# التاج
# الجامع للأصول

## في أحاديث الرسول ﷺ


دانراوى: مامۆستا شێخ مەنصور عەلى ناصف

وەرگێڕانى: نورى فارس حەمە خان

محمود أحمد محمد
پێیدا چوتەوەو سەرپەرشتى لە چاپدانى كردووە



دار المعرفة
بيروت - لبنان

# التَاجُ
# ألجَامِعُ لِلأُصُولِ
## في أحاديث الرَسُول ﷺ


دانراوی: مامۆستا شێخ مەنصور عەلی ناصف

وەرگێڕانی: نوری فارس حەمە خان

محمود أحمد محمد

پێیدا چۆتەوەو سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە


بەرگی دووەم - چاپی چوارەم


دار المعرفة

بيروت. لبنان

بسم الله الرحمن الرحيم

# التاجُ الجامِعُ للأصُول


- وەرگێڕانی: نوری فارس حمه خان
- پێداچونەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی: محمود أحمد محمد
- چاپ: چوارەم
- ساڵی چاپ : ٢٠٠٨
- تایپو دیزاین: کەژاڵ حسین/کۆمپیوتەری شانیا
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانه
- ژمارەی سپاردن:
- هەڵەگری: لاڤە هۆشیار محمد علی - کچەزای م.نوری فارس





- ژمارە سپاردنی (٢٣٩٤)ی ساڵی ٢٠٠٨ی پێدراوە

ئـەم پـەڕاوە پـیرۆزە لەسـەر فەرمایـشتی دانەرەکـەی پوختـەی حەدیثەکانی ئەم پەڕاوە پیرۆزانەیە:

١) صحيح البخاري

٢) صحيح مسلم

٣) سنن أبي دَاوُدَ

٤) جامِعُ الترمذي

٥) المُجْتَبى لِلنَّسَائِيَ



# نامەی زەکات

(ئەم نامەیە حەوت باس‌و پاشەکییەکە)

## ١) باسی یەکەم: باسی پێداویستی‌و گەورەیی زەکات

## کتاب الزکاة (وفیه تسعة ابواب وخاتمة)

## ١) الباب الأول: في فرضیة الزکاة وفضلها

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ}.

خودای گەورە دەفەرموێ: نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن‌و فەرمانبەری پێغەمبەر بکەن، سا بەشکوو خودای مەزن بە رەحمەتی خۆی رەحمتان پێ بکا.

وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: {خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ}.

واتە: ئەو زاتە مەزنە دەفەرموێ: زەکاتی شەرعی لە ماڵەکانیان وەربگرە وە بەهۆی ئەو زەکاتەوە دڵ‌و دەروونیان لە گوناەو تاوان پاك دەکەیتەوە، هەروەك زەکاتەکە خۆی دەبێ بە مایەی بەرەکەت‌و نەشونمای ماڵەکەیان، وە دوعای خێرو نزای باشیشیان بۆ بکەو بۆیان بپاڕێرەوە، چونکە نزاو پاڕانەوەی تۆ بۆ ئەوان دەبێ بە مایەی ئارام‌و ئاسایش بۆیان، خودایش بیسەرو زنەوایەو لە هەموو شتێ باش ئاگادارەو پاك‌و پیس لەیەك جیا دەکاتەوە.

وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَالَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَأَنفَقُوا لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەو کەسانەتان کە باوەڕ بە خوداو پێغەمبەر دەکەن ماڵ‌و دارایی خۆیان لە ڕێگەی خودادا بەخت دەکەن پاداش‌و پایەیەکی گەڵێ گەورەیان بۆ هەیە.

١١٧٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ النَبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ حِينَ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ: إِنَّكَ سَتَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ، فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إِلَى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ: وهُمْ الشيخان (أي البخاري ومسلم) وأبو داود والترمذي والنسائي رضوان الله تعالى عليهم،وَأينما ذكروا خصوصاً كلَّما تكررَّتْ اسماؤهم الكريم مِنْ ثنايا هذا الكتاب المبارك[1].

ئیبنو عەبباس (خوای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە موعاذی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەنو کردی بە سەرکارو مامۆستایان، پێی فەرموو: ئەوا تۆ دەچیت بۆ ناو گەلێك، کە خاوەنی نامە (ئەهلی کیتابن)، جا کاتێ دەچێتە ناویان لە پێشا داوایان لیٚ بکە کە شایەتی بدەن: کە هەر خودا خودایەو خودای تر نیەو موحەممەد پێغەمبەری خودایە، جا ئەگەر بۆ ئەمە بەگوێیان کردی ئەوا پێشیان بڵێ: کە خودا (لە هەموو شەوو رۆێکا) پێنج نوێژی لەسەریان داناوە، جا ئەگەر بۆ ئەمەیش بەگوێیان کردی ئەوا پێشیان بڵێ: کە خودا زەکاتی لەسەریان داناوە، کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێو دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان، جا ئەگەر بۆ ئەمەش بە گوێیان کردی ئەوا نەکەی نایابی ماڵەکانیان هەڵبژێریو لە باتی زەکات بیبەی، وە خۆشت بپارێزە لە ناڵەو نزای ستەمبار، چونکە ئاهو نزوولەو ناڵەی ستەمدیدە تیرێکی کوشندەیەو لەگەڵ لەکەوان دەرچوو بڕستی ستەمکار

[1] بخاري. زكاة: ١٣٩٥، ١٤٥٨، ١٤٩٦، ٢٤٤٨، ٤٣٤٧، ٧٣٧١، ٧٣٧٢. مسلم. إيمان: ١٢١ — ١٢٣. أبو داود. زكاة: ١٥٨٤. ترمذي. زكاة: ٦٢٥، ٢٠١٤. نسائي. زكاة: ٢٤٣٤، ٢٥٢١. ابن ماجه. زكاة: ١٧٨٣ (رياض: ١٢٠٨/٣. ز: ٢١٦).

دەبڕێو هیچ شتێ بەری ناگرێ تا خۆی دەگەیەنێتە بارەگای پەروەردگار! (ش/د/ت/ن): واتە: شەیخان (کە بوخاری و موسلیمن) و ئەبو داوودو تیرمیذی و نەسائی ئەم حەدیثەیان گێڕاوەتەوە، (رەمزای خوایان لێبێ و خودای گەورە لێیان خۆشنوودبێ)، هەرکاتێ ناویان ببرێ وە لە هەرلا باسیان بکرێ، بە تایبەتی لەناو ئەم کتێبە پیرۆزەدا لە هەرشوێنێ کە ناویان دەنووسرێ لە سەرەتاوە هەتا دوا وشەی).

١١٧٦– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى النَّبِيَّ فَ قَالَ:(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا عَمِلْتُهُ دَخَلْتُ الْجَنَّةَ. قَالَ: تَعْبُدُ اللَّهَ لاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ الْمَكْتُوبَةَ، وَتُؤَدِّي الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ. قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ أَزِيدُ عَلَى هَذَا. فَلَمَّا وَلَّى قَالَ:النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا[٢].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: کارێکم نیشان بدە ئەگەر بیکەم ببم بە بەهەشتی؟ فەرمووی: خودا بپەرستەو بەندەیی و پەرستشی بکەو هیچ هاوبەشی بۆ بڕیار مەدەو نوێژە فەرزەکان بکەو زەکاتی فەرز بدەو رۆژووی رەمەزان بگرە. پیاوەکەیش گوتی: بەو کەسە کە گیانی منی بە دەستە لەمانە زیاتر ناکەم، جا کە رۆیشت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی حەزدەکا کە لەم جیهانەدا بە چاوی خۆی پیاوێکی بەهەشتی ببینێ با تەماشای ئەم پیاوە بکا (ش/ن).

١١٧٧– وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلاَّ مَلَكَانِ يَنْزِلاَنِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا، وَيَقُولُ الآخَرُ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا. رَوَاهُمَا الشَّيْخَانِ وَالنَّسَائِيُّ[٣].

---

[٢] بخاري. زكاة: ١٣٩٧ . مسلم. إيمان: ١٠٧، ١٠٦، ١٠٨.

[٣] بخاری. زكاة: ١٤٤٢ . مسلم. زكاة: ٢٣٣٣.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو رۆژێ كە بەندەگان رۆژیان لێ دەبێتەوە، دوو فریشتە دێنە خوارەوە، یەكێكیان دەفەرموێ: خودایە! ئەوەی بەخشندەیە تۆڵەی بۆ بكەرەوە، ئەوی تریشیان دەفەرموێ: خودایە! ئەوەی چرووكو گیرە، لێی بگرەوە! (ش/ن).

١١٧٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا تَصَدَّقَ أَحَدٌ بِصَدَقَةٍ مِنْ طَيِّبٍ - وَلاَ يَقْبَلُ اللَّهُ إِلاَّ الطَّيِّبَ - إِلاَّ أَخَذَهَا الرَّحْمَنُ بِيَمِينِهِ وَإِنْ كَانَتْ تَمْرَةً فَتَرْبُو فِي كَفِّ الرَّحْمَنِ حَتَّى تَكُونَ أَعْظَمَ مِنَ الْجَبَلِ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ أَوْ فَصِيلَهُ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلاَّ أَبَا دَاوُدَ. وَزَادَ التِّرمِذِيُّ: وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ – يَمْحَقَ اللهُ الرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ[٤].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی خێرێ بكا لە حەڵاڵ، (چونكە هەرچی حەڵاڵ نەبێ خودا وەری ناگرێ) ئەوەی خێرێ بكا لە حەڵاڵ خودای میهرەبان بە دەستی راستی خۆی وەری دەگرێ، با دەنكە خورمایەكیش بێ، جا ئەو خێرە لەناو لەپی پەروەردگاری میهرەبانا نەشونماو گەشە دەكا تا بەقەد كێوێ گەورەتر دەبێ" وەك چۆن یەكێ لە ئێوە جوانوو ماینێ یا پارێنە وشترێ بۆ خۆی پەروەردە بكا خودایش ئەو خێرە ئاوا پەروەردە دەكا، تا تەواو گەورە دەبێ (ش/ت/ن) تیرمیذی ئەمەشی لێ زیاد كردووە: نیشانەی راستو دروستی ئەمەش لە نامەی خودای گەورەو شكۆمەنددا هەیە كە دەفەرموێ: {يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ} خودا سوود بێ پیتو بەرەكەت دەكاو ماڵی سوود خێرناداتەوە، بەڵام ماڵێ كە خێرو خێراتی لێ بكرێو زەكاتی لێ بدرێ خودا زۆری دەكاو نەشونمای پێ دەكا.

١١٧٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ نودِيَ فِي الْجَنَّةِ يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا خَيْرٌ فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلاَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ

---

(٤) بخاري. زكاة: ١٤١٠، ٧٤٣٠.

الصَّلاَةِ وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّان. قَالَ: أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا عَلَى أَحَدٍ يُدْعَى مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ كُلِّهَا؟ قَالَ: نَعَمْ وَإِنِّي أَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلاَّ أَبَا دَاوُدَ[٥].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ جووتێ شت لە ڕێگەی خودادا ببەخشێ وەك ئەوە دوو درهەم یا دوو دینار یا وەك ئەوە مەڕو بزنێ یا کەواو کراسێ ببەخشێ کاتێ کە دەچێتە بەهەشت دەرگاوانەکان بانگی دەکەن: ئەی بەندەی خودا! ئەی فیسارەکەس! ئەم دەرگایە باشە لە باوەڕی منا، وەرە لێرەوە بچۆرە ژوورەوە! جا ئەوەی خاوەنی نوێژە لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێ، وە ئەوەی خاوەنی خەبات و غەزا بێ لە دەرگای خەبات و غەزاوە بانگ دەکرێ، وە ئەوەی خێرەومەندبێ لە دەرگای خێرەومەندانەوە بانگ دەکرێ، وە ئەوەی خاوەن ڕۆژوو بێ لە دەرگای پاراوو تێراوەوە بانگ دەکرێ (هەتا دوایی). ئەبو بەکری صەدیقیش (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ قەیدی نیە کە یەکێ لە هەموو دەرگاکانەوە گازبکرێ؟ وە ئایا کەسێ هەیە کە لەهەر هەشت دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگ بکرێ؟ فەرمووی: بەڵێ: هەیە، وە ئومێدیش دەکەم کە تۆ یەکێك بیت لەوان! (ش/ت/ن).

١١٨٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَدَّيْتَ زَكَاةَ مَالِكَ فَقَدْ قَضَيْتَ مَا عَلَيْكَ. رَوَاهُ التِرمِذِي[٦].

---

[٥] بخاري. صوم: ١٩٧، ٢٨٤١، ٣٢١٦، ٣٦٦٦ مسلم. زكاة: ٢٣٦٨. ترمذي. مناقب: ٣٦٧٤. نسائي. صيام: ٢٢٣٧، ٢٤٣٨، ٣١٣٥.

[٦] بسند حسن (شرحه).

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەرماڵێ زەکاتەکەی بدەی ئیتر ئەرکی سەرشانی خۆتت لە بارەیەوە بەجێ هێناوە (ت-س/ح) واتە: تیرمیذی بەسەندێکی حەسەنو جوان ئەم فەرموودەیەی ئێڕاوەتەوە.

١١٨١- وَعَنْهُ وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ أَكَبَّ فَأَكَبَّ كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا يَبْكِي لاَ نَدْرِي عَلَى مَاذَا حَلَفَ ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فِي وَجْهِهِ الْبُشْرَى فَكَانَتْ أَحَبَّ إِلَيْنَا مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ ثُمَّ قَالَ: مَا مِنْ عَبْدٍ يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ وَيَصُومُ رَمَضَانَ وَيُخْرِجُ الزَّكَاةَ وَيَجْتَنِبُ الْكَبَائِرَ السَّبْعَ إِلاَّ فُتِّحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ فَقِيلَ لَهُ ادْخُلْ بِسَلاَمٍ. رَوَاهُ النَّسَائِي[٧].

ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدی خودری (خوایان لێ ڕازی بێ - ڕەزای خودایان لێبێ) گوتیان: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وتارێکی بۆمان دا" سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: بەو کەسە کە گیانی منی بە دەستە! ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سەری شۆڕکردەوە بەسەر سینگی خۆیدا، ئێمەیش هەمووومان سەری خۆمان دانەواندو دەستمان کرد بە گریان، وە نەمانزانی لەسەر چێ سوێند دەخوا، بەڵام کە سەری هەڵبڕی موژدە لە ڕووی دەباری! ئیتر ئەوەمان لە باشترین ماڵێ دنیا (کە ڕانە وشتری سوورە) پێ خۆشتر بوو.

ئینجا فەرمووی: هەر بەندەیەك هەموو ڕۆژێ پێنج نوێژەکان بکاو ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێو زەکات دەر بکاو خۆی لە حەوت گوناهە گەورەکان بپارێزێ، بێگومان کە هەر هەشت دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەخەنە سەرپشتو پێی دەڵێن: بەخۆشی بچۆرە ژوورەوە لەکام دەرگایانەوە کە خۆت ئارەزوو دەکەی (ن = نەسائی).

---

[٧] سكت عَن درجته الشارح.

## ٢) باسی دووەم: هەڕەشەکردن لە زەکات نەدەر

## الباب الثاني: في التشديد على تاركها

وَقَالَ اللهُ تَعالَى: {وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ. يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ}.

خودای گەورە دەفەرموێ: مژدەی سزایەکی بەسوێ بدە بەوانە کە هەر زێڕو زیو کەڵەکە دەکەن‌و لە ڕێگەی خودادا خەرجی ناکەن، ڕۆژێ دێ کە ئەو سامان‌و گەنجەیان لەناو ئاگری دۆزەخا سوور دەکرێتەوە، تا دەبێ بەیەک پارچە ئاگر، ئەوجا تەوێڵ‌و تەنشت‌و پشتیانی پێ داخ دەکرێ، وە فریشتەی سزاو عەذاب بەتەوس‌و تەڵفیسییەوە" لاقرتییان پێ دەکەن‌و پێیان دەڵێن: ئەمە زێڕو زیوو گەنجەکەی خۆتانەو خۆتان خڕتان کردۆتەوە بۆ گیانی خۆتان، کەواتە بچێژن لەبەری ڕەنجەشانی خۆتان!

١١٨٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُا) قَالَ: مَا بَلَغَ أَنْ تُؤَدَّى زَكَاتُهُ فَزُكِّيَ فَلَيْسَ بِكَنْزٍ. رَوَاهُ أبو دَاوُدَ وَلَحاكُم وَمالِكٌ: وَلَفْظُهُ: مَا أُدِيَ زَكَاتُهُ فَلَيْسَ بِكَنْزٍ[1].

ئوممو سەلەمە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر ماڵێ بگاتە ڕادەی زەکات‌و زەکاتی شەرعی لێ دەربکرێ ئیتر ئەو ماڵە بە گەنجی حەرام دانانرێ (د/حاکم/مالک) گفتەی (لفظ)ی مالیک ئاوایە: هەرچی زەکاتی لێ دەربکرێ بەگەنجی حەرام دانانرێ.

١١٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَبٍ وَلاَ فِضَّةٍ لاَ يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ صُفِّحَتْ لَهُ صَفَائِحَ مِنْ نَارٍ فَأُحْمِيَ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَيُكْوَى بِهَا جَنْبُهُ وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ كُلَّمَا

---

[1] صحيح عنه الحاكم. (تاج/٢ ص ٢١ – حديث رقم: ١٢٢٨/٢.

بَرَدَتْ أُعِيدَتْ لَهُ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ.

قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالإِبِلُ قَالَ: وَلاَ صَاحِبُ إِبِلٍ لاَ يُؤَدِّى مِنْهَا حَقَّهَا وَمِنْ حَقِّهَا حَلَبُهَا يَوْمَ وِرْدِهَا إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ أَوْفَرَ مَا كَانَتْ لاَ يَفْقِدُ مِنْهَا فَصِيلاً وَاحِدًا تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا وَتَعَضُّهُ بِأَفْوَاهِهَا كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولاَهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ قَالَ: وَلاَ صَاحِبُ بَقَرٍ وَلاَ غَنَمٍ لاَ يُؤَدِّى مِنْهَا حَقَّهَا إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ لاَ يَفْقِدُ مِنْهَا شَيْئًا لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ وَلاَ جَلْحَاءُ وَلاَ عَضْبَاءُ تَنْطِحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلاَفِهَا كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولاَهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلا التِّرْمِذِيَّ [٢].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەو کەسەی خاوەنی زێڕو زیو بێ و زەکاتی لێ دەرنەکا، لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو زێڕو زیوە دەکرێ بە پلێت و سوور دەکرێتەوە لەناو ئاگری دۆزەخا تا دەبێ بە یەك پارچە ئاگری سوور، ئەوجا تەنیشتی و ناوچەوانی و پشتی و هەموو لەشی تری پێی داخ دەکرێ، هەموو جارێ کە سارد دەبێتەوە، سەر لەنوێ سووری دەکەنەوە بۆی و دیسان وای لێ دەکەنەوە، ئیتر لەو ڕۆژەدا کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە ئەو کابرایە ئەمە حاڵیەتی، هەتا دادگایی و موحاکەمەی بەندەکان لەناو خۆیانا تەواو دەبێ، ئەوجا ڕێگەی خۆی نیشان دەدرێ سا یا بۆ بەهەشت سا یا بۆ دۆزەخ! گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی

---

[٢] بخاري. زكاة: ١٤٠٢، ٢٤٧٨، ٣٠٧٣، ٦٩٥٨ . مسلم. زكاة: ٢٢٨٧. نسائي. الخيل: ٣٥٦٥ (رياض/ ٣ ز: ٢١٦ ژمارە: ٩/ ١٢١٤).

وشتر؟ فەرمووێ: وە ئەوەی خاوەنی وشتربێ و مافی مافداران و هەقی هەقدارانی لێ نەدا، لە رۆژی قیامەتدا لە دەشتێکی کرکایکرکا لەسەر دەم رایدەخەن بۆ ئەو وشترانە، وە تا بلێیت زل زل و فیلەتەنن و یەك پارێنەشیان کەم نیە، ئیتر ئەوانیش بە پا دەیشێلن و بەدەم دەیگەزن و قەپی لێ دەگرن، گشت جارێ کە دواییەکەیان بەسەریا تێ دەپەڕی دیسانەوە بەراییەکەیان دەگێڕنەوەبۆ سەری، ئیتر ئەمە حاڵیەتی لەو رۆژەدا کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە هەتا مەحکەمەی ناو بەندەگان تەواو دەبێ، ئەو جار رێگەی خۆی پیشان دەدرێ، سا یا بۆ بەهەشت سا یا بۆ دۆزەخ! وە ئەو رۆژەشی کە وشتر دەبرێ بۆ سەر ئاوو دەدۆشرێ، ئەو شیرە مافی هەژارانی پێوەیە. گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی رەشە ولاخ و مەڕو بزن؟ فەرمووی: وە ئەوەی خاوەنی رەشە ولاخ و مەڕو بزن بێ و مافی هەژارانیان لێ نەدا لە رۆژی رەستاخێز (قیامەت)دا، لە دەشتێکی کرکایکرکا لەسەر دەم رادەخرێ بۆیان، ئەو ئاژەڵە لەو کاتەدا نە تاقە یەکێکیان کەمە، نە شاخ بادراوێکیان تیادایە، نە کوڵێ، نە شاخ شکاوێ، هەموو زرت و ئامادەن بۆ شەڕە قۆچ و شۆق وەشاندن ئیتر بەشاخ دەیدەنە بەر شۆق و بەسم گێرەی دەکەن، گشت جارێ کە دوایی یەکەیان بە سەریا تێ دەپەڕن دیسانەوە، بەراییەکەیان دەگێڕنەوە بۆ سەری، ئیتر ئەمە حاڵیەتی لەو رۆژەدا کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە، هەتا دادگایی و مەحکەمەی ناوەندی بەندەگان تەواو دەبێ، ئەوجا رێگەی خۆی نیشان دەدرێ: سا یا بۆ بەهەشت، سا یا بۆ دۆزەخ! (ش/د/ن).

**١١٨٤**- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً، فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ مُثِّلَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ، لَهُ زَبِيبَتَانِ، يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَيْهِ ثُمَّ يَقُولُ أَنَا مَالُكَ، أَنَا كَنْزُكَ، ثُمَّ تَلاَ (وَلاَ يَحْسِبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) رِوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلاَّ أَبَا دَاوُدَ[٣].

---

[٣] بخاري. زكاة: ١٤٠٣، ٤٥٦٥، ٤٦٥٩، ٦٩٥٧. مسلم. زكاة: ٢٢٩٣، ٢٢٩٤. نسائي. زكاة: ٢٤٥٣.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ خودا ماڵی پێ بدات و زەکاتی نەدا، لە ڕۆژی ڕەستاخێزدا ئەو ماڵە دەبێ بە نێرەمارێکی سەرگەڕی زەهردار، دوو کەڵبەی دەرپەڕیوی لە دەمایە، جاوەک کەڵەمە ئەڵقە دەدات لە ملیاو ەنووسێ بە هەردوو لا لغاوەیداو سەری لەم لا لغاوەی و کلکی لەو لا لغاوەکەی تری گیر دەکاو پێی دەڵێ: من ماڵەکەی خۆتم، من گەنجەکەی خۆتم! ئینجا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ و سەرو ماڵ و گیان بە قوربانی بێ) ئەم ئایەتەی خوێند:

{وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ}.

ئەوانەی کە ڕژدی و ڕەزیلی دەکەن لە بەختکردنی ئەو ماڵەدا کە لە سایەی خوداوە پێیان دراوە، با گومان نەبەن کە ئەو ڕژدی و چرووکییە بۆ ئەوان چاکە، بەڵکوو ئەوە زۆر بەدوو خراپە بۆ دوا ڕۆژیان، ئەو بەشەماڵە کە لەبەر ڕژدی نایدەن بە خاوەن هەق و بە هەژاران لە ڕۆژی ڕەستاخێزدا دەکرێ بە تەوقی ئاسنین و دەکرێتە ملیان! (ش/ت/ن).

١١٨٥- وَعَنْهُ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ قَالَ:عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ لأَبِي بَكْرٍ كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وَقَدْ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ فَمَنْ قَالَ: لَهَا فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلاَّ بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ . فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ وَاللَّهِ لأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقًا كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ. فَ قَالَ:عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ شَرَحَ اللهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[٤].

---

[٤] بخاري. زكاة: ١٣٩٩، ١٤٥٧، ٦٩٢٤، ٧٢٨٤، ١٤٠٠، ١٤٥٦، ٦٩٢٥، ٧٢٨٥. مسلم. إيمان: ١٢٤ — ١٢٨. رياض/ ١٢١٠، ١/٢٩٠. ترمذى. إيمان: ٢٦٠٧. أبو داود: زكاة: ١٥٥٦، ١٥٥٧ . نسائي. زكاة: ٢٤٤٢

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە کۆچی دوایی کرد، وە لە پاش ئەو ئەبو بەکر کرا بە جێنشین (خەلیفە) وە ئەو عارەبانەی کە لە دین هەڵگەڕابوونەوە پەیدابوون، وە ئەبو بەکر ویستی بچێ بەگژیانا بەم بۆنەیەوە عومەری کوڕی خەطاب پێی گوت: تۆ چۆن جەنگ دەکەی لەگەڵ ئەم خەڵکەداو بەڵگەت چیە؟ ئەی چی دەکەی لەوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: فەرمانم پێ کراوە کە شەڕ بکەم لەگەڵ ئەم خەڵکەدا تا شایەتمان دێننو بەزمان دەڵێن: (لا الـه الا الله) واتە: هەر خودا خودایەو خودای تر نیە، ئەگەر بشبێ راست نیەو درۆیە! ئیتر ئەو کەسەی کە ئەمە بڵێ ئەوا سەرو ماڵی خۆی لەمن قەدەغە دەکاو خوێنو نامووسو ماڵی لەمن حەرام دەبێ مەگەر لەسەر حەقی شەرعی، وە ئیتر حیسابو لێ پرسینەوەی نیازی دڵی لەو دنیا لەسەر خودایە.

ئەبو بەکریش گوتی: بەخودا زۆر باش دەچم بەگژ ئەوانەدا کە فەرقی نوێژو زەکات دەکەنو دەڵێن نوێژ فەرزەو دەیکەینو زەکات فەرزنیەو نایدەن چونکە زەکاتیش مزی ماڵە، سوێند بەخودا ئەگەر گیسکێکیان دابێ بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) و ئێستە نەیدەن بەمن لەسەر نەدانی ئەو گیسکەیە دەچم بەگژیانا.

عومەر دەیگوت: بەخودا دیار بوو کە کردنی ئەو جەنگە شتێ بوو خودا نابوویە دڵی ئەبو بەکرەوە، وە منیش بۆم دەرکەوت کە قسەکەی ئەبو بەکر راست بوو (ش/د/ت/ن).

## ٣) زەکات لەچی دەکەوێو لەچی ناکەوێ : (فصل فیما تجب فیه الزکاة)

١١٨٦- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ - أَوْ وَالَّذِي لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ، أَوْ كَمَا حَلَفَ - مَا مِنْ رَجُلٍ تَكُونُ لَهُ إِبِلٌ أَوْ بَقَرٌ أَوْ غَنَمٌ لاَ يُؤَدِّي حَقَّهَا إِلاَّ أُتِيَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا تَكُونُ

وَأَسْمَنَهُ، تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، كُلَّمَا جَازَتْ أُخْرَاهَا رُدَّتْ عَلَيْهِ أُولاَهَا، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلَّا أَبَا دَاوُدَ[١].

ئـەبو ذەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) گـوتی: چـووم بـۆ لای پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە سێبەری کەعبەدا دانیشتبوو کە گەیشتمە خزمەتی دەیفەرموو: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەستە یا دەیفەرموو: بەو خودایە کە خودای تری لە ڕەنگ نیە یا هەر سوێندێکی تری خوارد ئینجا فەرمووی: هەر پیاوێ وشتر یا ڕەشە ولاخ یا مەڕو بزنی هەبێ، وەمافی خاوەن مافی لێ نەدا، لە ڕۆژی قیامەت (ڕەستاخێز)دا ئـەو ماڵانـەی دەهێنـرێ، هـەتا بلێـی زل زلو قەڵـەو قەڵەون وە خۆی لەسەر سك وەك بەرە ڕادەخرێ بۆیان ئینجا ئەوانیش بەسم گێرەی دەکەنو بەشاخ شۆقی تێ هەڵ دەدەن، هەر چەند دواییەکەیان تێ دەپەڕێ بەسەریا دیسانەوە بەراییەکەیان دەگێڕنەوە بۆ سەری. ئیتر ئەو کابرایە ئەمە حاڵیەتی تا مەحکەمەی نێوانی ئەو خەڵکە تەواو دەبێ (ش/ت/ن).

١١٨٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ أَعْرَابِيًّا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْهِجْرَةِ فَقَالَ: وَيْحَكَ، إِنَّ شَأْنَهَا شَدِيدٌ، فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ تُؤَدِّى صَدَقَتَهَا. قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَاعْمَلْ مِنْ وَرَاءِ الْبِحَارِ فَإِنَّ اللَّهَ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئًا. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلَّا التِّرْمِذِيَّ[٢].

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: عارەبێکی دەشتەکی دەیویست کۆچ بکا بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جا سەربارەت بەوە لە حەزرەتی پرسی، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): هاوار لەخۆت! ئەو باسە گەلێ

---

[١] بخاري. زكاة: ١٤٠٢ . مسلم. زكاة: ٢٢٨٧ — ٢٢٩٤، ٢٢٩٧. رياض. ز: ٢١٦ ژمارە: ١٢١٤/٩. ترمذي. زكاة: ٦١٧. نسائي. زكاة: ٢٤٣٩.

[٢] بخاري. زكاة: ١٤٥٢، ٢٦٣٣، ٣٩٢٣ . ٦١٦٥. مسلم. إمارة: ٤٨٠٩ . أبو داود. جهاد: ٢٤٧٧ . نسائي. بَيْعَة: ٤١٧٥.

سەختو دیژوارەو ئەرکی زۆرە، بۆ هەموو کەسێ ڕاناگیرێ، واز لەم باسە بێنە، بەڵام ئایا وشترت هەیە زەکاتیان لێ بدەی؟ گوتی: بەڵێ. فەرمووی: دە لە هەر کوێ کاری باش دەکەی بیکە، خودا دەکا لەوپەڕ دەریاوە دەیکەی، لە هەرلا دەیکەی جیاوازی نیە، خودا بۆتی دەنوسێو هیچی لێ کەم ناکاتەوە (ش/د/ن).

١١٨٨- وَقَالَ:عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ: إنمَا تَجِبُ الزَّكَاةُ فِى الْعَيْنِ وَالزَّرْعِ وَالْمَاشِيَةِ ووَافَقَهُ مَالِكٌ وَالشَّافِعِيّ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمْ) وَلَفْظُ الشَّافِعِيِّ فِي الْأُمّ: الْمَالُ الَّذِى تَجِبُ فِيهِ الصَّدَقَةُ بِنَفْسِهِ عَيْنُ ذهَبٍ وَفِضةٍ، وَبَعْضُ نَبَاتِ الْأَرْضِ، وَالْمَاشِيَةُ، وَمَا أُصِيب فِي أَرْضٍ مِنْ مَعْدِنٍ وَرِكَازٍ[٣].

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێ: زەکات هەر لە نەختینەی زێڕو زیوو لە دانەوێڵەو لە ئاژاڵ دەکەوێ.

مالیكو شافیعیش لەسەر ئەم رایەی ئەون، ڕەزای خوا لە هەموویان بێ، پێشەوا شافیعی لە پەڕتووکی (الام)دا دەڵێ: ئەو ماڵەی کە لەخۆیەوە، بە خودی خۆی. زەکاتی لێ دەکەوێ: هەر نەختینەی زێڕو زیوو هەندێ ڕووەکی زەویو ئاژاڵو ئەوکانو گەنجەیە کە لە زەویدا دەدۆزرێتەوە.

١١٨٩- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ[٤].

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دانەوێڵە لە پێنج ویسق کەمتر بێ زەکاتی لێ ناکەوێ[١] (ش/د/ت/ن).

---

[٣] ئثر صحيح.

[٤] بخاري. زكاة: ١٤٠٥، ١٤٤٧، ١٤٥٩، ١٤٨٤ . مسلم . زكاة: ٢٢٦٠ — ٢٢٦٧. أبو داود. زكاة: ١٥٥٨. ترمذي. زكاة: ٦٢٦، ٦٢٧. نسائي. زكاة: ٢٤٤٥، ٢٤٧٢، ٢٤٧٤.

**١١٩٠- عَنْ أَبی هُرَیْرَةَ** (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) **قَـالَ: لَـیْسَ عَلَی الْمُسْلِمِ فِی عَبْدِهِ ولَافَرَسِهِ صَدَقَةٌ. رَوَاهُماَ الْخَمْسَةُ[٥].**

**ئـەبو هـورەیرە** (خـودای لێ رازی بـێ) **گـوتی: پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **فەرمووی: بەندەو ئەسپو ماینی پیاوی موسوڵمان زەکاتیان لێ ناکەوێ بەو مەرجەی کە هی بازرگانی نەبن (ش/د/ت/ن).**

**١١٩١- وَلِمُسلِم وَأَحمد: لیس في العبد صَدَقَ إلاّ صَدَقَةُ الفِطْرِ[٦]:**

**دەفـەرموێ:** (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) **(بێجگـە لەسـەرفترە، بەنـدە (کۆیلـە) زەکاتی تری لێ ناکەوێ (م/ئەحمەد).**

**١١٩٢- وَعَنْهُ عَنِ رَسُولُ اللّهِ** (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) **سُئِلَ عَنْ الْحَمِیرِ أَیهاَ زَکَاةٌ؟ فَقَالَ: مَا جَاءَنِی فِیهاَ شَیْءٌ إلاّ هَذِهِ الآیَةُ الْفَادَّةُ (فَمَنْ یَعْمَلْ مِثْ قَالَ:ذَرَّةٍ خَیْرًا یَرَهُ وَمَنْ یَعْمَلْ مِثْ قَالَ مِثْقَال ذَرَّةٍ شَرًّا یَرَهُ). رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالشَّیْخَان[٧].**

**دیـسان گـوتی: پرسـیار کـرا لـە پێغەمبـەر** (درووده خـودای لەسـەربێ)**: ئایـا گوێدرێژ زەکاتی لێ دەکەوێ یا نا؟ فەرمووی: لەم لایەنەوە هیچ سرووشێکم بە تایبەتی بۆ نەهاتووە، تەنیا ئەم ئایەتە دانسقەو کەم مانەندو کەم هاوتایە نەبی کە تێکڕا هەموو جۆرە خێرێ دەگرێتەوە کە دەفەرموێ:**

**{فَمَن یَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَیْرًا یَرَهُ وَمَن یَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا یَرَهُ}.**

---

[١] مامۆستا مەلا کەریمی بیارە خودا دەست بە عـەمری بگـرێ لـە بـەرگی یەکـەمی شـەریعەتی ئیـسلامدا لـە لاپـەڕە (٢٢٢)دا دەفـەرموێ: پێـنج وەسـق دەکاتـە سـێ سـەد صـاع، بەپێوانـەی کوردەواری دەکاتە نزیکەی چلو پێنج تەنەکە. - وەرگێڕ – ١٩٨٧/٧/٢١

[٥] بخاري. زکاة: ١٤٦٣، ١٤٦٤ . مسلم. زکاة: ٢٢٧٠ – ٢٢٧٣. أبو داود. زکاة: ١٥٩٤، ١٥٩٥. ترمذي. زکاة: ٦٢٨. نسائي. زکاة: ٢٤٦٦.

[٦] مسلم. زکاة: ٢٢٧٣.

[٧] بخاري. مساقاة: ٢٣٧١، ٢٨٦٠، ٣٦٤٦، ٤٩٦٢، ٤٩٦٣، ٧٣٥٦ . مسلم.

هەر كەسێ بەقەی سەنگی میرووچە بچكۆلەیێ چاكەی كردبێ پاداشتەكەی دەبینێتەوە، وە هەر كەسێ بەقەی سەنگی میرووله بچكۆلەیێ خراپەی كردبێ پاداشەكەی دەبینێتەوە (ئەحمەد/ش).

١١٩٣- عَنْ مُعَاذٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْأَلُهُ عَنِ الْخُضْرَوَاتِ وَهِيَ الْبُقُولُ فَقَالَ: لَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ. رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ وَالْبَزَّارُ وَالدَّارَ قُطْنِيُّ[٨].

موعاذ (خودای لێ رازی بێ) نامەی نووسی بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەبارەی سەوزە واتەوە (كە پێشی دەڵێن: تەڕە وەك خەیارو كاڵەك‌و بامیەو تەماتەو شتی وا) پرسیاری لێ كرد. فەرمووی: زەكاتیان لێ ناكەوێ (ت/بەززار/دارە قوطنی – اسانید ضعیفه).

## ٤) باسی سێیەم: باسی زەكاتی ئاژەڵ كە بریتییە لە وشترو رەشە وڵاخ‌و مەڕو بزن

## الباب الثالث: في زكاة الماشية وهي الابل والغنم والبقر

١١٩٤- عَنْ أَنَسٍ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) كَتَبَ لَهُ هَذَا الْكِتَابَ لَمَّا وَجَّهَهُ إِلَى الْبَحْرَيْنِ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْمُسْلِمِينَ، وَالَّتِي أَمَرَ اللَّهُ بِهَا رَسُولَهُ، فَمَنْ سُئِلَهَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى وَجْهِهَا فَلْيُعْطِهَا، وَمَنْ سُئِلَ فَوْقَهَا فَلاَ يُعْطِ فِي أَرْبَعٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الإِبِلِ فَمَا دُونَهَا مِنَ الْغَنَمِ مِنْ كُلِّ خَمْسٍ شَاةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ إِلَى خَمْسٍ وَثَلاَثِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ أُنْثَى، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَثَلاَثِينَ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ

---

[٨] بأسانيد ضعيفة (شرحه).

أُنْثَى، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَأَرْبَعِينَ إِلَى سِتِّينَ فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الْجَمَلِ، فَإِذَا بَلَغَتْ وَاحِدَةً وَسِتِّينَ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ فَفِيهَا جَذَعَةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ - يَعْنِي - سِتًّا وَسَبْعِينَ إِلَى تِسْعِينَ فَفِيهَا بِنْتَا لَبُونٍ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَتِسْعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الْجَمَلِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ إِلاَّ أَرْبَعٌ مِنَ الإِبِلِ فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا مِنَ الإِبِلِ فَفِيهَا شَاةٌ، وَفِي صَدَقَةِ الْغَنَمِ فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ شَاةٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ إِلَى مِائَتَيْنِ شَاتَانِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى مِائَتَيْنِ إِلَى ثَلاَثِمِائَةٍ فَفِيهَا ثَلاَثٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى ثَلاَثِمِائَةٍ فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، فَإِذَا كَانَتْ سَائِمَةُ الرَّجُلِ نَاقِصَةً مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةً وَاحِدَةً فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلَّامُسْلِماً[1].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەبو بەکر (خودای لێ ڕازی بێ) منی کرد بە سەرکاری سەر زەکاتی وڵاتی بەحرەین‌و ناردمی بۆ ئەوێ، ئەم نامەیەی بۆ نووسیم:

بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان. ئەمە دەستووری دانی زەکاتی فەرزە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە فەرمانی خودا دایناوە لەسەر موسوڵمان، جا هەر موسوڵمانێ لەسەر ئەم شێوە ڕێك‌و پێکە داوای لێ کرا ئەوا بابیدات، وە هەر کەسێ داوای زیاتری لەمە لێ کرا ئەوا با زیادەکە نەدات.

وشتر لە پێنج سەرەوە تا دەگاتە بیست‌و چوار سەر، زەکاتەکەی بە مەڕ یا بە بزن دەدرێ، لە هەموو پێنج سەر وشترێ مەڕێ، یا بزنێ زەکاتی لێ دەکەوێ لە دە سەر دوو مەڕە یا دوو بزن، لە پازدە سەر سێ مەڕ، یا سێ بزن، لە بیست سەر چوار مەڕ یا چوار بزن، مەڕی زەکات دەبێ تەمەنی

[1] بخاري. زكاة: ١٤٥٤، ١٤٤٨، ١٤٥٠، ١٤٥١، ١٤٥٣، ١٤٥٤، ١٤٥٥، ٢٤٨٧، ٣١٠٦، ٥٨٧٨، ٦٩٥٥.

ساڵێکی تەواو بێ یا زیاتر، بزن دەبێ تەمەنی دوو ساڵی ڕێك بێ، یا زیاتر، وەنێریش دەبێ، وە لە کەرتی نێوان دوو ژمارەیش (وەك شەش، نۆ، یا حەڤدە، یا بیست و سێ) هیچ ناکەوێ بەڵام وشترەکان کە بوون بە بیست و پێنج سەر هەتا دەبن بە سیی و پێنج گوێرەکە وشترێکی مێنگەی یەك ساڵەیان لێ دەکەوێ، وە کە بوون بە سیی و شەش سەر هەتا دەبن بەچل و پێنج سەر پارێنە وشترێکی مێنگەی دووساڵەیان زەکات لێ دەکەوێ، وە کەبوون بە چل و شەش سەر هەتا دەبن بە شەست سەر نێونە وشترێکی سێ ساڵەی بەرکەڵیان زەکات لێ دەکەوێ، وە کە بوون بە شەست و یەك سەر تا دەبن بە حەفتاو پێنج سەر وشترێکی مێی چوار ساڵەیان زەکات لێ دەکەوێ، وە کە بوون بە حەفتاو شەش سەر هەتا دەبن بە نەوەد سەر دوو پارێنە وشتری مێنگەی دوو ساڵەیان زەکات لێ دەکەوێ وە کە بوون بە نەوەدوو یەك سەر هەتا دەبن بە سەدو بیست سەر دوو، نێو نە وشتری سێ ساڵەی بەرکەڵیان زەکات لێ دەکەوێ. بەڵام کاتێ لە سەدو بیست سەر پتر بوون ئەوا لە هەموو چل سەرێ پارینە وشترێکی مێنگەی دوو ساڵەیان زەکات لێ دەکەوێ، وە لە هەموو پەنجا سەرێ نێوەنە" وشترێکی سێ ساڵەیان زەکات لێ دەکەوێ، وە هەر کەسێ تەنیا چوار وشتری هەبوو زەکاتیان لێ ناکەوێ، مەگەر خاوەنەکەیان بە ئارەزووی خۆی زەکاتیان لێ بدا.

بەڵام کە بوون بە پێنج وشتر، مەڕێ یا بزنێ زەکاتیان لێ دەکەوێ. زەکاتی مەڕو بزنیش ( کە بەدەمی خۆی بلەوەڕێ و بۆ دەرەوە ببرێ و بە لەوەڕی کەژ بژی و بە ئالیك و ئالفی ماڵەوە نەژی) ئاوایە: کە بوون بە چل سەر تا دەبن بە سەدو بیست سەر مەڕێ یا بزنێ زەکاتیان لێ دەکەوێ وە کە لە سەدو بیست زۆر تر بوون تا دەبن بە دووسەد سەر، دوو مەڕ یا دوو بزن زەکاتیان لێ دەکەوێ، وە کە لە دوو سەد سەر زۆر تربوون تا دەبن بە سێ سەد سەر سێ مەڕ، یا سێ بزن زەکاتیان لێ دەکەوێ، وە کە لە سێ سەد سەر هەڵیان بوارد ئەوا لە هەموو سەد سەرێ مەڕێ یا بزنێ زەکاتیان لێ دەکەوێ.

بەڵام ئەگەر مەڕو بزنی کابرایێ کە بەدەمی خۆیان لە دەشتو دەر، دە لەوەڕان یەك سەر لە چل سەر کەمتر بوون ئەوا زەکاتیان لێ ناکەوێ، مەگەر خاوەنەکەیان خۆی مەیلی هەبێ (ب/د/ت/ن).

١١٩٥- عَنْ مُعَاذٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْيَمَنِ: أَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنْ كُلِّ ثَلاَثِينَ بَقَرَةً تَبِيعًا أَوْ تَبِيعَةً وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً. رَوَاهُ أَصْحَابُ السُّنَنِ وَالْحَاكِمُ وَصَحَّحَهُ[٢].

موعاذ (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە ناردمی بۆ یەمەنو کردمی بە میرو فەرمانڕەوای ئەوێ، فەرمانی پێ کردم: کە لە هەموو سیی سەر ڕەشە وڵاخێ گوێرەکە نێرەیەك یا گوێرەکە مێنگەیەك زەکات وەربگرم، وە لە هەموو چل سەرێ نێوونێك زەکات وەربگرم. (د/ت/ن-س/ح- حاکم:ص)

١١٩٦- وَعَنْهُ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ لا آخُذَ مِنَ الْبَقَرِ شَيْئًا حَتَّى تَبْلُغَ ثَلاَثِينَ فَإِذَا بَلَغَتْ ثَلاَثِينَ فَفِيهاَ عَجْلٌ تَابِعٌ جَذَعٌ أَوْ جَذَعَةٌ حَتَّى تَبْلُغَ أَرْبَعِينَ فَإِذَا بَلَغَتْ أَرْبَعِينَ فَفِيهَا بَقَرَةٌ مُسِنَّةٌ. رَوَاهُ النسَائيُّ[٣].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێ کردم کە زەکات لە ڕەشە وڵاخ وەر نەگرم تا دەبن بە سیی سەر، جا کە بوون بە سیی سەر ئەوسا گوێرەکە نێرەیەکی یەك ساڵە یا گوێرەکە مێنگەیەکی یەك ساڵە زەکاتیان لێ دەکەوێ، ئیتر هەر ئەوەیە هەتا دەبن بە چل سەر، جا کە بوون بە چل سەر نێونێ زەکاتیان لێ دەکەوێ (ن).

١١٩٧- عَنْ أَنَسٍ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَتَبَ لَهُ الَّتِي فَرَضَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَا يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ،وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلاَّمُسْلِماً[٤].

---

[٢] رواه أصحاب السنن بسند حسن (شرحه).

[٣] سكت عنه.

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەو زەكاتەی كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دایناوە بۆماڵ، ئەبو بەكر نووسی بۆم كە: نەماڵی جیا كۆدەكرێتەوەو نە ماڵی كۆش جیا دەكرێتەوە لە ترسی زەكات، وە هاوبەشانیش لەناو خۆیانا بەرێكو پێكی كەمو زیادی دەگێڕنەوە بۆ یەكتری (هەر كەسێ بەقەد بەشی خۆی لە سەرمایەكەدا زەكات، دەدا) (ب/د/ت/ن).

## ٥) ئاژاڵی ناوبراو ئەگەر نەبوو چی لە جیاتی دەدرێ

## بيان العوض إذا فقد المطلوب

١١٩٨- عَنْ أَنَسٍ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) كَتَبَ لَهُ فَرِيضَةَ الصَّدَقَةِ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ رَسُولَهُ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ مِنَ الإِبِلِ صَدَقَةُ الْجَذَعَةِ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ جَذَعَةٌ وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الْحِقَّةُ وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إِن اسْتَيْسَرَتَا لَهُ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْحِقَّةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ الْحِقَّةُ وَعِنْدَهُ الْجَذَعَةُ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الْجَذَعَةُ، وَيُعْطِيهِ الْمُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْحِقَّةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ إِلاَّ بِنْتُ لَبُون فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ بِنْتُ لَبُون، وَيُعْطِي شَاتَيْنِ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ لَبُون وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الْحِقَّةُ وَيُعْطِيهِ الْمُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ لَبُون وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ وَعِنْدَهُ بِنْتُ مَخَاضٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ بِنْتُ مَخَاضٍ وَيُعْطِي مَعَهَا عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ مَخَاضٍ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ وَعِنْدَهُ بِنْتُ لَبُون فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ، وَيُعْطِيهِ الْمُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ بِنْتُ مَخَاضٍ عَلَى وَجْهِهَا، وَعِنْدَهُ ابْنُ لَبُون فَإِنَّهُ يُقْبَلُ مِنْهُ وَلَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ. رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ وَأَبُو دَاوُدَ وَالنَّسَائِيُّ[1].

---

[٤] بخاري. زكاة: ١٤٥٠، ١٤٥١.

[١] بخاري. زكاة: ١٤٥٣، ١٤٥٤.

ئەنەس (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: ئەو زەکاتە فەرزەی کە خودا دایناوە لەسەر ئۆممەتی پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) ئەبو بەکر (خودای لیٚ رازی بیٚ) بۆی نوسیمەوە کە: هەر کەسیٚ زەکاتی وشترەکانی دەیکردە وشتریٚکی میٚی چوارساڵە، بەڵام ئەم وشترەی نەبوو، بەڵکوو" نیوٚنە وشتری میٚی سیٚ ساڵەی هەبوو، ئەوا وشتریٚکی میٚی سیٚ ساڵەی لیٚ وەردەگیریٚ لەگەڵ دوو مەڕ، یا دوو بزندا ئەگەر مەڕو بزنی هەبوو، یا لەگەڵ بیست دەرەم زیوی رووتدا وە هەر کەسیٚ زەکاتەکەی دەیکردە نیٚونە وشتریٚکی میٚی سیٚ ساڵە، بەڵام ئەوەی نەبوو، بەڵکوو وشتریٚکی میٚی چوار ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لیٚ وەردەگیریٚ بەڵام زەکات سیٚنەکە یا بیست درەم یا دوو مەڕ یا دوو بزنی سەر باقی دەداتەوە، وە هەر کەسیٚ زەکاتەکەی دەیکردە نیٚونە وشتریٚکی سیٚ ساڵە بەڵام ئەمەی نەبوو بەڵکوو پاریٚنە وشتریٚکی میٚی دوو ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لیٚ وەردەگیریٚ لەگەڵ دوو مەڕ یا دوو بزن یا بیست درەم سەرباقی دا، وە هەرکەسیٚ زەکاتەکەی دەیکردە پارینە وشتریٚکی میٚی دوو ساڵانە بەڵام ئەمەی نەبوو، بەڵکوو نیٚونە وشتریٚکی سیٚ ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لیٚ وەردەگیریٚ، بەڵام زەکات سیٚنەکە بیست درەم یا دوو سەر مەڕ یا دوو سەر بزن سەر باقیی دەداتەوە پیٚی! وە هەرکەسیٚ زەکاتەکەی دەیکردە پارینە وشتریٚکی میٚی دوو ساڵە بەڵام ئەمەی نەبوو بەڵکوو گویٚرەکە وشتریٚکی میٚی یەك ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لیٚ وەردەگیریٚ لەگەڵ بیست درەم یا دوو مەڕ یا دوو بزن سەرباقی دا، وە هەر کەسیٚزەکاتەکەی دەیکردە گویٚرەکە وشتریٚکی میٚی یەك ساڵ بەڵام ئەمەی نەبوو بەڵکوو گویٚرەکە وشتریٚکی میٚی دوو ساڵەی هەبوو ئەوا ئەوەی لیٚ وەردەگیریٚ بەڵام زەکات سیٚنەکە بیست درەم یا دوو مەڕ یا دوو بزن سەرباقیی دەداتەوە، ئەگەر کەسیٚکیش گویٚرەکە وشتری میٚی یەك ساڵەی ریٚك و پیٚکی نەبوو بەڵام پاریٚنە وشتریٚکی نیٚرەی دوو ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لیٚ وەدەگیریٚ، سەر بەسەر بەبیٚ سەرباقی (ب/د/ن).

### ٦) مەرجی زەکاتی ئاژەڵ: (شرط زكاة المشية)

**١١٩٩– عَنْ أَنَسٍ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ** (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) **كَتَبَ لَهُ الصَّدَقَةَ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ رَسُولَهُ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **وَلاَ يُخْرَجُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ، وَلاَ ذَاتُ عَوَارٍ، وَلاَ تَيْسٌ، إِلاَّ مَا شَاءَ الْمُصَدِّقُ. رَوَاهُ الخَمْسَة إلا مسلماً[1].**

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: ئەو زەکاتەی کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **بەفەرمانی خودا دایناوە لەسەر موسوڵمانان ئەبو بەکر** (خودای لێ رازی بێ) **بۆی نوسیمەوە کە: پیری ددان لە دەما نەماوو ئاژەڵی زەدەدار نادرێن بە زەکات، هەر وا سابرێنو بەرانیش، مەگەر بە ئارەزووی زەکاتدەر خۆی (ب/د/ت/ن).**

**١٢٠٠– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُعَاوِيَةَ الْغَاضِرِيِّ** (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) **عَنْ النَّبِيِّ قَالَ:** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **ثَلاَثٌ مَنْ فَعَلَهُنَّ فَقَدْ طَعِمَ طَعْمَ الإِيمَانِ مَنْ عَبَدَ اللَّهَ وَحْدَهُ وَأَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَعْطَى زَكَاةَ مَالِهِ طَيِّبَةً بِهَا نَفْسُهُ رَافِدَةً عَلَيْهِ كُلَّ عَامٍ وَلاَ يُعْطِي الْهَرِمَةَ وَلاَ الدَّرِنَةَ وَلاَ الْمَرِيضَةَ وَلاَ الشَّرَطَ اللَّئِيمَةَ وَلَكِنْ مِنْ وَسَطِ أَمْوَالِكُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَسْأَلْكُمْ خَيْرَهُ وَلَمْ يَأْمُرْكُمْ بِشَرِّهِ. رَوَاهُ أبو داود والطبراني[2].**

**عەبدوڵڵای کوڕی موعاوییەی ئەل–غاضیری** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەوەی ئەم سێ شتە بکا بەراستی چێژو تامی ئیمانو باوەڕ دەچێژێ:**

**یەکەم: هەر خودا بپەرستێو بەتاقو تەنیای بزانێو شایەتی بدا کە هەر خودا خودایەو خودای تر نیە.**

**دووەم: هەموو ساڵێ بە دڵێکی پاکی بێگەردەوە زەکاتی ماڵەکەی بداتو بیکات بە کۆمەکی بۆ خۆی.**

---

[1] بخاري. زكاة: ١٤٥٥.

[2] بسند صالح (شرحه)

**سێیەم:** پیری بێ ددان و گەڕۆڵ و نەخۆش و وردیلانەی ئایەخ و ئاژەڵی مێگوان و کەم شیر نەدات لە زەکاتدا، بەڵکوو لە ناونجی ماڵەکانتان زەکات دەرکەن، چونکە خودای گەورە هەروەك ئەیفەرمووە باش و نایابی ماڵەکانتان بدەن بە زەکاتا پێشی نەگوتوون کە لە خراپ و ئایەخەکەی زەکات بدەن! (د/طبراني - سند صالح).

**١٢٠١-** عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمْ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِي كُلِّ سَائِمَةِ إِبِلٍ فِي أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ وَلاَ يُفَرَّقُ إِبِلٌ عَنْ حِسَابِهَا مَنْ أَعْطَاهَا مُؤْتَجِرًا بِهَا فَلَهُ أَجْرُهَا وَمَنْ مَنَعَهَا فَإِنَّا آخِذُوهَا وَشَطْرَ مَالِهِ عَزْمَةً مِنْ عَزَمَاتِ رَبِّنَا عَزَّ وَجَلَّ لَيْسَ لآلِ مُحَمَّدٍ مِنْهَا شَيْءٌ. رَوَاهُ أَبو داود والنسائي[٣].

بەهزی کوڕی حەکیم لە باوکیەوە لە باپیریەوە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە هەموو چل سەر وشترێ کە بە دەمی خۆیان لە لەوەڕی دەشت و دەر بلەوەڕێن، گوێرەکە وشترێکی دوو ساڵەی مێچکەیان زەکات لێ دەکەوێ، وە وشتر لە بابەتی خۆی جیا ناکرێتەوە وەك لە پێشەوە رۆیشت: کە نە ماڵی جیا کۆ دەکرێتەوەو نە ماڵی کۆش جیا دەکرێتەوە لە ترسی زەکات، یا مەبەست ئەمەیە کە نابێ پیر بە جیاو گەنج بە جیاو لەڕ بە جیاو قەڵەو بە جیا بژمێررێ، بەڵکوو رانەکە سەرجەم پێکەوە دەژمێررێ و زەکاتەکەی لە ناونجی دەدرێ جا هەرکەسێ بە تەمای پاداشی باش زەکاتەکەی بدات ئەوا بە پاداشی چاکی خۆی دەگا، وە ئەوەی بیەوێ کە نەیدا، ئەوا ئێمە خوا ناخوا زەکاتەکەی لێ دەسێنین لەگەڵ زیادەدا واتە: زەکاتەکەی بە زیادەوە لێ دەسێنین تا تەمێ خواربێ. زەکات فەرزێکە، وە خودای گەورەو سەردار داینــاوە، وە بەشی خزمان و کەس و کاری موحەممەدی پێوە نیە (د/ن-س/صالح).

---

[٣] بسند صالح (شرحه).

١٢٠٢- وَلِأَبِي دَاوُ مِنْ رِوَايَةِ عَلِيٍّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) وَفِي الْبَقَرِ فِي كُلِّ ثَلاَثِينَ تَبِيعٌ، وَفِي الأَرْبَعِينَ مُسِنَّةٌ، وَلَيْسَ عَلَى الْعَوَامِلِ شَيْءٌ[٤].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە رەشە ولاخ لە هەموو سیی سەرێ گوێرەکەیێ دەدرێ بە زەکاتەکەیدا، لە چلیش نێونێ دەدرێ، زیندەماڵی ئیشکەریش زەکاتی لێ ناکەوێ وەك گای جووتیو وشتری باری (د).

١٢٠٣- وَلِلشَّافِعِيِّ: لَيْسَ فِي الإِبِلِ وَالْبَقَرِ العَوَامِلِ صَدَقَةٌ[٥].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە وشترو رەشە ولاخی باریو جووتیو ئێشکەر زەکات ناکەوێ (شافیعی).

١٢٠٤- عَنْ مُعَاذٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) بَعَثَنِي رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ: خُذِ الْحَبَّ مِنَ الْحَبِّ وَالشَّاةَ مِنَ الْغَنَمِ وَالْبَعِيرَ مِنَ الإِبِلِ وَالْبَقَرَةَ مِنَ الْبَقَرِ. رَوَاهُ أبو داود والحاكم وصححه[٦].

موعاذ (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە ناردمی بۆ یەمەن پێی فەرمووم: دانەوێڵە لە زەکاتی دانەوێڵەدا وەربگرە" هەروا مەڕو بزن لە زەکاتی مەڕو بزنداو وشتر لە زەکاتی وشترداو رەشە ولاخ لە زەکاتی رەشە ولاخدا وەربگرە (د/حاکم:ص).

١٢٠٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنِ اسْتَفَادَ مَالاً فَلاَ زَكَاةَ عَلَيْهِ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ عِنْدَ رَبِّهِ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود.

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ ماڵێکی دەست کەوت زەکاتی لەسەر نیە تا ئەو ماڵە لەلای خاوەنەکەی ساڵێکی بەسەردا تێ دەپەڕێ (ت/د-س/ص).

---

[٤] سكت عنه.

[٥] صحيح عنه الحاكم.

[٦] صحيح عنده الحاكم.

## ٧) باسی چوارەم: باسی زەكاتی دانەوێڵەو میوە

## الباب الرابع: في زكاة الزروع

{قَالَ:اللهُ تَعَالَى – وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ}.

**خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەربارەی ماڵو دارایی دەفەرمویٚ: وە مافوهەقی خودای لیٚ بدەن لەو رۆژەدا كە درەو دەكریٚنو دەرامەیان وەردەگیریٚ، بەڵام دەستبلاٚوىو زیادەڕەوی مەكەن، بەراستی خودای گەورە دەستبلاٚوانو زیادەڕەوانی خۆش ناویٚ.**

١٢٠٦– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ. رَوَاهُ الخمسة[1].

**ئەم فەرموودەیە لە پیٚشەوە رۆیشت، لە بەرگی دوودا، لە زنجیرە (٢)دا، لە لاپەڕە (١٠) وە ژمارەی فەرموودەكە لەویٚ (٤)ە، وە لیٚرە ئەمەی زیاترە: وە چەن وشتریٚ كە لە پیٚنج سەر كەمتربن زەكاتیان لیٚ ناكەویٚ، وە زیویش لە پیٚنج ئۆقیە واتە: لە دوو سەد درەم كەمتر بیٚ زەكاتی لیٚ ناكەویٚ (ش/د/ت/ن).**

١٢٠٧– عَنْ جَابِرَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِيمَا سَقَتِ الأَنْهَارُ وَالْغَيْمُ الْعُشُورُ وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّانِيَةِ نِصْفُ الْعُشْرِ. رَوَاهُ الخمسة. وَفِي رِوَايَةٍ: فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالأَنْهَارُ وَالْعُيُونُ، أَوْ كَانَ بَعْلاً الْعُشْرُ وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّوَانِي أَوِ النَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ[2].

**جابیر (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: زەكاتی بەراوو دیٚمەكار دەیەكە، وە زەكاتی ئەوەی بە ولاٚخی چەرخ گیٚڕئاو**

---

[1] بخاري. زكاة: راجع: ١١٩٧/٤.

[2] بخاري. زكاة: ١٤٨٣ . مسلم. زكاة: ٢٢٦٩. أبو داود. زكاة: ١٥٩٧. نسائي. زكاة: ٢٤٨٨.

بدرێ بیست یەکە (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: ئەوەی بەباران و چەم و جۆگەو کانی و کارێز ئاو بدرێ، یاخود دێمی بێ، زەکاتەکەی دەیەکە، ئەوەشی کە بە ولاخی ئاو هەڵگوز، یاخود بەئاوکێش ئاو بدرێ زەکاتەکەی بیست یەکە.

## ٨) خەملاندنی باخی مێوو باخی خورما : (خرص العنب والنخل)

**١٢٠٨ – عَنْ عَتَّابِ بْنِ أَسِيدٍ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **أَنْ يُخْرَصَ الْعِنَبُ كَمَا يُخْرَصُ النَّخْلُ وَتُؤْخَذُ زَكَاتُهُ زَبِيبًا كَمَا تُؤْخَذُ زَكَاةُ النَّخْلِ تَمْرًا**[1].

عەتتابی کوڕی ئەسید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمانی داوە کە ڕەزیش وەك باخی خورما خەمڵ بکرێ، وە زەکاتەکەشی بە مێوژی وەربگیرێ، وەك چۆن زەکاتی باخە خورما بە خورمایی وەردەگیرێ! (د/ت/ن–س/ح).

**١٢٠٩– عَنْ سَهْلُ بْنُ حَثْمَةَ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: إِذَا خَرَصْتُمْ فَخُذُوا وَدَعُوا الثُّلُثَ فَإِنْ لَمْ تَدَعُوا أَوْ تَجِدُوا الثُّلُثَ فَدَعُوا الرُّبُعَ. رَوَاهُمَا أَصحاب السُّنن**[2].

سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ شتێکیان خەملکرد ئیتر لێی ببەن، بەلام سێ یەکێکی بهێڵنەوە تا زەکاتەکەی لێ دەردەکەن ئەگەر سێ یەکێکتان نەهێشتەوە دەبێ چواریەکی هەر بهێڵنەوە (د/ت/ن/حاکم:ص).

---

[1] رَوَاهُ أصحاب السُّنن بسند حسن (شرحه).

[2] رَوَاهُ أصحاب السُّنن والحاكم وصححه (شرحه).

١٢١٠- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَبْعَثُ ابْنَ رَوَاحَةَ إِلَى الْيَهُودِ فَيَخْرُصُ عَلَيْهِمُ النَّخْلَ حِينَ يَطِيبُ قَبْلَ أَنْ يُؤْكَلَ مِنْهُ ثُمَّ يُخَيِّرُ يَهُودَ يَأْخُذُونَهُ بِذَلِكَ الْخَرْصِ أَمْ يَدْفَعُوهُ إِلَيْهِمْ لِكَيْ تُحْفَظَ الزَّكَاةُ قَبْلَ أَنْ تُؤْكَلَ الثَّمَرَةُ وَتُفَرَّقَ. رَوَاهُ أَبو داود[٣].

جاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی دەنارد بۆ ناو جوولەکەکانی خەیبەر، ئەوکاتەی کە خورما خۆش دەبێ، جابەر لەوەی لێی بخۆن خورماکەی دەقەبلاندو خەملی دەکرد، ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) جوولەکەکانی دەکرد بەسەر پشك: یا بەو خەملە وەری بگرن، یا بیدەنە دەست موسوڵمانەکان بۆ ئەوەی زەکاتەکەی نەفەوتێ، بەر لەوەی بەرەکەی بخورێو بڵاوببێتەوە (د-سند موثق).

## ٩) زەکاتی زێڕو زیو: (زكاة الذهب والفضة)

١٢١١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): فِي الْكِتَابِ الَّذِي كَتَبَهُ لَهُ أَبُو بَكْرٍ حِينَ وَجَّهَهُ إِلَى الْبَحْرَيْنِ فِي الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْمُسْلِمِينَ: وَفِي الرِّقَةِ رُبُعُ الْعُشْرِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ إِلاَّ تِسْعِينَ وَمِائَةً فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا. رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ وَأَبو داود وَالنَّسائيُّ[١].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەبو بەکر (خودای لێ ڕازی بێ) کە ناردمی بۆ بەحرەین لەو زەکاتنامەیەدا کە بۆی نووسیم، لە بابەت ئەو زەکاتەوە کە خودا داینـاوە لەسەر موسوڵمانان ئەمەشی نووسیی: لە زیو چل یەك دەکەوێ، وە هەتا نەگاتە دوو سەد درەمیش زەکاتی لێ ناکەوێ، مەگەر خاوەنەکەی خۆی ئارەزووی هەبێ (ب/د/ن).

١٢١٢- (راجع رقم: ١٢١٣/١)[٢].

---

[٣] بسند موثق (شرحه).

[١] بخاري. زكاة: ١٤٥٤.

[٢] راجع رقم: ١٢٠٦/١.

**١٢١٣- عَنْ عَلِي** (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) **وَسَاقَ حَدِيثاً إِلَى أَنْ قَالَ: فَإِذَا كَانَتْ لَكَ مِائَتَا دِرْهَمٍ وَحَالَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ، وَلَيْسَ عَلَيْكَ شَيْءٌ حَتَّى يَكُونَ لَكَ عِشْرُونَ دِينَارًا، فَإِذَا كَانَتْ لَكَ عِشْرُونَ دِينَارًا وَحَالَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ فَفِيهَا نِصْفُ دِينَارٍ، فَمَا زَادَ فَبِحِسَابِ ذَلِكَ. رَوَاهُ أبو داود وصححه ألبخارى**[٣].

**عەلی** (خودای لێ رازی بێ) **فەرموودەیەکی گێڕایەوە لەو فەرموودەیەدا گوتی: زیو هەتا نەگاتە دوو سەد درەم زەکاتی لێ ناکەوێ، جا ئەگەر دوو سەد درەمت هەبوو وە ساڵیان بەسەردا هاتەوە، ئەوسا پێنج درەم زەکاتیان لێ دەکەوێ، زێڕیش هەتا نەگاتە بیست دیناری زێڕو ساڵیان بەسەردا تێ نەپەڕێ زەکاتی لێ ناکەوێ، ئەوسا نیو دینار زەکاتی لێ دەکەوێ، وە ئەوەشی لەمە زیاتر بوو بەم پێ و دانەیە (د/بوخاری بە صەحیحی داناوە).**

**١٢١٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: قَدْ عَفَوْتُ عَنِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ فَهَاتُوا صَدَقَةَ الرِّقَةِ مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا دِرْهَمَاً وَلَيْسَ فِي تِسْعِينَ وَمِائَةٍ شَيْءٌ فَإِذَا بَلَغَتْ مِائَتَيْنِ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالتِّرمِذِيُّ وَأَحْمَدُ**[٤].

**دیسان گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: لە زەکاتی بەرزەولاخ و کۆیلە، خۆش بووم بەلام لە هەموو چل درەمێ زیو یەك درەم زەکات بێنن، لە سەدو نەوەد درەم زەکاتی لێ ناکەوێ، تا دەبێ بە دوو سەد درەم ئەوسا پێنج درەم زەکاتی لێ دەکەوێ (د/ت/ئەحمەد).**

**١٢١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: الْعَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ. رَوَاهُ الخمسة إلا أَبَا داود**[٥].

---

[٣] حينما سأل الترمذي عن هذا الحديث البخاري صححه (شرحه).

[٤] سكت عنه.

[٥] بخاري. زكاة: ١٤٩٩. ٢٣٥٥، ٦٩١٢، ٦٩١٣، مسلم. حدود: ٤٤٤٠ — ٤٤٤٤. ترمذي. احكام: ١٣٧٧م. أبو داود. ركاز: ٣٠٨٥. نسائي. زكاة: ٢٤٩٤.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: چوار پێ و وەڵس ئەگەر شتێ زامار بکەن بەبێ سووچی خاوەنەکەیان خوێنی نیە، هەروەها کان و بیریش ئەگەر شتێکیان تێکەوت یا رمان بەسەریا خوێنی نیە، گەنجینەی کۆنی دۆزراوەش پێنجیەکی هی زەکاتە (ش/ت/ن).

١٢١٦- وَأَقْطَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِلاَلَ بْنَ الْحَارِثِ الْمُزَنِيَّ مَعَادِنَ الْقَبَلِيَّةِ مِنْ نَاحِيَةِ الْفُرْعِ، فَتِلْكَ الْمَعَادِنُ لاَ يُؤْخَذُ مِنْهَا إِلاَّ الزَّكَاةُ إِلَى الْيَوْمِ. رَوَاهُ مالك والشافعي وأبو داود[٦].

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کانەکانی قەبەلییەی (لەناوچەی فورع) بەش دا، بە بیلالی کوڕی حاریث، ئەو کانانە (هەتا ئەمرۆکەیش) جگە لە زەکات هیچی تریان لێ وەرناگیرێ (مالیك/شافیعی/د).

### ١٠) زەکاتی ماڵی بازرگانی: (زكاة عُروض التجارة)

١٢١٧- قَالَ اللهُ تَعَالَى: ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ. قَالَ مُجَاهِدٌ: نَزَلَتْ فِي التِّجَارَةِ)[١].

خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە! خەرج بکەن لە رێگەی خودادا لە پاك و حەڵاڵی ئەوە کە دەردەستی دەکەن لە کارو کاسبی دا.

موجاهید (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: ئەم ئایەتە لە بارەی زەکاتی شتومەکی بازرگانییەوە هاتۆتە خوارەوە.

---

[٦] سكت عنهُ.

[١] أثر صحيح (مترجم).

١٢١٨ – عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَأْمُرُنَا أَنْ نُخْرِجَ الصَّدَقَةَ مِنَ الَّذِى نُعِدُّ لِلْبَيْعِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٢].

**سەموورەی کوڕی جوندوب (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) گوتی: لەپاش ئەمە جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمانی پیٚ دەکردین کە زەکات بدەین لەو ماڵەی کە ئامادەمان کردووە بۆ فرۆشتن و بازرگانی (د–س/ح) واتە: ئەبو داوود (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) بە ئیسنادێکی جوان ئەم حەدیثەی ریوایەت کردووە.**

١٢١٩ – عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِى الإِبِلِ صَدَقَتُهَا، وَفِي الْغَنَمِ صَدَقَتُهَا وَفِي الْبَقَرِ صَدَقَتُهَا وَفِى الْبَزِّ صَدَقَتُهُ. رَوَاهُ الدارقطنى والحاكم وصححه[٣].

**ئەبو ذەڕ (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: وشترو مەڕو بزن و ڕەشە وڵاخ و کووتاڵ، هەرشتەی بەپێی خۆی زەکاتی لیٚ دەکەویٚ (دارە قوطنی/حاکم:ص).**

## ١١) باسی پێنجەم: باسی زەکاتی خشڵ و ماڵی هەتیوو زەکاتی هەنگوین

## الباب الخامس: في زكاة الحلي ومال اليتيم

١٢٢٠ – عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِي اللّهُ عَنهُمْ) أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهَا ابْنَةٌ لَهَا وَفِي يَدِ ابْنَتِهَا مَسَكَتَان غَلِيظَتَان مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ لَهَا: أَتُعْطِينَ زَكَاةَ هَذَا؟ قَالَتْ: لاَ. قَالَ: أَيَسُرُّكِ أَنْ يُسَوِّرَكِ اللّٰهُ بِهِمَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ سِوَارَيْنِ مِنْ نَارٍ قَالَ: فَخَلَعَتْهُمَا فَأَلْقَتْهُمَا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَالَتْ: هُمَا لِلّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ وَلِرَسُولِهِ. رَوَاهُ اصحاب السنن. ولفظ الترمذي: رَأَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى

---

[٢] بسند حسن (شرحه).

[٣] صحيح عنه الحاكم.

أَيْدِيهِمَا سُوَارَاينِ مِنْ ذَهَبٍ فَقَالَ: أَتُؤَدِّيَان زَكَاتَهُ؟ قَالَتَا: لاَ، فَقَالَ لَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَتُحِبَّانِ أَنْ يُسَوِّرَكُمَا اللَّهُ بِسُوَارَيْنِ مِنْ نَارٍ، قَالَتَا: لاَ، قَالَ: فَأَدِّيَا زَكَاتَهُ[1].

عەمری كوڕی شوعەیب لە باوكیەوە لە باپیریەوە (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: ئافرەتێ خۆیو كچێكی هاتنە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) كچەكەی دوو بازنی زێڕی قەوی لە دەستابوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێی: ئایا زەكاتی ئەم بازنگانە دەدەی؟ گوتی نەء، فەرمووی: ئەی پێت خۆشە كە لە ڕۆژی قیامەتا خودا لەباتی ئەم دوو بازنە دوو بازنی ئاگرینت بۆ بكا؟ گوتی: ئەویش هەردوو بازنەكەی داكەندو هەڵیدان بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وە گوتی: ئەوا هەردوكیانم بەخشی بە خوداو پێغەمبەری خودا (د/ت/ن) گفتەی (ت): پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە دەستیانا دوو بازنی زێڕی دی، فەرمووی: ئایا زەكاتی دەدەن؟ گوتیان: نەء، پێی فەرموون: ئەی حەزدەكەن كە خودا دوو بازنی ئاگرینتان بۆ بكا؟ گوتیان نەء فەرمووی كەواتە زەكاتەكەی بدەن.

١٢٢١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كُنْتُ أَلْبَسُ أَوْضَاحًا مِنْ ذَهَبٍ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكَنْزٌ هُوَ فَقَالَ: مَا بَلَغَ أَنْ تُؤَدَّى زَكَاتُهُ فَزُكِّيَ فَلَيْسَ بِكَنْزٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والحاكم وصححه[2].

ئەممو سەلەمە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: دوو سێ خڕخاڵی زێڕم لەپێدا بوون بە پێغەمبەرم گوت: ئەمانەیش بە گەنج (كەنز) دەژمێردریت؟ فەرمووی: ئەگەر گەییشتە حەددی زەكاتو زەكاتی لێ درا بە كەنز حسێب ناكرێو خاوەنەكەی بەر هەڕەشە سامناكەكەی خوا ناكەوێ (بڕ: ١١٨٢/١ ز- ٤) (د/حاكم:ص).

---

[1] سنده صحيح عند ابن القطان، وضعيف عند الترمذي (شرحه).

[2] صحيح عند الحاكم.

١٢٢٢- عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) أَنَّهُ كَانَ يُحَلِّى بَنَاتِهِ وَجَوَارِيَهُ بِالذَّهَبِ، ثُمَّ لاَ يُخْرِجُ مِنْهُ الزَّكَاةَ. رَوَاهُ مالك والشافعي[٣].

نافیع گوتی: جاران ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) خشڵی زێڕی بۆ کچەکانی و بۆ کەنیزەکەکانی دەکرد، وە زەکاتیشی لێ دەر نەدەکردن (مالیك/شافیعی. رەحمەتی خودایان لێبێ).

١٢٢٣- عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً يَسْأَلُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللّٰهِ عَنِ الْحُلِيِّ أَفِيهِ الزَّكَاةُ؟ قَالَ: لاَ قَالَ: وَإِنْ كَانَ يَبْلُغُ أَلْفَ دِينَارٍ؟ قَالَ: إِنْ كَثُرَ. رَوَاهُ الشافعي والبهقي[٤].

عەمری کوڕی دینار (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: گوێم لێبوو پیاوێ بۆ خشڵ لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵای پرسی گوتی: ئایا زەکاتی لێ دەکەوێ؟ گوتی: نەء، گوتی: با بگاتە هەزار دیناری زێڕیش؟ گوتی: با زۆریش بێ هەر زەکاتی لێ ناکەوێ (شافیعی/بەیهەقی).

## ١٢) زەکاتی ماڵی هەتیو: (زكاة مال اليتيم)

١٢٢٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمْ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: أَلاَ مَنْ وَلِيَ يَتِيمًا لَهُ مَالٌ فَلْيَتَّجِرْ فِيهِ وَلاَ يَتْرُكْهُ حَتَّى تَأْكُلَهُ الصَّدَقَةُ. رَوَاهُ الترمذي والشافعي والدارقطني[١].

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە لە باپیریەوە (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دووانی دەدا بۆ مەردوم فەرمووی: ئاگاداربن

---

[٣] سكت عنه الشارح

[٤] سكت عنه الشارح.

[١] بسند ضعيف ولكن مؤيد بالنصوص السابقة (شرحه).

هـەر کەسـێ بـوو بـە سەرپەرشـتی هـەتیویێ و ئـەو هـەتیوە مـاڵی هـەبوو، بـا مامەڵەو سەودای پێوە بکا تا ئەو ماڵە نەش و نما بکا وە هـەروا نەیهێڵێتـەوە تا بەرە بەرە زەکات تەواوی دەکات (ت/شافیعی/دارە قوطنی-سند ضعیف).

١٢٢٥- عَنْ الْقَاسِمِ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَتْ عَائِشَةُ تَلِينِي وَأَخًا لِي يَتِيمَيْنِ فِي حَجْرِهَا فَكَانَتْ تُخْرِجُ مِنْ أَمْوَالِنَا الزَّكَاةَ. رَوَاهُ الشافعي[٢].

قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبو بەکر، کە برازای عائیشە بوو، (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران عائیشە سەرپەشتی من و دوو برای ترمی دەکرد، کە هەردووکیان هەتیوبوون و لەژێر سەرپەرشتی خۆی دابوون، وە زەکاتی لە ماڵەکانمان دەردەکرد (شافیعی).

## ١٣) زەکاتی هەنگوین: (زكاة العسل)

١٢٢٦- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمْ) قَالَ: جَاءَ هِلَالٌ - أَحَدُ بَنِي مُتْعَانَ - إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِعُشُورِ نَحْلٍ لَهُ وَكَانَ سَأَلَهُ أَنْ يَحْمِيَ لَهُ وَادِيًا يُقَالُ لَهُ سَلَبَةُ فَحَمَى لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا وُلِّيَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) كَتَبَ لَهُ عَامِلُهُ: سُفْيَانُ بْنُ وَهْبٍ يَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ فَكَتَبَ لَهُ عُمَرُ: إِنْ أَدَّى إِلَيْكَ مَا كَانَ يُؤَدِّي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ عُشُورِ نَحْلِهِ لَهُ فَاحْمِ لَهُ سَلَبَةَ وَإِلاَّ فَإِنَّمَا هُوَ ذُبَابُ غَيْثٍ يَأْكُلُهُ مَنْ يَشَاءُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي الطبراني[١].

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە لە باپیرییەوە (خوایان لێ رازی بێ) گـوتی: هـیلال (کـە پیـاوێ بـوو لـە خێڵـی بـەنی موتعـان) دەیـەکی هـەنگوینی هەنگوژاڵەکەی خۆیی بە زەکات دەهێنا بۆ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) چونکە داوای لە پێغەمبەر کردبوو کە هەنگەژاڵەکەی شیوی سەلەبەی بۆ قەدەغە بکا،

---

[٢] سكت عنهُ الشارح.

[١] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ بسندٍ صالح (شرحه).

ئەویش بۆی قەدەغە کردبوو، جا حەڵ کە عومەری کوڕی خەططاب بوو بە فەرمانڕەوا، سوفیانی کوڕی وەهب (کە سەرکاری عومەر بوو نامەی بۆ نووسی و لە بارەی ئەم هەنگەژاڵەوە لێی پرسی، عومەریش وەڵامی بۆ نووسییەوە: ئەگەر دەیەکی هەنگوینی هەنگەژاڵەکەی بە زەکات دەدا بەتۆ وەك جاران دەیدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوا تۆش هەنگەژاڵەکەی دۆڵی سەلەبەی بۆ قەدەغە بکە، ئەگینا ئەوە مێشەبارانەیەو هەر کەس حەزکا دەیخوات (د-سند صالح-ن/طەبەرانی).

١٢٢٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِي الْعَسَلِ فِي كُلِّ عَشَرَةِ أَزُقِّ زِقٌّ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود. ولفظه: مِنْ كُلِّ عَشْرِ قَرب قَرْبَةٌ[٢].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە هەنگوین لە هەموو دەهیزۆڵکەیەك هیزۆڵکەیەك زەکاتی لێ دەکەوێ (ت-سند ضعیف-د-سند صالح) گفتەی (د): لە گشت دەکوندەیەك کوندەیەکی لێ دەکەوێ.

دانەر (خودای لێ رازی بێ) لەشەرحەکەدا دەڵێ: ئەحمەدو ئیبنو ماجە (خوایان لێ رازی بێ) ریوایەتیان کردووە: ئەبو سەییارە (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: چووم بۆلای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خودا! من هەنگم هەیە؟ فەرمووی: دەیەکەکەی بدە گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! هەڵەت و هەردەکەیم بۆ قەدەغە بکە. گوتی: ئەویش بۆی قەدەغە کردم.

## ١٤) باسی شەشەم: باسی سەرفترە
## الباب السادس: في زكاة الفطر

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّى، وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى}.

بە ڕاستی لە ئاگر رزگار دەبێ کەسێ کە لەگیانی خۆیدا پاك بێ و تێکۆشێ بۆ پاککردنەوەی دەروونی خۆی لەبیرو خەیاڵ و رەوشتی بەد،

---

[٢] رواه الترمذي بسند ضعيف وَرَوَاه أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

ئەمەیش بەوە دەبێ کە هەمیشە ناوی خودای لەسەر زمان بێ و زەکات دەرکاو سەرفترە بداو نوێژی فەرزو سوننەت بکا.

١٢٢٨- عَنْ كَثِيرِ بَنِ عَبْدِ اللهِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِي اللهُ عَنهُمْ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَئِلَ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ فَقَالَ: نُزِلَتْ فِي زَكَاةِ الْفِطْرِ. رَوَاهُ ابن خزيمَةَ[1].

کەثیری کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکیەوە لە باپیریەوە (خوایان لێ رازی بێ) بۆ ئەم ئایەتە لە حەزرەتیان پرسی فەرمووی: لە بارەی زەکاتی سەرفترەوە هاتۆتە خوارەوە! (ئیبنو خوزەیمە).

١٢٢٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ مَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلاَةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلاَةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن ماجه والحاكم وصححه[2].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سەرفترەی داناوە هەتا رۆژووەوان پاك بكاتەوە لە ماکی قسەی پڕوپووچ و هەرزەگۆیی، وە هەتا بشبێت بە خۆراکی جەژنی هەژاران، جا ئەوەی لە پێش نوێژی جەژندا بیدات ئەوە زەکاتێکی گەلێ پەسەندە، وە ئەوەیشی لەپاش نوێژی جەژن بیدات ئەوە خێرێکە لە خێرەکان (د/ئیبنو ماجە/ حاکم:ص).

## ١٥) ئەندازەی سەرفترە مەنێکە بەمەنی مەدینە

## قدر زكاة الفطر صاع بكيل المدينة

١٢٣٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ، وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى،

---

[1] سكت عَن درجته الشارح.

[2] صحيح عند الحاكم.

وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ. رَوَاهُ الخمسة[1].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **مەنێ خورما، یا مەنێ سەرفترەی دانا لەسەر هەموو موسوڵمانێ، ئیتر بەندە بی یا ئازاد، نێرینە بێ یا مێینە گەورە بێ یا بچووك، وە فەرمانیشی کرد: کە لەپێش ئەوەدا مەردووم بڕۆن بۆ نوێژی جەژن سەرفترەکە بدەن (ش/د/ت/ن- خۆشنوودی خودایان لێبێ).**

١٢٣١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا نُعْطِيهَا فِي زَمَانِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ فَلَمَّا جَاءَ مُعَاوِيَةُ وَجَاءَتِ السَّمْرَاءُ قَالَ: أُرَى مُدًّا مِنْ هَذَا يَعْدِلُ مُدَّيْنِ. رَوَاهُ الخمسة. وَفِي رِوَايَةٍ: حَتَّى قَدِمَ عَلَيْنَا مُعَاوِيَةُ حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا فَكَلَّمَ النَّاسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَكَانَ فِيمَا كَلَّمَ بِهِ النَّاسَ أَنْ قَالَ: إِنِّي أُرَى أَنَّ مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ تَعْدِلُ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ. قَالَ: أَبُو سَعِيدٍ: فَأَمَّا أَنَا فَلاَ أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَذَلِكَ[2].

**ئەبو سەعید** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەر خۆیدا** (درودی خودای لەسەربێ) **مەنێ خۆراکمان لەباتی سەرفترە دەدا، وەك: مەنێ خورما، یا مەنێ جۆ، یا مەنێ مێووژ، یا مەنێ کەشك، بەڵام کە موعاییەهات، گەنم پەیدا بوو، گوتی: وا دەزانم کە مشتێ واتە: لە گەنم هاوتای دوو مشت لە خۆراکی تر دەکا (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: تا موعاوییە هات بۆ ناومان، یا بۆ حەج هاتبوو یا بۆ عەمرە، گەنمیش پەیدا بوو بوو، جا لەسەر دوانگە قسەی بۆ مەردوم کرد، یەکێك لە قسەکانی ئەمەبوو: من وا دەزانم کە مستێ**

---

[1] بخاري. صدقة الفطر: ١٥٠٣، ١٥٠٤، ١٥٠٧، ١٥٠٩، ١٥١١، ١٥١٢. مسلم. زكاة: ٢٢٧٥ — ٢٢٨٤. أبو داود. زكاة: ١٦١١. ترمذي. زكاة: ٦٧٦. نسائي. زكاة: ٢٥٠١، ٢٥٠٢.

[2] بخاري. صدقة الفطر: ١٥٠٦. مسلم. زكاة: ٢٢٨٠ — ٢٢٨٤. أبو داود. زكاة: ١٦١٦. ترمذي. زكاة: ٦٧٣. نسائي. زكاة: ٢٥١٠.

لەم گەنمەی شام هاوتای مەنێ خورما دەکا. ئیتر خەڵکیش ڕەفتاریان بەم قسەیەی ئەو کرد، ئەبو سەعید دەیگوت: بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم هێشتا هەر وەك جاران مەنێ دەدەم.

١٢٣٢- عَنِ الْحَسَنِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: خَطَبَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) فِي آخِرِ رَمَضَانَ عَلَى مِنْبَرِ الْبَصْرَةِ فَقَالَ: أَخْرِجُوا صَدَقَةَ صَوْمِكُمْ فَكَأَنَّ النَّاسَ لَمْ يَعْلَمُوا فَقَالَ: مَنْ هَا هُنَا مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ قُومُوا إِلَى إِخْوَانِكُمْ فَعَلِّمُوهُمْ فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَذِهِ الصَّدَقَةَ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ شَعِيرٍ أَوْ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ قَمْحٍ عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ مَمْلُوكٍ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى صَغِيرٍ أَوْ كَبِيرٍ فَلَمَّا قَدِمَ عَلِيٌّ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) رَأَى رُخْصَ السِّعْرِ قَالَ: قَدْ أَوْسَعَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَلَوْ جَعَلْتُمُوهُ صَاعًا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنَسائِي[٣].

حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) گوتی: ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) لە دوا دوایی ڕەمەزانا لەسەر دوانگەکەی (بەصرە) وتارێ دەدا دەڵێ: سەرفترەی سەرتان بدەن. وەك بڵێیت خەڵکەکە ئەمە نەزانن وا دەبێ، جا بۆیە دەڵێ: خەڵکی مەدینە کێ لێرەیە هەڵسن بچن بەلای برا موسوڵمانەکانتانەوە، فێری سەرفترەیان بکەن، چونکە وا دیارە کە هێشتا ئەمانە نەیانزانیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم سەرفترەیەی، لەسەر هەموو موسوڵمانێ داناوە: ئیتر ئازاد بێ یا کۆیلە، نێرینە بێ یا مێیینە، بچووك بێ یا گەورە، دایناوە لەسەر گشت موسوڵمانێ کە مەنێ خورما، یا مەنێ جۆ، یا نیومەن گەنم سەرفترە بدات، بەڵام کە عەلی هات، تەماشای کرد هەرزانییە گوتی: خودا هەرزانی تێ خستوون، خۆزگە لە هەموو شتێ یەك مەنتان دەدا (د/ن).

١٢٣٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْوَزْنُ وَزْنُ أَهْلِ مَكَّةَ وَالْمِكْيَالُ مِكْيَالُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ. رواه النسائي وأبو داود[٤].

---

[٣] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ. قال صاحب التنقيح: رواته ثقات مشهورون، ولكنه مرسل (شرحه).

[٤] في البيوع بسند صحيح (شرحه).

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بۆ کێشان سەنگی خەڵکی مەککەو بۆ پێوانیش عەیارەی مەدینە تەواوو پەسەندە (ن/د-س/ص).

## ١٦) دروستە زەکات پێش بخرێ، هەر وەك دروستە بدرێ بە هەژارانی شوێنێکی تر : (یجوز تعجیل الزکاة، کما یجوز نقلها)

١٢٣٤- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ الْعَبَّاسَ سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي تَعْجِيلِ صَدَقَةِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ، فَرَخَّصَ لَهُ فِي ذَلِكَ. رَوَاهُ أبو داود والترمذي. وَفِي رِوَايَةٍ: أَنَّهُ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِعُمَرَ:إِنَّا قَدْ أَخَذْنَا زَكَاةَ الْعَبَّاسِ عَامَ الأَوَّلِ لِلْعَامِ[1].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: عەبباس لە پێغەمبەری پرسی (دروودی خودای لەسەربێ): دروستە زەکات دەربکەم پێش ئەوەی کاتی خۆی دابێ؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی ئەوەی دا کە زوو پێش هاتنیکاتی بیدات (د/ت) لە گێرانەوەیەکدا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە عومەری فەرموو: لە پارەوە زەکاتی ئەمساڵمان لە عەبباس وەرگرتووە.

١٢٣٥- وَلِلْبُخَارِيِّ: كَانَ النَّاسُ يُعْطُونَها قَبْلَ الْعِيدِ بِالْيَوْمِ وَالْيَوْمَيْنِ[2].

گوتی: جاران خەڵك لە پێش جەژنا، بە رۆژێ دوو رۆژ، سەرفترەیان دەدا (ب. رەحمەتی خودای لەسەربێ).

١٢٣٦- وَبَعَثَ اَحَدُ الأُمَرَاءِ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ عَلَى الصَّدَقَةِ فَلَمَّا رَجَعَ قَالَ: الأَمِيرُ: أَيْنَ الْمَالُ؟ قَالَ: عِمْرَانُ وَلِلْمَالِ أَرْسَلْتَنِي، أَخَذْنَاهَا مِنْ حَيْثُ كُنَّا نَأْخُذُهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَوَضَعْنَاهَا حَيْثُ كُنَّا نَضَعُهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وسعيد بن منصور بسند صحيح[3].

---

[1] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ مسندا ومرسلا وإرساله أصح (شرحه).

[2] بخاري. زكاة: ١٥١١.

[3] راجع نص آخر الحديث (بسند صحيح).

یەکێ لە فەرمانڕەواکان، عیمرانی کوڕی حوصەینی کرد بە سەرکاری سەرزەکاتو ناردی بۆ شوێنێ، جا کە عیمران گەڕایەوە، فەرمانڕەواکە گوتی: کوا ماڵەکە؟ واتە: ئەو ماڵی زەکاتەی کۆت کردۆتەوە کوا لە کوێیە؟ عیمرانیش گوتی: بۆچی تۆ منت بۆ ماڵ هاوردن ناردبوو! چۆن بە سەرینی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە کوێ زەکاتەکەمان وەردەگرت هەر لەو شوێنەیش دەمان دایەوە بە هەژارانی ئەوێ، ئێستاش وامان لێ کردەوە (د/سەعیدی کوڕی مەنصور —س/ص).

١٢٣٧– عَنْ أَبِي هِلَالٍ الثَّقَفِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: كِدْتُ أَنْ أُقْتَلَ بَعْدَكَ فِي عَنَاقٍ أَوْ شَاةٍ مِنَ الصَّدَقَةِ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَوْلَا أَنَّهَا تُعْطَى فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ مَا أَخَذْتُهَا. رَوَاهُ النسائي[٤].

ئەبو هیلالی ثەقەفی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: لە پاش تۆ خەریك بوو لەسەر گێسکێ یا لەسەر مەڕێ بمکوژن، کە هی زەکاتیش بوو، بۆ من نەبوو پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەدرێ بە هەژارانی کۆچکاران ئەگینا وەرم نەدەگرتو لێرەوە نەم دەبرد بۆ مەدینە (ن).

## ١٧) دەستووری زەکاتدەرو زەکاتوەرگر: (آداب المطي والآخذ)

١٢٣٨– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَتِيكٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: سَيَأْتِيكُمْ رَكْبٌ مُبَغَّضُونَ فَإِذَا جَاءُوكُمْ فَرَحِّبُوا بِهِمْ وَخَلُّوا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَبْتَغُونَ فَإِنْ عَدَلُوا فَلِأَنْفُسِهِمْ وَإِنْ ظَلَمُوا فَعَلَيْهَا وَأَرْضُوهُمْ فَإِنَّ تَمَامَ زَكَاتِكُمْ رِضَاهُمْ وَلْيَدْعُوا لَكُمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[١].

---

[٤] سكت عنه.

[١] بسند فيه ثابت بن قيس وثقه الإمام أحمد (شرحه).

جابیری کوڕی عەتیك (خودای لێ ڕازی بێ) لەباوکیەوە لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەستەیەکی ئێسك قورس دێنە لاتان (بۆ زەکات کۆکردنەوە) کە هاتن خۆش هاتنیان بکەن و چییان دەوێ دەست مەهێننە ڕێیان، چونکە ئەگەر ڕاست و دروست بن بۆ خۆیان باشە، ئەگەر ناهەقی و بێ دادیش بکەن لە خۆیانی دەکەن، وەرازیشیان بکەن چونکە ڕەزای ئەوان نیشانەی تەواویی زەکاتەکەتانە! وە با، ئەوانیش بیکەن بە دەستوور نزای باشتان بۆ بکەن (ئەبو داوود – ڕەزای خودای لێبێ – ئەم حەدیثەی گێڕاوەتەوە).

١٢٣٩– عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: شَكَا الأَعْرَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: إِنَّ نَاسًا مِنَ الْمُصَدِّقِينَ يَأْتُونَنَا فَيَظْلِمُونَنَا. قَالَ: فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ارْضُوا مُصَدِّقِيكُمْ. قَالَ: جَرِيرٌ مَا صَدَرَ عَنِّي مُصَدِّقٌ مُنْذُ سَمِعْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلاَّ وَهُوَ عَنِّي رَاضٍ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[٢].

جەریری کوڕی عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: عارەبە دەشتەوانەکان لەلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سکالایان کرد، گوتیان: کەسانێك دێنە لامان زەکات کۆ دەکەنەوە، ناهەقیمان لێ دەکەن، ئەویش فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): کارگوزاری زەکاتەکانتان ڕازی بکەن. جەریر گوتی: ئەوەتای ئەمەم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بیستووە، هیچ سەرکارێکی زەکاتم بەڕێ نەکردووە کە لێم نارازی بێ (م/د/ت/ن).

وَلَفظُ التِّرْمِذِيِّ: إِذَا أَتاكُمُ الْمُصَدِّقَ فَلاَ يُفارِقَنَّكُمْ إِلا عَنْ رِضاً

گفتەی (ت): کارگوزاری زەکات کە دێ بۆ لاتان بە خۆشی بەڕێیان بکەن.

١٢٤٠– عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمْ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ جَلَبَ وَلاَ جَنَبَ وَلاَ تُؤْخَذُ صَدَقَاتُهُمْ إِلاَّ فِي دُورِهِمْ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٣].

---

[٢] مسلم. زكاة: ٢٢٩٥. أبو داود زكاة: ١٥٨٩. نسائي. زكاة: ٢٤٥٩.

[٣] بسند صحيح (شرحه).

عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیرییەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئاژاڵ نابرێ بۆ لای زەکات کۆکەرەوە، تا بەشەزەکاتی لێ جیا بکاتەوە، بەڵکوو هەموو کەسێ زەکاتەکەی لە ماڵی خۆیا لێ وەردەگیرێ (د/ت/ن-س/ص).

١٢٤١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ أَبِي مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِمْ قَالَ: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ فُلاَنٍ، فَأَتَاهُ أَبِي بِصَدَقَتِهِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٤].

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: باوکم یەکێك بوو لە دەستەی ئەصحابول شەجەرە (هاوڕێیانی دەرەختەکە) کە لەژێر شێخەڵەکەدا: لەژێر دارە سەموورەکەدا، لە حودەیبیەدا، پەیمانی خۆشنوودیی (بیعة الرضوان) یان لەگەڵ پێغەمبەردا بەستبوو پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری وابوو کە کەسێ زەکاتی خۆی بۆ دەهێنا دەیفەرموو: {للهُمَّ صُلِّ عَلَى آل فُلانِ}: خودایە! ڕەحمەت بڕێژە بەسەرخانەوادەی فیسارە کەسدا، جا باوکیشم کە زەکاتەکەی خۆی بۆی برد فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): {اللّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أبِي أوْفَى} خودایە! ڕەحمەت بڕێژە بەسەر خانەوادەی ئەبو ئەوفادا! (ش/د/ن).

١٢٤٢- وَلَهُ وَلأَبِي دَاوُدَ: الْمُعْتَدِي فِي الصَّدَقَةِ كَمَانِعِهَا[٥].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: درێغی کەریش لە دانی زەکاتا وەك زەکات نەدەر وایە (ت/د).

---

[٤] بخاري. زكاة: ١٤٩٧، ٤١٦٦، ٦٣٣٢، ٦٣٥٩. مسلم. زكاة: ٢٤٨٩. أبو داوُد. زكاة: ١٥٩٠. نسائي. زكاة: ٢٤٥٨.

[٥] سكت عن درجته الشارح.

١٢٤٣- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْعَامِلُ عَلَى الصَّدَقَةِ بِالْحَقِّ كَالْغَازِى فِى سَبِيلِ اللَّهِ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ. رَوَاهُ الترمذي وحسنه[٦].

رافیعی کوڕی خەدیج (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سەرکاری ڕاست و دروستی سەر زەکات لە پایەی خەباتگێڕی ڕێگەی خودا دایە، تا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی (ت: ح: واتە: تیرمیذی ئەم حەدیثەی گێڕاوەتەوەو لە هەمان کاتا بە حەدیثێکی حەسەنی داناوە).

## ١٨) باسی حەوتەم: باسی ئەو کەسانە کە زەکات و سەرفترەیان پێ دەشێ، وەکێ پێی ناشێ:

## الباب السابع: فيمن تحل له الزكاة والصدقة ومن لا تحل

قَالَ اللهُ تَعَالى: {إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ}.

خودای گەورە خۆی زەکاتی داناوە بۆ ئەم هەشت کۆمەڵە لە موسوڵمانان.

یەکەم: هەژاران.

دووەم: میسکین و بێ نەوایان.

سێیەم: کارگوزەرانی سەر زەکاتەکە خۆی.

چوارەم: نۆموسوڵمان و ئەو کەسانەی کە ئومێدی سوودی ئیسلامیان لێ دەکرێ، بەو ماڵی زەکاتە دڵنەوایی دەکرێن.

[٦] حسن عند الترمذي.

**پێنجەم:** ئەو بەندانە کە پێویستیان هەیە بە ماڵو پارە بۆ ئازاد بوونیان.

**شەشەم:** قەرزاران.

**حەوتەم:** خەباتگێڕانو تێکۆشەرانی ڕێگەی خواد.

**هەشتەم:** ڕێبواران، وە خودا ئاگادارە بە هەموو شتێو خاوەن حیکمەتەو کار دروستە.

**١٢٤٤- وَجَاءَ رَجُلٌ يَسْأَلُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الصَّدَقَةِ. فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَرْضَ بِحُكْمِ نَبِيٍّ وَلاَ غَيْرِهِ فِي الصَّدَقَاتِ حَتَّى حَكَمَ فِيهَا هُوَ فَجَزَّأَهَا ثَمَانِيَةَ أَجْزَاءٍ فَإِنْ كُنْتَ مِنْ تِلْكَ الأَجْزَاءِ أَعْطَيْتُكَ حَقَّكَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[1].**

**پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) داوای زەکاتی لێ کرد، فەرمووی: سەربارەت بە ماڵی زەکات خودای گەورە نە بە حوکمی پێغەمبەرانو نە بە حوکمی کەسی تر رازی نەبووە، بەڵکوو بۆ خۆی ئەوەی بڕیارداوەو کردوویەتی بە هەشت بەشەوە، جا ئەگەر تۆ لەم خاوەن بەشانە بیت ئەوا هەقی خۆتت دەدەمێ (د-سند/صالح).**

**١٢٤٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا فَكَثُرَ دَيْنُهُ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ . فَتَصَدَّقَ النَّاسُ عَلَيْهِ فَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِغُرَمَائِهِ: خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ وَلَيْسَ لَكُمْ إِلاَّ ذَلِكَ. رَوَاهُ الترمذي بسند صحيح[2].**

**ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بە سەرینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێ هەندێ بەرو بوومی کڕی، بەرو بوومەکە تووشی ئافەت بوو و فەوتا، وە کابرا زۆر لە سەری قەرزاربوو. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: زەکاتی بدەنێ خەڵکەکەیش زەکاتیان دایە بەڵام بەشی دانەوەی**

---

[1] بسند صالح (شرحه).

[2] بسند صحیح.

قەرزەکانی نەکرد. پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) بە خاوەن قەرزەکانی فەرموو: ئەمەی هەیە وەری بگرن ئیتر هەر ئەوەتان دەکەوێ! (ت–س/ص).

١٢٤٦– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِى يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَان وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَان، وَلَكِن الْمِسْكِينُ الَّذِى لاَ يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ، وَلاَ يُفْطَنُ بِهِ فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ، وَلاَ يَقُومُ فَيَسْأَلُ النَّاسَ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٣].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەی لەسەربێ) فەرمووی: هەژاری بە راستی ئەوە نیە کە دەرگاو دەرگا دەکاو ماڵەوماڵ دەسووڕێتەوەو خەڵك خێری پێ دەکەن، لێرەو لەوێ بە پارووێ دوو پاروو، یا بە دەنکێ دوو دەنك خورما دەستی پێوە دەنێن، بەڵام هەژارای تەواو کە شایستەی زەکاتە ئەو کەسەیە کە خۆی ئەوەندەی دارایی نیە کە بەشی بکاو کەسیش پێی نازانێ تا زەکاتی بداتێو دەسگیرۆیی بکا، وە خۆشی لەبەر قەدر گرتنی خۆی ناچێ سواڵ لەمو لەو بکا! (ش/د/ن).

١٢٤٧– عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِق الْهِلاَلِيِّ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: تَحَمَّلْتُ حَمَالَةً فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَسْأَلُهُ فِيهَا فَقَالَ: أَقِمْ حَتَّى تَأْتِيَنَا الصَّدَقَةُ فَنَأْمُرَ لَكَ بِهَا. ثُمَّ قَالَ: يَا قَبِيصَةُ إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لاَ تَحِلُّ إِلاَّ لأَحَدِ ثَلاَثَةٍ: رَجُلٍ تَحَمَّلَ حَمَالَةً، فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَهَا ثُمَّ يُمْسِكُ وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ اجْتَاحَتْ مَالَهُ فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ – أَوْ قَالَ: سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ – وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ حَتَّى يَقُومَ ثَلاَثَةٌ مِنْ ذَوِى الْحِجَا مِنْ قَوْمِهِ لَقَدْ أَصَابَتْ فُلاَنًا فَاقَةٌ فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ – أَوْ قَالَ: سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ – فَمَا سِوَاهُنَّ مِنَ الْمَسْأَلَةِ يَا قَبِيصَةُ سُحْتًا يَأْكُلُهَا صَاحِبُهَا سُحْتًا. رَوَاهُ مسلم وأبو داود والنسائي[٤].

---

[٣] بخاري. تفسير: ٤٥٣٩، ١٤٧٩، ١٤٧٦. مسلم. زكاة: ٢٣٩٠. نسائي. زكاة:٢٥٧٠. رياض:٥٣٧/١٦ زنجيره: - ٥٧.

[٤] مسلم. زكاة: ٢٤٠١. ٢٤٠١. أبو داود. زكاة: ١٦٤٠. نسائي. زكاة: ٢٥٧٨، ٢٥٧٩، ٢٥٩٠، رياض: ٥٣٦/١٥ ز:٥٧

**قەبیصەی کوڕی موخاریقی هیلالی** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: باربوویەکم لە ئەستۆی خۆم گرتبوو واتە: چووبوومە ژێر چەردەیێ ماڵ کە بیدەم لە پێناوی ناوبژێکردنی دوو دەستەی ناکۆکا، ئینجا چوومە خزمەتی حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **وە داوای پیتاکم لێ کرد بۆ ئەم مەبەستە، فەرمووی: بمێنەرەوە تا زەکاتمان بۆ دێ، ئەوسا بەشت دەدەم لێی، ئنجا فەرمووی: ئەی قەبیصە! دە ڕۆزە دروست نیە، بۆ ئەم سێ کەسە نەبێ: بۆ پیاوێ دروستە کە چووبێتە ژێر ئەندازەیەك ماڵ بۆ کوژانەوەی ئاژاوەیەك، بۆ ئەمە دروستە کە ئەوەندە پیتاك کۆ بکاتەوە تا ئەو ئەندازەیە پەیدا دەکاو ئیتر دەبێ وازبێنێ، بۆ پیاوێکیش کە قۆرتێکی هاتبێ بە سەرداو هەژارکەوتبێ، بۆ ئەمیش دروستە ئەوەندە پیتاك کۆبکاتەوە تا گوزەرانی پێی دەچێ بەڕێوە یا فەرمووی: تا گوزەرانی پێ دەکا، بۆ پیاوێکیش کە سێ پیاوی هۆشیار (لە هۆزی خۆی) شایەتی بۆ بدەن کە فیسارەکەس هەژارو نابووت بووە، جا بۆ ئەمیش دروستە ئەوەندە باربوویی وەربگرێ تا گوزەرانی پێی دەچێ بەڕێوە. یا فەرمووی: تا گوزەرانی پێ دەکات، ئەی قەبیصە! ئیتر لەمانە بترازێ سواڵو دەرووزە ناڕەوایەو خاوەنەکەی بە ناڕەوایی دەیخوا (م/د/ن).**

**١٢٤٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو** (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ وَلاَ لِذِى مِرَّةٍ سَوِيٍّ[٥].**

**عەبدوڵلای کوڕی عەمر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: زەکات بەم دوو کەسە ناشێ: نە بە دەوڵەمەندو نە بە پیاوی لەش ساخی بەتوانا (د/ت/ن- أسانید حسنه).**

**١٢٤٩- عَنْ أَنَسٍ** (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: إِنْ الْمَسْأَلَةُ لاَ تَصْلُحُ إِلاَّ لِثَلاَثَةٍ: لِذِى فَقْرٍ مُدْقِعٍ، أَوْ لِذِى غُرْمٍ مُفْظِعٍ أَوْ لِذِى دَمٍ مُوجِعٍ[٦].**

---

[٥] بسند حسن (شرحه).

[٦] بسند حسن (شرحه).

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سواڵو دەرووزە هەر بۆ ئەم سێ کەسە دروستە: بۆ هەژاری رەش و رووت، وە بۆ قەرزاری بەرباد، وە بۆ کەسێ کە خوێنبایی بداتو بۆ ئەوە تەنگەتاو بووبێ و خۆی نەیبێ (د/ت/ن–س/ح).

١٢٥٠– عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سَأَلَ النَّاسَ وَلَهُ مَا يُغْنِيهِ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمَسْأَلَتُهُ فِي وَجْهِهِ خُمُوشٌ أَوْ خُدُوشٌ أَوْ كُدُوحٌ . قِيلَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ وَمَا يُغْنِيهِ قَالَ: خَمْسُونَ دِرْهَمًا أَوْ قِيمَتُهَا مِنَ الذَّهَبِ. رَوى هَذِهِ الثّلاثَه أَصحاب السُّنن[٧].

عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ بەشی خۆی هەبێو کەچی بچێ سواڵ لە خەڵك بکا لە رۆژی قیامەتا کە دێ بۆ دیوانی خوا ئەو سواڵە بە روویەوە دەبێ بە کونجرییو رووشاوییو رووکاوویی! گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! مرۆڤ چەندەی هەبێ بەشی دەکاو ئیتر نابێ سواڵ بکا؟ فەرمووی:: چل درەمی زیو یا بایی ئەوەندە زێڕی هەبێ (د/ت/ن–س/ح).

١٢٥١– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سَأَلَ وَلَهُ قِيمَةُ أُوقِيَّةٍ فَقَدْ أَلْحَفَ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَقَدْ سَأَلَ إِلْحَافًا فَقُلْتُ: نَاقَتِي الْيَاقُوتَةُ خَيْرٌ مِنْ أُوقِيَّةٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنَسَائي وأحمد[٨].

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ بایی ئۆقییەیەکی هەبێو لەگەڵ ئەوەشا سواڵو دەرووزە بکا ئەوە بە زۆر دەیسەنێو پێی حەرامە ئوقیەیە چل درەمی زیوە. لە گێڕانەوەیەکا: ئەوە بەزۆر سواڵ دەسەنێو گوێ بەو ئایەتە نادا کە دەفەرموێ: {لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا} واتە: وە داوای شت ناکەن لە خەڵك بە

---

[٧] بسند حسن (شرحه).

[٨] بسند موثق (شرحه).

تووڕکی. بۆیە دەڵێم: چۆن چۆنی بوێرم سواڵ بکەم خۆ هەر وشترەکەم (کە ناوی یاقووتەیە) بایی ئوقییەیەك زیاتر دەبێ، کە وابوو دەبێ بە بەشی خۆم قنیات بکەمو خەیاڵی سواڵکردن کە دەبێ بەهۆی ریسوایی لەدڵ دەرکەم، دەشێ کونجی قەناعەت بگرم نەك گەنجی قەباحەت وەربگرم (د/ن/ئەحمەد).

١٢٥٢- عَنْ سَهْلُ ابْنُ الْحَنْظَلِيَّةِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سَأَلَ وَعِنْدَهُ مَا يُغْنِيهِ فَإِنَّمَا يَسْتَكْثِرُ مِنَ النَّارِ. وَفِي رِوَايَةٍ: مِنْ جَمْرِ جَهَنَّمَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا يُغْنِيهِ؟ قَالَ: قَدْرُ مَا يُغَدِّيهِ وَيُعَشِّيهِ. وَفِي رِوَايَةٍ: أَنْ يَكُونَ لَهُ شِبَعُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن حبان وصححه[٩].

سەهلی کوڕی حەنظەلییە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی بەشی خۆی هەبێ و کەچی دەرووزە بکاو بۆ ماڵ کەچڵکی دەستی خەڵکە روو لەخلەو بلە بنێ، ئەوە ماڵ کۆ ناکاتەوە، وەك خۆی وا دەزانێ، بەڵکوو ئاگری دۆزەخ لە خۆی کەڵەکە دەکا! لە گێڕانەوەیەکا: پشکۆی دۆزەخ لەخۆی کەڵەکە دەکا گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! چەندی هەبێ مەعنای وایە کە بەشی خۆی هەیەو ئیتر بۆی دروست نیە کە سواڵ بکا؟ فەرمووی: ئەوەندەی ئەوەی هەبێ کە بەشی ژەمی بەیانی و ژەمی ئێوارەی بکا. لە گێڕانەویەکی تردا: تێرەخۆری رۆژوشەوێکی هەبێ (د/ئیبنو حەببان:ص).

١٢٥٣- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيّ إلاَّ لِخَمْسَةٍ: لِغَازٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ لِعَامِلٍ عَلَيْهَا أَوْ لِغَارِمٍ أَوْ لِرَجُلٍ اشْتَرَاهَا بِمَالِهِ أَوْ لِرَجُلٍ كَانَ لَهُ جَارٌ مِسْكِينٌ فَتُصُدِّقَ عَلَى الْمِسْكِينِ فَأَهْدَاهَا الْمِسْكِينُ لِلْغَنِيِّ. رَوَاهُ أبو داود وأحمد والحاكم وصححه[١٠].

---

[٩] صحيح عند ابن حبَّان.

[١٠] صحيح عند الحاكم (رحمه الله تعالى).

عەطای کوڕی یەسار (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: زەکات بە دەوڵەمەند ناشێ، مەگەر یەکێك بێ لەم پێنج کەسە: خەباتگێڕی ڕێگەی خودابێ، یا سەر کاری سەر زەکاتەکە بێ، یا قەرزاربێ، یا بە پارەی خۆی بیکڕێتەوە لە زەکات وەرگرێ یا کەسێ زەکات بدا بە هەژارێ، وە هەژارەکەش بە دیاریی بیداتەوە بە دراوسێیەکی دەوڵەمەندی خۆی (د/ئەحمەد/حاکم:ص).

## ١٩) زەکات بەخانەوادەی پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر و بە نۆکەرانی ئەوانیش ناشێ

## لا تحل الصدقة لآل بيت النبي ﷺ ومواليهم

١٢٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: أَخَذَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، فَجَعَلَهَا فِي فِيهِ، فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كِخْ كِخْ لِيَطْرَحَهَا ثُمَّ قَالَ: أَمَا شَعَرْتَ أَنَّا لاَ نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ. رَوَاهُ الشيخان ولمسلم: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّا لاَ تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی حەسەنی کوڕی عەلی دەنکێ خورمای زەکاتی هەڵگرت و نایە دەمیەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تێی خوڕی تا فڕێی بدا، فەرمووی: قخ قخ: یەع یەع ئینجا فەرمووی: چ عەجەب نازانی کە ئێمەی ئالوبەیتی موحەممەد، زەکات ناخۆین! (ش) لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا: ئەوە چۆن نازانی کە زەکات بە ئێمە ناشێ!

١٢٥٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَرَّ بِتَمْرَةٍ بِالطَّرِيقِ فَقَالَ: لَوْلاَ أَنْ تَكُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ لأَكَلْتُهَا. رَوَاهُ مسلم وأبو داود[2].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە سەرە ڕێ دەنکێ خورمای دۆزییەوە فەرمووی: نەبادا هی زەکات بێ، ئەگینا دەم خوارد (م/د- پڕ گۆڕەکانیان لە نوورو ڕەحمەت بێ).

---

[1] بخاري. زكاة: ١٤٩١. مسلم. زكاة: ٢٤٧٠، ٢٤٧١، رياض: ٢٩٨/١ ز:: ٣٨.

[2] مسلم. زكاة: ٢٤٧٦.

١٢٥٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) أُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِلَحْمٍ فَقُلْتُ: هَذَا مَا تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ. فَقَالَ: هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ، وَلَنَا هَدِيَّةٌ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٣].

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) گوتی: گۆشتیان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە بیخوات، پێم گوت: ئەم گۆشتە بەزەکات داویانە بە بەریرەی کارەکەرم، ئایا تۆ لێی دەخۆی؟ فەرمووی: ئەمە بۆ ئەو زەکاتە، بەلام بۆ ئێمە دەبێ بەدیاریی و لە زەکاتی دەردەچێ (ش/د/ن).

١٢٥٧- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أُتِيَ بِطَعَامٍ سَأَلَ عَنْهُ فَإِنْ قِيلَ هَدِيَّةٌ أَكَلَ مِنْهَا وَإِنْ قِيلَ صَدَقَةٌ لَمْ يَأْكُلْ مِنْهَا. رَوَاهُ الترمذي ومسلم[٤].

جاران نانیان دادەنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیپرسی، جا ئەگەر بگوترایە: هی دیارییە لێی دەخوارد، وەلێ ئەگەر بگوترایە: هی زەکاتە لێی نەدەخوارد! (ت/م).

١٢٥٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ الْهَاشِمِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) وَسَاقَ الْحَدِيثَ حَتَّى قَالَ: إِنَّ هَذِهِ الصَّدَقَاتِ إِنَّمَا هِيَ أَوْسَاخُ النَّاسِ وَإِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ وَلاَ لآلِ مُحَمَّدٍ. رَوَاهُ مسلم والنسائي[٥].

عەبدوڵلای کوڕی حاریثی ئەل-هاشمی (خودای لێ رازی بێ) فەرموو دەیەکی بە دوورو درێژی گێڕایەوە، تا ئەوێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەم زەکاتو خێرو صەدەقەیە چڵکاوو ئاراوی ماڵو دڵو دەروونی خەڵکە، لەبەر ئەوە نە بە موحەممەدو نە بە خانەدانو خزمو خوێشو نەتەوەی موحەممەد ناشێ (م/ن).

---

[٣] بخاري. زكاة: ١٤٩٥، ٢٥٧٧. مسلم. زكاة: ٢٤٨٢. أبو داود زكاة: ١٦٥٥ نسائي. عمرى: ٣٧٦٩.

[٤] مسلم. زكاة: ٢٤٨٨.

[٥] مسلم. زكاة: ٢٤٧٨. أبو داود. خراج: ٢٩٨٥. نسائي زكاة: ٢٦٠٨.

١٢٥٩- عَنْ أَبِي رَافِعٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَ رَجُلاً عَلَى الصَّدَقَةِ مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ، فَقَالَ: لأَبِي رَافِعٍ: اصْحَبْنِي فَإِنَّكَ تُصِيبُ مِنْهَا. قَالَ: حَتَّى آتِيَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَسْأَلَهُ فَأَتَاهُ فَسَأَلَهُ فَقَالَ: مَوْلَى الْقَوْمِ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَإِنَّا لاَ تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ. رَوَاهُ أبو داود والترمذى وصححه[٦].

ئەبو رافیع، نۆکەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێکی بەنی مەخزوومی کرد بە سەرکاری زەکاتو ناردی، پیاوەکە بەمنی گوت: تۆیش ببە بە هاوڕێم" بەشی تۆشی تێ دەکەوێ! گوتم: با بچم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بپرسم جا کە چووم‌و لێم پرسی فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ): نۆکەرو مەولای گەل لە خۆیانە کە وابوو تۆ کە نۆکەری منی لە ئێمەی، ئێمەیش دیارو ئاشکرایە کە زەکاتمان پێ ناشێ (د/ت/ص).

## ٢٠) باسی هەشتەم: باسی گەورەیی خۆپاراستن لە روو زەردی سواڵکردن‌و باسی ڕەخنەگرتن لە سواڵکردن مەگەر لەبەر ناچاریی

## الباب الثامن: في فضل التعفف وذم السؤال إلا لضرورة

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: {يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاء مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا}.

خودای گەورەو مەزن دەفەرموێ: پیاوی حاڵنەزان گومان دەبا بەو هەژارانە کە دەوڵەمەندن، چونکە ئەوەندە (لەبەر هێژایی خۆیان) خۆیان بە دوور دەگرن لە دەرووزەو سواڵکردن، تۆ (ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! یا ئەی قسە لەگەڵ کراو!) ئەو هەژارانە دەناسی بە شێوە یانا، چونکە ناوچەوانێکی پاکیان هەیە، نوێژکەرو نوورانین، هەر وەك بێ بەرگی‌و دەست تەنگیشیان پێوە دیارە ئەو هەژارە دەرووزە نەکەرانە یا هەر داوای شت ناکەن

[٦] صححه الترمذي.

لە مەردوم، یا ئەگەر داواشی بکەن بە توو ترکی نانووسێن بە کوڵکی خەڵکەوە!

١٢٦٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ نَاسًا مِنَ الأَنْصَارِ سَأَلُوا رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى نَفِدَ مَا عِنْدَهُ فَقَالَ: مَا يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللّٰهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللّٰهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللّٰهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً خَيْرًا وَأَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ. رَوَاهُ الخمسة[١].

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: چەند کەسێ (لە یاریدەدەران) چەند جارێ داوای بەشیان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرد، ئەویش هەموو جارێ بەشی دەدان، تا ئەو ماڵەی کە لەلای بوو هەمووی تەواو بوو، جا فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ): ئەو ماڵو خێرو بێرەی لەلای من بێ لە ئێوەی ناشارمەوە وە من ئەوەی لە دەستم بێ لە ئێوە درێغی ناکەم وە هەر کەسێکیش خۆی بە دوور بگرێ لە ڕووزەردیی سواڵو سواڵکردن خودا لەهەر دوو جیهاندا ڕوو سوورو سەربەرزی دەکا، وە هەر کەسێکیش چاوی تێربێو خۆی بێنیاز بگرێو چاوی لە دەستی ئەمو ئەو نەبێ، خودا دەوڵەمەندو بێنیازی دەکا، وە هەر کەسێکیش دان بە خۆیا بگرێو سەبووری خۆی بدا مسۆگەر کە خودایش سەبرو ئارامی دەداتێ، وە باشترینو گەورەترین خەڵاتی کە بە کەسێ درابێ خەڵاتو بەهرەی سەبرو ئارامگرتنە (ش/د/ت/ن).

١٢٦١- وَلِلشَّيخين والترمذي: قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ وَرُزِقَ كَفَافًا وَقَنَّعَهُ اللّٰهُ بِمَا آتَاهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: اللّٰهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتًا. وَفِي رِوَايَةٍ: لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ[٢].

---

[١] بخاري. زكاة: ١٤٦٩، ٦٤٧٠. مسلم. زكاة: ٢٤٢١. أبو داوُد زكاة: ١٦٤٤. الترمذي بروصلة: ٢٠٢٤. نسائي. زكاة: ٢٥٨٧.

[٢] بخاري. رقاق: ٦٤٦٠. مسلم. زكاة: ٢٤٢٤، ٧٣٦٧، ٧٣٦٨. الترمذي زهد: ٢٣٦١. رياض: ٥٢٣/٢ز: ٥٧، ٥٢٢/١.

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بە راستی سەرفرازو رزگار ئەو کەسەیە کە موسوڵمان بێو رزقو رۆژیی بەپێی حاڵ بێو بە بەشی خودا قایل بێ! (ش/ت) لە گێڕانەوەیەکا: خودایە! رزقو رۆژیی خانەوادەی موحەممەد ئەوەندە بدە کە سەرو بەر پێی هەڵبەکەن!! لە گێڕانەوەیەکی تردا: دەفەرموێ: دەوڵەمەندیی بە زۆریی ماڵو دارایی نیە، بەڵام دەوڵەمەندیی بە چاوتێریو دڵتێرییە.

١٢٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ فَيَحْتَطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْتِيَ رَجُلاً، فَيَسْأَلَهُ، أَعْطَاهُ أَوْ مَنَعَهُ[٣].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سوێندم بەو کەسە کە گیانی منی بە دەسە، کەسێ لە ئێوە گوریسێ هەڵبگرێو بە کۆڵ کۆڵە داربێنێو بیفرۆشێو خۆی پێ رزگار بکا لەچاو بەرەژێری ئەمو ئەو، هێشتا گەلێ لەوە باشترە کە بچێ دەست لە مەردم پان بکاتەوە، ئیتر ئەو مەردمە بەشی بدەن یا بەشی نەدەن، هەر ئیشکردنەکە بە قەدرترە لە سوڵکردنەکە! •ش/ت/ن = شەیخان، تیرمیذی، نەسائی. رەحمەتی خودایان لێبێ).

١٢٦٣- عَنْ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي ثُمَّ قَالَ: يَا حَكِيمُ إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى. قَالَ: حَكِيمٌ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لاَ أَرْزَأُ أَحَدًا بَعْدَكَ شَيْئًا حَتَّى أُفَارِقَ الدُّنْيَا، فَأَعْطَاهُ أَبُو بَكْرٍ ثُمَّ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) حَقَّهُ مِنْ الْفَيْءِ حَتَّى تُوُفِّيَ. رَوَاهُمَا الخمسة إلا أبا داود[٤].

---

[٣] بخاري. بيوع: ٢٠٧٤. مسلم: ٢٣٩٧ — ٢٣٩٩. نسائي. زكاة: ٢٥٨٣. ترمذي. زكاة: ٦٨٠. رياض: ٥٤٠/٢ ز:٥٩.

[٤] بخاري. زكاة: ١٤٧٢، ٢٧٥٠، ٣١٤٣، ٦٤٤١. مسلم. ٢٣٨٤. ترمذي. صفة القيامة: ٢٤٦٣. نسائي. زكاة: ٢٥٣٠، ٢٦٠١.

حەکیمی کوڕی حیزام (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ داوای بەشم لە پێغەمبەر کرد (درودی خودای لەسەربێ) ئەویش بەشی دامێ، دیسان داوام لێ کردەوە دیسانەوە بەشی دامەوە، هەمدیسان داوام لێ کردەوە هەمدیس بەشی دامەوە، لە پاشا فەرمووی: ئەی حەکیم! ڕاستە کە ماڵ مێوەیەکی سەوزو شیرین و خۆشە، بەڵام بزانە ئەوەی بە بەرچاوتێری و دڵتێریی وەری بگرێ خودا بەرەکەت و پیت و فەڕی بۆ تێ دەخاو ئەو ماڵە خێر دەداتەوە، وەلێ ئەوەی کە بە خوازەڵۆکی و چاوچنۆکی هەڵپەهەڵپی بۆ دەکاو قرم و مرخی لێ خۆش دەکاو چاوی تێ دەبڕێ تا دەیسەنێ، بە شێوەیەکی وا لەوە دوایش خاوەنەکەی چاوی لە دوایەتی، ئەوە ئەو ماڵە پیت و بەرەکەتی بە حەوادا دەچێ! ئیتر ئەو کەسە کە ئەوە حاڵیەتی وەك ژەمەنبوودەی لێ دێ هەر دەخواو هەر تێرنابێ! دیارە کە دەستی سەروو کە دەستی خێرکەرە یا ئەو دەستەیە کە بێز لە دەرووزە دەکاتەوە، دیارە کە دەستی سەروو لە دەستی ژێروو کە دەستی دەرووزەکەرە گەلێ باشترە. حەکیم (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کە ئەمەم لە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ژنەوت گوتم: ئەی ڕەهبەری خودا بەو کەسە کە تۆی کردووە بە پێغەمبەرێکی ڕاست و دروست و ڕەوانەی کردووی لەگەڵ ئەم ئایینە ڕاستەدا ئیتر لەپاش تۆ تا لە جیهان دەر دەچم شت لەکەس وەناگرم، لەپاش حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ئەبو بەکرو عومەر (ڕەزای خودایان لێبێ) لەکاتی جێنشینی (خەلافەت)ی خۆیاندا بەشی خۆیان لە دەستکەوتی جەنگی (الفيئ) دەدایە، بەڵام حەکیم تا مرد بزگۆڕێکی لەکەس وەرنەگرت (ش/ت/ن).

١٢٦٤- وَلأَبِي دَاوُدَ: الأَيْدِي ثَلاَثَةٌ: فَيَدُ اللّٰهِ الْعُلْيَا وَيَدُ الْمُعْطِي الَّتِي تَلِيهَا وَيَدُ السَّائِلِ السُّفْلَى فَأَعْطِ الْفَضْلَ وَلاَ تَعْجِزْ عَنْ نَفْسِكَ[5].

حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ سەرو ماڵ و منداڵ و گیان بە قوربانی بێ) دەفەرموێ: دەست سێ دەستە: دەستی خودا، کە دەستی هەرە باڵایە، دەستی

---

[5] سكت عَن درجته الشارح.

**بەخشندەو خێرکەر، کە لەدوا دەستی خودا ئەوە، دەستی داواکارو سواڵکەر، کە دەستی هەرە ژێرووە! لە بەخشش‌و پیاوەتی کردنیش درێغی مەکەو ئەوەی (بەپێی ڕۆژو باوی کۆمەڵایەتی) لە خۆت‌و خاوو خێزانت زیادە لە ڕێگەی خودادا صەرفی بکەو لە هەژارای مەترسەو بە گوێی نەفس‌و شەیتان مەکە (ئەبو داوود، پڕ گۆڕەکەی لە رەحمەت بێ).**

١٢٦٥- عَنْ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعْطِينِي الْعَطَاءَ، فَأَقُولُ: أَعْطِهِ مَنْ هُوَ أَفْقَرُ إِلَيْهِ مِنِّي، فَقَالَ: خُذْهُ، إِذَا جَاءَكَ مِنْ هَذَا الْمَالِ شَيْءٌ، وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ وَلاَ سَائِلٍ، فَخُذْهُ، وَمَا لاَ فَلاَ تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[٦].

**عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە بەشی دەدام دەمگوت: بیدە بە کەسێ کە ئەو لەمن پتر پێویستیی پێی هەبێ، ئەویش دەیفەرموو (درودو سەلامی خودای لەسەر بێ): ئەگەر لەم ماڵە شتێکت پێ درا، وەری بگرە، بە مەرجێ چاوی تێ نەبڕیو خۆت داوای نەکەی، ئەگینا خۆتی تێ مەگەیەنە (ش/ن).**

١٢٦٦- وللشيخين: إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَنِعْمَ صَاحِبُ الْمُسْلِمِ هُوَ، لِمَنْ أَعْطَى مِنْهُ الْمِسْكِينَ وَالْيَتِيمَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَإِنَّهُ مَنْ يَأْخُذُهُ بِغَيْرِ حَقِّهِ كَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، وَيَكُونُ شَهِيدًا عَلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[٧].

**شەیخەین (کە ئیمامی بوخاری‌و ئیمامی موسلمن (رەزای خودایان لێبێ) ریوایەتیان کردووە: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بە ڕاستی ئەم ماڵە مێوەیەکی سەوزو خۆشە وە هاریکارێکی چاکە بۆ ئەو موسوڵمانەی کە بەشی نەداراو هەتیوو ڕێبواری لێ دەدات، وە هەر کەسێ ماڵ بە ناڕەوا پەیدا**

---

[٦] بخاري. زكاة: ١٤٧٣، ٧١٦٣، ٧١٦٤. مسلم. زكاة: ٢٤٠٢ — ٢٤٠٦. نسائي. زكاة: ٢٦٠٧ رياض: ٥٣٨/١ ز-٥٨.

[٧] بخاري. زكاة: ١٤٦٥. مسلم. زكاة: ٢٤١٩، ٢٤٢٠.

دەکا وەك ژەمەنبردە وایە، هەر دەخواو تێر ناخوا، وە رۆژی قیامەتیش دەبێ بە شایەت لەسەری (ش).

١٢٦٧- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ النَّاسَ حَتَّى يَأْتِيَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ. رَوَاهُ الشيخان[٨].

دیسان عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پیاو هەیە هەر سوالْ دەکا لە خەڵك، تا لە رژی قیامەتدا کە دێ بۆ دیوانی خودای گەورە یەك پرزۆڵە گۆشت بە روویەوە نامێنی لە دەشتی مەحشەرەدا، خودا مۆری سواڵکەریی دەنێ بە روویاو دەمووچاوی یەك پارچە ئێسقانێکی رووتی بێ گۆشت دەبێ! (ش).

١٢٦٨- وَلِلنَّسائي: لَوْ تَعْلَمُونَ مَا فِي الْمَسْأَلَةِ مَا مَشَى أَحَدٌ إِلَى أَحَدٍ يَسْأَلُهُ شَيْئًا[٩].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر دەتانزانی کە سوالْ چەند سووکییە، کەس نەدەچوو بۆ لای کەس تا داوای شتی لێ بکا (ن).

١٢٦٩- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ فَأَنْزَلَهَا بِالنَّاسِ لَمْ تُسَدَّ فَاقَتُهُ وَمَنْ أَنْزَلَهَا بِاللّٰهِ أَوْشَكَ اللّٰهُ لَهُ بِالْغِنَى إِمَّا بِمَوْتٍ عَاجِلٍ أَوْ غِنًى عَاجِلٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[١٠].

عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ لەکاتی لێ قەومان و هەژار کەوتندا پەلاماری خەڵك بداو دامێنی ئەمو بگرێ و هانا بۆ ئادەمیزاد بەرێ و خودای گەورە فەرامۆشکا، لێ قەومان هەژارییەکەی بەو جۆرە چارناکرێ، بەڵام ئەو کەسەی لەم حاڵەتانەدا، کاری

---

[٨] بخاري. زكاة: ١٤٧٤، ١٤٧٥، ٤٧١٨. مسلم. زكاة: ٢٣٩٣ — ٢٣٩٥. رياض: ٥٣٠/٢. ز:٥٧.

[٩] سكت عنه الشارح.

[١٠] بسند صحيح (شرحه).

خۆی رووبەرووی خودا بکاتەوە ئەوە خودا بە زوویی دەرووی لێ دەکاتەوە: سا یا بەمردنێکی زوو بە زوویی دەیحەسێنێتەوە، یا بە زوویی دەوڵەمەندی دەکا (د/ت–س/ص).

١٢٧٠– وَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ يَتَكَفَّلَ لِي أَنْ لاَ يَسْأَلَ النَّاسَ شَيْئًا وَأَتَكَفَّلَ لَهُ بِالْجَنَّةِ. فَقَالَ: ثَوْبَانُ: أَنَا. فَكَانَ لاَ يَسْأَلُ أَحَدًا شَيْئًا. رَوَاهُ أبو داود[11].

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کێ مەرجم لەگەڵ دەکا کە هیچ لە خەڵك داوانەکا، هەتا منیش بەڵێنی بەهەشتی بدەمێ؟ ئەوبان گوتی من، ئیتر لەوە دوا ئەوبان داوای شتی لەکەس نەدەکرد تا مرد (د–سند صالح).

١٢٧١– وَقَالَ: الْفِرَاسِيُّ: يَا رَسُولِ اللّٰهِ أَسْأَلُ؟ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لاَ وَإِنْ كُنْتَ لاَبُدَّ سَائِلاً فَاسْأَلِ الصَّالِحِينَ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[12].

فیراسی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەی رەهبەری خودا! سواڵ دەکەم؟؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): مەیکە، ئەگەر هەر چارت نییەو دەیکەی سواڵ لە پیاوچاکان بکە (د–سند صالح–ن).

١٢٧٢– عَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمَسَائِلُ كُدُوحٌ يَكْدَحُ بِهَا الرَّجُلُ وَجْهَهُ، فَمَنْ شَاءَ أَبْقَى عَلَى وَجْهِهِ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَ إِلاَّ أَنْ يَسْأَلَ الرَّجُلُ ذَا سُلْطَانٍ أَوْ فِي أَمْرٍ لاَ يَجِدُ مِنْهُ بُدًّا. رَوَاهُ أصحاب السنن[13].

سەموورە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): سواڵ هەمووی چڕنووکەو پیاو رووی خۆی پێ دەڕنێتەوە، جا ئەوەی دەیەوێ خۆی رووسوور بکا لە دنیاو قیامەتدا بارووی خۆی بە پەندنەکا، وە

---

[11] بسند صالح (شرحه).

[12] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[13] بسند حسن (شرحه).

ئەوەشی دەیەوێ خۆی رووزەرد بکا ئەوە بە دەستی خۆیەتی، مەگەر بۆ پیاوێ کە لە فەرمانڕەوا داوا بکا، یا بۆ کارو فرمانێ کە ناچار بێ پێی (د/ت/ن–س/ص).

## ٢١) باسی نۆهەم: باسی ماڵ خەرجکردنو خێرکردن ئەم باسە چەند لکێکی لێ دەبێتەوە. خێر بۆ خوێش خێرترە

**الباب التاسع: في النفقة والصدقة. وفيه فروع. الصدقة على الأهل والقريب أفضل:**

١٢٧٣– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ. رَوَاهُ الخمسة الا الترمذي[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: باشترین خێر ئەو خێرەیە کە لەسەر تیریی بێ، لە خێزانی خۆشتەوە دەست بکە بە خێرکردن! (ش/د/ن).

١٢٧٤– وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: دِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي رَقَبَةٍ وَدِينَارٌ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَى مِسْكِينٍ وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ أَعْظَمُهَا أَجْرًا الَّذِى أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ. رَوَاهُ مسلم والترمذي وأحمد[2].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دیناری بدەی بۆ غەزاو دیناری بدەی بۆ ئازادکردنی بەندەو دیناری بە خێربدەی بە هەژاریو دیناری خەرج بکەی بۆ کەسو کاری خۆت ئەو دینارەیان خێری زۆرترە، کە خەرجی دەکەی بۆ کەسو کاری خۆت. (م/ت/ئەحمەد).

١٢٧٥– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يَحْبِسَ عَمَّنْ يَمْلِكُ قُوتَهُ. رَوَاهُ مسلم والنسائي وأبو داود. ولفظه: كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ[3].

---

[1] بخاري. زكاة: ١٤٢٧. مسلم. زكاة: ٢٣٨٣، ٢٣٨٤. نسائى. زكاة: ٢٥٤٢.

[2] مسلم. زكاة: ٢٣٠٧. ترمذي. بروصلة: ١٩٦٦.

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمر** (ڕەزای خوایان لێبێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: بەسە بۆ گوناهباری پیاوێ، کە نان و ئاو بگرێتەوە لەژێر دەستەی خۆی! (م/ن/د). گفتەی (د): بەسە بۆ گوناهباری پیاو، کە ئەو کەسانەی بەخێویان دەکا پشت گوێیان بخات.**

**١٢٧٦- عَنْ جَابِرٍ** (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) **قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ مِنْ بَنِى عُذْرَةَ عَبْدًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ فَبَلَغَ ذٰلِكَ رَسُولَ اللّٰهِ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَقَالَ: أَلَكَ مَالٌ غَيْرُهُ. فَقَالَ: لاَ. فَقَالَ: مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّى. فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللّٰهِ الْعَدَوِىُّ بِثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ فَجَاءَ بِهَا رَسُولَ اللّٰهِ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: ابْدَأْ بِنَفْسِكَ فَتَصَدَّقْ عَلَيْهَا فَإِنْ فَضَلَ شَىْءٌ فَلأَهْلِكَ فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَهْلِكَ شَىْءٌ فَلِذِى قَرَابَتِكَ فَإِنْ فَضَلَ عَنْ ذِى قَرَابَتِكَ شَىْءٌ فَهَكَذَا وَهَكَذَا، يَقُولُ فَبَيْنَ يَدَيْكَ وَعَنْ يَمِينِكَ وَعَنْ شِمَالِكَ. رَوَاهُ الخمسة[٤].**

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پیاوێکی بەنی عوذرەیی بەندەیەکی خۆی ئازادکرد،بەڵام بەمەرجێ کە لەپاش مردنی خۆی ئەوسا ئازاد ببێ، کەئەم باسە گەیشتەوە بەپێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئایا ماڵی ترت هەیە؟ گوتی: نەء فەرمووی: کێ ئەم بەندەیەم لێ دەکڕێ؟ جا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵای ئەلعەدەوی بەهەشت سەد درهەم لێی کڕی، پێغەمبەریش پارەکەی بۆ بردو دای پێی، ئینجا فەرمووی: جارێ لە خودی خۆتەوە دەست پێ بکەو لە پێشا خێر بەخۆت بکە، جا ئەگەر شتێ لە خۆت مایەوە بیدە بە کەس و کارەکەت، ئەگەر لەوانیش شتێ مایەوە بیدە بە خزم و خوێش، ئەگەر لەمانیش شتێ مایەوە ئەوسا بیدە بەم و بەو واتە: بیکە بەخێرو بەکێی دەدەی بیدە (ش/د/ت/ن).**

**١٢٧٧- وَسُئِلَ النَّبِىُّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **عَنِ الصَّدَقَةِ عَلَى القَرِيبِ فَقَالَ: لَهُ أَجْرَانِ أَجْرُ الْقَرَابَةِ وَأَجْرُ الصَّدَقَةِ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي والترمذي ولفظهما: الصَّدَقَةَ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ وَهِىَ عَلَى ذِى الرَّحِمِ اثْنَتَانِ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ[٥].**

---

[٣] مسلم. زكاة: ٢٣٠٩.

[٤] مسلم. زكاة: ٢٣١٠. أبو داود. عتق: ٣٩٥٧. نسائي بيوع: ٤٦٦٧. بخاري. بيوع: ٢٢٣١.

[٥] بخاري. زكاة: ١٤٦٦. مسلم. زكاة: ٢٣١٥. الترمذي. زكاة: ٦٣٥، ٦٣٦.

پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەبارەی خێرکردن بە خزمو خوێش فەرمووی: ئەم جۆرە خێرە دوو پاداشی هەیە: پاداشی خزمایەتیو پاداشی خێری ئاسایی (ش/ن/ت) گفتەی نەسائیو تیرمیذی (خوایان لێ رازی بێ) ئاوایە: خێر بە هەژار هەر خێرەو بەس، بەڵام خێر بەخزم دووجار خێرە، چونکە هەم خێری ئاساییەو هەم بەسەرکردنەوەی خزمو خوێشە.

١٢٧٨- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ أَنْ تَبْذُلَ الْفَضْلَ خَيْرٌ لَكَ وَأَنْ تُمْسِكَهُ شَرٌّ لَكَ وَلاَ تُلاَمُ عَلَى كَفَافٍ وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى. رَوَاهُ الشيخان[٦].

ئەبو ئومامە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی ئادامیزاد! ئەوەی لە خۆتو خێزانت زیادە ئەگەر بی بەخشی ئەوە خێرێکەو بۆ خۆتی دەکەی، خۆ ئەگەر هەڵی بگری ئەوە شەڕێکەو بۆ خۆتی هەڵ دەگری، لەسەر گوزەرانێکیش کە سەرو بەر بێو بەپێی حاڵ بێ، کەس سەرزەنشتت ناکا، لە خێزانو خزمی خۆشتەوە دەست بکە بە خێرکردن، دەستی سەرەوەش لە دەستی ژێرەوە باشترە واتە: دەستی بەخشندە لە دەستی خێر وەرگر چاکترە (ش. هەزار رەحمەت لە گۆڕیان).

١٢٧٩- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا أَنْفَقَ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةً وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا كَانَتْ لَهُ صَدَقَةً. رَوَاهُ الخمسة إلا أبا داود[٧].

ئەبو مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ موسوڵمان شتێ خەرج دەکا بۆ خێزانو کەسو کاری خۆی، ئەگەر لەبەر رەزای خودای بێ، بۆی بەخێر دەژمێردرێ (ش/ت/ن).

---

[٦] مسلم. زكاة: ٢٣٨٥. الترمذي زهد: ٢٣٤٣. رياض: ٥١٠/٢٠ ز-٥٦.

[٧] بخاري. إيمان: ٥٥، ٤٠٠٦، ٥٣٥١. مسلم. زكاة: ٢٣١٩. ترمذي. بروصلة: ١٩٦٥. نسائي. زكاة: ٢٥٤٤. رياض/١/٢٩٣. ز-٣٦.

## ٢٢) چەشنە خێرێکی زۆر نایاب : (نوع من الصدقة الفضلی)

قَالَاللّٰهُ تَعالَى: {لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ}.

خودای گەورە دەفەرموێ: ناگەن بە خێرو چاکەی تەواو رەسا هەتا خەرج نەکەن لەو شتە باشانەی کە خۆشتان دەوێن.

١٢٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ أَجْرًا؟ قَالَ: أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ، تَخْشَى الْفَقْرَ وَتَأْمُلُ الْغِنَى، وَلاَ تُمْهِلُ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ قُلْتَ لِفُلاَنٍ كَذَا، وَلِفُلاَنٍ كَذَا، وَقَدْ كَانَ لِفُلاَنٍ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی رەهبەری خودا! کام خێرو بەخشینە پاداشی گەورەترە؟ فەرمووی: ئەو خێرەی کە دەیکەی لەشت ساخ بێ و دڵت بەماڵداریی خۆش بێ و مەترسیی هەژار کەوتنت هەبێ و هیوای دەوڵەمەندبوونت هەبێ، نەوەك کەمترخەمی بکەی تا ئەو دەمەی گیان دەگاتە سەر لێوو مردن یەخەت دەگرێ، جا ئەو حەلە بە پەلە پڕووزە بڵێی: ئەوە بۆ ئەمو ئەمە بۆ ئەو تازە چ سوود! گریمان ئەگەر سوودیشی هەبێ کەمە لەچاو خێرکردنی حاڵی لەش ساخیدا چونکە ئەو شتە لە دەستی تۆ دەرچووەو دەبێ بە ماڵی یەکێکی تر کە میرات بەرە (ش/ن).

١٢٨١- وَعَنْهُ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: جَهْدُ الْمُقِلِّ وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ. رَوَاهُ أبو داود والحاكم وصححه[2].

---

[1] بخاري. زكاة: ١٤١٩، ٢٧٤٨. مسلم. زكاة: ٢٣٧٩ – ٢٣٨١. أبو داود. وصايا: ٢٨٦٥. نسائي. زكاة: ٢٥٤١، ٣٦١٣. رياض: ٤/٩٠ ز: ١٠.

[2] صحيح عند الحاكم.

دیسان گوتی: گوتم: ئەی ڕەهبەری خودا! کام خێرە زۆر خێرە؟ فەرمووی: چەندەی لە دەستی پیاوی کەم دەست دێ! وە لە خێزانو خزمی خۆشتەوە دەست بەخێرکردن بکە! (د/حاکم:ص).

١٢٨٢- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: سَبَقَ دِرْهَمٌ مِائَةَ أَلْفِ دِرْهَمٍ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ؟ قَالَ: رَجُلٌ لَهُ دِرْهَمَانِ فَأَخَذَ أَحَدَهُمَا فَتَصَدَّقَ بِهِ وَرَجُلٌ لَهُ مَالٌ كَثِيرٌ فَأَخَذَ مِنْ عُرْضِ مَالِهِ مِائَةَ أَلْفٍ فَتَصَدَّقَ بِهَا. رَوَاهُ النسائي[٣].

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: تاقە یەك درەم سەر سەد هەزار درەم دەکەوێ! گوترا: چۆن چۆنی؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: پیاوێ هەموو ماڵو سامانەکەی تاقە دوو درەمە، دەست دەبا درەمێکیان دەبەخشێ، پیاوێکی تریش سامانو ماڵێکی زۆرو بێ شوماری هەیە، دەست دەبا لەکەنارێکی ماڵەکەیەوە سەد هەزار درەم دەبەخشێتەوە (ن).

## ٢٣) هاندان لەسەر خێرکردن بە تێکڕایی: (الحث على الصدقة)

{قَالَ:اللهُ تَعَالَى - وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ}.

خودای گەورە دەفەرموێ: فرسەتەو هەلە، هەتا مردن نەیداوە بە سەرتانا خێرو خێراتێکی زۆربکەن، لەو ماڵو ڕۆژییەی خودا داوێتی پێتان، تا لەکاتی سەرەمەرگا ئاواتی نابەجا نەخوازنو نەڵێن: ئەی پەروەردگارم! خۆزگە کەمێ مۆڵەتت دەدام، تا هەندێ خێرو خێرات دەکەمو دەبم بە پیاوێکی باش!.

١٢٨٣- عَنْ أَبِي مُوسى (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ. فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: يَعْمَلُ بِيَدِهِ فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ وَيَتَصَدَّقُ.

---

[٣] سكت عنه الشارح.

قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: يُعِينُ ذَا الْحَاجَةِ الْمَلْهُوفَ. قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: فَلْيَعْمَلْ بِالْمَعْرُوفِ، وَلْيُمْسِكْ عَنِ الشَّرِّ فَإِنَّهَا لَهُ صَدَقَةٌ[1].

**ئەبو مووسا** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: هەموو موسوڵمانێ خێرکردنی لەسەرە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ئەگەر نەیبوو؟ فەرمووی: قۆڵی لێ هەڵکاو ئیش بکاو هەم خۆی بەخێو بکاو هەم خێریش بکا! گوتیان: ئەی ئەگەر ئەمەی بۆ نەکرا؟ فەرمووی: یاریدەی لێقەوماوێکی داماو بدا گوتیان: ئەی ئەگەر ئەمەشی بۆ نەلوا چی بکا؟ فەرمووی: با رەفتاری جوان بێ و کاری باش بێ و رێگەی باش بەخەڵك بڵێ و واز لە خراپە بێنێ، ئەمەیش دەبێ بە گەورەترین خێرو خێرات بۆی (ش/ن).**

١٢٨٤- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَطُوفُ الرَّجُلُ فِيهِ بِالصَّدَقَةِ مِنَ الذَّهَبِ ثُمَّ لاَ يَجِدُ أَحَدًا يَأْخُذُهَا مِنْهُ، وَيُرَى الرَّجُلُ الْوَاحِدُ يَتْبَعُهُ أَرْبَعُونَ امْرَأَةً، يَلُذْنَ بِهِ مِنْ قِلَّةِ الرِّجَالِ وَكَثْرَةِ النِّسَاءِ. رَوَاهُمَا الشيخان والنسائي[2].

**دیسان گوتی:** (خودای لێ رازی بێ): **حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: مەردوم دەکەونە چەرخێکەوە پیاو بە زێڕی خێرەوە ماڵەو ماڵ و شارەو شار دەسووڕێتەوە تا بیکا بەخێر، بەڵام کەسی دەست ناکەوێ لێی وەربگرێ لەبەر زۆری ماڵ کەس نایەوێ، وە دەبینرێ چل ژن شوێنی تاقە پیاوێ دەکەون و پەنای بۆ دەبەن تا سەرەوکارییان بکاو کەس دەسدرێژییان لێ نەکا ئەمەیش لەبەر کەمی پیاوو زۆری ژن (ش/ن).**

١٢٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَالَ: اللّٰهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: يَا ابْنَ آدَمَ أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيْكَ. وَقَالَ: يَمِينُ اللّٰهِ مَلأَى سَحَّاءُ لاَ يَغِيضُهَا

---

[1] بخاري. زكاة: ١٤٤٥، ٦٠٢٢. مسلم. زكاة: ٢٣٣٠ — ٢٣٣٢. نسائي. زكاة: ٢٥٣٧. رياض: ١٤١/٢٥ ز:١٣.

[2] بخاري. زكاة: ١٤١٤. مسلم. زكاة: ٢٣٣٥. رياض: ١٨٢٥/١٨ ز:٣٧٠.

شَيْءٌ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ. أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَاءِ وَالأَرْضَ فَإِنَّهُ لَمْ يَغِضْ مَا فِي يَمِينِهِ، قَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ وَبِيَدِهِ الأُخْرَى الْقَبْضُ يَرْفَعُ وَيَخْفِضُ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): خوای گەورە لە حەدیسێکی قودسیدا دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! ماڵ بەخت بکەو خێر زۆر بکە، تۆڵەت بۆ دەکەمەوە. وە تۆ چاوت لە بەندەگانی من بێ، منیش چاوی خێرم لە تۆ دەبێ. گوتی: فەرمووشی: دەستی راستی خودا هەمیشە پڕەو سەر رێژ دەکا، وە شەوو رۆژ بە درێژایی ساڵ لێی دەبەخشێ، بەڵام هیچ کەم ناکا، خۆباش دەزانن ئەوەتی ئاسمان‌و زەوی دروست کردووە چەندەی بەخشیوەتەوە، دیارە کە زۆر زۆری بەخشیوەتەوە، دەسا لەگەڵ ئەوەشدا خەزینەو گەنجینەکەی یەك دەنگ چییە کەمی نەکردووە، خۆی ماوە! فەرمووی: وە لەپێش دروستکردنی دروستکراواندا تەخت‌و بارەگای خودا لەسەر ئاو بوو، تەرازوو ئەمانەتیش لە دەستەکەی تری دایە بە ئارەزووی خۆی تاو تووو سەربەرەو ژوورو سەر بەرەو خواری پێ دەکا (ش).

١٢٨٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ طَعَامِ بَيْتِهَا غَيْرَ مُفْسِدَةٍ كَانَ لَهَا أَجْرُهَا بِمَا أَنْفَقَتْ وَلِزَوْجِهَا أَجْرُهُ بِمَا كَسَبَ، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ، لاَ يَنْقُصُ بَعْضُهُمْ أَجْرَ بَعْضٍ شَيْئًا. رَوَاهُ الخمسة[٤].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر ژن (بەبێ دەستبڵاویی) لە خۆراکی ماڵەوەی ببەخشێ، ئەوە پاداشی باشی بۆ هەیە لەسەر ئەو بەخشینە، چونکە ئەو هۆی ئەوەیە، هەروەها

---

[٣] بخاري. توحيد: ٧٤١٩. مسلم. زكاة: ٢٣٠٦.

[٤] بخاري. زكاة: ١٤٢٥، ١٤٣٧، ١٤٣٩، ١٤٤٠، ١٤٤١، ٢٠٦٥. مسلم. زكاة: ٢٣٦١. أبو داود. زكاة: ١٦٨٥. ترمذي. زكاة: ٦٧٢. ابن ماجه. تجارات: ٢٢٩٤.

**مێردەکەشی پاداشی باشی بۆ هەیە، چونکە ئەو پەیدای کردووە! کلیلدارو کلیل بەدەستیش هەروەها، کەسیشیان هیچ لە پاداشی کەسیان کەم ناکەنەوە واتە: نابن بە موزاحیمی یەکتریی (ش/د/ت/ن).**

١٢٨٧- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: أَرْبَعُونَ خَصْلَةً، أَعْلاَهُنَّ مَنِيحَةُ الْعَنْزِ، مَا يَعْمَلُ رَجُلٌ بِخَصْلَةٍ مِنْهَا رَجَاءَ ثَوَابِهَا وَتَصْدِيقَ مَوْعُودِهَا إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللّٰهُ بِهَا الْجَنَّةَ. رَوَاهُ أبو داود والبخاري[٥].

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ): فەرمووی: چل کاری باش هەن، هەرە گەورەکەیان بزنە بە دۆخەیە، ئەوەی یەکێ لەم ئیشە باشانە بکا، بە هیوای پاداشی باشی، وە لە هەمان کاتدا باوەڕی بەو بەڵێنە هەبێ کە خودا داویێتی لە بارەی کردنی ئەو ئیشەوە، ئەوە بێگومان کە خودا بەوە دەیباتە بەهەشت (د/ب).**

١٢٨٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: مَنِ اسْتَعَاذَ بِاللّٰهِ فَأَعِيذُوهُ وَمَنْ سَأَلَ بِاللّٰهِ فَأَعْطُوهُ وَمَنْ دَعَاكُمْ فَأَجِيبُوهُ وَمَنْ صَنَعَ إِلَيْكُمْ مَعْرُوفًا فَكَافِئُوهُ فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مَا بِهِ تُكَافِئُوا فَادْعُوا لَهُ حَتَّى تَرَوْا أَنَّكُمْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[٦].

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): هەر کەسێ پەنای بردە بەر خودا وەك ئەوە گوتی: توخوا دەستم لێ مەدەو ئازارم مەدە، ئەوە پەنای بدەن، وە هەر کەسێ بەهێنانی ناوی خودا داوای چشتی لێ کردن لەبەر رێزی ناوی خودا بەشی بدەن نا ئومێدی مەکەن وە هەر کەسێ بانگی کردن بۆنان خواردنو شتی وا بچن بە دەنگیەوە، وە هەر کەسێ پیاوەتیو چاکەیەکی لەگەڵدا کردن تۆڵەی بۆ بکەنەوە (چونکە**

---

[٥] بخاري. هبة: ٢٦٣١. رياض: ٢٢/ ١٣٨ ز: ١٣.

[٦] سكت عَن درجته الشارح.

جیهان دەستیاوە) ئەوەشی نەیبوو نزای باشی بۆ بکا، تا لە باوەڕی خۆتاندا وابزانن کە تۆڵەتان بۆ کردوونەتەوە (د/ن).

١٢٨٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَيُّمَا مُسْلِمٍ كَسَا مُسْلِمًا ثَوْبًا عَلَى عُرْيٍ كَسَاهُ اللَّهُ مِنْ خُضْرِ الْجَنَّةِ وَأَيُّمَا مُسْلِمٍ أَطْعَمَ مُسْلِمًا عَلَى جُوعٍ أَطْعَمَهُ اللَّهُ مِنْ ثِمَارِ الْجَنَّةِ وَأَيُّمَا مُسْلِمٍ سَقَى مُسْلِمًا عَلَى ظَمَإٍ سَقَاهُ اللَّهُ مِنَ الرَّحِيقِ الْمَخْتُومِ. رَوَاهُ أبو داود[٧].

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێکی رووت پۆشتە بکاتەوە خودا لە بەرگی سەوزی بەهەشت پۆشتەی دەکاتەوە، وە هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێکی برسی نان بدا خودا لە میوەی بەهەشت تێری دەکا، وە هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێکی تینوو تێراو بکا خودای گەورەو سەروەر لە شەرابی پاکی سەر بەمۆری مەشهوور بە (الرحیق المختوم) دەرخواردی دەدا (د-سند صالح).

١٢٩٠- عَنْ بُهَيْسَةَ الْفَزَارِيَّةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: اسْتَأْذَنَ أَبِي النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَدَخَلَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قَمِيصِهِ فَجَعَلَ يُقَبِّلُ وَيَلْتَزِمُ ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الشَّيْءُ الَّذِي لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ قَالَ: الْمَاءُ. قَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَا الشَّيْءُ الَّذِي لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ قَالَ: الْمِلْحُ. قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الشَّيْءُ الَّذِي لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ قَالَ: أَنْ تَفْعَلَ الْخَيْرَ خَيْرٌ لَكَ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[٨].

بوهەیسەی فەرازییە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: باوکم (خودای لێ رازی بێ) ئیزنی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خواست و سەری کرد بە ژێر کراسەکەیداو دەستی کرد بە ماچکردنی جەستەی پێغەمبەرو رووی خۆی هەڵدەسوو لە لەشی پیرۆزی. ئینجا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چی شتێ دروست نیە

---

[٧] بسند صالح (شرحه).

[٨] سكت عنه الشارح.

کە قەدەغە بکرێ؟ فەرمووی: (ئاو) گوتی: چی تریش؟ فەرمووی: خوێ گوتیەوە: چی تریش؟ فەرمووی: هەر خێرێ بکەی بۆ خۆتی دەکەی (ئەبو داوودو نەسائی - ڕەزای خودایان لێبێ - گێڕاویانەتەوە).

١٢٩١- وَلأَبِي دَاوُدَ: لِلسَّائِلِ حَقٌّ وَإِنْ جَاءَ عَلَى فَرَسٍ[9].

واتە: ئەبو داوود لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دەبێ سوالکەر بەشی بدرێو نائومێدنەکرێ ئەگەرچی بە سواری ئەسپیش سوال بکا (د-سند حسن).

١٢٩٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الصَّدَقَةَ لَتُطْفِئُ غَضَبَ الرَّبِّ وَتَدْفَعُ مِيتَةَ السُّوءِ[10].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەخششو خێرو خێرات ڕقو خەشمی خودا دەنیشێنێتەوەو مردنی خراپیش لەکوڵ دەخاتەوە! (ت-س/ح).

١٢٩٣- عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: سَأَلْتُ أَوْ سُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الزَّكَاةِ فَقَالَ: إِنَّ فِي الْمَالِ لَحَقًّا سِوَى الزَّكَاةِ ثُمَّ تَلاَ (لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ) الآيَةَ. رَوَاهُمَا الترمذي[11].

فاطیمەی کچی قەیس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە بارەی زەکاتەوە پرسیارم لە پێغەمبەر: (دروودی خودای لەسەربێ) کرد، یا گوتی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سەرەڕای زەکاتی ماڵ حەقی تری تێدایە، ئەوجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە.

{لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ الآيَةَ}.

---

[9] بسند حسن (شرحه).

[10] بسند حسن (شرحه).

[11] بسند ضعيف (شرحه).

هـەموو كـارێكی بـاش‌و چـاك هـەر ئـەوە نیـە كـە رووی خۆتـان بكەنـە رۆژهەڵات‌و رۆژئاوا، چاكە تەنها بەوە نابێ كە بڵێی موسوڵمانم‌و بەس، بەڵام كاری فرەباش‌و زۆرنایاب ئەوەیە كە ئیمان‌و باوەڕتان ببی بە خوداو بە رۆژی دوایی‌و بە فریشتەو نامەو پێغەمبەرانی خودا، وەكی تریش ماڵ‌و سامان‌و دارایی (كەشتێكی بەنرخ‌و خۆشەویستە لەلاتان لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر رەزای خودا) ببیبەخشن‌و بیدەن بەم كەسانە: بە خزم‌و خوێش‌و كەس‌و كار، بە هەتیوان، بەرێبواران، بە دەرووزەكەرو سواڵكەران، وە هەروەها خەرجی بكەن، لە رێی ئازادییداو گەردنی ئادەمیزادی لە كۆتی بەندەیی پێ ئازاد بكەن، وە لە هەمان كاتدا نوێژێكی جوانی ریكوپێك بكەن‌و زەكات بەدڵێكی پاكەوە بدەن‌و پەیمان مەشكێنن‌و بەڵێنی خۆتان بەجێ بێنن، وە لەكاتی تەنگدەستی‌و نەبوونی‌و لێقەومان‌و ناساخی‌و نەخۆشی‌و دەمی جەنگ‌و شەڕو كاتی تێك رژان‌و بەیەكا چووندا خۆتان بگرن‌و ورە بەر مەدەن ئەو كەسانەی كە ئەمە رەفتارو كارو كرداریانە بە راستی ئەوانە پیاوی راستاڵ‌و راستگۆو لەخودا ترس خۆیانن (تیرمیذی).

## ٢٤) پاشەكی: دواوتە. پارێزو گورێز لەمنەتكردن چەندە جوانە بەخشندەیی‌و خێرو خێراتی پەنامەكی!

### خاتمة: في الحذر من المن، وما أحسن السماحة واخفاء الصدقة

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبْطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى}.

یەزدانی مەزن دەفەرموێ: ئەی كەسانێ كە باوەڕتان هێناوە بە خودا! خێرو خێراتی خۆتان بەتاڵ مەكەنەوە بە نازین‌و منەت كردن بەسەر هەژاراناو بە ئازاردانیان.

وَقَالَ تَعَالَى: {إِن تُبْدُواْ الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاء فَهُوَ خَيْرٌ لُّكُمْ}.

یەزدانی گەورە، دەفەرموێ: ئەو خێرو خێراتانەی کە دەیانکەن ئەگەر دەریان بخەنو بە ئاشکرا بیدەن بە داماوان ئەوە زۆر باشەو شتی چاکە، وە ئەگەر بیان شارنەوە بە دزییەوە لە پەنامەکییەوە بیدەن بە هەژارانو پێشیاوان ئەوە زۆر باشترە.

١٢٩٤- عَنْ أَبِي ذَرّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ الْمَنَّانُ بِمَا أَعْطَى وَالْمُسْبِلُ إِزَارَهُ وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ. رَوَاهُ النسائي مسلم وأبو داود[1].

ئەبو ذەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (صەلاتو سەلامو سۆزو درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەم سێ کەسە لە ڕۆژی قیامەتا خودای گەورەو سەروەر نەقسەی خۆشیان لەگەڵ دەکاو نە بەچاوی میهرەبانیو ڕەحمەت تەماشایان دەکاو نە تاریفیان دەکاو نە پاکیان دەکاتەوە[1] وە سەرەڕای ئەوەیش سزایەکی سەختی بە سۆیشیان بۆ هەیە:

یەکەم: ئەو کەسەی منەت بکاو بنازێ بەو خێرو دەسەنەیەی کە دەیکا.

دووەم: ئەو کەسەی کە بۆ فیزو دەعیە جلو بەرگی خۆی شۆڕ بکاتەوەو بیخشێنێ لە زەوی!.

سێیەم: ئەو کەسەی کە بە سوێندی درۆ کاڵاو شتومەکی خۆی ساخ بکاتەوە (ن/م/د).

---

(١) مسلم. إيمان: ٢٨٩. أبو داود. لباس: ٤٠٨٧. ٤٠٨٨. ترمذي. بيوع: ١٢١١. نسائي. زكاة: ٢٥٦٢.

(١) واتە: لە هیچ ڕوویەکەوە ڕوویان ناداتێ. — وەرگێڕ -

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٢٥) نامەی ڕۆژوو

(ئەم نامەیە هەشت باس و پاشەكییەكە)

### باسی یەكەم: ڕۆژووی ڕەمەزان فەرزە

### كتاب الصيام: وفيه ثمانية أبواب وخاتمة

### الباب الأول: في فرضية صوم رمضان

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ. أَيَّاماً مَعْدُودَاتٍ}.

یەزدانی مەزن دەفەرموێ: ئەی كەسانێ كە خاوەنی باوەڕو ئیمانن! ڕۆژوو فەرزكراوەو دانراوە لەسەرتان هەروەك دانراوە لەسەر ئەو گەلانەی لەپێش ئێوەدا بوون، بەهیوای ئەوە كە لەخودا بترسن و خۆتان بپارێزن لە سزای پەروەردگار، ئەو ڕۆژووەیش وا لەچەن ڕۆژێكی هەڵژمێراودا، وەك مانگی ڕەمەزان بێ.

{وَ قَالَ:اللهُ تَعَالَى – شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ}.

خودای مەزن دەفەرموێ: مانگی ڕەمەزان ئەو مانگە پیرۆزەیە كە قورئانی پیرۆزی تیا نێردراوەتە خوارەوە، بۆ سەر حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) ئەو قورئانەی كە بووەو دەبێ بە ڕێنومای هۆشمەندان بۆ بیروباوەڕی باش و بۆ كردەوەی چاك، هەر وەك بووەو دەبێ بەشایەت و بەڵگەو نیشانەی درەخشان لەسەر پێغەمبەرێتیی موحەممەد، وە بووەو دەبێ بەهۆی شارەزایی هۆشیاران، وە بەهۆی جیاكردنەوەی ڕاست لە ناڕاست و حەق لە ناحەق، دەی هەر كەسێ لە ئێوە لەو مانگەدا لەجێی خۆی بوو، واتە: لەشی ساخ بوو، وە لە سەفەردا نەبوو، با ڕۆژووەكەی بگرێ.

**١٢٩٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَلِكٍ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **قَالَ: نُهِينَا أَنْ نَسْأَلَ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **عَنْ شَيْءٍ فَكَانَ يُعْجِبُنَا أَنْ يَجِيءَ الرَّجُلُ الْعَاقِلُ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ فَيَسْأَلَهُ وَنَحْنُ نَسْمَعُ فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَتَانَا رَسُولُكَ فَزَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزْعُمُ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَرْسَلَكَ قَالَ: صَدَقَ. قَالَ: فَمَنْ خَلَقَ السَّمَاءَ. قَالَ: اللَّهُ. قَالَ: فَمَنْ خَلَقَ الأَرْضَ قَالَ: اللَّهُ. قَالَ: فَمَنْ نَصَبَ فِيهَا الْجِبَالَ وَجَعَلَ فِيهَا مَا جَعَلَ قَالَ: اللَّهُ. قَالَ: فَمَنْ جَعَلَ فِيهَا الْمَنَافِعَ قَالَ: اللَّهُ. قَالَ: فَبِالَّذِي خَلَقَ السَّمَاءَ وَخَلَقَ الأَرْضَ وَنَصَبَ فِيهَا الْجِبَالَ وَجَعَلَ فِيهَا الْمَنَافِعَ آللَّهُ أَرْسَلَكَ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ قَالَ: صَدَقَ. قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا زَكَاةَ أَمْوَالِنَا قَالَ: صَدَقَ. قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا صَوْمَ شَهْرِ رَمَضَانَ فِي كُلِّ سَنَتِنَا. قَالَ: صَدَقَ. قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ أَنَّ عَلَيْنَا الْحَجَّ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً. قَالَ: صَدَقَ. قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَوَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لاَ أَزِيدَنَّ عَلَيْهِنَّ شَيْئًا وَلاَ أَنْقُصُ. فَلَمَّا وَلَّى قَالَ: النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **لَئِنْ صَدَقَ لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ. وَزَادَ فِي رِوَايَةٍ: فَقَالَ: الرَّجُلُ: آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ أَخُو بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ. رَوَاهُ الخمسة إلا أبا داود[1].**

**ئەنەس كوڕی مالیك** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: نەهیمان لێ كرابوو كە شت زۆر بپرسین لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **جا لەبەر ئەوە حەزمان دەكرد كە پیاوێكی هۆشیاری دەشتەكی بێ بۆ خزمەتی، وە پرسیاری لێ بكا، تا ئێمەیش گوێمان لێبێ!**

**جا رۆژێ پیاوێ (لە دەشتەوە هات) گوتی: ئەی موحەممەد! رابەری تۆ هاتووە بۆ ناومان دەڵێ: گوایە تۆ دەڵێی: من فروستادەو پێغەمبەری خودام. فەرمووی: راست دەكا گوتی: كەواتە كێ ئەم ئاسمانەی دروست كردووە؟**

---

[1] بخاري. علم: ٦٣. مسلم. إيمان: ١٠٢. ترمذي. زكاة: ٦١٩. نسائي. صوم: ٢٠٩٠.

فەرمووی: خودا گوتی: ئەی کێ ئەم زەوییەی دروست کردووە؟ فەرمووی: (خودا) گوتی: ئەی کێ ئەم شاخو کێوانەی داکوتاوەو ئەم کانو کانیو بەروبوومو شتومەکەی تیا داناوە؟ فەرمووی: خودا گوتی: دەسا توبیتو ئەو خودایەی کە ئەم ئاسمانو زەوییەی دروست کردووەو ئەم شاخانەی داکوتاوەو کردوونی بە مێخ بۆ دامەزراندنی زەویو بۆ راگتنی لەنگەری جموجوولی ئایا خودا تۆی رەوانەکردووە یانا؟ فەرمووی: بەڵێ من رەوانەکراوی خودام گوتی: رابەرەکەت دەڵێتیش: گوایە شەوو رۆژی پێنج نوێژمان لە سەرە؟ فەرمووی: راست دەکا گوتی: جا تۆ ئەو کەسەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەر ئایا خودا ئەمەی پێ گوتووی؟ فەرمووی: (بەڵێ) گوتی: رابەرەکەت دەشڵێ: زەکات لە ماڵەکانیشمان دەکەوێ؟ فەرمووی: راست دەکا گوتی جا تۆ ئەو کەسەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەر ئایا خودا ئەمەی پێ گوتووی؟ فەرمووی: بەڵێ گوتی: جا رابەرەکەت دەیشڵێ: گوایە هەموو ساڵێ رۆژووی مانگی رەمەزانمان لەسەرە. فەرمووی: راست دەکا گوتی: جاتۆ ئەو کەسەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەر ئایا خودا ئەمەی پێ گوتووی؟ فەرمووی: بەڵێ گوتی: رابەرەکەت دەشڵێ: گوایە حەجی خانەی خودایشمان لەسەرە، بۆ کەسێ تەواناى چوونو هاتنەوەی هەبێ. فەرمووی: راست دەکا. گوتی: ئینجا پیاوەکە رۆیشت، پیاوەکە گوتیشی: بەو کەسە کە تۆی کردووە بە پێغەمبەرو ئەم ئایینە راستو دروستەی پێ داوی نە لەمانە زیاتر دەکەمو نە لەمانەیش کەمتر دەکەم پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر راست بکا دەچێتە بەهەشت.

لە گێرانەوەیەکا ئەمەشی پترە: جا پیاوەکە گوتی: من باوەڕم هێناوە بەم ئایینەی تۆ هێناوتە، وە من نوێنەری هۆزەکەمم کە لەلای خۆمان چاوەنواڕی من دەکەن تا خەبەری تۆیان بۆ بەرمەوە وە من ضیمامی کوڕی ثەعلەبەم لە خێڵی بەنی سەعدی کوڕی بەکرم (ش/ت/ن).

**١٢٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَتَاكُمْ رَمَضَانُ شَهْرٌ مُبَارَكٌ فَرَضَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَيْكُمْ صِيَامَهُ تُفْتَحُ فِيهِ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَتُغْلَقُ فِيهِ أَبْوَابُ الْجَحِيمِ وَتُغَلُّ فِيهِ مَرَدَةُ الشَّيَاطِينِ لِلَّهِ فِيهِ لَيْلَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ مَنْ حُرِمَ خَيْرَهَا فَقَدْ حُرِمَ. رَوَاهُ النسائي والبيهقي[٢].**

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت درووو سەلامو صەلاتو میهرەبانی خودای لەسەربێ و سەروماڵو منداڵو خاوو خێزان بە قوربانی بێ فەرمووی: وا رەمەزان هات بۆلاتان، مانگێکی پیرۆزە، خودای گەورەو سەروەر گرتنی رۆژووی ئەم مانگەی داناوە لە سەرتان، لەم مانگەدا دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوەو دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن دێوە یاخییەکانو شەیتانە لە فەرمان دەرچووەکانی تیا کۆتو سنك دەکرێن، شەوێکی تیایە، شەوی خودایە! ئەو شەوە چاکترە لە هەزارمانگ، ئەوەی لە بەهرەی ئەم شەوە پیرۆزە نائومێدو بێ بەش بێ ئەوە بەراستی نائومێدو بەشبڕاو خۆیەتی (ن/بەیهەقی — رەحمەتی خودایان لێبێ).**

**١٢٩٧- عَنْ النَّضْرُ بْنُ شَيْبَانَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: قُلْتُ لأَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ حَدِّثْنِي بِشَيْءٍ سَمِعْتَهُ مِنْ أَبِيكَ سَمِعَهُ أَبُوكَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْسَ بَيْنَ أَبِيكَ وَبَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحَدٌ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ. قَالَ: نَعَمْ حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فَرَضَ صِيَامَ رَمَضَانَ عَلَيْكُمْ وَسَنَنْتُ لَكُمْ قِيَامَهُ فَمَنْ صَامَهُ وَقَامَهُ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ. رَوَاهُ النسائي وأحمد[٣].**

**نەضری کوڕی شەیبان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: گوتم بە ئەبو سەلەمەی کوڕی ئەورەحمان (خودایان لێ رازی بێ): لە بارەی مانگی رەمەزانەوە" فەرموودەیەکم پێ بڵێ کە تۆ خۆت یەك سەر لە باوکتت بیستبێ،**

---

[٢] سكت عنه الشارح.

[٣] سكت عنه الشارح.

وەباوكیشت بۆ خۆی لە پێغەمبەر خۆیی بیستبێ گوتی: بەڵێ باشە، گوتی: باوكم گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورەو پیرۆز گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزانی داناوە لە سەرتان، وە خۆیشم شەو نوێژەكەیم كردووە بە یاسا بۆتان جا هەر كەسێ (بە باوەڕی تەواوەوەو بە نیازێكی پاكەوە لەبەر ڕەزای خودا) ڕۆژووەكەی بگرێو شەو نوێژەكەی بكا ئەوە وەك ئەو ڕۆژەی كە لەدایك دەبێ ئاوا لە گوناه پاك دەبێتەوە (ن/ئەحمەد).

## ٢٦) باسی دووەم: باسی گەورەیی ڕۆژوو: (الباب الثاني: في فضائل الصوم)

١٢٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَقُولُ: قَالَ: اللّٰهُ تَعَالَى: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلاَّ الصِّيَامَ فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ فَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلاَ يَرْفُثْ يَوْمَئِذٍ وَلاَ يَصْخَبْ فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللّٰهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ وَإِذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ. رَوَاهُ الخمسة. وَفِي رِوَايَةٍ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ، الْحَسَنَةُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ قَالَ: اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ الصَّوْمَ فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ يَدَعُ شَهْوَتَهُ وَطَعَامَهُ مِنْ أَجْلِي[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورە لە حەدیسێكی قودسیدا دەفەرموێ: هەموو كردەوەیەكی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتیو بەشی دنیایی خۆیی پێوەیە بێجگە لە ڕۆژوو، بەڵام ڕۆژوو ساخ هەر بۆ منە، وە لەبەر ئەوە من خۆم پاداشی دەدەمەوە. وە ڕۆژوو قەڵغانەو مەردوم دەگێڕێتەوە لە خراپەو دەبێ بە

---

[1] بخاري. صوم: ١٩٠٤. مسلم. صوم ٢٧٠١، ٢٧٠٠. نسائي. صيام: ٢٢١٥. رياض: ١٢١٥/١ ز:٢١٧. رياض/ ١٢٢٠/٦ ز – ٢١٧.

حەساری ئاگری دۆزەخ! جا هەر رۆژێ بە رۆژوو بوون قسەی پڕو پووچ و شاتەشات مەکەن، ئەگەر یەکێکیش جنێوی پێ دان یا شەڕی پێ فرۆشتن بڵێن: من بابایەکی بەرۆژووم شەڕە جمێن و شەرکردن بۆ من نەهاتووە، بە زمانی بەرۆژووەوە دەمی خۆم چەپەڵ ناکەم!

بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی بە دەسە بۆنی بەڵخی دەمی رۆژووەوان (لەلای خودا) لە بۆنی میسك خۆشترە.

رۆژووان لە دوو کاتا شادو کەیف خۆش دەبێ: لەکاتی بەربانگا شادو کەیف خۆش دەبێ، وە لەو کاتەشا کە دەچێتەوە خزمەتی خودا بەهۆی رۆژووەکەیەوە تەواو کەیفخۆش دەبێ (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد چەند قات پاداشی دەدرێتەوە، چاکەیش یەك بەدەیە هەتا یەك بە حەوت سەدیش هەیە بەڵکوو زیاتریش خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: رۆژوو نەبێ چونکە رۆژوو ساخ هەر بۆمنە، وە پاداشی رۆژوو هەر بەخۆم دەدرێتەوە، رۆژووەوان لەبەر خاتری من واز لە هەوەس و ئارەزووی خۆی دێنێ و نان و ئاو لەخۆی قەدەغە دەکا.

١٢٩٩– وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ. رَوَاهُ الخمسة إلا أبا داود. ولفظ الترمذي: إِذَا كَانَ أَوَّلُ لَيْلَةٍ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ صُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ وَمَرَدَةُ الْجِنِّ وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ فَلَمْ يُفْتَحْ مِنْهَا بَابٌ وَفُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ فَلَمْ يُغْلَقْ مِنْهَا بَابٌ وَيُنَادِي مُنَادٍ يَا بَاغِيَ الْخَيْرِ أَقْبِلْ وَيَا بَاغِيَ الشَّرِّ أَقْصِرْ وَلِلَّهِ عُتَقَاءُ مِنَ النَّارِ وَذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ[٢].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ کە رەمەزان دێ دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو رەحمەت دەبارێ، دەرگاکانی دۆزەخ خڕ دادەخرێن، وە شەیتانەکان کۆت و زنجیرو کەلەپچە دەکرێن (ش/ت/ن) گفتەی (ت): کە یەکەم شەوی مانگی رەمەزان هات دێوو شەیتان و

---

[٢] بخاري. صوم: ١٨٩٨، ١٨٩٩، ٣٢٧٧. مسلم. صيام: ٢٤٩٣. نسائي. صيام: ٢٠٩٦ — ٢١٠٢.

جنۆكە سەركەش‌و یاخییەكان كۆت‌و زنجیر دەكرێن، وە دەرگاكانی دۆزەخ خڕ دادەخرێن‌و یەك دەرگایان ناكرێتەوە، وە دەرگاكانی بەهەشت دەخرێنە سەرپشت‌و یەك دەرگایان داناخرێ.

جاڕچییش جاڕ دەدا: ئەی خێرخوا! خێراكە، رۆژیەتی، وە ئەی شەڕخواز! وازبێنە، بەسیەتی، هەموو شەوێكیش لە رەمەزانا خودا دەستی خێر لە كەسانێ دەنێ كە شایستەی چوونە دۆزەخ بوون‌و لەئاگری دۆزەخ ئازادیان دەكا.

١٣٠٠- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. رَوَاهُ الخمسة وأحمد وزاد: وما تأخر[٣].

دیسان گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كەسێ رۆژووی رەمەزان بگرێ بە ئیمان‌و باوەڕەوە لەبەر رەزای خودا، خودا لە گوناهەكانی لەوەوپێشی خۆش دەبێ (ش/د/ت/ن/ئەحمەد) لە گێڕانەوەی ئەحمەددا: خودا لەگوناهی لەوەوبەرو لەوە دوای خۆش دەبێ.

١٣٠١- عَنْ سَهْلٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ بَابًا يُقَالُ لَهُ الرَّيَّانُ، يَدْخُلُ مِنْهُ الصَّائِمُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لاَ يَدْخُلُ مَعَهُمْ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ يُقَالُ أَيْنَ الصَّائِمُونَ فَيَدْ خُلُونَ مِنْهُ فَإِذَا دَخَلَ آخِرُهُمْ أُغْلِقَ، فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ أَحَدٌ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[٤].

سەهل (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەرگایەك هەیە لە بەهەشتا ناوی دەرگای تێراوە، لە رۆژی قیامەتا تەنها رۆژووەوانەكان لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوەو بەس. بانگەواز دەكەن: رۆژووەوانەكان كوان، جا ئەوانیش دەڕۆن لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوە، كە

---

[٣] بخاري. إيمان: ٣٧، ٣٥، ٣٨، ١٩٠١، ٢٠٠٨، ٢٠٠٩، ٢٠١٤. مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٧٦ — ١٧٧٨. نسائي. قيام الليل: ١٦٠١. أبو داود. صلاة: ١٣٧١. ترمذي. صوم: ٨٠٨. رياض: ١٢١٩/٥ ز- ٢١٧.

[٤] بخاری. صوم: ١٨٩٦، ١٨٩٧، ٢٨٤١، ٣٢١٦، ٣٦٦٦. مسلم. صوم: ٢٧٠٣ . رياض: ١٢١٧/٣ ز- ٢١٧.

دواكەسیان دەچێتە ژوورەوە ئیتر ئەو دەرگایە دادەخرێ‌و كەسی تری لێوە ناچێتە ژوورەوە (ش/ن).

١٣٠٢- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: عُمَرُ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): مَنْ يَحْفَظُ حَدِيثًا عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْفِتْنَةِ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ: أَنَا سَمِعْتُهُ يَقُولُ: فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَجَارِهِ تُكَفِّرُهَا الصَّلاَةُ وَالصِّيَامُ وَالصَّدَقَةُ. قَالَ: لَيْسَ أَسْأَلُ عَنْ ذِهِ، إِنَّمَا أَسْأَلُ عَنِ الَّتِي تَمُوجُ كَمَا يَمُوجُ الْبَحْرُ. قَالَ: وَإِنَّ دُونَ ذَلِكَ بَابًا مُغْلَقًا. قَالَ: فَيُفْتَحُ أَوْ يُكْسَرُ؟ قَالَ: يُكْسَرُ. قَالَ: ذَاكَ أَجْدَرُ أَنْ لاَ يُغْلَقَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. فَقُلْنَا لِمَسْرُوقٍ سَلْهُ أَكَانَ عُمَرُ يَعْلَمُ مَنِ الْبَابُ؟ فَسَأَلَهُ فَقَالَ: نَعَمْ، كَمَا يَعْلَمُ أَنَّ دُونَ غَدٍ اللَّيْلَةَ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٥].

حوذەیفە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: كێ فەرموودەكەی پێغەمبەری (درودی خودای لەسەربێ) لەبارەی ئاژاوەو فەرتەنەكانەوە لەبەرە؟ منیش گوتم: من، گوێم لێ بوو حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: ئەو فیتنەو ئاژاوەیەی كە پیاو تووشی دەبێ (بەهۆی كەس‌و كارو ماڵ‌و منداڵ‌و هاوسێ‌و دراوسێوە) نوێژو رۆژوو و خێركردن دەبن بە كەفارەتی‌و پاكی دەكەنەوە.

عومەر گوتی: مەبەستم ئەمەنیە، بەڵام لەو فیتنەو ئاژاوەیە دەپرسم كە وەك شەپۆلی دەریا شەپۆل ەدا، گوتم: ئەوە وا لە پشتی دەرگایەكی داخراوەوە، تا ئەو دەرگایە داخرابێ ئەو ئاژاوەیە رووندادا عومەر فەرمووی: جا ئەو دەرگایە دەكرێتەوە یا دەشكێنرێ؟ گوتم: دەشكێنرێ. گوتی: ئەمەیان بەگونجێ كە تا رۆژی قیامەت دانەخرێتەوە، قسەگێڕەوە (راوی) وتی: جا بە مەسرووقمان گوت: لە حوذەیفە بپرسە: ئایا عومەر خۆی دەیزانی ئەو دەرگایە كێیە؟ كە لێی پرسی گوتی: بەڵێ وەك چۆن دەیزانی كە رۆژ رۆیشت شەو دادێ ئاوایش ئەوەی دەزانی (ش/ت).

---

[٥] بخاري. رقاق: ٦٤٩٧، ٧٠٨٩، ٧٢٧٦. مسلم. إيمان: ٣٦٥. ترمذي. فتن: ٢١٧٩.

١٣٠٣– عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: أَرَأَيْتَ إِذَا صَلَّيْتُ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ وَصُمْتُ رَمَضَانَ وَأَحْلَلْتُ الْحَلاَلَ وَحَرَّمْتُ الْحَرَامَ وَلَمْ أَزِدْ عَلَى ذَلِكَ شَيْئًا أَأَدْخُلُ الْجَنَّةَ؟ قَالَ: نَعَمْ . قَالَ: وَاللّٰهِ لاَ أَزِيدُ عَلَى ذَلِكَ شَيْئًا. رَوَاهُ مسلم(٦).

**جابير** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پیاوێ پرسیاری لە پێغەمبەر کرد** (دروودی خودای لەسەربێ) **گوتی: پێم بفەرموو ئەگەر من نوێژە فەرزەکان بکەم و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرم و حەلاڵ بە حەلاڵ و حەرام بە حەرام بزانم و لەوەندە زیاتر هیچی تر نەکەم ئایا دەچمە بەهەشت؟ فەرمووی: بەڵێ دەچیتە بەهەشت پیاوەکە گوتی: دە بەخودا لەمە زیاتر هیچی تر ناکەم** (م – ڕەحمەتی خودای لێبێ).

١٣٠٤– عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ فَأَصْبَحْتُ يَوْمًا قَرِيبًا مِنْهُ وَنَحْنُ نَسِيرُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ وَيُبَاعِدُنِي مِنَ النَّارِ. قَالَ: لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ عَظِيمٍ وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللّٰهُ عَلَيْهِ تَعْبُدُ اللّٰهَ لاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ وَتَصُومُ رَمَضَانَ وَتَحُجُّ الْبَيْتَ. ثُمَّ قَالَ: أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ الصَّوْمُ جُنَّةٌ وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ النَّارَ الْمَاءُ وَصَلاَةُ الرَّجُلِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ شِعَارُ الصَّالِحِينَ. ثُمَّ قَرَأَ (تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ) حَتَّى بَلَغَ (جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ) ثُمَّ قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الأَمْرِ وَعَمُودِهِ وَذُرْوَةِ سَنَامِهِ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللّٰهِ. قَالَ: رَأْسُ الأَمْرِ الإِسْلاَمُ وَعَمُودُهُ الصَّلاَةُ وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ. ثُمَّ قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكَ بِمَلاَكِ ذَلِكَ كُلِّهِ. قُلْتُ بَلَى يَا نَبِيَّ اللّٰهِ قَالَ: فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ فَقَالَ: تَكُفُّ عَلَيْكَ هَذَا. قُلْتُ يَا نَبِيَّ اللّٰهِ وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ قَالَ: ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا مُعَاذُ وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ أَوْ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ. رَوَاهُ الترمذي في الإيمان وصححه(٧).

---

(٦) مسلم. إيمان ١١٠.

(٧) ترمذي: ٢٦١٩. رياض: ١٥٢٢/١٢ ز: ٢٥٤. قال النووي – رحمه الله تعالى – رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح. (مترجم).

موعاذی کوڕی جەبەل (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە سەفەرێکا لە خزمەتی حەزرەتدا بووم، ڕۆژێ بەدەم ڕۆیشتنەوە لێی نزیك بوومەوەو عەرزم کرد: ئەی ڕەهبەری خودا! کارێکم پێ بفەرموو کە بمباتە بەهەشتو لە ئاگری دۆزەخ دوورم بخاتەوە. فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): بەراستی لە شتێکی گەلێ گەورەو مەزنت پرسی، بەڵام ئاسانە بۆ کەسێ کە خودا بۆی ئاسانی بکا: هەر خودا دەپەرستیتو هیچ هاوبەشی بۆ پەیدا ناکەیتو نوێژەکانت دەکەیتو زەکات دەدەیتو ڕۆژووی ڕەمەزان دەگریتو حەجی خانەی خودا دەکەیت ئینجا فەرمووی: با دەرگا کانی جۆرەها خێرو چاکەی تریشت نیشان بدەم: ڕۆژوو قەڵغانو سوپەرەو وەك سەنگەرێکی قایمی پۆڵایین ڕۆژووەوان دەپارێزی لە گوناەو تاوان، خێرو بەخششو چاکەیش گوناە دەکوژێنێتەوە هەر وەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە ئاوا" وە شەو نوێژی پیاوی (خودا پێداوی)ش (لە جەرگەی شەودا کە مەردوم نوستووە دۆست خەبەر دارە) نیشانەو دروشمی پیاو چاکانە! گوتی: ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: (تتجافى جنوبهم عن المضاجع) تا گەیشتە (يعملون) سوورەتی سییو دوو، ئایەتی شانزەو حەڤدە. واتە: بە شەو دوورە پارێز لە نوێنو نووستنو خەریکی شەو نوێژو شەو طاعەتن لە خودا دەپارێنەوە، لاڵەو پاڵەو سکاڵا لە دەرگای پەروەردگاری خۆیانا دەکەن، هەم لەترسی سزاو تۆڵەی سەختیو هەم بە تەمای ڕێژنەی ڕەحمەتی، وە هەروەها لەو ڕزقو ڕۆژییە پاکەی کە خودا پێی داوون خێرو خێراتی باشی لێ دەکەن، ئەمانە مەگەر هەر خودای گەورە خۆی بزانێ کە لەباتی ئەم کردەوە باشانەیان خودای مەزن لە پەنامەکییەوە، لەژێر پەردەی غەیبەوە چی خێرو خۆشیو نازو نیعمەتێکی بۆ ئامادە کردوون!

ئینجا فەرمووی: با سەر ڕشتەی هەموو کارێکی باشو کۆڵەکەکەیو چڵەپۆپەی هەستوونەکەیت پێ بڵێم عەرزیم کرد: بفەرموو ئەی ڕەهبەری خودا! فەرمووی: سەر ڕشتەی هەموو کارێکی باش ئیسلامەتییە، وە کۆڵەکەکەی نوێژە، وە چڵەپۆپەی هەستوونەکەی خەباتو تێکۆشانە لە

**ڕێگـەی خـودادا. ئینجـا فـەرمووی: باشـیرازەی ئەمانەشـت هـەموو پـێ بڵـێم؟ عەرزم کرد: بفەرموو، قوربان! جا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **سـەری زمـانی خـۆی گـرتو فـەرمووی: زمـانی خـۆت بگـرە. منـیش گـوتم: بۆچـی ئـەی پێغەمبەری خودا! لەسەر ئەو قسانەیش کە دەیانکەین تاوانبار دەبین تووشی تۆڵەو سزا دەبین؟ فەرمووی: ئەی موعاذ! دایك ڕۆڵەڕۆت بۆ نەکا ئەی چی ئەو خەڵکە لە پەورووی یا فەرمووی: لـە سـەردەم لـەناو ئاگردا دەگـەوزێنێ جگـە لـە دروێنەی (داسی) زمانیان! (ت:ص)**[1].

**١٣٠٥– عَنْ أَبِي أُمَامَةَ** (رَضِي اللهُ عَنهُ) **قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مُرْنِي بِأَمْرٍ يَنْفَعُنِي اللَّـهُ بِهِ. قَالَ: عَلَيْكَ بِالصِّيَامِ فَإِنَّهُ لاَ مِثْلَ لَهُ. رَوَاهُ النسائي والحاكم وصححه**[8].

**ئـەبو ئومامـە** (خودای لێ رازی بێ) **گـوتی: عـەرزی حـەزرەتم كـرد** (درودی خودای لەسەربێ)**: قوربان! ئـەی ڕەوانـەکراوی خـودا! فرمـانێکی پـێ بڵـێ کـە خـودا بیکـا بەمایـەی خێـرو خۆشـی بـۆم؟ فـەرمووی: یەخـەی ڕۆژوو بگـرەو بـەری مـەدە، چونکە بەراستی وێنەی خۆی نییە (ن/حاکم:ص).**

## ٢٧) ڕۆژوو لە کەیەوە بۆ کەیەو لە پێشا چۆن بووە:

## فصل في أصل الصوم وبيان وقته

**١٣٠٦– عَنِ الْبَرَاءِ** (رَضِي اللهُ عَنهُ) **كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **إِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَائِمًا، فَحَضَرَ الإِفْطَارُ، فَنَامَ قَبْلَ أَنْ يُفْطِرَ لَمْ يَأْكُلْ لَيْلَتَهُ وَلاَ يَوْمَهُ، حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنَّ قَيْسَ بْنَ صِرْمَةَ الأَنْصَارِيَّ كَانَ صَائِمًا، فَلَمَّا حَضَرَ الإِفْطَارُ أَتَى امْرَأَتَـهُ، فَقَـالَ: لَهَـا**

---

(١) زمان داسە، یا دەیبڕێ، یا دەتبڕێ!

نان دەبڕێ، سەر دەبڕێ جەرگ دەبڕێ!

زبان گوێزان پاکو دەدا هەردوو جیهان

چارێ نیە یا دەیگرێ یا دەتگرێ! — وەرگێڕ —

[8] صحيح عند الحاكم.

أَعِنْدَكِ طَعَامٌ قَالَتْ: لاَ وَلَكِنْ أَنْطَلِقُ، فَأَطْلُبُ لَـكَ. وَكَـانَ يَوْمَـهُ يَعْمَـلُ، فَغَلَبَتْـهُ عَيْنَـاهُ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَتُهُ، فَلَمَّا رَأَتْهُ قَالَتْ خَيْبَةً لَكَ. فَلَمَّا انْتَصَفَ النَّهَارُ غُشِيَ عَلَيْهِ، فَـذُكِرَ ذَلِـكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَـثُ إِلَـى نِـسَائِكُمْ) فَفَرِحُوا بِهَا فَرَحًا شَدِيدًا، وَنَزَلَتْ (وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْـيَضُ مِـنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ). رَوَاهُ البخاري وأبو داود والنسائي. وَفِي رِوَايَةٍ: كَانَ النَّاسُ عَلَى عَهْـدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا صَلُّوا الْعَتَمَةَ حَرُمَ عَلَيْهِمُ الطَّعَامُ وَالشَّرَابُ وَالنِّـسَاءُ وَصَـامُوا إِلَى الْقَابِلَةِ فَاخْتَانَ رَجُلٌ نَفْسَهُ فَجَامَعَ امْرَأَتَهُ وَقَدْ صَلَّى الْعِشَاءَ وَلَمْ يُفْطِرْ فَأَرَادَ اللّٰهُ عَـزَّ وَجَلَّ أَنْ يَجْعَلَ ذَلِكَ يُسْرًا لِمَنْ بَقِيَ وَرُخْصَةً وَمَنْفَعَةً فَقَالَ: سُبْحَانَهُ (عَلِمَ اللّٰهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ). الآيَةَ[١].

**بەڕڕاء** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: جاران لەپێشدا یارانی موحەممەد** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە پاش بەربانگ هەر ئەوەندە ماوەی خواردن و خواردنەوەیان هەبوو هەتا دەخەوتن جاگریمان ئەگەر پیاوێ بە رۆژوو بووایەو بەربانگ ببوایەو پێش ئەوەی بەربانگ بکاتەوە خەوی لێ بکەوتایە ئیتر دەبوو ئەوشەوەیش هەتا سبەی ئێواری بەرۆژوو بووایەو هیچی نەخواردایەو رۆژووی نەشکاندایە. جا رۆژێ قەیسی کوڕی صیرمەی ئەنصاری بەرۆژوو دەبێ، کە بەربانگ دەبێ بەژنەکەی دەڵێ: بەربانگت لەلا دەست دەکەوێ؟ دەڵێ: نەء، بەڵام دەچم مشوورێکت بۆ دەخۆم قەیسیش ئەو رۆژە ئیش دەکاو ماندوو دەبێ، لەبەر ئەوە خەو زۆری بۆ دێنێ و خەوی لێ دەکەوێ، کاتێ کە ژنەکەی دێتەوەو دەیبینێ وا خەوی لێ کەوتووە دەڵێ: خانەخراپ چیت بەخۆت کرد! جا سبەینێ لە نیوەڕۆدا لەبەر توونێتی و برسێتی و ماندوێتی و شەکەتی، قەیس دەبوورێتەوە.**

**جا کە ئەم باسەیان بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **گێڕایەوە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:**

---

[١] بخاري. صوم: ١٩١٥، ٤٥٠٨.

{أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ}.

رەوا دراو حەڵاڵ كرا بۆ ئێوە لە شەوی رەمەزانا چوونەلای ژنەكانتان. جا موسوڵمانان ئەمەیان زۆر پێ خۆش بوو، وە ئەم ئایەتەیش هاتە خوارەوە:

{وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ}.

نان و ئاوبخۆن و بخۆنەوە تا سفیدەی بەیانیتان بۆ جیا دەبێتەوە لە روشتەی تاریكی شەو (ب/د/ن). لە گێرانەوەیەكا: لە سەردەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) لەپێشدا مەردوم كە نوێژی خەوتنیان دەكرد ئیتر تا شەوی دوایی خۆراك و حواردن و ژن و خواردنەوەیان لێ حەرام دەبوو، ئەمە وابوو تا پیاوێ گزی و ناپاكی لەگەڵ خۆیدا دەكاو لەپاشكردنی نوێژی خەوتنان لەگەڵ ژنەكەی دروست دەبێ، ئەمەیش لە كاتێكا لێی روودەدا كە ئەو پیاوە بەهانەی رەوای رۆژوو شكاندنی نابێ وەك سەفەرو نەخۆشین و چشتی وا جا خودا ویستی كە ئەمە بكا بەهۆی بارئاسانی و بارسووكی و رێبازو سوودو قازانج بۆ ئەم ئوممەتەیە هەتا هەتایە، جا خودا لەم رووەوە فەرمووی:

{عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ}.

تا كۆتایی ئایەت واتە: خودای گەورە باش دەزانێ و ئاگادارە كە ئێوە لەم بارەیەوە ناپاكی و فێڵتان لە نەفسی خۆتان كردووە، وە خۆتان پێ رانەگیراو خۆتان تووشی گوناه كرد، جا ئێستا كەوا ئێوە پەشیمانن لەوە خوایش تەوبەی ئێوەی گیراكرد، وە لێتان خۆش بوو..تاد.

١٣٠٧- عَنْ سَلَمَةَ عَنْ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) كَانَ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِيَ. حَتَّى نَزَلَتِ الآيَةُ الَّتِي بَعْدَهَا فَمَنْ شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ فَنَسَخَتْهَا[٢].

سەلەمەی كوڕی ئەكوەع (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: كە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

{وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ}.

پێویستە لەسەر ئەوانەی كە دەتوانن بەڕۆژوو بن و بە ڕۆژوو نابن تۆڵەی ئەو ڕۆژووەیان بدەن، بۆ هەر ڕۆژەی بە ئەندازەی خواردەمەنی گەدایەك. سەلەمە گوتی: كە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ئێمە بە ئارەزووی خۆمان بوو، ئەوەی ئارەزووی بوایە ڕۆژووی دەشكان و تۆڵە (فدیە)ی دەدا، جا ئەمە هەر وا مایەوە تا ئەم ئایەتەی پاشی هاتە خوارەوە كە دەفەرموێ:

{فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ}.

ئیتر ئەم ئایەتە ئایەتەكەی پێشووی هەڵوەشاندەوەو ڕۆژوو پێویست بوو لەسەر كەسێ كە بتوانێ بەڕۆژوو بێ و بەهانەی ڕۆژوو شكاندنی نەبێ (ش/د/ت/ن).

١٣٠٨- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ (حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ) قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَجْعَلُ تَحْتَ وِسَادَتِي عِقَالَيْنِ عِقَالاً أَبْيَضَ وَعِقَالاً أَسْوَدَ أَعْرِفُ اللَّيْلَ مِنَ النَّهَارِ. زَادَ فِي رِوَايَةٍ: فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ فِي اللَّيْلِ، فَلاَ يَسْتَبِينُ لِي، فَقَالَ: عَلَيْهِ الصَّلاَةُ والسَّلاَمُ: إِنَّ وَسَادَتَكَ لَعَرِيضٌ إِنَّمَا ذَلِكَ سَوَادُ اللَّيْلِ وَبَيَاضُ النَّهَارِ[٣].

عەدی كوڕی حاتەم (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: كە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

{حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ}.

---

[٢] بخاري. تفسير: ٤٥٠٧. مسلم. صوم: ٢٦٨٠، ٢٦٨١. أبو داود. صوم: ٢٣١٥. نسائي. صوم: ٢٣١٥.

[٣] بخاري. صوم: ١٩١٦، ١٩١٧، ٤٥١١، ٤٥٠٩، ٤٥١٠. مسلم. صيام: ٢٥٢٨.أبو داود.صوم: ٢٣٤٩. ترمذي. تغير: ٢٩٧١.

بخۆن و بخۆنەوە تا هێلی ڕەشی شەو لە هێڵی سپی ڕۆژ، جیا دەکەنەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من بەشەو دوو پەت، یەکێ سپی و یەکێ ڕەش، دەیان نێمە ژێر سەرینەکەم و بەم جۆرە شەو لە ڕۆژ جیا دەکەمەوە! لە گێڕانەوەیەکا ئەمەیشی پترە: کەچی هەر تەماشایان دەکەم و شەوم لە ڕۆژ بۆ جیا ناکرێتەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر وابێ کە هێڵی ڕەش و سپی شەوو ڕۆژ لەژێر سەرینەکەتا جێگەی بێتەوە، دیارە سەرینەکەت گەلێ پانە! مەبەست ئەوە نیە، بەڵکوو مەبەست تاریکیی شەوو ڕووناکی ڕۆژە (ش/د/ت/ن).

١٣٠٩– عَنْ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ وَأَدْبَرَ النَّهَارُ وَغَابَتِ الشَّمْسُ فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ. روى هَذِهِ الثلاثة الأصول الخمسة[٤].

عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کە شەو داهات و ڕۆژ نەماو خۆر ئاوا بوو ئیتر کاتی بەربانگی ڕۆژووەوانە (ش/د/ت/ن).

١٣١٠– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُؤَذِّنَانِ بِلاَلٌ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ . قَالَ: وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا إِلاَّ أَنْ يَنْزِلَ هَذَا وَيَرْقَى هَذَا. رواه الشيخان[٥].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دوو بانگدەری هەبوو، یەکێکیان بیلال بوو، وە ئەویتریان ئیبنو ئوممی مەکتووم بوو، کە پیاوێکی کوێر بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: بیلال هێشتا شەوی دەمێنێ کە بانگ دەدا، جا لەبەر ئەوە بخۆن و بخۆنەوە تا ئیبنو ئوممی مەکتووم بانگ دەدا گوتی: هەر ئەوەندەشیان بەین بوو کە ئەمیان دادەبەزی و ئەویتریان سەر دەکەوت (ش).

---

[٤] بخاري. صوم: ١٩٥٤. مسلم. صيام: ٢٥٥٣. أبو داود. صوم: ٢٣٥١. ترمذي. صوم: ٩٦٨. رياض: ١٢٣٦/٤ ز- ٢٢٢.

[٥] بخاري. أذان: ٦٢١، ٥٢٩٨، ٧٢٤٧. مسلم. صوم: ٢٥٣١ — ٢٥٣٦. رياض: ١٢٣١/٣ ز-٢٢١.

## ٢٨) نیشانەی سپیدپەهنا (فەجری صادق) : (علامة الفجر الصادق)

١٣١١- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَغُرَّنَّكُمْ مِنْ سُحُورِكُمْ أَذَانُ بِلاَلٍ وَلاَ بَيَاضُ الأُفُقِ الْمُسْتَطِيلُ حَتَّى يَسْتَطِيرَ هَكَذَا. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري ولفظ الترمذي: لاَ يَمْنَعَنَّكُمْ مِنْ سُحُورِكُمْ أَذَانُ بِلاَلٍ وَلاَ الْفَجْرُ الْمُسْتَطِيلُ وَلَكِنِ الْفَجْرُ الْمُسْتَطِيرُ فِي الأُفُقِ[1].

سەموورەی کوڕی جوندوب (خوادی لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بۆ پارشێوتان نە بانگی بیلال و نەسپیدە بالاّ (فەجری کازب = بەیانییە درۆزنە) تەفرەتان نەدەن و ڕێگەی هیچتان لێ نەگرن چونکە ئەو کاتە هێشتا شەوی ماوە، بخۆن و بخۆنەوە هەتا سپیدە پەهنا (فەجری صادق = بەیانی تەواو) دەدا (م/د/ت/ن) گفتەی (ت): نە بانگی بیلال و نە سپیدە بالاّ ڕێگەی پارشێوتان لێ نەگرن بخۆن و بخۆنەوەو بچنە لای ژنی خۆتان هەتا شەبەق دەداو ڕووناکی بلاّو دەبێتەوە بە کەناری ئاسمانا.

## ٢٩) باسی سێهەم: گرتن و شکاندنی ڕۆژوو بەدیتنی مانگی نوێ پێویست دەبێ
## الباب الثالث: يجب الصوم والإفطار برؤية الهلال

١٣١٢- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَصُومُوا حَتَّى تَرَوُا الْهِلاَلَ، وَلاَ تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ. رَوَاهُ الخمسة ولفظ الترمذي: لاَ تَصُومُوا قَبْلَ رَمَضَانَ صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ فَإِنْ حَالَتْ دُونَهُ غَيَايَةٌ فَأَكْمِلُوا ثَلاَثِينَ يَوْمًا[1].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ خۆش نوودبێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: تا مانگی نوێ نەبینن نە بیکەن بە ڕەمەزان و نە بیکەن بە جەژن!

---

[1] مسلم. صوم ٢٥٣٩. أبو داود. صوم: ٢٣٤٦. ترمذي. صوم: ٧٠٦. نسائي. صوم: ٢١٧٠.

[1] بخاري. صوم: ١٩٠٠، ١٩٠٧، ١٩٠٦. مسلم. صوم: ٢٤٩٥. نسائي. صوم: ٢١٢٠. رياض الصالحين: ١٢٢١/٧ ز- ٢١٩.

ئەگەر هەورو هەڵابوو وە هەور بەری مانگی گرتبوو سیی رۆژی تەواو دابنێن بۆ مانگی پێشوو (ش/د/ت/ن) گفتەی (ت): لەپێش رەمەزاندا بەرۆژوو مەبن، تا مانگی نوێش نەبینن نە بیكەن بە رەمەزانو نە بیكەن بە جەژن، ئەگەر هەورو هەڵاش بەری مانگی گرتبوو سی رۆژەكە تەواو بكەن.

١٣١٣- وَلِلْبُخَارِيِّ: فَإِنْ أُغْمَّ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلاَثِينَ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَإِنْ أُغْمَّ عَلَيْكُمْ فَصُومُوا ثَلاَثِينَ يَوْمًا[٢].

لە حەدیس دا دەفەرموێ: ئەگەر وابوو هەور بەری ئاسمانی گرتبوو، ژمارەی كوڵە مانگ (شەعبان) بكەن بەسیی رۆژی تەواو (ب) لە گێڕانەوەیەكا: ئەگەر هەورو هەڵای لێ كردن سیی رۆژی تەواو بەرۆژوو بن.

١٣١٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ، لاَ نَكْتُبُ وَلاَ نَحْسُبُ الشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا . يَعْنِي مَرَّةً تِسْعَةً وَعِشْرِينَ، وَمَرَّةً ثَلاَثِينَ. رَوَاهُ الثلاثة والنسائي[٣].

دیسان ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئێمە گەلێكی نەخوێندەوارو بێ سەوادین، نوسینو ئەستێرەژمێریی نازانین، جا لەبەر ئەوە خودای میهرەبان بەپێی حاڵ، نیشانەی ئاسانو ئاشكرای بۆ داناوین، بۆ زانینی كاتی طاعەتو پەرستشو شتی ترمان، وەك دیتنی خۆرو دیتنی مانگی یەك شەوە هەموو مانگێكیش وە نەبێ سیی رۆژی تەواو بێ، مانگ وا دەبێ ئەوەندەیەو وا دەبێ ئەوەندەیە واتە: رێ دەكەوێ مانگ بیستو نۆ رۆژ دەبێ وە رێ دەكەوێ مانگ سیی رۆژ دەبێ (ش/د/ن).

١٣١٥- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) آلَى مِنْ نِسَائِهِ شَهْرًا، فَلَمَّا مَضَى تِسْعَةٌ وَعِشْرُونَ يَوْمًا غَدَا أَوْ رَاحَ فَقِيلَ لَهُ إِنَّكَ حَلَفْتَ أَنْ لاَ تَدْخُلَ شَهْرًا. فَقَالَ:

---

[٢] بخاري. صوم: ١٩٠٠ (رياض: ١٢٢١/٧ ز- ٢١٩. مسلم: ١٠٨١).

[٣] بخاري. صوم: ١٩١٣. مسلم. صوم: ٢٥٠٨. أبو داود. صوم: ٢٣١٩. نسائي. صوم: ٢١٣٩، ٢١٤٠.

إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ يَوْمًا. رَوَاهُ الخمسة إلا أبا داود. وزاد مسلم: ثُمَّ طَبَّقَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدَيْهِ ثَلاثًا مَرَّتَيْنِ بِأَصَابِعِ يَدَيْهِ كُلِّهَا وَالثَّالِثَةَ بِتِسْعٍ مِنْهَا[٤].

ئوممو سەلەمە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سوێندی خوارد لە ژنەکانی کە یەك مانگ نەچێتە لایان، جا لەپاش بیستو نۆ ڕۆژ سەر لەبایانی، یا سەر لە ئێوارە، چوو بۆ لایان، کە پێیان گوت: خۆتۆ سوێندت خواردبوو کە یەك مانگ نەچیت بۆ لایان؟ فەرمووی: مانگ بیستو نۆ ڕۆژیش دەبێ خۆ مەرج نیە کە گشت مانگێ سیی ڕۆژی دەق بێ (ش/ت/ن) موسلیم (ڕەحمەتی خودای لێبێ) ئەمەشی پتر کردووە: ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەم مەبەستەی دووپات کردەوە بەم ڕەنگە: سێ جار هەردوو دەستی خۆی ماڵی بەیەکا، دوو جاریان بەهەر دەپەنجەکەیو جاری سێیەم بە نۆ پەنجەی، کە دەکەنە (٢٩) بیستو نۆ ڕۆژ.

١٣١٦- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: شَهْرَا عِيدٍ لاَ يَنْقُصَانِ رَمَضَانُ وَذُو الْحِجَّةِ. رَوَاهُ الأربعة[٥].

ئەبو بەکرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دوو مانگی دوو جەژنەکە (واتە: مانگی ڕەمەزانو مانگی قوربان) بە دەگمەن ڕێ دەکەوێ کە هەردوو مانگەکان، لەیەك ساڵا لەسیی ڕۆژ کەمتر بن (ش/د/ت).

## ٣٠) دیتنی مانگی نوێ بەشایەتیی پیاوێکی ڕاستاڵ ساغ دەبێتەوە: تثبت رؤية الهلال ولو بشهادة عدل

١٣١٧- عَنْ حُسَيْنُ بْنُ الْحَارِثِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَطَبَ أَمِيرُ مَكَّةَ ثُمَّ قَالَ: عَهِدَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ نَنْسُكَ لِلرُّؤْيَةِ فَإِنْ لَمْ نَرَهُ وَشَهِدَ شَاهِدَا عَدْلٍ نَسَكْنَا بِشَهَادَتِهِمَا. رَوَاهُ أبو داود والدارقطني وصححه[١].

---

[٤] بخاري. صوم: ١٩١٠، ٥٢٠٢. مسلم. صوم: ٢٥١٩، ٢٥١٦ — ٢٥٢٠. ترمذي. تفسير: ٣٣١٨. نسائي. صوم: ٢١٣٠.

[٥] بخاري. صوم: ١٩١٢. مسلم. صوم: ٢٥٢٦. أبو داود. صوم: ٦٩٢.

[١] صحيح عند الدارقطني.

حوسەینی کوڕی حاریث (خودای لێ رازی بێ) گوتی: فەرمانڕەوای مەککە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمربوو وتارێکی دا، گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێمان داوە کە بەدیتنی مانگی نوێ دەست بکەین بە پەرستش‌و خودا پەرستی واتە: بەرۆژوو گرتن. جا ئەگەر مانگمان نەدی بەڵام دووپیاوی بەداد (عادڵ) شایەتییان دا ئەوا لەسەر شایەتییەکەی ئەوان دەست دەکەین بە جێبەجێکردنی دەستووراتی ئایینی خۆمان. (د/داره قوطني:ص).

١٣١٨- عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اخْتَلَفَ النَّاسُ فِي آخِرِ يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ فَقَدِمَ أَعْرَابِيَّانِ فَشَهِدَا عِنْدَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِاللّٰهِ لأَهَلاَّ الْهِلاَلَ أَمْسِ عَشِيَّةً فَأَمَرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) النَّاسَ أَنْ يُفْطِرُوا زَادَ خَلَفٌ فِي حَدِيثِهِ وَأَنْ يَغْدُوا إِلَى مُصَلاَّهُمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد بسند صحيح[٢].

پیاوێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: لەسەر ئاخرەمین رۆژی رەمەان بوو بە مقۆمقۆیان، تا دوو عارەبی دەشتەکی هاتن، لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) شایەتیان داو خودایان کرد بە شایەت لەسەر ئەوە: کە دوێنێ ئێوارە بەچاوی خۆمان مانگمان دی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی کرد بە مەردوم کە دەست بەجێ رۆژوو بشکێنن‌و چاوەڕوانی ئێوارە نەکەن وە بۆ سبەینێ بەیانی بڕۆن بۆ نوێژگاکە بۆ کردنی نوێژی جەژن (د/ئەحمەد-س/ص).

١٣١٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: تَرَاءَى النَّاسُ الْهِلاَلَ، فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنِّي رَأَيْتُهُ فَصَامَهُ وَأَمَرَ النَّاسَ بِصِيَامِهِ. رَوَاهُ أبو داود وابن حبان والحاكم وصححه[٣].

---

[٢] سند صحيح.

[٣] صحيح عند الحاكم.

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: لەناو مەردوومدا مقۆمقۆ داكەوت كە دەڵێت: مانگیان دیوە، منیش عەرزی پێغەمبەرم كرد: كەمن مانگم دیوە، جا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **هەم خۆی بە رۆژوو بوو وە هەم فەرمانی دا بە مەردووم كە بەرۆژووبن (د/ئیبنو حەببان/حاكم:ص).**

**١٣٢٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) **قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ الْهِلاَلَ فَقَالَ: أَتَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَتَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: يَا بِلاَلُ أَذِّنْ فِي النَّاسِ فَلْيَصُومُوا غَدًا. رَوَاهُ أصحاب السن وابن حبان والحاكم**[٤].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: عارەبێكی دەشتەكی هات عەرزی حەزرەتی كرد: كە من بۆ خۆم مانگم دی، پێغەمبەریش** (درودی خودای لەسەربێ) **پێی گوت: ئایا شایەتی دەدەی كە هەر خودا خوایە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەدی باشە ئەی شایەتی دەدەی كە موحەممەد پێغەمبەری خودایە؟ گوتی: بەڵێ. فەرمووی** (درودی خودای لەسەربێ)**: ئەی بیلال! جاڕ هەڵدە بەناو مەردوما با بەیانی بەرۆژوو بن (د/ت/ن/ئیبنو حەببان/حاكم).**

## ٣١) گشت وڵاتێ دیتنی خۆی هەیە: (لكل قطر رؤيته)

**١٣٢١- عَنْ كُرَيْبٍ** (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) **أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بِنْتَ الْحَارِثِ بَعَثَتْهُ إِلَى مُعَاوِيَةَ بِالشَّامِ قَالَ: فَقَدِمْتُ الشَّامَ فَقَضَيْتُ حَاجَتَهَا وَاسْتُهِلَّ عَلَيَّ رَمَضَانُ وَأَنَا بِالشَّامِ فَرَأَيْتُ الْهِلاَلَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ ثُمَّ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فِي آخِرِ الشَّهْرِ فَسَأَلَنِي عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عَبَّاسٍ** (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا)**: مَتَى رَأَيْتُمُ الْهِلاَلَ؟ فَقُلْتُ: رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ. فَقَالَ: أَنْتَ رَأَيْتَهُ؟ فَقُلْتُ نَعَمْ وَرَآهُ النَّاسُ وَصَامُوا وَصَامَ مُعَاوِيَةُ. فَقَالَ: لَكِنَّا رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ السَّبْتِ فَلاَ نَزَالُ نَصُومُ حَتَّى نُكْمِلَ ثَلاَثِينَ أَوْ نَرَاهُ. فَقُلْتُ أَوَلاَ تَكْتَفِي بِرُؤْيَةِ مُعَاوِيَةَ وَصِيَامِهِ فَقَالَ: لاَ هَكَذَا أَمَرَنَا رَسُولُ اللّٰهِ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**.رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري**[١].

---

[٤] سكت عن درجته.

[١] مسلم. صوم: ٢٥٢٣. أبو داود صوم. ٢٣٣٢. ترمذى. صوم: ٦٩٣. نسائى. صوم: ٢١١٠.

**كورەیب** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: ئوممو فەزڵی كچی حاریث ناردمی بۆ لای معاوییە لەشام، ئیشەكەی ئوممو فەضلَم جێبەجێ كرد، لەوێ مام تا بوو بە رەمەزان، كە بوو بە رەمەزان من خۆم ئێوارەی شەوی هەینی مانگی نوێم دی. جا لە كۆتایی مانگی رەمەزانا هاتمەوە بۆ مەدینە، ئیبنو عەبباس لێی پرسیم: ئێوە كەی مانگتان دی؟ گوتم: شەوی هەینی مانگمان دی گوتی: تۆ خۆت دیت؟ گوتم: بەڵێ، وە خەڵكی تریش دینییانو هەموو بەرۆژوو بوونو موعاویەش بە رۆژوو بوو. گوتی بەڵام ئێمە ئێوارەی شەوی شەممە مانگمان دیوە، لەبەر ئەوە هەر بەرۆژوو دەبین تا سیی رۆژ تەواو دەكەین یاخۆمان مانگ دەبینین. گوتم: ئەی بە دیتنو بە بەرۆژوو بوونی معاوية اكتفاناكەی؟ گوتی: نەء، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **ئاوەها فەرمانی پێمان كردووە كە هەر وڵاتەی بە پێی رووانگە (مطلع)ی خۆیان رەفتار دەكەن (م/د/ت/ن).**

## ٣٢) باسی چوارەم: باسی نیتهێنانو ئەوەی كە بۆ رۆژووەوان جوانە بیكا:

## الباب الرابع: في النية وما يستحب للصائم

**١٣٢٢**–عَنْ حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (وَرَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلاَ صِيَامَ لَهُ. رَوَاهُ أصحاب السنن وابن خزيمة وابن حبان وصححاه[1].

**حەفصەی هاوسەری پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: هەر كەسێ بەر لە شەبەق نیازی رۆژووی (فەرز) نەهێنێ رۆژووەكەی دورست نیە. (د/ت/ن،ئیبنو خوزەیمە/ئیبنو ماجە: ص).**

**١٣٢٣**– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيِ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ فَقُلْنَا لاَ. قَالَ: فَإِنِّي إِذًا صَائِمٌ. ثُمَّ أَتَانَا يَوْمًا آخَرَ

---

[1] صحيح كما نص عليهِ المصنف فى نهاية الحديث.

فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ. فَقَالَ: أَرِينِيهِ فَلَقَدْ أَصْبَحْتُ صَائِمًا فَأَكَلَ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[٢].

**عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: رۆژێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **تەشریفی هات بۆلام، فەرمووی: هیچتان لەلا هەیە کە بیخۆم؟ گوتمان: نەخێر. فەرمووی: کەوابوو ئەمڕۆ بە رۆژوو دەبم. رۆژێکی تریش تەشریفی هات بۆلام عەرزمان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! چنگاڵی خورماو رۆن و کەشکیان بەدیاریی هێناوە بۆمان ئایا نافەرموویت لێی بخۆیت؟ فەرمووی: کوانێ خۆ من ئەمڕۆکە بەرۆژووشم، ئینجا رۆژووەکەی شکاندو دەستی کرد بە خواردنی** (م/د/ت/ن).

١٣٢٤- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً. رَوَاهُ الخمسة إلا أبا داود[٣].

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: پارشێو بکەن، چونکە بەرەکەت و پیت و فەڕ لە پارشێودایە** (ش/ت/ن) **لە گێڕانەوەیەکا لەسەر قسەی شەرحەکە: دەفەرموێ: ئەگەر چی بەقومێ ئاویش بووە هەر پارشێو بکەن!**

١٣٢٥- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فَصْلُ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ أَكْلَةُ السَّحَرِ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[٤].

**عەمری کوڕی عاص** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: جیاوازیی رۆژووی ئێمە لەگەڵ رۆژووی خاوەن نامەکان واتە: لەگەڵ رۆژووی گاورو جوولەکەکان، بە خواردنەکەی پارشێوە** (م/د/ت/ن).

---

[٢] مسلم. صوم: ٢٧٠٧، ٢٧٠٨. أبو داود صوم: ٢٤٥٥. ترمذي. صوم: ٧٣٣، ٧٣٤. نسائي. صوم ٢٣٢٤.

[٣] ١٩٢٣. مسلم. صوم: ٢٥٤٤. ترمذي. صوم: ٧٠٨. نسائي. صوم: ٢١٤٥. رياض: ١٢٢٩/١ ز -٢٢١.

[٤] مسلم. صوم: ٢٥٤٥. أبو داود صوم: ٢٣٤٣. ترمذي. صوم: ٧٠٩. رياض: ١٢٣٢/٤ ز- ٢٢١.

١٣٢٦- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: تَسَحَّرْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ. قُلْتُ كَمْ كَانَ بَيْنَ الأَذَانِ وَالسَّحُورِ؟ قَالَ: قَدْرُ خَمْسِينَ آيَةً. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٥].

(ئەنەس گوتی:) زەیدی کوڕی ثابیت (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) پارشێومان کرد، ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەڵسا چوو بەلای نوێژەوە. گوتم: نێوانی بانگی بەیانیو پارشێوەکە چەندە دەبوو؟ گوتی: بەقەد ئەوە دەبوو کە پەنجا ئایەت بخوێنی (ش/ت).

١٣٢٧- وَلِلنَّسَائِيِّ وَأَبِي دَاوُدَ: عَلَيْكُمْ بِغَدَاءِ السُّحُورِ فَإِنَّهُ هُوَ الْغَدَاءُ الْمُبَارَكُ[٦].

لە حەدیسێکا کە نەسائیو ئەبو داوود (خودایان لێ ڕازی بێ) ریوایەتیان کردووە: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: پارشێوان هەمیشە نان بخۆن، بەراستی ئەم نانە نانێکی موبارەكو پیرۆزە.

١٣٢٨- وَلأَبِي دَاوُدَ: نِعْمَ سَحُورُ الْمُؤْمِنِ التَّمْرُ[٧].

لە فەرموودەیەکا (کە ئەبو داوود گێڕاویەتەوە) حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خورما پارشێوی چاکە بۆ پیاوی موسوڵمان!

١٣٢٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اسْتَعِينُوا بِطَعَامِ السَّحَرِ عَلَى صِيَامِ النَّهَارِ وَبِالْقَيْلُولَةِ عَلَى قِيَامِ اللَّيْلِ. رَوَاهُ ابن ماجه والحاكم والطبراني[٨].

---

[٥] بخاري. صوم: ٥٨٥٠، ١٩٢١. مسلم. صوم: ٢٥٤٧. ترمذى. صوم: ٧٠٣، ٧٠٤. نسائى. صوم: ٢١٥٤، ٢١٥٥. رياض: ١٢٣٢/٤ ز-٢٢١.

[٦] المجتبى للنساى كله صحيح (المقدمه).

[٧] سكت عنه الشارح.

[٨] سكت عنه الشارح.

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: بە خواردنی خۆراکی پارشێو داوای یارمەتی بکەن، بۆ گرتنی ڕۆژووی ڕۆژ، وە بە نیوەڕۆ خەویش داوای یارمەتی بکەن بۆ کردنی شەونوێژ (ئیبنو ماجە/حاکم/ طەبەرانی).**

١٣٣٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ. رَوَاهُ الخمسة ولفظ أبي داود: لاَ يَزَالُ الدِّينُ ظَاهِرًا مَا عَجَّلَ النَّاسُ الْفِطرَ لأَنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى يُؤَخِّرُونَ[٩].

**سەهلی کوڕی سەعد** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: مەردووم هەتا پەلە لە بەربانگ بکەن و بەربانگ بەقنگا نەخەن و لەکاتی خۆیا ڕۆژوو بشکێنن نیشانەی ئەوەیە کە هێشتا هەر باشن و لەرێی ڕاست لایان نەداوە (ش/د/ت/ن) گفتەی (د): مەردوم هەتا زوو ڕۆژوو بشکێنن نیشانەی ئەوەیە کە هێشتا ئایین لەسەرەوەیە، چونکە جوولەکەو گاور درەنگ ڕۆژوو دەشکێنن و چاوەنواڕی هەڵهاتنی ئەستێران دەکەن.**

١٣٣١- وَلِلتِّرْمِذِي وَأَحْمَدَ: قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَحَبُّ عِبَادِي إِلَيَّ أَعْجَلُهُمْ فِطْرًا[١٠].

**لە حەدیثا دەفەرموێ** (دروودی خودای لەسەربێ)**: خودای سەردارو سەروەر، دەفەرموێ: لە حەدیثی قودسی دا: خۆشەویستترینی بەندەکانم لەلام ئەوانەیانە کە زوو تر بەربانگ دەکەنەوە (ت/ئەحمەد-س/ح).**

١٣٣٢- عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَمَسْرُوقٌ عَلَى عَائِشَةَ فَقُلْنَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ رَجُلاَنِ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) كِلاَهُمَا لاَ يَأْلُو عَنِ الْخَيْرِ أَحَدُهُمَا يُعَجِّلُ الإِفْطَارَ وَالصَّلاَةَ وَالآخَرُ يُؤَخِّرُ الإِفْطَارَ وَيُؤَخِّرُ الصَّلاَةَ. قَالَتْ أَيُّهُمَا الَّذِي

---

[٩] بخاري. صوم: ١٩٥٧. مسلم. صوم: ٢٥٤٩. ترمذي. صوم: ٦٩٩. رياض: ١/١٢٣٣ ز- ٢٢٢.

[١٠] بسند حسن (شرحه).

يُعَجِّلُ الإِفْطَارَ وَيُعَجِّلُ الصَّلاَةَ؟ قُلْنَا: عَبْدُ اللَّهِ ابْنَ مَسْعُودٍ. قَالَتْ: كَذَلِكَ كَانَ يَصْنَعُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالآخَرُ أَبُو مُوسَى. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[11].

**ئەبو عەطییە (خودای لێ ڕازی بێ) منو مەسرووق چووین بۆلای عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) پێمان گوت: ئەی دایكی موسوڵمانان! دوو پیاو هەن هەردووكیان بۆ خێرو چاكەكردن درێغی ناكەن، وە هەردووكیشیان لە یارانی موحەممەدن (بەڵام یەكێكیان زوو بەربانگ دەكاتەوەو زوویش نوێژی شێوان دەكا، وە ئەوی تریان درەنگ بەربانگ دەكاتەوەو درەنگیش نوێژی شێوان دەكا ئایا كاری كامەیان زۆر تەواوە؟ عائیشە گوتی: كامیان بەزوویی بەربانگ دەكاتەوەو بەزوویی نوێژی شێوان دەكا؟ گوتمان: عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود. گوتی: پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) جاران هەروەهای دەكرد. پیاوەكەی تریشیان ئەبو مووسا بوو (م/د/ت/ن).**

١٣٣٣- عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ فَإِنَّهُ بَرَكَةٌ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى مَاءٍ فَإِنَّهُ طَهُورٌ. رَوَاهُ أصحاب السنن[12].

**سەلمانی كوڕی عامیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەخورما بەربانگ بكەنەوە، چونكە شتێكی پیرۆزو موبارەكە، ئەگەر خورما نەبوو بەئاو ڕۆژووەكەتان بشكێنن، چونكە ئاو پاكەوەكەرە خوا حەزكا ڕۆژووەكەتان دەبێ بە پاكەوەكەری دەروونو دەرەوەتان (د/ت/ن-س/ص).**

---

[11] مسلم. صوم: ٢٥٥٢، ٢٥٥١. أبو داود صوم: ٢٣٥٤. ترمذي. صوم: ٧٠٢. نسائي. صوم: ٢١٧٥، ٢١٥٨ – ٢١٦٠. رياض: ١٢٣٤/٢ ز-٢٢٢.

[12] رياض: ١٢٣٨/٦ ز- ٢٢٢. أبو داود: ٢٣٥٥. ترمذي: ٦٥٨. قال النووي: حديث حسن صحيح.

١٣٣٤- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُفْطِرُ عَلَى رُطَبَاتٍ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ رُطَبَاتٌ فَعَلَى تَمَرَاتٍ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ حَسَا حَسَوَاتٍ مِنْ مَاءٍ. رَوَاهُ أبو داود والترمذى[١٣].

**ئەنەس** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: جاران پێغەمبەر** (درووودو صەلاتو سەلامی خودای لەسەر بێ و سەرو ماڵو منداڵ بە قوربانی بێ) **لە پێشكردنی نوێژی شێوانا بە چەند دەنگێ فەریكە خورما ڕۆژووەكەی دەشكاند، بەڵام ئەگەر فەریكە خورما نەبوایە بە چەند دەنگێ خورما دەیشكاند، جا ئەگەر خورمایش دەست نەكەوتایە ئەوسا بەچەن قومێ ئاو ڕۆژووەكەی دەشكاندو ئەوجا نوێژی شێوانی دەكردو لەپاش نوێژەكە شێوی دەكردەوە (د/ت-س/ح).**

١٣٣٥- وَلِلترمذي: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُفْطِرُ فِي الشِّتَاءِ عَلَى تَمَرَاتٍ وَفِي الصَّيْفِ عَلَى الْمَاءِ[١٤].

**گوتی: حەزرەت** (درووودی خودای لەسەربێ) **جاران لە زستانا بە چەند دەنكێ خورما ڕۆژووی دەشكاند، لەهاوینیشا بەئاو (ت).**

## ٢٣) نزای كاتی بەربانگ كردنەوە: (الدعاء عند الإفطار)

١٣٣٦- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَفْطَرَ قَالَ: ذَهَبَ الظَّمَأُ وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ وَثَبَتَ الأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللّٰهُ. رَوَاهُ أبو داود والنسائى[١].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: جاران پێغەمبەر** (درووودی خودای لەسەربێ) **كە بەربانگی دەكردەوە دەیفەرموو:**

{ذَهَبَ الظَّمَأُ وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ وَثَبَتَ الأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللّٰهُ}.

---

[١٣] بسند حسن (شرحه) (رياض: ١٢٣٩/٧ ز-٢٢. أبو داود: ٢٣٥٦. ترمذى: ٦٩٤. حديث حسن).

[١٤] سكت عنه الشارح.

[١] رَوَاهُ أبو داود بسند صالح (شرحه). (المجتبى للنساء كله صحيح المقدمة للتاج الجامع للأصول ص١٦).

تونێتی رۆیشتو رەگو دەمارەکان تەڕبوونەوە خوا حەزکا پاداشتیش جێگەی خۆی گرت (د-سند صالح-ن).

١٣٣٧- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) إِذَا أَفْطَرَ قَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ صُمْتُ وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ. رَوَاهُ أبو داود والطبراني. ولفظه: بِسْمِ اللهِ اللَّهُمَّ لَكَ صُمْتُ وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ[٢].

گوتی جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە رۆژووی دەشکاند دەیفەرموو: {اللَّهُمَّ لَكَ صُمْتُ وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ}.

خودایە! بۆ رەزای تۆ بەرۆژوو بووم و بەرزق و روزیی تۆ بەربانگ دەکەمەوە (د-سند صالح-طەبەرانی) گفتەی طەبەرانی: {بِسْمِ اللهِ اللَّهُمَّ لَكَ صُمْتُ وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ}.

بەناوی خودا، ئەی خودایە! لەبەر رەزای تۆ بە رۆژوو دەبم و بەرزق و رۆژیی تۆ بەربانگ دەکەمەوە!

١٣٣٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَفْطَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) عِنْدَ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فَقَالَ: أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ. رَوَاهُ ابن ماجه[٣].

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جارێ لەلای سەعدی کوڕی موعاذ بەربانگی کردەوەو فەرمووی:
{أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ}.

هەمیشە رۆژووەوانان بەربانگتان لە لابکەنەوەو پیاوچاکان نانتان بخۆن و فریشتەکان دروودو رەحمەتتان بۆ بنێرن! (ئیبنو ماجە).

---

[٢] سكت عنه الشارح.

[٢] (رياض: ١٣٦٧/٣. ز-٢٣١. قال النووي: رَوَاهُ أبو داود باسناد صحيح. أبو داود: ٣٨٢٤).

## ٣٤) پاراستنی زمان: (حفظ اللسان)

١٣٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلماً[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو کەسەی وازنەیەنێ لە قسەی ناڕەوا، خودا کاری بەوەی ئەو نیە کە دەمی خۆی ببەستێ و واز لە خواردن و خواردنەوە بێنێ[1] (ب/د/ت/ن).

١٣٤٠- تقدم تخريجه بمثل الحديث ١٢٩٨[2].

١٣٤١- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رُبَّ صَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ صِيَامِهِ إِلاَّ الْجُوعُ وَرُبَّ قَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ قِيَامِهِ إِلاَّ السَّهَرُ. رَوَاهُ ابن ماجه وأحمد والحاكم[3].

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: گەلێ رۆژووەوان هەیە، لە رۆژووەکەی تەنیا برسێتییەکەی پێ دەبڕێ چونکە بەکردنی قسەی ناڕەواو کاری ناڕەوا خێری رۆژووەکەی دەڕواو پووچ دەبێتەوە.

## ٣٥) باسی سیواك: (السواك)

١٣٤٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ. رَوَاهُ البخاری والشافعي والنسائی[1].

---

[1] (رياض ١٢٤١/٢. ز-٢٢٣. بخاري. ١٩٣٣. طرفه: ٦٦٦٩).

[1] زمانی پاراو لە یادی خودا — گولی مەجلیسە گەر خودا بیدا
زمانی پیسیش بەبڕین بچێ! — لە سەرو بنی خوایە ! مووددەرچێ

[2] راجع رقم ١٢٩٨، الذی سبق.

[3] بسند صحيح (شرحه).

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: سیواك سەرەڕای ئەوەی کە هۆی پاكو خاوێنییە بۆ دەمو ددان دەبێ بەهۆی ڕەزامەندیی خودای گەورەیش! (ب/شافیعی/ن).**

**١٣٤٣– عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ** (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) **قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **يَسْتَاكُ وَهُوَ صَائِمٌ. مَا لاَ أَعُدُّ وَمَا لاَ أُحْصِي. رَوَاهُ أبو داود والبخاري والترمذي[٢].**

**عامیری کوڕی ڕەبیعە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: جارەها حەزرەتم دیوە بە ڕۆژوو بووە، ئەوەندەیش لەوکاتەدا سیواکی دەکرد لە ژمارە نەدەهات بۆم! (د/ب–تعلیقا–ت).**

## ٣٦) خوێندنی قورئانو بەخشندەیی لە مانگی ڕەمەزانا گەلێ سوننەتن: تلاوة القرآن والكرم في رمضان

**١٣٤٤– عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ** (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) **قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ، وَكَانَ أَجْوَدُ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ، حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ، وَكَانَ جِبْرِيلُ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – يَلْقَاهُ كُلَّ لَيْلَةٍ فِي رَمَضَانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ، يَعْرِضُ عَلَيْهِ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **الْقُرْآنَ،وَفِي رِوَايَةٍ: فَيُدَارِسُهُ الْقُرْآنَ، فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – كَانَ أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ. رَوَاهُ الشيخان[١].**

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **بۆ بەخشندەیی و پیاوەتی و چاکەکردن لە وێنەی خۆی نەبوو! لە ڕەمەزانیشا (کە جوبرائیل** (درودی خودای لەسەربێ) **دەهات بۆلای لەم کاتەدا) لە هەموو کاتێکی تر زیاتر خێری دەکردو شتی دەبەخشی و بەخشندەتر بوو، جوبرائیلیش**

---

[١] تعليق قبل الرقم: ١٩٣٤ (رياض: ١٢٠٢/٧ ز- ٢١٥).

[٢] تعليق ذكره البخاري قبل الرقم: ١٩٣٤ في كتاب الصوم باب: سواك الرطب واليابس للصائم (مترجم).

[١] بخاري. بدء الوحي: ٥ (٦) ١٩٠٢، ٣٢٢٠، ٣٥٥٤، ٤٩٩٧. مسلم. فضائل: ٥٩٦٤ (رياض: ١٢٢٢/١ ز: ٢١٨).

(دروودی خودای لەسەربێ) عادەتی وابوو لە مانگی ڕەمەزانا هەتا مانگ تەواو دەبوو هەموو شەوێ دەهات بۆ خزمەتی. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەو ماوەیەدا دەوری قورئانی بۆ دەکردەوە هەتا بەباشی ڕەوانی بکاو لە یادی نەچێتەوە لە گێڕانەوەیەکا: جا جوبرائل دەوری قورئانی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەکردەوە خۆی لە پێشا جارێ بۆی دەخوێند، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دووبارەی دەکردەوە بۆی‌و ئەو گوێی لێی دەگرت جا لەم کاتەدا (کە جوبرائیل (دروودی خودای لەسەربێ) دەهات بۆ خزمەتی) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ بەخشندەیی‌و خێرخوایی سەری پێوەنەبوو، وە بۆ ئەمە ئەوەندە خێرابوو، وە ئەوەندە بەهەر چوارلادا شتی دەبەخشی دەتگوت بای هەڵکراوە، سۆزەی بە هەموو لایەکا دەگات! (ش).

١٣٤٥- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئًا. رَوَاهُ الترمذي وأحمد[٢].

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ بەربانگ بکاتەوە بە ڕۆژووەوانێ، بە قەد ڕۆژوەوانەکە خێرو پاداشی بۆ هەیە، بەڵام وە نەبێ لە خێرو پاداشی ڕۆژوەوانەکە هیچ کەم بکاتەوە (ت/ئەحمەد-س/ص).

١٣٤٦- عَنْ أُمِّ عُمَارَةَ الأَنْصَارِيَّةِ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ عَلَيْهَا فَقَدَّمَتْ إِلَيْهِ طَعَامًا فَقَالَ: كُلِي. فَقَالَتْ: إِنِّي صَائِمَةٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ الصَّائِمَ تُصَلِّي عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ إِذَا أُكِلَ عِنْدَهُ حَتَّى يَفْرُغُوا. وَرُبَّمَا قَالَ: حَتَّى يَشْبَعُوا. وَفِي رِوَايَةٍ: الصَّائِمُ إِذَا أَكَلَ عِنْدَهُ الْمَفَاطِيرُ صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ. رَوَاهُ الترمذى بسند صحيح[٣].

---

[٢] بسند صحيح (شرحه).

[٣] راجع نهاية الحديث نفسه.

ئـوم عیمـارەی ئەنـصارییە (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەربێ) تەشریفی هانی بۆلام، منیش نانم بۆ دروست کردو بۆم دانا، فەرمووی: خۆشت بخۆ گوتم: من بە ڕۆژووم. فەرمووی: هـەر ڕۆژووەوانی کەسانی تر شتی لە لابخۆن هەتا ئەوان لەو خواردنە دەبنەوە فریشتەکان ڕەحمەت دەڕێژن بەسەر ئەودا، یا فـەرمووی: هـەتا ئـەوان تێر دەخۆن..تاد. لـە گێڕانەوەیەکا: کاتێ بێ ڕۆژوو (موفطیر) دەخـوات لـەلای ڕۆژووەوان فریشتەکان ڕەحمـەتی بـۆ دەنێـرن و نـزای باشـی بـۆ دەکـەن (ت-س/ص = تیرمیـذی بەسـەندێکی صـەحیح ئـەم حەدیثەی گێڕاوەتەوە. ڕەحمەتی خودای گەورەی لێبێ. ئامین)

## ٣٧) شەونوێژی ڕەمەزان، واتە: نوێژی تەراویح: (قیام رمضان وهو التراویح)

١٣٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ فِيهِ بِعَزِيمَـةٍ فَيَقُـولُ: مَـنْ قَـامَ رَمَـضَانَ إِيمَانًـا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ ثُمَّ كَانَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ فِي خِلاَفَةِ أَبِي بَكْرٍ وَصَدْرًا مِنْ خِلاَفَةِ عُمَـرَ عَلَـى ذَلِـكَ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هـانی یـارانی دەدا لەسـەر کردنـی شـەو نوێـژی ڕەمـەزان، بـەلام جـەختی لێ نەدەکردن، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): کەسـێ شـەو نوێـژی ڕەمـەزان بکا، بـەئیمان و بـاوەڕەوە لەبـەر ڕەزای خـودا، خـودا لـە گوناهـەکانی لەوەوپێـشی خۆش دەبێ ئیتر هـەتا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) کۆچی دوایـی کرد ئـەم کـارە لەسـەر ئـەم بـارە بـوو هەرکەسـێ بۆ خـۆی بـە تـەنیا بە ئارەزووی خـۆی

---

[1] بخاري. صوم: ١٩٠١. مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٧٨. أبـو داود. صلاة: ١٣٧١. ترمـذي. صـوم: ٨٠٨. نسائی. صوم: ٢١٠٣ (ریاض: ١/١١٨٧ ز-٢١٣).

چەندێ ئارەزووی لێ بوایە ئەوەندە نوێژی تەراویحی دەکرد لە پاشیشا لەکاتی جێنشینی (خەلافەت)ی ئەبو بەکرو لە سەرەتای جێنشینیی عومەریشەوە ئەم کارە هەروابوو (ش/د/ت/ن).

١٣٤٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) خَرَجَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةً مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ، وَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلاَتِهِ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا، فَاجْتَمَعَ أَكْثَرُ مِنْهُمْ، فَصَلَّوْا مَعَهُ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا، فَكَثُرَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَصَلَّى، فَصَلَّوْا بِصَلاَتِهِ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ عَجَزَ الْمَسْجِدُ عَنْ أَهْلِهِ، حَتَّى خَرَجَ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ، فَلَمَّا قَضَى الْفَجْرَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، فَتَشَهَّدَ ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ مَكَانُكُمْ، وَلَكِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْتَرَضَ عَلَيْكُمْ فَتَعْجِزُوا عَنْهَا. فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ. رَوَاهُ الثلاثة[٢].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: شەوێ لە شەوەکانی ڕەمەزان حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەناو جەرگەی شەودا دەرچوو لەماڵ و چوو بۆ مەزگەوت و لەوێ دەستی کرد بە شەونوێژ، وە چەند پیاوێ لە یاران لە پشتیەوە ئیقتیدایان پێ کردو دەستیان کرد بە نوێژکردن لەگەڵیا، جا کاتێ ڕۆژبووەوە خەڵك ئەم باسەیان گێڕایەوە، وە لە شەوی دووەما خەڵك زۆرتر گردەوەبوون و پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) دیسان بەرنوێژیی بۆ کردنەوە، وە بۆ سبەینێ ئەم باسە تەواو بڵاوە بوو، جا بۆ شەوی سێیەم خەڵکێکی زۆر لە مزگەوت گردەوە بوون و دیسانەوە شەو نوێژیان بە جەماعەت لە پشت پێغەمبەرەوە کردەوە، جا لە شەوی چوارەما هاوڕێیانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوەندە کۆبووبوونەوە مزگەوت نەیدەگرتن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەم شەوەدا دەرنەچوو بۆ ناویان بۆ شەونوێژ، جا سبەینێ کە چوو بۆ ناویان و نوێژی سبەینێی بۆ کردن، ڕووی تێ کردن و شایەتمانی

[٢] بخاري. الجمعة: ٩٢٤. مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٨٠، ١٧٨١. نسائي. صوم: ٢١٩٢. أبو داود. صلاة: ١٣٧٣.

**هێناو فەرمووی** (دروودی خودای لەسەربێ)**: لەپاش سوپاس و ستایشی خودای گەورە، من ئەمشەو ئاگاداربووم لە هاتنی ئێوە بۆ مزگەوت و ئاگام لە حاڵتان بوو، بەڵام نەهاتم بۆ لاتان لەبەر ئەوە مەبادا ئەم تەراویحە فەرزیکرێ لەسەرتان، وە ئێوەیش بۆتان نەکرێ.**

**ئیتر هەتا حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **کۆچی دوایی کرد شەو نوێژیی رەمەزان هەر لەسەر ئەم شێوەیە بوو (ش/د).**

**١٣٤٩- عَنْ أَبِي ذَرٍّ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **قَالَ: صُمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **رَمَضَانَ فَلَمْ يَقُمْ بِنَا شَيْئًا مِنَ الشَّهْرِ حَتَّى بَقِيَ سَبْعٌ فَقَامَ بِنَا حَتَّى ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ فَلَمَّا كَانَتِ السَّادِسَةُ لَمْ يَقُمْ بِنَا فَلَمَّا كَانَتِ الْخَامِسَةُ قَامَ بِنَا حَتَّى ذَهَبَ شَطْرُ اللَّيْلِ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ نَفَّلْتَنَا قِيَامَ هَذِهِ اللَّيْلَةِ. فَقَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا صَلَّى مَعَ الإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ حُسِبَ لَهُ قِيَامُ اللَّيْلَةِ. قَالَ: فَلَمَّا كَانَتِ الرَّابِعَةُ لَمْ يَقُمْ فَلَمَّا كَانَتِ الثَّالِثَةُ جَمَعَ أَهْلَهُ وَنِسَاءَهُ وَالنَّاسَ فَقَامَ بِنَا حَتَّى خَشِينَا أَنْ يَفُوتَنَا الْفَلاَحُ. قَالَ: قُلْتُ: وَمَا الْفَلاَحُ؟ قَالَ: السُّحُورُ ثُمَّ لَمْ يَقُمْ بِنَا بَقِيَّةَ الشَّهْرِ. رَوَاهُ اصحاب السنن**[٣].

**ئەبو ذەڕ** (رەزای خوای لێبێ) **گوتی: لەگەڵ حەزرەت خۆیدا** (دروودی خودای لەسەربێ) **رۆژووی مانگی رەمەزانمان گرت وە لە هیچ شەوێ لە شەوەکانیا لەگەڵمانا نوێژی تەراویحی نەکرد، هەتا حەوت شەوی رەمەزان ما، جا لە شەوی بیست و سێدا** (دروودی خودای لەسەربێ) **هەستا هاتە ناومان و شەو نوێژیی بە جەماعەت بۆ کردین هەتا سێیەکی شەو رۆیشت، وە لە شەوی بیست و چواردا شەونیوێژی بۆ نەکردین، وە لە شەوی بیست و پێنج دا هەستا شەو نوێژی پێ کردین هەتا نیوەی شەو، منیش عەرزیم کرد: یا رەسوڵەڵلا! بریا! تا کۆتایی شەو ئەم شەو هەر شەونوێژت بە جەماعەت بکردایە پێمان! فەرمووی: پیاو، کاتێ نوێژی کرد لەگەڵ پێشنوێژدا هەتا پێشنوێژ دەڕواتەوە بۆ جێگەی خۆی ئیتر ئەوە نوێژی ئەو شەوەی سەرانسەر بۆ حلیب**

---

[٣] بسند صحيح.

دەكرێ. گوتی: بەڵام لە شەوی بیستو شەشدا شەونوێژی بۆ نەكردین وەلێ لە شەوی بیستو حەوتدا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) خێزانو ژنەكانی خۆیو خەڵكی تری كرد كردەوە لە مزگەوتو هەر تەاویحی بۆ كردین، هەتا مەترسی ئەوەمان لێ نیشت كە فریای فەلاح (رێگەی رزگای) نەكەوین، قسەبەر (راوی) دەڵێ: گوتم: مەبەست لە فەلاح (كە بەمانا رێگەی رزگارییە) چییە؟ گوتی: مەبەست پارشێوە، ئیتر حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لە شەوەكانی تردا تا مانگ تەواو بوو شەونوێژی بۆ نەكردین (د/ت/-س/ص).

١٣٥٠- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) لَيْلَةً فِي رَمَضَانَ، إِلَى الْمَسْجِدِ، فَإِذَا النَّاسُ أَوْزَاعٌ مُتَفَرِّقُونَ يُصَلِّي الرَّجُلُ لِنَفْسِهِ، وَيُصَلِّي الرَّجُلُ فَيُصَلِّي بِصَلَاتِهِ الرَّهْطُ فَقَالَ عُمَرُ: إِنِّي أَرَى لَوْ جَمَعْتُ هَؤُلَاءِ عَلَى قَارِئٍ وَاحِدٍ لَكَانَ أَمْثَلَ. ثُمَّ عَزَمَ فَجَمَعَهُمْ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، ثُمَّ خَرَجْتُ مَعَهُ لَيْلَةً أُخْرَى، وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلَاةِ قَارِئِهِمْ، فَقَالَ عُمَرُ: نِعْمَ الْبِدْعَةُ هَذِهِ، وَالَّتِي يَنَامُونَ عَنْهَا أَفْضَلُ مِنَ الَّتِي يَقُومُونَ. يُرِيدُ آخِرَ اللَّيْلِ، وَكَانَ النَّاسُ يَقُومُونَ أَوَّلَهُ. رَوَاهُ البخاری[٤].

عەبدورەحمانی كوڕی عەبدی - ئەلقاریی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: شەوێ لە رەمەزانا لە خزمەتی عومەری كوڕی خەتابدا چووم بۆ مزگەوت، كە چووین تەماشامان كرد وا خەڵك بڕگە بڕگەو كۆمەڵ كۆمەڵ پەخش بوونەتەوە بە ناو مزگەوتاو لەسەر ئەم شێوەیە نوێژی تەراویح دەكەن: وابوو هەندێ پیاو بە تەنیا بۆ خۆی نوێژی دەكرد، وە هەندێكی تر بەر نوێژیی بۆ دەستەیێ دەكرد، جا عومەر كە ئەم حاڵەی دی گوتی: من لام وایە ئەگەر ئەم كۆمەڵ كۆمەڵانە گشتیان لە پشتی یەك پێشنوێژەوە گرد بكەینەوە گەلێ باشترە لەم حاڵە، جا پاش ئەوە بڕیاری لەسەرداو گشتیانی كۆكردەوە لەسەر ئیقتیداكردن بە ئوبەییەی كوڕی كەعب. جا شەوێكی تر رۆیشتینەوە بۆ ئەوێ تەماشامان كرد خەڵكەكە لە پشتی ئوبەییەوە بە كۆمەڵی نوێژی تەراویح

---

[٤] بخاری. صلاة التراويح: ٢٠١.

دەكـەن، عومـەر كـە ئەمـەی دی گـوتی: ئەمـە هەرچـەندە تـازە دامـەزراوو تازەقەڵڵایە بەڵام ئیشێكی گەلێ چاكەو كارێكی فرە خاسە، وە گوتیشی: ئەو شەونوێژەی كە لە خەو هەڵ دەستن بۆی ئەوە باشترە لەمە، مەبەستی عومەر لەم قسەیە ئەوەیە كە شەو نوێژی ئاخری شەو لەشەو نوێژی سەرەتای شەو باشترە، چونكە ئەوكاتە خەڵكەكە لەسەرەتای شەوەوە شەو نوێژیان دەكرد بۆیە ئەویش وای گوت (ب).

## ٣٨) ژمارەی تەراویح: (عدد قيام التراويح)

١٣٥١- (تقدم)[1]

١٣٥٢- عَنْ يَزِيدَ بْنِ رُومَانَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَقُومُونَ فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فِي رَمَضَانَ بِثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ رَكْعَةً[2].

یەزیـدی كـوڕی رومـان (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: جـاران لـە شـەوەكانی رەمـەزانا لەسـەردەمی (خەلافـەتی) عومـەری كـوڕی خەتابـدا مـەردوم بیسـتو سێ ركات تەراویحیان دەكرد (ئیمامی مالیك - خودای لێ رازی بێ).

١٣٥٣- وَرُوِيَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَو عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ: مَا رَآهُ الْمُؤْمِنُونَ حَسَناً فَهُوَ عِنْدَ اللهِ حَسَنٌ وَمَا رَأَهُ الْمُسْلِمُونَ قَبِيحاً فَهُوَ عِنْدَ اللّهِ قَبِيحٌ. رَوَاهُمَـا الإمـام مالك (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ)[3].

دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) یا لە ئیبنو مەسعوودەوە (خودای لێ رازی بێ) دەفەرموێ: هەرچی شتێ موسوڵمانان بە جوانی بزانن ئەو شتە لـەلای خـودایش جوانـە، وە هەرچـی شـتێ موسـوڵمانان بـە ناشـیرینی دابنێن ئەو شتە لەلای خودایش ناشیرینە (ئیمامی مالیم - رەزای خودای لێبێ).

---

[1] راجع رقم: ٥/٩٩٠. مجلد/ ١. تسلسل: ٢٨٢.

[2] سكت عنه الشارح.

[3] سكت عنه الشارح.

## ٣٩) باسی پێنجەم: باسی ئەو شتانەی بۆ رۆژوو دەست نادەن: یەکێك لەوانە جووتبوونو دروست بوونە

## الباب الخامس: في الأمور المهني عنها في الصوم منها الجماع

**١٣٥٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: هَلَكْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: وَمَا أَهْلَكَكَ قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ. قَالَ: هَلْ تَجِدُ مَا تُعْتِقُ رَقَبَةً؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: فَهَلْ تَجِدُ مَا تُطْعِمُ سِتِّينَ مِسْكِينًا؟ قَالَ: لاَ - قَالَ: - ثُمَّ جَلَسَ فَأُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ. فَقَالَ: تَصَدَّقْ بِهَذَا. فَقَالَ: الرَّجُلُ: أَعَلَى أَفْقَرَ مِنَّا يَا رَسُولَ اللهِ، فَوَاللهِ فَمَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْوَجُ إِلَيْهِ مِنَّا. فَضَحِكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ ثُمَّ قَالَ: اذْهَبْ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەوتاوم. فەرمووی: بۆچی فەوتاوی؟ گوتی: لە رەمەزاندا (بەرۆژوو بوومو) لەگەڵ ژنەکەم دروست بووم. فەرمووی: ئایا هەتە کە بەندەیێ ئازاد بکەی؟ گوتی: نەء. فەرمووی: ئەی دەتوانی دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژووبی؟ گوتی: نەء، فەرمووی: ئەی دەتوانی نانی شەست هەژار بدەی؟ گوتی: نەء، ئەبو هورەیرە گوتی: جا پیاوەکە لەلای پێغەمبەر دانیشت، تا زەمیلەیێ خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمە بکە بەخێر پیاوەکەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ لە ئێمە هەژارترە تا پێی بدەم! دەسا بەو خودایە، لەم پەری مەدینەوە تا ئەوپەری مەدینە خێزانێکی وای تیانیە کە وەك ئێمە پێویستی بەم خورمایە بێ! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەها پێکەنی

---

[1] بخاري. صوم: ١٩٣٦، ١٩٣٧، ٢٦٠٠، ٥٣٦٨، ٦٠٨٧، ٦١٦٤، ٦٧٠٩، ٦٧١١، ٦٨٢١. مسلم. صوم: ٢٥٩٠، ٢٥٩٥. أبو داود. صوم: ٢٣٩٠ — ٢٣٩٢. ترمذی. صوم: ٧٢٤.

تەنانەت ددانەپێشینەکانی وەدەرکەوتن" ئینجا فەرمووی: دەبڕۆ دەرخواردی خێزانەکەی خۆتی بدە (ش/د/ت/ن).

## ٤٠) یەکێی تر لەوانە خواردن و خواردنەوەو خۆرشاندنەوەیە بە ئارەزوو: ومنها الأكل والشرب والقيئ عمدا

**١٣٥٥** – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَفْطَرَ يَوْمًا مِنْ رَمَضَانَ، مِنْ غَيْرِ رُخْصَةٍ رَخَّصَهَا اللهُ لَهُ، لَمْ يَقْضِ عَنْهُ صِيَامُ الدَّهْرِ، وَإِنْ صَامَهُ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلما.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ (بەبێ بەهانەیەکی رەوا، کە خودا رێگەی پێ دابێ) رۆژێ لە رۆژووی رەمەزان بخوات، ئەگەر گریمان بە درێژایی ساڵ لە جیاتی ئەو تاقە رۆژە بەرۆژووبێ هێشتا شوێنی ئەو تاقە رۆژە پڕ ناکاتەوە! (ب/د/ت/ن).

**١٣٥٦** – وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ. رَوَاهُ الخمسة ولفظ الترمذى: مَنْ أَكَلَ أَوْ شَرِبَ نَاسِيًا فَلاَ يُفْطِرْ فَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ رَزَقَهُ اللَّهُ[٢].

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ ئەگەر لەبیری نەبوو کە بەرۆژووە، وە چشتی خوارد یا چشتی خواردەوە ئەوە با رۆژووەکەی نەشکێنێ و ئەونان و ئاوەیش کە خواردوویەتی رزق و رۆژییە بووە لە خوداوە (ش/د/ت/ن) گفتەی (ت): ئەگەر کەسێ لە یادی نەبوو کە بەرۆژووە، وە شتێکی خوارد، یا شتێکی خواردەوە با رۆژووەکەی نەشکێنێ، ئەونان و ئاوەیش کە خواردوویەتی رزق و رۆژییە بووە خودا بۆی رەخساندووە!

---

[٢] بخاري. صوم: ١٩٣٣، ٦٦٦٩. مسلم. صوم: ٢٧٠٩ (رياض: ١٢٤٢/١ ز- ٢٤٤ — متفق عليه).

**١٣٥٧- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ** (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) **قَالَتْ: أَفْطَرْنَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **يَوْمَ غَيْمٍ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ. قِيلَ لِهِشَامٍ فَأُمِرُوا بِالْقَضَاءِ؟ قَالَ: لاَبُدَّ مِنْ قَضَاءٍ. رَوَاهُ البخارى وأبو داود**[٣].

**ئەسمائی کچی ئەبو بەکر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: بەسەرینی پێغەمبەر خۆی** (دروودی خودای لەسەربێ) **رۆژێ هەورە رۆژ بوو، جا کە بەربانگمان کردەوە لەپاشا خۆر دەرچوو. گوترا بەهیشام: ئایا پێیان گوترابوو بیگێڕنەوە؟ گوتی: لە حاڵەتی واداد گێڕانەوە پێویستە (ب/د).**

**١٣٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِي اللّهُ عَنهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: مَنْ ذَرَعَهُ قَيْءٌ وَهُوَ صَائِمٌ فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ وَإِنِ اسْتَقَاءَ فَلْيَقْضِ. وَفِي رِوَايَةٍ: مَنِ اسْتَقَاءَ عَمْدًا فَلْيَقْضِ. رَوَاهُ أصحاب السنن والحاكم وصححه**[٤].

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: کەسێ رشانەوە زۆری بۆ هێناو رشایەوە بەبێ خواستی خۆی وە لە هەمان کاتا بەرۆژووبوو، ئەوە گێڕانەوە (قەزا کردنەوە)ی لەسەر نیە، بەلام ئەگەر خۆی خۆی رشاندەوە با رۆژووەکەی بگرێتەوە لە گێڕانەوەیەکا: کەسێ بە ئارەزوو خۆی رشاندەوە با بیگرێتەوە. (د/ت/ن/حاکم: حاکم بەصەحیحی داناوە).**

## ٤١) یەکێ تریان ئەوەیە کە چەن رۆژێ رۆژوو بداتە دەم یەک و لەو ماوەیەدا شەوو رۆژ بەرۆژوو بێ: (ومنها الوصال)

**١٣٥٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِي اللّهُ عَنهُ) **قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللّهِ** (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **عَنِ الْوِصَالِ فَقَالُوا: إِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللّهِ قَالَ: وَأَيُّكُمْ مِثْلِي إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِ. فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الْوِصَالِ وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلاَلَ،**

---

[٣] بخاري. صوم: ١٩٥٩.

[٤] صحيح عند الحاكم.

فَقَالَ: لَوْ تَأَخَّرَ الهِلاَلُ لَزِدْتُكُمْ. كَالتَّنْكِيلِ لَهُمْ، حِينَ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا. وَفِي رِوَايَةٍ: إِيَّاكُمْ وَالْوِصَالَ. مَرَّتَيْنِ قِيلَ إِنَّكَ تُوَاصِلُ. قَالَ: إِنِّي أَبِيتُ عِنْدَ رَبِّي يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ، فَاكْلَفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ. رَوَاهُ الأربعة[1].

ئەبو هورەیره (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی نەدەدا کە یەکێ دوو رۆژ یا پتر شەوو رۆژ بەرۆژوو بێ و لەو ماوەیەدا بەهیچ جۆرێ رۆژووەکەی نەشکێنێ. یاران گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ خۆت وادەکەی؟ فەرمووی: جا ئێوە وەك من وان، من جیام لە ئێوە من خودا فرسەتم دەداو بەشەو نان و ئاوم دەداتێ جا کە هەر وازیان نەهێنا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دوو رۆژ لەسەریەك نەیشکاند پێیان تا مانگیان دی و بوو بە جەژن، جا فەرمووی: ئەگەر مانگ نەبینرایە پترم پێ دەگرتن وەك کەسێ بیەوێ چاوترسێنیان بکا، تا جارێکی تر شتی وانەکەن، لە گێرانەوەیەکا: دوو جار فەرمووی: نەکەن رۆژوو بدەنە دەم رۆژووی تر گوترا: قوربان! تۆ خۆت وا دەکەی. فەرمووی: من بەشەو لە خزمەتی پەروەردگارمدا دەبم، ئەو فرسەتم دەدا، نان و ئاوم دەداتێ، ئێوە کارێ بکەن کە لەووزەتانا بێ و ئیشێ بگرنە ئەستۆی خۆتان کە بۆتان بکرێ (ش/د/ت).

## ٤٢) یەکێکی تریان دەستبازی و ماچکردنە: (ومنها المباشرة والقبلة)

١٣٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْمُبَاشَرَةِ لِلصَّائِمِ فَرَخَّصَ لَهُ. وَأَتَاهُ آخَرُ فَسَأَلَهُ فَنَهَاهُ. فَإِذَا الَّذِي رَخَّصَ لَهُ شَيْخٌ وَالَّذِي نَهَاهُ شَابٌّ. رَوَاهُ أبو داود والبيهقي وصححه[1].

ئەبو هورەیره (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی (دروودی خودای لەسەربێ): ئایا رۆژووەوان دروستە یاری و دەستبازیی لەگەڵ خێزانی

---

[1] بخاري. صوم: ١٩٦٥، ١٩٦٦، ٦٨٥١، ٧٢٤٢، ٧٢٩٩. مسلم. صوم: ٢٥٥٨ — ٢٥٦٧. أبو داود. صوم: ٢٣٦٠.

[1] صحيح عند البيهقي.

خۆیا بکا؟ فەرمووی: بۆ تۆ ئا لە پاشا پیاوێکی ترهات هەمان پرسیاری لێ کرد، فەرمووی: بۆ تۆ نەء! جا کەسەرنجمان دان روانیمان ئەوەیان کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی دابوو پیاوێکی پیربوو، وە ئەوی تریان کە رێگەی نەدابوو کوڕێکی گەنج بوو (د/بەیهەقی:ص).

١٣٦١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُا) قَالَتْ: كَـانَ النَّبِـيُّ (صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) يُقَبِّـلُ وَيُبَاشِرُ، وَهُوَ صَائِمٌ، وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لإِرْبِهِ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: وا دەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەرۆژووبوو لەگەڵ ئەوەشا ماچ و مۆچ و یاری و دەستبازیی دەکرد لەگەڵ حەڵاڵی خۆیا. بەڵام ئەو لە هەمووتان باشتر نەفسی خۆی پێ زەوت دەکراو لەم لایەنەوە لە رادە دەر نەدەچوو، تا (خوا نەخواستە) تووشی بێشەرعی بێ (ش/د/ت/ن — خودایان لێ خۆشنوودو رازی بێ).

## ٤٣) یەکێکی تریان زیادەڕەوی لە ئاو ڕادان لەدەم و لە لووت:
## ومنها المبالغة في المضمضة والاستنشاق

١٣٦٢- عَنْ لَقِيطِ بْنِ صَبْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنـهُ) قَـالَ: يَـا رَسُـولَ اللّٰـهِ أَخْبِرْنِـي عَـنِ الْوُضُوءِ. قَالَ: أَسْبِغِ الْوُضُوءَ وَخَلِّلْ بَيْنَ الأَصَابِعِ وَبَـالِغْ فِـي الاِسْتِنْـشَاقِ إِلاَّ أَنْ تَكُـونَ صَائِمًا. رَوَاهُ أصحاب السنن[١].

لە قیطی کوڕی صەبرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! دەسنوێژم پێ بڵێ؟ فەرمووی: دەسنوێژێکی تێرو تەسەل بگرەو دەست بخەرە بەینی پەنجەکانت، وە زۆرباش ئاو لەدەم و لووتت وەردەو هنگ بکە، ئەگەر بەرۆژوو نەبووی (د/ت/ن-س/ص).

---

[٢] بخاري. صوم: ١٩٢٧، ١٩٢٨. مسلم. صوم: ٢٥٧٠ — ٢٥٧٤. ترمذی. صوم: ٢٥٧١. أبو داود. صوم: ٢٣٨٣.

[١] بسند صحيح (شرحه) (رياض: ١٢٤٣/٢ ز- ٢٢٤. حديث حسن صحيح. أبو داود: ٢٣٦٦. ترمذي: ٧٨٨).

## ٤٤) لەشپیسی رۆژوو ناشكێنێ: (لا بأس للجنابة للصائم)

**١٣٦٣– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ فِي رَمَضَانَ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ غَيْرِ حُلُمٍ فَيَغْتَسِلُ وَيَصُومُ[1].**

**عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاری وا دەبوو لە رەمەزانا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەشەو لەگەڵ ژنەكانیا دروست دەبوو، وە شەبەقی دەدا ئەوسا خۆی دەشۆرد، وە لە هەمان كاتا بە رۆژووبوو (ش/د/ت/ن).**

**١٣٦٤– وَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهَا) كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ جِمَاعٍ لاَ مِنْ حُلُمٍ ثُمَّ لاَ يُفْطِرُ وَلاَ يَقْضِي. رَوَاهُمَا الخمسة[2].**

**ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاری وا دەبوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەلەشی پیسەوە بەیانی لێ دەدا، لەش پیسی جووتبوونیش نەك لەش پیسی شەیتانی بوون، لەگەڵ ئەوەشا نە رۆژووەكەی دەشكاندو نەقەزای ەكردەوە (ش/د/ت/ن).**

## ٤٥) كەڵەشاخ گرتنو كلكردنە چاوو خۆشۆردن قەی ناكەن
## لا بأس بالحجامة والكحل والغسل

**١٣٦٥– عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلماً[1].**

**ثەوبان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: رۆژووی كەڵەشاخ گرو كەڵەشاخ لێ گیراو دەشكێ ئەگەر بەرۆژوو بن (ب/د/ت/ن).**

---

[1] بخاري. صوم: ١٩٣٠، ١٩٣١، ١٩٢٦، ١٩٣٢. تجريد بخارى: ٨٨٩. مسلم. صوم: ٢٥٨٥ – ٢٥٨٩. نسائى طهارة: ١٩٣٦، ١٨٣٠. أبو داود. صوم: ٢٣٨٩ (رياض: ١٢٤٥/٤ ز: ٢٢٤٠ – متفق عليه).

[2] تقدم تخريجه (الحديث ١٣٧٠/١).

[1] بخاري. صوم: راجع باب الحجامة والقيئ. قبل رقم: ١٩٣٨.

١٣٦٦- وَقِيْلَ لِأَنَسَ (رَضِي اللّهُ عَنـهُ) أَكُنْتُمْ تَكْرَهُونَ الْحِجَامَةَ لِلصَّائِمِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: لاَ. إِلاَّ مِنْ أَجْلِ الضَّعْفِ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود[٢].

گوترا بە ئەنەس: ئایا جاران لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) کەڵەشاخ گرتنتان بۆ بەرۆژوو پێ ناخۆش بوو؟ گوتی: نەء، مەگەر لەبەر ئەوە کە زەبوونی دەکا (ب/د).

١٣٦٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) احْتَجَمَ، وَهُوَ مُحْرِمٌ وَاحْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلماً وَفِي رِوَايَةٍ: لاَ يُفْطِرُ مَنْ قَاءَ وَلاَ مَنِ احْتَلَمَ وَلاَ مَنِ احْتَجَمَ[٣].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەکاتی ئیحرامدا کەڵەشاخی لەخۆی گرتووە، وە لەکاتی بەرۆژوو بوونیشا هەروەها (ب/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: ئەو کەسەی بەبێ خەتای خۆی بڕشێتەوە یا شەیتانی ببێ یا کەڵەشاخ لەخۆی بگرێ ڕۆژووی ناشکێ.

١٣٦٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اشْتَكَتْ عَيْنِي أَفَأَكْتَحِلُ وَأَنَا صَائِمٌ؟ قَالَ: نَعَمْ. رَوَاهُ الترمذي[٤].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ گوتی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ): چاوم ژان دەکاو بەرۆژوویشم، جا ئایا چاوم بڕێژم یانا؟ فەرمووی: ئا بیڕێژە (ت-سند ضعيف).

١٣٦٩- وَاكْتَحَلَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي رَمَضَانَ وَهُوَ صَائِمٌ. رَوَاهُ ابن ماجه[٥].

گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ڕەمەزانا بەرۆژوویش بوو چاوی خۆی ڕشت (ئیبنو ماجە - سند ضعيف).

---

[٢] بخاري. صوم: ١٩٤٠.

[٣] بخاري. صوم: ١٩٣٨.

[٤] بسند ضعيف.

[٥] بسند ضعيف.

١٣٧٠- وَكَانَ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَكْتَحِلُ وَهُوَ صَائِمٌ[٦].

گوتی: جاران ئەنەسیش لەکاتی بەڕۆژوو بوونا چاوی خۆی دەرشت (د).

١٣٧١- وَقَالَ الأَعْمَشِ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِنَا يَكْرَهُ الْكَحْلَ لِلصَّائِمِ. رَوَاهُمَا أبو داود[٧].

ئەعمەشیش دەڵێ: لە برادەرانی خۆمان کەسم نەدیوە چاوڕشتنی بۆ ڕۆژووەوان پێ ناخۆش بووبێ (د).

١٣٧٢- وَلَمْ يَرَ أَنَسٌ وَالْحَسَنُ وَإِبْرَاهِيمُ بِالْكُحْلِ لِلصَّائِمِ بَأْسًا. رَوَاهُ البخارى[٨].

نە ئەنەس و نە حەسەن و نە ئیبراهیم چاو ڕشتنی بەڕۆژوویان بەخراپ نەدەزانی (ب).

١٣٧٣- وَقَالَ: بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْعَرْجِ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ الْمَاءَ وَهُوَ صَائِمٌ مِنَ الْحَرِّ مِنَ أَوْ الْعَطَشِ. رَوَاهُ أبو داود والنسائى وأحمد[٩].

یەکێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: لە عەرەج پێغەمبەرم دی، بەڕۆژوو بوو، وە لەتاو گەرما، یا لەبەر تونێتی ئاوی دەکرد بەسەر خۆیداو خۆی دەشۆرد (د-س/ص-ن/ئەحمەد).

## ٤٦) باسی شەشەم: باسی هۆیەکانی شکاندنی ڕۆژوو، ڕێبوارو ئەو نەخۆشەی هیوای چاك بوونەوەی هەبێ ڕۆژوو دەشکێنن و لەپاشا دەیگێڕنەوە.

## الباب السادس: في أسباب الفطر للمريض الذي يرجى برؤه وللمسافر أن يفطرا وعليهما القضاء

[٦] سكت عنه الشارح.

[٧] سكت عنه الشارح.

[٨] رَوَاهُ البخارى تعليقا فى الباب الرقم: ٢٥ من كتاب الصوم قبل رقم ١٩٣٠.

[٩] رَوَاهُ أبو داود بسند صحيح (شرحه).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ}.

**دەی هەر کەسێ لە ئێوە کە مانگی ڕەمەزان لەجێی خۆی بوو، واتە: لەشی ساخ بوو وە لەسەفەردا نەبوو، با ڕۆژووەکەی بگرێ، مادام عوذری نەبێ، وە هەرکەسێ نەخۆش بێ، یا لەسەر سەفەربێ، وە بەرۆژوو نەبێ، ئەوە دروستە، بەلاّم دەشێ کە عوزرەکەی نەماو بیانووەکەی بڕا چەند ڕۆژی خواردووە ئەوەندە قەزا بکاتەوە، خودای گەورە میهرەبانە لەگەڵ ئێوە، بۆیە دەیەوێ کارتان بۆ ئاسان بکاو نا یەوێ کارتان لێ گران بکا.**

١٣٧٤- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ إِلَى مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ فِي رَمَضَانَ فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ الْكَدِيدَ ثُمَّ أَفْطَرَ فَأَفْطَرَ النَّاسُ وَكَانَ صَحَابَةُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَّبِعُونَ الأَحْدَثَ فَالأَحْدَثَ مِنْ أَمْرِهِ. وَفِي رِوَايَةٍ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَرَفَعَهُ إِلَى فِيهِ لِيُرِهُ النَّاسَ فَأَفْطَرَ، حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ، وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ فَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقُولُ قَدْ صَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَفْطَرَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ. رَوَاهُ الثلاثة[1].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە ڕەمەزانا دەرچوو ڕۆیشت بۆ مەککە، لە ڕێگە بە ڕۆژوو بو هەتا گەیشتە کەدید" لەوێ ڕۆژووی شکاندو خەڵکەکەیش ڕۆژووی خۆیان شکاند، یارانی پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەستووریان وابوو کام فەرمانی حەزرەت تازەتر بوایە پەیڕەوی ئەوەیان دەکرد. لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەمەدینەوە کەوتە ڕێ بۆ مەککە، وە لەڕێ بەڕۆژوو بوو هەتا گەیشتە عوسفان، جا لەوێ داوای ئاوی کردو لەبەرچاوی عەشاماتەکە ئاوەکەی**

---

[1] بخاري. صوم: ١٩٤٤، ١٩٤٨، ٢٩٥٣، ٤٢٧٥، ٤٢٧٦، ٤٢٧٧، ٤٢٧٨، ٤٢٧٩، ٤٢٧٦. مسلم. صوم: ٢٥٩٩ — ٢٦٠٤. أبو داود. صوم: ٢٤٠٤.

خواردەوە، رۆژووەکەی شکاندن، هەتا بیبینن و بیانوویان نەمێنێ ئیتر بەرۆژوو نەبوو تا گەیشتە مەککە، وە ئەم رووداوەیش لەمانگی رەمەزانا بوو. ئیبنو عەبباس دەیگوت: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) وابووە لەسەفەردا بەرژوو بووە وە وا بووە بە رۆژوو نەبووە، جا کە وابوو لە سەفەردا ئەوەی حەز دەکا ئەوا بەرۆژوو بێ، وە ئەوەیشی حەز ناکا ئەوا بەرۆژوو نەبێ (ش/د).

١٣٧٥- وَقَالَ: أَنَسٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) سَافَرْنَا مَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي رَمَضَانَ فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ وَلاَ الْمُفطِرُ عَلَى الصَّائِمِ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّهُ مَنْ وَجَدَ قُوَّةً فَصَامَ فَحَسَنٌ وَمَنْ وَجَدَ ضَعْفًا فَأَفْطَرَ فَحَسَنٌ. رَوَاهُ الأربعة[٢].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە رەمەزانا لە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) سەفەرێکمان کرد، جا نە رۆژووەوان نەنگ و عەیبی لەبێ رۆژوو دەگرت (لەبەر ئەوە کە بەرۆژوو نیە) وە نەبێ رۆژووش نەنگ و عەیبی لە رۆژووەوان دەگرت لەسەر ئەوە کە لەسەفەرا بەرۆژووە. لە گێرانەوەیەکا: جاران یاران وایان بەباش دەزانی: ئەوەی بەخۆیا رادەپەرموێ و بەرۆژوو دەبێ ئەوە شتی چاکە، وە ئەوەی لەخۆی رانابینی و بەرۆژوو نابێ دیسان شتی چاکە! (ش/د/ت).

١٣٧٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ، فَرَأَى زِحَامًا، وَرَجُلاً قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقَالُوا: صَائِمٌ. فَقَالَ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ. رَوَاهُ الخمسة[٣].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ، لە سەفەرێکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قەرەباڵغییەکی دی، لە دەوری پیاوێ کە لەژێر سێبەرێکا بوو" فەرمووی: ئەم جەنجاڵییە چییە؟ گوتیان: رۆژووەوانە ناوی ئەبو ئیسرائیلە

---

[٢] بخاري. صوم: ١٩٤٧. مسلم. صوم: ٢٦١٥، ٢٦١٦، ٢٦١٠ — ٢٦١٣، ٢٦١٤. ترمذي. صوم: ٧١٣. نسائی. صوم: ٢٣٠٨، ٢٣١٠، ٢٣١١.

[٣] بخاري. صوم: ١٩٤٦. مسلم: ٢٦٠٧. أبو داود. صوم: ٢٤٠٧ نسائی. صوم: ٢٢٦١.

بەرۆژووە، لە گەرما ناو لە توونیانا لەهۆش خۆی چووە، فەرمووی: رۆژوو لەسەفەردا كارێكی باش نیە (ش/د/ت/ن).

١٣٧٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ فَصَامَ بَعْضٌ وَأَفْطَرَ بَعْضٌ فَتَحَزَّمَ الْمُفْطِرُونَ وَعَمِلُوا وَضَعُفَ الصُّوَّامُ عَنْ بَعْضِ الْعَمَلِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالأَجْرِ. رَوَاهُ مسلم والنسائي[٤].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەفەرێكا بوو، هەندێ كەس بەرۆژووبوون و هەندێ كەس بەرۆژوو نەبوون، جا بێ رۆژووەكان پشتێنیان لێ بەست و چاكیان لێ هەڵكردو هەموو ئیشەكانیان كرد، وە رۆژووەوانەكان لەبەر بێ هێزی هەندێ كاریان بۆ نەدەكرا. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەم بۆنەیەوە فەرمووی: پاداشی هەرە گەورە ئەمڕۆ بۆ بێ رۆژووەكان بوو (م/ن).

١٣٧٨- وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ وَابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُم) يَقْصُرَانِ وَيُفْطِرَانِ فِي أَرْبَعَةِ بُرُدٍ. رَوَاهُ البخاري[٥].

لەكاتی خۆیدا ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) بۆ ماوەی دوو رۆژە رێ بەپێی وشتر بە بارەوە هەم نوێژیان كورت دەكردەوەو هەم رۆژوویان دەشكاند (ب).

١٣٧٩- وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) يَخْرُجُ إِلَى الْغَابَةِ فَلاَ يُفْطِرُ وَلاَ يَقْصُرُ. رَوَاهُ أبو داود[٦].

---

[٤] مسلم. صوم: ٢٦١٧، ٢٦١٨. بخاري. جهاد: ٢٨٩٠. نسائي. صوم: ٢٢٨٢.

[٥] تعليق ذكره البخاري في الباب رقم/ ٤ من كتاب تقصير الصلاة قبل رقم: ١٠٨٦ مبا شرة. (مترجم)

[٦] بسند صالح (شرحه).

جارانیش کە ئیبنو عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) دەردەچوو بۆ جەنگەڵەکە کە پێیان دەگوت: ئەلغابە، کە جێگەیەك بوو نیو قۆناخ لە مەدینەوە دوور بوو نە نوێژی کورت دەکردەوەو نە ڕۆژووی دەشکاند (د-سند/صالح).

## ٤٧) پیرو ژنی دووگیانو ژنی مەمکدەرو نەخۆشێ کە هیوای چاك بوونەوەی نەبێ ئەمانە ڕۆژوونەگرن بەڵام دەبێ برێتی (کەفارەت) بدەن:

## للكبير والحبلى والمرضع والمريض الذي لايرجى أن يفطروا وعليهم الفدية

١٣٨٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) هِيَ رُخْصَةٌ لِلشَّيْخِ الْكَبِيرِ وَالْمَرْأَةِ الْكَبِيرَةِ وَهُمَا يُطِيقَانِ الصِّيَامَ أَنْ يُفْطِرَا وَيُطْعِمَا مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا وَالْحُبْلَى وَالْمُرْضِعُ إِذَا خَافَتَا أَفْطَرَتَا وَأَطْعَمَتَا. رَوَاهُ أبو داود والبخارى في التفسير. ولفظه: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا): هِيَ لَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةٍ، هُوَ لِلشَّيْخِ الْكَبِيرِ وَالْمَرْأَةِ الْكَبِيرَةِ لاَ يَسْتَطِيعَانِ أَنْ يَصُومَا، فَلْيُطْعِمَانِ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا[1].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ٢/١٤٢}. واتە: پێویستەو فەرزە لەسەر ئەو کەسانە کە ساغنو لە شوێنی خۆیانان بەڵام لەبەر پیریو ناتەوانایی بە خەرجکردنی هەموو تەوانایی نەبێ ناتوانن ڕۆژوو بگرن تۆڵەی ئەو ڕۆژووەیان بدەن، بۆ هەر ڕۆژەی بە ئەندازەی خواردەمەنی گەدایەك/ ئیبنو عەبباس دەڵێ: ئەم ئایەتە ڕوخصەتێکە بۆ ئەو پیەمێردو پیرەژنە ئیختیارانە کە زۆر بەگرانو زەحمەت ڕۆژوویان بۆ دەگیرێ، جا ئەوانەی پێ نابن لەباتی ڕۆژووی هەموو ڕۆژێ نانی هەژارێ بە تۆڵە (کەفارەت = فیدیە) دەدەن. ژنی سك پڕو ئافرەتی مناڵ بە بەریش ئەگەر ترسیان هەبوو لە ئەندروستی خۆیان

[1] بخاري. تفسير: ٤٥٠٥.

یا لە سكو ساواكەیان ئەوە ئەوانیش هەروەها (د/ب) گفتەی (ب) ئاوایە: ئیبنو عەبباس (خودایان لیٚ رازی بیٚ) دەڵیٚ: ئەم ئایەتە حوكمەكەی هەڵنەوەشاوەتەوەو نەسخ نەبۆتەوە[1]، بەلاّم ئەمە روخصەتو ریٚدانە بۆ ئەو پیرەمیٚردو پیرەژنە بەساڵاّ چووانەیە كە ناتوانن بەرۆژوو بن، جا لەجیاتی رۆژووی هەموو رۆژیٚ نانی هەژاریٚ دەدەن.

١٣٨١– وَعَنْهُ فِي هَذِهِ الآيَةِ: لاَ يُرَخَّصُ فِي هَذَا إِلاَّ لِلَّذِي لاَ يُطِيقُ الصِّيَامَ أَوْ مَرِيضٍ لاَ يُشْفَى. رَوَاهُ النسائي[2].

دیسانەوە ئیبنو عەبباس (خودایان لیٚ رازی بیٚ) لەبارەی ئەم ئایەتەوە دەڵیٚ: بۆ ئەم پیٚ نەبوونو تۆڵەی رۆژوودانە كە لەم ئایەتەدا باس كراوە تەنیا ریٚگەی ئەو كەسانە دەدریٚ كە وزەی رۆژوو گرتنیان نیە، یا نەخۆش كە ئومیٚدی چاك بوونەوەی لیٚ نەكریٚ (ن).

١٣٨٢– عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ رَجُلٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِحَاجَةٍ فَإِذَا هُوَ يَتَغَدَّى قَالَ: هَلُمَّ إِلَى الْغَدَاءِ. فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ. قَالَ: هَلُمَّ أُخْبِرْكَ عَنِ الصَّوْمِ: إِنَّ اللّهَ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ نِصْفَ الصَّلاَةِ وَالصَّوْمَ وَرَخَّصَ لِلْحُبْلَى وَالْمُرْضِعِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[3].

ئەبو قیلابە (خودای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: پیاویٚ گوتی: بۆ ئیشیٚك چووم بۆ لای پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) تەماشامكرد وانان دەخوا، فەرمووی: وەرە پیٚشەوەنان بخۆ گوتم: من بەرۆژووم. فەرمووی: دەوەرە باسی رۆژووت بۆ بكەم: خودا نیوەی نویٚژو رۆژوی لەسەر ریٚبوار هەڵگرتووە، وە ریٚگەی ژنی

---

(١) ئەم ئایەتە لە پیٚشەوە رۆیشت لە زنجیرە بیستو حەوتی ئەم بەرگەدا بەلاّم تەفسیری ئەویٚ لەگەڵ تەفسیری ئیٚرەدا جیایە، بۆیە وایە هەتا لەهەردوولا لەگەڵ حەدیثەكەی تەكیدا بگونجیٚ.
– وەرگیٚر– ١٩٨٧/٨/٢٤

(٢) جميع ما فى المجتبى للنسائى صحيح (المقدمة).

(٣) بسند حسن للترمذى وسند النسائى صحيح (شرحه.

سك پڕو ژنی شیردەریشی داوە ئەگەر مەترسیان لە خۆیان یا لە منالەکەیان هەبوو ئەوا بەرۆژوو نەبن، بەلام تۆلە دەدەن، لەباتی رۆژووی گشت رۆژێ ژەمێ خۆراك دەدەن بە هەژارێ (د/ت-س/ح-ن-س/ص).

## ٤٨) پێویستە لەسەر زەیستانو بێنوێژ کە بەرۆژوو نەبن، بەلام دەبێ کە پاك بوونەوە بیگێڕنەوە : (على الحائض والنفساء الفطر والقضاء)

١٣٨٣- (راجع رقم: ٣/٣٠٠)[1].

١٣٨٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: إِنْ كَانَتْ إِحْدَانَا لَتُفْطِرُ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَا تَقْدِرُ عَلَى أَنْ تَقْضِيَهُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى يَأْتِيَ شَعْبَانُ. رواهما الخمسة[2].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بەسەرینیی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ)، ئێمەی ژنان هێندێکمان (لەبەر بێنوێژی یا زەیستانی) بەرۆژوو نەدەبوین، لەبەر ئەوەشی کە لەخزمەتی حەزرەتدا بووین نەمان دەتوانی بیگێڕینەوە، هەتا کولە مانگ (شەعبان) دەهات (ش/د/ت/ن).

١٣٨٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَضَاءِ رَمَضَانَ إِنْ شَاءَ فَرَّقَ وَإِنْ شَاءَ تَابَعَ. رَوَاهُ الدار قطني وصححه ابن الجوزي[3].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: گێڕانەوەی رۆژووی رەمەزان، مرۆڤ بە دەستی خۆیەتی: حەزکا چەند رۆژێ لەسەرە هەمووی بەسەر یەکەوە دەگێڕێتەوە، وە حەزکا ناوبەناو دەیانگێڕێتەوە (دارە قوطنی -ح/ص).

---

[1] تقدم تخريجه بمثل الحديث (٣/٣٠٠). مجلد/ ١ تسلسل / ٣٥.

[2] بخاري. صوم: ١٩٥٠. مسلم. صوم: ٢٦٨٢. أبو داود. صوم: ٢٣٩٩. نسائي. صوم: ٢٣١٨.

[3] صححه الدارقطني.

## ٤٩) ڕۆژووی مردوو قەزا دەکرێتەوە، وە دروستە فیدیەشی بۆ بدرێ:
## يقضى الصيام عن الميت بصوم أو إطعام

١٣٨٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ. رَوَاهُ الثلاثة والنسائي[1].

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: کەسێ بمرێ وە ڕۆژووی لەسەر بێ، کەس و کاری دەتوانن لە باتی ئەو بەڕۆژوو بن (ش/د/ن).**

١٣٨٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا فَقَالَ: لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكَ دَيْنٌ أَكُنْتَ قَاضِيَهُ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَدَيْنُ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى. رَوَاهُ الخمسة[2].

**ئیبنو عەبباس** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم مردووە، وە ڕۆژووی مانگێکی لەسەرە، ئایا دەشێ کە من بۆی بگێڕمەوە لە جیاتی خۆی! فەرمووی** (درودی خودای لەسەربێ)**: گریمان دایکت قەرزی کەسێکی لەسەر بێ ئایا بۆی دەدەیتەوە؟ گوتی: ئەدیی واتە: بەڵێ. فەرمووی: کەوابوو دانەوەی قەرزی خودا ڕەواترە کە بدرێتەوە (ش/د/ت/ن-** هەزار هەزار ڕەحمەتی خودایان لەسەر بێ).

١٣٨٨- وَجَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ نَذْرٍ أَفَأَصُومُ عَنْهَا؟ قَالَ: أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ فَقَضَيْتِيهِ أَكَانَ يُؤَدِّي ذَلِكِ عَنْهَا؟ قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: فَصُومِي عَنْ أُمِّكِ. رَوَاهُ الشيخان[3].

---

[1] بخاري. صوم: ١٩٥٢. مسلم. صوم: ٢٦٨٧. أبو داود. صوم: ٢٤٠٠.

[2] بخاري. صوم: ١٩٥٣. مسلم. صوم: ٢٦٨٨ - ٢٦٩١. أبو داود. إيمان: ٣٣١٠. ترمذي. صوم: ٧١٦، ٧١٧.

[3] بخاري. صوم: ١٩٥٣. مسلم. صوم: ٢٦٩١.

ئافرەتێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم مردووە، وە رۆژووی نەذری لەسەرە، ئایا دەبێ کە من لەباتی ئەو بەرۆژووبم؟ فەرمووی: پێم بڵێ ئەگەر دایکت قەرزاری کەسێ بێ، وەتۆ ئەو قەرزەی بۆ بدەیتەوە، ئایا ئەوە بریتیی قەرزەکەی دەکەوێ یانا؟ گوتی: بەڵێ بریێتی دەکەوێ. فەرمووی: دە لەجیاتی دایکت بەرۆژووبە (ش).

١٣٨٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامُ شَهْرٍ فَلْيُطْعِمْ عَنْهُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا. رَوَاهُ الترمذي وابن ماجه[٤].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ بمرێ.وە رۆژووی مانگێکی لەسەر بێ، با کەسوکارەکەی لەجیاتی رۆژووی هەموو رۆژێ نانی هەژارێ بدەن (ت- سند ضعيف- ئیبنو ماجە).

١٣٩٠- وَقَالَ: ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) إِذَا مَرِضَ الرَّجُلُ فِي رَمَضَانَ ثُمَّ مَاتَ وَلَمْ يَصُمْ أُطْعِمَ عَنْهُ وَلَاقَضَاءَ، وَإِنْ نَذَرٌ قَضَى عَنْهُ وَلِيُّهُ. رَوَاهُ أبو داود هَكَذَا وَالبَيْهَقِيُّ وَعَبْدُ الرَّزَّاقِ مَوْصُولاً[٥].

ئیبنو عەبباس (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: ئەگەر کەسێ لە رەمەزاندا، نەخۆش کەوتو مرد، وە بەرۆژوو نەبوو، ئەوە نان دەدەن لە تۆڵەی رۆژووەکەیدا وە قەزای لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر رۆژووی نەذری لەسەر بوو ئەوە دەبێ هەقدارەکەی بۆی بگێڕێتەوە (د-موقوفا. بەیهەقی/عەبدوررەزاق- موصولا).

---

[٤] رَواه الترمذی بسند ضعيف (شرحه).

[٥] صححه الحافظ (شرحه).

## ٥٠) باسی حەوتەم: باسی شەوی لەیلەتولقەدر

## الباب السابع: في ليلة القدر

قَالَ:اللهُ جَلَّ شَأْنُهُ – إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ. وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ. لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ. تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ. سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ}.

خودای گەورە دەفەرموێ: بەراستی ئێمە قورئانی پیرۆزمان لە شەوی لەیلەتولقەدردا ناردوەتە خوارەوە، کە شەوێکی زۆر بەقەدرو بە رێزە، ئەی موحەممەد! ئایا دەزانی کە شەوی لەیلەتولقەدر چیەو پایەی طاعەت لەو شەوەدا چۆنەو چەندێکە؟ بزانە کە شەوی بەرێز (لەیلەتولقەدر) لە هەزار مانگ خێرترە، کە ئەو شەوە یان تیا نەبێ، فریشتەی رەحمەتو جوبرائیل (کە مەشهوورە بە رۆحی ئەمین) لەو شەوەدا بە فەرمانی خودای هەموان لە ئاسمانەوە دێنە خوارەوە، بۆ دابەشکردنو رێکخستنی هەموو کارێ کە خودای گەورە بڕیاری دابێ کە لەو ساڵەدا جێبەجێ ببێ، وە ئەو شەوە تا شەبەق دەدا هەر خێرو خۆشیو ئاشتیو ئاسایش دەبارێ!

١٣٩١– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ بە ئیمانو باوەڕەوە، ساخ لەبەر رەزای خودا شەونوێژی شەوی لەیلەتولقەدر بکا خودا لە گوناهەکانی لەوەو پێشی خۆش دەبێ. (ش/د/ت/ن = بوخاری، موسلیم، ئەبو داوود، تیرمیذی، نەسائی).

---

[1] بخاري. صوم: ٣٥، ٣٧، ٣٨، ٢٠٠٨، ٢٠٠٩، ٢٠١٤، ١٠٩١. مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٧٦ — ١٧٧٩. نسائي. قيام الليل: ١٦٠١. أبو داود. صلاة: ١٣٧١. ترمذي. صوم: ٨٠٨. نسائي. صوم: ٢١٠٣، ٢١٩٧.

**١٣٩٢- عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ أُرِيَ أَعْمَارَ النَّاسِ قَبْلَهُ أَوْ مَا شَاءَ اللَّهُ مِنْ ذَلِكَ فَكَأَنَّهُ تَقَاصَرَ أَعْمَارَ أُمَّتِهِ أَنْ لاَ يَبْلُغُوا مِنَ الْعَمَلِ مِثْلَ الَّذِي بَلَغَ غَيْرُهُمْ فِي طُولِ الْعُمْرِ فَأَعْطَاهُ اللَّهُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ. رَوَاهُ الإمام مالك[٢].**

**پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوەندەی خوا حەزکا ئاگادار دەکرێ لە تەمەنی نەتەوەکانی پێش خۆی دیارە کارو کردەوەشیان بەپێی تەمەنی درێژیان زۆر زۆر بووە جا کاتێ لەم وەزعە حاڵی دەبێ وەك بڵێی تەمەنی ئۆمەتی خۆی بە کورت بزانێ و مەترسی ئەوە دەکا کە لەبەر تەمەن کورتی فریا نەکەون کە ئەو هەموو کردەوە باشانە بکەن، کە ئەوان لە تەمەنی درێژی خۆیاندا کردوویانە، جا خودای گەورەو میهرەبان بۆ باربوویی ئەو بەجیماوییە شەوی لەیلەتوقەدری پێ بەخشی، کە چاکترە لە هەزار مانگ (ئیمامی مالیك. ڕەحمەتی خودای لێبێ).**

## ٥١) لەیلەتولقەدر لە شەوەکانی دەی دوایی ڕەمەزاندایە
## هي في العشر الأواخر من رمضان

**١٣٩٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ شَدَّ مِئْزَرَهُ، وَأَحْيَا لَيْلَهُ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ. رَوَاهُ الخمسة. ولفظ الترمذي: وَكَانَ يَجْتَهِدُ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مَا لاَ يَجْتَهِدُ فِي غَيْرِهَا[١].**

**عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وابوو کە دەی دوایی ڕەمەزان دەهات خۆی گورج دەکردەوە بۆ خواپەرستی و شەوی خۆیی ئاوەدان دەکردەوە بەشەو نوێژو یادی خودا وە کەس و کاری خۆشی خەبەر دەکردەوە بۆ هەمان مەبەست (ش/د/ت/ن).**

---

[٢] سكت عنه الشارح.

[١] بخاري صوم: ٢٤. فضل ليلة القدر: ٢٠٢٤. مسلمز إعتكاف: ٢٧٧٩، ٢٧٨٠. أبو داود. صلاة: ١٣٧٦. نسائي. قيام الليل: ١٦٣٨. (رياض: ١٢٢٣/٢ ز: ٢١٨).

ولفظ الترمذي: وَكَانَ يَجْتَهِدُ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مَا لاَ يَجْتَهِدُ فِي غَيْرِهَا:

**گفتەی (ت): ئەو كۆشش و تێكۆشانەی كە لە دەی دوایی ڕەمەزاندا دەیكرد لە هیچ كاتێكی تردا ئەوەی نەدەكرد.**

١٣٩٤- وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُجَاوِرُ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ وَيَقُولُ: تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٢].

**دیسان گوتی: یاسای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وابوو: لە دەی دوایی ڕەمەزاندا خەڵوەی لە مزگەوتا دەكێشا، وە دەیفەرموو: لە دە شەوی دوایی ڕەمەزاندا بۆ لەیلەتولقەدر بكەڕێن (ش/ت).**

١٣٩٥- وَقَالَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): أَنَّ رِجَالاً مَنْ أَصْحَابِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُرُوا لَيْلَةِ الْقَدْرِ فِي الْمَنَامِ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَأَتْ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ، فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيهَا فَلْيَتَحَرَّهَا فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٣].

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: چەند پیاوێ لە یارانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە خەونا لە حەوت شەوەكانی دوایی ڕەمەزاندا لە لەیلەتولقەدر دیبوو، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: وا دەزانم كە خەونەكەتان لە بارەی لەیلەتولقەدرەوە كە بكەوێتە حەوتەی دوایی ڕەمەزانەوە، وا دەزانم ئەم خەونەتان پێكاویەتی و ڕێك دەكەوێ لەگەڵ ڕاستی دا، جا كەوابوو ئەوەی مشووری بۆ دەخوات با لە حەوت شەوەكانی دوایی دا مشووری بۆ بخوات (ش/د/ن).**

---

[٢] بخاري. فضل ليلة القدر: ٢٠٢٠. مسلم. صوم: ٢٧٦٨. (رياض: ١١٩١/٣ ز:٢١٤ — متفق عليه.

[٣] بخاري. فضل ليلة القدر: ٢٠١٥. مسلم. صوم: ٢٧٥٣ — ٢٧٥٥. أبو داود. صلاة: ١٣٨٥. (رياض: ١١٩٠/٢ز: ٢١٤ — متفق عليه).

١٣٩٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْوِتْرِ مِنَ الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٤].

**عائیشه** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: بگەڕێن بۆ شەوی لەیلەتولقەدر لە شەوە تاکەکانی دەی دوایی رەمەزاندا (ش/ت).**

١٣٩٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي تَاسِعَةٍ تَبْقَى، فِي سَابِعَةٍ تَبْقَى، فِي خَامِسَةٍ تَبْقَى. رَوَاهُ الثلاثة[٥].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) **فەرمووی: لە شەوەکانی دەی دوایی رەمەزاندا بگەڕێن بۆ شەوی لەیلەتولقەدر، بە تایبەتی لە شەوی بیستو یەكو بیستو سێو بیستو پێنج دا (ش/د).**

١٣٩٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اعْتَكَفَ الْعَشْرَ الأَوَّلَ مِنْ رَمَضَانَ ثُمَّ اعْتَكَفَ الْعَشْرَ الأَوْسَطَ فِي قُبَّةٍ تُرْكِيَّةٍ عَلَى سُدَّتِهَا حَصِيرٌ. قَالَ: فَأَخَذَ الْحَصِيرَ بِيَدِهِ فَنَحَّاهَا فِي نَاحِيَةِ الْقُبَّةِ ثُمَّ أَطْلَعَ رَأْسَهُ فَكَلَّمَ النَّاسَ فَدَنَوْا مِنْهُ فَقَالَ: إِنِّي اعْتَكَفْتُ الْعَشْرَ الأَوَّلَ أَلْتَمِسُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ ثُمَّ اعْتَكَفْتُ الْعَشْرَ الأَوْسَطَ ثُمَّ أُتِيتُ فَقِيلَ لِي إِنَّهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَعْتَكِفَ فَلْيَعْتَكِفْ. فَاعْتَكَفَ النَّاسُ مَعَهُ قَالَ: وَإِنِّي أُرِيتُهَا لَيْلَةَ وِتْرٍ وَأَنِّي أَسْجُدُ صَبِيحَتَهَا فِي طِينٍ وَمَاءٍ. فَأَصْبَحَ مِنْ لَيْلَةِ إِحْدَى وَعِشْرِينَ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ فَمَطَرَتِ السَّمَاءُ فَوَكَفَ الْمَسْجِدُ فَأَبْصَرْتُ الطِّينَ وَالْمَاءَ فَخَرَجَ حِينَ فَرَغَ مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ وَجَبِينُهُ وَرَوْثَةُ أَنْفِهِ فِيهِمَا الطِّينُ وَالْمَاءُ وَإِذَا هِيَ لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ مِنَ الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٦].

---

[٤] بخاري. فضل ليلة القدر: ٢٠١٧. مسلم. صوم: ٢٧٦٨ (رياض: ١١٩٢/٤ ز: ٢١٤).

[٥] بخاري. فضل ليلة القدر: ٢٠٢١، ٢٠٢٢.

[٦] بخاري. أذان: ٦٦٩، ٨١٣، ٨٣٦، ٢٠١٦، ٢٠١٨، ٢٠٢٧، ٢٠٣٦، ٢٠٤٠. مسلم. صوم: ٢٧٦١ — ٢٧٦٥. أبو داود. صلاة: ٨٩٤، ٨٩٥، ٩١١، ١٣٨٢. نسائي. تطبيق: ١٠٩٤، ١٣٥٥. ابن ماجه. صوم: ١٧٦٦.

ئـەبو سـەعيد (خـوداى لىٚ ڕازى بـىٚ) گـوتـى: پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەربىٚ) لـە دەشـەوى يەكـەمى ڕەمەزانـدا لـە مزگـەوت خـەڵوەى كێشا، لەپاشا لـە دەشـەوى ناوەڕاستيشا خەڵوەى كێشا، لەناو چاتۆڵەيەكى لباد دابوو، حەسيرێك پـەردەى دەرگاكـەى بـوو، گـوتـى: جـا حـەزرەت (دروودى خـوداى لەسـەربىٚ) بـە دەسـتـى خـۆى حەسـيرەكەى هـەڵگرتو لـە گۆشـەيەكى چـاتۆڵەكەوە دوورى خـستەوە، ئينجـا سـەرى كێـشاو قـسەى لەگـەڵ خەڵكەكـە كـرد، ئـەوانيش لێـى نزيـك بوونـەوە، فـەرمووى: مـن كـە لـە دەى يەكـەما خـەڵوەم كێشا منـەيى شـەوى لەيلەتولقـەدرم دەكـردو بـۆ ئـەو شـەوە دەگـەڕام، هـەر وەهـا لـە دەى ناوەڕاستيـشدا، كەچـى جوبرائيل هاتـە لامو فەرمووى: كە ئەو شەوە لـە دەى دوايـى دايـە، كەواتـە هـەر كەسەتان حەزدەكان كە ئـەم دەشـەوەى دواييـيـەيش خـەڵوە بكێشن ئەوابيكێشن ئـيتر مەردوومەكـەيش لەگـەڵ پێغەمبـەردا (دروودى خوداى لەسـەربىٚ) ئـەو دە شـەوەيش خەڵوەيان كێشايەوە لەناو مزگەوتا، فەرمووى (دروودى خوداى لەسەربىٚ): وە لـە خـەوما نيـشانم درا كـە شـەوى بـەڕێز (لەيلەتولقـەدر) شـەوێكى تـاك دەبـىٚ، وە لـە بەيانييەكەيدا كوڕنووش لـەناو قوڕاوو باراناودا دەبـەم، جا وا ڕێكـەوت شـەوى بيـستو يـەك بـاران بـارى، مزگەوتەكـە دلۆپـەى كـرد، بـە چـاوى خـۆم ئـاوو قوڕاوەكەم دى، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەربىٚ) كە لـە نوێـژى بەيانى بووەو چووە دەرەوە تـەوێڵو سـەرى لـووتى ئـاوو قوڕيـان پێوەبـوو وەخەوەكـەى پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسـەربىٚ) هاتە دى جا كە تەماشامان كرد ئەو شەوە شەوى بيستو يەك بوو لە دە شەوى دوايى ڕەمەزان (ش/د/ن).

١٣٩٩- وَفِي رِوَايَةٍ: أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ ثُمَّ أُنْسِيتُهَا وَأَرَانِي صُبْحَهَا أَسْجُدُ فِي مَاءٍ وَطِينٍ. قَالَ: فَمُطِرْنَا لَيْلَةَ ثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ[٧].

لـە گێڕانەوەيـەكا: شـەوى لەيلەتولقـەدريان پـىٚ گـوتم: بـەڵام لەپاشـا لـە بيريان بردمەوە، وە لە خەونا ديتم كە نوێژى بەيانى ئەو شەوە دەكـەم، لـەناو ئاوو قوڕدا كوڕنووش دەبەم گوتى: جا لە شەوى بيستو سێدا باران بارى.

---

[٧] مسلم. صوم: ٢٧٦٧.

## ٥٢) واباوە کە شەوی بیستو حەوت شەوی لەیلەتولقەدرە
## المشهور في السابعة والعشرين

١٤٠٠- عَنْ زِرِّ بْنَ حُبَيْشٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ فَقُلْتُ: إِنَّ أَخَاكَ ابْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: مَنْ يَقُمِ الْحَوْلَ يُصِبْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ. فَقَالَ: رَحِمَهُ اللَّهُ أَرَادَ أَنْ لاَ يَتَّكِلَ النَّاسُ أَمَا إِنَّهُ قَدْ عَلِمَ أَنَّهَا فِي رَمَضَانَ وَأَنَّهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ وَأَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ. ثُمَّ حَلَفَ لاَ يَسْتَثْنِي أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ فَقُلْتُ بِأَيِّ شَيْءٍ تَقُولُ ذَلِكَ يَا أَبَا الْمُنْذِرِ قَالَ: بِالْعَلاَمَةِ أَوْ بِالآيَةِ؟ الَّتِي أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهَا تَطْلُعُ يَوْمَئِذٍ لاَ شُعَاعَ لَهَا. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري ولفظ أبي داود: قُلْتُ مَا الآيَةُ قَالَ: تُصْبِحُ الشَّمْسُ صَبِيحَةَ تِلْكَ اللَّيْلَةِ مِثْلَ الطَّسْتِ لَيْسَ لَهَا شُعَاعٌ حَتَّى تَرْتَفِعَ[١].

زیڕی کوڕی حوبەیش (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پرسیارم کرد لە ئوبەیی کوڕی کەعب، گوتم: ئیبنو مەسعوودی برادەرت دەڵێ: هەر کەسێ سەرانسەری ساڵ شەونوێژبکا ئەوسا تووشی لەیلەتولقەدر دەبێ، ئەویش گوتی: (ڕەحمەتی خودای لێبێ) ئەوە مەبەستی ئەوەیە کە موسوڵمانان پشتیان سارد نەبێتەوەو تەنیا بەکردنی شەونوێژی دەی دوایی ڕەمەزان پشت نەبەستن، ئەگینا ئەو باش باش دەزانێ کە ئەو شەوە لە ڕەمەزاندایە، وە لە دەی دواییش دایە، وە شەوی بیستو حەوتیشە، لە پاشا بەبێ پەروا سوێندی خوارد (بەبێ ئەوە کە سێ و دووی لێ بکا) لەسەر ئەوە کە ئەو شەوە شەوی بیستو حەوتە، منیش پێم گوت: ئەی ئەبو لمونذیر! بە چیا وادەڵێی؟ گوتی: بەو نیشانەیەدا (یا گوتی: بەو بەڵگەیەدا) کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی گوتووین: ئەو ڕۆژە کە خۆر هەڵدێ تیشکی نیە (م/د/ت/ن) گفتەی (د): گوتم: نیشانەکەی کامەیە؟ گوتی: بەیانی ئەو شەوە خۆر وەك تەشت وا دەبێ، لەبەر زۆری هامووشۆی فریشتە وەك لەپشت هەورێکی تەنکەوە دەرکەوێ وا دەبێ، تا بەرز نەبێتەوە تیشکی نابێ.

---

[١] مسلم. صوم: ٢٧٦٩، ١٧٨٢، ١٧٨٣، ١٧٨٤، ٢٧٧٠، أبو داود صلاة: ١٣٧٨. نسائی. صوم: ٧٩٣.

**١٤٠١- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْلَةَ الْقَدْرِ لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ. رَوَاهُ أبو داود وأحمد[٢].**

**موعاوییەی كوڕی ئەبو سوفیان (خودایان لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: شەوی لەیلەتولقەدر شەوی بیستو حەوتی رەمەزانە (د/ئەحمەد-س/ص).**

## ٥٣) نەهی كراوە لە گرتنی رۆژووی ئەم رۆژانە

## رۆژی جەژنی رەمەزانو رۆژی جەژنی قوربانو ئەو سێ رۆژەیش كە قوربانییان تیا دەكرێ كە مەشهوورن بە ئەییامو تەشریق:

## الأيام المنهي عن صيامها: أيام العيد والتشريق

**١٤٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ يَوْمِ الأَضْحَى وَيَوْمِ الْفِطْرِ. رَوَاهُ الخمسة[١].**

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی كردووە لە گرتنی رۆژووی ئەم دوو رۆژە: رۆژی جەژنی قوربانو رۆژی جەژنی رەمەزان (ش/د/ت/ن).**

**١٤٠٣- عَنْ نُبَيْشَةَ الْهُذَلِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَيَّامُ التَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ وَذِكْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. رَوَاهُ أحمد ومسلم[٢].**

**نوبەیشەی هوذەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سێ رۆژەی پاش رۆژی یەكەمی جەژنی قوربانیش كە مەشهوورن بە ئەییاموتەشریق، واتە: رۆژانی قوربانی سەربڕینو كردنی گۆشتەكەیان بەلەتكە گۆشت (قەدید) بە هەڵخستنی لەبەر خۆر ئەم سێ رۆژەیش وەك**

---

[٢] بسند صحيح (شرحه).

[١] بخاري. صوم:١٩٩٠، ٥٥٧١. مسلم. صوم: ٢٦٦٦، ٥٠٧٠، ٥٠٧١، ٨٠٧٢. أبو داود. صوم: ٢٤١٦. ترمذي. صوم: ٧٧١.

[٢] مسلم. صوم: ٢٦٢٧ – ٢٦٧٥.

یەکەم ڕۆژی جەژن، ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەو یادکردنی خودای گەورەن. (ئەحمەد/موسلیم).

١٤٠٤ – عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَوْمُ عَرَفَةَ وَيَوْمُ النَّحْرِ وَأَيَّامُ التَّشْرِيقِ عِيدُنَا أَهْلَ الإِسْلاَمِ وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٣].

عوقبەی کوڕی عامیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژی جەژنی قوربان و سێ ڕۆژەکەی پاشی، جەژنی خۆمانن (کە کۆمەڵەی ئیسلامین) وە ئەم ڕۆژانە ڕۆژی خواردن و خواردنەوەو نۆشکردنن! (د/ت/ن–س/ص).

## ٥٤) لە نیوەی دوایی کوڵەمانگیشا ڕۆژوو باش نیە: (نصف شعبان الأخير)

١٤٠٥ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقَدَّمُوا رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ وَلاَ يَوْمَيْنِ إِلاَّ رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمًا فَلْيَصُمْهُ. رَوَاهُ الخمسة[١].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەڕۆژوو دوو ڕۆژ لەپێش ڕەمەزانا بەڕۆژوو مەبن، مەگەر بۆ کەسێ ڕۆژووی خۆی بگرێ وەك ئەوە دەستووری وابێ دوو شەممەو پێنج شممە بەڕۆژوو بێ، یا ڕۆژووی نەذربێ، یا قەزا بێ (ش/د/ت/ن. ڕەحمەتی خودایان لەسەر بێ).

١٤٠٦ – وَالأصحاب السنن: إِذَا انْتَصَفَ شَعْبَانُ فَلاَ تَصُومُوا[٢].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەکوڵە مانگ دوو کوت بوو ئیتر هەتا ڕەمەزان دادێ ڕۆژوو مەگرن (د/ت/ن–س/ص).

---

[٣] بسند صحيح (شرحه).

[١] بخاري. صوم: ١٩١٤. مسلم. صوم: ٢٥١٤. ترمذی صوم: ٦٨٥.

[٢] بسند صحيح (شرحه). (رياض: ١٢٢٦/٣ ز- ٢١٩ – حدريث حسن صحيح).

**٥٥) رۆژووی رۆژی گومان (يوم الشك): گومانە رۆژیش باش نیە: (يوم الشك)**

١٤٠٧– عَنْ صِلَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ فَأُتِيَ بِشَاةٍ مَصْلِيَّةٍ فَقَالَ: كُلُوا. فَتَنَحَّى بَعْضُ الْقَوْمِ فَقَالَ: إِنِّي صَائِمٌ. فَقَالَ عَمَّارٌ: مَنْ صَامَ الْيَوْمَ الَّذِى يَشُكُّ فِيهِ النَّاسُ فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ (صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ). رَوَاهُ أصحاب السنن. والبخارى تعليقا[1].

صیلە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لەلای عەمماری کوڕی یاسر بووین دانیشتبووین، مەڕێکی برژاویان بۆ هێنا، گوتی: بخۆن، پیاوێ لە کۆمەڵەکە کلابوو، وە گوتی: من بەرۆژووم. عەمماریش گوتی: هەر کەسێ رۆژووی ئەو رۆژە بگرێ کە خەڵك گومانی لێ دەکەن و لێیان روون نیە کە لە رەمەزانەیانە، ئەوە لە فەرمانی پێغەمبەر دەرچووە (دروودی خودای لەسەربێ) (د/ت/ن–س/ص – بوخاریش بە تەعلیق ریوایەتی کردووە. رەزای خودایان لێبێ).

**٥٦) گرتنی رۆژووی هەینی یا شەممە بە تەنیا باش نیە**
**أفراد يوم الجمعة أو السبت**

١٤٠٨– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ) قَالَ: لاَ يَصُمْ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلاَّ أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ أَوْ يَصُومَ بَعْدَهُ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەس لە ئێوە بەتایبەتی رۆژووی رۆژی هەینی بەتەنیا نەگرێ، مەگەر لە پێشیەوە یا لە پاشیەوە رۆژێکی تری لە گەڵدا بگرێ (ش/د/ت/ن).

١٤٠٩– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ عَنْ أُخْتِهِ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ) قَالَ: لاَ تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ إِلاَّ فِيمَا افْتُرِضَ عَلَيْكُمْ وَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلاَّ لِحَاءَ عِنَبَةٍ أَوْ عُودَ شَجَرَةٍ فَلْيَمْضُغْهُ. رَوَاهُ اصحاب السنن والحاكم وصححه[2].

---

[1] ذكره البخارى تعليقا فى الباب/ ١١ من كتاب الصوم قبل الرقم: ١٩٠٦. (رياض: ١٢٢٧/٤ ز-٢١٩. أبو داود. ٢٣٣٤. ترمذى: ٦٨٦).

[1] بخاري. صوم: ١٩٨٥، ١٩٨٦، ١٩٨٤. مسلم. صوم: ٢٦٧٦ – ٢٦٧٩. أبو داود صوم: ٢٤٢٠. ترمذى. صوم: ٧٤٣.

عەبدوڵڵای كوڕی بوسر لە خوشكیەوە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بە تەنیا ڕۆژی شەممە خۆی بە ڕۆژوو مەبن مەگەر بۆ ڕۆژووی فەرز، ئەگەر لەو ڕۆژەدا هەر هیچتان دەست نەكەوت بیخۆن، جگە لە تلّپی دەنكە ترێیەك، یا جگە لە پەلكە دارێ ئەوا ئەوە بجوون و بیخۆن و بەڕۆژوو مەبن تالاسكایی جوولەكە نەكەنەوە (د/ت/ن/حاكم:ص).

## ٥٧) باسی هەشتەم: باسی ڕۆژووی سوننەت
## الباب الثامن: في صيام النفل

١٤١٠ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بَاعَدَ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا. رَوَاهُ الشيخان[1].

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ لەكاتی غەزادا، یا لە ڕێگەی خوادا، تەنیا لەبەر ڕەزای خودای گەورە، ڕۆژێ بە ڕۆژووبێ، خودا حەفتا ساڵەرێ ڕووی دوور دەگرێ لە ئاگری دۆزەخ! (ش).

## ٥٨) ڕۆژوو لە مانگی موحەرەما سوننەتە: (صوم شهر المحرم)

١٤١١ - تقدم تخريجه في رقم: ٩٧٦/٤[1].

١٤١٢ - وَقَالَ: عَلِيّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) جَاءَ رَجُلٌ فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ شَهْرٍ تَأْمُرُنِي أَنْ أَصُومَ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ قَالَ: إِنْ كُنْتَ صَائِمًا بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ فَصُمِ

---

[2] صحيح عند الحاكم.

[1] بخاري. جهاد: ٢٨٤٠. مسلم. صوم: ٢٧٠٤ — ٢٧٠٦. ترمذي. جهاد: ١٦٢٣.

[1] راجع رقم: ٩٧٦/٤ في المجلد الاول. تسلسل/١٨١.

الْمُحَرَّمَ فَإِنَّهُ شَهْرُ اللَّهِ فِيهِ يَوْمٌ تَابَ اللَّهُ فِيهِ عَلَى قَوْمٍ وَيَتُوبُ فِيهِ عَلَى قَوْمٍ آخَرِينَ. رَوَاهُ الترمذي وحسنه[٢].

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ هات لە پێغەمبەری پرسی (درودی خودای لەسەربێ) سەرەڕای ڕەمەزان بەكام مانگەی تریش فەرمانم پێ دەكەی كە بەڕۆژووبم؟ فەرمووی: ئەگەر سەربارەی ڕەمەزان ڕۆژووی تر دەگریت، ئەوا موحەڕەم بگرە، موحەڕەم مانگی خودایە، مانگێكی گەورەیە، ڕۆژێكی تیادایە خودا لەو ڕۆژەدا تۆبەو پەشیمانی لە گەلێ قەبووڵ كردووە، وە هەر لەو ڕۆژەیشدا خودا تەوبە لە خەڵكانو گەلانی تریش گیرا دەكا (ت:ح).

## ٥٩) گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی عاشوورا: (يوم عاشوراء)

١٤١٣- عَنْ الْحَكَمُ بْنُ الأَعْرَجِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ رِدَاءَهُ عِنْدَ بِئْرِ زَمْزَمَ فَقُلْتُ لَهُ: أَخْبِرْنِي عَنْ صَوْمِ عَاشُورَاءَ. فَقَالَ: إِذَا رَأَيْتَ هِلاَلَ الْمُحَرَّمِ فَاعْدُدْ وَأَصْبِحْ يَوْمَ التَّاسِعِ صَائِمًا. قُلْتُ أَهَكَذَا كَانَ رَسُولُ الـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُومُهُ قَالَ: نَعَمْ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخارى[١].

حەكەمی كوڕی ئەعرەج (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: چووم بۆ لای ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) لە كن بیری زەمزەم شانی دادابوو لەسەر پۆشاكەكەی، پێم گوت: پێم بڵێ ڕۆژووی عاشوورا كامەیە؟ گوتی: كە مانگی یەك شەوەی مانگی موحەڕەمت دی، ڕۆژ بژمێرە، وە ڕۆژی نۆهەم بە. ڕۆژوو بە گوتم: جاران پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) هەر ئاوا دەیگرت؟ گوتی: ئا (م/د/ت/ن. ڕەزای خودای مەزنیان لەسەربێ).

---

[٢] حسن عند الترمذي.

[١] مسلم. صوم: ٢٦٥٩. ابو داود صوم: ٢٤٤٦، ٢٦٥٩. ترمذى. صوم: ٧٥٤.

١٤١٤- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: صَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ يَوْمٌ تُعَظِّمُهُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى. قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِذَا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ - إِنْ شَاءَ اللَّهُ - صُمْنَا الْيَوْمَ التَّاسِعَ فَلَمْ يَأْتِ الْعَامُ الْمُقْبِلُ حَتَّى تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَوَاهُ مسلم وابو داود[٢].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕۆژی دەی موحەررەم کە ناودارە بە ڕۆژی عاشوورا بە ڕۆژوو بوو، وە فەرمانی دا بە موسوڵمانانیش کە ئەو ڕۆژە بەڕۆژووبن. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم ڕۆژە جوولەکەو گاوریش ڕێزی لێ دەگرن. فەرمووی: کەواتە خوا حەزکا ئەگەر ماین‌و نەمردین لە ساڵی ئاییندەدا ڕۆژی نۆهەمیشی دەگرین تا خۆمان لە گاورو جوولەکەکان جیا بکەینەوە، لاسکایی ئەوان نەکەینەوە، گوتی: ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) (لە پێش هاتنی ساڵی ئاییندەدا) کۆچی دوایی کرد (م/د).

١٤١٥- وَعَنْهُ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِصَوْمِ عَاشُورَاءَ يَوْمَ الْعَاشِرِ. رَوَاهُ الترمذي وصححه[٣] .

دیسان هەرخۆی (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی کرد: ڕۆژووی ڕۆژی دەهەمی موحەڕەم بگرن لە جیاتی ڕۆژی عاشورا (ت:ص).

١٤١٦- قَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ: صُومُوا التَّاسِعَ وَالْعَاشِرَ وَخَالِفُوا الْيَهُودَ[٤].

لە شەرحەکەدا دەڵێ: ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژی نۆیەم‌و دەیەمی موحەڕەم بەڕۆژووبن‌و خۆتان لە جوولەکەکان جیا بکەنەوە چونکە ئەوان هەر ڕۆژی دەیەم بەڕۆژوو دەبن.

---

[٢] مسلم. صوم: ٢٦٦١. أبو داود. الصوم: ٢٤٤٥.

[٣] صحيح عند الترمذي.

[٤] سكت عن درجته الشارح.

## ٦٠) گەورەیی ڕۆژووەکەی: (فضل صيامه)

١٤١٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَتْ: كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُومُهُ، فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ صَامَهُ، وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، فَلَمَّا فُرِضَ رَمَضَانُ تَرَكَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ. رَوَاهُ الأربعة[1].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران قوڕەیش لە سەردەمی نەزانیدا ڕۆژووی ڕۆژی عاشوورایان دەگرت، وە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) هەر لەو سەردەمەدا چاوی لەوان دەکردو دەیگرت، کاتێ هاتیش بۆ مەدینە هەر دەیگرت‌و فەرمانیشی دەکرد بەگرتنی، جا کە خودا ڕۆژووی ڕەمەزانی دانا لەسەر موسوڵمانان، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وازی لە ڕۆژووی ڕۆژی عاشوورا هێنا، جا ئێستا ئاوایە: کەسێ حەزکا دەیگرێ، وە کەسێ حەزکا نایگرێ! (ش/د/ت).

١٤١٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُا) قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ، فَرَأَى الْيَهُودَ تَصُومُ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ: مَا هَذَا. قَالُوا: هَذَا يَوْمٌ صَالِحٌ، هَذَا يَوْمٌ نَجَّى اللَّهُ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ عَدُوِّهِمْ، فَصَامَهُ مُوسَى. قَالَ: فَأَنَا أَحَقُّ بِمُوسَى مِنْكُمْ، فَصَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ. رَوَاهُ الشيخان[2].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە هات بۆ مەدینە تەماشای کرد جوولەکەکان دەی موحەڕڕەم بەڕۆژوو دەبن، فەرمووی: ئەم ڕۆژووە هی چییە؟ گوتیان: ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر باشە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە خودا نەوەی حەزرەتی یەعقووب پێغەمبەری تێدا ڕزگار کردووە لە دەستی دوشمنی خۆیان، وە مووسا لەم ڕۆژەدا سوپاس بۆ خودا لەسەر نیعمەتی قوتاربوون لە دەستی دوشمن بەڕۆژوو بووە وە ئێمەیش چاو لەو

---

[1] بخاري. تفسير: ٢٥٠١، ٢٥٠٢، ٢٥٠٤. مسلم. صوم: ٢٦٣٢ — ٢٦٤٠. أبو داود. صوم: ٢٤٤٣.

[2] بخاري. تفسير: ٤٦٨٠، ٤٧٣٧، ٣٩٤٩. مسلم. صوم: ٢٦٥١ — ٢٦٥٣. أبو داود. روم: ٢٤٤٤.

دەکەین و دەیگرین، حەزرەتیش فەرمووی: کەوابێ بۆ من رەواترە کە پەیڕەوی مووسا بکەم لەمەدا هەتا ئێوە، جا پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) گرتی، وە فەرمانی دا بە گرتنیشی لەلایەنی موسوڵمانانەوە (ش/د).

١٤١٩- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ أَهْلُ خَيْبَرَ يَصُومُونَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ يَتَّخِذُونَهُ عِيدًا وَيُلْبِسُونَ نِسَاءَهُمْ فِيهِ حُلِيَّهُمْ وَشَارَتَهُمْ. فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَصُومُوهُ أَنْتُمْ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران جوولەکەکانی خەیبەر لە رۆژی دەی موحەڕڕەمدا بە رۆژوو دەبوون و دەیانکرد بە جەژن وە ژنەکانیان خۆیان دەڕازاندەوەو خشڵ و جل و بەرگی رازاوەیان لەبەر دەکرد.جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەی ئێوەیش بیگرن (ش).

١٤٢٠- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: أَمَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ أَنْ أَذِّنْ فِي النَّاسِ، أَنَّ مَنْ كَانَ أَكَلَ فَلْيَصُمْ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ أَكَلَ فَلْيَصُمْ، فَإِنَّ الْيَوْمَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ. رَوَاهُ الشيخان والنسائى[٤].

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: لە بەیانی رۆژی عاشوورادا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی کرد بە پیاوێکی سەلەمی کە: بەناو مەردومدا جاڕ هەڵدەو بانگەواز هەڵدە: ئەوەی شتی خواردووە با ئیتر نەیخواو ماوەی ئەمڕۆ تا ئێوارێ بەرۆژوو بێ، وە ئەوەی شتی نەخواردووە با بەرۆژوو بێ، چونکە ئەمڕۆ رۆژووی عاشورایە (ش/ن).

١٤٢١- عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: أَرْسَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَدَاةَ عَاشُورَاءَ إِلَى قُرَى الأَنْصَارِ الَّتِي حَوْلَ الْمَدِينَةِ: مَنْ كَانَ أَصْبَحَ صَائِمًا فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ وَمَنْ كَانَ أَصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ. فَكُنَّا بَعْدَ ذَلِكَ نَصُومُهُ وَنُصَوِّمُ صِبْيَانَنَا

---

[٣] بخاري. صوم: ٢٠٠٤، ٣٣٩٧، ٣٩٤٣، ٤٦٨٠، ٤٧٣٧ تجريد: ٩١٩. مسلم. صوم: ٢٦٥٦.

[٤] بخاري. صوم: ١٩٢٤، ٢٠٠٧، ٧٢٥٦. مسلم. صوم: ٢٦٦٣. نسائى. صوم: ٢٣٢٠.

الصِّغَارَ مِنْهُمْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ وَنَذْهَبُ إِلَى الْمَسْجِدِ فَنَجْعَلُ لَهُمُ اللُّعْبَةَ مِنَ الْعِهْنِ فَإِذَا بَكَى أَحَدُهُمْ عَلَى الطَّعَامِ أَعْطَيْنَاهَا إِيَّاهُ حَتَّى يَكُونَ عِنْدَ الإِفْطَارِ(٥).

روبەییعی كچی موعەوویذ (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سەر لە بەیانی رۆژی عاشورا، پەیامی نارد بۆ گوندەكانی یاریدەدەران (أنصار) كە لە دەوروبەری مەدینە بوون فەرمووی: هەر كەسێ ئەمڕۆ بەرۆژووە با نەیشكێنێ تا ئێوارێ، وە هەر كەسێ ئەمڕۆ بەرۆژوو نیە با ماوەی ئەمڕۆ بەرۆژووبێ ئیتر لەوەدوا دەستوورمان وابوو، ئەو رۆژە بەرۆژوو دەبووین، تەنانەت بە مندالّی بچكۆلەی خۆیشمان دەگرت، بەوانەیان كە خودا لە چارەی نوسیبوون، وە دەچووین بۆ مزگەوتو یاریلۆكە (لوعبە)مان لە خوری (رەنگاو رەنگ) دروست دەكرد بۆیان، جا كە دەگریان بۆنانو ئاو بەوە ژیرمان دەكردنەوە هەتا كاتی بەر بانگ (ش).

١٤٢٢- وَقَالَ: ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَحَرَّى صِيَامَ يَوْمٍ فَضَّلَهُ عَلَى غَيْرِهِ، إِلاَّ هَذَا الْيَوْمَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَهَذَا الشَّهْرَ. شَهْرَ رَمَضَانَ. رَوَاهُمَا الشيخان(٦).

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: نەمدیوە كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) مشووری رۆژووی هیچ رۆژێ بخوا كە بە گەورەتری دابنێ لە رۆژانی تر جگە لەم رۆژە كە رۆژی عاشوورایە، وە جگە لەم مانگە كە مانگی رەمەزانە (ش).

١٤٢٣- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) أَنَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري(٧).

---

(٥) بخاري. صوم: ١٩٦٠. مسلم. صوم: ٢٦٦٤.

(٦) بخاري. صوم: ٢٠٠٦. مسلم. صوم: ٢٦٥٧. نسائي. صوم: ٢٣٦٩.

(٧) مسلم. صوم: ٢٧٣٨ — ٢٧٤١. ابو داود صوم: ٢٤٢٥، ٢٤٤٦. ترمذي صوم: ٧٤٩. نسائي. صوم: ٢٣٨٢.

**ئـەبو قـەتادە** (خـودای لێ رازی بـێ) **گـوتی: پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **فەرمووی: ئومێد دەكەم لـە خـودا كە رۆژووی رۆژی عاشوورا برێتـی گوناهی ساڵی پێش خۆی بكەوێ (م/د/ت/ن).**

**١٤٢٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ** (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: (مَنْ وَسَّعَ عَلَى عِيَالِهِ فِي يَومِ عَاشُورَاءَ وَسَّعَ اللهُ عَلَيْهِ فِي سَنَتِهِ كُلِّهَا. رَوَاهُ الطبراني والبيهقي**[٨]**.**

**ئەبو سەعيد** (خودای لێ رازی بێ) **گـوتی:** (درودی خودای لەسەربێ) **فـەرمووی: هـەر كەسێ لە رۆژی عاشوورادا خۆشیو هەرزانی بخاتە ناو خـاوو خێـزانو مـاڵو منـاڵی خـۆی، خـودا خۆشـیو هـەرزانی دەخاتـە تـەواوی ئـەو سـاڵەی ئـەوەوە! (طەبەرانی/ بەیهەقی)**[١]**.**

---

[٨] سكت عَن درجتة الشارح.

[١] ئیمامی حوسەین (رەزای خودای گەورەی لێبێ) لە رۆژی دەی موحەڕەمدا شەهیدكرا، رەنگە هەنـدێ كەسی ناشارەزا وا بڵێن: كە ئەم حەدیثانەی عاشووراء بە دەسیسەی ئەمەوییـەكان هەڵبەسـتراون، هـەتا سـاڵ رۆژی بیرەوەریـی ئـەم كارەسـاتە دڵ تەزێنـە نـەبێ بـە بۆنـەیێ بۆشـینو شـەپۆڕو ماتـەمینی، وە سـەرەنجام سەربكێـشێ بـۆ سـەركۆنەو سـەرنگوونبوونی حـوكمی ئەمـەوی!! بـەڵێ راستە خوێنی بەناهەق رژاوی حوسەین (خوای لێ رازی بێ) بوو بە دەریایـەكی بـێ پایـانو لـە كۆنو نۆدا گەڵێ فیرعەونانی زەمانـەی تیاخنكان، وە بەتایبـەت بـوو بـە دەردێكی كوشندەو نووسا بـە دڵو جـەرگی ئەمەوییەكانـەوە، تـا یـافتی نەبڕینـەوە یەخـەی بەرنـەان، (هـەروەها رژێمـی صەدامیش).

بەڵام قەت لەو بڕوایـەدا مەبـە كـە زانایـانی گـەورە گـەورەی وەك ئیمامـان: بوخـاریو موسلیمو تیرمیذیو ئەبو داوودو نەسائی (رەزای خودایان لێبێ) فێڵی وایان لێ بكرێ لـە دینـدا، كـە شـتێ بكـەن بە سوننەتو رەوشـتی ئوممـەتی موحەممـەد (درودی خوای لەسەر بێ) كـە لـە سەرچاوەیەكی لێڵو لیخنەوە هەڵقولابێ، ئەو زاتانـە سـەرەڕای عیلمـی بـاطین - دارای عیلمـی ظاهیـریش بـوون، وە بـەرەنگێ تـەحقیقو تـەدقیقیان كـردووە، تاقـە وشـەیێ، یـا حـەرفێ، یـا سـەرو بۆرێكیـان، لـەناو حەدیسێكی درێـژدا بەسـەر گرتۆتـەوەو لایـانبردووە! ئەمـە لـەلایێ، وەكـی تـریش گـەڵێ جاریش

## ٦١) گرتنی رۆژووی رەجەب: (صيام رجب)

**١٤٢٥- قَالَ عُثْمَانُ بْنُ حَكِيمٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) سَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ عَنْ صَوْمِ رَجَبٍ وَنَحْنُ يَوْمَئِذٍ فِي رَجَبٍ. فَقَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يُفْطِرُ. وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يَصُومُ. رَوَاهُ الأربعة[١].**

**عوسمانی کوڕی حەکیم (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: رۆژێ لە مانگی رەجەبدا بووین، بۆ رۆژووی رەجەب لە سەعیدی کوڕی جوبەیرم پرسی، گوتی: لە ئینو عەبباسم ژنەوت دەیگوت: گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەوەندە لەسەر یەك بەرۆژوو دەبوو، تەنانەت دەمانگوت: ئیتر هەر بەرۆژوو دەبێ، گەلێ جاریش لەناوەندی ساڵ ئەوەندە لە سەریەك بەرۆژوو نەدەبوو هەتا دەمانگوت: ئیتر پێ نابێ واتە: بۆ رۆژووی سوننەت فەرقی رەجەب و مانگێکی تری نەدەکرد (ش/د/ت. رەحمەتی خودایان لێبێ).**

**١٤٢٦- عَنْ مُجِيبَةَ الْبَاهِلِيَّةِ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا) عَنْ أَبِيهَا أَوْ عَمِّهَا أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ انْطَلَقَ فَأَتَاهُ بَعْدَ سَنَةٍ وَقَدْ تَغَيَّرَتْ حَالَتُهُ وَهَيْئَتُهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَمَا تَعْرِفُنِي؟ قَالَ: وَمَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: أَنَا الْبَاهِلِيُّ الَّذِي جِئْتُكَ عَامَ الأَوَّلِ. قَالَ: فَمَا غَيَّرَكَ وَقَدْ كُنْتَ حَسَنَ الْهَيْئَةِ. قَالَ: مَا أَكَلْتُ طَعَامًا إِلاَّ بِلَيْلٍ مُنْذُ فَارَقْتُكَ. فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِمَ عَذَّبْتَ نَفْسَكَ. ثُمَّ قَالَ: صُمْ شَهْرَ الصَّبْرِ وَيَوْمًا مِنْ كُلِّ شَهْرٍ. قَالَ: زِدْنِي فَإِنَّ بِي قُوَّةً. قَالَ: صُمْ يَوْمَيْنِ. قَالَ: زِدْنِي. قَالَ: صُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ. قَالَ: زِدْنِي. قَالَ: صُمْ مِنَ الْحُرُمِ وَاتْرُكْ صُمْ مِنَ الْحُرُمِ وَاتْرُكْ صُمْ مِنَ الْحُرُمِ وَاتْرُكْ. وَقَالَ: بِأَصَابِعِهِ الثَّلاَثَةِ فَضَمَّهَا ثُمَّ أَرْسَلَهَا. رَوَاهُ أبو داود وأحمد والنسائي[٢].**

---

**وابووە کە لە رۆژە پیرۆزەکاندا کارەساتی ناخۆش رووی داوەو نەیشبووە بەهۆی طەعن لە پیرۆزیی ئەو رۆژە.**

[١] بخاري. صوم: ١٩٧١. مسلم. صوم: ٢٧١٧. نسائی. صوم: ٢٣٤٥.

[٢] كل مافی المجتبى للنسائی صحيح (المقدمة). (رياض: ٣/ ١٢٤٨ ز: ٢٢٥).

**موجیبـەی باهیلییـە (خـودای لێ رازی بـێ) گـوتی: بـاوکم (یـا گـوتی: مامـەم) دەچـێ بـۆ خزمـەتی حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەربێ) وە سـاڵێ لـەوە دوا دیـسان دەچێتەوە بـۆ لای بـەڵام لـە جاری دووهـەما رەنگـو رووی دەگـۆڕێو شـێوەی وەك خۆی نامێنێ، دەڵێ: بە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ): ئـەی پێغەمبـەری خودا! ئەوە نامناسیتەوە؟ دەفەرموێ: بۆ تۆ كێیت؟ دەڵـێ: من ئـەو باهیلییـەم کە پار هاتم بۆ لات. دەفەرموێ: خۆتۆ پیاوێکی قۆزبووی! بۆ چی وا گۆڕاوی؟ دەڵـێ: ئـەوەتی لـە تـۆ جیابوومەتـەوە بەشـەو نـەبێ رۆژووم نەشـکاندووە پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: بۆچـی ئـازاری خۆتـت داوە؟ ئینجا دەفـەرموێ: رۆژووی مـانگی رەمـەزان بگـرە، کـە مـانگی صـەبرە، وە لـە هەموو مانگێکیش یەك رۆژ بە رۆژوو بە. دەڵێ: قوربان! بۆم زیاتر کە، توانای پترم هەیە. دەفەرموێ: دەفەرموێ: دەی لە گشت مانگێ دوو رۆژ بەرۆژوو بە. دەڵـێ: بـۆم زیـاتر کـە، دەفـەرموێ: دە لەهـەموو مانگـێ سـێ رۆژ بـەرۆژوو بـە دەڵێ: بۆم زیادکە، دەفـەرموێ: دە بەتایبـەتی لـە مـانگی حەرامـەکان سـێ رۆژ بەرۆژووبـە ئینجـا واز بێنـە. دە بـە تایبـەتی لـە مانگـە حەرامـەکان سـێ رۆژ بەرۆژوو بە ئینجا وازبێنە وە بەسێ پەنجەشی دیاری دەکرد کە لەهـەر مانگـێ سـێ رۆژ بگـرێ، بـەم شـێوەیە سـێ پەنجـەی دەلکـان بەیەکـەوە ئینجـا بـەری دەدانەوە (د/ئەحمەد/ن).**

## ٦٢) گرتنی رۆژووی کوڵەمانگ: (صيام شعبان)

**١٤٢٧ – عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) اسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَهْرٍ إِلاَّ رَمَضَانَ، وَمَا رَأَيْتُهُ أَكْثَرَ صِيَامًا مِنْهُ فِي شَعْبَانَ. كَانَ يَـصُومُهُ إِلاَّ قَلِيلاً بَلْ كَانَ يَصُومُهُ كُلَّهُ. رَوَاهُ الأربعة[1].**

---

[1] بخاري. صوم: ١٩٦٩، ١٩٧٠، ٦٤٦٥. مسلم. صوم ٢٧١٤. أبو داود صوم: ٢٤٣٤. نسائي. صوم: ٢٣٥٠.

عائيشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەم دیوە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) مانگێكی تەواو بەرۆژوو بێ، جگە لە رەمەزان، ئەیشم دیوە كە لە هیچ مانگێكا بەقەی مانگی كوڵە مانگ بەرۆژوو بێ، كوڵەمانگی هەموو دەگرت كەمێكی نەبێ، بگرە ساڵی وابوو هەمووی دەگرت (ش/د/ت).

١٤٢٨- وَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُا): مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُومُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ إِلاَّ شَعْبَانَ وَرَمَضَانَ. رَوَاهُ الترمذي بسند حسن[٢].

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: نەمدیوە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دوو مانگ لەسەر یەك سەراپا بەرۆژوو بێ، مەگەر كوڵەمانگ‌و رەمەزان (ت-س/ح=تیرمیذی بەسەنەدێكی جوان ریوایەتی كردووە).

١٤٢٩- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لِرَجُلٍ: هَلْ صُمْتَ مِنْ سُرَرِ هَذَا الشَّهْرِ شَيْئًا؟ قَالَ: لاَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَإِذَا أَفْطَرْتَ مِنْ رَمَضَانَ فَصُمْ يَوْمَيْنِ مَكَانَهُ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

عیمرانی كوڕی حوصەین (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەپیاوێكی فەرموو: لە ناوەراستی مانگی كوڵەمانگدا هیچ بەرۆژوو بووی؟ گوتی: نەء، فەرمووی: دە لەجیاتی ئەوە، كە رەمەزان تەواو بوو دوو رۆژ بەرۆژوو بە (ش).

## ٦٣) رۆژووی رۆژی نیوەڕاستی كوڵەمانگ، شەوی بەرات: (يوم النصف)

١٤٣٠- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا كَانَتْ لَيْلَةُ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ فَقُومُوا لَيْلَهَا وَصُومُوا يَوْمَهَا. فَإِنَّ اللَّهَ يَنْزِلُ فِيهَا لِغُرُوبِ الشَّمْسِ إِلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا فَيَقُولُ: أَلاَ مِنْ مُسْتَغْفِرٍ فَأَغْفِرَ لَهُ أَلاَ مُسْتَرْزِقٌ فَأَرْزُقَهُ أَلاَ مُبْتَلًى فَأُعَافِيَهُ أَلاَ كَذَا أَلاَ كَذَا حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ. رَوَاهُ ابن ماجه[١].

---

[٢] بسند حسن.

[٣] بخاري. صوم: ١٩٨٣. مسلم. صوم: ٢٧٤٣ — ٢٧٤٦.

[١] سكت عنه الشارح.

**عـەلی** (خـودای لێ رازی بـێ) **گـوتی: پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **فـەرمووی: کـە شەوی نیوەی کوڵە مانگ هات، بەشەو نوێژو شەو تاعەت شەوەکەی ئاوەدان بکەنەوەو ڕۆژەکەی بەرۆژوبن، چونکە خودا لـە خۆرئـاوای ئـەو شـەوەوە دێتـە خـوارەوە بـۆ ئـا سمـانی خـواروو، وەتـا بـەیان دەدا هـەر دەفـەرموێ: ئـای بـۆ کەسێ داوای لێ خۆشبوونم لێ بکـا، تـا لێـی خـۆش بم، ئـای بۆ کەسێ داوای بەخشش و ڕۆزیم لێ بکا تا بیدەمێ، ئای بۆ دووچارێ تاچا ری دەردی بکـەم! ئای بۆ ئەوە، ئای بۆ ئەمە واتە: خودای گەورە ورشەو جیلوەی بەهرەو نـازو بەخششی خۆی لەم شەوەدا بـۆ بەنـدەکانی خـۆی دەردەخـا (ئیبنـو ماجـە – سند ضعیف).**

**١٤٣١– عَنْ عَائِشَةَ** (رَضِي اللهُ عَنْهَا) **قَالَتْ: فَقَدْتُ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **ذَاتَ لَيْلَةٍ فَخَرَجْتُ أَطْلُبُهُ فَإِذَا هُوَ بِالْبَقِيعِ رَافِعٌ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ أَكُنْتِ تَخَافِينَ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْكِ وَرَسُولُهُ. قَالَتْ: ظَنَنْتُ أَنَّكَ أَتَيْتَ بَعْضَ نِسَائِكَ. فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَنْزِلُ لَيْلَةَ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيَغْفِرُ لأَكْثَرَ مِنْ عَدَدِ شَعَرِ غَنَمِ كَلْبٍ. رَوَاهُ ابن ماجه والترمذي وأحمد[٢].**

**عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: شەوێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەلام بوو، کە لەخەو خەبەرم بۆوە لەلام نەمابوو، جا کە چووم بۆێگەڕام تەماشام کرد لە گۆڕستانی بەقیع بوو، سەری هەڵبڕیبوو، بۆ ئاسمان فەرمووی: ئەی عائیشە! ئایا مەترسی ئەوەت بوو کە خوداو پێغەمبەری خودا ناڕەواییت لێ بکەن!. گوتم: لەمن وابوو کە خۆت لەمن دزیوەتەوەو چوویت بۆلای ژنێکی ترت. فەرمووی: خودای گەورە لە شەوی نیوەی کوڵەمانگا واتە: لە شەوی بەراتا دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی خواروو، وە پتر لە ژمارەی مووی رانی هۆزی کەلب لە گوناهباران خۆش دەبێ (ئیبنو ماجە/ ت–سند ضعیف–ئەحمەد).**

---

[٢] سكت عنه الشارح.

**١٤٣٢- عَنْ أَبِي مُوسَى** (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) **عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: إِنَّ اللّٰهَ لَيَطَّلِعُ فِي لَيْلَةِ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ فَيَغْفِرُ لِجَمِيعِ خَلْقِهِ إِلاَّ لِمُشْرِكٍ أَوْ مُشَاحِنٍ. رَوَاهُ ابن ماجه وأحمد**[3].

**ئەبو مووسا** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: خودا لە شەوی نیوەی كوڵەمانگا جیلوە دەداو خۆی دەنوێنێ، وە لە هەموو دروستكراوانی خۆی خۆش دەبێ تەنیا لەم دوو كەسە نەبێ، لە كەسێ هاو بەش پەیدا بكا بۆ خوداو لە كەسێ شەڕ فرۆش و ناكۆك و ناسازبێ! (ئیبنو ماجە/ ئەحمەد.** ڕەحمەتی خودایان لێبێ**).**

**١٤٣٣- وللامَام أحمد (كما في الشرح): يطلع الله تبارك وتعالى إِلى خلقه ليلة النصف من شعبان فيغفر لعباده الا اثنين، مشاحن وقاتل نفس**[4].

**واتە: لە شەرحەكەدا دەڵێ: لەسەر گێڕانەوەی ئیمامی ئەحمەد** (خودای لێ ڕازی بێ) **پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرموویەتی: خودای گەورە لە شەوی بەراتا ورشەو پرشنگی ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی دەر دەخات بۆ بەندەكانی خۆی، سەراپا لە بەندەكانی خۆش دەبێ و تاوانیان دەپۆشێ، ئەم دوو كەسەی لێ دەرچێ: كەسێ شەڕانی و ناكۆك و ناسازبێ كەسێ بەناڕەوا كەسێ بكوژێ.**

## ٦٤) ڕۆژووی شەش ڕۆژ لە مانگی شەشەڵان (واتە: مانگی شەووال) سوننەتە: صوم ستة أيام من شوال

**١٤٣٤- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ** (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: مَنْ صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ كَانَ كَصِيَامِ الدَّهْرِ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخارى**[1].

---

[3] سكت عنه الشارح.

[4] سكت عنه الشارح.

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ لە پێشدا رۆژووی رەمەزان بگرێ، وە لەپاش ئەو شەش رۆژیش لە شەشلان بگرێ، ئەوە وەکوو بەدرێژایی ساڵ بەرۆژوو بێ وایە: (م/د/ت/ن).

## ٦٥) دەی قوربان: دەی نۆمینە: (عشر ذي الحجة)

**١٤٣٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ أَيَّامٍ الْعَمَلُ الصَّالِحُ فِيهِنَّ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ الأَيَّامِ الْعَشْرِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فَلَمْ يَرْجِعْ مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ. رَوَاهُ الترمذي والبخارى وأبو داود[1].**

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هیچ رۆژانێ نیە کە وەك ئەم دە رۆژەی یەکەمی مانگی قوربانە کردەوەی باشیان تیا خۆشەویستو پەسەند بێ لەلای خودای گەورە. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! هەتا خەباتو تێکۆشانیش لە ریگەی خودادا هاوتای کردەوەی باشی ئەم رۆژانە ناکا؟ فەرمووی: بەڵی، هەتا خەباتو غەزاش لە رێگەی خودادا خێرو پاداشی وەك ئەوە گەورەنیە، مەگەر کەسێ کە بەسەرو ماڵەوە بڕوات بۆ غەزاو هیچیان نەهێنێتە دواوە! (ت/ب/د).

**١٤٣٦- وَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ أَوْ حَفْصَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا): كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُومُ تِسْعَ ذِي الْحِجَّةِ وَيَوْمَ عَاشُورَاءَ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي وأحمد[2].**

ئوممو سەلەمە (یا حەفصە (خودایان لێ رازی بێ)) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نۆی مانگی نۆمینەو رۆژی دەی موحەرەم بەرۆژوو دەبوو. (د/ن/ئەحمەد).

---

(١) مسلم. صوم: ٢٧٥٠. أبو داود صوم: ٢٤٣٣. ترمذى. صوم: ٧٥٩. (رياض: ١٢٥٤از: ٢٢٨).

(١) بخارى. عيدين: ٩٦٩.

(٢) سكت عند الشارح.

١٤٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ أَيَّامٍ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ أَنْ يُتَعَبَّدَ لَهُ فِيهَا مِنْ عَشْرِ ذِي الْحِجَّةِ يَعْدِلُ صِيَامُ كُلِّ يَوْمٍ مِنْهَا بِصِيَامِ سَنَةٍ وَقِيَامُ كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْهَا بِقِيَامِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ. رَوَاهُ الترمذي[٢].

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هیچ رۆژانێ نیە کە وەك ئەم دەرۆژەی یەکەمی مانگی قوربانە ئاوا بەندەیی و پەرستشی خودایان تیا پەسەندو خۆشەویست بێ لەلای خودا، پاداشی رۆژووی هەر رۆژێ لەم دە رۆژە، هاوتای پاداشی رۆژووی یەك ساڵ دەکا، وە شەو نوێژی هەر شەوێ لەم دە شەوە هاوتای پاداشی شەو نوێژی شەوی لەیلەتولقەدر دەکا (ت–بە سەنەدێکی بێ هێزە = سند ضعیف).**

## ٦٦) گرتنی رۆژووی رۆژی عارفە بۆ کەسێ خەریکی حەج نەبێ: صيام عرفة لغير الحاج

١٤٣٨- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[١].

**ئەبو قەتادە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئومێدم هەیە بە کەرەمی خودا کە رۆژووی رۆژی نۆی مانگی قوربان (کە لەو رۆژەدا حاجیان لە کێوی عەرەفەن) برێتی گوناهی ساڵی پێش خۆی و ساڵی پاش خۆی بکەوێ (م/د/ت/ن).**

---

[٢] بسند ضعيف.

[١] مسلم. صوم: ٢٧٣٩، ٢٧٣٨. أبو داود. صوم: ٢٤٢٥، ٢٤٢٦. ترمذی. صوم: ٧٤٩. نسائی. صوم: ٢٣٨٢ (ریاض: ١/١٢٥٠ز-٢٢٧).

١٤٣٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَفْطَرَ بِعَرَفَةَ وَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ أُمُّ الْفَضْلِ بِلَبَنٍ فَشَرِبَ. رَوَاهُ الأربعة[٢].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە حەجەکەیدا لە رۆژی عەرەفەدا لە کێوی عەرەفە بەرۆژوو نەبوو، وە ئوممو فەضل کە ئامۆژنی پێغەمبەر بوو جامێ شیری بۆ نارد تا بزانن کە بەرۆژووە یا نا، جا حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **شیرەکەی خواردەوە ئیتر زانیمان کە بەرۆژوو نیە (ش/د/ت).**

١٤٤٠- وَسُئِلَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ فَقَالَ: حَجَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ وَمَعَ عُمَرَ وَمَعَ عُثْمَانَ فَلَمْ يَصُمُوا يَوْمَ عَرَفَةَ وَأَنا لاَ أَصُومُهُ وَلاَ آمُرُ بِهِ وَلاَ أَنْهَى عَنْهُ. رَوَاهُ النسائی والترمذی بسند حسن[٣].

**بۆ گرتنی رۆژووی رۆژی نۆمینەی حاجیان لە ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **پرسیارکرا، گوتی: خۆم حەجم کردووە لەگەڵ پێغەمبەردا** (دروودی خودای لەسەربێ) **وە لەگەڵ ئەبو بەکردا، وە لەگەڵ عومەردا، وە لەگەڵ عوسماندا، ئەم زاتانە کەسیان لەکاتی حەجدا رۆژی عەرەفە واتە: رۆژی نۆمینەی حاجیان بەرۆژوو نەدەبوون، وە من بەش بە حاڵی خۆم بەرۆژوو نابم، وە بەکەسیش ناڵێم کە بیکرە یا مەیکرە! (د/ت-س/ح).**

## ٦٧) هەر کەسێ (لە هەموو مانگێ) سێ رۆژ بەرۆژووبێ، وەك ساڵ دوانزە مانگە سەرومڕ بەرۆژووبێ وایە: (صيام ثلاثة من كل شهر كصيام الدهر)

١٤٤١- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): صُمْ مِنَ الشَّهْرِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا وَذَلِكَ مِثْلُ صِيَامِ الدَّهْرِ. رَوَاهُ الثلاثة[١].

---

[٢] بخاري. حج: ١٦٥٨، ١٦٦١، ١٩٨٨، ٥٦٠٤، ٥٦١٨، ٥٦٣٦. مسلم. صيام ٢٦٢٧ – ٢٦٣١. أبو داود صوم: ٢٤٤١.

[٣] حديث حسن عنه الترمذی.

[١] مسلم. صوم: ٢٧٣٤، ٢٧٣٨. بخاري. صوم: ١٩٧٥، ١١٣١.

عەبدوڵڵای كوڕی عەمر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: لە هەموو مانگێ سێ رۆژ بەرۆژوو بە، ئەوە وەك ئەوە وایە كە بەدرێژایی ساڵ بەرۆژوو بیت، چونكە چاكەیەك بە دەیە (ش/د).

١٤٤٢- ولمسلم وأبي داود: صَوْمُ ثَلاَثَةٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ وَرَمَضَانَ إِلَى رَمَضَانَ صَوْمُ الدَّهْرِ[٢].

حەزرەت (صەلات و سەلام و دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر كەسێ رەمەزانەو رەمەزان بەرۆژووبێ و لە گشت مانگێكیش سێ رۆژ بەرۆژوو بێ ئەوە وەك بە درێژایی رۆژگار، ساڵ دوانزە مانگەی خودا بەرۆژووبێ وایە (م/د).

١٤٤٣- عَنْ أَبِي ذَرّ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ صَامَ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فَذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ . فَأَنْزَلَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ تَصْدِيقَ ذَلِكَ فِي كِتَابِهِ (مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا). الْيَوْمُ بِعَشْرَةِ أَيَّامٍ. رَوَاهُ الترمذى وصححه[٣].

ئەبو ذەڕ (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كەسێ لە هەموو مانگێ سێ رۆژ بەرۆژوو بێ، وەك ساڵ دوانزە مانگە بەرۆژوو بێ وایە جا خودای گەورەو سەروەر بۆ راست و دروستی ئەم فەرمایشتە، لە قورئانی پیرۆزدا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە:

{مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا}.

هەر كەسێ كردەوەیەكی باش بكا ئەوە دەقاتی كردەوەكەی پاداشی بۆ هەیە جا بەم پێیە رۆژووی رۆژێ برێتی رۆژووی دەرۆژ دەكەوێ (ت:ص).

١٤٤٤- وَقَالَتْ مُعَاذَةُ الْعَدَوِيَّةُ (رَضِي اللّهُ عَنْهَا) لِعَائِشَةَ: أَكَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُومُ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ قَالَتْ: نَعَمْ. فَقُلْتُ لَهَا: مِنْ أَيِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ كَانَ

---

[٢] مسلم. صوم: ٢٧٣٩، ٢٧٣٨. أبو داود صوم: ٢٤٢٥، ٢٤٢٦. ترمذی. صوم: ٧٤٩.

[٣] صحيح عند الترمذي.

يَصُومُ؟ قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ يُبَالِي مِنْ أَيِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ يَصُومُ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذي[٤].

موعـاذەی عەدەوییـە (خـودای لێ رازی بێ) بـە عائیـشەی گـوت: ئایـا کـوو پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) کردبـووی بـە یاسـا و دەستـوور کـە لـە هومـوو مانگێ سێ رۆژ بەرۆژووبێ؟ گوتی: ئا، گوتی: پێم گوت: لە کوێی مانگەوە بەرۆژوو دەبوو؟ گوتی: دەربەستی ئەوە نەبوو کە چ رۆژێ لە مانگ بەرۆژوو بێ (م/د/ت).

## ٦٨) رۆژووی ئەییامولبیض (واتە: رۆژە شەو سپییەکان): (صيام أيام البيض)

١٤٤٥- عَنِ مِلْحَانَ الْقَيْسِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْمُرُنَا أَنْ نَصُومَ الْبِيضَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ وَخَمْسَ عَشْرَةَ. قَالَ: وَقَالَ: هُنَّ كَهَيْئَةِ الدَّهْرِ. رَوَاهُ أصحاب السنن ولفظ الترمذي: إِذَا صُمْتَ مِنَ الشَّهْرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فَصُمْ ثَلَاثَ عَشْرَةَ وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ وَخَمْسَ عَشْرَةَ[١].

ملیحـانی قەیـسی (خـودای لێ رازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەربێ) کردبـووی بـە یاسـا فـەرمانی پـێ دەکـردین کـە ئـەو رۆژانـەی شـەوەکانیان تابەیانی مانگەشەون، بە رۆژووبین، کە بریێتین لە رۆژانی سیازدەو چاردەو پازدە. گوتی: دەیفەرموو (درودی خودای لەسەربێ): گرتنی ئەم سێ رۆژە، وەك ئەوە وایـە کـە کەسـێ بـە درێـژایی سـاڵ بـەرۆژوو بـێ (د/ت/ن-س/ح) گفتـەی (ت): ئەگـەر لـە مـانگ سـێ رۆژ بـەرۆژوو بـووی، ئـەوا سـیازدەو چـواردەو پـازدە بەرۆژوو بە.

---

[٤] مسلم. صوم: ٢٧٣٦. أبو داود صوم: ٢٤٣٥. ترمذی. صوم: ٧٦٣ (رياض ١٢٤١/٤. ز: ٢٣٠ + ١٢٦٢/٥ ز: ٢٣٠. ترمذی: ٧٦١).

[١] بسند حسن (رياض: ١٢٦٢/٥ ز: ٢٣٠. ترمذی: ٧٦١).

**٦٩) گرتنی رۆژووی دووشەمەو پێنج شەمە سوننەتە: (صوم الإثنين والخميس)**

**١٤٤٦ – عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ صَـوْمَ يَوْمِ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمِ الْخَمِيسِ قَالَ: فِيهِ وُلِـدْتُ وَفِيـهِ أُنْـزِلَ عَلَـيَّ الْقُـرْآنُ. رَوَاهُ أبـو داود ومسلم[١].**

**ئـەبو قـەتادە (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: بـۆ گرتنـی رۆژووی دوو شـەممەو پێنج شممە پرسـیار کـرا لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: مـن لـە رۆژی دووشممەدا لـەدایك بووم‌و هـەر لـەم رۆژەیشا قورئانم بۆ هات، کەواتـە ئەم رۆژە رۆژێکی موبارەکەو شایانی ئەوەیە کە مرۆڤ تیا بە رۆژوو بێ (د/م).**

**١٤٤٧ – وَانْطَلَقَ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنـهُ) إِلَى وَادِي الْقُرَى فِي طَلَبِ مَالٍ لَـهُ فَكَانَ يَصُومُ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ فَقَالَ لَهُ مَـوْلاَهُ: لِـمَ تَـصُومُ يَـوْمَ الاِثْنَـيْنِ وَيَـوْمَ الْخَمِيسِ وَأَنْتَ شَيْخٌ كَبِيرٌ؟ فَقَالَ: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) كَانَ يَصُومُ يَوْمَ الاِثْنَـيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ وَسُئِلَ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: إِنَّ أَعْمَالَ الْعِبَادِ تُعْرَضُ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٢].**

**ئوسامەی کوڕی زەید (خودای لێ رازی بێ) هەندێ ماڵی لەوادیلقورا بوو چوو بە دوایا، یاسای ئوسامە وابوو، رۆژی دوو شەموان‌و پێنج شەموان بە رۆژوو دەبـوو، نۆکەرەکـەی پێـی گـوت: تـۆ پیرەمێردێکـی ئیختیـاری، رۆژی دوو شـەمان‌و پێنج شـەمان بـۆ بـەرۆژوو دەبـی؟ گوتی: چونکە پێغەمبـەری خـودا (دروودی خودای لەسەربێ) لـەم دوو رۆژەدا بـەرۆژوو دەبـوو، جـا کـە بـۆ ئەمـە لێیـان پرسـی فـەرمووی: کردەوەکـانی هـەموو بەنـدەیێ لـە رۆژی دووشـەممەو پێنج شـەمەدا لـە حـوزووری خودادا راەنوێنرێن، جـا لـەبـەر ئـەوە حـەز دەکـەم لـەو رۆژەدا کـە کـردەوەم را ەنـوێنرێ بـە رۆژوو بم (د/ت/ن–س/ح. رەمزای خودایـان لەسەربێ).**

---

[١] مسلم. صوم: ٢٧٤٢ (رياض: ١٢٥٥/١ ز:٢٢٩).

[٢] بسند حسن (شرحه) (رياض: ١٢٥٥/١ ز: ٢٢٩).

١٤٤٨- وَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُا) كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْمُرُنِي أَنْ أَصُومَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ أَوَّلُهَا الاِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[٣].

ئوممو سەلەمە (خودای گەورەی لێ خۆش نوودبێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لێبێ) پێی دەگوتم: كە لە هەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بم، وە بەڕۆژی دووشەممە یا بەڕۆژی پێنج شەممە دەستیان پێ بكەم (د/ن).

١٤٤٩- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُا) كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُومُ مِنَ الشَّهْرِ السَّبْتَ وَالأَحَدَ وَالاِثْنَيْنِ وَمِنَ الشَّهْرِ الآخَرِ الثُّلاَثَاءَ وَالأَرْبِعَاءَ وَالْخَمِيسَ. رَوَاهُ الترمذي وحسنه[٤].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕۆژێ شەممەو یەك شەممەو دووشەممە لە مانگێ بەڕۆژوو دەبوو، لە مانگێكی تریش ڕۆژی سێ شەممەو چوارشەممەو پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبوو (ت:ح. واتە: تیرمیذی ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوەو لە هەمان كاتدا بەفەرموودەیەكی جوانی داناوە).

## ٧٠) ڕۆژووی ڕۆژ نا ڕۆژێ: (صوم يوم وفطر يوم)

١٤٥٠- تقدم برقم: ٩٨١/٩[١].

١٤٥١- يأتي في رقم: ١٤٥٨/١[٢].

## ٧١) ڕۆژووی ساڵ دوانزە مانگە: (صوم الدهر)

١٤٥٢- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: أُخْبِرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِإِنِي أَقُولُ: وَلأَقُومَنَّ اللَّيْلَ وَلأَصُومَنَّ النَّهَارَ مَا عِشْتُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

---

[٣] سكت عنه الشارح.

[٤] حسن عند الترمذي.

[١] راجع رقم: ٩٨١/٩ فی المجلد الأول تسلسل: ١٨١.

[٢] يأتی مباشرة في رقم: ١٤٥٨/١.

وَسَلَّمَ): آنْتَ الَّذِي تَقُولُ ذَلِكَ. فَقُلْتُ: لَهُ قَدْ قُلْتُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِنَّكَ لاَ تَسْتَطِيعُ ذَلِكَ فَصُمْ وَأَفْطِرْ وَنَمْ وَقُمْ وَصُمْ مِنَ الشَّهْرِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فَإِنَّ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا وَذَلِكَ مِثْلُ صِيَامِ الدَّهْرِ. قَالَ قُلْتُ: فَإِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ. قَالَ: صُمْ يَوْمًا وَأَفْطِرْ يَوْمَيْنِ. قَالَ قُلْتُ: فَإِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: صُمْ يَوْمًا وَأَفْطِرْ يَوْمًا وَذَلِكَ صِيَامُ دَاوُدَ - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - وَهُوَ أَعْدَلُ الصِّيَامِ. قَالَ: قُلْتُ فَإِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ. قَالَ: لاَ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لأَنْ أَكُونَ قَبِلْتُ الثَّلاَثَةَ الأَيَّامَ الَّتِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَهْلِي وَمَالِي. وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَ لَهُ: فَلاَ تَفْعَلْ، صُمْ وَأَفْطِرْ، وَقُمْ وَنَمْ، فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِعَيْنِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْرِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ بِحَسْبِكَ أَنْ تَصُومَ كُلَّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ. وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَ: لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّكَ لَتَصُومُ الدَّهْرَ، وَتَقُومُ اللَّيْلَ؟ فَقُلْتُ نَعَمْ. قَالَ: إِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ هَجَمَتْ لَهُ الْعَيْنُ وَنَفِهَتْ لَهُ النَّفْسُ، لاَ صَامَ مَنْ صَامَ الدَّهْرَ، صَوْمُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ صَوْمُ الدَّهْرِ كُلِّهِ. رَوَاهُ الثلاثة والنسائي[1].

عەبدوڵڵای كوڕی عەمر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: عەرزی پێغەمبەریان كردبوو (درودی خودای لەسەربێ) كە من دەڵێم: هەتا ماوم بەشەو هەرشەو نوێژ دەكەمو بە ڕۆژ هەر بەڕۆژوو دەبم. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئایا تۆ وات گوتووە؟ گوتم: گوتوومە، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ناتوانی ئەمە بكەی، بەڵام ناو بەناو بەڕۆژوو بەو ناو بەناویش بەڕۆژوو مەبە، وە تاوێ شەونوێژ بكەو تاوێكیش بخەوە، وە لە هەموو مانگێ سێ ڕۆژ بە ڕۆژووبە بەسە، ئیتر ئەوە وەك ئەوە وایە كەساڵ دوازدە مانگەی خودا بەڕۆژوو بی، چونكە چاكەیەك بە دەیە گوتم: قوربان! توانای زیاترم هەیە. فەرمووی: دە یەك ڕۆژ پێبەو دوو ڕۆژ پێمەبە گوتم: قوربان! توانای پترم هەیە. فەرمووی: دە ڕۆژ نا ڕۆژێ بەڕۆژوو بە، كە ئەوەیش دەستووری

---

[1] بخاري. صوم: ١١٣١، ١١٥٢، ١١٥٣، ١٩٧٤، ١٩٧٥، ١٩٧٦، ١٩٧٧، ١٩٧٨، ١٩٧٩، ١٩٨٠، ٣٤١٨، ١٤١٩، ٣٤٢٠، ٥٠٥٢، ٥٠٥٣، ٥٠٥٤، ٥١٩٩، ٦١٣٤، ٦٢٧٧. مسلم. صوم: ٢٧٢٦. ترمذی. صوم: ٧٦٨. نسائی. صوم: ٢٣٩٦ (ریاض: ١٤٣/٢ ز: ١٤).

بـــەرۆژووبوونی داوود پێغەمبـــەر بـــووە، (دروودی خـــودای لەســـەربێ) وە ئـــەم دەستوورەیش رەواترین دەستوورو یاسایە بۆ رۆژوو گرتن! گوتمەوە: قوربان من لەمەیش باشتر دەتوانم. فەرمووی: لەمە باشتر نیە. عەبدوڵلا (رەزای خودای گەورەی لێبێ) لە دوایی تەمەنیا دەیگوت: بریا ئەو سێ رۆژەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە هەموو مانگێ سێ رۆژ بەرۆژوو بە، بریا ئەو سێ رۆژەم قەبووڵ بکردایە، قەبووڵکردنی ئەم سێ رۆژەم لەلا خۆشترە هەتا ماڵو منالم، لە گێڕانەوەیەکا: فەرمووی: وا مەکە ناو بەناو بەرۆژوو بەو ناو بەناویش بەرۆژوو مەبە، وە تاوێ شەو نوێژ بکەو تاوێکیش بخەوە، چونکە لە راستیدا لەشو جەستەت مافی هەیە لە سەرتۆ کە زۆر نەیرەنجێنیو تا رادەی پرووکان نەیرەتێنی، وە هەروەها چاوەکانت مافیان هەیە لەسەرتۆ، وە ژنەکەت مافی هەیە لەسەر تۆ، وە میوانەکەت مافی هەیە لەسەر تۆ، جا دەبێ موراعاتی حاڵی ئەمانە بکەی، هەر کەسەی بەپێی خۆی وە لەگشت مانگێ تەنیا سێ رۆژ بەرۆژوو بە بەستە! لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێم: ئایا راستە کە تۆ بەدرێژایی ساڵ هەمیشە بەرۆژوو دەبیتو بەشەویش هەر شەونوێژ دەکەیت؟ گوتم: بەڵێ راستە. فەرمووی: ئاخر ئەگەر وابکەی چاوت پێی کز دەبێ، وە دڵت پێی دەگیرێو تاقەتی نامێنێ، رۆژووی ئەو کەسە گیرانەبێ کە ساڵ دوانزە مانگە بەرۆژوو دەبێ! رۆژووی سێ رۆژ لە مانگ خێرو پاداشی رۆژووی ساڵ دوانزە مانگەی هەیە (ش/د/ن = بوخاری، موسلیم، ئەبو داوود، نەسائی. خودایان لێ رازی بێ).

١٤٥٣- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ أَنَّ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَـا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ الدَّهْرَ كُلَّهُ؟ قَالَ: لاَ صَامَ وَلاَ أَفْطَرَ أَوْ قَالَ: لَمْ يَصُمْ وَلَمْ يُفْطِرْ. قَالَ: كَيْفَ مَنْ يَصُومُ يَوْمَيْنِ وَيُفْطِرُ يَوْمًا قَالَ: وَيُطِيقُ ذَلِكَ أَحَدٌ؟ قَالَ: كَيْفَ مَنْ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا؟ قَالَ: ذَاكَ صَوْمُ دَاوُدَ (عَلَيْهِ السَّلاَمُ). رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[٢].

---

[٢] مسلم. صوم: ٢٧٣٨ – ٢٧٤٢. أبو داود. صوم: ٢٤٢٥، ٢٤٢٦. ترمذي. صوم: ٧٤٩. نسائي. صوم: ٢٣٨٢.

ئەبو قەتادە گوتی: عومەر (خودای لێ رازی بێ) پرسیاری لە پێغەمبەر کرد (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کەسێ بە درێژایی ساڵ هەمیشە بەرۆژوو بێ چۆنە؟ فەرمووی: ئەوە نەپێی دەڵێن بەرۆژوو بووە، وە نەپێشی دەڵێن بەرۆژوو نەبووە! یا فەرمووی: ئەوە نەرۆژووەکەی رۆژووەو نە پێ نەبوونەکەشی پێ نەبوونە! گوتی: ئەی کەسێ دوو رۆژ بگرێو رۆژێ نەگرێ چۆنە؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): جا کەس ئەمە دەتوانێ؟ گوتی: ئەی کەسێ رۆژ نا رۆژێ بە رۆژووبێ چۆنە؟ فەرمووی: ئەوە زۆر باشە، چونکە ئەمە رۆژووی داوود بووە. (درودی خودای لەسەربێ) (م/د/ت/ن).

١٤٥٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَ إِلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُون فَجَاءَهُ فَقَالَ: يَا عُثْمَانُ أَرَغِبْتَ عَنْ سُنَّتِي؟ قَالَ: لاَ وَاللّهِ يَا رَسُولَ اللّهِ وَلَكِنْ سُنَّتَكَ أَطْلُبُ. قَالَ: فَإِنِّي أَنَامُ وَأُصَلِّي وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأَنْكِحُ النِّسَاءَ فَاتَّقِ اللّهَ يَا عُثْمَانُ فَإِنَّ لأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا وَإِنَّ لِضَيْفِكَ عَلَيْكَ حَقًّا وَإِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا فَصُمْ وَأَفْطِرْ وَصَلِّ وَنَمْ. رَوَاهُ أبو داود[٣].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ناردی بە شوێن عوسمانی کوڕی موظعووندا، کە هاتە خزمەتی فەرمووی: ئەی عوسمان! ئەوە لە سوننەتو یاسای من لا دەدەیت؟ گوتی: نە بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! بەڵکوو من پەروانەی چرای سوننەتی تۆم! فەرمووی: دەسا بزانە کە یاساو سوننەتی من بەم شێوەیە، وە ئەوەی لێی لادا دیارە پێی رازی نیەو لێی لووتەلایە: دەسا من هەم بەشی خۆم دەخەومو هەم شەونوێژیش دەکەم، هەم ناو بەناو بەرۆژوو دەبمو هەم ناو بەناو بەرۆژووش نابم، وەژنیش دەهێنم، ئەی عوسمان! لەخودا بترسە شتەکە بەهەڵە تێ مەگە، ئیسرافو زیادەرەوی زۆرو رەبەندیو رەهبانییەت بەناوی تەرکی دنیاوە، لە رەفتاری موسوڵمانەوە دوورن، چونکە لە راستیدا خێزانەکەت هەقی هەیە

---

[٣] سكت عنه الشارح.

لەسەر تۆ، وە میوانەکەت هەقی هەیە لەسەر تۆ" وە خۆت ماف و هەقت هەیە لەسەر خۆت، کەوابوو تۆش چاو لەمن بکە ناو بەناو بەرۆژووبەو ناو بەناو بەرۆژوو مەبە، وە بەشی خۆت هەم شەو نوێژ بکەو هەم بخەوە (د).

## ٧٢) ئەوەی رۆژووی سوننەت دەگرێ خۆی ئاغای خۆیەتی
## الصائم المتطوع أمير نفسه

١٤٥٥- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ الْفَتْحِ فَتْحِ مَكَّةَ جَاءَتْ فَاطِمَةُ فَجَلَسَتْ عَنْ يَسَارِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأُمُّ هَانِئٍ عَنْ يَمِينِهِ قَالَ: تْ فَجَاءَتِ الْوَلِيدَةُ بِإِنَاءٍ فِيهِ شَرَابٌ فَنَاوَلَتْهُ فَشَرِبَ مِنْهُ ثُمَّ نَاوَلَهُ أُمَّ هَانِئٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقَدْ أَفْطَرْتُ وَكُنْتُ صَائِمَةً. فَقَالَ لَهَا: أَكُنْتِ تَقْضِينَ شَيْئًا؟ قَالَتْ: لاَ. قَالَ: فَلاَ يَضُرُّكِ إِنْ كَانَ تَطَوُّعًا. وَفِي رِوَايَةٍ: الصَّائِمُ الْمُتَطَوِّعُ أَمِينُ - أَوْ أَمِيرُ - نَفْسِهِ إِنْ شَاءَ صَامَ وَإِنْ شَاءَ أَفْطَرَ. رَوَاهُ أصحاب السنن والإمام أحمد[1].

ئوممو هانی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژی فەتحی مەککە فاطیمەی کچی پێغەمبەر هات لەلای چەپی باوکییەوە دانیشت، منیش لەلای راستیەوە دانیشتم، کەنیزەکەکەیش جامێ خواردنەوەی هێنا، وە دای بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خۆی لێی خواردەوەو لەپاشا دای بەمن، منیش لێم خواردەوەو گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ من بەرۆژووش بووم، رۆژووەکەم شکاند؟ فەرمووی: ئایا رۆژووت لەسەر بوو تا بیگێڕیتەوە؟ گوتم: نەخێر فەرمووی: ئەگەر رۆژووی سوننەت بێ قەی ناکا، لە گێڕانەوەیەکا: فەرمووی: کەسێ رۆژووی سوننەت بگرێ لەکاتی بەرۆژوو بوونەکەیا، خۆی ئەمیندار یا فەرمووی: خۆی ئاغای خۆیەتی: ئەگەر حەزکا تا ئێوارێ بەرۆژوو دەبێ، وە ئەگەر حەزکا لەناوەندی رۆژدا دەیشکێنێ (د/سند صالح/ص/ت/ئەحمەد).

---

[1] بسند صالح (شرحه).

١٤٥٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهَا) قَالَتْ: أُهْدِيَ لِي وَلِحَفْصَةَ طَعَامٌ وَكُنَّا صَائِمَتَيْنِ فَأَفْطَرْنَا ثُمَّ دَخَلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْنَا لَهُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّا أُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ فَاشْتَهَيْنَاهَا فَأَفْطَرْنَا فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لاَ عَلَيْكُمَا صُومَا مَكَانَهُ يَوْمًا آخَرَ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٢].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: خواردەمەنییەكیان هێنا بەدیاریی بۆ منو حەفصە، ئێمەیش بەرۆژوو بووین، بەڵام رۆژووەكەمان شكانو دەستمان كرد بە خواردنی، جا كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ لامان، عەرزمان كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دیاریمان بۆ هاتبوو، حەزمان لێی بوو، رۆژووە سوننەتەكەمان بۆ شكاند؟ فەرمووی: قەیناكا لە جیاتی ئەوە رۆژێكی تر بەرۆژوو بنەوە! (د-سند صالح-ن/ص).

١٤٥٧- تقدم برقم: ١٣٢٣/٢[٣].

## ٧٣) رۆژووەوان قەبووڵی دەعوەت دەكا: (يجيب الصائم الدعوة)

١٤٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ وَهُوَ صَائِمٌ فَلْيَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ. وَفِي رِوَايَةٍ: إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيُجِبْ فَإِنْ كَانَ مُفْطِرًا فَلْيَطْعَمْ وَإِنْ كَانَ صَائِمًا فَلْيُصَلِّ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاری[١].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر یەكێكتان خوڵك كران بۆ نانخواردنو لەو كاتەدا بەرۆژوو بوون بڵێن: من بەرۆژووم لە گێڕانەوەیەكا: ئەگەر یەكێ لە ئێوە بانگ كرا بۆ نانخواردن با بچێ، جا لەوێ ئەگەر بەرۆژوو نەبوو ئەوا با نانی خۆی بخوا، ئەگینا ئەگر بەرۆژوو بوو ئەوا با نزای باشیان بۆ بكا (م/د/ت/ن).

---

[٢] سند النسائی صحيح (شرحه).

[٣] راجع رقم: ١٣٢٣/٢١ ز: ٣٢.

[١] مسلم. صوم: ٢٦٩٦. أبو داود. صوم: ٢٤٦١. ترمذی. صوم: ٧٨١ (رياض/ ٧٣٨/١ ز: ١٠٢).

## ٧٤) پاشەكی: باسی خەڵوەكێشان (ئیعتیكاف)

## الخاتمة: في الاعتكاف

قَالَ اللهُ تَعَالَى: { - وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ}.

خودای گەورە دەفەرموێ: گوتمان بە ئیبراهیم: ماڵی منو خانەی من كە كەعبەیە پاك بكەرەوە لە هەموو پیسییەكی ماددیو ناپاكییەكی مەعنەوی، وە بەگشت جۆرێ پاكو خاوێنی رابگرە بۆ ئەوانە كە تەوافی دەكەن (واتە: بەشێوەی ئایین بە دەوریا ئەسووڕێنەوە) وە بۆ ئەو كەسانە كە نوێژ دەكەنو روكووعو كوڕنووشی تیا دەبەن بۆ من.

قَالَ اللهُ تَعَالَى: { - وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ}.

خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانان! لە كاتێكا كە ئێوە خەڵوە دەكێشن لەناو مزگەوتا لەگەڵ ژنی خۆتانا دروست مەبن.

**١٤٥٩** - عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنهَا) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ. رَوَاهُ الخمسة[1].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یاسای وابوو لە دەی دوایی رەمەزانا لە مزگەوتا خەڵوەی دەكێشا، هەتا ئەوكاتەی خودا بردیەوە بۆ لای خۆی ئەمەی تەرك نەكرد، بۆیە لەپاش خۆی ژنەكانیشی لە مزگەوتا خەڵوە دەكێشن (ش/د/ت/ن).

[1] بخاري. اعتكاف: ٢٠٢٦(٢٠٢٥). مسلم. إعتكاف: ٢٧٧٣ - ٢٧٧٦. أبو داود. صوم: ٢٤٦٢. (رياض: ١٢٦٩/٢ ز:٢٣٢).

١٤٦٠– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعْتَكِفُ فِي كُلِّ رَمَضَانَ عَشْرَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ يَوْمًا. رَوَاهُ البخاري وأبو داود[٢].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وابوو لە هەموو رەمەزانێکدا دە رۆژ لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا، بەڵام لەو ساڵەدا کە تیا وەفاتی کرد بیست رۆژ خەڵوەی کێشا (ب/د).

١٤٦١– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الْفَجْرَ ثُمَّ دَخَلَ مُعْتَكَفَهُ وَإِنَّهُ أَمَرَ بِخِبَائِهِ فَضُرِبَ أَرَادَ الاِعْتِكَافَ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ فَأَمَرَتْ زَيْنَبُ بِخِبَائِهَا فَضُرِبَ وَأَمَرَ غَيْرُهَا مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِخِبَائِهِ فَضُرِبَ فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْفَجْرَ نَظَرَ فَإِذَا الأَخْبِيَةُ فَقَالَ: آلْبِرَّ تُرِدْنَ. فَأَمَرَ بِخِبَائِهِ فَقُوِّضَ وَتَرَكَ الاِعْتِكَافَ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ حَتَّى اعْتَكَفَ فِي الْعَشْرِ الأَوَّلِ مِنْ شَوَّالٍ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٣].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری وابوو کە دەیویست خەڵوەبکێشێ لە مزگەوتا، نوێژی بەیانی دەکردو دەچووە ناو خەڵوەخانەکەیەوە، جارێکیان لە دەی دوایی رەمەزاندا ویستی خەڵوە بکێشێ، جا فەرمانی کرد چاتۆڵەکەیان لەناو مزگەوتا بۆ هەڵدا، زەینەبیش گاڵی دا چاتۆڵەکەی خۆیان بۆ هەڵ دا، ژنەکانی تریشی هەروا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە نوێژی بەیانی کرد چاتۆڵەکانی دی ناو مزگەوتەکەیان داگیر کردبوو جا فەرمووی: ئایا مەبەستتان کردنی کردەوەی چاکەیە یا بۆ چاو لێکەرییەو هیچی تر؟ ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)

---

[٢] بخاری. اعتکاف: ٢٠٤٤، ٤٩٩٨.

[٣] بخاری، اعتکاف: ٢٠٣٣، ٢٠٣٤، ٢٠٤١، ٢٠٤٥. مسلم. اعتکاف: ٢٧٧٧. أبو داود. صوم: ٢٤٦٤. ترمذی. صوم: ٧٩١. نسائی. مساجد: ٧٠٨.

فەرمانی کرد چاتۆڵەکەی ئەویان خستو لایان برد، وە لەو رەمەزانەدا خەڵوەی نەکێشا، وە لە دەی یەکەمی شەشەڵانا خەڵوەکەی کێشا (ش/د/ن).

١٤٦٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اعْتَكَفَ طُرِحَ لَهُ فِرَاشٌ أَوْ يُوضَعُ لَهُ سَرِيرٌ وَرَاءَ أُصْطُوَانَةِ التَّوْبَةِ. رَوَاهُ ابن ماجه بسند موثق[٤].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە خەڵوەی دەکێشا، لەپشت ئەستوونی تەوبەوە رایەخێکیان بۆ رادەخست یا چارپایەکیان بۆ دادەنا (ئیبنو ماجە – سند مووەثثەق).

## ٧٥) خەڵوەکێش بۆ پێویستی خۆی لە مزگەوت دەردەچێ
## يخرج المعتكف من المسجد للحاجة

١٤٦٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهَا) كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اعْتَكَفَ يُدْنِي إِلَيَّ رَأْسَهُ فَأُرَجِّلُهُ وَكَانَ لاَ يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلاَّ لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ. رَوَاهُ الخمسة[١].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا لە دەرگای هۆدەکەی خۆمەوە کە لەسەرماڵی مزگەوت بوو سەری دەردەهێنا، سەریم شانە دەکرد، وە بۆ سەراویش نەبوایە نەدەهاتە ماڵەوە (ش/د/ت/ن. رەزای خودایان لێبێ).

١٤٦٤- وَقَالَتْ صَفِيَّةَ (رَضِي اللّهُ عَنهَا) كَانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُعْتَكِفًا فَأَتَيْتُهُ أَزُورُهُ لَيْلاً فَحَدَّثْتُهُ ثُمَّ قُمْتُ إِلَى بَيْتِي فَقَامَ مَعِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِيَقْلِبَنِي.

---

[٤] سند موثق.

[١] بخاري. اعتكاف: ٢٠٢٩، ٢٠٣٣، ٢٠٣٤، ٢٠٤١، ٢٠٤٥. مسلم. حيض. ٦٨٢ – ٦٨٦. أبو داود صوم: ٢٤٦٧، ٢٤٦٨. ترمذى. صوم: ٨٠٤.

وَكَانَ مَسْكَنُهَا فِي دَارِ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ فَمَرَّ رَجُلاَنِ مِنَ الأَنْصَارِ فَلَمَّا رَأَيَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَسْرَعَا فَقَالَ: (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ): عَلَى رِسْلِكُمَا إِنَّهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ. قَالاَ سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ الإِنْسَانِ مَجْرَى الدَّمِ فَخَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَيْئًاأَوْ قَالَ: شَرًّا. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٢].

**صەفيە** (خودای لیٚ رازی بیٚ) **گوتی: جاریٚ پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربیٚ) **خەڵوەی دەكیٚشا شەویٚ چووم بۆ دیدەنی، تاویٚ قسەو گفتوگۆم لەگەڵ كردو هەڵسام بچمەوە بۆ ماڵەوەم، پیٚغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەربیٚ) **لەگەڵما هات، تا رەوانەم بكاتەوە، وە ماڵی صەفییە لە خانووەكەی ئوسامەی كوڕی زەیددا بوو، جا لەو كاتەدا دوو پیاو (لە یاریدەدەران - ئەنصار -) لەویوە رەت بوون، كاتیٚ كە پیٚغەمبەریان دی لەگەڵ مندا پیٚیان هەڵگرت، ئەویش فەرمووی: پەلە مەكەن‌و مەپەشۆكیٚن ئەمە صەفییە كچی حویەییە كە ژنی خۆمە. ئەوانیش گوتیان: سوبحانەڵڵا! ئەی پیٚغەمبەری خودا! ئیٚمە چۆن دڵ لەتۆ پیس دەكەین! فەرمووی: ئاخر شەیتان لەناو جەستەی ئادەمیزاددا وەكوو خویٚن هاتوچۆ دەكات، لەبەر ئەوە ترسام كە شەیتان شتیٚ (یا گومانیٚكی بەد) بخاتە ناو دڵتانەوەو دڵتان لەمن كرمیٚ ببیٚ‌و ئەوە ببیٚ بەهۆی فەوتانتان (ش/د/ن).**

## ٧٦) ئایا رۆژوو مەرجە بۆ خەڵوەكیٚشان؟ : (هل يشترط الصوم الاعتكاف؟)

١٤٦٥- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَوْفِ بِنَذْرِكَ فَاعْتَكِفْ لَيْلَةً. رَوَاهُ الخمسة[١].

---

[٢] بخاري. اعتكاف: ٢٠٣٥، ٢٠٣٨، ٢٠٣٩، ٣١٠١، ٣٢٨١، ٦٢١٩، ٧١٧١. مسم. ٥٦٦٣. أبو داود. صوم: ٢٤٧٠، ٢٤٧١، ٤٩٩٤.

[١] بخاري. اعتكاف: ٢٠٣٢، ٢٠٤٣، ٣١٤٤، ٤٣٢٠، ٦٦٧٩. مسلم. أيمان ونذور: ٤٢٦٨، ٤٢٦٩. أبو داود. أيمان ونذرور: ٣٣٢٥. ترمذي. نذور: ١٥٣٩. نسائي. نذور: ٣٨٢٩.

عومەری کوڕی خەتاب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لە سەردەمی نەزانیدا فووتوو (نەذر)م کردووە کە شەوێ لەناو مەسجیدولحەرامدا خەڵوەبکێشم جا دەفەرمووێ: چی؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: فووتوو (نەذر)ەکەت بەجێ بێنەو ئەهدەکەت ببەرە سەر، ئەویش شەوێ خەڵوەی کێشا (ش/د/ت/ن).

١٤٦٦– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهَا) قَالَتِ: السُّنَّةُ عَلَى الْمُعْتَكِفِ أَنْ لاَ يَعُودَ مَرِيضًا وَلاَ يَشْهَدَ جَنَازَةً وَلاَ يَمَسَّ امْرَأَةً وَلاَ يُبَاشِرَهَا وَلاَ يَخْرُجَ لِحَاجَةٍ إِلاَّ لِمَا لاَ بُدَّ مِنْهُ وَلاَ اعْتِكَافَ إِلاَّ بِصَوْمٍ وَلاَ اعْتِكَافَ إِلاَّ فِي مَسْجِدٍ جَامِعٍ. رَوَاهُ أبو داود والنسائى[٢].

عائیشە (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: یاساو دەستووری خەڵوەکێش بەم شێوەیە: کە نەبچێ بۆ دیدەنی نەخۆش‌و نەبچێ بۆ دیار تەرم‌و نە دەست بەرێ بۆ ژن‌و نە لەگەڵیا دروست بێ، وە بۆ پێویستییەکی ناچاری خۆشی نەبێ نابێ لە مزگەوت دەربچێ، وە خەڵوەکێشانیش بەبێ ڕۆژوو نابێ، وە دەشێ لە مزگەوتێکا بێ کە نوێژی جومعەی تیا بکرێ (د/ن).

## ٧٧) خێرو گەورەیی خەڵوەکێشان: (فضل الإعتكاف)

١٤٦٧– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِي الْمُعْتَكِفِ هُوَ يَعْكِفُ الذُّنُوبَ وَيُجْرَى لَهُ مِنَ الْحَسَنَاتِ كَعَامِلِ الْحَسَنَاتِ كُلِّهَا. رَوَاهُ ابن ماجه[١].

ئیبنو عەبباس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەشان‌و شکۆی خەڵوەکێشا فەرمووی: خەڵوەکێشان گوناهو تاوان بەربەست دەکا، وە بەقەی ئەو کەسەشی کە هەرچی چاکە هەیە بیکا خێرو چاکەی دەست دەخات! (ئیبنو ماجە – سند ضعيف).

---

[٢] كال ما فى المجتبى للنسائى. صحيح (المقدمة).

[١] بسند ضعيف (شرحه).

١٤٦٨- وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ صَاحِبَ هَذَا الْقَبْرِ يَقُولُ: مَنْ مَشَى فِي حَاجَةِ أَخِيهِ وَبَلَغَ فِيهَا كَانَ خَيْراً لَهُ مِنَ اعْتِكَافِ عَشْرِ سِنِينَ، وَمَنْ اعْتَكَفَ يَوْماً ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللهِ تَعَالَى جَعَلَ اللهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ ثَلَاثَ خَنَادِقَ أَبْعَدَ مِمَّا بَيْنَ الْخَافِقَيْنِ. رَوَاهُ الطبراني والبيهقي والحاكم وصححه[٢].

**دیسان گوتی: لە خاوەنی ئەم گۆڕە پیرۆزەم بیست (درودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەر کەسێ تێکوشێ بۆ ئیش و کاری برادەرێکی هەتا جێبەجێی دەکا، لە خەڵوەکێشانی دە ساڵ زیاتر خێری دەگا! هەر کەسێکیس (لەبەر رەزای خواوەندی گەورە) تاقە یەك رۆژ خەڵوە بکێشێ، خودا لە ئاگری دۆزەخ دووری دەخاتەوە پتر لە دووری رۆژ هەڵات لە رۆژ ئاواوە (تەبەرانی/بەیهەقی/ حاکم: حاکم بە صەحیحی داناوە).**

١٤٦٩- عَنِ الْحُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنِ اعْتَكَفَ عَشْراً فِي رَمَضَانَ، كَانَ كَحَجَّتَيْنِ وَعُمْرَتَيْنِ. رَوَاهُ البيهقي. والله أعلم[٣].

**حوسەینی کوڕی عەلی (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ لە رەمەزانا دەرۆژ خەڵوەبکێشێ وەك دوو حەج و دوو عەمرە بکا وایە (بەیهەقی). خودا خۆی باشتری لێ دەزانێ.**

---

[٢] صحيح عند الحاكم.

[٣] سكت عنه الشارح.

# نامەی حەج‌و عەمرە

(حەوت باس‌و دوا وتارێکە)

## ٧٨) باسی یەکەم: باسی گەورەیی حەج

## كتاب الحج والعمرة (وفيه سبعة أبواب وخاتمة)

## الباب الأول: في فضائل الحج

**١٤٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ حَجَّ لِلّٰهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ[1].**

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ بۆ خودا حەجێ بکاو لەکاتی کردنی حەجەکەدا پارێز لە کەیف کردن لەگەڵ ژندا بکاو گورێز لە هەرزەگویی‌و قسەی پڕو پووچ بکاو گوناه نەکا، ئەوە وەك ئەو رۆژە کە لەدایك دەبێ ئاوا لە گوناه پاك دەبێتەوە! (ش/ن/ت).**

**١٤٧١- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلاَّ الْجَنَّةُ. رَوَاهُمَا الخمسة إلا ابا داود[2].**

**دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەم عەمرە هەتا ئەو عەمرە برێتیی گوناهی نێوانی هەردوکیان دەکەوێ حەجی دروستیش هەر بەهەشتە پاداشی (ش/ت/ن).**

**١٤٧٢- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا): يَا رَسُولَ اللّٰهِ، نَرَى الْجِهَادَ أَفْضَلَ الْعَمَلِ، أَفَلاَ نُجَاهِدُ قَالَ: لاَ، لَكِنَّ أَفْضَلَ الْجِهَادِ حَجٌّ مَبْرُورٌ. رَوَاهُ البخاري والنسائي ولفظه: وَلَكُنَّ أَحْسَنُ الْجِهَادِ وَأَجْمَلُهُ حَجُّ الْبَيْتِ[3].**

---

[1] بخاري. حج: ١٥٢١، ١٨١٩، ١٨٢٠. مسلم. حج: ٣٢٧٨ — ٣٢٨٠. ترمذی. حج: ٨١١. نسائی. مناسك الحج: ٢٦٢٦. أبو داود. المناسك: ٢٩١٠ (رياض: ١٢٧٤/٤ ز: ٢٣٢).

[2] بخاری. عُمرَة: ١٧٧٣. مسلم. حج: ٣٢٧٦. نسائی. (رياض: ١٢٧٥/٥ ز-٢٣٣).

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە خەبات‌و غەزاکردن بە باشترین کردەوە دەزانین، جا ئایا نەچین بۆ غەزاو خەباتکردن؟ فەرمووی: نەء. بەڵام بۆ ئێوەی ژنان حەجی باش گەورەترین غەزاو خەباتە (ب/ن) گفتەی (ن): بەڵام بۆ ئێوە حەجی خانەی خودا پەسەندترین‌و جوانترین غەزایە.

١٤٧٣– وَعَنْهَا عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللَّهُ فِيهِ عَبْدًا مِنَ النَّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ وَإِنَّهُ لَيَدْنُو ثُمَّ يُبَاهِي بِهِمُ الْمَلاَئِكَةَ فَيَقُولُ مَا أَرَادَ هَؤُلاَءِ. رَوَاهُ مسلم والنسائى[٤].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا لە هیچ ڕۆژێکا وەك ڕۆژی عەرەفە ئاوا بە زۆری بەندەی خۆی لە ئاگری دۆزەخ ئازاد ناکا، تەواو نزیك دەبێتەوە لێیان‌و شانازییان پێوە دەکا لەلای فریشتەکان‌و دەفەرموێ: ئەمانە چییان دەوێ؟ (م/ن).

١٤٧٤– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَابِعُوا بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ فَإِنَّهُمَا يَنْفِيَانِ الْفَقْرَ وَالذُّنُوبَ كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ وَالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَلَيْسَ لِلْحَجَّةِ الْمَبْرُورَةِ ثَوَابٌ إِلاَّ الْجَنَّةُ. رَوَاهُ النسائى والترمذى وصححه[٥].

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: حەج‌و عەمرە بەرو دوا بکەن‌و بەینیان مەخەن، چونکە ئەم دوانە هەژاری‌و تاوان ڕەهەنە دەکەن، هەر وەك چۆن مووشە دەمە چڵك‌و ژەنگی ئاسن‌و زێڕو زیو پاك دەکاتەوە ئاوا، وە حەجی باش‌و دروستیش تەنیا بەهەشتە تۆڵەو پاداشی‌و بەس (ن/ت:ص).

---

[٣] بخاري. حج: ١٥٢٠، ١٨٦١، ٢٧٨٤، ٢٨٧٥، ٢٨٧٦. (رياض: ١٢٧٦/٦ ز:٢٣٣).

[٤] (رياض: ١٢٧٧/٧ ز- ٢٣٣. مسلم: ١٣٤٨). مسلم: ٣٢٧٥.

[٥] صحيح عند الترمذى.

١٤٧٥– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيُحَجَّنَّ الْبَيْتُ وَلَيُعْتَمَرَنَّ بَعْدَ خُرُوجِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ. رَوَاهُ البخاری فی فضل الحرم[٦].

ئەبو سەعیدی خودری (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە پاش پەیدابوونی یەئجووج و مەئجووجیش خەڵك هەر دەچن بۆ دینیی خانەی خودا بۆ کردنی حەج و عەمرە! (ب).

١٤٧٦– عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَهَلَّ بِحَجَّةٍ أَوْ عُمْرَةٍ مِنَ الْمَسْجِدِ الأَقْصَى إِلَى الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ أَوْ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ. رَوَاهُ أبو داود وأحمد وابن ماجه[٧].

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ لە مەسجدول ئەقساوە ئیحرامی حەج یا عەمرە دابەستێ بۆ مەسجودلحەرام، بێگومان کە خودا لە گوناهی لەوەو بەری و لەوەو پاشی خۆش دەبێ، یا بەهەشت مسۆگەر دەکا بۆ خۆی (د/ئەحمەد/ ئیبنو ماجە).

١٤٧٧– وَللنسائی: وَفْدُ اللَّهِ ثَلاثَةٌ: الْغَازِی وَالْحَاجُّ وَالْمُعْتَمِرُ[٨].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: وەفدی خودا ئەم سێ دەستەیەن: ئێکۆشەری رێگەی خوداو حاجی و عەمرەکەر (ن).

١٤٧٨– عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَجَّ ثَلاثَ حِجَجٍ حَجَّتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُهَاجِرَ وَحَجَّةً بَعْدَ مَا هَاجَرَ وَمَعَهَا عُمْرَةٌ فَسَاقَ ثَلاثًا وَسِتِّينَ بَدَنَةً وَجَاءَ عَلِيٌّ مِنَ الْيَمَنِ بِبَقِيَّتِهَا فِيهَا جَمَلٌ لأَبِي جَهْلٍ فِي أَنْفِهِ بُرَةٌ مِنْ فِضَّةٍ فَنَحَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ

---

[٦] بخاري. حج: ١٥٩٣.

[٧] سكت عنه الشارح.

[٨] سكت عنه الشارح.

(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَمَرَ مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ بِبَضْعَةٍ فَطُبِخَتْ وَشَرِبَ مِنْ مَرَقِهَا. رَوَاهُ التِرمذي. والله أعلم[٩].

جابير (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سێ حەجی کردووە، لە پێش کۆچکردندا دوو حەج و لەپاش کۆچکردن حەج و عەمرەیەك، لە حەجی دواییدا سەد وشتری کرد بە قوربانی، لەگەڵ خۆی لە مەدینەوە شەست و سێ وشتری هێنابوو، وە باقی مەندەکەی عەلی لە یەمەنەوە هێنابوونی، وشترە نێرەیەکی ئەبو جەهلیان تیابوو، ئەڵقەیەکی زیوی لە لووتابوو، جا زۆربەیان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی سەری بڕین وە گوتی بە عەلی باقی مەندەکەی سەربڕین وە فەرمانی کرد لەهەر قوربانییەك پارچەیەکیان لە تیانچەیەکا کوڵان و هەندێکی لەمەرگەکەی خواردەوە (ت).

## ٧٩) باسی دووەم: باسی فەرزبوونی حەج

## الباب الثاني: في فرضية الحج

قَالَ الله تَعَالَى: {وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ الله غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ }.

خودای گەورە دەفەرموێ: وە بۆ خودا هەیە لەسەر گشت کەسێ کە تەوانای چوون و هاتنەوەی ئەو رێگەیەی ببێ حەجکردنی ماڵی خودا، وە هەر کەسێ باوەڕی بە حەج نەبێ ئەوە خودا بێ نیازە لەو کەسە چونکە خودا بێ باکەو نیازی بە هیچ چشتێ نیە.

١٤٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ فَرَضَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ فَحُجُّوا . فَقَالَ: رَجُلٌ أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ

---

[٩] سكت عند الشارح.

اللَّهِ؟ فَسَكَتَ حَتَّى قَالَهَا ثَلاثًا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَوْ قُلْتُ نَعَمْ لَوَجَبَتْ وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ ثُمَّ قَالَ: ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَدَعُوهُ. رَوَاهُ مسلم والنسائي والترمذي[1].

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وتارێکی بۆماندا فەرمووی: ئەی خەڵکینە! خودا حەجی داناوە لە سەرتان دەی حەج بکەن، پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا هەموو ساڵێ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەنگی نەکرد، تا سێ جار پیاوەکە ئەم پرسیارەی دووبارە کردەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر بڵێم بەڵێ ئەوا هەموو ساڵێ حەج فەرز ەبێ لەسەرتان و بۆشتان ناکرێ، ئینجا فەرمووی: کاتێ من وازم لە ئێوە هێناو لە شتێکم نەکۆڵییەوە لەگەڵتاندا، ئیتر ئێوەیش واز لەمن بێنن و لەو شتە مەکۆڵنەوە، چونکە نەتەوەکانی پێش ئێوە بەهۆی ئەمانەوە لەناو چوون و فەوتان: بەهۆی پرسیاری زۆرو دژایەتییان لەگەڵ پێغەمبەرەکانیانا، دەی ئەگەر فەرمانم پێ کردن بە چشتێ ئەوەندەی لە تواناتانا هەیە بیکەن، وە ئەگەر نەهیشم کرد لە شتێ لێتان بەتەواوی وازی لێ بێنن (م/ن/ت).**

١٤٨٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ الْحَجُّ فِي كُلِّ سَنَةٍ أَوْ مَرَّةً وَاحِدَةً قَالَ: بَلْ مَرَّةً وَاحِدَةً فَمَنْ زَادَ فَهُوَ تَطَوُّعٌ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي وأحمد والحاكم وصححه[2].

**ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: ئەقرەعی کوڕی حابیس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! حەج هەموو ساڵێکە یا یەك جار فەرزە**

---

[1] مسلم. حج: ٣٢٤٤. نسائی. حج: ٢٦١٨. (ریاض صالحین: ٢/١٢٧٢از: ٢٣٣ + ژمارە: ١/١٥٦.

[2] صحیح عنه الحاكم.

لە تەواوی تەمەندا؟ فەرمووی: هەموو ساڵێ فەرزنییە بەڵکوو لە تەواوی تەمەندا یەکجار فەرزە، ئیتر هەر کەسێ زیاتر بکا ئەوە زیادە خێرە (د/ن/ئەحمەد/حاکم:ص).

١٤٨١– وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَرَادَ الْحَجَّ فَلْيَتَعَجَّلْ. رَوَاهُ أبو داود وأحمد وزاد: فَإِنَّهُ قَدْ يَمْرَضُ الْمَرِيضُ وَتَضِلُّ الراحِلَةُ وَتَعْرِضُ الْحَاجَةُ[٣].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ دەیەوێ حەج بکا با زوو بە زوو بیکا (د–سند صالح–ئەحمەد) ئەحمەد ئەمەشی پتر کردووە، چونکە دەقەومێ مرۆڤ نەخۆش بکەوێ، یا ولاخەکەی بزربێ، یا کارێ روو بدات و پەکی حەجەکەی بکەوێ.

١٤٨٢– عَنْ عَلِيّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ مَلَكَ زَادًا وَرَاحِلَةً تُبَلِّغُهُ إِلَى بَيْتِ اللّٰهِ وَلَمْ يَحُجَّ فَلاَ عَلَيْهِ أَنْ يَمُوتَ يَهُودِيًّا أَوْ نَصْرَانِيًّا وَذَلِكَ أَنَّ اللّٰهَ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ (وَلِلّٰهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً)[٤].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ توێشەی رێگەو ولاخێکی سواری وای هەبێ کە بیگەیەنێتە خانەی خودا، وە حەج نەکا ئەوە دەیەوێ بە جوولەکەیی بمرێ یا بە گاووریی کەیفی خۆیەتی، ئەمەیش بەپێی فەرمایشتی خودا لەنامەی خۆیا کە دەفەرموێ:

{وَلِلّٰهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً}. (ت/ئەحمەد)

١٤٨٣– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَا يُوجِبُ الْحَجَّ قَالَ: الزَّادُ وَالرَّاحِلَةُ. رَوَاهُمَا الترمذي وأحمد[٥].

---

[٣] رواه ابو داود بسند صالح (شرحه).

[٤] درجة الحسن (شرحه).

[٥] بسند حسن (شرحه).

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! حەج بەچی پێویست دەبێ؟ فەرمووی: بە توێشووی رێگەو بە ولاخی سواریی (ت-س/ح-ئەحمەد).

١٤٨٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاس (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْيَمَنِ يَحُجُّونَ وَلاَ يَتَزَوَّدُونَ وَيَقُولُونَ نَحْنُ الْمُتَوَكِّلُونَ، فَإِذَا قَدِمُوا مَكَّةَ سَأَلُوا النَّاسَ، فَأَنْزَلَ اللّٰهُ تَعَالَى ( وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى). رَوَاهُ البخاری وأبو داود[٦].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: جاران کە خەڵکی یەمەن دەهاتن بۆ حەج توێشەو خەرجییان لەگەڵ خۆیان نەدەهێنا، وە دەیانگوت: ئێمە تەوەکوولمان لەسەر خودایەو خودا خۆی پشتیوانمانە ئیتر چۆن دەبێ نان و پارەو پوول و خەرجی لەگەڵ خۆمان ببەین، شتی وا دژی پشت بەخودا بەستنە! جا کە دەگەیشتنە مەککە لەوێ دەستیان دەکرد بە سواڵکردن لە خەڵك، جا خودای گەورە بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى: وە توێشەی رێگە هەڵبگرن، بە راستی باشترین توێشەیێ بۆ ئادەمیزاد تەقواو پارێزگارییە، کە دەبێ بەهۆی پاراستن لە سزاو تۆڵەی سەختی خودای گەورە (ب/د).

١٤٨٥- وَعَنْهُ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ فَرِيضَةَ اللّٰهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا، لاَ يَثْبُتُ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ. رَوَاهُ الخمسة[٧].

دیسان گوتی: ژنێکی خەثعەمی هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! حەج (کە فەرزی خودایە لەسەر بەندەکانی خۆی) کەوتۆتە سەر باوکم، کە

---

[٦] بخاری حج: ١٥٢٣.

[٧] بخاري. حج: ١٥١٣، ١٨٥٤، ١٨٥٥، ٤٣٩٩، ٦٢٢٨. مسلم. حج: ٣٢٣٨. ابو داود. مناسك: ١٨٠٩. نسائی. مناسك: ٢٦٣٣، ٢٦٣٤. (رياض: ١٢٧٩/٩ ز: ٢٢٣ — متفق عليه).

پیرەمێردێکی ئیختیاری وایە خۆی بەسەر وڵاخەوە بۆ راناگیرێ، جا ئایا دەبێ کە من خۆم لەباتی ئەو حەجی بۆ بکەم یا نابێ؟ فەرمووی: بەڵێ دەبێ ئەم پرسیارو وەڵامەیش لەکاتی کردنی حەجیماڵئاواییدا بوو کە ناودارە بەحەجول ویداع (ش/د/ت/ن).

١٤٨٦- وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً يَقُولُ: لَبَّيْكَ عَنْ شُبْرُمَةَ؟ قَالَ: مَنْ شُبْرُمَةَ قَالَ: أَخٌ لِي أَوْ قَرِيبٌ لِي. قَالَ: حَجَجْتَ عَنْ نَفْسِكَ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: حُجَّ عَنْ نَفْسِكَ ثُمَّ حُجَّ عَنْ شُبْرُمَةَ. رَوَاهُ أبو داود وابن حبان والبيهقي وصححه[٨].

دیسان ئەو گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوێی لێ بوو پیاوێ دەیگوت: خودایە، ئیحرامی حەج دادەبستم بۆ تۆ لە جیاتیی شوبرورمە! حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: شوبروومە کێیە؟ گوتی: برامە، یا گوتی: خزممە. فەرمووی: ئایا لەمەو پێش حەجت بۆ خۆت کردووە؟ گوتی: نەخەیر! فەرمووی: دە لەپێشدا حەج بۆ خۆت بکە ئینجا حەج بۆ شوبروومە بکە (د/ئیبنو حەببان:ص-بەیهەقی:ص).

١٤٨٧- وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ يَقُولُ: لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إلاَّ وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ وَلاَ تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ إلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ . فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إنَّ امْرَأَتِي خَرَجَتْ حَاجَّةً وَإِنِّي اكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا. قَالَ: انْطَلِقْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ. رَوَاهُ الأربعة[٩].

دیسان ئەو گوتی: گوێم لە پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: پیاوو ژنی بیانی دوو بەدوو بە تەنها خۆیان پێکەوە نەبن مەگەر ئافرەتەکە کەسێکی خۆیی لەگەڵدابێ، وە ئافرەتیش لەگەڵ یەکێکی خۆییدا نەبێ نەچێ بۆ سەفەر. پیاوێکیش هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من خۆم بۆ فیسارە غەزا ناونووس کراوم و ژنەکەشم دەچێ بۆ حەج فەرمووی: برۆ لەگەڵ ژنەکەتا حەج بکە (ش/د/ت).

---

[٨] صحيح عند البيهقي.

[٩] بخاري. جزاء الصيد: ١٨٦٢، ٣٠٠٦، ٣٠٦١، ٥٢٣٣. مسلم. حج: ٣٢٥٩.

## ٨٠) حەج قەزا دەكرێتەوە بۆ مردوو، وە حەجی منداڵیش دروستە
## يقضى الحج عن الميت كما يصح من الصبي

١٤٨٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ أُمِّي نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ، فَلَمْ تَحُجَّ حَتَّى مَاتَتْ أَفَأَحُجُّ عَنْهَا قَالَ: نَعَمْ. حُجِّي عَنْهَا، أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ أَكُنْتِ قَاضِيَةً اقْضُوا اللَّهَ، فَاللَّهُ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ. رَوَاهُ البخارى والنسائى[1].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: ئافرەتێكی جوهەینەیی هاتە لای حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایكم فووتوو (نەذر)ی كردبوو كەحەجێ بكا، وە نەیشی كرد تامرد، ئایا دەبێ من ئەو حەجەی بۆ بكەم؟ فەرمووی: ئا، دەبێ، حەجی بۆ بكە، نابینیت ئەگەر دایكت قەرزاری كەسێ بێ تۆ ئەو قەرزەی بۆ دەبژێریتەوە، دەی هەقی خودایش بدەنەوە، چونكە وەفاو سەر راستی لەگەڵ خودادا لە هەموو كەسێكی تر رەواترە (ب/ن. رەحمەتی خودایان لێبێ).**

١٤٨٩- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَلَمْ تَحُجَّ أَفَأَحُجُّ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ حُجِّي عَنْهَا. رَوَاهُ الترمذي هنا ومسلم فى الصوم[2].

**بورەیدە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: ئافرەتێ هاتە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **عەرزیكرد: قوربان! من دایكم مردووە، وە حەجی نەكردووە، ئایا دەبێ من حەجی بۆ بكەم؟ فەرمووی: ئا دەبێ حەجی بۆ بكە (ت/م).**

١٤٩٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّ أَبِي مَاتَ وَعَلَيْهِ حَجَّةُ الإِسْلاَمِ فَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ أَبَاكَ تَرَكَ دَيْنًا عَلَيْهِ أَتَقْضِيهِ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَاحْجُجْ عَنْ أَبِيكَ. رَوَاهُ النسائى والشافعى[3].

---

[1] بخاري. جزاء الصيد: ١٨٥٢، ٦٦٩٩، ٧٣١٥.

[2] مسلم. صوم: ٢٦٩٢ – ٢٦٩٥. أبو داود. زكاة ١٦٥٦. ترمذى. زكاة: ٦٦٧.

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) عەرزیکرد: قوربان! من باوکم مردووەو حەجی فەرزی لەسەرە ئایا دەبێ من حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: پێم بڵێ: ئەگەر باوکت قەرزێکی لەسەربێ، ئایا بۆی دەبژێریتەوە؟ گوتی: بەڵێ بۆی دەبژێرمەوە. فەرمووی: دە حەجیش بۆ باوکت بکە (ن/شافیعی).

١٤٩١- وَعَنْهُ قَالَ: رَفَعَتِ امْرَأَةٌ صَبِيًّا لَهَا فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ وَلَكِ أَجْرٌ. رَوَاهُ مسلم والترمذی[٤].

دیسان گوتی: ئافرەتێ منداڵێکی خۆی هەڵبڕی و نیشانی پێغەمبەری داو گوتی: ئەی رەهبەری خودا! ئایا حەج بۆ ئەم منداڵە دەبێ؟ فەرمووی: بەڵێ بۆی دەبێ، وە بۆ تۆیش پاداش هەیە لەسەر ئەوە کە حەجی پێ دەکەی، چونکە مامۆستای خێر وەك خێرکەر وایە (م/ت).

١٤٩٢- وَقَالَ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ: حُجَّ بِي أَبِي مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَأَنَا ابْنُ سَبْعِ سِنِينَ. رَوَاهُ الترمذي بسند صحيح[٥].

سائیبی کوڕی یەزید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەساڵی حەجی ماڵئاوایی (حەججەتولویداع)دا، لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) حەجیان پێ کردم ئەو حەلە تەمەنم حەوت ساڵ بوو (ت-س/ص).

## ٨١) بەدەم حەجکردنەوە کاسپیکردن قەی ناکا: (لابأس بالتكسب مع النسك)

١٤٩٣- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَنَّ النَّاسَ فِي أَوَّلِ الْحَجِّ كَانُوا يَتَبَايَعُونَ بِمِنًى وَعَرَفَةَ وَسُوقِ ذِي الْمَجَازِ وَمَوَاسِمِ الْحَجِّ فَخَافُوا الْبَيْعَ وَهُمْ حُرُمٌ فَأَنْزَلَ

---

[٣] كل ما فى المجتبى للنساء صحيح (المقدمة).

[٤] مسلم. حج: ٣٢٤. أبو داود. مناسك: ١٧٣٦. نسائى مناسك: ٢٦٤٦ — ٢٦٤٨.

[٥] (رياض: ١٢٨١/١١ ز: ٢٣٣. بخاري. ١٨٥٨) تجريد ١٨٥٨/٨٤٩.

اللّٰهُ سُبْحَانَهُ (لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلاً مِنْ رَبِّكُمْ) فِي مَوَاسِمِ الْحَجِّ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[1].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: لە سەرەتای حەجەوە کە ئایینی ئیسلام هات خەڵك وەك سەردەمی پێش ئیسلام لە میناو عەرەفات و بازاڕەکانی زیلمەجازو مەڵبەندەکانی حەجدا، شتومەکیان دەکڕی و دەفرۆشت و مامەڵەو ئاڵ و وێڵیان دەکرد، بەڵام لەپاشا کاتێ کە ئایینی ئیسلام دامەزراو خۆی گرت موسوڵمانەکان لەکاتی حەجکردندا پێیان ناخۆش بوو کە بە بەرگی ئیحرامەوە خەریکی سەوداو ئاڵوێڵ بن، تا خودای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە کە دەفەموێ:**

{لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ – فِي مَوَاسِمِ الْحَجِّ}.

**هیچ گوناهێکتان لەسەر نیە کە لە مەڵبەندەکانی حەجا، لەو کاتەدا کە لە حەجان مامەڵەو ئاڵ و وێڵ بکەن و بگەڕێن بەشوێن رزق و رۆژی پاك و ماڵی حەڵاڵدا، کە بەشێکن لە بەخشش و کەرەمی خودای خۆتان (ش/ن).**

١٤٩٤– عَنْ أَبِي أُمَامَةَ التَّيْمِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً أُكْرِي فِي هَذَا الْوَجْهِ وَكَانَ نَاسٌ يَقُولُونَ لِي إِنَّهُ لَيْسَ لَكَ حَجٌّ فَلَقِيتُ ابْنَ عُمَرَ فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: ابْنُ عُمَرَ أَلَيْسَ تُحْرِمُ وَتُلَبِّي وَتَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَتُفِيضُ مِنْ عَرَفَاتٍ وَتَرْمِي الْجِمَارَ قَالَ: قُلْتُ بَلَى. قَالَ: فَإِنَّ لَكَ حَجًّا وَسَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ذَلِكَ فَسَكَتَ عَنْهُ حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلاً مِنْ رَبِّكُمْ) فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ وَقَرَأَهَا عَلَيْهِ وَقَالَ: لَكَ حَجٌّ. رَوَاهُ أبو داود بسند صالح[2].

---

[1] (رياض: ١٢٨٤/١٤ ز: ٢٣٣. بخاري. ١٧٧٠) ٢٠٥٠، ٢٠٩٨، ٤٥١٩. بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی/٢ ل/٢٢٧ دوا ژمارەی لاپەڕەکە، کە (٣١)ە.

[2] بسند صالح.

ئەبو ئومامەی تەمیمی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: دەستوورم وابوو وڵاخم دەدا بەکرێ بە حاجیان‌و خۆشم بەدەمیەوە حەجم دەکرد، هەندێ کەس دەیانگوت: تۆ حەجت بۆ نییە چونکە تۆ سەربەخۆ بۆ حەج نایەیت‌و بۆ کرێکاریی دێی! جا منیش بە ئیبنو عومەر گەیشتم‌و بۆ ئەمە، لێم پرسی، گوتی: ئایا ئیحرام دادەبەستیت‌و لەبیەیکە دەیکەیت‌و هەڵ دەسووڕێیت بە دەوری خانەی خوداداو لە عەرەفاتەوە دادەپەڕیت بۆ موزدەلیفەو بەرد فڕێ دەدەیت بۆ کۆگا بەردەکان‌و ڕەجمی شەیتان دەکەیت، ئایا ئەمانە هەموو دەکەیت؟ گوتم: ئا هەموویان دەکەم، گوتی: دەحەجت بۆ هەیە، چونکی جارێ پیاوێ بۆ ئەمە پرسیاری لە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) کرد، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) وەڵامی نەدایەوە تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

{لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ – فِي مَوَاسِمِ الْحَجّ}.

(د–س/صالح = ئەبو داوود ئەم حەدیثەی گێڕاوەتەوە بە سەنەدێکی باش).

## ٨٢) نیشانەی کات‌و وادەو شوێنی دابەستنی ئیحرامی حەج‌و عەمرە: مواقيت الحج والعمرة

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ}.

خودای مەزن دەفەرموێ: کاتی خەریکبوون بە کردەوەکانی حەجەوە چەن مانگێکی ئاشکراو دیاری کراون، کە برێتین لە مانگی شەشەڵان‌و ناو جەژنان‌و سیازدە ڕۆژ لە سەرەتای مانگی نۆمینە.

١٤٩٥– قَالَ: ابْنُ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) أَشْهُرُ الْحَجِّ شَوَّالٌ وَذُو الْقَعْدَةِ وَعَشْرٌ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ. رَوَاهُ البخاري[1].

---

[1] تعليق ذكره البخاري في الباب/ ٣٣ من كتاب الحج قبل رقم: ١٥٦٠ مباشرة (مترجم).

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **دەڵێ: مانگەکانی حەج شەشەڵان و ناوجەژنان و دەی یەکەمی مانگی نۆمینەن (ب).**

**١٤٩٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) **إِنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **وَقَّتَ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلأَهْلِ الشَّأْمِ الْجُحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنَ الْمَنَازِلِ، وَلأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، وَقَالَ: هُنَّ لَهُنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِنَّ، مِمَّنْ أَرَادَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ، حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ. رَوَاهُ الخمسة**[٢].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **ذولحولەیفە کە ئێستا ناو دارە بە بیری عەلی دیاری کردووە بۆ جێگە ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینە، وە بۆ خەڵکی شامیش جوحفە، وە بۆ خەڵکی نەجدیش قەرنولمەنازیل، وە بۆ خەڵکی یەمەنیش یەلەم لەم وە فەرمووی** (دروودی خودای لەسەربێ)**: ئەم شوێنانە جێگەی ئیحرام دابەستنن بۆ ئەو کەسانەی کە دێن بۆ حەج و عەمرە لە خەڵکی ئەم ولاتانەو لە خەڵکی ولاتانی تریش کە بەسەر ئەم شوێنانەدا دێن بۆ حەج و عەمرە، وە کەسێ لەم شوێنانە نزیکتربوو ئەوە جێگەی ئیحرام دابەستنی لەو شوێنەوەیە کە دەکەوێتە رێ! تەنانەت خەڵکی مەککە لەمەککەوە ئیحرام دادەبستن (ش/د/ت/ن).**

**١٤٩٧- وَعَنْهُ قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **لأَهْلِ الْمَشْرِقِ الْعَقِيقَ. رَوَاهُ أبو داود والترمذي**[٣].

**دیسان ئەو** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **عەقیقی دیاری کردووە بۆ جێگە ئیحرام بەستنی خەڵکی رۆژهەلات (عێراق) (د/ت-س/ح).**

**١٤٩٨- وَلأحمد وأبي داود والنسائي: وَقَّتَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **لأَهْلِ الْعِرَاقِ ذَاتَ عِرْقٍ**[٤].

---

[٢] بخاري. حج: ١٥٢٤، ١٥٢٦، ١٥٢٩، ١٥٣٠، ١٨٤٥. مسلم. حج: ٢٧٩٥، ٢٧٩٦. أبو داود. حج: ١٧٣٨. نسائي. حج: ٢٦٥٧.

[٣] بسند حسن (شرحه).

گوتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) زات عیرقی دیاری کردووە بۆ جێگە ئیحرام بەستنی خەڵکی عیراق (ئەحمەد/د/ن–س/ص).

١٤٩٩– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: لَمَّا فُتِحَ هَـذَانِ الْمِـصْرَانِ أَتَـوْا عُمَـرَ فَقَالُوا: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَدَّ لأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنًا، وَهُوَ جَوْرٌ عَنْ طَرِيقِنَا، وَإِنْ أَرَدْنَا قَرْنًا شَقَّ عَلَيْنَا. قَالَ: فَانْظُرُوا حَذْوَهَا مِنْ طَرِيقِكُمْ. فَحَدَّ لَهُمْ ذَاتَ عِرْقٍ. رَوَاهُ البخاری[٥].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: کە کووفەو بەصرە فەتح کران، هاتنە خزمەتی عومەر عەرزیان کرد: قوربان! ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! خۆت دەزانی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قەرنی دیاری کردووە بۆ جێگە ئیحرام بەستنی خەڵکی نەجد، ئەوێش کلایە لە رێگەی ئێمەوەو ئەگەر گریمان بچین لەوێوە بێین بۆ حەج دوور دەکەوێتەوەو تووشی رەنج و زەحمەت دەبین عومەر گوتی: سەرنج بدەن لە رێکی ئەوێ لە رێگەی خۆتانەوە کوێیە، جا ذات عیرقی بۆ دیاریکردن! (بوخاری. رەحمەتی خودای لێبێ).

## ٨٣) باسی سێیەم: باسی ئەو شتانە کە لە ماوەی ئیحرام بەستندا حەرام دەبێ لە حاجی و لە عەمرەکەر، یەکێکیان پۆشینی جل و بەرگ و خۆ بۆنخۆشکردنە: (الباب الثالث: فيما يحرم على المحرم منها لبس الثياب والطليب)

١٥٠٠– عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ مَـا يَلْـبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ قَالَ: لاَ يَلْبَسُ الْقُمُصَ، وَلاَ الْعَمَائِمَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ الْبَرَانِسَ، وَلاَ الْخِفَافَ، إِلاَّ أَحَدٌ لاَ يَجِدُ النَّعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْـفَلَ مِـنَ الْكَعْبَـيْنِ، وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ زَعْفَرَانٌ وَلاَ الْوَرْسُ. وَفِي رِوَايَةٍ: مَـنْ لَـمْ يَجِـدِ نَعْلَـيْنِ فَلْيَلْبَسِ خُفَّيْنِ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَارًا فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ[١].

---

[٤] بسند صحيح (شرحه).

[٥] بخاري. حج: ١٥٣١.

[١] بخاري. حج: ١٥٤٢. ٥٨٠٣. مسلم. حج: ٢٧٨٣. أبو داود حج: ١٨٢٤. نسائی. حج: ٢٦٧٣.

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەرگی ئیحرام چییە بۆ کەسێ لە ئیحرام بێ؟ فەرمووی: مێزەرو کراس و دەرپێ و کڵاوو خوف لەبەر نەکا، ئەگەر کەسێ جووتێ سۆلی دەست نەکەوت ئەوا جووتێ خوف (لەخوار قاپە رەقەڵەوە ببڕێتەوە) ئەوجا لەپێیان بکا، وە هەربەرگێ زەعفەران و وەرسی پێوە بێ لەبەری مەکەن. لە گێڕانەوەیەکا: کەسێ جووتێ سۆڵی دەست نەکەوت ئەوا جووتێ خوف لەپێ بکا، وە کەسێ پەشتە ماڵ (ئیزار)ی دەست نەکەوت دەرپێ لەپێ بکا (ش/د/ت/ن).

١٥٠١- عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ بِالْجِعْرَانَةِ قَدْ أَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ وَهُوَ مُصَفِّرٌ لِحْيَتَهُ وَرَأْسَهُ وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَحْرَمْتُ بِعُمْرَةٍ وَأَنَا كَمَا تَرَى. فَقَالَ: انْزِعْ عَنْكَ الْجُبَّةَ وَاغْسِلْ عَنْكَ الصُّفْرَةَ وَمَا كُنْتَ صَانِعًا فِي حَجِّكَ فَاصْنَعْهُ فِي عُمْرَتِكَ. رَوَاهُمَا الخمسة[٢].

یەعلای کوڕی ئومەییە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ، ریش و قژی خۆی لە بۆنی خۆشا زەرد کردبوو، وە جبەیەکی لەبەردابوو، لە جیعرانە هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزی کرد: ئەی رەوانەکراوی خودا! ئیحرامی عەمرەم دابەستووەو بەم شێوەیەشم کە دەمبینی؟ فەرمووی: جبەکەت داکەنەو ئەم بۆنە زەردەت بشۆرە، وە هەرچی لە حەجەکەتا دەیکەی لە عەمرەکەشتا بیکە (ش/د/ت/ن).

١٥٠٢- تقدم برقم: ١٠٨٨[٣].

١٥٠٣- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى النِّسَاءَ فِي إِحْرَامِهِنَّ عَنِ الْقُفَّازَيْنِ وَالنِّقَابِ وَمَا مَسَّ الْوَرْسُ وَالزَّعْفَرَانُ مِنَ الثِّيَابِ

---

[٢] بخاري. حج: ١٥٣٦، ١٧٨٩، ١٨٤٧، ٤٣٢٩، ٤٩٨٥. مسلم. حج: ٢٧٩٠ — ٢٧٩٤. أبو داود. حج: ١٨١٩، ١٨٢٠، ١٨٢١. ترمذی. حج: ٨٣٦. نسائی حج: ٢٦٦٧.

[٣] سبق فی المجلە الأول برقم: ١/١٠٨٨ نسلسل: ٢٠٦.

وَلْتَلْبَسْ بَعْدَ ذَلِكَ مَا أَحَبَّتْ مِنْ أَلْوَانِ الثِّيَابِ مُعَصْفَرًا أَوْ خَزًّا أَوْ حُلِيًّا أَوْ سَرَاوِيلَ أَوْ قَمِيصًا أَوْ خُفًّا. رَوَاهُ أصحاب السنن وأحمد[٤].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: گوێم لێبوو کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **نەهی دەکرد لەوە کە ژن لەکاتی ئیحرامدا دەستکێش و پەچەو جلی وەرساوی و زەعفەراناوی بەکاربێنێ، ئەمانەی لێ دەرچێ ئیتر ژن حەزی لەچی چەشنە جلێکی ترە با لەبەری بکا، وەك عەصفەراوی و هاورێشم و خشڵ و دەرپێ و کراس و خوف (د/ت/ن/ئەحمەد).**

١٥٠٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: كَانَ الرُّكْبَانُ يَمُرُّونَ بِنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُحْرِمَاتٌ فَإِذَا حَاذَوْا بِنَا سَدَلَتْ إِحْدَانَا جِلْبَابَهَا مِنْ رَأْسِهَا إِلَى وَجْهِهَا فَإِذَا جَاوَزُونَا كَشَفْنَاهُ. رَوَاهُ أبو داود وابن ماجه بسند صالح[٥].

**عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: گەلێ جار وادەبوو لە ئیحرامدا دەبووین لەگەڵ پێغەمبەردا** (دروودی خودای لەسەربێ) **کاتێ گەلە (کۆمەڵە) سوار بەلامانا تێ دەپەرین کە دەگەیشتنە ئاستی ئێمە چارشێوەکەی سەر سەرمانمان دادەدایەوە بەسەر رووماناء تا کاتێ لێمان رەت دەبوون ئیتر لامان دەدایەوە (د/ئیبنو ماجە-سند صالح).**

## ٨٤) یەکێکی تریان راوکردن و نێچیرگرتن، مەگەر هی زیانەخۆرۆ: ومنها قتل الصید إلا الضار منه

قَالَ اللَّهُ تَعَالى: {أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِيَ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ}.

---

[٤] ورواه البخاری بلفظ لا تنتقب المرأة المحرمة، ولا تلبس القفازین (بخاری. حج: ١٨٣٨).

[٥] بسند صالح (شرحه).

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: حەڵاڵ کراوە بۆ ئێوە نەچیری دەریاو خواردەمەنی دەریا بۆ رابواردنی ئێوە، لە کاتێکا کە نیشتەجێبن یاخود کاروانیو رەفتەنی بن، خواه لە ئیحرامدا بن یا لە ئیحرامدا نەبن، وە حەرام کراوە لە ئێوە نەچیری وڵاتی وشکانی هەتا لە ئیحرامدا بن، وە خۆتان بپارێزن لە نافەرمانی خودا، چونکە ئێوە ناتوانن لە دەستی دەرچن وە زوو یا درەنگ دنیا بەجێ دێڵنو لە رۆژی رەستاخێزدا لە خزمەتی ئەو زاتەدا گرد دەکرێنەوە.

١٥٠٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: أَهْدَى الصَّعْبُ بْنُ جَثَّامَةَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِمَارَ وَحْشٍ وَهُوَ مُحْرِمٌ فَرَدَّهُ عَلَيْهِ وَقَالَ: لَوْلاَ أَنَّا مُحْرِمُونَ لَقَبِلْنَاهُ مِنْكَ. وَفِي رِوَايَةٍ: أُهْدِيَ لَهُ عُضْوٌ مِنْ لَحْمِ صَيْدٍ فَرَدَّهُ. فَقَالَ: إِنَّا لاَ نَأْكُلُهُ إِنَّا حُرُمٌ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ئیحرامدا بوو، صەعبی کوڕی جەثامە کەرەکێوییەکی بەدیاری بۆ هێنا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دایەوە بە سەریاو فەرمووی: لەبەر ئەوە لە ئیحرامداین بۆیە لێت وەرناگرین، ئەگینا لێمان وەر دەگرتیت لە گێڕانەوەیەکا: پەلێ گۆشتیان لە نەچیرێ بۆ هێنا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وەری نەگرتو فەرمووی: نایخۆین چونکە لەئیحرامداین (ش/د/ت/ن).

١٥٠٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: صَيْدُ الْبَرِّ لَكُمْ حَلاَلٌ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ مَا لَمْ تَصِيدُوهُ أَوْ يُصَدْ لَكُمْ. رَوَاهُ أصحاب السنن. وَقَالَ: الشافعي: إِنَّهُ أَحْسَنُ حَدِيث فِي الْبَابِ[2].

---

[1] بخاري. حج: ١٨٢٥، ٢٥٧٣، ٢٥٩٦. مسلم. حج: ٢٨٣٧، ٢٨٤٢. ترمذي: حج: ٨٤٩ز نسائي. حج: ٢٨١٨، ٢٨١٩. ابن ماجه مناسك: ٣٠٩٠. (رياض: ٣/٦٢٣ز: ٧٣).

[2] قال الشافعي: إنه احسن حديث في الباب.

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: لەکاتی ئیحرامیشدا نەچێری وشکانی حەڵاڵە بۆئێوە بەمەرجێ کە خۆتان راوی نەکەن و بەنیازی ئێوە راو نەکرابێ (د/ت/ن) شافیعی دەڵێ: ئەم فەرموودەیە جوانترین بەڵگەیە بۆ ئەم باسە.**

**١٥٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) **قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّـهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فِي حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ فَاسْتَقْبَلَنَا رِجْلٌ مِنْ جَرَادٍ فَجَعَلْنَا نَضْرِبُهُ بِسِيَاطِنَا وَعِصِيِّنَا فَقَالَ: النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**: كُلُوهُ فَإِنَّهُ مِنْ صَيْدِ الْبَحْرِ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[٣].**

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: لە خزمەتی حەزرەتدا** (درودی خودای لەسەربێ) **دەرچووین یا بۆ حەج، یا بۆ عەمرە، تووشی پەڵەیێ کوللەبووین، جا بە قەمچی و بەداردەست دەستمان کرد بە پیامالینی، پێغەمبەریش** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: بیخۆن چونکە ئەمە لە نەچێری دەریایە (ت/د-سند ضعیف).**

**١٥٠٨- عَنْ حَفْصَةَ** (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) **عَنْ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ لاَ حَرَجَ عَلَى مَنْ قَتَلَهُنَّ الْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْفَأْرَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ. وَفِي رِوَايَةٍ: خَمْسٌ فَوَاسِقُ يُقْتَلْنَ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ: الْحَيَّةُ وَالْغُرَابُ الأَبْقَعُ وَالْفَارَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ وَالْحُدَيَّا. رَوَاهُ الخمسة[٤].**

**حەفصە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: پێنج جانەوەر هەن، هەر کەسێ بیانکوژێ گوناهی ناگات، قەلەڕەش و کۆلارەو مشك و دووپشك و سەگێ بگەزێ لە گێڕانەوەیەکا: پێنج جانەوەر هەن لەرادە دەچوون و زیانیان لە ئەندازە بەدەرە، لەبەر ئەوە چ لە خاکی حەرەم و چ لە**

---

[٣] بسند ضعیف.

[٤] بخاری. جزاء الصید: ١٨٢٨. نسائی. مناسك الحج: ٢٨٨٩. مسلم، حج: ٢٨٦١ — ٢٨٦٨.

غەیری خاکی حەرەمدا دەکوژرێن: ئەوانیش مارو قەلەبازەڵەو مشك‌و سەگی نهێنی گری گازگرو کۆلارەن![1] (ش/د/ت/ن).

## ٨٥) یەکێ تریان ژنهێنان‌و ژن بە شوودانە: (ومنها النكاح)

١٥٠٩– عَنْ أَبَانِ بْنِ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ اَبِي يَقُولُ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ وَلاَ يُنْكِح وَلاَ يَخْطُبُ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخارى[1].

ئەبانی کوڕی عوسمان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: گوێم لێبوو باوکم دەیگوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە نابێ نەژن بهێنێ بۆ خۆی‌و نە ژن بەشوو بدات‌و نە خوازبێنیی ژن بکا (م/د/ت/ن).

١٥١٠– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: تَزَوَّجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ. رَوَاهُ الخمسة[2].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ مەیموونەی مارەکرد لە ئیحرامدا بوو (ش/د/ت/ن).

١٥١١– وَقَالَ: سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) وَهِمَ ابْنُ عَبَّاسٍ فِي ذٰلِكَ لِانْفِرَادِهِ بِهِ عَنْ رُوَاةِ الْحَدِيثِ الَّذِينَ مِنْهُمْ أَبُو رَافِعٍ وَمَيْمُونَةُ نَفْسُهَا فَقَدْ قَالَتْ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَحْنُ حَلاَلاَنِ بِسَرِفَ. رَوَاهُ أبو داود ومسلم

---

[1] دەڵێن: فاسقی خەمسە پێنجن دیارە.

دووپشك‌و مشك‌و مارە. قەلەڕەش‌و کۆلارە. - وەرگێڕ -

[1] مسلم. نكاح: ٣٤٣٢. أبو داود. مناسك: ١٨٤١، ١٨٤٢. الترمذي حج: ٤٨٠ نسائى. مناسك: ٢٨٤٢، ٢٨٤٣.

[2] بخارى. نكاح:٥١١٤. مسلن. نكاح: ٣٤٣٧. ترمذى. حج: ٨٤٤٠. نسائى. مناسك: ٢٨٣٧.

والترمذی ولفظه: تَزَوَّجَهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ حَلَالٌ وَبَنَى بِهَا حَلَالاً وَمَاتَتْ بِسَرِفَ وَدَفَنَتْ بِالْمَكَانِ الَّذِي دَخَلَ بِهَا فِيهِ[٣].

سەعیدی كوڕی موسەییب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەم باسەدا ئیبنو عەبباس بەهەڵەدا چووە، چونكە بە تەنها هەر ئەو ئەم قسەیە دەكا لەناو ئەو كەسانەدا كە ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، كە یەكێك لەوانە ئەبو ڕافیع بووە كە نۆكەری پێغەمبەر بووە، وە خۆی ڕابەری نێوانی پێغەمبەرو مەیموونە بووە لەكاتی داخوازییەكەیا وە مەیموونە خۆشی دەڵێ (خودای لێ ڕازی بێ): كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) مارەی كردم لەسەریف بووین، وە هەردووكمان بێ ئیحرام بووین‌و لە ئیحرامدا نەبووین (د/م/ت) گفتەی (ت): پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) كاتێ مەیموونە مارە دەكا لەخۆی، لە ئیحرامدا نابێ وە كە بەدەستیشی دەگرێ هەر لە ئیحرامدا نابێ، وە مەیموونە لە سەریف مردووە، وە هەر لەو شوێنەیشدا نێژراوە كە كاتی خۆی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەوێدا بە دەستی گرتبوو.

## ٨٦) ئیحرامدار (واتە: كەسێ لە ئیحرامدابێ) خۆشۆردن‌و كەڵەشاخگرتن‌و چاوڕشتنی بۆ هەیە: (للمحرم الغسل والحجامة والكحل)

١٥١٢– عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَغْتَسِلُ وَهُوَ مُحْرِمٌ وَحَرَّكَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَفْعَلُ. رَوَاهُ الثلاثة[١].

ئەبو ئەییوب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەرم دی (درودی خودای لەسەربێ) لە ئیحرامدا بوو خۆی دەشۆرد. ئینجا ئەبو ئەییوب بە هەردوو دەستی قژی

---

[٣] مسلم. نكاح: ٤٣٣٩، أبو داود. مناسك: ١٨٤٣. ترمذی. حج: ٨٤٥.

[١] بخاری. جزاء الصيد: ١٨٤٠. مسلم. حج: ٢٨٨١. أبو داود مناسك: ١٨٤٠. نسائی. مناسك: ٢٦٦٤.

خۆی هەڵكلۆفت و گوتی: بەچاوی خۆم دیم كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوەها سەری خۆی هەڵدەگلۆفت! (ش/د).

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: احْتَجَمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ مُحْرِمٌ بِلَحْيِ جَمَلٍ فِي وَسَطِ رَأْسِهِ. رَوَاهُ الخمسة وزاد أبو داود: من داء كان به[٢].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ئیحرامدا بوو لەلەحیی جەمەل بوو، كەڵەشاخی لە ناوەڕاستی سەری خۆی گرت (ش/د/ت/ن) ئەبو داوود ئەمەیشی پتر كردووە: لەبەر ئازارێ كە لەسەریا بوو.

١٥١٣- عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِمَلَلٍ اشْتَكَى عُمَرُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ عَيْنَيْهِ فَلَمَّا كُنَّا بِالرَّوْحَاءِ اشْتَدَّ وَجَعُهُ فَأَرْسَلَ إِلَى أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ يَسْأَلُهُ فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ أَنِ اضْمِدْهُمَا بِالصَّبِرِ فَإِنَّ عُثْمَانَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الرَّجُلِ إِذَا اشْتَكَى عَيْنَيْهِ وَهُوَ مُحْرِمٌ ضَمَّدَهُمَا بِالصَّبِرِ. رَوَاهُ الخمسة الا البخاري[٣].

لە نوبەیهی كوڕی وەهبەوە، گوتی: لەگەڵ ئەبانی كوڕی عوسماندا دەرچووین، لەرێگە كە گەیشتینە مەلەل، عومەری كوڕی عوبەیدوڵلا چاوەكانی دەستیان كرد بەژانكردن، جا كاتێ كە گەیشتینە رەوحا ئیشەكەی تەواو سەخت بوو، یەكێكی نارد بۆ لای ئەبانی كوڕی عوسمان لەم بارەیەوە لێی پرسی، ئەویش وەڵامی بۆ ناردەوە: كە بەنییونمەكی تاڵی شاری بیپێچە" چونكە عوسمان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیاركرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ): ئەگەر پیاوێ لە ئیحرامدا چاوی ئێشا چی بكا؟ فەرمووی: بەتاڵی شاریی بیپێچێت (م/د/ت/ن).

---

[٢] بخاري. جزاء الصيد: ١٨٣٦ (١٨٣٥) ٥٦٩٨. أبو داود. مناسك: ١٨٣٥. الترمذي حج: ٨٣٩. نسائي. مناسك: ٢٨٤٥.

[٣] مسلم. حج: ٢٨٧٩. أبو داود مناسك: ١٨٣٨. الترمذي حج: ٩٥٢. نسائي. حج: ٧١٠.

## ٨٧) ئیحرام بەستن لە میقاتەوە: (الإهلال من الميقات)

**١٥١٤- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **تَجَرَّدَ لِإِهْلاَلِهِ وَاغْتَسَلَ. رَوَاهُ الترمذي وحسنه[١].**

**زەیدی کوڕی ثابیت** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەرم دی** (دروودی خودای لەسەربێ) **بۆ ئیحرام بەستن خۆی رووت کردەوەو خۆی شۆرد (ت:ح).**

**١٥١٥- عَنْ عَائِشَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) **قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **لِإِحْرَامِهِ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ وَلِحِلِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ. وَفِي رِوَايَةٍ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الْمِسْكِ فِي مَفْرِقِ رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **وَهُوَ مُحْرِمٌ[٢].**

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: بۆ خۆم بۆنی خۆشم دەدا لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەکاتی ئیحرام بەستندا، بەڵام لەپێش ئەوەدا کە ئیحرام ببەستێ، وە هەروەها بۆ ئیحرام شکاندنیش لەپاش رەجمی شەیتان و شەرتاشین لە پێش ئەوەدا کە تەوافی بەیت بکا بۆنی خۆشم لێ دەدا لە گێرانەوەیەکا: ئێستاش هەر لەبەر چاومە کە چۆن شوێنی جیاکردنەوەی مووی سەری پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کە لە ناوەڕاستا دەیکرد بە دوو لەتەوە، بریسکەی میسکەکەی پێوە بوو، کە لەپێشی ئیحرام بەستندا لێی دابوو (ش/د/ت/ن).**

**١٥١٦- عَنْ أَنَسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **الظُّهْرَ بِالْمَدِينَةِ أَرْبَعًا، وَالْعَصْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ بَاتَ بِهَا حَتَّى أَصْبَحَ، فَلَمَّا صَلَّى رَكِبَ رَاحِلَتَهُ اسْتَوَتْ بِهِ أَهَلَّ. رَوَاهُمَا الخمسة[٣].**

**ئەنەس** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کە چوو بۆ حەجیماڵئاوایی لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆی بە چوار رکاتکرد، بەڵام لە**

---

[١] حسن عند الترمذي.

[٢] بخاري. غسل: ٢٧١، ١٥٣٨، ٥٩١٨، ٥٩٢٣. مسلم. حج: ٢٨٢٤. نسائي. مناسك: ٢٦٩٣، ٢٦٩٤، ٢٦٩٥.

[٣] بخاري. حج: ١٥٤٦، ١٥٤٧، ١٥٥١.

ذولحولەیفە نوێژی عەصری بە قەصر بە دوو ركات كرد، ئینجا شەو لەوێ مایەوە تا بەیانی، ئینجا سوار بوو ڕۆیشت، تا وڵاخەكەی سەری خستە سەرشاخی بەیدا جا لەوێ ستایشی خودای كردو سوبحانەڵڵاو ئەڵڵاهو ئەكبەری كردو حەج و عەمرەی پێكەوە دابەست و بە لەبەیكەكردن بە دەنگی بەرز ئیحرامی دابەست (ش/د/ت/ن).

١٥١٨- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: انْطَلَقَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْمَدِينَةِ، بَعْدَ مَا تَرَجَّلَ وَادَّهَنَ وَلَبِسَ إِزَارَهُ وَرِدَاءَهُ، هُوَ وَأَصْحَابُهُ، فَلَمْ يَنْهَ عَنْ شَيْءٍ مِنَ الأَرْدِيَةِ وَالأُزْرِ تُلْبَسُ إِلاَّ الْمُزَعْفَرَةَ الَّتِي تَرْدَعُ عَلَى الْجِلْدِ، فَأَصْبَحَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، رَكِبَ رَاحِلَتَهُ حَتَّى اسْتَوَى عَلَى الْبَيْدَاءِ، أَهَلَّ هُوَ وَأَصْحَابُهُ وَقَلَّدَ بَدَنَتَهُ، وَذَلِكَ لِخَمْسٍ بَقِينَ مِنْ ذِي الْقَعْدَةِ، فَقَدِمَ مَكَّةَ لأَرْبَعِ لَيَالٍ خَلَوْنَ مِنْ ذِي الْحَجَّةِ، فَطَافَ بِالْبَيْتِ وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَلَمْ يَحِلَّ مِنْ أَجْلِ بُدْنِهِ لأَنَّهُ قَلَّدَهَا، ثُمَّ نَزَلَ بِأَعْلَى مَكَّةَ عِنْدَ الْحَجُونِ، وَهْوَ مُهِلٌّ بِالْحَجِّ، وَلَمْ يَقْرَبِ الْكَعْبَةَ بَعْدَ طَوَافِهِ بِهَا حَتَّى رَجَعَ مِنْ عَرَفَةَ، وَأَمَرَ أَصْحَابَهُ أَنْ يَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ يُقَصِّرُوا مِنْ رُءُوسِهِمْ ثُمَّ يَحِلُّوا، وَذَلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ بَدَنَةٌ قَلَّدَهَا، وَمَنْ كَانَتْ مَعَهُ امْرَأَتُهُ فَهِيَ لَهُ حَلاَلٌ، وَالطِّيبُ وَالثِّيَابُ. رَوَاهُ البخاری[٤].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە مەدینە سەرو ریشی خۆی چەوركردو شانەی كردن، وە خۆی و هاوڕێیانی سەرو دوو پەشتەماڵ (ئیزارو ریدا)یان لەبەر كردو ئینجا بەرەو مەككەی نازدار كەوتنە ڕێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی لەبەركردنی هەموو جۆرە پەشتەماڵێكی دا، مەگەر ئەوانەی كە زەعفەراناوییەكی وەها بن كە ڕەنگ بدەنەوەو لەش زەردكەن، جا ئەو ڕۆژە چووە ذولحولەیفە، وە شەو لەوێ مایەوە، وە بەیانی سواری وڵاخەكەی بوو، وە ڕۆیشت تا سەركەوتە سەركێوی بەیدا، جا لەوێ خۆی و هاوڕێیانی ئیحرامیان بەست، وە ئەو

[٤] بخاري. حج: ١٥٤٥، ١٦٢٥، ١٧٣١.

وشترە دیارییانە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هێنابوونی، کە لە مەککە بیانکات بە قوربانی، لەوێ نیشانەی کردن و سەرو جووت سۆڵی کردە ملیان، کە ئەمانەی کرد هێشتا لە مانگی ناو جەژنان پێنج ڕۆژی مابوو، وە لە ڕۆژی چوارەمی مانگی قورباندا گەیشتە مەککە، جا تەوافی بەیتی کردو سەعی نێوانی صەفاو مەروەی بەجێ هێنا، وە خۆی ئیحرامی نەشکاند، چونکە وشتری دیاریی (ئەلهەدی)ی هێنابوو لەگەڵ خۆی، ئینجا لە سەرووی مەککەوە، لە کن حەجوون دابەزیو بارگەکەی خست، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەنیا ئیحرامی حەجی بەستبوو، کە تەوافی کەعبەی کرد ئیتر توخنی نەکەوتەوە تا لە کێوی عەرەفە گەڕایەوە، بەڵام فەرمانی دا بە هاوڕێکانی (واتە: بەو کەسانەیان کە وشتری دیاریی و قوربانییان نەهێنابوو لەگەڵ خۆیان) فەرمانی پێکردن: کە تەوافی بەیت بکەن و تەوافی نێوانی صەفاو مەڕوە بکەن و ئینجا مووی سەری خۆیان کورت بکەنەوەو ئیحرام بشکێنن، وە بیکەن بە عەمرە، وە لەم ماوەیەدا کە ئیحرام دەشکێنن تا ئیحرامی حەج دەبەستن ئەوەی ژنی خۆی لەگەڵ بێ وەك جاران بۆی حەڵاڵە، وە هەروەها بۆنی خۆش لە خۆدان و پۆشینی جل و بەرگی ئاساییش! (ب).

١٥١٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنها) قَالَتْ: دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ الزُّبَيْرِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي أُرِيدُ الْحَجَّ وَأَنَا شَاكِيَةٌ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): حُجِّي وَاشْتَرِطِي وَقُولِي اللَّهُمَّ أَنَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي. وَكَانَتْ تَحْتَ الْمِقْدَادِ ابْنِ الأَسْوَدِ. رَوَاهُ الخمسة[٥].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەشریفی چوو بۆ لای ضوباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموطەلیب، ضوباعە گوتی: ئەی ڕەوانەکراوی خودا! دەمەوێ بچم بۆ حەج بەڵام دەترسم لەڕێ نەخۆش کەوم؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بڕۆ بۆ حەج و

---

[٥] بخاري. نكاح: ٥٠٨٩. مسلم. ٢٨٩٤ — ٢٨٩٩. نسائي. مناسك: ٢٧٦٧. أبو داود. مناسك: ١٧٤٣.

مەرج دابنی و بڵێ ئەی خودایە! لەهەر کوێ تۆ نەخۆشت خستم لەوێ ئیحرام دەشکێنم وە ضوباعە ژنی میقدادی کوڕی ئەسوەد بوو (ش/د/ت/ن).

## ٨٨) لەبەیکەکردن: (التلبية)

١٥٢٠- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ قَائِمَةً عِنْدَ مَسْجِدِ ذِى الْحُلَيْفَةِ أَهَلَّ فَقَالَ لَبَّيْكَ: اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ. رَوَاهُ الخمسة وَزَادَ غَيْرُ البخارى: وَكَانَ ابْنَ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) يَقُولُ: كَانَ عُمَرُ يُهِلُّ بِإِهْلاَلِ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ هَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ وَيَقُولُ وَيَزِيدُ: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ لَبَّيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ[1].

ئیبنو عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جاران کە ولاخەکەی سەری دەخستە سەر کێوی بەیدا، لەکن مزگەوتەکەی ذولحولەیفە رادەوەستا ئینجا ئیحرامی دادەبەست واتە: نیەتی چوونە ناو حەجی دەهێنا بە گوتنی ئەم گوتەیە دەیفەرموو:

لَبَّيْكَ: اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ:

پەروەردگارا! هەمیشە کەمەری بەندەگیم بەستووە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی تۆ، تۆ بێ چوون و بێ هاوەڵی سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، وە بەخشش و نازو بەهرەو نیعمەت و دارایی و پاشایی و خاوەنی هەر لەخۆت دێ و هەر لەخۆت جوانە، بێ چوونی و بێ هاوەڵی تۆ ئاشکراو نمایانە (ش/د/ت/ن) بوخاری لێ دەرچێ ئەوانی تریان ئەمەشیان لەم فەرموودەیە پتر

---

[1] بخاري. حج: ١٥٤١، ٢٨٠٨، ٢٨٠٩. مسلم. حج: ٢٨٠٤، ٢٨٠٦. أبو داود. مناسك: ١٧٧١. ترمذی. حج: ٨١٨. نسائی. حج: ٢٧٥٨.

کردووە: جاران عومەر (خودای لێ رازی بێ) (وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)) بەم وشانەی پێشەوە ئیحرامی دەبەست و ئەمەیشی لێ پتر دەکرد:

لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ لَبَّيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ

پەروەردگارا! ئەی خودای من، من هەمیشە ملکەچم بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی تۆ. تا خۆشنوودیی و رەزامەندیی تۆ دەردەست دەکەم، چاکە بە دەستی تۆیە، ئومێدی هەرە گەورەم بە لوتف و کەرەمی تۆیە، هەر کردەوەیێ کە تۆ پەسەندی نەکەی مایە پووچ و فیرۆیە!

١٥٢٠- عَنْ السَّائِبِ الأَنْصَارِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَتَانِي جِبْرِيلُ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي وَمَنْ مَعِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالإِهْلاَلِ أَوْ قَالَ: بِالتَّلْبِيَةِ. رَوَاهُ أصحاب السنن وصححه الترمذي[٢].

سائیبی ئەنصاری (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جوبرائیل (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ لام فەرمووی پێم: کە فەرمان بکەم بە یارانم و بە هەموو ئۆمەتم کە لەکاتی ئیحرام دابەستنی حەج و عەمرەدا بە دەنگی بەرز لەببەیکە بکەن (د/ت:ص/ن).

١٥٢١- عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سُئِلَ أَيُّ الْحَجِّ أَفْضَلُ؟ قَالَ: الْعَجُّ وَالثَّجُّ[٣].

ئەبو بەکری صەدیق (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیارکرا لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) حەج کامەی خێری زۆر ترە؟ فەرمووی: گرمەی دەنگی لەببەیکە کردن و قوربانی کردن! (ت-سند غریب).

١٥٢٢- عَنْ سَهْلٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُلَبِّي إِلاَّ لَبَّى مَنْ عَنْ يَمِينِهِ أَوْ عَنْ شِمَالِهِ مِنْ حَجَرٍ أَوْ شَجَرٍ أَوْ مَدَرٍ حَتَّى تَنْقَطِعَ الأَرْضُ مِنْ هَهُنَا وَهَهُنَا. رَوَاهُ الترمذي[٤].

---

[٢] صحيح عند الترمذي.

[٣] سند غريب (شرحه).

سەهل (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ موسوڵمانێ لەببەیکە دەکات، هەرچی هەیە لە راست‌و لەچەپیەوە (لەبەردو دارو گڵمتك) ئەوانیش بە زمانی حاڵ یا بەزمانی گوتاری خۆیان بۆی دەسەندنەوەو ئەوانیش لەگەڵیا لەببەیکە دەکەن، هەتا نزیکی قیامەت (ت).

١٥٢٣– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرْدَفَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ مِنْ عَرَفَةَ حَتَّى جَاءَ جَمْعاً وَأَرْدَفَ الْفَضْلَ مِنْ جَمْعٍ حَتَّى جَاءَ مِنًى. وَأَخْبَرَنِي الْفَضْلُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ. رَوَاهُ الأربعة[٥].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە موزدەلیفەوە تا مینا فەضلی خستە پاشکۆی خۆی، فەضل هەواڵی بێ دام، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) تا لەکۆگا بەردەکەی جەمرەتولعەقەبە رەجمی شەیتانی تەواو کرد هەر لەببەیکەی دەکرد (ش/د/ت).

١٥٢٤– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُلَبِّي الْمُعْتَمِرُ حَتَّى يَسْتَلِمَ الْحَجَرَ. رَوَاهُ أبو داود والترمذي وصححه[٦].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: عەمرەکەر هەر لەببەیکە دەکا تا دەست دەهێنێ بە بەردە رەشەکە (حجر الاسود)دا (د/ت:ص).

---

[٤] غير مطعون سنده (شرحه).

[٥] بخاري. حج: ١٦٦٩، ١٦٨٥. مسلم. حج: ٣٠٧٦ – ٣٠٧٨. أبو داود. ماسك: ١٨١٥. ترمذی. حج: ٩١٨. نسائی. مناسك الحج: ٩١٨، ٣٠٥٥.

[٦] صحيح عند الترمذي (شرحه).

**٨٩) باسی چوارەم: باسی ئەوەیە: کە حەج و عەمرە بەچەن جۆر دەکرێن، وە ئەوکارو فرمانانەی کە لە حەج و عەمرەدا دەکرێن چین و چۆنن! واتە: باسی جۆرەکانی حەج و عەمرەو کردارەکانیان:**

**جۆری یەکەم: کردنیان بە جیاجیا:**

**الباب الرابع: في أنواع النسك وأعماله: (النوع الأول: الافراد)**

١٥٢٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَفْرَدَ الْحَجَّ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري. ولفظ مسلم. أَهَلَّ بِالْحَجِّ مُفْرِدًا[1].

**عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حەجی بە تەنها کرد واتە: حەجی بەجیا بەبێ عەمرە دابەست (م/د/ت/ن) گفتەی (م): لە پێشدا ئیحرامی حەجی بەجیا دابەست لە پاشا عەمرەیشی تێ خست.**

١٥٢٨- وَعَنْهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ وَأَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْحَجِّ، فَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ أَوْ جَمَعَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لَمْ يَحِلُّوا حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي وَفِي رِوَايَةٍ: لِجَابِرٍ: أَهَلَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابُهُ بِالْحَجِّ مُفْرِدًا[2].

**دیسان گوتی: ساڵی حەجەتولویداع لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) کەوتینەرێ، جا هەمان بوو تەنیا ئیحرامی عەمرەی دا بەستبوو، هەشمان بوو تەنیا ئیحرامی حەجی دابەستبوو، وە هەشمان بوو ئیحرامی حەج و عەمرەیان بەیەکەوە دابەستبوو پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) تەنیا ئیحرامی حەجی دابەست، جا ئەوانەی کە هەر ئیحرامی حەجیان**

---

[1] مسلم. حج: ٢٩١٣. أبو داود. مناسك: ١٧٧٧. الترمذي. حج: ٨٢٠. نسائي. حج: ٢٧١٤.

[2] بخاري. حيض: ٣١٧ (٣١٩) ٣١٦. مسلم. حج: ٢٩٠٣.

دابەستبوو (یا ئیحرامی حەج‌و عەمرەیان پێکەوە دابەستبوو) ئیحرامەکەیان شکاند هەتا ڕۆژی جەژن (ش/د/ن) لە گێڕانەوەیەکی جابیردا (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خۆی‌و یارانی حەجیان بەجیا واتە: بەبێ عەمرە دابەست.

## ٩٠) جۆری دووەم: تەمەتووعە واتە: ئیحرام بەستن بەعەمرە لەپێش کردنی حەجدا : (النوع الثاني: التمتع)

١٥٢٧– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ مُتْعَةِ الْحَجِّ فَقَالَ: أَهَلَّ الْمُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ وَأَزْوَاجُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَأَهْلَلْنَا، فَلَمَّا قَدِمْنَا مَكَّةَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اجْعَلُوا إِهْلاَلَكُمْ بِالْحَجِّ عُمْرَةً إِلاَّ مَنْ قَلَّدَ الْهَدْىَ . فَطُفْنَا بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ وَأَتَيْنَا النِّسَاءَ، وَلَبِسْنَا الثِّيَابَ وَقَالَ: مَنْ قَلَّدَ الْهَدْىَ فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ لَهُ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْىُ مَحِلَّهُ. ثُمَّ أَمَرَنَا عَشِيَّةَ التَّرْوِيَةِ أَنْ نُهِلَّ بِالْحَجِّ، فَإِذَا فَرَغْنَا مِنَ الْمَنَاسِكِ جِئْنَا فَطُفْنَا بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَقَدْ تَمَّ حَجُّنَا، وَعَلَيْنَا الْهَدْىُ قَالَ: اللَّهُ تَعَالَى (فَمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْىِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ) إِلَى أَمْصَارِكُمْ. الشَّاةُ تَجْزِى، فَجَمَعُوا نُسُكَيْنِ فِي عَامٍ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى أَنْزَلَهُ فِي كِتَابِهِ وَسَنَّهُ نَبِيُّهُ وَأَبَاحَهُ لِغَيْرَ أَهْلِ مَكَّةَ، قَالَ: اللَّهُ تَعَالَىَ: (ذَلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِى الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ). رَوَاهُ الثلاثة[1].

پرسیار کرا لە ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) لە بارەی پشوودان (تەمەتتووع)ی حەجەوە، گوتی: لە حەجیماڵئاواییدا کۆچکەران‌و یاریدەدەران‌و هاوسەرانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئیحرامی حەجیان بەست وە ئێمەیش ئیحراممان بەست، جا کە چووینە مەککە پێغەمبەر (درودی

---

[1] بخاري. حج: ١٦٩١. مسلم. حج: ٢٩٠٣.

خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی لە ئێوە حەیوانی دیاری مەککەی نیشانە نەکردووە با حەجەکەی بکا بە عەمرە ئیتر ئێمەیش تەوافی بەیتو تەوافی صەفاو مەڕوەمان کردو مووی سەرمان کورت کردەوەو ئیحراممان شکاندو چووینە لای ژنی خۆمانو وەك جاران جلو بەرگی ئاساییمان پۆشییەوە. وە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویشی: هەر کەسێ دیاریی بەیتی نیشانەکردووە ئەوە نابێ ئیحرام بشکێنێ، هەتا ئەو دیارییە دەگاتە جێگەی خۆیو لەمینا سەر دەبڕێ، ئینجا تاقی ئێوارەی رۆژی هەشتەمی قوربان کەناودارە بەرۆژی تەروییە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێ کردین: کە سەر لەنوێ لەناو مەککەوە ئیحرامی حەج ببەستینەوە، وە کاتێ لە فەرمانەکانی تری حەج بووینە، دیسان بێینەوە بۆ مەککەو دیسان تەوافی بەیتو تەوافی سەفاو مەڕوە بکەین، ئیتر حەجەکەمان تەواو دەبێو دەبین بە خاوەنی یەك عەمرەو یەك حەج، وەلێ سەرو کوشتی وامان دەکەوێتە سەر کە بۆ قوربانی دەست بدا، ئەمەیش ئەوەیە کە خودای گەورە دەفەرموێ:

{فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ}.

هەر کەسێ لەپاش کردنی عەمرە ئیحرامی شکاندو خۆشی وەرگرتەوە تا کاتێ ئیحرامی حەج دادەبەستێ ئەوە چی بۆ هەڵسووڕا ئاژەڵی دەست بدا بۆ قوربانی سەری ببڕێ دەی کەسێ ئاژەڵی دەست نەکەوێ ئەوە پێویستە کە سێ رۆژ بە رۆژوو بێ لەکاتی حەجدا وە حەوت رۆژیش کە گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆتانو چوونەوە ناو کەسو کاری خۆتان جا مەڕێ یا بزنێ بۆ ئەم کوشتییە بۆیەك کەس بەش دەکا ئیتر لەو ساڵەدا هەردوو پەرستش (عیبادەت)ی حەجو عەمرەیان لەیەك وەرزا کۆ کردەوە، وە خودا ئەم حوکمەی لەنامەی خۆیدا ناردۆتە خوارەوەو پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) کردوویە بە یاساو بۆ خەڵکی غەیری مەککە رەوای دیوە، خودا دەفەرموێ:

{ذَلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ}.

ئەم حوکمە کە پێویست بوونی فیدیەیە لەسەر کەسێ تەمەتتوع بکا، بۆ ئەو کەسەیە کە خەڵکی نزیکی مەسجیدولحەرام نەبێ بە کەمتر لە ماوەی کورت کردنەوەی نوێژ (مسافه القصر) (ش/د).

١٥٢٨ – عَنْ أَبِي جَمْرَةَ الضُّبَعِيَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: تَمَتَّعْتُ فَنَهَانِي نَاسٌ عَنْ ذَلِكَ، فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَأَمَرَنِي بِهَا ثُمَّ انطَلَقْتُ إِلَى الْبَيْتِ فَنِمْتُ فَأَتَانِي آتٍ فِي مَنَامِي فَقَالَ: عُمْرَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ. وَحَجٌّ مَبْرُورٌ قَالَ: فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي رَأَيْتُ فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ سُنَّةُ أَبِي الْقَاسِمِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ مسلم والبخاری وزاد: فَقَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ: أَقِمْ عِنْدِي وَأَجْعَلُ لَكَ سَهْمًا مِنْ مَالِي. فَقُلْتُ لِمَ؟ فَقَالَ: لِلرُّؤْيَا الَّتِي رَأَيْتَ[٢].

ئەبو جەمرەی ضوبەعی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێشدا عەمرەم کردو ئینجا پشووم وەرگرت تا کاتی بەستنی ئیحرامی حەج کە بەم کارە، دەگوترێ تەمەتتوع (پشوودان)ی حەج کەچی هەندێ کەس پێیان گوتم شتی وامەکە، منیش چووم پرسیارم کرد لە ئیبنو عەبباس، ئەو گوتی: بیکە، لە پاشا چووم بۆ بەیت و لەوێ خەوتم، جا یەکێ لە خەوما هاتە لام پێی گوتم: عەمرەت گیراوحەت دروست بێ! منیش چوومەوە بۆ لای ئیبنو عەبباس و ئەم خەوەی دیم بۆیم گێڕایەوە، ئەویش گوتی: ئەڵڵاهو ئەکبەر، ئەڵڵاهو ئەکبەر خەونێکی چەند جوانت دیوە پشوودان (تەمەتتوع) سوننەتی پێغەمبەر خۆیەتی (دروودی خودای لەسەربێ) (م/ب) بوخاری (رەحمەتی خودای لێبێ) ئەمەی پترە: ئیبنو عەبباس گوتیشی پێم: بمێنەرەوە لەلام پشکت بۆ دادەنێم لە ماڵەکەم، گوتم: لە بەرچی؟ گوتی لەبەر ئەم خەونە باشەی کە دیوتە!

١٥٢٩ – عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أُنْزِلَتْ آيَةُ الْمُتْعَةِ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَفَعَلْنَاهَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَلَمْ يُحَرِّمْهَا قُرْآنٌ، وَلَمْ يَنْهَ عَنْهَا حَتَّى مَاتَ. رَوَاهُ الشیخان ولکن البخاری فی التفسیر[٣].

---

[٢] بخاري. حج: ١٥٦٧، ١٦٨٨. مسلم. حج: ٣٠٠٥.

[٣] بخاري. حج: ١٥٧١، ٤٥١٨. مسلم. حج: ٢٩٦٢ – ٢٩٦٤.

**عیمرانی کوڕی حوصەین** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: ئایەتی پشوودان‌و حەسانەوە لە نێوانی عەمرەو حەجدا کە ناو دارە بە ئایەتی تەمەتتوعی حەج لە نامەی خوادا هاتۆتە خوارەوە ئێمە خۆمان لەگەڵ حەزرەت خۆیدا** (درودی خودای لەسەربێ) **عەمرەو حەجمان لەسەر ئەو شێوەیە کردووە، وە هەتا حەزرەتیش** (درودی خودای لەسەربێ) **کۆچی دوایی کرد ئەم کارە لەسەر ئەم شێوەیە وەك خۆی مابوو، وە نە قورئان قەدەغەی کردبوو، وە نە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **یاساخی کردبوو (ش).**

## ٩١) جۆری سێیەم: قیرانە. واتە: کردنی حەج‌و عەمرە بەیەکەوە:

## النوع الثالث: القران

**١٥٣٢- عَنْ أَنَسٍ** (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) **قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللّٰهِ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **بِالْمَدِينَةِ الظُّهْرَ أَرْبَعًا، وَالْعَصْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ بَاتَ بِهَا حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ رَكِبَ حَتَّى اسْتَوَتْ بِهِ عَلَى الْبَيْدَاءِ، حَمِدَ اللّٰهَ وَسَبَّحَ وَكَبَّرَ، ثُمَّ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ، وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهِمَا، فَلَمَّا قَدِمْنَا أَمَرَ النَّاسَ فَحَلُّوا، حَتَّى كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ أَهَلُّوا بِالْحَجِّ قَالَ: وَنَحَرَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **بَدَنَاتٍ بِيَدِهِ قِيَامًا، وَذَبَحَ بِالْمَدِينَةِ كَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ. رَوَاهُ البخاری وأبو داود وأحمد**[1].

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **کە چوو بۆ حەجی ماڵئاوایی لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆی بە چوار رکات کرد، ئینجا کەوتە رێ کە گەیشتە ذولحولەیفە لەوێ نوێژی عەصری بەقەصر بە دوو رکات کرد، ئینجا شەو لەوێ مایەوە هەتا بەیانی، ئینجا سواربوو رۆیشت تا وڵاخەکەی سەری خستە سەرشاخی بەیدا، جا لەوێ سوپاس‌و ستایشی خودای کردو سوبحانەڵلاو ئەڵلاهو ئەکبەری کرد، ئینجا بە تەلبییەی پێشوو ئیحرامی**

---

[1] تقدم تخريجه فی الرقم: ١٥٢٣/٣ من تسلسل (٨٢).

حەج و عەمرەی بەیەکەوە بەست و خەڵکەکەیش ئیحرامی حەج و عەمرەیان بەست، بەڵام کە چوونە مەککە فەرمانیکرد بە خەڵکەکە ئیحرامیان شکاند، ئینجا لە ڕۆژی هەشتەمی مانگی قوربان، کە دەکاتە ڕۆژی تەرویە، ئەوانەی کە ئیحرامیان شکاندبوو سەرلەنوێ ئیحرامی حەجیان بەستەوە. گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە دەستی خۆی چەند وشترێکی سەربڕی لە مەککە، لەکاتی سەربڕینەکەدا وشترەکان بەپێوە ڕاوەستابوون لەسەر سێ پێ. کە گەڕاشەوە بۆ مەدینە دوو بەرانی تەوی سەربڕی و کردی بە قاوەڵتی بە بۆنەی گەڕانەویەوە لە حەج (ت/د/ئەحمەد).

١٥٣٣- وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُلَبِّي بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ جَمِيعاً يَقُولُ لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا. رَوَاهُ الأربعة[٢].

دیسان گوتی: خۆم گوێم لێبوو لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئیحرامی حەج و عەمرەی بەیەکەوە دابەست و فەرمووی: نییەتمە ئیحرامی عەمرەو حەج دادەبەستم بۆ خودا (ش/د/ت).

١٥٣٤- عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِوَادِي الْعَقِيقِ يَقُولُ: أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتٍ مِنْ رَبِّي فَقَالَ: صَلِّ فِي هَذَا الْوَادِي الْمُبَارَكِ وَقُلْ عُمْرَةً فِي حَجَّةٍ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود وأحمد[٣].

عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە شیوی عەقیق گوێم لێبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم شەو فریشتەیێ لەلایەنی پەروەردگارمەوە هات بۆ لام فەرمووی پێم: لەم شێوە پیرۆزەدا نوێژبکە وە بڵێ: ئەوا ئیحرامی عەمرەم لەگەڵ حەجا بەیەکەوە بەست (ب/د/ئەحمەد).

---

[٢] بخاري. حج: ١٥٦٣، ١٥٦٩. مسلم. حج: ٣٠١٨، ٣٠١٩. أبو داود. مناسك: ١٧٩٥. نسائي. مناسك: ٢٧٢٨.

[٣] بخاري. حج: ١٥٣٤، ٢٢٣٧، ٧٣٤٣.

١٥٣٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيُهِلَّ بِالْحَجِّ مَعَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ لاَ يَحِلَّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعًا. رَوَاهُ الثلاثة[٤].

عائیشه (خودای لیّ رازی بیّ) گوتی: پیّغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیّ) فەرمووی: هەرکەسیّ دیاریی مەککەی پیّیە با ئیحرامی حەج و عەمرە پیّکەوە ببەستیّ، بەلاّم ئیتر نابیّ ئیحرام بشکیّنیّ تا هەردووکیان تەواو دەکاو ئیحرامی هەردووکیان بەیەکەوە دەشکیّنیّ (ش/د).

١٥٣٦- عَنْ مُطَرِّفٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: لِي عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ: أُحَدِّثُكَ حَدِيثًا عَسَى اللَّهُ أَنْ يَنْفَعَكَ بِهِ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَمَعَ بَيْنَ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ ثُمَّ لَمْ يَنْهَ عَنْهُ حَتَّى مَاتَ وَلَمْ يَنْزِلْ فِيهِ قُرْآنٌ يُحَرِّمُهُ وَقَدْ كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ حَتَّى اكْتَوَيْتُ فَتُرِكْتُ ثُمَّ تَرَكْتُ الْكَيَّ فَعَادَ. رَوَاهُ مسلم في التمتع[٥].

موطەرریف (خودای لیّ رازی بیّ) گوتی: عیمرانی کوڕی حوصەین (خودای لیّ رازی بیّ) پیّی گوتم: فەرموودەیەکت بۆ دەگیّڕمەوە، هیوایەکە خودا بیکا بە مایەی سوودو قازانج بۆت: پیّغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیّ) خۆی حەج و عەمرەی بە یەکەوە کردووە، وە هەتا خۆشی کۆچی دوایی کرد (دروودی خودای لەسەربیّ) ئەم کارە لەسەر ئەم شیّوەیە وەك خۆی مابوو، نە پیّغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیّ) لەپیّش مەرگیا یاساخی کردبوو، وە نە قورئان قەدەغەی کردبوو وە من جاران مەیاسیریم بوو، جا هەتا خۆم لە بەرباری خودادا رادەگرت و رازی دەبووم بە قەزای خودا فریشتە لە خەلوەتی دا دەهاتن بۆلام و سلاویان لیّ دەکردم، بەلاّم کە خۆم داخ دەکردو خۆم دەرمان دەکرد ئیتر نە دەهاتن بۆ لام و سلاویان لیّ نەدەکردم هەتا وازم لە خۆتیمارکردن و خۆ داخکردن هیّنا ئیتر سەرلەنویّ سلاو کردنی فریشتە لەمن دەستی پیّ کردەوە! (م).

---

[٤] بخاري. حج: ١٥٥٦، ١٦٣٨. مسلم. حج: ٢٩٠٢ – ٢٩٠٤. أبو داود. مناسك: ١٧١٨.

[٥] مسلم. حج: ٢٩٦٤.

١٥٣٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَرَنَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ فَطَافَ لَهُمَا طَوَافًا وَاحِدًا. رَوَاهُ الترمذي وحسنه[٦].

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **حەج و عەمرەی بەجووت پێکەوە کرد، وە یەك تەوافی کرد بۆ هەردوو لایان (ت:ح = تیرمیذی ڕیوایەتی کردووە بە حەسەنی داناوە).**

## ٩٢) تێکەڵکردنی عەمرەو حەج: (إدخال الحج على العمرة)

١٥٣٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنها) قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَقَالَ: مَنْ أَرَادَ مِنْكُمْ أَنْ يُهِلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ فَلْيَفْعَلْ وَمَنْ أَرَادَ أَنْ يُهِلَّ بِحَجٍّ فَلْيُهِلَّ وَمَنْ أَرَادَ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهِلَّ فَأَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْحَجِّ وَأَهَلَّ بِهِ نَاسٌ مَعَهُ وَأَهَلَّ نَاسٌ بِالْعُمْرَةِ وَالْحَجِّ وَأَهَلَّ نَاسٌ بِعُمْرَةٍ وَكُنْتُ مِمَّنْ أَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ. ثُمَّ قَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيُهِلَّ بِالْحَجِّ مَعَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ لاَ يَحِلَّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعًا فَقَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَائِضٌ، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: انْقُضِي رَأْسَكِ وَامْتَشِطِي، وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ، وَدَعِي الْعُمْرَةَ. فَفَعَلْتُ فَلَمَّا قَضَيْنَا الْحَجَّ أَرْسَلَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ إِلَى التَّنْعِيمِ فَاعْتَمَرْتُ فَقَالَ: هَذِهِ مَكَانُ عُمْرَتِكِ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[١].

**عاعیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: لە حەجی ماڵئاواییدا لەگەڵ پێغەمبەردا** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەرچووین. فەرمووی: هەر کەس دەیەوێ ئیحرامی حەج و عەمرە بەیەکەوە دابەستێ با وابکا، هەر کەسەیش دەیەوێ ئیحرامی حەج بە تەنیا (یا ئیحرامی عەمرە بە تەنیا) دابەستێ ئەوە ئارەزووی خۆیەتی. پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **خۆی بەس ئیحرامی حەجی بەست، وە**

---

[٦] حسن عند الترمذي.

[١] تقدم تخريجه في رقم: ١٥٣٣/٢ (مترجم).

کەسانێکی تریش لەگەڵ ئەودا تەنیا، ئیحرامی حەجیان بەست، دەستەیەکیش ئیحرامی هەردوولایان پێکەوە بەست، کەسانێکیش بەس ئیحرامی عەمرەیان بەست، من خۆم یەکێك بووم لەوانە کە تەنیا ئیحرامی عەمرەیان بەستبوو، لەپاشا کە چووینە مەککە لەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ دیاریی بەینی هاپێ با حەج‌و عەمرە بەیەکەوە دابەستێ، ئیتر ئیحرام، نەشکێنێ هەتا هەردووکیان تەواو دەکاو ئیحرامی هەردووکیان بەیەکەوە دەشکێنێ جا من کە گەیشتمە مەککە بێنوێژبووم لەبەر ئەوە تەوافی بەیت‌و تەوافی صەفاو مەڕوەم نەکرد، جا کەسکاڵای ئەم حاڵەم لەلای پێغەمبەر کرد (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: قژەکەت هەڵوەشێنەوەو شانەی بکەو ئیحرامی حەج ببەستەو واز لە عەمرە بێنە منیش ئاوام کرد. جا کاتێ کە حەجمان تەواو کرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەگەڵ عەبدولڕەحمانی براما ناردمی بۆ تەنعیم لەوێوە ئیحرامی عەمرەم بەستەوە جا کە عەمرەکەم تەواو کرد حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم عەمرەیە لە جیاتی عەمرەکەی پێشوو (ش/د/ن).

## ٩٣) شەومانەوە لە ذی طەوا وە چوونە ناو مەککە بە ڕۆژ:
## المبيت بذي طوى ودخول مكة نهارا

١٥٣٩- عَنْ نَافِعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ لاَ يَقْدُمُ مَكَّةَ إِلاَّ بَاتَ بِذِي طُوًى حَتَّى يُصْبِحَ وَيَغْتَسِلَ ثُمَّ يَدْخُلُ مَكَّةَ نَهَارًا. وَفِي رِوَايَةٍ: ١٧٦٩ - وَإِذَا نَفَرَ مَنْ مَكَّةَ مَرَّ بِذِي طُوًى وَبَاتَ بِهَا حَتَّى يُصْبِحَ، وَكَانَ يَذْكُرُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَعَلَهُ. زاد في رِواية: وَمُصَلَّى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى أَكَمَةٍ غَلِيظَةٍ أَسْفَلَ مِنَ الْمَسْجِدِ الَّذِي بُنِيَ هُنَاكَ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[1].

---

[1] بخاري. صلاة: ٤٨٤. ١٥٥٣، ١٥٥٤، ١٥٧٣، ١٥٧٤. مسلم. حج: ٣٠٣٥. نسائى. حج: ٢٨٦٢. أبو داود. مناسك: ١٨٦٥.

**نافیع** (خودای لێ خۆش نوود بێ) **گوتی: گشت جارێ کە ئیبنو عومەر دەهات بۆ مەککە شەو دەمایەوە لە ذی طەوا وە بەیانی لەوێ خۆی دەشۆرد، ئینجا بەرۆژ دەهاتە ناو مەککە لە گێڕانەوەیەکا: کە لە مەدینە دەردەچوو لە ذی طەواوە دەڕۆیشت، وە شەو لەوێ دەمایەوە هەتا بەیانی وە دەیگوت: پێغەمبەر خۆشی** (دروودی خودای لەسەربێ) **ئاوەهای دەکرد.**

**لە گێڕانەوەیەکا ئەمەشی پترە: نوێژگاکەی پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **لەسەر تەپۆڵکەیەکی قەویلکەبوو، لە خوار ئەو مزگەوتەوە کە ئێستا لەوێ دروست کراوە! (ش/د/ن).**

**١٥٤٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ** (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **دَخَلَ مَكَّةَ مِنْ كَدَاءٍ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا الَّتِي بِالْبَطْحَاءِ، وَيَخْرُجُ مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى. رَوَاهُ الخمسة[٢].**

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ - رەزای خودایان لێبێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە کەدائەوە دەڕۆیشتە ناو شاری مەککەوە، واتە: لە دانەی ژووروەوە کە پێی دەگوترێ: ثەنییەتولعولیا کە وا لەناو بەطحادا، وە لە دانەی خوارووشەوە کە پێی دەگوترێ: ثنییەتول سوفلا لە مەککە دەردەچوو (ش/د/ت/ن).**

## ٩٤) تەوافی بەیت واتە: حەوت جار هەڵسووڕان لەسەر شێوەی ئایین بە دەوری کەعبەدا : (الطواف بالبيت)

**قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ}.**

**خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: فەرمانمان دا بە ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی، کە ئەم ماڵی منە دەروناوی پاك بکەنەوە لە**

---

[٢] بخاري. حج: ١٥٧٦. مسلم. حج: ٣٠٣٠. أبو داود. مناسك: ١٨٦٦. نسائی. مناسك: ٢٨٦٥.

**هەرشتێ کە نەگونجێ لەگەڵ بەندەگی و موناجاتی خودادا، بۆ ئەو کەسانە کە بەشێوەی ئایین هەڵدەسووڕێن بە دەوریا، وە یا لەناویا دەمێننەوە بۆ بەندەیی خودا وە بۆ ئەو کەسانە کە نوێژی تیا دەکەن، وە روکوع و کوڕنووش دەبەن بۆ خودای مەزن.**

**١٥٣٩- عَنْ عَائِشَةُ (رَضِي اللَّهُ عَنها) قَالَتْ: أَوَّلُ شَيْءٍ بَدَأَ بِهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ أَنَّهُ تَوَضَّأَ ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ. رَوَاهُ البخاري[1].**

**عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کە تەشریفی چوو بۆ مەککە یەکەم شت کە کردی ئەوە بوو: دەستنوێژی گرت و هەڵسووڕا بە دەوری کابەدا (ب).**

**١٥٤٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا طَافَ فِي الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ أَوَّلَ مَا يَقْدَمُ فَإِنَّهُ يَسْعَى ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ بِالْبَيْتِ ثُمَّ يَمْشِي أَرْبَعَةً ثُمَّ يُصَلِّي سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ يَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ. رَوَاهُ الخمسة ولفظ الترمذي: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَكَّةَ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَاسْتَلَمَ الْحَجَرَ ثُمَّ مَضَى عَلَى يَمِينِهِ فَرَمَلَ ثَلاَثًا وَمَشَى أَرْبَعًا ثُمَّ أَتَى الْمَقَامَ فَقَالَ: (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَالْمَقَامُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ ثُمَّ أَتَى الْحَجَرَ بَعْدَ الرَّكْعَتَيْنِ فَاسْتَلَمَهُ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّفَا أَظُنُّهُ قَالَ: (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ). وَفِي رِوَايَةٍ: كَانَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا طَافَ طَوَافِهِ الأَوَّلِ خَبَّ ثَلاَثاً وَمَشَى أَرْبَعاً[2].**

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: یاسای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **وابوو کە دەچوو بۆ حەج و عەمرە، کە دەگەیشتە مەککە لە پێشا تەوافی بەیتی دەکرد بەم شێوەیە: سێ جار بە هەڕاکردن دەسووڕایەوە بە دەوری بەیتاو چوار جاریش بە رۆیشتنی ئاسایی، ئینجا دوو رکات نوێژی سوننەتی تەوافی دەکرد،**

---

[1] بخاري. حج: ١٦١٤، ١٦١٥، ١٦٤١، ١٦٤٢، ١٧٩٦.

[2] بخاري. حج: ١٦١٦، ١٦٠٣، ١٦٠٤، ١٦١٧، ١٦٤٤. مسلم. حج: ٣٠٣٧، ٣٠٣٨، ٣٠٣٩. أبو داود. مناسك: ١٨٩٣. نسائي. مناسك: ٢٩٤١.

ئینجا تەوافی نێوانی صەفاو مەڕوەشی دەکرد (ش/د/ت/ن) گفتەی (ت): کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گەیشتە مەککە ڕۆیشت بۆناو مزگەوت و دەستی هێنا بە حەجەرولئەسوەددا ئینجا بەلای راستی خۆیا بایدایەوەو سێ جار بە هەڕاکردن هەڵسووڕا بە دەوری بەیتاو چوار جاریش بە ڕۆشتنی ئاسایی، ئینجا چوو بۆ مەقامی ئیبراهیم و ئەم ئایەتەی خوێند:

{وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى}.

وە پێمان گوتن مەقامی ئیبراهیم بکەن بە جێگە نوێژ بۆ خۆتان و ئەو شوێنە پیرۆزەیە بکەن بە نوێژگاو نوێژی سوننەتی تیا بکەن ئینجا دوو رکات نوێژی سوننەتی تەوافی کرد، لە نوێژەکەدا مەقامی ئیبراهیم کەوتە نێوانی پێغەمبەرو نێوانی بەیتەوە، ئینجا ڕۆشتەوە بۆ لایحەجەرولئەسوەدو سەرلەنوێ دەستی پیا هێنایەوە ئینجا ڕۆیشت بۆ صەفا، وا دەزانم کە لە صەفا نزیک بۆوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ}.

تەپۆڵکەی صەفاو مەروە نیشانەی بەندەیی خودان لەکاتی حەج و عەمرەدا. لە گێڕانەوەیەکا: دەستووری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وابوو کە تەوافی یەکەمی دەکرد سێ جار بەلۆقە هەڵدەسووڕا بە گردی کابەداو چوار جاریش بەڕۆیشتنی ئاسایی.

١٥٤٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابُهُ فَقَالَ: الْمُشْرِكُونَ إِنَّهُ يَقْدَمُ عَلَيْكُمْ، وَقَدْ وَهَنَهُمْ حُمَّى يَثْرِبَ. وَأَمَرَهُمُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يَرْمُلُوا الأَشْوَاطَ الثَّلاَثَةَ، وَأَنْ يَمْشُوا مَا بَيْنَ الرُّكْنَيْنِ، وَلَمْ يَمْنَعْهُ أَنْ يَأْمُرَهُمْ أَنْ يَرْمُلُوا الأَشْوَاطَ كُلَّهَا إِلاَّ الإِبْقَاءُ عَلَيْهِمْ. وَزاد فِي رِوَايَةٍ: فَقَالَ: الْمُشْرِكُونَ: هَؤُلاَءِ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّ الْحُمَّى قَدْ وَهَنَتْهُمْ هَؤُلاَءِ أَجْلَدُ مِنْ كَذَا وَكَذَا. رَوَاهُ الخمسة[٣].

---

[٣] بخاري. حج: ١٦٠٢، ٤٢٥٦. مسلم. حج: ٣٠٤٨. أبو داود. مناسك: ١٨٦٦، ١٨٨٦. نسائي. مناسك: ٢٩٤٥.

**ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خودایان لێبێ) **دەڵێ: لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا کە پێغەمبەرو یارانی هاتن بۆ کردنی عەمرە هاوبەشپەداکەرەکان گوتیان: وا تاقمەیەك دێن بۆلاتان لە ڕزوتای مەدینە کزی کردوون! پێغەمبەریش** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمانی بە یارانی کرد: کە لەسێ سەری پێشەوەی تەوافدا بە لۆقە بڕۆن و چالاکی و هێزی خۆیان نیشانی دوژمن بدەن تا چاو ترسێنیان بکەن بەڵام لە نێوانی دوو ڕوکنە یەمانییەکانا بە ڕۆیشتنی ئاسایی بڕۆن تا لەو ماوەیەدا کەمێ بحەسێنەوە، چونکە لەوێدا لە بتپەرستەکانەوە دیارنەبوون! بۆیەیش فەرمانی پێنەدان کە هەر حەوت جارەکەی تەواف بە لۆقە بڕۆن نەبادا بەهۆی ئەوەوە تەواو شپرزەیان بکا.. لە گێڕانەوەیەکا: ئەمەشی پتر کردووە: جا هاوبەشپەیدا کەرەکان گوتیان: بەمانەتان دەگوت: گوایە لەڕزو تا کە نەفتی کردوون چاکی کە نەفت نەکردوون خۆ ئەوەتانێ لە هەموو کەس ئازاو نەبەردترن! (ش/د/ت/ن).**

**١٥٤٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) **قَالَتْ شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **أَنِّي مَرِيضَةٌ فَقَالَ: مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ. فَطُفْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **يُصَلِّي إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ، وَهُوَ يَقْرَأُ (وَالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ). رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٤].**

**ئوممو سەلەمە** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: عەرزی حەزرەتم کرد** (درودی خودای لەسەربێ) **کە نەخۆشم، فەرمووی: لەپاش خەڵکەکەوە بە سواری تەواف بکە جا لەوکاتەدا کەمن تەوافم دەکرد پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **لە تەنشتی کەعبەوە نوێژی دەکرد، وە سوورەتی (والطور وکتاب مسطور) دەخوێند (ش/د/ن).**

---

[٤] **بخاري. صلاة: ٤٦٤، ١٩١٩، ١٩٢٦، ١٦٣٣، ٤٨٥٣. مسلم. حج: ٣٠٦٧. أبو داود. مناسك: ١٨٨٢. نسائی. مناسك: ٢٩٢٥، ٢٩٢٧.**

## ٩٥) دەستهێنان بە حەجەرولئەسوەدو بە هەردوو گۆشە یەمانییەکان و بە مولتەزەم دا سوننەتە: (إستلام الحجر والرُّكنين والملتزم)

١٥٤٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: نَزَلَ الْحَجَرُ الأَسْوَدُ مِنَ الْجَنَّةِ وَهُوَ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ فَسَوَّدَتْهُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ[1].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەردە رەشەکە (حەجەرولئەسوەد) کە لە بەهەشت هاتە خوارەوە وەك چڕی شیر سپی بوو، ئیتر بەرە بەرە گوناهی ئادەمیزاد لەکاتی دێنی کردنیا ئاوا رەشی کرد (ت:ح. واتە: تیرمیذی گێڕاویەتەوە بە حەدیسێکی حەسەنی داناوە).

١٥٤٦- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِي الْحَجَرِ وَاللَّهِ لَيَبْعَثَنَّهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ يَشْهَدُ عَلَى مَنِ اسْتَلَمَهُ بِحَقٍّ. رَوَاهُمَا الترمذي وحسنهما[2].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەشانی بەردە رەشەکە (حەجەرولئەسوەد)دا فەرمووی: بەخودا لە رۆژی قیامەتدا خودا ئەم بەردە زیندوو دەکاتەوە، حاڵی وایە دوو چاوی هەیە شتیان پێ دەبینێ، وە زمانی هەیە گوفتوگۆی پێ دەکا، شایەتی دەدا بۆ ئەو کەسانەی کە بە ساغی و بە راست و دروستی دەستیان پیا هێناوە و دیدەنییان کردووە (ت:ح).

١٥٤٧- عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ جَاءَ إِلَى الْحَجَرِ الأَسْوَدِ فَقَبَّلَهُ، فَقَالَ: إِنِّي أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لاَ تَضُرُّ وَلاَ تَنْفَعُ، وَلَوْلاَ أَنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُقَبِّلُكَ مَا قَبَّلْتُكَ. رَوَاهُ الخمسة[3].

---

(1) حسن عند الترمذي.

(2) حسن عند الترمذي.

(3) بخاري. حج: ١٦٠٥، ١٦١٠. مسلم. حج: ٣٠٥٦، ٣٠٥٧ — ٣٠٦١. أبو داود. مناسك: ١٨٧٣. ترمذی. حج: ٨٦٠. نسائی. مناسك الحج: ٢٩٣٧.

عومەر (خودای لێ رازی بێ) چوو بۆ لای حەجەرولئەسوەدو ماچی کردو گوتی: من دەزانم کە تۆ بەردێکیت نەزیانت هەیەو نە سوود بەڵام ئەوەندە هەیە من خۆم پێغەمبەرم دیوە کە تۆی ماچ دەکرد، بۆیە منیش ماچت دەکەم، ئەگینا ماچم نەدەکردیت (ش/د/ت/ن).

١٥٤٨- وَقَالَ: ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) لَمْ أَرَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَلِمُ مِنَ الْبَيْتِ إِلاَّ الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ. وَفِي رِوَايَةٍ: طَافَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى بَعِيرٍ، يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ. رَوَاهُ الخمسة. وَفِي رِوَايَةٍ: كُلَّمَا أَتَى الرُّكْنَ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ فِي يَدِهِ وَكَبَّرَ[٤].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: نەم دیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەست بهێنێ بە هیچ شوێنێکی بەیتدا، جگە لە دوو گۆشە یەمانییەکان.. لە گێڕانەوەیەکدا: لە حەجی ماڵ ئاواییدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە سواری وشترێ تەوافی بەیتی دەکرد، وە بەگۆچانێ دەستی دەهێنا بە گۆشەی حەجەرولئەسوەددا (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: هەموو جارێ کە دەگەیشتە لای روکنی حەجەرولئەسوەد دارێکی بە دەستەوە بوو، جا لەو ئاستە بە دارەکە (ئاماژە) ئیشارەی دەکرد بۆ حەجەرولئەسوەدو دەیفەرموو {اللَّهُ أَكْبَر}.

١٥٤٩- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: طُفْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ ثُمَّ مَضَى حَتَّى اسْتَلَمَ الْحَجَرَ وَأَقَامَ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْبَابِ فَوَضَعَ صَدْرَهُ وَوَجْهَهُ وَذِرَاعَيْهِ وَكَفَّيْهِ هَكَذَا وَبَسَطَهُمَا بَسْطًا ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَفْعَلُهُ. رَوَاهُ أبو داود وابن ماجه[٥].

لە عەمری کوڕی شوعیبەوە (خودایان لێ رازی بێ) لە باوکیەوە گوتی: لەگەڵ عەبدوڵلادا تەوافم دەکرد، عەبدوڵلا چوو دەستی هێنا بە بەردەکەداو راوەستا

---

[٤] بخاري. حج: ١٦٠٧، ١٦١٢، ١٦١٣، ١٦٣٢، ٥٢٩٣. مسلم. حج: ٣٠٦٢. نسائي. حج: ٢٩٥٤.

[٥] سكت عنه الشارح.

لە بەینی گۆشەی حەجەرولئەسوەدو دەرگای کەعبەدا، جاسینگ و دەمووچاوو هەردوو بالاو هەردوو لەپی خۆی دانا لە سەری و هەردوو باڵی خۆی تەواو بلاو کردەوەو گوتی: خۆم دیتم کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوای دەکرد (د/ ئیبنو ماجە. خودایان لێ رازی بێ).

١٥٥٠- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ صَفْوَانَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: : لَمَّا فَتَحَتْ مَكَّةَ قُلْتُ: لأَلْبَسَنَّ ثِيَابِي وَكَانَتْ دَارِي عَلَى الطَّرِيقِ فَلأَنْظُرَنَّ كَيْفَ يَصْنَعُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَانْطَلَقْتُ فَرَأَيْتُ قَدْ خَرَجَ مِنَ الْكَعْبَةِ هُوَ وَأَصْحَابُهُ قَدِ اسْتَلَمُوا الْبَيْتَ مِنَ الْبَابِ إِلَى الْحَطِيمِ وَقَدْ وَضَعُوا خُدُودَهُمْ عَلَى الْبَيْتِ وَرَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَسْطَهُمْ. رَوَاهُ أبو داود[٦].

عەبدوڕەحمانی کوڕی صەفوان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کاتێ فەتحی مەککە کرا گوتم: با جلەکانم لەبەر بکەم و بچم بزانم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چۆن دەکا، کە چووم روانیم وا خۆی و هاوڕێکانی لەناو کەعبە هاتوونەتە دەرەوەو خەریکن دەست دەهێنن بە دیواری بەیتاو ماچی دەکەن، ئەو ماوەیە لە دەرگای کابەوە بوو هەتا حەطیم، دیتم روومەتی خۆیان لەسەر دیواری کەعبە دانابوو پێغەمبەریش خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) لەناویاندا بوو (د).

١٥٥١- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَرَأَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي رَكْعَتَي الطَّوَافِ بِسُورَتَي الإِخْلاَصِ (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) وَ (قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ). رَوَاهُ الترمذي وأحمد ومسلم.

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە دووڕکاتە نوێژە سوننەتەکەی تەوافدا ئەم دوو سوورەتەی خوێند کە ناودارن بە دوو سوورەتی ئیخلاص، واتە: سوورەتی {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ} و سوورەتی {قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ} (ت/ئەحمەد/موسلیم).

---

[٦] سكت عنه الشارح.

## ٩٦) مەرجی تەواف چییە: (شرط الطواف)

**١٥٥٠-** عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهَا) قَالَتْ: قَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَائِضٌ، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، قَالَتْ فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: افْعَلِي كَمَا يَفْعَلُ الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَّى تَطْهُرِي. رَوَاهُ الأربعة[1].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کە گەیشتمە مەککە بێ نوێژبووم، ئیتر نە تەوافی بەیتم کردو نە صەفاو مەڕوەم کرد، وە عەرزی پێغەمبەرم کرد کە حاڵم وایە، فەرمووی: هەرچی حاجی دەیکا تۆیش بیکە، بەڵام تەواف مەکەو بە دەوری بەیتا هەڵمەسووڕێ تا پاك دەبیتەوە لە بێنوێژیو خۆت پاك دەشۆیت (ش/د/ت).

**١٥٥١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَنِي أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ فِي الْحَجَّةِ الَّتِي أَمَّرَهُ عَلَيْهَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْلَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ يَوْمَ الْنَّحْرِ فِي رَهْطٍ يُؤَذِّنُ بِمِنىً النَّاسِ أَنْ لاَ يَحُجُّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ وَلاَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي والحاكم[2].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەوحەجەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەبو بەکری کردبوو بە سەرداری حەج، کە بەر لەحەجی ماڵ ئاواییی بوو، لەو حەجەدا ئەبو بەکر منی لەگەڵ دەستەیەکی تردا نارد، رۆژی جەژن جاڕماندا: ئیتر لەمساڵ بەدواوە بتپەرستو هاوبەشپەیداکەر نەیەن بۆ حەج، وە کەسیش نابێ بەرووتی تەوافی بەیت بکا (ش/ت).

**١٥٥٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الطَّوَافُ حَوْلَ الْبَيْتِ مِثْلُ الصَّلاَةِ إِلاَّ أَنَّكُمْ تَتَكَلَّمُونَ فِيهِ فَمَنْ تَكَلَّمَ فِيهِ فَلاَ يَتَكَلَّمَنَّ إِلاَّ بِخَيْرٍ. رَوَاهُ الترمذي والحاكم[3].

---

[1] بخاري. حيض: ٣٠٥. مسلم. حج: ٢٩١١.

[2] بخاري. صلاة: ٣٦٩، ١٦٢٢، ٣١٧٧، ٤٣٦٣، ٢٦٥٥، ٤٦٥٦، ٤٦٥٧. مسلم. حج: ٣٢٧٤. نسائي. حج: ٢٦٥٩.

[3] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ خۆش نوودبێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: تەوافی بەیت و هەڵسووڕانی دەوری وەك نوێژ وایەو هەمان مەرجی هەیە کە مەرجی نوێژە تەنیا ئەوە نەبێ کە ئێوە لە تەوافا قسە دەکەن بەڵام لە ناونوێژا قسەی دنیایی ناکرێ جا ئەو کەسەی کە لەکاتی تەوافدا قسە دەکا با هەر قسەی باش بکاو بەس (ت-س/ح-حاکم).

## ٩٧) گەڕان و هاتوچۆی نێوانی صەفاو مەڕوە: (السعي بين الصفا والمروة)

١٥٥٣- عَنْ عَاصِمٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قُلْتُ لأَنَسٍ: أَكُنْتُمْ تَكْرَهُونَ السَّعْيَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ. لأَنَّهَا كَانَتْ مِنْ شَعَائِرِ الْجَاهِلِيَّةِ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا). رَوَاهُ الشيخان[1].

عاصیم (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بەئەنەسم گووت: (خودای لێ رازی بێ) ئایا لە پێشدا راکردنی نێوانی صەفاو مەڕوەتان پێ ناخۆش بوو؟ گوتی: بەڵێ، چونکە ئەمە لەپێشدا یەکێك بوو لە دروشمەکانی ئایینی سەردەمی نەزانی، بەڵام کە خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ئیتر کردنی صەفاو مەڕوە بوو بەسوونەت، ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ:

{إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا}.

تەپۆڵکەی صەفاو تەپۆڵکەی مەڕوە نیشانەی بەندەیی خودان و لە نیشانەکانی ئایینی خودان لەکاتی حەج و عەمرەدا، دەی هەر موسوڵمانێ حەجی خانەی خودا بکا یا عەمرە بکاوە تەوافی کابە بکا، ئەوە بەوە گوناهی ناگا لە ناوەندیاندا، هاتووچۆبکا (ش=بوخاری و موسلیم. رەحمەتی خودایام لێبێ).

---

[1] بخاري. حج: ١٦٤٨، ٤٤٩٦. مسلم. ٣٠٧٣، ٣٠٦٨ - ٣٠٧٣.

١٥٥٤- وَقَالَ: عُرْوَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قُلْتُ لِعَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا) إِنِّى لأَظُنُّ أَنَّ رَجُلاً لَوْ تَرَكَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ لَمْ يَضُرُّهُ قَالَتْ: وَلِمَ؟ قُلْتُ: لإِنَّ اللّٰهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللّٰهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا) مَا أَتَمَّ اللّٰهُ حَجَّ امْرِئٍ وَلاَ عُمْرَتَهُ لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَلَوْ كَانَتْ كَمَا تَقُولُ لَكَانَتْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَطَّوَّفَ بِهِمَا. وَهَلْ تَدْرِى فِيمَا كَانَ ذَاكَ؟ إِنَّ الأَنْصَارَ كَانُوا يُهِلُّونَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ لِصَنَمَيْنِ عَلَى شَطِّ، يُقَالُ لَهُمَا إِسَافٌ وَنَائِلَةٌ. ثُمَّ يَجِيئُونَ فَيَطُوفُونَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ ثُمَّ يَحْلِقُونَ. فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلاَمُ كَرِهُوا أَنْ يَطُوفُوا بَيْنَهُمَا لِلَّذِى كَانُوا يَصْنَعُونَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ قَالَتْ فَأَنْزَلَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللّٰهِ) إِلَى الآيَةَ فَطَافُوا. وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَتْ: لَهُ: بِئْسَمَا قُلْتَ يَا ابْنَ أُخْتِي طَافَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَطَافَ الْمُسْلِمُونَ فَكَانَتْ سُنَّةً. رَوَاهُ الخمسة. ولفظ البخارى: إِنَّمَا أُنْزِلَتْ الأَنْصَارِ، كَانُوا قَبْلَ أَنْ يُسْلِمُوا يُهِلُّونَ لِمَنَاةَ الطَّاغِيَةِ الَّتِي كَانُوا يَعْبُدُونَهَا عِنْدَ الْمُشَلَّلِ، فَكَانَ مَنْ أَهَلَّ لَهَا يَتَحَرَّجُ االطَّوَافَ بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَلَمَّا أَسْلَمُوا سَأَلُوا رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ذَلِكَ، فَنَزَلَتِ الآيَةَ. قَالَ: أَبُو بَكْرٍ: فَأَسْمَعُ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي الْفَرِيقَيْنِ كِلَيْهِمَا فِي الَّذِينَ كَانُوا الْجَاهِلِيَّةِ يَتَحَرَّجُونَ أَنْ يَطُوفُوا بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَالَّذِينَ يَطُوفُونَ بِهِمَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ ثُمَّ تَحَرَّجُوا ذَلِكَ فِي الإِسْلاَمِ[٢].

عوروە (خودای گەورەی لێ راوزی بێ) گوتی: بە عائیشەم گوت (خودای لێ رازی بێ): بەخودا وادەزانم ئەگەر پیاوێ لەکاتی حەج و عەمرەدا نەش گەڕێ لە ناوەندی صەفاو مەڕوەدا گوناهی ناگا؟ گوتی: بۆ؟ گوتم: چونکە خودای گەورە دەفەرموێ:

{إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا}.

---

[٢] بخاري.. تفسير: ١٦٤٣، ١٧٩٠، ٤٤٩٥، ٤٨٦١. مسلم. حج: ٣٠٦٨ – ٣٠٧٣. ترمذى. تفسير: ٢٩٦٥. نسائى. حج: ٢٩٦٧.

ئەویش گوتی: هەر کەسێ لە ناوەندی صەفاو مەڕوەدا هاتۆچۆ نەکا ئەوە خودا نە حەجی تەواو دەکاو نە عەمرەی، وە ئەگەر وەك تۆ دەڵێیت ئاوابێ دەبێ ئایەتەکە ئاوابێ:

{فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا}.

گوناهی ناگا کە لەناوەندیان هاتۆچۆ نەکا. دەزانی بۆ ئەم ئایەتە لەسەر ئەم شێوەیە هاتە خوارەوە: چونکە لە پێشا یاریدەران (ئەنصار) لە سەردەمی نەزانیدا ئیحرامی حەجیان دەبەست بۆ دووبت کە ناویان ئیساف و نائیلە بوو، وە لەسەر رۆخی دەریابوو (؟) ئینجا دەهاتن و هاتۆچۆی ناوەندی صەفاو مەڕوەیان دەکرد، لەپاشا سەری خۆیان دەتاشی، جا لەبەر ئەمە کە ئایینی ئیسلام هات پێیان ناخۆش بوو کە وەك سەردەمی نەزانی هاتوو چۆ بکەن لە ناوەندیانا، تا خودای گەورەو سەروەر ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە:

{إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ}.

تا کۆتایی ئایەتەکە. ئیتر ئەوانیش دەگەڕان لە ناوەندیانا لە گێڕانەوەیەکا: عائیشە پێی گوت: ئەم قسەی تۆ کردت گەلێ خراپ بوو ئەی خوشکەزای خۆم! چونکە پێغەمبەری خودا بۆ خۆی (درودی خودای گەورەی لەسەربێ) ئەم هاتۆچۆیەی کردووەو موسوڵمانانیش کردوویانەو کەواتە بووە بە یاساو سوننەت و پەیڕەوی ئیسلامەتی! (ش/د/ت/ن) گفتەی (ب=بوخاری) ئاوایە: بەڵام ئەم ئایەتە لەشانی یاریدەدەراندا هاتە خوارەوە، ئەوان لەپێش ئیسلام بوونیاندا جاران ئیحرامی حەجیان بۆ بوتێ دەبەست کە ناوی مەنات بوو، موسوڵمانان ناویان نا مەناتی طاغیە واتە: مەناتی سەرکەش، چونکە خەڵکێکی زۆری گومرا کردبوو ئەم بتە لەلای موشەللەلابوو، لەویدا دەیان پەرست، جا ئەوانەی کە ئیحرامی حەجیان بۆ ئەم بتە سەرکەشە دەبەست ئیتر دوورە پارێزیان لە تەوافی صەفاو مەڕوە دەگرت هەتا توخنی بتەکانی خەڵکی مەککە نەکەون کە ناویان ئیساف و نائیلەبوو، ئیساف لە سەرتەپۆڵکەی صەفا بوو، وە نائیلە لەسەر تەپۆڵکەی مەڕوە بوو جا کاتێ کە

ئیسلام بوون لەم بارەیەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد (دروودی خودای لەسەربێ) وە بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە وە ساخبۆوە کە تەوافی نێوانی صەفاو مەڕوە پێویستە. ئەبو بەکر کە زوهرییە بۆ ئەم ئایەتە پرسیاری لێکرد گوتی: من بیستوومە لە زانایانی ئایین کە ئەم ئایەتە دەربارەی هەردوو دەستەکە هاتۆتە خوارەوە، واتە: هەم دەربارەی ئەوانە کە لە سەردەمی نەزانیدا دوورە پارێزیان دەگرت لە تەوافی صەفاو مەڕوەو بەگوناهیان دەزانی، وە هەم دەربارەی ئەوانیش کە لەسەردەمی نەزانیدا تەوافی صەفاو مەڕوەیان دەکرد، بەڵام لەسەردەمی ئیسلامەتیدا ئەمەیان بەگوناه دەزانی و نەیان دەکرد

١٥٥٥– عَنِ ابْنَ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيـهِ وَسَلَّمَ) فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا، وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، وَطَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعاً، وَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ. وَفِي رِوَايَةٍ: وَكَانَ يَسْعَى بِبَطْنِ الْمَسِيلِ إِذَا طَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ. رَوَاهُ الخمسة إلا أبا داود[٣].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە هات بۆ مەککە حەوت جار بە دەوری بەیتدا هەڵسووڕا، وە لە پشتی مەقامی ئیبراهیمەوە دوو رکات نوێژی سوننەتی تەوافی کرد، وە حەوت جاریش لە ناوەندی صەفاو مەڕوەدا هاتوچۆی کرد. ئینجا بۆ ئەوەی کە بەباشی بزانین کە ئەمە یاسای ئایینە ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ}.

بێگومان کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕەهبەرو سەرمەشقێکی هەرە جوانە بۆ ئێوە، وە شایانی ئەوەیە کە پیاوانە پەیڕەوی خوو ڕەوشتە جوانەکانی و کردەوە باشەکانی بکەن، هەنگاو بە هەنگاوو بست بەبست.. لە

---

[٣] بخاري. صلاة: ٣٩٥، ١٦٢٣، ١٦٢٧، ١٦٤٥، ١٦٤٧، ١٧٩٣. مسلم. حج: ٢٩٨٩. نسائي. حج: ٢٩٣٠، ٢٩٦٠، ٢٩٦٦.

گێڕانەوەیەکا: وە لەکاتی تەوافی صەفاو مەڕوەدا بەناو بەطنول مەسیلدا رای دەکرد (ش/ت/ن).

**١٥٥٦- وَقَالَ: جَابِرٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَكَّةَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعاً وَقَالَ: (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) فَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ ثُمَّ أَتَى الْحَجَرَ فَاسْتَلَمَهُ ثُمَّ قَالَ: نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ. فَبَدَأَ بِالصَّفَا وَقَرَأَ (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ). رَوَاهُ النسائى والترمذى وصححه[٤].**

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کە هات بۆ مەککە، حەوت جار هەڵسووڕا بە دەوری خانەی خودادا، وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە:**

**{وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى}.**

**ئینجا لە پشتی مەقامەوە دوو رکات نوێژی سوننەتی تەوافی کرد، ئینجا چوو بۆلای حەجەرولئەسوەدو دەستی پیاهێنا، ئینجا فەرمووی: ئەوە پێش دەخەین کە خودا پێشی خستووە ئینجا لە صەفاوە دەستی کرد بە تەواف و ئەم ئایەتەی خوێندەوە:**

**{إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ}.** (د/ت:ص).

## ٩٨) نزاو پاڕانەوەو ویردی کاتی تەواف و کاتی هاتوچۆی نێوانی صەفاو مەڕوە: (الذكر والدعاء في الطواف والسعي)

**١٥٥٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنها) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّمَا جُعِلَ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ وَرَمْيُ الْجِمَارِ لِإِقَامَةِ ذِكْرِ اللَّهِ تَعَالَى. رَوَاهُ أبو داود وأحمد والترمذى وصححه[١].**

---

[٤] صحيح عند المسائى والترمذى.

[١] صحيح عند الترمذي.

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەڵسووڕانی دەوری خانەی خوداو هاتوچۆ لەناوەندی صەفاو مەڕوەداو رەجمی شەیتان، بۆ ئەوە دانراون کە هەمیشە یادکردنی خودای گەورە پایە داربێ (د/ئەحمەد/ت:ص).

١٥٦٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ بَيْنَ الرُّكْنِ الْيَمَانِيِّ وَالْحَجَرِ: (رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ). رَوَاهُ أحمد وأبو داود والحاكم وصححه[٢].

عەبدوڵلای کوڕی سائیب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: گوێم لێبوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەناوەندی گۆشەی یەمانی و حەجەرولئەسوەدا، دەیفەرموو:

(رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ).

خودایە! هەم لە جیهاناو هەم لە دوارۆژدا چاکمان بۆ بکەو بەشی باشمان بدەرێ، وە لەسزای ئاگر بمان پارێزە (ئەحمەد/حاکم:ص).

١٥٥٩- وللشافعي: قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ كَيْفَ نَقُولُ إِذَا اسْتَلَمْنَا الْبَيْتَ؟ قَالَ: قُولُوا بِسْمِ اللهِ وَاللهُ أَكْبَرُ إِيمَاناً بِاللهِ وَتَصْدِيقاً لِمَا جَاءَ بِهِ مُحَمَّدٌ[٣].

شافیعی (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوترا: ئەی رەوانەکراوی خودا! لەکاتی دەستهێنان بە کەعبەتۆڵلادا چی بڵێین؟ فەرمووی: بڵێن:

بِسْمِ اللهِ وَاللهُ أَكْبَرُ إِيمَاناً بِاللهِ وَتَصْدِيقاً لِمَا جَاءَ بِهِ مُحَمَّدٌ:

بەناوی خودا، وە خودا لە هەموو کەسێ گەورەترە بۆیەش ئەمە دەکەین چونکە باوەڕمان بەخودا هەیەو بەهەرچیش کە موحەممەد هێناویەتی لەلای خوداوە.

---

[٢] صحيح عند الحاكم.

[٣] سكت عنه الشارح.

**١٥٦٠- وللبزار: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّكِ والشِّرْكَ وَالنِّفَاقِ وَالشِّقَاقِ وَسُوءِ الأَخْلَاقِ[٤].**

**گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەمیشە دەیفەرموو:**

**اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّكِ والشِّرْكَ وَالنِّفَاقِ وَالشِّقَاقِ وَسُوءِ الأَخْلَاقِ:**

**پەروەردگارا! پەنا دەگرم بەتۆ لە بەدگومانی و لە هاوبەشپەیداکردن بۆتۆو لە ناپاکی و دووڕوویی و لە دووبەرەکی نانەوەو لە بەد خوویی! (بەززار)[١].**

**١٥٦٣- وَلِابْنِ مَاجَه عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَكِّلَ بِالرُّكْنِ الْيَمَانِيِّ سَبْعُونَ مَلَكاً، فَمَنْ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ العَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، قَالُوا آمِينَ[٥].**

---

[٤] سكت عنه الشارح.

[١]

**ناپاک کەسێکە بەدەم موسوڵمان**

**بە دڵ دوشمنی گەلی موسوڵمان**

**بۆ قوتاربوونی سەری، دەفرۆشێ**

**گیانی شیرینی بەچەن قورۆشێ**

**خانەی بەهەشتی خۆی وێران دەکا**

**بۆ چەن رۆژێکی دنیای بێ بەقا**

**لەم چەرخەی ئێمە نەماوە ناپاک!!**

**دەزانی بۆچی ئەی کاکەی دڵپاک!**

**چونکە موسوڵمان قەدری نەماوە**

**رۆژی ناپاکە لەهەر چار لاوە!**

- وەرگێڕ- ١٩٨٧/٩/١٦

**گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: خودا حەفتا فریشتەی لەسەر گۆشەی یەمانی داناوەو ڕایسپاردوون کە هەر کەسێ لەوێدا ئەم نزایە بکا ئەوان بڵێن ئامین، نزاکەیش ئەمەیە:**

اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ العَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ:

**خودایە! داوای لێبووردن و چاوپۆشی و سەر فرازی هەردوو جیهانت لێ دەکەم، ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئێمە هەمیشە چاومان لە ڕێژەی خوانی تۆوەیە، ساتۆیش بە کردەوەی خۆمانمان لەگەڵ مەکە، بەڵکوو بەلوتف و کەرەمی خۆت هەم لە جیهاناو هەم لە پاشە ڕۆژدا بەشمان بدە لە بەشی جوان، وە بمان پارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ! (ئیبنو ماجە).**

١٥٦٤- ولابن ماجه أيضاً: مَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا وَلاَ يَتَكَلَّمُ إِلاَّ بِسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَقُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ مُحِيَتْ عَنْهُ عَشْرُ سَيِّئَاتٍ وَكُتِبَتْ لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ وَرُفِعَ لَهُ بِهَا عَشْرُ دَرَجَاتٍ[٦].

**حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: کەسێ حەوت جار بەدەوری خانەی خودادا هەڵسووڕێ و قسەی تر نەکا جگە لەم نزایە، دە خراپە لە خراپەکانی کوێر دەکرێتەوەو دە چاکەی بۆ دەنووسرێ و دە پایەیش پێی بەرز دەبێتەوە، نزاکەیش ئەمەیە:**

**پاکی لە هەموو کەمی و کەموکوورییەك بۆ خودایە، لەگەڵ سوپاس و ستایش، هەر یەزدانی پاك خودای ڕاست و دروستەو خودای تر نیە، خودا لە هەموو کەسێ گەورە ترە، دەستەڵات و هێزیش هەر بە دەستی خودایە (ئیبنو ماجە).**

---

(٥) سكت عنه الشارح.

(٦) سكت عَن درجته الشارح.

## ٩٩) جووتكار (قارين) واتە: كەسێ حەج و عەمرە بخاتە پاڵ یەك و بەیەكەوە بیانكات ئەوە یەك تەواف و یەك هاتۆچۆی بەسە بۆ هەردوولا

## يكفي للقارن طواف واحد وسعي واحد

**١٥٦٥- عَنْ ابْنَ عُمَرَ** (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) **قَالَ: أَصْنَعَ كَمَا صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **إِنِّي أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ عُمْرَةً. ثُمَّ خَرَجَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِظَاهِرِ الْبَيْدَاءِ قَالَ: مَا شَأْنُ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ إِلاَّ وَاحِدٌ، أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ حَجًّا مَعَ عُمْرَتِي. وَأَهْدَى هَدْيًا اشْتَرَاهُ بِقُدَيْدٍ وَلَمْ يَزِدْ عَلَى ذَلِكَ، فَلَمْ يَنْحَرْ، وَلَمْ يَحِلَّ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، وَلَمْ يَحْلِقْ وَلَمْ يُقَصِّرْ حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ، فَنَحَرَ وَحَلَقَ، وَرَأَى أَنْ قَدْ قَضَى طَوَافَ الْحَجِّ، وَالْعُمْرَةِ بِطَوَافِهِ الأَوَّلِ. وَقَالَ: هَكَذَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). **رَوَاهُ الشيخان**[1].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: من وەك پێغەمبەر خۆی** (دروودی خودای لەسەربێ) **حەج و عەمرە دەكەم: ئێوە بەشایەت بن: كەوا ئیحرامی عەمرەم بەست و لەسەر خۆم پێویست كرد. لەپاشا كەوتەڕێ هەتا گەیشتە بەیداء، لەوێ گوتی: كارو باری حەج و عەمرە وەك یەكە لەوەدا كە دروستە ئیحرام بشكێنرێ لەكاتی قەدەغەكردن (ئیحصار)دا ئێوە دەكەم بە شایەت كەوا ئیحرامی حەجیشم دابەست لەگەڵ عەمرەكەما وە ئەویشم لەسەر خۆم فەرزكرد، وە دیاریشی لەگەڵ خۆی برد بۆ بەیت، ئاژەڵە دیارییەكانی لە قەدید كڕی، ئیتر نە ئاژەڵە دیارییەكانی سەربڕی، وە نەئیحرامی شكان بە كردنی شتێ لەوشتانەی كە بەهۆی ئیحرام بەستنەوە قەدەغە دەبن (وە نەسەری تاشی، وە نەمووی سەری كورت كردەوە، هەتا ڕۆژی جەژن، ئەوسا ئاژەڵە دیارییەكانی سەربڕی و سەری خۆی تاشی. وە باوەڕی وابوو كە بەتەوافی یەكەم تەوافی حەج و عەمرەی جێبەجێ كردووە وە گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **ئاوەهای دەكرد (ش).**

---

[1] بخاري. حج: ١٦٣٩، ١٦٤٠، ١٦٩٣، ١٧٠٨، ١٧٢٩، ١٨٠٦، ١٨٠٧، ١٨٠٨، ١٨١٠، ١٨١٢، ١٨١٣، ٤١٣٠، ٤١٨٤، ٤١٨٥. مسلم. حج: ٢٩٨٢. نسائي. حج: ٢٧٤٥.

١٥٦٤- وَقَالَ: جَابِرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) لَمْ يَطُفِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلاَ أَصْحَابُهُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ إِلاَّ طَوَافًا وَاحِدًا، طَوَافَهُ الأَوَّلَ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[٢].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی و ئەو هاوڕێیانەی کە دیاریی بەیتیان پێبوو یەك طەوافی صەفاو مەڕوەیان کرد کە ئەویش تەوافی یەکەم بوو یەك تەواف حەوت جار هەڵسووڕانە یە دەوری کەعبەدا، یا حەوت جار هاتۆچۆکردنە لە نێوانی صەفاو مەڕوەدا (م/د/ت/ن).

١٥٦٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: فَطَافَ الَّذِينَ كَانُوا أَهَلُّوا بِالْعُمْرَةِ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ حَلُّوا، ثُمَّ طَافُوا طَوَافًا آخَرَ بَعْدَ أَنْ رَجَعُوا مِنْ مِنًى، وَأَمَّا الَّذِينَ جَمَعُوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ فَإِنَّمَا طَافُوا طَوَافًا وَاحِدًا. رَوَاهُ البخاري.

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جا ئەو کەسانە کە تەنیا ئیحرامی عەمرەیان بەستبوو تەوافی بەیتیان کردو هاتوچۆی نێوانی صەفاو مەڕوایان کردو ئیتر ئیحرامیان شکاند، لە پاشدا کە لەمینا گەڕانەوە تەوافێکی ترو هاتۆچۆیەکی تریانکرد بۆ حەجەکەیان بەڵام ئەو کەسانە کە ئیحرامی حەج و عەمرەیان بەیەکەوە بەستبوو تەنیا یەك تەواف و یەك هاتوچۆیان کرد (ب).

١٥٦٨- وَعَنْهَا (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَهَا: طَوَافُكِ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ يَكْفِيكِ لِحَجَّتِكِ وَعُمْرَتِكِ. رَوَاهُ أبو داود ومسلم[٤].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێم: تەوافەکەی بەیت و هاتوچۆکەی نێوانی صەفاو مەڕوەت بەستە بۆ حەجەکەشت و بۆ عەمرەکەشت (د/م).

---

[٢] مسلم. حج: ٢٩٣٤، ٣٠٧٤، ٣٠٧٥. أبو داود مناسك: ١٨٩٥. نسائی. مناسك: ٢٩٨٦.

[٤] مسلم. حج: ٢٩٢٦.

**١٠٠) بێنوێژو زەیستان هەموو فەرمانەکانی حەج و عەمرە دەکەن، تەنیا طەوافی بەیت نەبێ: (الحائض والنفساء تعملان المناسك كلها إلا الطواف بالبيت)**

١٥٦٧ - عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ نَذْكُرُ إِلاَّ الْحَجَّ حَتَّى جِئْنَا سَرِفَ فَطَمِثْتُ فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا أَبْكِي فَقَالَ: مَا يُبْكِيكِ؟ فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ خَرَجْتُ الْعَامَ قَالَ: مَا لَكِ لَعَلَّكِ نَفِسْتِ. قُلْتُ نَعَمْ. قَالَ: هَذَا شَيْءٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ افْعَلِي مَا يَفْعَلُ الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَّى تَطْهُرِي. قَالَتْ: فَلَمَّا قَدِمْتُ مَكَّةَ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأَصْحَابِهِ: اجْعَلُوهَا عُمْرَةً فَأَحَلَّ النَّاسُ إِلاَّ مَنْ كَانَ مَعَهُ الْهَدْيُ قَالَتْ: فَكَانَ الْهَدْيُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَذَوِي الْيَسَارَةِ ثُمَّ أَهَلُّوا حِينَ رَاحُوا قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ طَهَرْتُ فَأَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَفَضْتُ قَالَتْ: فَأُتِينَا بِلَحْمِ بَقَرٍ. فَقُلْتُ مَا هَذَا فَقَالُوا أَهْدَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ نِسَائِهِ الْبَقَرَ. فَلَمَّا كَانَتْ لَيْلَةُ الْحَصْبَةِ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَرْجِعُ النَّاسُ بِحَجَّةٍ؟ وَعُمْرَةٍ وَأَرْجِعُ بِحَجَّةٍ؟ قَالَتْ: فَأَمَرَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ فَأَرْدَفَنِي عَلَى جَمَلِهِ حَتَّى جِئْنَا إِلَى التَّنْعِيمِ فَأَهْلَلْتُ مِنْهَا بِعُمْرَةٍ جَزَاءً بِعُمْرَةِ النَّاسِ الَّتِي اعْتَمَرُوهَا (وَالتَّنْعِيمُ أَقْرَبُ بُقْعَةٍ مِنْ أَرْضِ الْحِلِّ إِلَى الْحَرَمِ. رَوَاهُ الخمسة[1].

**عائشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) دەرچووین بۆ حەج، وە بەتەمای عەمرە نەبووین، کە گەیشتینە سەریف لەوێ من بێنوێژکەوتم و دەستم کرد بەگریان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بەسەرما دەگریام فەرمووی: بۆ دەگری؟ گوتم: بەخوا حەزم دەکرد کە ئەمساڵ نەهاتمایە بۆ حەج، فەرمووی: رەنگە بێنوێژبیت؟ گوتم: بەڵێ. فەرمووی: ئەمە شتێکە خودا نووسیویەتی لەسەر کچانی ئادەم و سووچی تۆی تیا نییە جا هەرچی حاجی دەیکا تۆیش بیکە، بەڵام تەوافی بەیت مەکە تاپاک دەبیتەوە عائیشە گوتی: جا کە گەیشتینە مەککە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە**

---

(١) بخاري. حج: ١٧٨٦، ١٧٨٤، ٢٩٨٥. مسلم. حج: ٢٩٢٨، ٢٩١٠، ٢٩١١، ٢٩٢١، ٢٩٢٥، ٢٩٢٧، ٢٩٢٩.

هاورێیانی خۆی فەرموو: بیکەن بەعەمرە ئیتر خەڵکەکە ئیحرامیان شکان، مەگەر ئەو کەسانە نەبێ کە ئاژەڵی دیاریی بەیتیان پێ بوو. گوتی: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) دیاریی پێبوو، وە ئەبو بەکرو عومەریش دیارییان پێبوو، هەروەها دەوڵەمەندەکانیش دیارییان پێبوو، جا دیسانەوە کە تاقی ئێوارەی رۆژی تەرویەکەوتنەوە رێ ئیحرامی حەجیان دابەستەوە. گوتی: رۆژی جەژن لە بێنوێژیی پاك بوومەوە، جا گۆشتی گایان بۆ هێنایین، گوتم: ئەم گۆشتە هی چییە؟ گوتیان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گای کردووە بە قوربانی بۆ هاوسەرەکانی. جا شەوی حەصبە (ناوی شوێنێکە) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم خەڵکە هەموو حەج‌و عەمرەشیان کردووە، تەنیا من نەبێ، کە هەر حەجم کردووە؟! گوتی: پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بە ئەورەحمانی برام، ئەویش لە پاشکۆی وشترەکەی خۆیدا بردمی تا چووینە تەنعیم، جا لەوێ ئیحرامی عەمرەم بەست لەباتی ئەو عەمرەیەی کە خەڵکەکە کردبوویان تەنعیم نزیکترین هەرێمی خاکی حیللە لەخاکی حەرمەوە (ش/د/ت/ن).

## ١٠١) رۆیشتن بۆ ئیستگای عەرەفات، وە عەرەفات هەمووی ئیستگایە السير إلى عرفة وكلها موقف

١٥٦٨– عَنْ أَنَسَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) أَنَّهُ سُئِلَ زَهُوَ يَسِيرُ مَنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ فِي هَذَا الْيَوْمِ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ فَقَالَ: كَانَ يُهِلُّ مِنَّا الْمُهِلُّ فَلاَ يُنْكِرُ عَلَيْهِ، وَيُكَبِّرُ مِنَّا الْمُكَبِّرُ فَلاَ يُنْكِرُ عَلَيْهِ. رَوَاهُ الشيخان والنسائى[١].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) لە میناوە دەڕۆیی بۆ عەرەفات، لێیان پرسی: لەم رۆژەدا کە لە خزمەتی حەزرەتدا دەبوون چیتان دەکرد؟ گوتی: هەمان بوو تەلیلەی دەکردو، هەمان بوو (اللّٰهُ أكْبَر)ی دەکرد هەمان بوو تەلبییەی دەکرد،

---

[١] بخاري. عيدين: ٩٧٠، ١٦٥٩. مسلم. حج: ٣٠٨٥. نسائي. حج: ٣٠٠٠.

هەمان بوو تەسبیحاتی دەکرد کەسیش لێی نەدەگرتین و نەیدەگوت ئەمەیان بکەن و ئەوەیان مەکەن (ش/ن).

١٥٦٩– عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَدْ نَحَرْتُ هَا هُنَا وَمِنًى كُلُّهَا مَنْحَرٌ فَانْحَرُوا فِي رِحَالِكُمْ وَوَقَفْتُ هَا هُنَا وَعَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ وَوَقَفْتُ هَا هُنَا وَجَمْعٌ كُلُّهَا مَوْقِفٌ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[٢].

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر چەند من خۆم لێرانەدا قوربانیم سەربڕی، بەڵام خاکی مینا هەمووی جێگەی قوربانی سەربڕینە وە لەهەر کوێدا بۆتان لووا لەوێدا قوربانی خۆتان سەربڕن هەر چەند من خۆم لێرانەدا ڕاوەستاوم بەڵام خاکی عەرەفات هەمووی ئیستگایەو جێگەی ڕاوەستانە، وە هەرچەند من خۆم لێرانەدا ڕاوەستاوم لە موزدەلیفە بەڵام خاکی موزدەلیلفە هەمووی ئیستگایەو جێگای ڕاوەستانە (م/د/ت/ن = موسلیم، ئەبو داوود، تیرمیذی، نەسائی (خودایان لێ ڕازی بێ).

١٥٧٠– عَنْ يَزِيدَ بْنِ شَيْبَانَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَانَا ابْنُ مِرْبَعٍ الأَنْصَارِيُّ وَنَحْنُ بِعَرَفَةَ فِي مَكَانٍ بَعِيدٍ عَنِ الإِمَامِ فَقَالَ: إِنِّي رَسُولُ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَيْكُمْ يَقُولُ لَكُمْ: قِفُوا عَلَى مَشَاعِرِكُمْ فَإِنَّكُمْ عَلَى إِرْثٍ مِنْ إِرْثِ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ. رَوَاهُ أصحاب السنن وحسنه الترمذي[٣].

یەزیدی کوڕی شەیبان (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە عەرەفە بووین، شوێنەکەمان دوور بوو لە پێغەمبەری پێشەواوە (درودی خودای لەسەربێ) جا ئیبنو میربەعی ئەنصاری هات بۆ ناومان گوتی: من ڕابەری پێغەمبەرم (درودی خودای لەسەربێ) منی ناردووە بۆلای ئێوە دەفەرموێ پێتان: هەرکەس لە مەڵبەندی خۆی ڕاوەستێ واتە: هەر کەس لە ئێستگای خۆی کە ئێستا لێیەتی باراوەستێ و نەڵێ من دوورم لە پێشەواوەو لە میرو سەردارانی حەجەوەو

---

[٢] مسلم. حج: ٢٩٤٣. أبو داود. مناسك: ١٩٠٧، ١٩٠٨. نسائي. حج: ٣٠١٥.

[٣] حسن عند النسائي والترمذي.

**بابچمە پێشەوە، چونکە ئێرە (لەبەر دووری) خێری کەمە! باکەس ئەم خەیاڵە نەکا، چونکی خاکی عەرەفات گشتی ئیستگایە سەرەڕای ئەمەیشە ئەم مەڵبەندو ئیستگایانە گشتیان بەکەلەپوور لە ئیبراهیمی بابەگەورەتانەوە، بەجێماون بۆتان (د/ن/ت– تیرمذی بەحەسەنی داناوە).**

**١٥٧١– عَنْ عَائِشَةَ** (رَضِي اللَّهُ عَنهُمْ) **قَالَتْ: كَانَتْ قُرَيْشٌ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا يَقِفُونَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَكَانُوا يُسَمَّوْنَ الْحُمْسَ، وَكَانَ سَائِرُ الْعَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَاتٍ، فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلاَمُ أَمَرَ اللَّهُ نَبِيَّهُ** (صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **أَنْ يَأْتِيَ عَرَفَاتٍ، ثُمَّ يَقِفَ بِهَا ثُمَّ يُفِيضَ مِنْهَا، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى {ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ}. رَوَاهُ الخمسة والله أعلم[٤].**

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: جاران قوڕەیش و ئەوانەی لەسەر ئایینی قوڕەیش بوون، لەموزدەلیفە ڕادەوەستان، وە پێیان دەگوتن: حومس واتە: دلێرەکان وە عەرەبەکانی تریش لە عەرەفە ڕادەوەستان، جا کاتێ کە ئایینی ئیسلام هات خودای گەورەو سەروەر فەرمانی کرد بە پێغەمبەری خۆی کە بڕوات بۆ خاکی عەرەفات، لەوێ ڕاوەستێ و لەپاشا لەوێوە داپەڕن و بڕۆن بۆ موزدەلیفەو مەشعەرولحەرام و مینا وەك خودا لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ}.**

**واتە: ئێوەیش وەکی موسوڵمانانی تر هەر لەخاکی عەرەفاتدا ڕاوەستن و هەر لەوێشەوە داڕژێن و وەرنەخوارەوە بۆ موزدەلیفەو کاتێ لەلای مەشعەرولحەرامدا یادو ذیکری خوداتان کرد ئینجا لەوێوە بڕژێنە خوارەوە بۆ مینا (ش/د/ت/ن– شەیخەین، ئەبو داوود، تیرمیذی، نەسائی –** خودایان لێ ڕازی بێ).

## ١٠٢) نزاو پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفە گیرایە: (الدعاء يوم عرفة مقبول)

**١٥٧٤– عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ** (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: خَيْرُ الدُّعَاءِ دُعَاءُ يَوْمِ عَرَفَةَ. رَوَاهُ الترمذي وأحمد[١].**

---

[٤] بخاري. تفسير: ٤٥٢٠، ١٦٦٥. مسلم. حج: ٢٩٤٥. أبو داود. مناسك: ١٩١٠. نسائي. حج: ٣٠١٢.

[١] سكت عنه الشارح.

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لەباوکیەوە لە باپیریەوە (خودایان لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: باشترین نزاو پاڕانەوەو دوعا نزاو پاڕانەوەو دوعای ڕۆژی عەرەفەیە (ت/ئەحمەد).

١٥٧٥- وَخَيْرُ مَا قُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ[٢].

لە شەرحەکەیدا دەڵێ: لە گێڕانەویەکی ئەم حەدیثەی عەمری کوڕی شوعەیبدا ئەمەشی پترە: فەرمووشی (دروودی خودای لەسەربێ): وە باشترین وتارێ کە منو پێغەمبەرەکانی پێش من وتوومانە ئەمەیە:

لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير:

هەر خودا خودایەو تاکو تەنیایە، بێ هاوەڵو بێ چوونە، پاشاییو داراییو سوپاسو ستایش هەر لەخۆی جوانەو هەر لەخۆی دێ! وەشت نیە کە لە دەستی دەربچێو هەموو شتێ بۆ ئەو ئاسانە!

١٥٧٤- وَقَالَ: أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) كُنْتُ رَدِيفَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِعَرَفَاتٍ فَرَفَعَ يَدَيْهِ يَدْعُو فَمَالَتْ بِهِ نَاقَتُهُ فَسَقَطَ خِطَامُهَا فَتَنَاوَلَ الْخِطَامَ بِإِحْدَى يَدَيْهِ وَهُوَ رَافِعٌ يَدَهُ الأُخْرَى. رَوَاهُ النسائى[٣].

ئوسامەی کوڕی زەید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە عەرەفات لە پاشکۆی پێغەمبەردا بووم (دروودی خودای لەسەربێ) هەردوو دەستی بەرزکردەوەو دەستی کرد بە پاڕانەوە، جا لەوکاتەداوشترەکەی لەترێکی پێدا هەوسارەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە، جا بەدەستێکی هەوسارەکەی هەڵگرتەوەو ئەو دەستەکەی تریشی هەر هەڵبڕیبوو! (ن).

---

[٢] سكت عنه الشارح.

[٣] جميع ما فى النسائى صحيح (مقدمة الشرح).

## ١٠٣) كەسێ فریای عەرەفات نەكەوێ حەجی لە دەست دەچێ
## یفوت الحج بفوت عرفة

١٥٧٥- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي يَعْمَرَ الدِّيلِيِّ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ بِعَرَفَةَ فَجَاءَ نَفَرٌ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ فَأَمَرُوا رَجُلاً فَنَادَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَيْفَ الْحَجُّ فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً فَنَادَى فِي النَّاسِ الْحَجُّ الْحَجُّ يَوْمُ عَرَفَةَ مَنْ جَاءَ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ مِنْ لَيْلَةِ جَمْعٍ فَتَمَّ حَجُّهُ أَيَّامُ مِنًى ثَلاَثَةٌ فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[1].

عەبدوڕەحمانی كوڕی یەعمەری دیلی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: چووم بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە عەرەفە بوو، دەستەیەكی خەڵكی حەج هاتن گوتیان بە پیاوێ بانگی پێغەمبەری كرد: كە حەج چۆنە؟

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمانی كرد بە پیاوێ، بەناو خەڵكەكەدا بانگەوازی هەڵدا: حەج بریتییە لە ڕۆژی عەرەفە، كەسێ شەوی موزدەلیفە لەپێش نوێژی بەیانیدا بێ بۆ ئێرە بۆ عەرەفات ئەوە حەجەكەی تەواوەو فریای حەج كەتووە، ڕۆژەكانی میناش سێ ڕۆژن، بەڵام بۆ كەسێ پەلە بكاو لە پاش ڕەجمی شەیتان لە ڕۆژی دووەما دەرچێ، ئەوە دروستەو تاوانی لەسەر نیە، وە هەر كەسێكیش دواكەوێ تا ڕۆژی سیانزە دیسان تاوانی لەسەر نیە[1] (د/ت/ن).

---

[1] جميع ما فى الحجتبى للنسائى صحيح عند النسائى (مقدمة شرح التاج الجامع للأصول).

[1] لێرانەدا ئەمەوێ كەشتێ، یا سەرنجێ تۆماربكەم كە زۆرتر پەیوەندی بەزمانی كوردییەوە هەیە، هەتا بەتەرجەمەی ئەم حەدیثەوە:

خوێنەری هێژا! یەكەم سەرنجی سەرپێیی واچاوەڕوان دەكرا كە بگوترایە: (گوناهی ناگا) نەك (تاوانی لەسەر نیە) ئەمە ڕاستە بەڵام ئەگەر بمانەوێ زمانەكەمان پێشخەین و خزمەتێكی پاك و پوخت و دڵسۆزانەی بكەین، دەشێ بەرەبەرە صیغەی بەلاغی و جومەلی فەصیح و ڕستەی ڕەسای دوور لە قسەی ئاسایی بۆ داڕێژین و ناوبەناو، لێرەوە لەوێ، بەناویا، لە هەل و بوارێكی لەباردا بڵاوی بكەینەوە، ئیتر هەركەسەمان بەپێی توانای خۆی، بابڵێین: من لە باسی ناییندا. جەنابت

لە باسی شیعرو موسیقاو هونەردا، کاکەبرا لە بابەتی هونەرە جوانەکاندا، کاکەخاس لە بابەتی ئاژەڵدا..تاد، بەڵام مەرجی سەرەکی ئەمە ئەوەیە: کە وشەو رستەو زاراوەو قسە نەستەقە نوێکان رێك و پێك بن و سووك و خۆش بن لە گوێداو ئاسان و رەوان بن لەسەر زمان وە وابکەین کە خوێنەری نامەکوردییەکان و رەشە خەڵکەکەی خۆمان (بە مەلاو شێخ و ئۆمی و زاناو دانایەوە) تام و چێژیان لێ وەرگرن و گوێیان پێیان رابێ و زمانیان ئالوودەی ببێ!

چونکە زمانی تۆمارکردنی زانیارییەکان و بابەتە ئایینییەکان و شیعرو هەڵبەست و پەخشان و چیرۆك نووسین و داستان و رۆمان تۆمارکردن گەلێ جیایە لە زمانی ناوبازارییەکان، کە سەوداو مامەڵەی توورو گێزەرو پیازی پێ دەکرێ، وە گەلێ جار بەراست و بەدرۆ سوێندی پێ دەخورێ و شەڕەجنێوو درۆی پێ دەکرێ بە شێوەیەکی سەرواڵا!

داخەکەم هەتا ئێستاکەیش زوربەی رۆشنبیرە کوردەکان خوێندنەوەی کوردییان لەلا پەشمە! بۆچی و لەبەر چی؟

چونکە خۆیان لەوە بەزلتر دەزانن کە کاتی زێڕینی خۆیان بەشتی واوە خەریك بکەن و بکوژن، هەتا فیردەوسی و میردەسی و شانامەو مانامەو ضەرەبەنا زەیدوون و ئەلف لەیلەو لەیلەو کەواکیب و مەواکیب وەستابێ کاریان بەشیعرو ئەدەب و نامەو رۆشنبیری کوردی نیە، با هی نالی و ناری و مەحوی و مەولەوی و گۆران و قانیع و حاجی قادری کۆییش بێ! کە بەرهەمی ئەم زاتانە ئەگەر بە کوردی نەبوایە ئێستا بە هەزاران زمانی زیندوو تەرجەمە کرابوون! ئاخ بێ کیانی! ئەوەی کیانی نەبوو گیانیشی نەبوو، وات لێ کردووین خۆشمان قێزو بێز لە خۆمان بکەینەوە، هەمانە پێی کەمییە لە خزمەتی پیاوی بەرزدا قسە بە کوردی بکا، لەم رۆژانەدا کابرایەکی ساویلکەی ژیری خەڵکی سلێمانی لەلام بوو لە دائیرە، هەر کوردێ دەهات من بە کوردی قسەم دەکردو رێزم دەگرتن و ئیشەکەم تۆ دەکردن، کابراکە گوتی: مامۆستا تۆ بوویت بە شەلەمووەجوو! بە خودا تۆ کەم و ئێمە زۆر فریامان ناکەوی. گوتی: شەلەموو پیاوێکی جوولەکەبوو لە سلێمانی، کاتێ جوولەکەکان رۆیشتن ئەو مایەوە ئیتر بەهەر چوارلادا هەر هەڵپەی دەکردو فریا نەدەکەوت چونکە تەنیا باڵ بوو وەك تۆ، سەری لە کنیشتەدەدا، مەزبەحەکەی دەماڵی، گۆڕە جوولەکەکانی خزمەت دەکرد، سەربانەکانی دەگێڕا، کە پرشینەی دەگرت، شەمەی رێزدەگرت، ریشی دەهێشتەوە.. تاد هەر بەتەما بوو مردوو زیندوو بێتەوە تا خۆشی سەری نایەوە. منیش بەم بۆنەیەوە گوتوومە:

١٥٧٦- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ الطَّائِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ بِالْمُزْدَلِفَةِ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُ مِنْ جَبَلَيْ طَيِّئٍ أَكْلَلْتُ مَطِيَّتِي وَأَتْعَبْتُ نَفْسِي وَاللَّهِ مَا تَرَكْتُ مِنْ حَبْلٍ إِلاَّ وَقَفْتُ عَلَيْهِ فَهَلْ لِي مِنْ حَجٍّ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ أَدْرَكَ مَعَنَا هَذِهِ الصَّلاَةَ وَأَتَى عَرَفَاتٍ قَبْلَ ذَلِكَ لَيْلاً أَوْ نَهَارًا تَمَّ حَجُّهُ وَقَضَى تَفَثَهُ. رَوَاهُ أصحاب السنن وصححه الترمذي[٢].

عوروەی کوڕی موضەریسی طائی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە موزدەلیفە چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! لەلای دووکێوەکەی طەییئەوە هاتووم، ولاخەکەمم ڕەتاندووەو خۆشم شەکەت و ماندوو کردووە لەڕێ، ئەوەندە پەلەم کردووە بەخودا تووشی چەند باسکەبووم لەسەر هەموویان ڕاوەستاوم، جا ئایا فریای حەج گەوتووم یانا؟ پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ لەپێش بەرەبەیانی ڕۆژی جەژنا فریای ڕاوەستانی عەرەفات بکەوێ ئەوە بەحەجا گەیشتووەو ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێناوە (د/ن/ت. تیرمیذی بە صەحیحی داناوە).

## ١٠٤) ڕۆیشتن لە خاکی عەرەفاتەوە بۆ مزدەلیفەو شەومانەوە لەوێ: الدفع من عرفة إلى المزدلفة والمبيت بها

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَإِذَا أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُواْ اللّهَ عِندَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ}.

خودای گەورە دەفەرموێ: کاتێ لە ئیستگای خاکی عەرەفاتەوە داڕژان و هاتنەوە خوارەوە لەپاش ڕۆژئاوابوون یا دوزیکری خودای گەورە

---

خالۆ! لە پاش چی بم بەخزمەتی چی ... ئاغام پاشاش بێ ئەوە بەمن چی
کوردێکی مەردی پاکی موسوڵمان ... لەمن ڕازی بێ دەبم کامەران!
بم بە نۆکەر لەبۆ گەلی خۆم ... باشترە لەلام لە پاشایی ڕۆم

- وەرگێڕ - ١٩٨٧/٩/٢٠

[٢] ما في المجتبى صحيح وصحيح عند الترمذي.

بکەن و لەخودا بپاڕێنەوە لەلای مەشعەرولحەرامدا، کە کێوێکە وا لە داوێنی موزدەلیفەوە.

١٥٧٧- عَنْ عُرْوَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سُئِلَ أَنَسٌ وَأَنَا جَالِسٌ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسِيرُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ حِينَ دَفَعَ؟ قَالَ: كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[1].

عوروە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: خۆم دانیشتبووم لە خزمەتی ئەنەسدا کە لێیان پرسی: لە حەجیماڵئاواییدا ئەوکاتەی کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەرچوو لە عەرەفاتەوە بۆ موزدەلیفە لەڕێ چۆن دەڕۆیشت؟ گوتی بە ڕەوت وشترەکەی لێ دەخوڕی، ئەگەر بواریشی دەست کەوتایە تاوی دەدا (ش/د/ن. خودایان لێ ڕازی بێ)

١٥٧٨- عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّهُ دَفَعَ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ عَرَفَةَ فَسَمِعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَرَاءَهُ زَجْرًا شَدِيدًا وَضَرْبًا وَصَوْتًا لِلإِبِلِ فَأَشَارَ بِسَوْطِهِ إِلَيْهِمْ وَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، فَإِنَّ الْبِرَّ لَيْسَ بِالإِيضَاعِ. رَوَاهُ البخارى وأبو داود[2].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: ڕۆژی عەرەفە کە لە خزمەتی حەزرەتدا (درودی خودای لەسەربێ) لە عەرەفەوە ڕۆیشتین بۆ موزدەلیفە لەڕێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوێی لێبوو هەندێ کەس دەی یان لە وڵاخ دەکردو بە توندی تێیان دەخوڕین و لێیان دەدان، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە قامچییەکەی ئاماژە (ئیشارەت)ی بۆ کردن و فەرمووی: ئەی موسوڵمانینە! لەسەر خۆ بن، پەلەپەل باش نیە! (ب/د).

١٥٧٩- وَقَالَ أُسَامَةُ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ عَرَفَةَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِالشِّعْبِ نَزَلَ فَبَالَ ثُمَّ تَوَضَّأَ وَلَمْ يُسْبِغِ الْوُضُوءَ فَقُلْتُ لَهُ الصَّلاَةَ. قَالَ: الصَّلاَةُ أَمَامَكَ فَرَكِبَ فَلَمَّا جَاءَ الْمُزْدَلِفَةَ نَزَلَ فَتَوَضَّأَ فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ ثُمَّ أُقِيمَتِ

---

[1] بخاري. حج: ١٥٤٣، ١٦٨٦، ١٦٦٦، ٢٩٩٩، ٤٤١٣. مسلم. حج: ٣٠٩٤. أبو داود. حج: ١٩٢٣. نسائى. حج: ٣٠٢٣.

[2] بخارى. حج: ١٦٧١.

الصَّلاَةُ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ ثُمَّ أَنَاخَ كُلُّ إِنْسَانٍ بَعِيرَهُ فِي مَنْزِلِهِ ثُمَّ أُقِيمَتِ الْعِشَاءُ فَصَلاَّهَا وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٣].

ئوسامەی کوڕی زەید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە عەرەفاتەوە لە ڕۆژی عارفەدا کەوتە ڕێ بۆ موزدەلیفە ڕۆیشت، تا گەیشتە ڕێچکەکانی حاجیان، لەوێ دابەزی و گمێزی کردو دەسنوێژێکی سووکەڵەی گرت. منیش عەرزم کرد: نوێژ دەکەی؟ فەرمووی: نوێژ ها لە پێشەوە لەولاترە.

ئینجا سوار بووەوەو ڕۆیشت تا گەیشتە موزدەلیفە، لەوێ دابەزی و دەسنوێژێکی تێرو پڕی گرت، ئینجا قامەتی نوێژکراو نوێژی شێوانی کرد، ئینجا هەر کەسە لە جێگەی خۆی وشتری خۆی لێ ییخ دا، لەپاشا قامەتی نوێژی خەوتنانیش کراو نوێژی خەوتنانیشی کردو هیچ نوێژی تری لە بەینیانا نەکرد (ش/د/ن).

١٥٨٠- وَقَالَ: ابْنُ مَسْعُودٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى صَلاَةً إِلاَّ لِمِيقَاتِهَا إِلاَّ صَلاَتَيْنِ: صَلاَةَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ وَصَلَّى الْفَجْرَ يَوْمَئِذٍ قَبْلَ مِيقَاتِهَا. رَوَاهُ الثلاثة[٤].

ئیبنو مەسعوود (خودای لێ ڕازی) نەمدیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هیچ نوێژێ لەکاتی ئاسایی خۆیدا نەکا، ئەم دوو نوێژە نەبێ:

یەکەم: نوێژی شێوان و خەوتنانی لە موزدەلیفە بە یەکەوە کردو نوێژی شێوانی دواخست تا کاتی نوێژی خەوتنان.

دووەم: ئەو ڕۆژە نوێژی بەیانیشی لەپێش کاتی ئاسایی خۆیدا کردو لەگەڵ شەبەقدا نوێژی کرد تا زوو بڕوا بۆ مەشعەرولحەرام (ش/د).

---

[٣] بخاري. وضوع: ١٣٩، ١٨١، ١٦٦٧، ١٦٦٩، ١٦٧٢. مسلم. حج: ٣٠٨٧، ٣٠٨٩. أبو داود حج: ١٩٢٥. نسائي حج: ٣٠٢٤، ٣٠٢٥.

[٤] بخاري. حج: ١٦٨٢. مسلم. حج: ٣١٠٤. أبو داود. مناسك: ١٩٣٤. نسائي. حج: ٣٠١٠، ٣٠٢٧، ٣٠٣٨.

١٥٨١- وَقَالَ: عَلِيّ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ): أَصْبَحَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ وَقَفَ عَلَى قُزَحَ فَقَالَ: هَذَا قُزَحُ وَهُوَ الْمَوْقِفُ وَجَمْعٌ كُلُّهَا مَوْقِفٌ. رَوَاهُ أبو داود والترمذى وصححه[٥].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە بەیانەکیدا لەسەر کێوی قوزەح راوەستاو فەرمووی: ئەمە قوزەحە، ئێرە ئیستگای چاکە، وە موزدەلیفەیش هەمووی هەر ئیستگایە (د/ت:ص).

١٥٨٢- وَقَالَ: عَمْرَو بْنَ مَيْمُونٍ: شَهِدْتُ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) صَلَّى بِجَمْعٍ الصُّبْحَ، ثُمَّ وَقَفَ فَقَالَ: إِنَّ الْمُشْرِكِينَ كَانُوا لاَ يُفِيضُونَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَيَقُولُونَ أَشْرِقْ ثَبِيرُ. وَأَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَالَفَهُمْ، ثُمَّ أَفَاضَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ. رَوَاهُ البخارى وأبو داود[٦].

عەمری کوڕی مەیموون (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەگەڵ عومەردا بووم (خودای لێ رازی بێ) کە نوێژی بەیانی لە موزدەلیفە کرد گوتی: جاران هاوبەشپەیداکەرەکان تا خۆر نەکەوتایە لە موزدەلیفەوە رەویان نەدەکرد بۆ مینا وە دەیانگوت: با خۆر لە چیای ثەبیر گزنگ بدا ئەوسا دەڕۆین بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێچەوانەی ئەوانی دەکردو لەپێش خۆرکەوتندا دەڕۆیشت بۆ مینا (ب/د).

## ١٠٥) لازە بوون (زەعیف)ەکان لە پێشەوە دەڕۆن بۆ مینا:
## تقدم الضعفاء إلى منى

١٥٨٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهَا) قَالَتْ: كَانَتْ سَوْدَةُ امْرَأَةً ضَخْمَةً ثَبِطَةً فَاستَأْذَنَتْ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ تُفِيضَ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ فَأَذِنَ لَهَا فَقَالَتْ عَائِشَةُ

---

[٥] صحيح عند الترمذي.

[٦] بخاري. حج: ١٦٨٤، ٣٨٣٨.

فَلَيْتَنِي كُنْتُ اسْتَأْذَنْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَمَا اسْتَأْذَنَتْهُ سَوْدَةُ. رَوَاهُ الشيخان[١].

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) گوتی: سەودەی دایکی موسوڵمانان ئافرەتێکی قەبەی گرانەڕۆبوو، داوای لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرد کە رێگەی بدا کە بەشەو لە موزدەلیفەوە بڕوات بۆ مینا بەر لەوە خەڵکەکە بیکەن بە قەرەباڵغی و جەنجاڵی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی دا خۆزگەم منیش وەکی سەودە بۆ ئەمە روخصەتم لە پێغەمبەر دەخواست (ش).

١٥٨٤- وَقَالَ: ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَا مِمَّنْ قَدَّمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةِ فِي ضَعَفَةِ أَهْلِهِ. رَوَاهُ الخمسة. وزاد الترمذي وأبو داود. وَقَالَ: لاَ تَرْمُوا الْجَمْرَةَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ[٢].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: خۆم یەکێك بووم لە لازەبوونەکانی کەسوکاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە شەوی موزدەلیفە لە پێشەوە ناردنی بۆ مینا (/د/ت/ن) تیرمیذی و ئەبو داوود ئەمەیان زیاتر کردووە، وە فەرمووی: بەرد فڕێ مەدەن بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبە تا خۆر هەڵدێ!

## ١٠٦) شەومانەوە لە خاکی مینا لە رۆژی جەژن و سێ رۆژەکانی دوای جەژندا: (المبيت بمنى أيام العيد والتشريق)

١٥٨٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ نَبْنِي لَكَ بَيْتًا يُظِلُّكَ بِمِنًى قَالَ: لاَ مِنًى مُنَاخُ مَنْ سَبَقَ. رَوَاهُ أبو داود والترمذى وصححه[١].

---

[١] بخاري. حج: ١٩٨١. مسلم. حج: ٣١٠٦، ٣١٠٧.

[٢] بخاري. جنائز: ١٣٥٧، ١٦٧٨، ١٨٥٦، ٤٥٨٧. مسلم. حج: ٣١١٣، ٣١١٤. أبو داود. مناسك: ١٩٣٩. نسائى. مناسك: ٣٠٣٢.

[١] صحيح عند الترمذي.

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! با لەمینا کەپرێکت بۆ دروست بکەین بۆ سێبەر؟ فەرمووی: مەکەن، مینا هەواری ئەو کەسەیە زووتر بگاتە ئەوێ (د/ت:ص).**

**١٥٨٨- وَقَالَ: رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِهِ: خَطَبَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **النَّاسَ بِمِنًى وَنَزَّلَهُمْ مَنَازِلَهُمْ فَقَالَ: لِيَنْزِلِ الْمُهَاجِرُونَ هَا هُنَا. وَأَشَارَ إِلَى مَيْمَنَةِ الْقِبْلَةِ وَالأَنْصَارُ هَا هُنَا. وَأَشَارَ إِلَى مَيْسَرَةِ الْقِبْلَةِ ثُمَّ لِيَنْزِلِ النَّاسُ حَوْلَهُمْ**[٢].

**ئەبو داوود** (خودای لێ خۆش نوود بێ) **دەگێڕێتەوە بە سەنەدێکی صالح (لەبار) دەڵێ: پیاوێ لە هاوڕێیانی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە مینا وتارێکی بۆ موسوڵمانان داو هەوارگەی بۆ نیشانەکردن فەرمووی: با کۆچکاران واتە: موهاجیرەکان لێرەدا دابەزن، وە با یاریدەدەران واتە: ئەنصارەکانیش لێرانەدا دابەزن حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **لای ڕاستی ڕووگە (قیبلە)ی نیشانە کرد بۆ هەواری کۆچکەران‌و لای چەپی ڕووگەشی نیشانە کرد بۆ هەواری یاریدەران، ئینجا فەرمووی: با خەڵکەکەی تریش بەدەوری ئەوانا هەوار هەڵدەن‌و دابەزن!**

**١٥٨٩- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ قُرْطٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنْ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: أَعْظَمُ الأَيَّامِ عِنْدَ اللّٰهِ يَوْمُ النَّحْرِ ثُمَّ يَوْمُ النَّفْرِ. رَوَاهُمَا أبو داود**[٣].

**عەبدوڵڵای کوڕی قورط** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: مەزنترین ڕۆژ لەلای خودا ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانە کە ناودارە بە یەومونەحر واتە: ڕۆژی قوربانی سەربڕین لە پاش ئەویش ڕۆژی دووهەمی، کە ناودارە بە یەومولقەڕ واتە: ڕۆژی دامەزرانی حاجیان لە مینا (د- سند صالح) واتە: ئەبو داوود** (خودای لێ ڕازی بێ) **بە سەنەدێکی لەبار ئەم حەدیثەی گێڕاوەتەوە).**

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] بسند صالح (شرحه).

**١٥٩٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ** (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) **أَنَّ الْعَبَّاسَ** (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) **اسْتَأْذَنَ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **لِيَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى، مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ، فَأَذِنَ لَهُ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي**[٤].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: عەبباس** (خودای لێ رازی بێ) **روخصەتی خواست لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کە رێگەی بدا شەوەکانی مینا لە مەککە بمێنێتەوە، لەبەر ئاودان بە حاجیان، ئەویش رێگەی مانەوەی دا (ش/د/ن).**

## ١٠٧) بەرد فڕێدان بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبە: (رمي جمرة العقبة)

**١٥٩١- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ** (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) **أَنَّهُ حَجَّ مَعَ ابْنِ مَسْعُودٍ فَرَآهُ يَرْمِي الْجَمْرَةَ الْكُبْرَى بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، فَجَعَلَ الْبَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ، وَمِنًى عَنْ يَمِينِهِ، ثُمَّ قَالَ: هَذَا مَقَامُ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلماً**[١].

**عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: لەگەڵ ئیبنو مەسعووددا حەجم دەکرد، تەماشام کرد بەیتی خستە لای چەپی خۆیەوەو مینای خستە لای راستی خۆیەوەو ئینجا حەوت بەردی گرتە کۆمەڵە بەردەگەورەکە (ئەلجەمرەتولکبرا) وە گوتی: ئەمە جێگەی راوەستانی پێغەمبەر خۆیەتی کە سوورەتی بەقەرەی بۆ هاتووە، کە زۆرینەی مناسکی حەجی واتیادا** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەم شوێنەدا (ش[١]/د/ت/ن).**

---

[٤] بخاري. حج: ١٧٤٥. مسلم. حج: ٣١٦٤. ابو داود. مناسك: ١٩٥٩.

[١] بخاري. حج: ١٧٤٧، ١٧٤٨، ١٧٤٩، ١٧٥٠. مسلم. حج: ٣٠٧٩ – ٣٠٨٢، ٣١١٨. نسائي. مناسك: ٣٠٤٦. أبو داود. مناسك: ١٩٧٤. الترمذي حج: ٩٠١. نسائي. حج: ٣٠٧٠.

[١] جاء في الاصل في آخر الحديث المبارك (رواه الخمسة الا مسلما) فلست أدري هل هذا سهو من المؤلف (رحمة الله عليه) أم سهو من النساخ أم خطأ مطبعي، على أي حال هذا الحديث الكريم رواه

١٥٩٢- وَقَالَ: جَابِرٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَرْمِي عَلَى رَاحِلَتِهِ يَوْمَ النَّحْرِ وَيَقُولُ لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ فَإِنِّي لاَ أَدْرِي لَعَلِّي لاَ أَحُجُّ بَعْدَ حَجَّتِي هَذِهِ. رَوَاهُ مسلم. وأبو داود وأحمد[٢].

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: رۆژی جەژنی قوربان پێغەمبەرم دی** (درودی خودای لەسەربێ) **بە سواری وڵاخەکەی رەجمی شەیتانی دەکردو دەیفەرموو: یاساو دەستووروو کردارو گفتاری حەج ئەمانەن کە من کردمن لەم حەجەمدا، دەی ئێوەش لە خۆمەوە وەریان بگرن و فێریان بن و کارو رەفتیان پێ بکەن، چونکە من نازانم لەوانەیە حەجی ترم بە نصیب نەبێ (م/د/ئەحمەد).**

---

مسلم (رضى الله عنه) في صحيحه، حفظه الله تعالى سرمداً وجعله مع سائر الصحاح ومصادر السنة النبوية المطهرة ذخراً للمسليمن دائماً أبداً.

راجع صحيح مسلم بشرح النووي رمي جمرة العقبة من بطن الوادي من الجزء التاسع ص ٤٤. (المترجم).

واتە: لە داوێنی ئەم فەرموودەیەدا نووسراوە: هەر پێنجیان (واتە: بوخاری و موسلیم و ئەبو داوودو تیرمیذی و نەسائی) ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، موسلیم نەبێ جا نازانم ئەمە هەڵەی دانەر خۆیەتی، پڕ گۆڕەکەی لە نووربێ، یا هەڵەی نووسیارە، یا هەڵەی چاپە، هەر چۆن بێ، دەقی ئەم فەرموودەیە، موسلیم (خودای لێ رازی بێ) لە صەحیحی موسلیمدا ریوایەتی کردووە، لەباسی (باب رمی جمرة العقبة من بطن الوادی) تەماشای شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم بکە بەرگی نۆ لاپەڕە چل و چوار.. خودایە! ئەم کتێبە پیرۆزانە کە بوون بە بوخچەو سەنگەرو قەڵای قایمی سوننەتی پاکی پێغەمبەری تۆ (درودی خودای لەسەربێ) ئاگادارییان بکە هەتا هەتایە، ئەمانە سەرچاوەو بناوانی ئایینی ئێمەن، خودایە! بە پیرۆزیی و بەرەکەتی ئەم نامە پیرۆزو بەرێزانە رەحمێ بەم گەلی کوردی مەزلوومی لێقەوماوە بکە، وەرووی خێرو رەحمەتی خۆتی لێ بکەرەوە، لە پەنای ئەم قورئان و حەدیس و ئایینی ئیسلامەدا، لەژێر ئاڵای موحەممەدو یارانیدا پەنای خێری بدەو دەستی زۆرداری لێ کۆتا کە. ئامین..

- وەرگێڕ نوری فارس - ١٩٨٧/٩/٢٢

[٢] مسلم. حج: ٣١٢٤. أبو داود. مناسك: ١٩٧٠. نسائی. مناسك. حج:: ٣٠٦٢.

١٥٩٣- وَعَنْهُ قَالَ: رَمَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ ضُحًى وَأَمَّا بَعْدُ فَإِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ. رَوَاهُ الخمسة ولكن البخارى تعليقاً[٣].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە رۆژی یەکەمی جەژنا کە شەیتانی بەردەباران کرد، کات چێشتەنگاوو بوو، بەڵام رۆژەکانی تر لەپاش نیوەڕۆ شەیتانی سەنگەسار دەکرد (ب-بەتەعلیق-م/د/ت/ن).

١٥٩٤- وَقَالَ: قُدَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَرْمِي الْجِمَارَ عَلَى نَاقَةٍ لَيْسَ ضَرْبٌ وَلاَ طَرْدٌ وَلاَ إِلَيْكَ إِلَيْكَ. رَوَاهُ النسائى والترمذى وصححه والله أعلم[٤].

قودامەی کوڕی عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەربێ) بە سواریی وشترە مێنگەیەك بوو، رەجمی شەیتانی دەکرد، زۆر بە ئاسایی و بەبێ دەبدەبەو هەراو زەنا نە لە کەسیان دەداو نە دڕیان بە خەڵکەکە دەداو نە بەکەسیان دەگوت: بەولاوە خۆت لادە وەك چۆن لەبەردەم مەوکیبی پادشاو پیاوانی جیهان دەکرێ (د/ت:ص) خودای گەورە بۆ خۆی باشی دەزانێ.

## ١٠٨) ئیحرام شکاندنی یەکەم: (الحل الأول)

١٥٩٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا رَمَى أَحَدُكُمْ جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ فَقَدْ حَلَّ لَهُ كُلُّ شَيْءٍ إِلاَّ النِّسَاءَ. رَوَاهُ أبو داود والنسائى[١].

---

[٣] بخاري. حج: تعليق مذكور قبل الرقم: ١٧٤٦ مباشرة مسلم. حج: ٣١٢٨، أبو داود. مناسك: ١٩٧١. الترمذي. حج: ٨٩٤. نسائى. حج: ٣٠٦٣.

[٤] صحيح عند الترمذي.

[١] بسند حسن (شرحه).

**عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: هەر کاتێ رەجمی شەیتانی کۆگای گەورەتان تەواو کرد، کە ناودارە بە جەمرەتول عەقەبە ئیتر ژن نەبێ هەموو شتێکی ترتان بۆ حەڵاڵ دەبێ واتە: ژن نەبێ هەرچی بەهۆی ئیحرام بەستنەوە لە موسوڵمان قەدەغە دەبێ، دروست دەبێتەوە بۆی! (د-س/ح-ن).**

**١٥٩٦- عَنْ أَنَسٍ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **أَتَى مِنًى فَأَتَى الْجَمْرَةَ فَرَمَاهَا ثُمَّ أَتَى مَنْزِلَهُ بِمِنًى وَنَحَرَ ثُمَّ قَالَ: لِلْحَلاَّقِ: خُذْ وَأَشَارَ إِلَى جَانِبِهِ الأَيْمَنِ ثُمَّ الأَيْسَرِ ثُمَّ جَعَلَ يُعْطِيهِ النَّاسَ. رَوَاهُ الخمسة**[٢]**.**

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **رۆیشت بۆ میناو چوو بۆ کۆگا بەردەکەو بەردی بۆ فڕێ دا، ئینجا هاتەوە بۆ بارەگاکەی خۆی لە مینا، لەوێ قوربانی کرد، ئینجا بەسەرتاشەکەی فەرموو: سەرم بتاشە. وە پێی گوت: کە لەپێشا لای راستی سەری بتاشێ ئینجا لای چەپی. لەپاشا فەرمانی دا قژە سەرەکەییان دابەش دەکرد بەسەر خەڵکەکەدا (ش/د/ت/ن).**

**١٥٩٥- تقدم برقم: ١٥١٥/٢**[٣]**.**

## ١٠٩) باسی کوشتنی‌و ئەو ئاژەڵەی دەست دەدا بۆ قوربانی

## الذبح وما يجزيء في الضحية

**{قَالَ:اللَّهُ تَعَالَى - لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَّعْلُومَاتٍ عَلَى مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ}.**

---

[٢] مسلم. حج: ٣١٣٩ — ٣١٤٢. أبو داود. مناسك: ١٩٨١. ترمذى. حج: ٩١٢.

[٣] راجع رقم: ١٥١٥/٢. تقدم فى تسلسل: ٨٧ من المجلد الثانى (مترجم).

با ئەو موسوڵمانانە بێن بۆ لای تۆو بۆ دیدەنی خانەی خودا بۆ ئەوە کە حازرو ئامادە بن بۆ سەر گەلێ سوودی جیهانیو ئایینی بۆ خۆیان وە با ناوی خودا ببەن لە چەن رۆژێکی دیاری کراودا، لەسەر سەربڕینی ئەو ئاژەڵەی کە خودا پێیداون، جا کاتێ سەرتان برین لەباتێ قوربانی یا لە جیاتی دیاریی خانەی خودا (هەدی) ئەوا خۆیشتان لێی بخۆنو دەرخواردی مرۆڤی گیرۆدەی لێقەوماوو گەدایشی بدەن. جا پاش سەربڕینی ئەو ئاژەڵانە با هەرچی چڵكو پیسی هەیە پێیانەوە (وەکی نینۆكو زیادە مووشتی وا) لای ببەن، وە هەر فووتوو نەزرێ کردوویانە جێبەجێی بکەنو تەوافی خانەی دێرینەی خودای گەورە بکەن.

١٥٩٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَحَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ الْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذى. وَفِي رِوَايَةٍ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُهِلِّينَ بِالْحَجِّ فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ نَشْتَرِكَ فِي الإِبِلِ وَالْبَقَرِ كُلُّ سَبْعَةٍ مِنَّا فِي بَدَنَةٍ. وَفِي أُخْرىَ: اشْتَرَكْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ كُلُّ سَبْعَةٍ فِي بَدَنَةٍ[1].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ساڵی حودەیبییە کە لە خزمەتی حەزرەتدا بووین ئیحرامی عەمرەمان بەستبوو، بەڵام بتپەرستەکان رێگەیان نەداین، ئیتر ئیحرامەکەمان شکانو بەم شێوەیە فیدیەماندا: بە حەوت کەس وشترێ یا گایەکمان سەر دەبڕی (م/د/ت) لە گێڕانەوەیەکا: لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) دەرچووینو حەجمان دابەست جا کە خەڵکی مەککە رێگەیان نەداین حەجەکەمان تەواو بکەین پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێ کردین کە: هەر حەوت کەسێ، بەهاوبەشی، وشترێ، یا رەشە وڵاخی لەباتی هەدی سەرببڕین لە گێڕانەوەیەکی تردا: لە خزمەتی حەزرەتدا بووین، حەجو عەمرەمان دەکرد، لە رەشە وڵاخو وشتردا دەبووین بە هاوبەش بە حەوت کەس سەرێکمان سەر دەبڕی!.

---

[1] مسلم. حج: ٣١٧٥، ٣١٧١ – ١٣٧٥. أبو داود. اضاحى: ٢٨٠٩. ترمذى. حج: ٩٠٤، ١٥٠٢.

١٥٩٧- وَقَالَ: ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ. فَحَضَرَ الأَضْحَى فَاشْتَرَكْنَا فِي الْبَقَرَةِ سَبْعَةً وَفِي الْجَزُورِ عَشَرَةً. رَوَاهُ النسائى والترمذى وحسنه[٢].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: لە سەفەرێکدا، لە خزمەتی حەزرەتدا بووین بوو بە جەژنی قوربان، جا حەوت کەس، حەوت کەس لەیەك سەر رەشە ولاخا دەبووین بەهاوبەش و دەمانکرد بە قوربانی وە دەکەس دەکەسیش لەیەك سەر وشتردا دەبووین بە هاوبەش و دەمان کرد بە قوربانی، رووکار (ظاهیر)ی ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ کە رەشە ولاخێ بۆ حەوت کەس دەست دەدا، وە وشترێ بۆ دەکەس، ئیتر چ بۆ قوربانی بێ، یا بۆ تۆڵە بێ، یا بۆ دیاری خانەی خوابێ، (ن/ت:ح).

١٦٠٠- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا) أَنَّهُ رَأَى رَجُلاً يَنْحَرُ بَدَنَةً وَهِيَ بَارِكَةٌ قَالَ: ابْعَثْهَا قِيَاماً مُقَيَّدَةً سُنَّةَ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٣].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) پیاوێکی دی، وشترێکی قوربانی پیخ دابوو، خەریك بوو سەری دەبڕی و دەیکرد بە قوربانی بۆ خۆی، جا گوتی پێی: هەڵیسێنەوە سەرپێ و دەستی چەپی ببستە، چونکە یاساو سوننەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوایە (ش/د/ن).

١٦٠١- وللبخارى: نَحَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِهِ سَبْعَ بُدْنٍ قِيَامًا[٤].

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە دەستی خۆی حەوت وشتری قوربانی سەربڕی هەر حەوتیان لەکاتی سەربڕینەکەدا بەپێوە راوەستابوون (ب).

---

[٢] صحيح عند النسائى، حسن عند الترمذي (مترجم).

[٣] بخاري. حج: ١٧١٣. مسلم. حج: ٣١٨٠. أبو داود. مناسك: ١٧٦٨.

[٤] بخاري. حج: ١٧١٤.

## ١١٠) گۆشتی قوربانی هەم لێی دەبەخشنەوەو هەم لێشی دەخۆن
## يتصدقون من الضحايا ويأكلون

١٦٠٢- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ وَأَنْ أَتَصَدَّقَ بِلَحْمِهَا وَجُلُودِهَا وَأَجِلَّتِهَا وَأَنْ لاَ أُعْطِيَ الْجَزَّارَ مِنْهَا قَالَ: نَحْنُ نُعْطِيهِ مِنْ عِنْدِنَا. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[1].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێکردم کە رابوەستم بەسەر وشترە قوربانییەکانیەوە، وە گۆشت و پێستەو جلەکانیان ببەخشمەوە، وە هیچیان لێ نەدەم بە قەسابەکە لە باتی کرێی سەربڕین، بەلاّم لەباتی پشك قەیناکا، فەرمووی: خۆمان شتێکی تری دەدەینێ لەباتی ئەوە (ش/د/ن).

١٦٠٣- وَقَالَ: جَابِرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) كُنَّا لاَ نَأْكُلُ مِنْ لُحُومِ بُدْنِنَا فَوْقَ ثَلاَثِ مِنًى، فَرَخَّصَ لَنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: كُلُوا وَتَزَوَّدُوا فَأَكَلْنَا وَتَزَوَّدْنَا[2].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێشدا بەس لە ماوەی سێ رۆژەکانی مینادا لە گۆشتی قوربانی خۆمانمان دەخوارد، لە پاشدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) رێگەی داین و فەرمووی: لێی بخۆن و توێشووشی لێ بکەن بۆ رێگەتان ئیتر ئێمەیش لەوە دوا هەم لێمان دەخواردو هەم توێشووشمان لێ دەکرد (ش).

١٦٠٤- وَقَالَ: ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) لاَ يُؤْكَلُ مِنْ جَزَاءِ الصَّيْدِ وَالنَّذْرِ، وَيُؤْكَلُ مِمَّا سِوَى ذَلِكَ. رَوَاهُ الشيخان والله أعلم[3].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: لە گۆشتی حەیوانی نەذرو حەیوانێ کە لە جیاتی نەچیر راوکردن سەربڕێ ناخۆرێ، وە لە گۆشتی غەیری ئەم دووە دەخورێ (ش).

---

[1] بخاري. حج: ١٧٠٧، ١٧١٦، ١٧١٦م، ١٧١٧، ١٧١٨، ٢٢٩٩. مسلم. حج: ٣١٦٧ – ٣١٧١. أبو داود. المناسك: ١٧٦٩.

[2] بخاري. جهاد. ٢٩٨٠، ١٧١٩، ٢٩٨٠، ٥٤٢٤، ٥٥٦٧. مسلم. ٥٠٧٧ – ٥٠٨٠. نسائي. ضحايا: ٤٤٣٨.

[3] بخاري. حج: تعليق ذكره البخارى فى الباب المرقم: ١٢٤ من كتاب الحج، قبل الرقم: ١٧١٩.

**١١١) سەرتاشین یا مووی سەرکورتکردنەوە: (الحلق أو التقصیر)**

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِن شَاء اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُؤُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا}.

ئەو خەونەی کە پێغەمبەر دیبووی (کە خۆی‌و یارانی دەچنە مەککە بەبێ ترس‌و سەری خۆیان دەتاشن، یا مووی سەریان کورت دەکەنەوە (ئەو خەونە خەونێکی راست بوو، وە لە خوداوە بوو، وە خودا) لە کاتی دانراوو وەقتی موقەددەری خۆیدا – بەراستی دەگێڕێ‌و دەیهێنێتەدی، جا گومانی تیا نیە کە ئێوە بە پشتی خودا بەبێ بیم‌و ترس دەچنە ناو شاری مەککەو دێنی ماڵی خودا دەکەن‌و هەتانە سەری خۆی دەتاشێ، وە هەتانە مووی سەری کورت دەکاتەوە گەلێ شتیش هەیە کە خودا دەیزانێ‌و ئێوە نایزانن وەکوو حیکمەتی دواکەوتنی هاتنەدی ئەم خەونەو حیکمەتی رێکەوتنی حودەبییە، وە لە پێش روودانی ئەمەدا بە زوویی وڵاتێکی گەورە دەگرن، تا ببێ بە دڵخۆشکەرە بۆتان تا کاتی هاتنەدی بەڵێنەکە.

١٦٠٥– عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ. قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ. قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: وَالْمُقَصِّرِينَ. رَوَاهُ الثلاثة[1].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: رەحمەتی خودا لەو کەسانە بێ کە لەپاش تەواوکردنی حەج‌و عەمرە سەری خۆیان دەتاشن! یارانیش عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! رەحمەت بکە لەو کەسانەش کە مووی سەریان کورت دەکەنەوە؟ بەلام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دیسان فەرموویەوە: رەحمەتی خودا لەو کەسانەبێ کە سەری خۆیان دەتاشن! دیسانەوە یاران عەرزیان کردەوە: ئەی

[1] بخاري. حج: ١٧٢٧، ١٧٢٨. مسلم. حج: ٣١٣٢، ٣١٣١ – ٣١٣٨. ترمذي. حج: ٩١٣. أبو داود. مناسك: ١٩٧٩.

پێغەمبەری خودا! ڕەحمەت بکە لەو کەسانەش کە مووی سەریان کورت دەکەنە؟ ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لەو کەسانەش بێ کە مووی سەریان کورت دەکەنەوە (ش/د).

١٦٠٦- وَقَالَ: أَنَس (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) لَمَّا رَمَى رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْجَمْرَةَ وَنَحَرَ نُسُكَهُ وَحَلَقَ نَاوَلَ الْحَلاَّقَ شِقَّهُ الأَيْمَنَ فَحَلَقَهُ، فَأَعْطَاهُ أَبَا طَلْحَةَ، ثُمَّ نَاوَلَهُ شِقَّ الأَيْسَرَ. فَحَلَقَهُ فَأَعْطَاهُ أَبَا طَلْحَةَ فَقَالَ: اقْسِمْهُ بَيْنَ النَّاسِ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَوَزَّعَهُ الشَّعَرَةَ وَالشَّعَرَتَيْنِ بَيْنَ النَّاسِ. رَوَاهُ الأربعة(٢).

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە لە مینا بەردی فڕی دا بۆ کۆگا بەردەکەو حەیوانی قوربانی و دیاری بەیتی سەربڕی، ئیتر لای ڕاستی سەری کردە سەرتاشەکە، ئەویش ئەولایەی تاشی و مووەکەی دا بە ئەبو طەلحە، ئینجا لای چەپیشی تێ کرد، سەر تاشەکە ئەویشی تاشی و مووی ئەویشی دا بە ئەبو طەلحە لەسەر فەرمانی پێغەمبەر خۆی، لە پاشا فەرمووی پێی: دابەشی بکە بەسەر خەڵکەکەدا. لە گێڕانەوەیەکا: ئەویش تەڵەتەڵەو دوو تەڵ دوو تەڵ دابەشی کرد بەسەر مەردومەکەدا (ش/د/ت).

١٦٠٥- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ الْحَلْقُ إِنَّمَا عَلَى النِّسَاءِ التَّقْصِيرُ. رَوَاهُ أبو داود والترمذی والدار قطنی(٣).

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ژن سەرتاشینی لەسەر نیە، بەڵام موو کورت کردنەوەی لەسەرە (د-س/ح-ت/ دارە قوطنی. ڕەزای خودایان لێبێ).

١٦٠٦- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ: رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زُرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ. قَالَ: لاَ حَرَجَ. قَالَ: حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ. قَالَ: لاَ حَرَجَ. قَالَ: ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ. قَالَ: لاَ

---

(٢) بخاري. حج: ١٧٢٦، ٤٤١٠، ٤٤١١. مسلم. حج: ٣١٣٩ — ٣١٤٢. أبو داود. مناسك: ١٩٨٠. ترمذی. حج: ٩١٢.

(٣) رَوَاهُ أبو داود بسند حسن (شرحه).

حَرَجَ. وَفِي رِوَايَةٍ: وَقَفَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِمِنًى لِلنَّاسِ يَسْأَلُونَهُ، فَقَالَ: رَجُلٌ: لَمْ أَشْعُرْ فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ. فَقَالَ: اذْبَحْ وَلاَ حَرَجَ. فَجَاءَ آخَرُ فَقَالَ: لَمْ أَشْعُرْ، فَنَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ. قَالَ: ارْمِ وَلاَ حَرَجَ. فَمَا سُئِلَ يَوْمَئِذٍ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلاَ أُخِّرَ إِلاَّ قَالَ افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ. رَوَاهُ الخمسة[٤].

دیسان گوتی: پیاوێ عەرزی حەزرەتی کرد (دروودی خودای لەسەربێ): لە پێش رەجمی شەیتانا تەوافم کرد؟ فەرمووی: قەیناکا گوتی: لەپێش سەربڕینی قوربانیشدا سەرم تاشی؟ فەرمووی: قەی ناکا گوتی: لەپێش رەجمی شەیتانیشا قوربانیم سەربڕی؟ فەرمووی: قەی ناکا. لە گێڕانەوەیەکا: لە حەجی ماڵئاوایی دا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە مینا بەپێوە راوەستا هەتا خەڵك پرسیاری لێ بکەن.

پیاوێ گوتی: نەمزانی لە پێش قوربانیکردندا سەرم تاشی، فەرمووی: قوربانیەکەت بکە قەیناکا پیاوێکی تر هات گوتی: نەمزانی لە پێش رەجمکردنی شەیتانا قوربانیم سەربڕیوە، فەرمووی: رەجمی شەیتان بکە، قەیناکا، ئیتر ئەو رۆژە هەرچییان لێ دەپرسی لە بارەی شتێکەوە، کە پێش خرا بووبێ، یا دواخرابووبێ، هەر دەیفەرموو: بیکە قەیناکا! (ش/د/ت/ن- خودایان لێ رازی بێ).

### ١١٢) وتاری رۆژی جەژن: (خطبة يوم النحر)

١٦٠٩- عَنِ رَافِعُ بْنُ عَمْرِو الْمُزَنِيُّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ النَّاسَ بِمِنًى حِينَ ارْتَفَعَ الضُّحَى عَلَى بَغْلَةٍ شَهْبَاءَ وَعَلِيٌّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) يُعَبِّرُ عَنْهُ وَالنَّاسُ بَيْنَ قَاعِدٍ وَقَائِمٍ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[١].

---

[٤] بخاري. علم: ٨٣، ١٢٤، ١٧٣٦، ١٧٣٧، ١٧٣٨، ٦٦٦٥. مسلم. حج: ٣١٤٣. أبو داود. المناسك: ٢٠١٤. ترمذى. حج: ٩١٦.

[١] جميع ما فى المجتبى صحيح على ما فى مقدمة شرح التاج الجامع (مترجم).

**رافیعی کوڕی عەمری موزەنی** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: لە مینا خۆم پێغەمبەرم دی** (درودی خودای لەسەربێ) **وتاری دەدا بۆ جەماوەرەکە، بە سواری هێسترە ماچەیەکی بۆ زبوو، کات چێشتەنگاوێکی بەرزبوو، عەلی** (خودای لێ رازی بێ) **لە دوور وەستابوو، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **هەرچی دەفەرموو: عەلی بە دەنگی بەرز رستە رستە دووبارەی دەکردەوە بۆ عەشاماتەکە، خەڵکەکەش هەندێ راوەستابوون، هەندێ دانیشتبوون (د/ن– خودایان لێ رازی بێ).**

١٦١٠– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) خَطَبَ النَّاسَ يَوْمَ النَّحْرِ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ. أَيُّ يَوْمٍ هَذَا. قَالُوا: يَوْمٌ حَرَامٌ. قَالَ: فَأَيُّ بَلَدٍ هَذَا. قَالُوا بَلَدٌ حَرَامٌ. قَالَ: فَأَيُّ شَهْرٍ هَذَا. قَالُوا شَهْرٌ حَرَامٌ. قَالَ: فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا. فَأَعَادَهَا مِرَارًا، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا): فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَوَصِيَّتُهُ إِلَى أُمَّتِهِ فَلْيُبْلِغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ. رَوَاهُ الشيخان وأحمد. وَفِي رِوَايَةٍ: وَقَفَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ النَّحْرِ بَيْنَ الْجَمَرَاتِ فِي الْحَجَّةِ الَّتِي حَجَّ بِهَذَا، وَقَالَ: هَذَا يَوْمُ الْحَجِّ الأَكْبَرِ، فَطَفِقَ النَّبِيُّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ اشْهَدْ. وَوَدَّعَ النَّاسَ. فَقَالُوا هَذِهِ حَجَّةُ الْوَدَاعِ[٢].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ خۆش نوودبێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **لە رۆژی جەژنی قوربانــدا وتــاری دا بــۆ جــەماوەرو فــەرمووی: ئــەی موسوڵمانەکان! ئەی خەڵقینە! ئەمرۆژە چۆن رۆژێکە؟ گوتیان: رۆژێکی گەلێ بەرێزەو تاوانی تیا حەرامە زۆر زۆر، فەرمووی: ئەی ئەم شارە چۆن شارێکە؟ گوتیان: شارێکی گەلێ بەرێزەو تاوانی تیا حەرامە زۆر زۆر، فەرمووی: ئەی ئەم مانگە چۆن مانگێکە؟ گوتیان: مانگێکی گەلێ بەرێزەو تاوانی تیا حەرامە زۆر زۆر، فــەرمووی: دەخــوێن و مــاڵ و ناموومــتان لەیــەکتری حەرامــەو بــە یەکتری ناڕەوایە، وەك چۆن تاوان گەلێ حەرام و ناڕەوایە لەم رۆژە زۆر بەرێزو**

---

[٢] بخاري. حج: ١٧٤٢، ٤٤٠٣، ٦٠٤٣، ٦١٦٦، ٦٧٨٥، ٦٨٦٨، ٢٠٧٧، ١٧٢٩، ٧٠٧٩.

حەرامــەتانا، لــەم مانگــە زۆر بــەرێزو حەرامــەتانا، لــەم شــارە زۆر بــەرێزو حەرامەتانا وە تاچەن جارێ ئەم فەرمایشتەی دووبارە کردەوە، ئینجا سەری بەرز کردەوەو دووجار فەرمووی: خوایە! تۆ بەشایەتبە ئەوا من ئەرکی سەرشانی خۆمم بەجێ هێناو فەرمایشتو فەرمانەکانی تۆم پێ ڕاگەیاندن ئینجا فەرمووی: کێ لێرەیەو گوێی لەم قسانەیە، با ڕایانبگەیەنێ بەو کەسانەی کە ئێستا لێرە حازرنین، نەکەن لەپاش خۆشم پاش گەزببنەوەو وەکی کۆمەڵی کافران و میللەتی خۆخۆر بەرببنە سەرو گوێلاکی یەکتریی و لەسەر پڕو پاتاڵی جیهان لە گەردنی یەکتری بدەن.

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: بەو کەسە کە گیانی من وا لە دەستی قودرەتیا، ئەم وتارە وەصییەت و سفارش و ڕاسپێری پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەربێ) کردی بۆ ئۆمەتی (ش/ئەحمەد) لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕۆژی جەژنی قوربان لە نێوانی کوگا بەردەکانا ڕاوەستا، لەو حەجەیدا کە ئەم وتارەی تیادا، وە فەرمووشی: ئەمرۆژە ڕۆژی حەجی ئەکبەرە، ئەمرۆژە ڕۆژی حەجی زۆر گەورەیە ناو بەناو دەشی فەرموو: خودایە! تۆ بەشایەتبەو ئاگات لێ بێ، وە لەو حەجەداخواحافیزیو ماڵ ئاوایی لە خەڵکەکەکرد، جا ئەوانیش دەیانگوت ئەمە حەجی ماڵ ئاواییو خوحافیزییە، تا لە دوایی‌دا بەم ناوەوە ناوی دەرکرد.

١٦٠٩- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ خَطَبِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَجَّتِهِ فَقَالَ: إِنَّ الزَّمَانَ قَدِ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللّٰهُ السَّمٰوَاتِ وَالأَرْضَ، السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا مِنْهَا، أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلاَثٌ مُتَوَالِيَاتٌ، ذُو الْقَعْدَةِ وَذُو الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمُ وَرَجَبُ مُضَرَ الَّذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ. رَوَاهُ الثلاثة[٣].

ئەبو بەکرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەو حەجەدا کە کردی لەپاش کۆچکردن، وتارێکیدا فەرمووی: چەرخ چووەتەوە

---

[٣] بخاري. حج: ١٧٤١.

دۆخی جارانی خۆی وزەمان هەڵسووڕاوەتەوە سەر ئەو شێوەیەی خۆی کە خودای گەورە ئاسمانەکانو زەوی دروست کردو شەوو رۆژومانگو ساڵی دانا، ئیمسال ساڵ بووەتەوە بە دوانزە مانگو هەموو مانگێ لە دوانزە مانگەی خودا کەوتۆتەوە شوێنی راستەقینەی خۆیو نەسیئ نەما، وە وەك سەردەمی پێغەمبەرەکان (درودی خودا لە پێغەمبەری خۆشمانو لەوانیش بێ) ئەوەی رەوایە بووەتەوە بەرەواو ئەوەی نارەوایە بووەتەوە بە نارەوا، وە ئەو گۆڕانو دەستکاریی شەریعەتە کە لە سەردەمی نەزانیدا کرابوون راست کرانەوە وە ئەم مانگانە چواریان مانگی حەرامنو خاوەن رێزو قەدرو نرخنو لەبەر ئەوە شەڕو شۆڕو هەراو جەنگیان زۆر تیا حەرامە وە ئەم چوارمانگە سیانیان بەرو دوانو بەشوێن یەکا دێن: کە ناوجەژنانو نۆمینەو موحەڕەمن، ئەوی تریشیان تەنیایە کە مانگی رەجەبە کە مەشهوورە بە رەجەبی هۆزی موضەر لەبەر ئەوە کە هۆزی موضەر زۆر قەدری ئەم مانگە دەگرن — کە دەکەوێتە بەینی جومادای دەووهەمو کۆڵەمانگەوە (ش/د).

### ١١٣) تەوافی فەرز: (طواف الافاضة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ}.

یەکەم ئایەت: واتە: ئەم ئایەتە پیرۆزە لە سەرەتای باسی سەدو نۆ لە بەرگی دووەمدا راڤەکراوە، تەماشای ئەوێ بکە.

١٦١٠- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنها) حَجَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَفَضْنَا يَوْمَ النَّحْرِ. رَوَاهُ البخاري[1].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ کە حەجمانکرد لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) رۆژی جەژن تەوافی بەیتمان کرد (ب-خ= بوخاری، خودای گەورەی لێ رازی بێ).

---

[1] بخاري. حج: ١٧٣٣.

١٦١١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَفَاضَ يَوْمَ النَّحْرِ ثُمَّ رَجَعَ فَصَلَّى الظُّهْرَ بِمِنًى. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُ ذَلِكَ اقْتِرَاءً بِالنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ الثلاثة[٢].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) رۆژی جەژن تەوافی بەیتی کرد، ئینجا گەڕایەوە بۆ میناو لەوێ نوێژی نیوەڕۆی کرد، ئیبنو عومەریش پەیڕەوی پێغەمبەری دەکردو بەوشێوەی دەکرد. (ش/د-بوخاری و موسلیم و ئەبو داوود. خودایان لێ رازی بێ).

١٦١٤- وللبخاری: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَزُورُ الْبَيْتَ أَيَّامَ مِنًى[٣].

گوتی: دەستووری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وابوو لەسێ رۆژەکانی مینادا دێنیی بەیتی دەکرد (ب).

١٦١٥- قال المؤلف (رحمه الله تعالى) فی الشرح: الاكثار منه )اي من طواف البيت مندوب لحديث: الطواف بالبيت صلاة[٤].

دانەر (پڕ گۆڕەکەی لە رەحمەت بێ) لە شەرحەکەدا دەڵێ: زۆر تەوافکردنی بەیت سوننەتە، بەپێی ئەم حەدیثەیە کە دەفەرموێ: تەوافی بەیت بەنوێژ دادەنرێ!

## ١١٤) رەجمی شەیتان لە رۆژەکانی (ئەییامو تەشریق: سێ رۆژەکانی پاش جەژن)دا پێویستە: (رمي الجمار في أيام التشريق)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَاذْكُرُواْ اللّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ اتَّقَى وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ}.

---

[٢] مسلم. حج:٣١٥٢. أبو داود. مناسك: ١٩٩٨.

[٣] تعليق ذكره البخاری فی الباب المرقم: ١٢٩ من كتاب الحج قبل الرقم: ١٧٣٢ مباشرة (مترجم).

[٤] رواه الترمذي بسند حسن راجه: ١٥٥٩/٣ من هذا المجلد (مترجم).

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: کاتێ کە دەستوورو یاساکانی حەجتان تەواو کرد ذیکرو یادی خودای گەورە بکەن لەچەن رۆژێکی هەڵژمێرراو، کە رۆژی جەژن‌و سێ رۆژەکانی مینایە، لەم رۆژە پیرۆزانەدا یادی خودا زۆر بکەن وە دوای هەموو نوێژێ ئەڵڵاهو ئەکبەر بکەن، وە قوربانی سەر ببڕن، وە رەجمی شەیتان بکەن، وە لە دوای هەموو بەردێ کە دەیگرنە میلەکان تەکبیر بکەن، جا ئەگەر کەسێ پەلەی کرد بۆ گەڕانەوەی، لە دوای دوو رۆژو لە رۆژی دووەمی مینادا، لە پێش رۆژاوادا گەڕایەوە ئەوە دروستەو تاوانی لەسەر نیە، وە هەرکەسێکیش دوا کەوێ تا رۆژی سیانزەو هەر سێ رۆژەکەی مینا لەوێ بمێنێتەوە هەر تاوانی لەسەر نیە ئەمەیش بۆ کەسێ کە لە خودا بترسێ‌و ترسی خودای لەدڵدا بێ، وە هەمیشە لە ترسی خودا بێئاگا مەبن، تا هەموو دەم تەریك بن لە تاوان‌و پارێزبن لە گوناهان، وە بزانن کە لە دەستی خودا قوتارتان نابێ‌و زوو یا درەنگ دەگەڕێنەوە بەر دەستی خۆی!

١٦١٤- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيـهِ وَسَـلَّمَ) كَـانَ إِذَا رَمَى الْجَمْرَةَ الَّتِي تَلِي مَسْجِدَ مِنًى يَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ كُلَّمَا رَمَى بِحَـصَاةٍ، ثُـمَّ تَقَدَّمَ أَمَامَهَا فَوَقَفَ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ رَافِعًا يَدَيْهِ يَـدْعُو، وَكَـانَ يُطِيـلُ الْوُقُـوفَ، ثُـمَّ يَـأْتِي الْجَمْرَةَ الثَّانِيَةَ، فَيَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ كُلَّمَا رَمَى بِحَصَاةٍ، ثُمَّ يَنْحَدِرُ ذَاتَ الْيَسَارِ مِمَّا يَلِي الْوَادِيَ، فَيَقِفُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ رَافِعًا يَدَيْهِ يَدْعُو، ثُمَّ يَأْتِي الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الْعَقَبَةِ فَيَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ عِنْدَ كُـلِّ حَـصَاةٍ، ثُـمَّ يَنْـصَرِفُ وَلاَ يَقِـفُ عِنْـدَهَا. رَوَاهُ البخاري وأبو داود[1].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) دەڵێ پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لێبێ) کە رەجمی شەیتانی دەکرد لەسەر ئەم شێوەیە دەیکرد: یەکەم جار حەوت

---

[1] بخاري. حج: ١٧٥٢، ١٧٥١.

بەردی فڕێ دەدا بۆ کۆگا بەردەکەی ئەولای مزگەوتەکەی میناوە، لەپاش هەڵدانی هەموو بەردێ ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد دەیفەرموو:

{اللّهِ أَكْبَرُ، اللّهِ أَكْبَرُ، لا اله الا الله، والله أكْبَر، اللهُ أكْبَر، ولله الحمد}.

ئینجا دەچووە پێشەوەو بەرەو رووگە رادەوەستاو هەردوو دەستی بەرز دەکردەوەو دەستی دەکرد بە نزاکردن و بەپێوە زۆر دەپاڕایەوە لەوێدا، ئینجا دەڕۆیشت بۆ کۆگا بەردی دووەم، وە حەوت بەردی فڕی دەدا بۆ ئەو میلەیش و لەپاش تێ گرتنی هەموو بەردی ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد، ئینجا بەلای چەپا لەلای شیوەکەوە دادەبەزی و بەرەو رووگە رادەوەستاو هەردوو دەستی بەرز دەکردەوەو دەستی دەکرد بە پاڕانەوە، ئینجا دەڕۆیشت بۆ کۆگا بەردەکەی کن عەقەبە وە حەوت بەردی فڕێ دەدا بۆ ئەم میلەیش، وە لەپاش تێ گرتنی هەر بەردێ ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، ئیتر دەگەڕایەوەو لەوێ نەدەوەستا (ب/د).

١٦١٧- وَعَنْهُ أَنَّهُ كَانَ يَأْتِي الْجِمَارَ فِي الأَيَّامِ الثَّلاثَةِ بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ مَاشِيًا ذَاهِبًا وَرَاجِعًا وَيُخْبِرُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ. رَوَاهُ أبـو داود والترمذى وصححه[٢].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) لەسێ رۆژەکەی پاش رۆی یەکەمی جەژنا کە ناودارن بەسێ رۆژەکەی مینا هەردوو سەر: چوون و هاتنەوە بە پێ دەچوو بۆ هەر سێ کۆگا بەردەکان (میلەکان): (ئەلجەمەرات) وە دەشی گوت: پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) گەلێ جار ئاوای دەکرد هەم بەپێ دەچوو، هەم بەپێ دەگەڕایەوە (د/ت:ص).

---

[٢] صحيح عند الترمذي.

١٦١٦- عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِرِعَاءِ الإِبِلِ فِي الْبَيْتُوتَةِ أَنْ يَرْمُوا يَوْمَ النَّحْرِ ثُمَّ يَجْمَعُوا رَمْيَ يَوْمَيْنِ بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ فَيَرْمُونَهُ فِي أَحَدِهِمَا. وَفِي رِوَايَةٍ: رَخَّصَ النَّبِيُّ لِلرِّعَاءِ أَنْ يَرْمُوا يَوْمًا وَيَدَعُوا يَوْمًا. رَوَاهُ أصحاب السنن والله أعلم[٣].

ئەبولبەدداح لەباوکیەوە (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: بۆمانەوەی شەو لەمینا، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی شوانە وشترەکانی دەدا: کە رۆژی جەژن، رەجمی شەیتان بکەن، ئینجا لەپاش رۆژی جەژنیش رەجمی دووڕۆژ کۆ بکەنەوەو لەیەکێ لە دوو رۆژەکەی پاش جەژنا هەر دوو رەجمەکە بکەن! لە گێڕانەوەیەکا: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی شوانەکانی دەدا کە رۆژ نا رۆژێ رەجمی شەیتان بکەن خودای گەورە بۆ خۆی باشی دەزانێ (د/ت/ن).

## ١١٥) رۆیشتن لە میناوە بۆ ئەبطەح و شەومانەوە لەوێ:

## السير من منى إلى الابطح والمبيت به

١٦١٧- عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ: أَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ عَقَلْتَهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيْنَ صَلَّى الظُّهْرَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ؟ قَالَ: بِمِنًى. قُلْتُ فَأَيْنَ صَلَّى الْعَصْرَ يَوْمَ النَّفْرِ؟ قَالَ: بِالأَبْطَحِ. افْعَلْ كَمَا يَفْعَلُ أُمَرَاؤُكَ. رَوَاهُ الشيخان[١].

عەبدولعەزیزی کوڕی روفەیع (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی: شتێکم پێ بڵێ کە خۆت لە هۆشت مابێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) رۆژی تەروییە نوێژی نیوەڕۆی لەکوێ کرد؟ گوتی: لە مینا، گوتم: ئەی رۆژی نەفر، ئەو رۆژەی کە لە میناوە گەڕایەوە بۆ مەککە نوێژی عەصری لەکوێ کرد؟ گوتی: لە ئەبطەح واتە: لە موحەصصەب = تەحصیب

---

[٣] جميع ما فى المجتبى للنسائى صحيح عنده (المقدمة).

[١] بخاري. حج: ١٦٥٣، ١٦٥٤، ١٧٦٣. مسلم. حج: ٣١٥٣.

= حەصبە = بەطحاء = خەیفی بەنی کینانە. ئینجا ئەنەس گوتی: فەرمانڕەواکانت و میرەجەکانت چی دەکەن تۆش ئەوە بکەو بەبیانووی پەیڕەویی کردنی پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) جیاوازیی و دووبەرەکی بەرپا مەکە (ش- شەیخان، خودا لێیان رازی بێ).

١٦١٨- وَقَالَ أَنَس (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) صَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، وَرَقَدَ رَقْدَةً بِالْمُحَصَّبِ، ثُمَّ رَكِبَ إِلَى الْبَيْتِ فَطَافَ بِهِ. رَوَاهُ البخاری وأبو داود[٢].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە موحەصصەب نوێژی نیوەڕۆو عەصرو شێوان و خەوتنانی کردو هەر لەوێش سەرخەوێکی شکاندو ئینجا سوار بوو چوو بۆ بەیت و طەوافی بەیتی کرد (ب/د).

١٦١٩- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ كَانُوا يَنْزِلُونَ الأَبْطَحَ. رَوَاهُ مسلم والترمذی[٣].

گوتی: جاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) و ئەبو بەکرو عومەر لە ئەبطەح دادەبەزین و چانێکیان دەگرت (م/ت، خودایان لێ رازی بێ).

١٦٢٠- وَقَالَ: أَبُو رَافِعٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) لَمْ يَأْمُرْنِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ أَنْزِلَ الأَبْطَحَ حِينَ خَرَجَ مِنْ مِنًى وَلَكِنِّي جِئْتُ فَضَرَبْتُ فِيهِ قُبَّتَهُ فَجَاءَ فَنَزَلَ. رَوَاهُ مسلم. وأبو داود[٤].

ئەبو رافیعی نۆکەری حەزرەت (درودی خودا لەسەر پێغەمبەربێ و رەزای خوداش لەوبێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە لە مینا دەرچوو خۆی فەرمانی پێ

---

[٢] بخاری. حج: ١٧٥٦، ١٧٦٤.

[٣] مسلم. حج: ٣١٥٤ — ٣١٥٨.

[٤] مسلم. حج: ٣١٦٠. أبو داود. مناسك: ٢٠٠٩.

نەکردم کە لە ئەبطەح قۆناخ بگرم‌و لەوێ بارگەکەی بخەم، بەڵام کە چووم من لە خۆمەوە لەوێ چاتوڵەکەیم هەڵدا، جا کە خۆشی گەیشتە ئەوێ تەشریفی دابەزی (م/د).

١٦٢٣– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَحْنُ بِمِنًى: نَحْنُ نَازِلُونَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ حَيْثُ تَقَاسَمُوا عَلَى الْكُفْرِ. وَذَلِكَ إِنَّ قُرَيْشًا وَبَنِي كِنَانَةَ تَحَالَفَتْ عَلَى بَنِي هَاشِمٍ وَعَلَى بَنِي الْمُطَّلِبِ أَنْ لاَ يُنَاكِحُوهُمْ وَلاَ يُبَايِعُوهُمْ حَتَّى يُسَلِّمُوا إِلَيْهِمْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ الشيخان[٥].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: هێشتا لە مینا بووین کە حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی پێمان: خوا حەزکا سبەینێ لە خەیف قۆقزاییەکەی بەنی کینانە قۆناخ دەگرین، لەو شوێنەدا کە کاتی خۆی دوشمنەکانی ئیسلام پەیمانیان بەست لەسەر کوفر.

ئەو رووداوەیش ئاوابووە: کاتێ خۆی کافرەکانی قورەیش‌و بەنی کینانە لەو جێگەیەدا لە دژی بەنی هاشم‌و بەنی موطەلیب (کە باسی پێغەمبەریان دەکرد) بوو بوون بە یەك‌و سوێندیان بۆ یەکتری خواردبوو لەسەر ئەمە: هەتا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) نەدەن بە دەستەوە نەژن‌و ژنخوازییان لەگەڵ بکەن‌و نە سەوداو مامەڵە! (ش).

١٦٢٤– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: حَاضَتْ صَفِيَّةُ لَيْلَةَ النَّفْرِ، فَقَالَتْ: مَا أُرَانِي إِلاَّ حَابِسَتَكُمْ. قَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَقْرَى حَلْقَى أَطَافَتْ يَوْمَ النَّحْرِ؟ قِيلَ نَعَمْ. قَالَ: فَانْفِرِي. رَوَاهُ الخمسة[٦].

---

[٥] بخاري. حج: ١٥٩٠، ١٥٨٩، ٣٨٨٢، ٤٢٨٤، ٤٢٨٥، ٤٧٧٩. مسلم. حج: ٣١٦١، ٣١٦٢.

[٦] بخاري. طلاق: ٥٣٢٩. مسلم. حج: ٣٢١٥، ٣٢١١ – ٣٢١٥.

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: شەوی نەفر، صەفییە (خودای لێ ڕازی بێ) کەوتە بێنوێژییەوەو گوتی: وابزانم گلتان دەدەمەوە چونکە کەوتومەتە بێنوێژییەوەو هێشتا (تەوافی ماڵئاوایی) تەوافی و یداعیشم نەکردووە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەش بەبارو دەم بە ئازار بێ بۆ خێر بە دەمیانایێ! ئەی ڕۆژی جەژن تەوافی نەکردووە؟ گوترا: با کردوویەتی. فەرمووی: دەبا بکەوێتەڕێ لەگەڵمان مادام تەوافی فەرزی بەجێ هێناوە، تەوافی ماڵئاوایی بۆ ئەو نەشی کات قەیناکات (ش/د/ت/ن، خودایان لێ ڕازی بێ).

## ١١٦) فەرموودەی حەجی ماڵئاوایی (حجة الوداع): (حديث حجة الوداع)

١٦٢٥- عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ فَسَأَلَ عَنِ الْقَوْمِ حَتَّى انْتَهَى إِلَيَّ فَقُلْتُ أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ. فَأَهْوَى بِيَدِهِ إِلَى رَأْسِي فَنَزَعَ زِرِّي الأَعْلَى ثُمَّ نَزَعَ زِرِّي الأَسْفَلَ ثُمَّ وَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ ثَدْيَيَّ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ غُلاَمٌ شَابٌّ فَقَالَ: مَرْحَبًا بِكَ يَا ابْنَ أَخِي سَلْ عَمَّا شِئْتَ. فَسَأَلْتُهُ وَهُوَ أَعْمَى وَحَضَرَ وَقْتُ الصَّلاَةِ فَقَامَ فِي نِسَاجَةٍ مُلْتَحِفًا بِهَا كُلَّمَا وَضَعَهَا عَلَى مَنْكِبِهِ رَجَعَ طَرَفَاهَا إِلَيْهِ مِنْ صِغَرِهَا وَرِدَاؤُهُ إِلَى جَنْبِهِ عَلَى الْمِشْجَبِ فَصَلَّى بِنَا فَقُلْتُ أَخْبِرْنِي عَنْ حَجَّةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: بِيَدِهِ فَعَقَدَ تِسْعًا فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَكَثَ تِسْعَ سِنِينَ لَمْ يَحُجَّ ثُمَّ أَذَّنَ فِي النَّاسِ فِي الْعَاشِرَةِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَاجٌّ فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ بَشَرٌ كَثِيرٌ كُلُّهُمْ يَلْتَمِسُ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَيَعْمَلَ مِثْلَ عَمَلِهِ فَخَرَجْنَا مَعَهُ حَتَّى أَتَيْنَا ذَا الْحُلَيْفَةِ فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَيْفَ أَصْنَعُ؟ قَالَ: اغْتَسِلِي وَاسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ وَأَحْرِمِي. فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْمَسْجِدِ ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حَتَّى إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ نَاقَتُهُ عَلَى الْبَيْدَاءِ نَظَرْتُ إِلَى مَدِّ بَصَرِي بَيْنَ يَدَيْهِ مِنْ رَاكِبٍ وَمَاشٍ وَعَنْ يَمِينِهِ مِثْلَ ذَلِكَ وَعَنْ يَسَارِهِ مِثْلَ ذَلِكَ وَمِنْ خَلْفِهِ مِثْلَ ذَلِكَ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ أَظْهُرِنَا وَعَلَيْهِ يَنْزِلُ الْقُرْآنُ وَهُوَ يَعْرِفُ تَأْوِيلَهُ وَمَا عَمِلَ بِهِ مِنْ شَيْءٍ عَمِلْنَا بِهِ فَأَهَلَّ بِالتَّوْحِيدِ. لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ

لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ. وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهَذَا الَّذِى يُهِلُّونَ بِهِ فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهِمْ شَيْئًا مِنْهُ وَلَزِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَلْبِيَتَهُ قَالَ: جَابِرٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) لَسْنَا نَنْوِى إِلاَّ الْحَجَّ لَسْنَا نَعْرِفُ الْعُمْرَةَ حَتَّى إِذَا أَتَيْنَا الْبَيْتَ مَعَهُ اسْتَلَمَ الرُّكْنَ فَرَمَلَ ثَلاَثًا وَمَشَى أَرْبَعًا ثُمَّ نَفَذَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – فَقَرَأَ (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) فَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ فَكَانَ أَبِى يَقْرَأُ فِى الرَّكْعَتَيْنِ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) وَ (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الرُّكْنِ فَاسْتَلَمَهُ ثُمَّ خَرَجَ مِنَ الْبَابِ إِلَى الصَّفَا فَلَمَّا دَنَا مِنَ الصَّفَا قَرَأَ (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ) أَبْدَؤُا بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ. فَبَدَأَ بِالصَّفَا فَرَقِىَ عَلَيْهِ حَتَّى رَأَى الْبَيْتَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَوَحَّدَ اللَّهَ وَكَبَّرَهُ وَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ أَنْجَزَ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ. ثُمَّ دَعَا بَيْنَ ذَلِكَ قَالَ: مِثْلَ هَذَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ نَزَلَ إِلَى الْمَرْوَةِ حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِى بَطْنِ الْوَادِى سَعَى حَتَّى إِذَا صَعِدَتَا مَشَى حَتَّى أَتَى الْمَرْوَةَ فَفَعَلَ عَلَى الْمَرْوَةِ كَمَا فَعَلَ عَلَى الصَّفَا حَتَّى إِذَا كَانَ آخِرُ طَوَافِهِ عَلَى الْمَرْوَةِ فَقَالَ: لَوْ أَنِّى اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِى مَا اسْتَدْبَرْتُ لَمْ أَسُقِ الْهَدْىَ وَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ لَيْسَ مَعَهُ هَدْىٌ فَلْيَحِلَّ وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً. فَقَامَ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِعَامِنَا هَذَا أَمْ لأَبَدٍ؟ فَشَبَّكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَصَابِعَهُ وَاحِدَةً فِى الأُخْرَى وَقَالَ: دَخَلَتِ الْعُمْرَةُ فِى الْحَجِّ مَرَّتَيْنِ لاَ بَلْ لأَبَدِ أَبَدٍ وَقَدِمَ عَلِىٌّ مِنَ الْيَمَنِ بِبُدْنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوَجَدَ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) مِمَّنْ حَلَّ وَلَبِسَتْ ثِيَابًا صَبِيغًا وَاكْتَحَلَتْ فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهَا فَقَالَتْ إِنَّ أَبِى أَمَرَنِى بِهَذَا. قَالَ: فَكَانَ عَلِىٌّ يَقُولُ بِالْعِرَاقِ فَذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُحَرِّشًا عَلَى فَاطِمَةَ لِلَّذِى صَنَعَتْ مُسْتَفْتِيًا لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيمَا ذَكَرَتْ عَنْهُ فَأَخْبَرْتُهُ أَنِّى أَنْكَرْتُ ذَلِكَ عَلَيْهَا فَقَالَ: صَدَقَتْ صَدَقَتْ مَاذَا قُلْتَ حِينَ فَرَضْتَ الْحَجَّ. قَالَ: قُلْتُ اللَّهُمَّ إِنِّى أُهِلُّ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُكَ. قَالَ: فَإِنَّ مَعِىَ الْهَدْىَ فَلاَ تَحِلُّ. قَالَ: فَكَانَ جَمَاعَةُ الْهَدْىِ الَّذِى قَدِمَ بِهِ عَلِىٌّ مِنَ الْيَمَنِ وَالَّذِى أَتَى بِهِ النَّبِىُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِائَةً قَالَ: فَحَلَّ النَّاسُ كُلُّهُمْ وَقَصَّرُوا إِلاَّ النَّبِىَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْىٌ فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ تَوَجَّهُوا إِلَى مِنًى فَأَهَلُّوا بِالْحَجِّ وَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَصَلَّى بِهَا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ

وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ ثُمَّ مَكَثَ قَلِيلاً حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ وَأَمَرَ بِقُبَّةٍ مِنْ شَعَرٍ تُضْرَبُ لَهُ بِنَمِرَةَ فَسَارَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلاَ تَشُكُّ قُرَيْشٌ إِلاَّ أَنَّهُ وَاقِفٌ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ كَمَا كَانَتْ قُرَيْشٌ تَصْنَعُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَأَجَازَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ فَوَجَدَ الْقُبَّةَ قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةَ فَنَزَلَ بِهَا حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ فَرُحِلَتْ لَهُ فَأَتَى بَطْنَ الْوَادِي فَخَطَبَ النَّاسَ وَقَالَ: إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ وَدِمَاءُ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ وَإِنَّ أَوَّلَ دَمٍ أَضَعُ مِنْ دِمَائِنَا دَمُ ابْنِ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ كَانَ مُسْتَرْضِعًا فِي بَنِي سَعْدٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ وَأَوَّلُ رِبًا أَضَعُ رِبَانَا رِبَا عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللَّهِ وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ وَلَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ. فَإِنْ فَعَلْنَ ذَلِكَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَقَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ إِنِ اعْتَصَمْتُمْ بِهِ كِتَابَ اللَّهِ. وَأَنْتُمْ تُسْأَلُونَ عَنِّي فَمَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ؟ قَالُوا نَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ وَأَدَّيْتَ وَنَصَحْتَ. فَقَالَ: بِإِصْبَعِهِ السَّبَّابَةِ يَرْفَعُهَا إِلَى السَّمَاءِ وَيَنْكُتُهَا إِلَى النَّاسِ اللَّهُمَّ اشْهَدِ اللَّهُمَّ اشْهَدْ . ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ أَذَّنَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى أَتَى الْمَوْقِفَ فَجَعَلَ بَطْنَ نَاقَتِهِ الْقَصْوَاءِ إِلَى الصَّخَرَاتِ وَجَعَلَ حَبْلَ الْمُشَاةِ بَيْنَ يَدَيْهِ وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ وَذَهَبَتِ الصُّفْرَةُ قَلِيلاً حَتَّى غَابَ الْقُرْصُ وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ خَلْفَهُ وَدَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ شَنَقَ لِلْقَصْوَاءِ الزِّمَامَ حَتَّى إِنَّ رَأْسَهَا لَيُصِيبُ مَوْرِكَ رَحْلِهِ وَيَقُولُ أي يَسِيرُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى، أَيُّهَا النَّاسُ السَّكِينَةَ السَّكِينَةَ. كُلَّمَا أَتَى حَبْلاً مِنَ الْحِبَالِ أَرْخَى لَهَا قَلِيلاً حَتَّى تَصْعَدَ حَتَّى أَتَى الْمُزْدَلِفَةَ فَصَلَّى بِهَا الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا شَيْئًا ثُمَّ اضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ وَصَلَّى الْفَجْرَ - حِينَ تَبَيَّنَ لَهُ الصُّبْحُ - بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حَتَّى أَتَى الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَدَعَا اللهَ وَكَبَّرَهُ وَهَلَّلَهُ وَوَحَّدَهُ فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى أَسْفَرَ جِدًّا فَدَفَعَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ وَأَرْدَفَ الْفَضْلَ بْنَ عَبَّاسٍ وَكَانَ رَجُلاً حَسَنَ الشَّعْرِ أَبْيَضَ وَسِيمًا فَلَمَّا دَفَعَ

رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَرَّتْ بِهِ ظُعُنٌ يَجْرِينَ فَطَفِقَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهِنَّ فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَهُ عَلَى وَجْهِ الْفَضْلِ فَحَوَّلَ الْفَضْلُ وَجْهَهُ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ يَنْظُرُ فَحَوَّلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ عَلَى وَجْهِ الْفَضْلِ يَصْرِفُ وَجْهَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ يَنْظُرُ حَتَّى أَتَى بَطْنَ مُحَسِّرٍ فَحَرَّكَ قَلِيلاً ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى الَّتِي تَخْرُجُ عَلَى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى حَتَّى أَتَى الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الشَّجَرَةِ فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنْهَا مِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ رَمَى مِنْ بَطْنِ الْوَادِي ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمَنْحَرِ فَنَحَرَ ثَلاثًا وَسِتِّينَ بِيَدِهِ ثُمَّ أَعْطَى عَلِيًّا فَنَحَرَ مَا غَبَرَ وَأَشْرَكَهُ فِي هَدْيِهِ ثُمَّ أَمَرَ مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ بِبَضْعَةٍ فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ فَطُبِخَتْ فَأَكَلاَ مِنْ لَحْمِهَا وَشَرِبَا مِنْ مَرَقِهَا ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَفَاضَ إِلَى الْبَيْتِ فَصَلَّى بِمَكَّةَ الظُّهْرَ فَأَتَى بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ يَسْقُونَ عَلَى زَمْزَمَ فَقَالَ: انْزِعُوا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَلَوْلاَ أَنْ يَغْلِبَكُمُ النَّاسُ عَلَى سِقَايَتِكُمْ لَنَزَعْتُ مَعَكُمْ. فَنَاوَلُوهُ دَلْوًا فَشَرِبَ مِنْهُ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود. والله أعلم[1].

لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە لە باوکییەوە (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: چووین بۆ لای جابیر کوڕی عەبدوڵڵا خودایان لێ رازی بێ کوێر بوو بوو، یەکە یەکە دەیپرسی: ئەمە کێیەو ئەوە کێیە، تا سەرە هاتە سەرمن، گوتم: من موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینم، کەوام گوت دەستی هێنا بەسەرماو دەستی هێنایە خوارەوە بۆسینگ و بەرۆکم و دوگمەی سەرەوەو دوگمەی خوارەوەی ترازاندم و لەپی هێنا بەسینگما بۆ موبارەکی و گوتی: خۆش هاتی ئەی برازای خۆشەویستم! پرسیارت چییە بیکە. منیش ئەو حەلە کوڕێکی لاوبووم، ئینجا کاتێ نوێژ داهات هەڵسا نوێژی بۆ کردین تەیلەسانێکی لەبەردابوو، پێچابووی لە خۆیەوە، لەبەر بچووکی کە دەیدا بەسەر شانیا چمکەکانی هەڵدەکشانەوە بۆلای خۆی، پەشتە ماڵ (ریداء)ەکەشی لە تەنیشتیەوە بەسەر سێ پایەکەوە بوو، جا کە نوێژی بۆ کردین لە پاشا لێم پرسی گوتم: باسی حەجەکەی پێغەمبەرم بۆ بکە (درودی خودای گەورەی لەسەربێ) جا

---

[1] مسلم. حج: ٢٩٤١. أبو داود. مناسك: ١٩٠٥.

نۆپەنجەی خۆی ژماردو گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نۆ ساڵ مایەوە لە مەدینە، لەو ماوەیەدا حەجی نەکرد، جا لەساڵی دەهەمدا جاڕی دا بەناو مەردومدا کە: ئەمساڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەچێ بۆ حەج. ئیتر عەشامەتێکی گەلێ زۆر هاتن بۆ مەدینە وە هەموویان دەیان ویست کە پەیڕەوی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بکەن و چاو لەو بکەن و ئەو هەرچی کرد لە حەجەکەیا ئەوانیش بیکەن. ئینجا لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) کەوتینە رێ و رۆیشتین تا گەیشتینە ذولحەلەیفە لەوێ ئەسمای کچی عومەریس موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکی بوو، وە هەواڵی نارد بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە چۆن بکا؟ فەرمووی: خۆت بشۆرەو ناواخنی بۆ خۆت بکەو تۆپەوانەیێ بۆ وانێکەکەت بکەو خوێنەکەی پێ بەربەست بکەو ئیحرام ببەستە.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) لەوێ لە مزگەوتەکەدا نوێژی عەصری کرد، ئینجا سواری قەصواء بوو رۆیشت تا بەسواری سەرکەوتە سەرکێوی بەیدا، لەوێ بەهەر چوار لادا تەماشام کرد تا چاوم بڕی دەکرد هەر سواربوو وە هەر پیادە بوو لە دەوری حەزرەت (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) ئەو دەمە وەك ئێستا نەبوو حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی لەناو مانابوو پەیتا پەیتا قورئانی بۆ دەهاتە خوارێ، وە خۆی بە جوانی راڤەو تەفسیری قورئانەکەی دەزانی، ئیتر ئەو خۆی هەرچی بکردایە ئێمەیش لەشوێن ئەوەوە ئەوەمان دەکرد، ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بەم وشە پیرۆزەیە کە دروشمی یەزدان پەرستییەو نیشانەی یەکتایی خودایە ئیحرامی حەجی بەست:

لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ:

مەردوومەکەی تریش ئا بەمەی خۆیان ئیحرامی پێ دەبەستن بەوە ئیحرامیان بەست، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لێی نەگرتن، وەلێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ خۆی هەر لەسەر تەلبییەکردنەکەی خۆی بەردەوام بوو.

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: تەنیا هەر نیازی حەجمان هەبوو خەیاڵی عەمرەمان نەبوو چونکە لەوەوپێش لە رۆژانی حەجدا عەمرەمان نەدەکرد، تا ئەو حەلە کە لە خزمەتی حەزرەتدا چووینە بەیت و لەوێ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەستی هێنا بەروکنی حەجەرولئەسوەدداو ماچی کردو سێ جار بە هەڕاکردن و چوار جار بەرۆیشتنی ئاسایی هەڵسووڕا بە گردی خانەی خواداو، ئینجا رۆیشت بۆ مەقامی ئیبراهیم (درودی خودای گەورەی لەسەربێ) ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە:

{وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى} ب – ٢ ز – ٩٤ ف – ٢.

وە مەقامی خستە بەینی خۆی و بەینی بەیتەوەو دوو رکات سوننەتی نوێژی تەوافی کردو لە رکاتی یەکەمداو لەپاش خوێندنی سوورەتی فاتیحا سوورەتی {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ}ەی خوێند، وە لە رکاتی دووەمدا لە پاش خوێندنی سوورەتی فاتیحا سوورەتی {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ} خوێند، ئینجا گەڕایەوە بۆ سەر حەجەرولئەسوەدو دیسانەوە دەستی پیا هێنایەوە ئینجا لە دەرگای نزیك صەفاوە دەرچوو رۆیشت بۆ صەفا، کە لە صەفا نزیك بووەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ} ب – ٢ ز – ٩٤ ف – ٢.

وە فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): بەوەیان دەست پێ بکەن کە خودا پێشی خستووە ئینجا دەستی کرد بە تەوافی صەفاو سەرکەوتە سەر تەپۆڵکەی صەفا تا خانووی بەیتی لێوە دەرکەوت، جا رووی کردە رووگەو شایەتمانی هێناو ئەڵلاهو ئەکبەری کردو فەرمووی:

لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كَلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لاَ إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَحْدَهُ أَنْجَزَ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ: (ب–٢ / ز: ٨٨/ف–١).

هەر خودا خودایەو تاك و تەنیایە، بێ هاوەڵ و بێ چوونە، خاوەنی موڵك و پادشایی و سەڵتەنەتە، سوپاس و ستایش هەر لەخۆی جوانەو هەر قابیل بەخۆیەتی، هیچی لەدەست دەرناچێ و تەوانای هەموو شتێکی هەیە، هەر خودا خودایە، بەڵێنەکەی خۆی هێنایەدی وە بەندەکەی خۆی کە موحەممەدە سەرخست، وە ئەو کۆمەڵانەی کە لە ڕۆژی غەزای خەندەکا گەلەکۆمەیان لە ئیسلام کرد بوو، خۆی بە تەنها شکاندنی و ژێری خستن! وە سێ جار حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم ذیکرەی خوێند، وە لە بەینی ئەم سێ جارەیشدا دەپاڕایەوە و دوعاو نزای تری دەکرد.

ئینجا داپەڕی بۆ مەڕوە کە پێی نایە ناو شیوەکەوە پێی هەڵگرت و خێرا ڕۆیی تا گەیشتە هەورازەکە ئینجا بە ئاسایی ڕۆیشت تا چووە سەر مەڕوە، وە لەسەر صەفا چیکرد لەسەر مەڕوەش هەمان شتی دووبارە کردەوە، تا دوا تەوافی لەسەر مەڕوە تەواو بوو فەرمووی: تازە لە دەستم چوو ئەگینا دیاریی بەیتم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، وە دەم کرد بە عەمرە، جا هەر کەسەتان کە دیاریی پێ نیە با ئیحرام بشکێنێ و بیکا بە عەمرە سوراقەی کوڕی مالیکیش هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە هەر بۆ ئەمساڵ وایە یاخود هەتا هەتایە هەر وادەمێنێ؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) پەنجەکانی خۆی تێك پەڕاندو دووجار فەرمووی: عەمرە تێکەڵی حەج بوو هەتا هەتایە! عەلیش (خودای لێ ڕازی بێ) لە یەمەنەوە وشتری قوربانی هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) عەلی کە هات ڕوانی فاطیمە (خودای گەورەی لێ ڕازی بێ) ئیحرامی شکاندووەو جلی ڕەنگاویی پۆشیوەو چاوی ڕشتووە، جا گوتی: ئەمە چییە؟ فاطیمەیش گوتی: باوکم فەرموویەتی وا بکەم. گوتی: کاتێ عەلی لە عێراق بوو دەیگوت: جا چووم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تا گاڵی بدەم لە فاطیمە، کە بۆ وای کردووە، وە بۆ ئەو قسەیەش کە گوتی باوکم فەرموویەتی کە وا بکەم هەرلێم پرسی وە عەرزیشمکرد کە من ئەو کارەی ئەوم پێ خۆش نیە، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: فاطیمە ڕاست دەکا من خۆم پێم گوتووە تۆ کە ئیحرامی حەجت دابەست چیت گوت؟

گوتم: گوتوومە ئەی خودایە! ئەوا نییەتی حەجم هێنا لەسەر ئەو نییەتەی کە پێغەمبەری تۆ دەیهێنێ. فەرمووی: دەتۆ ئیحرام مەشکێنە، چونکە من دیاریی بەیتم پێیە.

گوتی: ئەو دیارییەی کە عەلی لە یەمەنەوە هێنابووی لەگەڵ ئەو دیارییەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەگەڵ خۆی هێنابووی سەرجەم سەد وشتر بوون.

گوتی: ئیتر خەڵکەکە هەموو ئیحرامیان شکاندو مووی سەریان کورت کردەوە، پێغەمبەرو ئەو کەسانە نەبێ کە دیاریی بەیتیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، جا لەرۆژی تەروییەدا کە دەکاتە رۆژی هەشتەمی مانگی نۆمینە بەرەو مینا جمان و ئیحرامی حەجیان بەست، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سواربوو، وە نوێژی نیوەڕۆو عەصرو شێوان و خەوتنان و بەیانیی لەوێ کرد، ئینجا لەوێ کەمێ مایەوە تا خۆر هەڵهات، وە فەرمانیدا کە لە نەمیرە دەوارێکی بۆ هەڵدەن، جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کەوتە رێ قورەیش وایان دەزانی کە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) وەك سەردەمی نەزانی خۆیان لە مەشعەرولحەرام دەوەستێ، بەڵام پێغەمبەر لەوێ رەت بوو، وە نەوەستاو رۆیشت تا چووە نزیکی عەرەفە سەیری کرد لە نەمیرە دەوارەکەیان بۆ هەڵداوە، جا لەوێ دابەزی وە لەوێ مایەوە تا خۆر لای دا.

ئەوجا فەرمانی کرد، قەصوایان بۆ کوپان کردو چوو بۆ ناو شیوەکەو لەوێ وتارێکی داو فەرمووی: خوێن و سەرو ماڵ و ناموستان لەیەکتریی زۆر حەرامە، وەك چۆن شکاندنی رێزی ئەم رۆژە پیرۆزەتانا لەم مانگە پیرۆزەتان لەم شارە پیرۆزەتانا زۆر زۆر حەرامە ئاوا، ئاگاداربن! کە وا هەرچی کاروباری سەردەمی نەزانییە پووچەو بەتاڵەو بێ بایەخە، خوێنی سەردەمی نەزانی بەتاڵە، وە یەکەم خوێن (لە خوێنی کەسوکاری خۆم) کە بەتاڵ و بێ بایەخی دادەنێم خوێنی کوڕەکەی رەبیعەی کوڕی حاریسە، کە لەناو هۆزی بەنی سەعددا درابوو بەدایەن وە هۆزی هوزەیل دەیکوژن. وە سوودی سەردەمی

نەزانی هەمووی پووچ و بەتاڵە، وە یەکەم سوودیش (لە سوودی کەسوکاری خۆم) کە بەتاڵی دەکەمەوە سوودی عەبباسی کوڕی موطڵەلیبە، ئەو سوودە هەمووی بەتاڵە، وە دەربارەی ئافرەتانیش لە خودا بترسن و بێ دادیی و ناهەقییان لێ مەکەن و ڕەفتارتان جوان بێ لەگەڵیانا، چونکە ئەوان ئەمانەت و سپاردەی خودای گەورەن لەلای ئێوەی پیاوان، پیاو هەر خیانەت بکا نابێ خیانەت لە ئەمانەتی خودای خۆی بکا! وە ئەوان لەسەر فەرموودەی خوداو بەپێی قسەی شەریعەتی ئەو حەڵاڵ بوون بۆتان و دێنە بەخەڵتان و دەچنە لایان.

وەمافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە کە ئەو کەسە کە ئێوە حەزی لێ ناکەن نەیهێننە سەربەڕەتان و نەیەڵن بێتە ماڵتان، جا ئەگەر شتێ وایان کرد کە بەدڵی ئێوە نەبوو، ئەوا تا دەتوانن چاوپۆشییان لێ بکەن و بەنەرمونیانی لەگەڵیانا ڕەفتار بکەن، وە بەبێ هۆیەکی ڕەوا تەڵاقیان مەدەن، بەڵام ئەگەر بەم شێوە شیرینەیش چاریان نەکرا ئەوا شەریعەت ڕێگەتان دەدا کە بە ئەسپایی لێیان بدەن.

وە مافی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە کە بەباشی و بەپێی باوی وڵاتی خۆتان ڕۆژی و خۆراک و بەرگ و پۆشاکیان پێ بدەن وەکی هاوسەری هاوشانی خۆتان، تا هەست بە هاوسەر کەمی نەکەن!

وە من یاسایەکی وەهایشم لەپاش خۆم بۆ جێ هێشتوون ئەگەر بێتو پەیڕەوی بکەن لەناو خۆتانا هەتا هەتایە جارێکی تر سەرتان لێ ناشێوێ، ئەویش ئەم قورئانەیە کە نامەی خودایە.

وە ئێوە لەدوا ڕۆژدا لەبارەی منەوە پرسیارتان لێ دەکرێ، جا ئێوە وەڵامتان چی دەبێ؟

گوتیان: شایەتی دەدەین کە تۆ کۆتایی و درێغیت نەکردووە تەبلیغی خۆتت کردووەو ئەرکی سەرشانی خۆتت بەجێ هێناوەو ئامۆژگاری خێری ئێمەت کردووە!

**جا حەزرەت** (صەڵات‌و سەلام‌و دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) **سێ جار پەنجەی دۆشاو مـژەی[1] خـۆی هـەڵبڕی بـۆ ئاسمـان‌و داینەوانـدەوە بـۆ نـاو خەڵکەکـەو هـەموو جارێکیش لەگەڵ ئەم ئاماژەیەوە دەیفەرموو: خودایە! تۆ بە شایەت بە.**

---

[1] پەنجەی پاڵ پەنجەکەڵە بە عەرەبی وەك پێی دەگوترێ (سبابە) پێشی دەگوترێ (مـسبحە) لـە کوردیـشا وەك پێـی دەگـوترێ دۆشـاومژە پێـشی دەگـوترێ پەنجـەی شـایەتمان، سـبابە لـە (سب) وەرگیراوە کە بە مانا جمێنە چونکی لـەکاتی شـەڕەجنێودا ئامـاژەی پـێ دەکـرێ، مـسبحەیش لـە تەسبیح وەرگیراوە، چونکی لەکاتی تەسبیحات کردنا ئامـاژەی پـێ دەکـرێ، جا هـەر چـەند گەلێ دوورەکە هەموو کاتێ وەجهەتەسمییە لە دووزمانا یەك شـت بـێ وەڵێ بـەپێی بـواری گونجـاو مـن هەوڵم داوە کە ئەم خاڵانەی پاشەوە رەچاو بکەم هەتا خوێنەری تەرجەمەکە وا هەست بکا کە خۆی لەناو رووداوەکەدا دەژی وەك چۆن خوێنەری دەقە عەرەبییەکە رێك وا هەست دەکا:

١- وشە عەرەبی‌و وشە کوردییەکان بەپێی توانا وەك دوو برای دوانە وابن لە هـەموو روویەکـەوە لەیـەك بـچن، وەك لێرانـەدا سـبابە تەرجەمـە بکـرێ بـە دۆشـاومژە، چـونکە ئامـاژەکردن‌و دۆشاومژین لە بارترن بۆ یەکترو بگرە لە مێژتریشن لە تەسبیحات کردن‌و شایەتمان هێنان!

جا ئەم جۆرە وردەکارییە گەلێ لایەنی باس‌و شتەکە روون دەکاتەوە هـەر لەبـەر ئەوەیـە کـە مـن قسەو گفتوگۆو گێڕانەوەی باس‌و خواس‌و هەڵسان‌و دانیشتنی ناو یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەك خۆیان (رەزای خودایان لێبێ) بەبێ تەکللوف‌و تەصەننوع نەقڵ دەکەم!

٢- لە هەنـدێ شـوێنا، قـسەبەر، یـا قـسەکەر هەنـدێ جـێ تـەماوی دەکـاو شـوێنەکە بـاش روونـاك ناکاتەوەو بە غامیضی‌و تاریکی دەیهێڵێتەوەو قەدبڕ بەسـەریا تـێ دەپـەڕێ، جا یـا لەبـەر کـورت برییە، یا لەبەر هەندێ هۆی هونەری‌و تایبەتییە، هەتا هەنـدێ لایـەنی شتەکە سـەرواڵا نـەبێ‌و لەژێر پەردەدا بمێنێتەوە، یا لەبەر هەر هۆیەکی ترە، منیش لەم شوێنانەدا وەهام کردووە.

دیارە ئەم تەرجەمەیە ئەگەر وەك ئەصڵی مەتنەکە شەرحێکی رێك‌و پێکی بـە کـوردی لێ بکـرێ ئەوە نـوور لـەبان نـوورەو خـوا حـەزکا دەبـێ بەمایـەی رۆشـنایی‌و نـووری چـاوی نـووری وە ئـەم کەلێنەش پڕ دەکاتەوە!

٣- گـەلێ وشـەو رسـتە هەیـە کـە بەچـەن جـۆری جیاجیـا راڤـەو شـەرح کـراون، بەتایـەبت بەشـی ناوەکان، ئیتر چ ناوی شوێن بن، یا نـاوی مـەل‌و جانـەوەرو گیانلەبـەربن، یـا نـاوی جل‌و بـەرگ‌و پۆشـاك بـن، یـا نـاوی دارو درەخـت‌و درك‌و داڵ‌و گیـاو گژبن، تەنانـەت خـاوەنی فەرهەنگەکان‌و

ئینجا فەرمانی دا بانگ دراو قامەت کراو نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین‌و فەرمانی کردەوە قامەت کرایەوەو نوێژی عەصریشی •بە (جەمع) بۆ کردین، وە لە بەینیانا هیچ نوێژی تری نەکرد.

ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سواربوو ڕۆیشت تا گەیشتە ئێستگاکەی خۆی لە عەرەفات. جارووی وشترەکەی (کە ناوی قەصواء بوو) کردە تاوێرە بەردەکانی داوێنی کێوی جەبەلوڕەحمە کە ئەم چیای ڕەحمەتە خۆی وا لەناوەڕاستی خاکی عەرەفاتدا وەکۆمەڵی حاجییە پیادەکانی خستە بەردەمی خۆیەوە، وە ڕووی کردە ڕووگە.

ئیتر لەوێدا ڕاوەستا تا خۆر ئاوابوو، جا ئوسامەی خستە پاشکۆی خۆیەوەو داپەڕی بۆ موزدەلیفە، هەوسارەکەی قەصواشی وا گورج کردبۆوە، تەنانەت سەری قەصوا دەیدا لە قەڵبووزی کۆپانەکەی، وە بە دەستی ڕاستیشی ئامارژەی دەکردو دەیفەرموو: خەڵکینە! لەسەر خۆبن، خەڵکینە هێواش بەڵام کە دەگەیشتە تەپکەو ماسۆڵکەلمێ، کەمێ جڵەوەکەی بۆ قەصوا شل دەکرد، تا سەر دەکەوتە سەری، جا ڕۆیشت تا تەشریفی گەیشتە موزدەلیفە جا لەوێ نوێژی شێوان‌و خەوتنانی بە جەمعەتەئخیرکرد بەیەك بانگ‌و بە دوو قامەت، وە هیچ نوێژی سوننەتی لە بەینیاندا نەکرد، ئینجا تەشریفی خەوت هەتا شەبەقی دا.

---

شەرح‌و ڕافە نووسەکانیش لەگەڵێ شوێنا، نەك هەر قسەیان یەك نییە، بەڵکوو قسەکانیان دژی یەکترییە، وەك (قرء)یەکێ دەڵێ: پاکییە، یەکێ دەڵێ: بێپیسی‌و بێنوێژییە، وەك (یربوع) ئەحمەدی دەڵێ: گۆڕ هەڵکەنەیە، مامۆستا مەی کەریمی بیارە لە شەریعەتی ئیسلامدا دەڵێ: ڕزقە سەرەڕای ئەمەیش گەلی کورد گەلێکی کوێستانین، گەلی عەرەب گەلێکی گەرمیانین، لەبەر ئەوە زۆرشت هەیە لەم لا هەیە لەو لا نییە، جا مـن بۆ چارەسەری ئەم کێشەبە گەڵێ تەقلام داوە، جاری وا بووە بیخەیتە سەریەك یەك حەفتە خەریکی ساخکردنەوەی یەك وشەبووم، لەگەڵ ئەوەشا هەر خوا هەڵە ناکا. - وەرگێڕ -

جا کە بەیانی تەواوی دا فەرمانی دا بانگ دراو قامەت کراو نوێژی بەیانیی کرد. ئینجا سواری قەصوا بووەو ڕۆیشت تا گەیشتە مەشعەرولحەرام، جا ڕووی کردە ڕووگەو لە خودا پاڕایەوەو ئەڵڵاهو ئەکبەرو تەلیلەی کردو ناوی خودای تاك و تەنیای هێنا.

وە لەوێ ڕاوەستا تا تەواو دنیا ڕووناك بووەوە، جا لەپێش خۆرکەوتندا کەوتە ڕێ بۆ مینا، وە فەضلی کوڕی عەبباسی خستە پاشکۆی خۆی، فەضلیش پیاوێکی قژجوانی سپیلکەی شۆخ و قۆز بوو جا لەو کاتەدا کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کەوتە ڕێ تاقمێ ژن لەناو کەژاوەدا، دایان بەلایدا، فەضلیش دەستی کرد بە تەماشاکردنیان، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی نا بەڕووی فەضلەوەو بەرچاوی گرت، فەضلیش ڕووی وەرچەرخان بەولاداو لەولاوە تەماشای دەکرن.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی لەولاوە گواستەوە بۆ لایەکەی ترو نایەوە بە ڕووی فەضلەوە تا بەرچاوی بگرێتەوەو تەماشا نەکا. ئیتر حەزرەت ڕۆیشت تا گەیشتە ناو شیوی موحەسیر لەوێ تۆزێ خێرا لێی خوڕی و ڕێگەی ناوەڕاستی گرت کە دەچێ بەسەر کۆگای گەورەدا، جا ڕۆیشت تا گەیشتە لای کۆگا بەردەکە، کە لەلای دەرختەکەدایە، وە حەوت بەردی بۆ فڕێ دا، بەردەکان وەك بەردێ وابوون کە بە پەلەپیتکە دەهاوێژرێ، گشت جارێ کە بەردێکی تێ دەگرت ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، لەناو شیوەکەوە بەردەکانی تێ دەگرت.

ئینجا ڕۆیشت بۆ کوشتنگا (مەنحەر: کوشتارگە) کەو لەوێ بە دەستی خۆی شەست و سێ وشتری سەربڕی، ئینجا چەقۆکەی دا بە عەلی و عەلیش باقی مەندەی وشترە دیارییەکانی حەزرەتی سەربڕی، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) عەلی کرد بە هاوبەشی خۆی لەم وشترە دیارییەیانەدا، ئینجا فەرمانیدا لە گۆشتی هەر وشترێ پارچەیەکیان هێناو خستیانە ناو مەنجەڵێکەوە کوڵانیان و خۆی و عەلی لە گۆشتەکەیان خواردو لە ئاوی

مەرگەکەیان خواردەوە، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سواربوو، ڕۆیشت بۆ بەیت و تەوافل ئیفاضەی کرد، وە نوێژی نیوەڕۆی لە مەککە کرد. جا چوو بۆ لای بەنی عەبدولموططەلیب، کە لەسەر بیری زەمزەم ئاویان دەدا بە حاجیان. فەرمووی: ئەی نەوەی عەبدولموططەلیب! ئاو هەڵگوزن و بیدەن بە حاجییان و بەمەردوم نەبادا خەڵك وا تێ بگەن کە ئاو هەڵگۆزێنیش لە کردارەکانی حەجە وە لەم حاڵەدا زۆرتان بۆ بێنن و ڕێگەتان نەدەن کە بە ئاسایی ئاو بدەن بە حاجیان، نەبادا ئەمە روو بدا ئەگینا ئەم ئیشەی ئێوە ئەوەندە کارێکی پەسەندە منیش ئاوم هەڵ دەگۆست لەگەڵتانا جا ئەوانیش سەتڵێ ئاویان بۆ برد، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لێی خواردەوە (م/د).

## ١١٧) باسی پێنجەم: باسی عەمرە

## الباب الخامس: في العمرة

١٦٢٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَـا) قَالَ: إِنَّهَا لَقَرِينَتُهَا فِي كِتَابِ اللَّهِ (وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ)[1].

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ لەنامەی خودادا عەمرە هاوتاو هاوڕای حەجە کە وابوو ئەمیش وەك ئەو فەرزە: خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

{وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّهِ}.

ئەی موسوڵمانەکان! حەج و عەمرەتان کە دەست پێکرد تەواویان بکەن، وە هەر بۆ خودا بیکەن (ب).

١٦٢٧- وَقَالَ: ابْنُ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) لَـيْسَ أَحَـدٌ إِلاَّ وَعَلَيْـهِ حَجَّـةٌ وَعُمْـرَةٌ. رواهما البخاری[2].

---

[1] تعليق ذكره البخارى فى الباب/ ٢٦ من كتاب العُمرَة، قبل الرقم: ١٧٧٣.

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: هەموو کەسێ یەک حەج و یەک عەمرەی لەسەرە (ب).

١٦٢٨- عَنْ أَبِى رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِى شَيْخٌ كَبِيرٌ لاَ يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ وَلاَ الْعُمْرَةَ وَلاَ الظَّعْنَ. قَالَ: احْجُجْ عَنْ أَبِيكَ وَاعْتَمِرْ. رواه أصحاب السنن[٣].

ئەبو رەزینی عوقەیلی (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: گوتم: ئەی رەوانە کراوی خودا! باوکم پیرێکی ئیختیارەو تەواناى حەج و عەمرەو هاتوو چۆی نەماوە؟ فەرمووی: خۆت حەج و عەمرەی بۆ بکە (د/ت/ن-س/ص).

١٦٢٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سُئِلَ عَنِ الْعُمْرَةِ أَوَاجِبَةٌ هِيَ؟ قَالَ: لاَ وَأَنْ تَعْتَمِرُوا هُوَ أَفْضَلُ. رواه الترمذي وأحمد والبيهقي[٤].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئایا عەمرە فەرزە یانا؟ فەرمووی: فەرزنیە، بەڵام عەمرەکردن بۆ ئێوە خێرێکی گەلێ مەزنە (ت/ئەحمەد/بەیهەقی).

١٦٢٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاِمْرَأَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهَا أُمُّ سِنَانٍ مَا مَنَعَكِ أَنْ تَكُونِى حَجَجْتِ مَعَنَا؟ قَالَتْ: نَاضِحَانِ كَانَا لأَبِى فُلاَنٍ حَجَّ هُوَ وَابْنُهُ عَلَى أَحَدِهِمَا وَكَانَ الآخَرُ يَسْقِى عَلَيْهِ غُلاَمُنَا. قَالَ: فَعُمْرَةٌ فِى رَمَضَانَ تَقْضِى حَجَّةً. أَوْ حَجَّةً مَعِى. رَوَاهُ الخمسة ولفظ البخارى: فَإِذَا كَانَ رَمَضَانُ اعْتَمِرِى فِيهِ فَإِنَّ عُمْرَةً فِى رَمَضَانَ حَجَّةٌ[٥].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: ژنێکی ئەنصاری هەبوو، ناوی ئوم سینان بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە لەحەج گەڕایەوە پێی فەرموو: بۆ نەهاتیت بۆ حەج لە گەڵمانا؟ ژنەکەیش گوتی: باوکی منداڵەکان دوو وڵاخی ئاو

---

[٢] تعليق مذكور فى الباب/ ٢٦ من كتاب العُمرَة قبل الرقم: ١٧٧٣.

[٣] بسند صحيح (شرحه).

[٤] رواه الترمذي وقال صحيح ولكن الحفاظ اتفقوا على ضعفه (شرحه).

[٥] بخاري. عُمرَة: ١٧٨٢، ١٨٦٣. مسلم. حج: ٣٠٢٨، ٣٠٢٩. نسائى. صوم: ٢١٠٩.

کێشی هەبوو، خۆی و کوڕەکەی بەسواری یەکێکیان چوون بۆ حەج، ئەویتریشیان خولامەکەمان ئاوی پێ دەکێشا لەبەر ئەوە پێم نەکرا بێم بۆ حەج فەرمووی: دەی عەمرە یەك لە رەمەزانا خۆی دەدا لە حەجێك یا فەرمووی: خۆی دەدا لە حەجێ لەگەڵ مندا! (ش/د/ت/ن) گفتەی (ب=بوخاری) ئاوایە: کاتێ رەمەزان بوو، عەمرەیێ بکە، چونکە عەمرەیێ لە رەمەزانا بە حەجێکە!

١٦٢٩- راجع رقم: ١٤٧١/٢ من هذا المجلد[٦].

١٦٣٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُهِلَّنَّ ابْنُ مَرْيَمَ بِفَجِّ الرَّوْحَاءِ حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا أَوْ لَيَثْنِيَنَّهُمَا. رواه مسلم والله أعلم[٧].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەستە دیارە کە خودای گەورەیە لە فەججوڕەوحاوە عیسای کوڕی مەریەم ئیحرامی حەج یا ئیحرامی عەمرە، یا ئیحرامی هەردوکیان پێکەوە دەبەستێ و دەیان کات وە فەرزی حەج و فەرزی عەمرە تاجیهان بمێنی ئەوانیش دەمێنن (م).

## ١١٨) پێغەمبەر درودی خودای لەسەر چەند عەمرەی کردووە: (کم اعتمر النبي ﷺ)

١٦٣١- عَنْ قَتَادَةُ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسًا كَمْ حَجَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: حَجَّةً وَاحِدَةً وَاعْتَمَرَ أَرْبَعَ عُمَرٍ. كُلُّهُنَّ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، إِلاَّ الَّتِي كَانَتْ مَعَ حَجَّتِهِ. عُمْرَةً مِنَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مِنَ الْجِعْرَانَةِ حَيْثُ قَسَمَ غَنَائِمَ حُنَيْنٍ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مَعَ حَجَّتِهِ. رواه الثلاثة والله أعلم[١].

---

[٦] تقدم برقم: ١٤٧١/٢ فی تسلسل/ ٧٨ مجلد٢.

[٧] مسلم. حج: ٣٠٢٠ – ٣٠٢٢.

[١] بخاري. حج: ١٧٧٨، ١٧٧٩، ١٧٨٠، ٣٠٦٦، ٤١٤٨. مسلم. حج: ٣٠٢٣. أبو داود. حج: ١٩٩٤. ترمذی. حج: ٨١٥.

قەتادە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە ئەنەسم پرسی (خودای لێ رازی بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چەند حەجی کردووە؟ گوتی: لەپاش فەرز بوونی حەج یەك حەج وە لەپێش فەرز بوونیشا، بەر لە کۆچکردنی دوو حەج، وە چوار عەمرەشی کردووە، وە هەر چواریانی لە مانگی ناو جەژناندا کردووە، ئەوەیان نەبێ کە لەگەڵ حەجە (فەرزە)کەی کردی: عەمرەیەکیان لە کاتی رێکەوتنەکەی حودەبییەدا بوو، لە مانگی ناو جەژناندا بو هەر چەند کافرەکان رێگەیان نەدان کە تەواوی بکەن بەلاّم دادەنرێ بە عەمرەیێ، ئەمەیان لە ساڵی شەشی کۆچیدا بوو عەمرەیەکی تریان لە ساڵی ئاییندەدا بوو ئەمە عەمرەی دووهەمی بوو، وە لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بوو، وەپێی دەگوترێ: عەمرەتول قەضا، وە ئەویش هەر لە مانگی ناوجەژناندا بوو، عەمرەیەکی تریان لە کاتی غەزای حونەیندا بوو، لە جیعرانەوە ئیحرامی بەست بۆی، ئەمیش هەر لە مانگی ناوجەژناندا بوو، لەوکاتەدا کردی کە تالاّنەکەی غەزای حونەینی دابەشکرد ئەم عەمرەی سێیەمە لە ساڵی هەشتەما بوو کە ساڵی فەتحی مەککە بوو عەمرەکەیتریشیان کە چوارەمە ئەوە بوو کە لەگەڵ حەجە فەرزەکەیدا کردی ئەمە هەر چوار عەمرەکە (ش/د).

### ١١٩) کردارەکانی عەمرە (ئەعمالی عەمرە): (أعمال العمرة)

١٦٣٢- عَنْ مَرْوَانَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْمَدِينَةِ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي بِضْعَ عَشْرَةَ مِائَةً مِنْ أَصْحَابِهِ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِذِي الْحُلَيْفَةِ قَلَّدَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْهَدْيَ وَأَشْعَرَ وَأَحْرَمَ بِالْعُمْرَةِ. رواه البخاري وأبو داود وأحمد[1].

مەڕوان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەکاتی رووداوی حودەیبییەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی‌و نزیکەی هەزارو چوار سەدکەس لە یارانی، لە مەدینەوە رۆیشتن بۆ مەککە، جارۆیشت تا گەیشتە ذولحولەیفە لەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وشترە دیارییەکانی بەیتی دیاری کردو یەکی

---

[1] بخاري. حج: ١٦٩٤، ١٨١١، ٢٧١٢، ٢٧٣١، ٤١٥٨، ٤١٧٨ — ٤١٨١ + ١٦٩٥، ٢٧١١، ٢٧٣٢، ٤١٥٧، ٤١٧٩، ٤١٨٠.

جووتێ سۆلی کردە ملیان و تیفی دا لە دووگیان تا نیشانە بن کە ئەمانە دیاری ماڵی خودان با کەس دەستیان بۆ نەبا، وە لە میقاتەوە ئیحرامی عەمرەی بەست (ت/د/ ئەحمەد).

١٦٣٣- تقدم برقم: ١٥٠١/٢ من تسلسل/٨٣[٢].

١٦٣٤- سَأَلْنَا ابْنَ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنْ رَجُلٍ طَافَ بِالْبَيْتِ فِي عُمْرَةٍ، وَلَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ أَيَأْتِي امْرَأَتَهُ فَقَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا، وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، فَطَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعًا (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ). رواه البخارى[٣].

پرسیار کرا لە ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ): پیاوێ (لە کاتی کردنی عەمرەکەیدا) تەوافی بەیت بکا، بەڵام هێشتا تەوافی بەینی صەفاو مەڕوەی نەکردبێ ئایا دروستە بڕواتە لای ژنی خۆی؟ گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە چوو بۆ عەمرە، حەوت جار هەڵسووڕا بەدەوری بەیتاو لە پشتی مەقامی ئیبراهیمەوە دوو رکات نوێژی سوننەتی تەوافی کردو حەوت جاریش تەوافی بەینی صەفاو مەڕوەی کرد، وە بێگومان کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رەهبەرو سەرمەشقێکی گەلێ جوانە بۆ ئێوە، وەکی خودا لەم ئایەتەدا دەفەرموێ:

(لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ):

١٦٣٥- وَقَالَ: ابْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ): اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاعْتَمَرْنَا مَعَهُ فَلَمَّا دَخَلَ مَكَّةَ طَافَ وَطُفْنَا مَعَهُ، وَأَتَى الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ وَأَتَيْنَاهَا مَعَهُ، وَكُنَّا نَسْتُرُهُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ أَنْ يَرْمِيَهُ أَحَدٌ. فَقَالَ: صَاحِبٌ لِي: دَخَلَ الْكَعْبَةَ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: فَحَدِّثْنَا مَا قَالَ: لِخَدِيجَةَ. قَالَ: بَشِّرُوا خَدِيجَةَ بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لاَ صَخَبَ فِيهِ وَلاَ نَصَبَ. رواه البخارى وأبو داود والنسائى[٤].

---

[٢] راجع رقم: ١٥٠١/٢ من هذا الجلد تسلسل/ ٨٣.

[٣] بخاري. حج: ١٦٤٥.

[٤] ١٧٩٢، ٣٨١٩.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) عەمرەمانکرد، کە گەیشتە مەککە تەوافی خانەی خودای کرد ئێمەیش لەگەڵیدا تەوافمانکرد، ئینجا چوو بۆ کردنی صەفاومەڕوە، ئێمەیش لەگەڵیدا صەفاومەڕوەمان کرد، وەك تەیمان دەورەیشمان لێ دابوو لە ترسی خەڵکی مەککە، نەبادا ناحەزێ شتێکی تێ گرێ.

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: برادەرێ گوتی پێم: ئایا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) چووە ناو ماڵی کەعبەوە؟ گوتم: نەء، گوتی: دە بۆمان بگێڕەوە کەچی بە خەدیجە فەرموو؟ گوتی: گوتم: فەرمووی: مژدە بدەن بە خەدیجە کە لە بەهەشتا کۆشکێکی بۆ هەیە، دارو پەردووەکەی لە لوولە قامیشی مرواری هەڵۆڵە، زڵەزڵ و هەراو هوریاو شەکەتی و ماندوویی تیا نیە! (ب/د/ن- خودایان لێ ڕازی بێ).

١٦٣٦- تقدم برقم: ١٥٩٦/١ فی تسلسل/ ١٠٩[٥].

## ١٢٠) کردنی عەمرە کاتی بۆ نیە: (لا وقت للعمرة)

١٦٣٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: إِنَّ قُرَيْشاً وَمَنْ دَانَ دِينَهُمْ كَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ الْعُمْرَةَ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ مِنْ أَفْجَرِ الْفُجُورِ فِي الأَرْضِ، وَيَجْعَلُونَ الْمُحَرَّمَ صَفَرًا وَيَقُولُونَ إِذَا بَرَأَ الدَّبَرْ، وَعَفَا الأَثَرْ، وَانْسَلَخَ صَفَرْ، حَلَّتِ الْعُمْرَةُ لِمَنِ اعْتَمَرْ. قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابُهُ صَبِيحَةَ رَابِعَةٍ مُهِلِّينَ بِالْحَجِّ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً فَتَعَاظَمَ ذَلِكَ عِنْدَهُمْ فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الْحِلِّ؟ قَالَ: الْحِلُّ كُلُّهُ. رواه الثلاثة[١].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: لەسەر دەمی نەزانیدا قوڕەیش و ئەوانەی کە لەسەر ئایینە پووچەکەی قوڕەیش بوون وایان دانابوو کە کردنی عەمرە (لە مانگەکانی حەجدا) لە گوناهە هەرە گەورەکانەو لە وەخراپتر رووی

---

[٥] سبق فی رقم: ١٥٩٦/١.

[١] بخاري. حج: ١٥٦٤، ٣٨٣٢. مسلم. حج: ٢٩٩٩. نسائي. مناسك: ٢٨١٢.

نەداوە لەسەر رووی زەوی! وە لەباتی مانگی موحەڕەم صەفەریان دەکرد بە مانگی حەرام.

وە دەیانگوت: کەزامو ناوکەرێژی پشتی وڵاخی ژێر حاجیان سارێژبوو، وە شوێنەواری کاروانی حاجیان کوێرەوە بوو، وە مانگی موحەڕەم تەواو بوو، ئەو حەلە کەسێ بیەوێ عەمرە بکا عەمرەی بۆ دروست بوو!

جا کاتێ لە حەجی ماڵئاواییدا کە پێغەمبەرو هاوڕێکانی (درودی خودا لە خۆیو رەزای خودا لە هاوڕێکانی بێ) لە بەیانی رۆژی چوارەمی مانگی نۆمینەدا هاتن بۆ مەککە ئیحرامی حەجیان بەستبوو، ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێکردن کە حەکەکەیان بکەن بە عەمرەو لە پاشا ئیحرام بشکێنن لەپاش تەواوکردنی کردارەکانی عەمرە بەڵام لە ئەوان ئەم کارە زۆر گەورەو گران بوو لەسەرشانیان چونکە ئەوان لەوەو پێش کردنی عەمرەیان لە مانگەکانی حەجدا بە گوناهێکی گەلێ گەورە دادەنا ئینجا کە باش لە باسەکە تێ گەیشتن گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! بەم ئیحرام شکاندنە چیمان بۆ حەڵاڵ دەبێتەوە لەو شتانەی کە بەهۆی ئیحرام بەستنەوە لێمان قەدەغە بوو بوون؟ فەرمووی: هەموو شتێکتان بۆ حەڵاڵ دەبێتەوە (ش/د، خودایان لێ رازی بێ).

١٦٣٩ – وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: هَذِهِ عُمْرَةٌ اسْتَمْتَعْنَا بِهَا فَمَنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ الْهَدْيُ فَلْيَحِلَّ الْحِلَّ كُلَّهُ فَإِنَّ الْعُمْرَةَ قَدْ دَخَلَتْ فِي الْحَجِّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. رواه مسلم والترمذى[٢].

دیسان ئەو (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەوانە کە لەسەر فەرمانی خۆی حەجەکەیان کرد بەعەمرە: ئەمە عەمرەیەك بوو کردمان بۆ خۆمان، جا هەرکەسێ دیاری بەیتی پێ نیە با بەئێجگاری ئیحرام بشکێنێ وە لەم ماوەیەدا تا ئیحرامی حەج دەبەستێتەوە هەموو شتێکی حەڵاڵی بۆ حەڵاڵ دەبێتەوە ئیتر لەم رۆژە شەوە، تا رۆژی

---

[٢] مسلم. حج: ٣٠٠٤. أبو داود. مناسك: ١٧٩٠. نسائی. مناسك: ٢٨١٤.

قیامـەت کردنـی عـەمرە لـە مانگـەکانی حەجـدا دروسـتە (م/ت – موسـلیم و تیرمیذی، خەدایان لێ رازی بێ).

١٦٤٠– عَنْ مُحَرِّشٍ الْكَعْبِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ مِنَ الْجِعْرَانَةِ لَيْلاً مُعْتَمِرًا فَدَخَلَ مَكَّةَ لَيْلاً فَقَضَى عُمْرَتَهُ ثُمَّ خَرَجَ مِنْ لَيْلَتِهِ فَأَصْبَحَ بِالْجِعْرَانَةِ كَبَائِتٍ بِهَا. رواه أصحاب السنن وحسنه الترمذي واللفظ له[٣].

موحەڕیشی ئەل–کەعبی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە جیعرانەوە بەشەو رۆیشت بۆ عەمرە، جا هەر ئەو شەوە رۆیشتە ناو مەککەوەو عەمرەکەی تەواوکردو هەر ئەو شەوەیش گەڕایەوە بۆ جیعرانەو ماوەی شەو لەوێ مایەوە تا بەیانی (ت:ح– د/ن).

## ١٢١) مانەوە لە مەککە لەپاش تەواوکردنی حەج و عەمرە، وە تەوافی ماڵاوایی: (الإقامة بمكة بعد النسك وطواف الوداع)

١٦٤١– قَالَ: عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ لِلسَّائِبِ بْنَ يَزِيدَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) هَلْ سَمِعْتَ فِي الإِقَامَةِ بِمَكَّةَ شَيْئًا؟ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ الْحَضْرَمِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ: رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقِيمُ الْمُهَاجِرُ بِمَكَّةَ بَعْدَ قَضَاءِ نُسُكِهِ ثَلاَثًا. رواه الخمسة[١].

عومەری کوڕی عەبدلعەزیز بە سائیبی کوڕی یەزیدی گوت (خودا لێیان خۆش نوودبێ) لە بارەی مانەوە وە لە مەککەدا لەپاش تەواوکردنی حەج و عەمرە شتێکت ژنەوتووە؟ گوتی: ژنەوتم لە عەلای کوڕی حەضرەمی (خودای لێ رازی بێ) دەیگوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لایە (واتە: لاوەکی: کەسێ

---

[٣] حسن عند الترمذي وعده النسائي صحيحا (شرحه).

[١] بخاري. مناقب الأنصار: ٣٩٣٣. مسلم. حج: ٣٢٨٤ – ٣٢٨٨. ترمذی حج: ٩٤٩. نسائي. تقصر الصلاة فی السفر: ١٤٥٣.

کە خەڵکی مەککە نەبێ) لەپاش تەواوکردنی کردارەکانی حەج و عەمرە هەقی هەیە سێ شەوی تر لە مەککە بمێنێتەوە (ش/د/ت/ن).

١٦٤٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَنْصَرِفُونَ فِي كُلِّ وَجْهٍ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ. رواه الخمسة إلا البخاري. ولفظ الترمذي: مَنْ حَجَّ هَذَا الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلْيَكُنْ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ. فَقَالَ: لَهُ عُمَرُ: خَرَرْتَ مِنْ يَدَيْكَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَمْ تُخْبِرْنَا بِهِ[٢].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: جاران موسوڵمانان کە حەج و عەمرەیان تەواو دەکرد ئیتر بە هەر چوارلادا بڵاوەیام لێ دەکرد تا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەس بڵاوەی لێ نەکا تا تەوافی بەیت نەکا (م/د/ت/ن — خودایان لێ رازی بێ) گفتەی (ت) ئاوایە: هەر کەس حەجیماڵی خودای کرد، یا عەمرەی بەجێ هێنا با لە پاشدا تەوافی خوا حافیزی لە بەیت بکا! عومەریش (خودای لێ رازی بێ) پێی گوت: تەرییق بیتەوە ئەمەشت بیستووە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کەچی پێشمان ناڵێیت!

١٦٤٣- وَعَنْهُ قَالَ: أُمِرَ النَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ، إِلاَّ أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الْحَائِضِ. رواه الشيخان والنسائي[٣].

دیسان هەر ئەو گوتی: فەرمان کراوە بە موسوڵمانەکان کە لەپاش حەج و عەمرە دواکاریان تەوافی ماڵی خودا بێ، بەڵام بۆ ئافرەتی بێنوێژ یا زەیستان چاو پۆشی لەم تەوافە دەکرێ (ش/ن — خودایان لێ رازی بێ).

---

[٢] بخاري. طهارة: ٣٢٩، ١٧٦١، ١٧٦٠، ١٧٥٥. مسلم. حج: ٣٢٠٦، ٣٠٢٧. أبو داود. مناسك: ٢٠٠٢.

[٣] بخاري. حج: ١٧٦١. مسلم. حج: ٣٢٠٧.

## ١٢٢) باسی شەشەم: باسی ئیحصار، واتە: قەدەغە کردنی حاجیو عەمرەکەر لە تەواکردنی حەجو عەمرە، وە باسی گێڕانەوەی حەجو عەمرە، وە باسی فیدیەدان، باسی ئیحصار لە حەجا:

## الباب السادس: في الاحصار والقضاء والفدية الاحصار في الحج

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّهِ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلاَ تَحْلِقُواْ رُؤُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ. {صَدَقَ اللهُ العَظِيمُ}.

**خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانەکان! حەج و عەمرە لەسەر یاسای ئایین تەواو بکەن، ساخ بۆ رەزای خودای گەورە، جا ئەگەر قەدەغە کران (لەپاش ئیحرام بەستن) لە تەواوکردنیان، لەلایەنی دوژمنەوە، یا بەهۆی نەخۆشینەوە، ئەوە ئیحرامەکەتان بشکێنن بەوە کە چیتان بۆ هەڵ دەسووڕێ لە ئاژەڵی دیاری سەری ببڕن لەوێدا کەرێی حەج و عەمرەکەتان لێ دەگیرێ، وە سەرتان مەتاشن (کە نیشانەی ئیحرام شکاندنە) تا ئاژەڵە دیارییەکە دەگا بەجێی خۆی. واتە: سەری دەبڕن لەو شوێنەدا کە گیرتان خواردووە.**

١٦٤٤- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: أَلَيْسَ حَسْبُكُمْ سُنَّةَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، إِنْ حُبِسَ أَحَدُكُمْ عَنِ الْحَجِّ طَافَ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ حَلَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ، حَتَّى يَحُجَّ عَامًا قَابِلاً، فَيُهْدِي أَوْ يَصُومُ، إِنْ لَمْ يَجِدْ هَدْيًا. رواه البخاري[1].

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: ئایا سوننەتی پێغەمبەرتان بەس نیە؟ ئەگەر کەسێ لە ئێوە تەواوکردنی حەجی لێ قەدەغەکرا لەلایەن دوشمنەوە، یا لەهۆی ناساغییەوە ئەوا تەوافی بەیت بکاو صەفاو مەروە بکا، ئینجا ئیحرامی تەواو بشکێنێ لە هەموو شتێ، وە لە ساڵی ئایندەدا حەجەکەی بکاتەوە، بەڵام ئەگەر هەیبوو دەشێ قوربانییەك سەر ببڕێ، ئەگینا دە رۆژ بە رۆژووبێ (ب= بوخاری - خودای لێ رازی بێ - ئەم حەدیثەی رایوایەت کردووە).**

---

[1] بخاری. کتاب المحصر: ١٨١٠.

١٦٤٥- عَنِ الْحَجَّاجِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: مَنْ كُسِرَ أَوْ عَرِجَ فَقَدْ حَلَّ وَعَلَيْهِ حَجَّةٌ مَنْ قَابِلٍ. قَالَ: عِكْرِمَةُ: فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا هُرَيْرَةَ عَنْ ذَلِكَ فَقَالاَ صَدَقَ. رواه أصحاب السنن[٢].

حەججاجی کوڕی عەمر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ پەکی بکەوێ یا لەنگ ببێ، ئەوە ئیحرامەکەی دەشکێ و ئاژەڵی دیاری سەر دەبڕێ، وە لە ساڵی ئاییندەدا حەجی لەسەرە، عەکرەمە گوتی: بۆ ئەم قسەیە لە ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرەم پرسی، گوتیان: حەججاج ڕاست دەکا (د/ت/ن - س/ص).

١٦٤٦- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ هَبَّارَ بْنَ الأَسْوَدِ جَاءَ يَوْمَ النَّحْرِ وَعُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَنْحَرُ هَدْيَهُ فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ أَخْطَأْنَا الْعِدَّةَ كُنَّا نُرَى أَنَّ هَذَا الْيَوْمَ يَوْمُ عَرَفَةَ. فَقَالَ: عُمَرُ اذْهَبْ إِلَى مَكَّةَ فَطُفْ أَنْتَ وَمَنْ مَعَكَ وَانْحَرُوا هَدْيًا إِنْ كَانَ مَعَكُمْ ثُمَّ احْلِقُوا أَوْ قَصِّرُوا وَارْجِعُوا فَإِذَا كَانَ عَامٌ قَابِلٌ فَحُجُّوا وَأَهْدُوا فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعَ[٣].

سولەیمانی کوڕی یەسار (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ڕۆژی جەژن بوو، عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) خەریکی سەربڕینی ئاژەڵی دیاری بەیت بوو، لەو کاتەدا هەبباری کوڕی ئەسوەد هات گوتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان!! ئێمە ژمارەی ڕۆژەکانمان لێ تێك چوو بوو، ئێمە ئەمڕۆمان بە ڕۆژی عەرەفە دەزانی جا لەم حاڵەتەدا چی بکەین؟ عومەریش (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: خۆت و ئەوانەی لەگەڵتان بچن بۆ مەککە لەوێ تەوافی ماڵی خودا بکەن و ئەگەر ئاژەڵی دیاریتان هێناوە سەری ببڕن، ئینجا سەرتان بتاشن یا کورتی بکەنەوە، وە بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان، جا لە ساڵی ئاییندەدا حەج بکەنەوەو دیاریش

---

[٢] بسند صحيح (شرحه).

[٣] سكت عن درجته الشارح.

بێنن، ئەوەشی نییەتی لەکاتی حەجەکەدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ ئەوکاتەی دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆشی حەوت ڕۆژ بەڕۆژوو بێ (ئیمامی مالیك – خ)

١٦٤٧- وَعَنْهُ أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) خَرَجَ حَاجًّا حَتَّى إِذَا كَانَ بِالبَّادِيَةِ مِنْ طَرِيقِ مَكَّةَ أَضَلَّ رَوَاحِلَهُ فَقَدِمَ عَلَى عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) يَوْمَ النَّحْرِ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: عُمَرُ: اصْنَعْ كَمَا يَصْنَعُ الْمُعْتَمِرُ ثُمَّ قَدْ حَلَلْتَ فَإِذَا أَدْرَكَكَ الْحَجُّ قَابِلاً فَاحْجُجْ وَأَهْدِ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ. رواهما الإمام مالك. وَقَالَ: وَمَنْ قَرَنَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ ثُمَّ فَاتَهُ الْحَجُّ فَعَلَيْهِ أَنْ يَحُجَّ قَابِلاً وَيَقْرِنُ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ وَيُهْدِي هَدْيَيْنِ هَدْيًا لِقِرَانِهِ الْحَجَّ مَعَ الْعُمْرَةِ وَهَدْيًا لِمَا فَاتَهُ مِنَ الْحَجِّ. والله أعلم[٤].

دیسان گوتی: ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (خودای لێ ڕازی بێ) دەچێ بۆ حەج، کە دەگاتە بیابانەکەی ڕێگەی مەککە لەوێ وڵاخەکانی لێ بزر دەبێ وە بۆیان دەگەڕێ تا ڕۆژی عەرەفاتی لەکیس دەچێ جا ڕۆژی جەژن دەچێ بۆلای عومەرو ئەمەی بۆ دەگێڕێتەوە. عومەریش دەڵێ: عەمرە بکەو ئیحرام بشکێنە، وە لە ساڵی ئایندەدا حەج بکەرەوە ئەگەر مایت، وە چیت بۆ هەڵسووڕا لە ئاژەڵی دیاریی مەککە سەری ببڕە (ئیمامی مالیك).

ئیمامی مالیك دەیشڵێ: هەر کەسێ ئیحرامی حەج و عەمرەی بەیەکەوە بەست، بەڵام حەجی بۆ نەکرا پێویستە لەسەری لە ساڵی ئایندەدا ئیحرامی حەج و عەمرە پێکەوە ببەستێتەوە، وە دەبێ دوو ئاژەڵی دیاریی مەککەیش سەرببڕێ: یەکێکیان لە جیاتی ئەوە کە حەج و عەمرەی بەقیران بەیەکەوە کردووە، وە ئەویتریشیان لەباتی ئەوە کە حەجەکەی بۆ تەواو نەکراوە.

## ١٢٣) باسی ئیحصار لە عەمرەدا:

١٦٤٨- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، مُعْتَمِرِينَ، فَحَالَ كُفَّارُ قُرَيْشٍ دُونَ الْبَيْتِ، فَنَحَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بُدْنَهُ،

---

[٤] سكت عنه الشارح.

وَحَلَقَ رَأْسَهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: قَدْ أُحْصِرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَحَلَقَ رَأْسَهُ وَجَامَعَ نِسَاءَهُ، وَنَحَرَ هَدْيَهُ، حَتَّى اعْتَمَرَ عَامًا قَابِلاً. رواه البخاري والله أعلم[١].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لیٚ رازی بیٚ) **گوتی: لە خزمەتی پیٚغەمبەردا** (دروودی خودای لەسەربیٚ) **دەچووین بۆ عەمرەکردن، بیٚ برِواکانی قورەیش لە حودەیبییە ریٚگەی بەیتیان لیٚ گرتین‌و لەویٚ گیرمان خوارد، ئیتر پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربیٚ) **وشترە دیارییەکانی خۆی سەربرِی‌و سەری خۆی تاشی.. لە گیٚرانەوەیەکدا: پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربیٚ) **قەدەغەکرا واتە: مەنع کرا لە تەواوکردنی عەمرە لەلایەنی دوشمنەوە ئیتر وشترە دیارییەکانی خۆی سەربرِی‌و سەری خۆی تاشی‌و دروست بوو لەگەلٚ ژنەکانی، وە لە سالٚی ئاییندەدا عەمرەی کردەوە (ب).**

## ١٢٤) حوکمی چوونەلای ژن لەکاتی کردنی حەج‌و عەمرەدا:
## حكم الوطء في النسك

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ}.

**خودای گەورە دەفەرمویٚ: کاتی خەریك بوون بە ئادابی حەجەوە چەند مانگیٚکی دیاری‌و ئاشکران، دەی کەسیٚ لەم مانگانەدا حەجی دابەست، ئیتر نابیٚ بچیٚتە لای ژن، وە نابیٚ دەرچیٚ لە یاسای ئایین‌و کاری بەد بکا، یا دەرچیٚ لە یاسای دامەزراوی حەج، وە نابیٚ لەکاتی حەجدا دەمقالٚی‌و بگرەو بەردە بەرپا بکا.**

١٦٤٩- سُئِلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ وَعَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَأَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمْ) عَنْ رَجُلٍ أَصَابَ أَهْلَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ بِالْحَجِّ فَقَالُوا يَنْفُذَانِ يَمْضِيَانِ لِوَجْهِهِمَا حَتَّى يَقْضِيَا حَجَّهُمَا ثُمَّ عَلَيْهِمَا حَجٌّ قَابِلٍ وَالْهَدْيُ. رواه الإمام مالك (رَضِي اللَّهُ عَنهُ)[١].

---

[١] بخاری. كتاب المحصر: ١٨٠٧، ١٨٠٨، ١٨٠٩.

[١] سكت عن درجته الشارح.

پرسیارکرا لە عومەری کوڕی خەطاب و لە عەلی کوڕی ئەبو طالیب و لە ئەبو هورەیرە (خودا لێیان رازی بێ): پیاوێ حەجی دابەستبێ و لەکاتی کردنی حەجدا بڕواتە لای خێزانی خۆی حوکمی چییە؟ گوتیان: هەردوکیان لەسەر کاری خۆیان دەڕۆن تا حەجەکەیان تەواو دەکەن یا عەمرەکەیان تەواو دەکەن ئەگەر لەکاتی کردنی عەمرەدا ئەو ئیشەیان کردبوو وە لە ئاییندەشدا هەم قەزایان لەسەرەو هەم ئاژەڵە دیاری! (ئیمامی مالیك – خودای لێ رازی بێ).

## ١٢٥) هۆکانی تۆڵەدان (فیدیە) وە تۆڵە دەبێ چی بێ:
## أسباب الفدية وبيانها

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ}.

وَقَالَ تَعَالَى: {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: دەی ئەگەر کەسێ لە ئێوە نەخۆش بوو، یا ئازارێ لە سەریا بوو، وە بەهۆی ئەو نەخۆشینەوە یا بەهۆی ئەو ئازارەوە بە ناچاری سەری تاشی ئەوە لەسەریەتی تۆڵەیێ (فیدیەیێ) بدا لەباتی ئەو سەرتاشینەی، کە تۆڵەکە بریتییە لە رۆژووی سێ رۆژ یا خواردەمەنی شەش هەژار یا ئاژەڵێ سەربڕێ.

١٦٤٩– عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)، مَرَّ بِهِ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ وَهُوَ يُوقِدُ تَحْتَ قِدْرٍ لَهُ وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِهِ فَقَالَ: آذَاكَ هَوَامُّ رَأْسِكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) إِحْلِقْ وَأُسُكْ ثُمَّ اذْبَحْ شَاةً نُسُكًا

أَوْصُمْ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ أَوِ أَطْعِمْ ثَلاَثَةَ آصُعٍ مَنْ تَمْرٍ عَلَى سِتَّةِ مَسَاكِينَ\ز رواه الخمسة وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَ: فِيَّ خَاصَّةً نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضاً). وَهِيَ لَكُمْ عَامَّةً[1].

**کەعبی کوڕی عوجرە** (خودای لیٚ رازی بیٚ) **گوتی: لەکاتی حودەیبییەدا ئاگرم لەژێر مەنجەڵێکا خۆش دەکرد، ئەسپێ لەسەرم هەڵدەوەری لە بەرزۆری، لەو کاتەدا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربیٚ) **هات بۆلام، فەرمووی پێم: ئەم جرۆجانەوەرانەی سەرت ئازارت دەدەن؟ گوتم: بەڵێ: فەرمووی: سەرت بتاشە، لە پاشا یا مەڕێ یا بزنێکی خێر سەربڕە، یاخود سێ رۆژ بەرۆژوو بە یاخود سێ مەن خورما بدە بە شەش هەژار (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: کەعب گوتی: ئەم ئایەتە {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً} بەهۆی منەوە هاتە خوارەوەو من هۆی هاتنی بووم، بەڵام حوکمەکەی بە تێکڕایی بۆ هەمووتانە.**

## ١٢٦) تۆڵەی نەچیر: (جزاء الصيد)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: { - يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْتُلُواْ الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ وَمَن قَتَلَهُ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاء مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَو عَدْلُ ذَلِكَ صِيَامًا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ عَفَا اللّهُ عَمَّا سَلَف وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللّهُ مِنْهُ وَاللّهُ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ}.

**خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانەکان! لە کاتێکا کە ئێوە لە ئیحرامدا بن نەچیر مەکوژن، وە هەر کەسێ لە ئێوە نەچیرێ بکوژێ بە قەستی و بزانێ کە ئەوە حەرامە، ئەوە لە سەریەتی تۆڵە دانەوە بەگیان لەبەرێ کە وەکوو ئەو نەچیرە وابێ، کە دووپیاوی خاوەن دادو عەداڵەت دایبنێن و حوکمی پێ**

---

[1] بخاری. محصر: ١٨١٤، ١٨١٥، ١٨١٦، ١٨١٧، ١٨١٨، ٤١٥٩، ٤١٩٠، ٤١٩١، ٥٦٦٥، ٥٧٠٣، ٦٧٠٨. مسلم. حج: ٢٨٦٩. ابو داود. مناسك: ١٨٥٦، ١٨٥٧. ترمذی. حج: ٩٥٣، ٢٩٧٣، ٢٩٧٤. نسائی. مناسك: ٢٨٥١.

بکەن، وە دەبێ ئەو ئاژەڵە تۆڵەیە بنێرێ بۆ حەرەمی مەککەو لەوێ سەربڕرێ بۆ هەژارانی حەرەم، یا کەففارەتێ بدا کە بریتییە لە بەهای ئەو ئاژەڵە تۆڵەیە، وە دەبێ بەو بەهایە خۆراك‌و دانەوێڵە بکڕێ‌و بیدا بەهەژاران، یاخود بەئەندازەی ئەو خواردەمەنییە بەرۆژوو بێ، بەم شێوەیە لەباتی هەموو مشتێ رۆژێ بە رۆژووبێ، ئەم تۆڵەدانەوەیە بۆ ئەوەیە کە ئازاری ئەم کارە نابارە خۆیە بچێژێ، خودا خۆش بووە لەوەی لەمەوپێش بووە، وە هەرکەسێ پتر لە جارێ ئەم کارە ناڕەوایە بکا ئەوە دیارە گێرەشێوێنەو باکی لە نافەرمانیی خودا نیە، جا لەبەر ئەوە بێجگە لەو سزایە کە دانراوە بۆی خودا تۆڵەی لێ دەستێنێ، وە خودای گەورە زاڵ‌و تەواناو تۆڵەسێنە.

١٦٥١– عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ أَنَّ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَضَى فِي الضَّبُعِ بِكَبْشٍ وَفِي الْغَزَالِ بِعَنْزٍ وَفِي الأَرْنَبِ بِعَنَاقٍ وَفِي الْيَرْبُوعِ بِجَفْرَةٍ[1].

ئەبو زوبەیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: عومەر (خودای لێ رازی بێ) بۆ تۆڵەی کەمتیار بەرانێکی داناوە، وە بۆ تۆڵەی ئاسك بزنێ، وە بۆ تۆڵەی کەروێشك گێسکێ، وە بۆ تۆڵەی رزق کارژەڵەیێ (مالیك/ شافیعی، رەزای خودایان لێبێ).

١٦٥٢– وَكَانَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ فِي حَمَامِ مَكَّةَ إِذَا قُتِلَ شَاةٌ. رواهما مالك والشافعي. وزاد: وَفِي غَيْرِ حَمَامِ مَكَّةَ وَغَيْرِهِ مِنَ الطَّائِرِ قِيمَتُهُ[2].

سەعیدی کوڕی موسەییبیش دەیگوت: کەسێ، کۆترێ لە کۆترەکانی حەرەمی مەککە بکوژێ دەبێ مەڕێ لە تۆڵەیدا بدا (مالیك/ شافیعی) شافیعی (خودای لێ رازی بێ) ئەمەیشی لێ پتر کردووە: بەڵام لە جیاتی کۆتری شوێنانی تر لە جیاتی باڵندەی تر جگە لە کۆتر، بەهاکەی خۆیان چەند بێ ئەوەندە دەدا بە تۆڵەیاندا.

---

[1] سکت عنه الشارح.

[2] سکت عنه الشارح.

١٦٥٣- وَقَضَى عُمَرَ وَعُثْمَانَ وَعَلِيٌّ وَزَيْدَ وَابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُم) فِي النَّعَامَةِ بِبَدَنَةٍ. رواه الشافعى وَقَالَ: فِي بَقَرَةِ الْوَحْشِ أَوْ حِمَارِ الْوَحْشِ بَقَرَةٌ[٣].

عومەرو عوسمان و عەلى و زەیدو ئیبن و عەبباس (خودای گەورەیان لێ رازی بێ) بڕیاریان داوە کە لە تۆڵەی کوشتنی وشترمرغدا وشترێ دەدرێ (شافیعی) شافیعی دەڵێ: تۆڵەی گاکێوی گایەکە، هەروەها تۆڵەی کەرەکێویش گایەکە.

١٦٥٤- وَرُوِىَ عَنْ عَطَاءٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) فِي الثَّعْلَبِ شَاةٌ وَفِي الْوَبَرِ إِنْ كَانَ يُؤْكَلُ شَاةٌ وَفِي الضَّبِّ شَاةٌ. قَالَ: الشَّافِعِيُّ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ): إِنْ أَرَادَ شَاةً صَغِيرَةً فَبِذَلِكَ نَقُولُ وَإِنْ أَرَادَ مُسِنَّةً خَالَفْنَاهُ[٤].

دەگێڕنەوە لە عەطاوە (خودای لێ رازی بێ) کە بۆ تۆڵەی ڕێوی مەڕێ یا بزنێکی داناوە، وە بۆ تۆڵەی چالەکەیش (کە گۆشتی دەخورێ) هەر مەڕێ یا بزنێکی داناوە، وە هەروەها بۆ تۆڵەی بزنمژەیش مەڕێ یا بزنێکی داناوە شافیعی (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: ئەگەر مەبەستی مەڕو بزنی گچکە بێ ئێمەش رامان لەسەر رای ئەوە، بەڵام ئەگەر مەبەستی مەڕو بزنی سەرە بێ ئێمە رامان لەسەری نیە.

## ١٢٧) ناژەڵی دیاریی بەست (حەرەم)ی پیرۆزی مەککە

## الهدي الى الحرم الشريف

{قَالَ: اللّٰهُ تَعَالَى – وَالْبُدْنَ جَعَلْنَاهَا لَكُم مِّن شَعَائِرِ اللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ فَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا صَوَافَّ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْقَانِعَ وَالْمُعْتَرَّ كَذَلِكَ سَخَّرْنَاهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ}.

---

[٣] سكت عنه الشارح.

[٤] سكت عنه الشارح.

خودای گەورە دەفەرموێ: ئێمە سەربڕینی وشتری سەرەمان گێڕاوە بە دروشمو نیشانەی ئایینی ئیسلام کە ئایینی ئێوەیە، وە کردوومانە بەو عیبادەتانە کە خودای گەورە دایمەزراندوونو کردوونی بە یاسای حەج، ئەم وشترانە مایەی خێری دینو دنیان بۆ ئێوە، دەی کاتێ ویستتان بیانکەن بە قوربانی یا بیانکەن بە دیاریی بەستی مەککە ئەوا دەستو پێیان ببەستنو لەسەر سێ قاچ رایان وەستێنن بە پێوەو لەکاتی سەربڕیندا ناوی خودایان لەسەر ببەن، جا کاتێ کەوتن بەلاداو ساردەوە بوون ئەوا هەم خۆتان لە گۆشتەکەیان بخۆنو هەم بەشی هەژاری بەقنیاتی لێ بدەنو هەم بەشی ئەوانەیشی لێ بدەن کە خۆیان داوا دەکەنو ویرەویر دەکەن لەسەرکەمی بەشەکەیان، ئێمە بەو جۆرە کە دەیبینو وا بە بەر چاوتانەوە ئەم وشترە زلو بەهێزانەمان بۆ رام کردوونو ئاوا بە ئاسانی قاچیان دەبەستنو سەریان دەبڕنو پیخیان دەدەنو سواریان دەبنو باریان دەکەن، سابەڵکوو ئێوە بیرێ بکەنەوەو سوپاسی نازو نیعمەتەکانی خودای گەورە بکەن!

١٦٥٤- عَنِ ابْنَ عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: تَمَتَّعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، وَأَهْدَى فَسَاقَ مَعَهُ الْهَدْيَ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ. رَوَاهُ الشيخان[1].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە حەجیماڵئاواییدا ئاسایشی وەرگرتو خۆشی وەرگرتو ئیقتصادی کرد لە کردارەکانا، چونکە عەمرەو حەجی بەیەکەوە کرد، وە ئاژەڵە دیاریشی سەر بڕی، ئاژەڵە دیارییەکەی لە ذولحولەیفەوە لەگەڵ خۆی هێنابوو بۆ مەککە (ش).

١٦٥٥- وَقَالَ: عَلِيٌّ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَهْدَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِائَةَ بَدَنَةٍ، فَأَمَرَنِي بِلُحُومِهَا فَقَسَمْتُهَا، ثُمَّ أَمَرَنِي بِجِلاَلِهَا فَقَسَمْتُهَا، ثُمَّ بِجُلُودِهَا فَقَسَمْتُهَا. رَوَاهُ البخاري[2].

---

[1] بخاری. حج: ١٦٩١. مسلم. حج: ٢٩٧٢.

[2] بخاری. حج: ١٧٠٧، ١٧١٦، ١٧١٧، ١٧١٨، ٢٢٩٩.

عـەلی (خـودای گـەورەی لیّ خۆش نوودبیّ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەربێ) سـەد وشتری کرد بە دیاری‌و بردنی بۆ هەژارانی بەست (حـەرەم) وە فـەرمانی بـەمن کـرد کـە گۆشـت‌و کۆپـان‌و کـەوڵیان هـەموو دابـەش بکـەم وە منـیش وام کـرد. (ب/٢ ز/١١٠ ف/١ (ب–خ) (بوخاری ئەم حەدیثەی ریوایەت کردووە، خودا لیّی رازی بیّ).

١٦٥٦– سبق فی رقم: ١٦٣٢/١ تسلسل/ ١١٩.[٣].

١٦٥٨– وَصَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) الظُّهْـرَ بِـذِي الْحُلَيْفَـةِ ثُـمَّ دَعَـا بِنَاقَتِـهِ فَأَشْعَرَهَا فِي صَفْحَةِ سَنَامِهَا الأَيْمَنِ ثُمَّ سَلَتَ الدَّمَ عَنْهَا، وَقَلَّدَهَا نَعْلَيْنِ عَلَّقَهُمَا فِي عُنُقِهَا. رَوَاهُ أبو داود والترمذی وصححه[٤].

پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) نوێژی نیوەڕۆی لە بیری عەلی کرد، ئینجا داوای کرد وشترێ لەوشترە دیارییەکانی ماڵی خودایان بۆ هێنا، لەسەر ئەم شێوەیە نیشانەی کرد: بەتیغ لای راستی دووگی تەرەکاندەوەو خوێنەکەی هەڵسوی لەلا دووگی، وە جووتێ سۆلی کرد بە گەردن بەند بۆی‌و هەڵی واسین بەگەردنیاو ئەمەیش بۆ ئەوەیە تا خەڵك بزانن کە ئەوە دیاری بەستەو دەستی بۆنەبەن! (د/ت:ص).

١٦٥٩– وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهاَ) فَتَلْتُ قَلاَئِدَ بُدْنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدَيَّ، ثُمَّ قَلَّدَهَا وَأَشْعَرَهَا وَأَهْدَاهَا، فَمَا حَرُمَ عَلَيْهِ شَيْءٌ كَانَ أُحِلَّ لَهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: كُنْتُ أَفْتِلُ قَلاَئِدَ الْغَنَمِ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فَيَبْعَـثُ بِهَـا، ثُـمَّ يَمْكُـثُ حَـلاَلاً. رَوَاهُ الخمسة[٥].

---

[٣] راجع رقم: ١٦٣٢/١.

[٤] صحیح عند الترمذی.

[٥] بخاري. حـج: ١٧٠٠، ١٦٩٦، ١٦٩٨، ١٦٩٩، ١٧٠١، ١٧٠٢، ١٧٠٣، ١٧٠٤، ١٧٠٥، ٢٣١٧، ٥٥٦٦. مـسلم. حـج: ٣١٨١ – ٣١٩٤. نسائی. مناسك الحج: ٢٧٩٢. أبو داود. مناسك: ١٧٥٥. ترمذی. حج: ٩٠٩.

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: خۆم (بەدەستی خۆم) گەردن بەندی حەیوانە دیارییەکانی حەزرەتم دەهۆندەوە، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە دەستی خۆی دەیکردە ملیان و بە تەرەکاندنەوەی لادووگیان: بەخوێنەکەی نیشانەی دەکردن، ئینجا دەیناردن بە دیاری بۆ هەژارانی مەککە، لەگەڵ ئەمیشە هیچ شتێکی لێ قەدەغە نەدەبوو بەهۆی ئەمەوە لەو شتانەی کە لەوەو بەر بۆی حەلاڵ بووبێ! لە گێڕانەوەیەکا: جاران خۆم گوڵەنگم دەهۆنییەوە بۆ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) جا دەیکردە ملی مەڕو بزن و بە دیاری دەیناردن بۆ هەژارانی بەست (حەرەم)ی مەککە، وە خۆی لە مەدینە دەمایەوە، بەبێ ئیحرام، وە لەو ماوەدا هەموو شتێکی حەلاڵی بۆ حەلاڵ بوو. (ش/د/ت/ن = بوخاری، موسلیم، ئەبو داوود، تیرمیذی، نەسائی. خودایان لێ ڕازی بێ).

### ١٢٨) لەکاتی پێویستیدا سواربوونی وڵاخی قوربانی و دیاریی بەیت دروستە: (لا بأس بركوب البدن عند الحاجة)

١٧٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً، قَالَ: ارْكَبْهَا. قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ. قَالَ: ارْكَبْهَا. قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ رَاكِبَهَا يُسَايِرُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالنَّعْلُ فِي عُنُقِهَا. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دی پیاوێ وشترێکی دیاری لێ دەخوڕی، فەرمووی: (سواری بە) گوتی: ئاخر چۆن سواری بم ئەمە وشتری دیاریی مەککەیە. فەرمووی: سواری بە گوتی: جا خۆم دیم کە پیاوەکە سواری بوو بوو وە لەتک پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) دەڕۆیشت و بەدەم ڕێوە دەمەتەقێی لەگەڵدا دەکرد وەسۆڵیش لەملی وشترەکەدا بوو کە نیشانەی ئەوەیە کە ئەم وشترە دیاری بەستە (ش/د/ت/ن).

---

[1] بخاري. حج: ١٦٨٩، ١٧٠٦، ٢٧٥٥، ٦١٦٠. مسلم. حج: ٣١٩٥ – ٣٢٠٢. أبو داود. مناسك: ١٧٦٠. نسائي: حج: ٢٧٩٨.

١٧٠١- قَالَ: أَبُو الزُّبَيْرِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): سَأَلْتُ جَابِرَ عَنْ رُكُوبِ الْهَدْيِ فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: ارْكَبْهَا بِالْمَعْرُوفِ حَتَّى تَجِدَ ظَهْرًا. رَوَاهُ مسلم وأبو داود[٢].

ئەبو زوبەیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بۆ سواربوونی وڵاخی دیاریی خانەی خودا لە جابیرم پرسی گوتی: گوێم لێ بوو لە حەزرەت خۆی دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): تا وڵاخێکی سواری ترت دەست دەکەوێ بەشێوەیەکی پەسەند سواری بە (م/د- خودایان لێ رازی بێ).

## ١٢٩) ئاژەڵی دیاری ئەگەر لەڕێ پەکی کەوت سەر دەبڕێ بۆ خەڵك
## إن عطب الهدي في الطريق يذبح للناس

١٧٠٢- عَنْ ذُؤَيْبٍ أَبِي قَبِيصَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَبْعَثُ مَعَهُ بِالْبُدْنِ ثُمَّ يَقُولُ: إِنْ عَطِبَ مِنْهَا شَيْءٌ فَخَشِيتَ عَلَيْهِ مَوْتًا فَانْحَرْهَا ثُمَّ اغْمِسْ نَعْلَهَا فِي دَمِهَا ثُمَّ اضْرِبْ بِهِ صَفْحَتَهَا وَلاَ تَطْعَمْهَا أَنْتَ وَلاَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ رُفْقَتِكَ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري والله أعلم[١].

ذوئەیب، واتە: ئەبو قەبیصە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وشتری دیاری بەیتی بەمنا دەنارد، وە دەیفەرموو: ئەگەر لەڕێ لێیان پەکی کەوت و مەترسی مردنت لێی کرد لەوێ سەری ببڕەو سۆڵەکەی گەردنی بەخوێنەکەی رەنگ بکەو بیدە لە لادووگی هەتا بزانن کە ئەوە دیاریی بەیتەو ماڵی هەژارانە وە خۆت و هاوڕێکانت کە لە کاروانەکەدا لەگەڵتان لێی مەخۆن (م/د/ت/ن).

---

[٢] مسلم. حج: ٣٢٠١. أبو داود. مناسك: ١٧٦١. نسائی. حج: ٢٨٠١.

[١] مسلم. حج: ٣٢٠٣ — ٣٢٠٥. أبو داود. مناسك: ١٧٦٣، ١٧٦١. نسائی. مناسك الحج: ٢٨٠١.

## باسی حەوتەم: باسی ڕێزو گەورەیی دوو بەستە پیرۆزەکان، کە مەککەی بەڕێزو مەدینەی نازدارن، (ئەم باسە پێنج بەش و پاشەکییەکە):

### ١٣٠) بەشی یەکەم: باسی گەورەیی بەست (حەرەم)ی مەککەی بەڕێز:

**الباب السابع: في الحرمين الشريفين وفيه خمسة فصول وخاتمة:**

**الفصل الأول: في فضل الحرم المكي:**

قَالَ اللهُ تَعَالى: {وَإِذْ قَالَ:إِبْـرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَـلْ هَـذَا بَلَـدًا آمِنًـا وَارْزُقْ أَهْلَـهُ مِـنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ}.

خـودای گـەورە دەفـەرموێ: باسـی ئـەوە بکـە کـە ئیـبراهیم فـەرمووی: خودایە! ئەم شوێنە کە مەککەیە، کە من ئەم خانەی تۆم تیا دروست کردووە بیکە بە شارێکی هێمن و پڕئاسایش و پارێزراو، وە بەش و بارەو رزق و رۆژیی دانیشتووانی بدەو لە میوەهات و خواردەمەنی بەشیان بدە، هی ئەوانـەیان کە باوەڕیان هەیە بەخوداو بە رۆژی پاشە رۆژ.

وَقَالَ تعالى: {إِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَذِهِ الْبَلْدَةِ الَّـذِي حَرَّمَهَـا وَلَـهُ كُـلُّ شَيْءٍ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ}.

خــودای گــەورە دەفــەرموێ: ئــەی موحەممــەد! ئــەی پێغەمبــەری خۆشەویستی من! تۆ ئەوەی پێویستی سەرشانت بوو کردت و بەبێ درێغی و کۆتاهی ئەرکی سەرشانی خۆتت بەجێ هێنا، ئەمجار بڵـێ: من هەر فەرمانی ئەوەم پێکراوە کە بەندەیی بکەم بۆ خوداو پەروەردگاری ئەم شاری مەککەیە، ئـەو پـەروەردگارە کردگـارە جوانکـارەی کـە دەسـتی قـەدرو ڕێـزی لـەم شـارە ناوەو پیرۆزو بەڕێزی کردووەو هەندێ شتی بـە تایبـەتی تیا حەرام و قەدەغە کــردووە، وەك خــوێن ڕژان و ڕاوکــردن و رووەك و داربــڕین، وە دەســتی دەستدرێژان و پیاوخراپانی لێ بڕیوە، وە ئەو خاوەنی هەموو شتێکەو هـەموو شتێ لە ڕاستیدا ماڵ و موڵکی ئەوەو خۆی دروستی کردووە لـە نـەبوون! وە من بەش بەحاڵی خۆم وەك فەرمانم پێ کراوە لەلایەنی خوداوە بـەردەوام دەبم لەسەر ئایینی ئیسلام.

وَقَالَ تَعَالَى: {أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا آمِنًا يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِزْقًا مِن لَّدُنَّا وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ}.

لە ئايەتێكى تردا دەفەرموێ: ئايا ئێمە ولأتێكى وامان بۆ ئەوان دانەمەزراندووە كە حەرامە لەسەر خاوەن دەستەلاتەكان دەستيان بۆ بۆ ببەن‌و هێمنە لە دەستدرێژی بەدكاران، سەرەرای ئەوە لە هەموو لايەكەوە ميوەو بەرووبوومی هەموو شتێ گرداوەری دەكرێ‌و دەبرێ بۆيان‌و خۆم كردوومە بە رۆژی ئەوان، بەلأم زۆربەی ئەوانە كەو دەن‌و نەفامو نەزانن بەم نيعمەتانە نازانن.

١٧٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ خُزَاعَةَ قَتَلُوا رَجُلاً عَامَ فَتْحِ مَكَّةَ بِقَتِيلٍ مِنْهُمْ قَتَلُوهُ، فَأُخْبِرَ بِذَلِكَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَكِبَ رَاحِلَتَهُ فَخَطَبَ فَقَالَ: إِنَّ اللّٰهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ وَسَلَّطَ عَلَيْهَا رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ أَلاَ وَإِنَّهَا لَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي وَلَنْ تَحِلَّ لأَحَدٍ بَعْدِي أَلاَ وَإِنَّهَا أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنَ النَّهَارِ أَلاَ وَإِنَّهَا سَاعَتِي هَذِهِ حَرَامٌ لاَ يُخْبَطُ شَوْكُهَا وَلاَ يُعْضَدُ شَجَرُهَا زَادَ فِي رِوَايَةٍ: وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهَا، وَلاَ تُلْتَقَطُ سَاقِطَتُهَا إِلاَّ لِمُنْشِدٍ، وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ إِمَّا أَنْ يُعْقَلَ، وَإِمَّا أَنْ يُقَادَ فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ يُقَالُ لَهُ أَبُو شَاهْ فَقَالَ: اكْتُبْ لِي يَا رَسُولَ اللّٰهِ. فَقَالَ: اكْتُبُوا لأَبِي شَاهْ. فَقَالَ: رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ إِلاَّ الإِذْخِرَ فَإِنَّا نَجْعَلُهُ فِي بُيُوتِنَا وَقُبُورِنَا. فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلاَّ الإِذْخِرَ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئەبو هورەيرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ساڵی گرتنی مەككە، هۆزی خوزاعە پياوێكيان كوشت لە هۆزی بەنی لەيث، لە جياتی كوژراوێكی خۆيان كە بەنی لەيث لەوەوپێش كوشتبوويان، جا كە ئەمە عەرزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) كرا، سواری ولأخەكەی بوو، وە وتارێكی دا، فەرمووی: خودای گەورو سەروەر مەككەی پاراست لە دەسدرێژی خاوەن فيلەكان، كە ئەبرەهەو

[1] بخاري. لقطة: ٢٤٣٤. مسلم. حج: ٣٢٩٢. أبو داود. مناسك: ٢٠١٧. ترمذي. كتاب السير: ١٤٠٥. نسائي. قسامه: ٤٧٩٩، ٤٨٠٠، ٤٨٠١.

لەشکرەکەی بوو، وە بە پشتیوانی خودا پێغەمبەری خوداو موسوڵمانەکان لە ڕۆژی ئازادکردنی (فەتح)ی مەککەدا زاڵبوون بە سەرگرتنی ئەم شارەدا بەڵام باش باش بزانن کە ئەم شارە نە لەپێش مندا، وە نە لەپاش من بۆ کەس ڕەوانەبینراوەو ڕەوانابینرێ کە ڕێزی بشکێنێ و شەڕو شۆڕی تیا بکا، ئاگاداربن تەنانەت بۆ منیش بۆ ماوەیەکی کەم لەو ڕۆژەدا کوشتاری تیا حەلاڵ بوو، باش ئاگاداربن ئا ئێستا لەم دەمەدا شارێکی بەڕێزو قەدەغەیە، کەوابوو نەدڕکی پاکۆ دەدرێ وە نە داروودرەختی دادەپاچرێ وە نەکوشتارو شەڕو شۆڕی تیا دەکرێ لەم حەلەوە تا ڕۆژی قیامەت ئەم شتانەی تیا قەدەغەیە، لە گێڕانەوەیەکی تردا ئەمەیشی لێ پتر کردووە: وە نە نەچیری دەڕەوێنرێتەوە، وە نەشتی داکەوتووی هەڵدەگیرێتەوە، مەگەر بۆ کەسێ کە ناونیشانی هەڵبدا هەتا خاوەنەکەی پەیدا ببێ و بیباتەوە.

وە هەر کەس کەسێکی کوژرا، ئەوا خۆی لە یەکێ لەم دوو بڕیارە سەرپشکە: یا خوێن وەربگرێ، یاخود تۆڵەی بۆ بسەندرێ و بکوژەکە بکوژرێتەوە.

جا پیاوێکی یەمەنی کە پێیان دەگوت ئەبو شاە، هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمان بفەرموو کە ئەم وتارەم بۆ بنووسنەوە. حەزرەتیش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بینووسنەوە بۆ ئەبو شاە!

جا پیاوێکی قورەیشیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تەنیا گیای سوڕناتك (اذخر: زوڕناتك)ی لێ دەرچێ، چونکە بۆ سووتەمەنی ناوماڵ و بۆ سەرگرتنی سەری گۆڕ بەکاری دێنین" حەزرەتیش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: باشە تەنیا گیای سوڕناتیکی لێ دەرچێ (ش/د/ت/ن = شەیخان، ئەبو داوود، تیرمیذی، نەسائی. خودایان لێ ڕازی بێ).

١٧٠٤– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ. لاَ هِجْرَةَ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا فَإِنَّ هَذَا الْبَلَدَ حَرَّمَهُ اللّٰهُ يَوْمَ

خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ، فَهْوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ الشيخان وَفِي رِوَايَةٍ: لاَ يَحِلُّ لأَحَدِكُمْ أَنْ يَحْمِلَ بِمَكَّةَ السِّلاَحَ[٢].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: رۆژی گرتن (فەتح)ی مەککە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئیتر کۆچکردن لە مەککەوە بۆ مەدینە نەما چونکە مەککەیش وەکی مەدینە بوو بە وڵاتی ئیسلام بەڵام تێکۆشان و خەباتگێڕان و غەزاکردن لە پێناوی ئیسلاما هەردەمێنن هەتا رۆژی رەستاخێز، وە هەروەها کۆچکردن لە وڵاتی کرفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام هەردەمێنێ هەتا رۆژی قیامەت وە هەروەها نیازی پاکیش دەمێنێ وە لەم رێگەیەوە دەتوانن بە پایەی پاداشی کۆچ کردن بگەن وە هەرکاتێکیش داواکران بۆ غەزاکردن بڕون بۆی، وە ئەم شاری مەککەیە خودا قەدەغەو حەرامی کردووە لەو رۆژەوە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، ئیتر هەتا رۆژی قیامەت هەروا بە حەرامی و بەرێزداری دەمێنێتەوە بە فەرمانی خودای گەورە (ش) لە گێڕانەوەیەکا: دروست نیە بۆ کەستان لە مەککەدا چەك هەڵبگرن.

١٧٠٥- عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) أَنَّهُ قَالَ: لِعَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ وَهُوَ يَبْعَثُ الْبُعُوثَ إِلَى مَكَّةَ ائْذَنْ لِي أَيُّهَا الأَمِيرُ أُحَدِّثْكَ قَوْلاً قَامَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْغَدَ مِنْ يَوْمِ الْفَتْحِ سَمِعَتْهُ أُذُنَاىَ وَوَعَاهُ قَلْبِي وَأَبْصَرَتْهُ عَيْنَاىَ حِينَ تَكَلَّمَ بِهِ أَنَّهُ حَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا اللَّهُ وَلَمْ يُحَرِّمْهَا النَّاسُ فَلاَ يَحِلُّ لاِمْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ بِهَا دَمًا وَلاَ يَعْضِدَ بِهَا شَجَرَةً فَإِنْ أَحَدٌ تَرَخَّصَ بِقِتَالِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيهَا فَقُولُوا لَهُ إِنَّ اللَّهَ أَذِنَ لِرَسُولِهِ وَلَمْ يَأْذَنْ لَكُمْ وَإِنَّمَا أَذِنَ لِي فِيهَا سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ وَقَدْ عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالأَمْسِ وَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ . فَقِيلَ لأَبِي شُرَيْحٍ مَا قَالَ: لَكَ عَمْرٌو قَالَ: أَنَا أَعْلَمُ بِذَلِكَ مِنْكَ يَا أَبَا شُرَيْحٍ إِنَّ الْحَرَمَ لاَ يُعِيذُ عَاصِيًا وَلاَ فَارًّا بِدَمٍ وَلاَ فَارًّا بِخَرْبَةٍ. رَوَاهُ الشيخان والترمذى[٣].

---

[٢] بخاري. جنائز: ١٣٤٩، ١٥٨٧، ١٨٣٣، ١٨٣٤، ٢٠٩٠، ٢٤٣٣، ٢٧٨٣، ٢٨٢٥، ٣٠٧٧، ٣١٨٩، ٤٣١٣. مسلم. حج: ٢٢٨٩ – ٢٢٩٣.

[٣] بخاري. علم: ١٠٤، ١٨٣٢، ٤٢٩٥. مسلم. حج: ٣٢٩١. ترمذى. حج: ٨٠٩، ١٤٠٦. نسائى. حج: ٢٨٧٦

عەمری کوڕی سەعید خەریك بوو لەشکری دەنارد بۆ سەر ئیبنو زوبەیر لە مەککە، ئەبو شورەیحی ئەل-عەدەوی پێی گوت: رێگەم بدە ئەی میر! ئەی فەرمانڕەوا! تا فەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە لەپاش فەتحی مەککە بەدووڕۆژ، پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەربێ) لە وتاردا ئەو فەرموودەیەی فەرموو، بە هەردوو گوێی خۆم گوێم لێی بوو، وە بەدڵ دڵم لەلای بوو، وە بە چاوی خۆم سەیریم دەکرد، لەوکاتەدا کە ئەم فەرموودەیەی دەفەرموو، کە سوپاس و ستایشی خودای کردو ئینجا فەرمووی: مەککە خودای گەورە خۆی حەرامی کردووەو کردوویەتی بە حەرەم و بەست، وە خەڵك لە خۆیانەوە حەرامیان نەکردووەو نەیانکردووە بە بەست و حەرەم! جا کەوابوو دروست نیە بۆ کەسێ کە باوەڕو ئیمانی بە خوداو بەرۆژی پاشە رۆژ هەبێ کە خوێنی بە ناهەق تیا بڕێژێ، وە یا دارو درەختی داپاچێ، وە ئەگەر دنیا بوو یەکێ کوشتارەکەی رۆژی فەتحی مەککەی پێغەمبەری کرد بە بەهانە بۆ ئەوەی شەڕو شۆڕی تیا بکا، رێگەی مەدەن و بڵێن: کەوا خودا رێگەی پێغەمبەری خۆی دابوو بۆ ئەوە، بەڵام رێگەی ئێوەی نەداوە بۆ ئەمە، تەنانەت بۆ منیش بۆ ماوەیەکی زۆر کەم رێگەی دابوو لەو رۆژەداو بەس، کە لەبەیانەکییەوە بوو تا عەصر، وەلێ ئێستا وەك سەردەمی پێشوو مەککە قەدەغەو حەرام بووەتەوە جا ئەوەی لێرەیەو حازرەو بەدیارەوەیەو بەگوێی خۆی ئەم فەرمایشتانەی من دەبیستێ بارایان بگەیەنێ بەو کەسانەی کە ئێستا لێرەنین!

جا گوترا بە ئەبو شورەیح: ئەدی وەڵامی عەمر چی بوو؟ گوتی: عەمریش گوتی: من ئەوە لەتۆ باشتر دەزانم ئەی ئەبو شورەیح! بەڵام بەست (حەرەم)ی مەککە پەنای پیاوی یاخی و پەنای پیاوی خوێن رێژی هەڵهاتوو پەنای پیاوی گزیکاری راکردوو نادات! (ش/ت — خودایان لێ رازی بێ).

١٧٠٥- وَقَالَ: عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَدِيٍّ بْنِ حَمْرَاءَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاقِفًا عَلَى الْحَزْوَرَةِ فَقَالَ: وَاللَّهِ إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللَّهِ وَأَحَبُّ أَرْضِ اللَّهِ إِلَى اللَّهِ وَلَوْلاَ أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ[٤].

---

[٤] صحيح عند الترمذي (شرحه).

**عەبدوڵڵای کوڕی عەدی کوڕی حەمراء** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: چاوم لێ بوو حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەسەر حەزوەرا ( لە مەککە) راوەستابوو، دەیفەرموو: سوێند بە یەزدانی پاك ئەی خاکی مەککە! تۆ خۆشەویستترین و باشترین وڵاتی خودای لەلای خودا! من بەزۆر لە تۆ دەریان پەڕاندم ئەگینا بەخواهیشتی خۆم بەجێم نەدەهێشتی! (ت:ص).**

**١٧٠٦– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لِمَكَّةَ: مَا أَطْيَبَكِ مِنْ بَلَدٍ وَأَحَبَّكِ إِلَيَّ وَلَوْلاَ أَنَّ قَوْمِي أَخْرَجُونِي مِنْكِ مَا سَكَنْتُ غَيْرَكِ. رواهما الترمذي[٥].**

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **بە مەککەی فەرموو: چەندە شارێکی دڵگیرو سازگارو خۆشەویستیت لەلام، خزمانم بەزۆر لەتۆ دەریان پەڕاندم، ئەگینا لە شوێنانی تر دانەدەنیشتم (ت:ح = واتە: تیرمیذی ریوایەتی کردووەو بە حەسەنی داناوە).**

## ١٣١) چوون بۆ مەککە بەبێ ئیحرام بەستن دروستە:
## يجوز دخول مكة بغير احرام

**١٧٠٨– عَنْ أَنَسٍ** (رَضِي اللّهُ عَنهُ) **أَنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ مِغْفَرٌ فَلَمَّا نَزَعَهُ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ. فَقَالَ: اقْتُلُوهُ. رَوَاهُ الخمسة[١].**

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: لە ساڵی گرتنی مەککەدا، کاتێ حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **هاتە ناو شاری مەککەوە کڵاوزرێیەکی لەسەردابوو، کە کڵاوزرییەکەی داکەند لەوکاتەدا پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا!**

---

[٥] حسن عند الترمذي (شرحه).

[١] بخاري. جزاء الصيد: ١٨٤٦، ٣٠٤٤، ٤٢٨٦، ٥٨٠٨. مسلم. حج: ٣٢٩٥. أبو داود. جهاد: ٢٦٨٥. الترمذي جهاد: ١٦٩٣. نسائي. مناسك حج: ٢٨٦٧.

ئیبنو خەطەل ئەو دوشمنە پیسە دامێنی کەعبەی گرتووەو پەنای بردۆتە بەر بەیت لە ترسانا، جا تۆفەرمانت بە چییە؟ فەرمووی: بیکوژن ئامانی مەدەن، جا نەضلەو سەعیدی کوڕی حورەیث کوشتیان، چونکە کاتی خۆی لە ئیسلام وەرگەڕابوو، وە موسوڵمانێکی کوشتبوو، وە خوسپ (غەیبەت‌و هەجو)ی حەزرەتیشی دەکرد (ش/د/ت/ن).

١٧٠٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[٢].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە هاتە ناو شاری مەککەوە مێزەرێکی رەشی بەسەرەوە بوو، چونکە لەو کاتەدا لە ئیحرامدا نەبوو (م/د/ت/ن).

### ١٣٢) لێبردن‌و خواردنەوەی ئاوی بیری زەمزەم: (شرب ماء زمزم ونقله)

١٧١٠- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ زَمْزَمَ فَشَرِبَ وَهُوَ قَائِمٌ. قَالَ: عَاصِمٌ: فَحَلَفَ عِكْرِمَةُ مَا كَانَ يَوْمَئِذٍ إِلاَّ عَلَى بَعِيرٍ. رَوَاهُ البخاري ومسلم ولفظه: شَرِبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ زَمْزَمَ مِنْ دَلْوٍ مِنْهَا وَهُوَ قَائِمٌ[١].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: لە زەمزەم ئاوم دا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە راوەستانەوە خواردیەوە. عاصیم گوتی: عەکرەمە سوێندی خوارد: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەوکاتەدا بەسواری وشتر بووە (ب/م) گفتەی (م) ئاوایە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەراوەستانەوە بە دۆڵچەیێ لە ئاوی زەمزەمی خواردەوە.

---

[٢] مسلم. حج: ٣٢٩٦. نسائی. حج: ٢٨٩٦. ترمذی. جهاد: ١٦٧٩م.

[١] بخاري. حج: ١٦٣٧، ٥٦١٧. مسلم. أشربة: ٥٢٤٨ – ٥٢٥٢. ترمذی. أشربة: ١٨٨٢. نسائی. حج: ٢٩٦٤.

١٧١١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُا) أَنَّهَا كَانَتْ تَحْمِلُ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ وَتُخْبِرُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَحْمِلُهُ. رَوَاهُ الترمذي وصححه[٢].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) لە ئاوی زەمزەمی دەبردەوە، وە دەشی گوت: جاران پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) لێی دەبردەوە بۆ مەدینە بۆ مووفەڕك! (ت:ص).

١٧١٠- عَنْ جَابِرَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَاءُ زَمْزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ. رَوَاهُ ابن ماجه وابن حبان وصححه. والله أعلم[٣].

لە جابیرەوە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): ئاوی زەمزەم بەچی نیازێ بخورێتەوە دەبێ (ئیبنو ماجە/ئەحمەد/ئیبنو حەببان:ص) وە خودا بۆ خۆی باشی دەزانێ.

١٧١٢- وللدارقطني والحاكم: مَاءُ زَمْزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ إِنْ شَرِبْتَهُ تَسْتَشْفِي بِهِ شَفَاكَ اللّٰهُ وَإِنْ شَرِبْتَهُ مُسْتَعِيذاً أَعَاذَكَ اللهِ وَإِنَّ شَرِبْتَهُ لِشِبَعِكَ أَشْبَعَكَ اللّٰهُ بِهِ وَإِنْ شَرِبْتَهُ لِقَطْعِ ظَمَئِكَ قَطَعَهُ اللهُ وَهِيَ هَزْمَةُ جِبْرِيلَ (أي غمزة بيده) وَسُقْيَا اللّٰهِ إِسْمَاعِيلَ. وَفِي رِوَايَةٍ: من شربه لمرض شفاه الله، أو جوع أشبعه الله، أو لحاجة قضاها الله[٤].

لە شەرحەکەدا دانەر (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: دارە قوتنی و حاکم (خودایان لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەگێڕنەوە دەفەرموێ: خواردنەوەی ئاوی زەمزەم بە هەموو نیازێکی پاك دەبێ و بە هەرچی نیازێ بخورێتەوە سەر دەگرێ، ئەگەر بە نیازی دەرمان و چابوونەوەو شیفا بیخۆیتەوە، خودا دەیکا بە شیفاو دەرمان بۆت، وە ئەگەر بە نیازی ئەوە بیخۆیتەوە کە توونێتیت بشکێنێ خودا توونێتییەکەت دەشکێنێ، وە ئەگەر

---

[٢] صحيح عند الترمذي.

[٣] صحيح عند ابن حبان.

[٤] سكت عن درجته الشارح.

بـــەنیازی تێرخـــواردن بیخۆیتـــەوە برێتیـــی نـــان و ئـــاو دەكـــەویّ و خـــودا تیروتەسەلت دەكا زەمزەم چالاّوی نوقورچی جوبرائیلەو خێراوی پێغەمبەر ئیسماعیلە (دروودی خودایان لەسەربێ) لە گێرانەوەیەكا: كەسێ بەنیازی چابوونەوە لە نەخۆشین بیخواتەوە خودا چاكی دەكاتەوە، یا لەبەر برسێتی بیخواتەوە خودا تیروتەسەلی دەكا، یا بۆ هەر مەبەستیّ و بەهەر نیازێ بیخواتەوە خودا بۆی جێبەجێ دەكا!

## ١٣٣) خێری ئاودان بە حاجییان: (فضل سقاية الحاج)

١٧١٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَاءَ إِلَى السِّقَايَةِ، فَاسْتَسْقَى، فَقَالَ: الْعَبَّاسُ يَا فَضْلُ اذْهَبْ إِلَى أُمِّكَ، فَأْتِ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِشَرَابٍ مِنْ عِنْدِهَا. فَقَالَ: اسْقِنِي. قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُمْ يَجْعَلُونَ أَيْدِيَهُمْ فِيهِ. قَالَ: اسْقِنِي. فَشَرِبَ مِنْهُ، ثُمَّ أَتَى زَمْزَمَ، وَهُمْ يَسْقُونَ وَيَعْمَلُونَ فِيهَا، فَقَالَ: اعْمَلُوا، فَإِنَّكُمْ عَلَى عَمَلٍ صَالِحٍ ثُمَّ قَالَ: لَوْلاَ أَنْ تُغْلَبُوا لَنَزَلْتُ حَتَّى أَضَعَ الْحَبْلَ عَلَى هَذِهِ يَعْنِي عَاتِقَهُ وَأَشَارَ إِلَى عَاتِقِهِ. رَوَاهُ البخاری[١].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ سەر سەرچاوەكەو داوای ئاوی خواردنەوەی كرد، عەبباسیش گوتی: ئەی فەضل! برۆ لەلای دایكت خواردنەوەی باش بێنە بۆ پێغەمبەر.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئاوم بدەرێ لەم ئاوەی دەیدەی بەم خەڵكە عەبباسیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئاخر دەستی تێ دخەن؟ فەرمووی: بم دەرێ قەیناكا، من پاشاو ئاغانیم تا خۆم لە یەكەیەكەی نەتەوە جیابكەمەوە.

---

[١] بخاري. حج: ١٦٣٧، ٥٦١٧ (تجريد/٢ ل - ٢٠١ + رياض/ ٢ ل - ٢٦٢ ژ/٧٦٢ ز/٤١١١).

ئینجا لێی خواردەوەو چوو بۆ سەر زەمزەم، لەوکاتەدا ئاویان هەڵدەگوست‌و دەیاندا بە خەڵك، فەرمووی: ئاو هەڵگۆزن، بەراستی ئیشەکەتان ئیشێکی گەلێ چاکە لەپاشا فەرمووی: نەبادا خەڵکەکەی تریش چاو لە من بکەن‌و کەڵەکەتان لێ بکەن‌و لە ئەنجاما زۆرتان بۆبێنن‌و مەوداتان نەدەن، ئەگینا منیش دادەبەزیم‌و گوریسی سەتڵەکەم دەنایە سەر ئێرەم‌و خۆشم ئاوم لەگەڵتان هەڵدەگۆزی‌و دەمدا بە حاجیان! وە ئیشارەتی بۆ سەر شانی خۆی کرد کە فەرمووی: گوریسی سەتڵەکەم دەنایە سەر ئێرەم (ب- خودای لێ رازی بێ).

١٧١٤- وَكَانَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) جَالِساً عِنْدَ الْكَعْبَةِ فَأَتَاهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: مَا لِي أَرَى بَنِي عَمِّكُمْ يَسْقُونَ الْعَسَلَ وَاللَّبَنَ وَأَنْتُمْ تَسْقُونَ النَّبِيذَ أَمِنْ حَاجَةٍ بِكُمْ أَمْ مِنْ بُخْلٍ فَقَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ الْحَمْدُ لِلَّهِ مَا بِنَا مِنْ حَاجَةٍ وَلاَ بُخْلٍ قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رَاحِلَتِهِ وَخَلْفَهُ أُسَامَةُ فَاسْتَسْقَى فَأَتَيْنَاهُ بِإِنَاءٍ مِنْ نَبِيذٍ فَشَرِبَ وَسَقَى فَضْلَهُ أُسَامَةَ وَقَالَ: أَحْسَنْتُمْ وَأَجْمَلْتُمْ كَذَا فَاصْنَعُوا. فَلاَ نُرِيدُ تَغْيِيرَ مَا أَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ مسلم وابو داود[٢].

جارێ ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) لەلای کەعبەدا دانیشتبوو، عەرەبێکی دەشتەکی هات گوتی: ئەوە بۆ دەبینم ئامۆزاکانتان شەربەتی هەنگوین‌و شیر دەدەن بە خەڵك کەچی ئێوە خۆشاو دەدەن بە خەڵك ئایا ئەمە لەبەر نەبوونیتانە، یا لەبەر پیسکەییتانە؟ ئیبنو عەبباسیش گوتی: لە سایەی خوداوە نە نەبووین‌و نە پیسکەو رەزیلین، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە سواری وڵاخەکەی تەشریفی هات، وە ئوسامەی لە پاشکۆدابوو، وە داوای خواردنەوەی کرد، ئێمەش جامێ خۆشاومان بۆ هێنا، جا خۆی لێی خواردەوەو بەرماوەکەی خۆی دا بە ئوسامە، وە فەرمووی: ئافەرین بۆ خۆتان، باش دەکەن هەروابکەن.

---

[٢] مسلم. حج: ٣١٦٦. أبو داود. مناسك: ٢٠٢١.

**جا ئێمەیش نامانەوێ لە قسەی پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەرچین، یا ەرمانەکەی بگۆڕین!** (م/د).

## ١٣٤) بەشی دووەم: باسی کەعبە، خودا بی پارێزێ:

## الفصل الثاني: في الكعبة حفظها الله تعالى

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا}.

**خودای گەورە دەفەرموێ: بەراستی یەکەم هۆدەیێ دانرابێ لەسەر زەویدا بۆ خودا پەرستی ئەو هۆدەیەتە کە لە شاری مەککەدایە، کە هۆدەیەکی خاوەن پیت و بەرەکەتەو هۆی شارەزابوون و هیدایەتە بۆ هەموو کەسێ، چەند بەڵگەو نیشانەیەکی گەورەی ئاشکرای تیایە، وەك مەقامی ئیبراهیم و حەجەرول ئەسوەد، وە هەر کەسێ بچێتە ناوی لە دۆزەخ رزگاری دەبێ و لە جیهانیشا ئاسوودە دەبێ.**

وَقَالَ سُبْحَانَهُ: {وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ}.

**خودای پاکو بێگەرد دەفەرموێ: وە باسی ئەوە بکە کە ئیبراهیم بە یارمەتی ئیسماعیلی کوڕی، بناغەی خانووی کابەیان لە عەرز بەرزەوەکرد، کە دەپاڕانەوە لە خوداو دەیان گوت: خودایە! ئەم کردەوەو ئەم ئەرکەمان لێ قەبووڵ بکە، ئەی خودا! بە راستی ئەتۆ شنەوای وتارو زانای پەنامەکیی دڵی ئێمەی.**

وَقَالَ تَعَالَى: {جَعَلَ اللّهُ الْكَعْبَةَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ قِيَامًا لِّلنَّاسِ}.

**خودای گەورە دەفەرموێ: خودای گەورە ئەو کابەیەی کردووە بەهۆی راوێستاوی مەردوم و مەردوم بەهۆی ئەوەوە کاروباری هەردوو جیهانیان**

دەڕوا بەڕێوە، ئەو کابەیە کە حاڵی وایە خانەیەکی خاوەن پایەو شانو شەرەفە، وە نارەوایی تیادا زۆر زۆر بێ ئەدەبی و بێ جایە.

١٧١٦- عَنْ جَابِرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا بُنِيَتِ الْكَعْبَةُ ذَهَبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَبَّاسٌ يَنْقُلاَن الْحِجَارَةَ فَقَالَ: الْعَبَّاسُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اجْعَلْ إِزَارَكَ عَلَى رَقَبَتِكَ. فَخَرَّ إِلَى الأَرْضِ، وَطَمَحَتْ عَيْنَاهُ إِلَى السَّمَاءِ فَقَالَ: أَرِنِي إِزَارِى. فَشَدَّهُ عَلَيْهِ. زاد في رواية: فَمَا رُئِيَ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ عُرْيَاناً. رَوَاهُ الشيخان والله أعلم[1].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کە کەعبەیان دروست دەکردەوە، پێغەمبەرو عەبباسی مامەی بەیەکەوە بەردیان بۆ دەهێنا، عەبباس بە پێغەمبەر دەڵێ: شەرواڵەکەت بخەرە سەرشانت با بەرد سەرشانت نەبا، کە حەزرەت وای کرد شەرمگای دەرکەوت ئیتر لە شەرمانا بوورایەوەو خرپ بەربۆوەو کەوتە سەر زەوی وە چاوی لە ترسی خودا بەرەو ئاسمان ئەبڵەق بوو.

وە فەرمووی: کوانێ دەرپێکەم ئینجا کردیەوە بەری. لە گێڕانەوەبەکا ئەمەشی پترکردووە: ئیتر لەو رۆژە بەدواوە بە رووتی نەبینراوە[1] (ش).

---

[1] بخاري. حج: ١٥٨٢. مسلم. حيض: ٧٦٩.

[1] وەك لە (عەینی)دا دەفەرموێ: ئەوکاتە تەمەنی حەزرەت (٣٥) ساڵ بووە، ئەمرۆ لە خودا بەزیاد بێ عومدەتولقاری مەشهوور بە عەینیم دەست کەوت، تا ئێستا بۆ عەینی سوودم لە نوسخەکەی نامەخانەکەی مزگەوتی حاجی ئیبراهیم بەگ تەکریتی لە کەرکووك وەردەگرت، بەهۆی جەنابی مامۆستا مەلا خەلیل سەعید مەحموودەوە، کە ئیمامو خەطیبی ئەوێیە، کە برادەرێکی گیانی بە گیانیمە، خودا دەست بەعەمری بگرێ. بەراستی فەزڵی ئەم مزگەوتەو ئەم نامەخانەیەو ئەم مامۆستایە لەسەر من زۆرە. بوون بە ئارامگای گیانم، جا بەم بۆنەیەوە دەڵێم:

ئەی گیان! هەر چەندە دووری لە ماددە

لەگەڵ ئەوەیشا وەك بووكی پەردە،

كە بە زۆری دار پەلكێش كرابێ

لەناو جەستەدا دیلی وەك بەندە!

## ١٣٥) نوێژکردن لەناو ماڵی کەعبەدا دروستە.وە حیجریش بەشێکە لەکەعبە: تجوز الصلاة في الكعبة والحجر منها

١٧١٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ أَبَى أَنْ يَدْخُلَ الْبَيْتَ وَفِيهِ الآلِهَةُ فَأَمَرَ بِهَا فَأُخْرِجَتْ قَالَ: فَأَخْرَجُوا صُورَةَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَفِي أَيْدِيهِمَا الأَزْلاَمُ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَمَا وَاللَّهِ

---

کە کێوی خەمان هەرەسی هێنا
کە دڵ وەک مەنجەڵ ژەنگی هەڵهێنا
کە دنیا وەک گۆڕ تەنگ و تارک بوو
کاتی مزگەوتە، هەنگاو هەڵهێنە!
ئەی خانەی خودا! یانەی موسوڵمان!
گیانم میوانە لە خاکو پاتان،
هەی دێی لێ مەکەن لەبەر ناوانی
غەریبە قەدری بگرن لەلاتان!
سڵاو لەتۆ بێ ئەی نامەخانە!
هەر کتێبێکت رۆژی بەیانە
سڵاو لە خۆت و خاوەنی خاست
خوایە! ئەی بڕی ئەم چراخانە
بڕای تاقانەم مامۆستا خەلیل
دانا و زانایە لەدین بە دەلیل
لەسەر نەشری دین، خزمەتی ئیسلام
فرصەتی بدەی ئەی خودای جەلیل

نوری فارس ١٩٨٧/١٠/٢٠

(کاتی روونووسکردنی ئەم کتێبە پیرۆزە بۆ لە چاپدان. خوا حەزکا.
کەرکووک نەخۆشخانەی عەسکەری کەرکووک)

لَقَدْ عَلِمُوا أَنَّهُمَا لَمْ يَسْتَقْسِمَا بِهَا قَطُّ. فَدَخَلَ الْبَيْتَ فَكَبَّرَ فِي نَوَاحِيهِ. رَوَاهُ البخار وأبو داود[1].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درووودی خودای لەسەربێ) **کە تەشریفی هات بۆ مەککە هەتا بتەکان لەناو بەیتا بوون قایبل نەبوو کە بچێتە ناوی، جا فەرمانی کرد بتەکانیان لێ هێنایە دەرەوە، کە پەیکەری ئیبراهیم‌و ئیسماعیلیان لەبەیت هێنایە دەرەوە ئەزلامیان لە دەستابوو، پێغەمبەر** (درووودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: دەك خودا بچێ بە گژیانا! دەسا بەزاتی خودا خۆیان زۆرباش دەزانن کە ئەو دووزاتە هەرگیزاو هەرگیز بەمانە بەخت‌و فاڵیان نەگرتۆتەوە.**

**جا کە خوا درۆینەکانیان لە بەیت دەرهێنا ئەوسا حەزرەت** (درووودی خودای لەسەربێ) **چووە ناوی‌و لەناویا دەستی کرد بە ئەڵڵاهو ئەکبەر کردن (ب/د).**

١٧١٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْبَيْتَ هُوَ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَبِلَالٌ، وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ، فَأَغْلَقُوا عَلَيْهِمْ فَلَمَّا فَتَحُوا، كُنْتُ أَوَّلَ مَنْ وَلَجَ، فَلَقِيتُ بِلَالاً فَسَأَلْتُهُ هَلْ صَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: نَعَمْ، بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ. وَفِي رِوَايَةٍ: جَعَلَ عَمُودًا عَنْ يَسَارِهِ وَعَمُودَيْنِ عَنْ يَمِينِهِ وَثَلَاثَةَ أَعْمِدَةٍ وَرَاءَهُ، وَكَانَ الْبَيْتُ يَوْمَئِذٍ عَلَى سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ، ثُمَّ صَلَّى. رَوَاهُ الخمسة[2].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درووودی خودای لەسەربێ) **خۆی‌و ئوسامەو بیلال‌و عوسمانی کوڕی طەلحە چوونە ناو ماڵی کابەوە، وە دەرگایان لەسەر خۆیان داخست، جا کە دەرگاکەیان کردەوە یەکەم کەس کەچووە ژوورەوە من بووم، بە بیلال گەیشتم لێم پرسی: ئایا پێغەمبەر** (درووودی خودای لەسەربێ) **نوێژی تیاکرد؟ گوتی: ئا، لە بەینی دوو کۆڵەکە یەمەنییەکاندا. لە گێڕانەوەیەکا:**

---

[1] بخاري. حج: ١٦٠١.

[2] بخاري. صلاة: ٣٩٧، ٤٦٨، ٥٠٤، ٥٠٥، ٥٠٦، ١١٦٧، ١٥٩٨، ١٥٩٩، ٢٩٨٨، ٤٢٨٩، ٤٤٠٠. مسلم. حج: ٣٢١٧. أبو داود. مناسك: ٢٠٢٣. نسائي. صلاة: ٦٩١.

کۆڵەکەیەکی خستە لای چەپیەوەو دوو کۆڵەکەی خستە لای راستیەوەو سێ کۆڵەکەیشی خستە پشت خۆیەوە، ئینجا دوو رکات نوێژی کرد، ئەو سەردەمەیش بەیت لەسەر شەش ئەستوون بوو.(ش/د/ت/ن- خودایان لێ رازی بێ).

١٧١٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ عِنْدِي وَهُوَ مَسْرُورٌ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيَّ وَهُوَ كَئِيبٌ فَقَالَ: إِنِّي دَخَلْتُ الْكَعْبَةَ وَلَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا دَخَلْتُهَا إِنِّي أَخَافُ أَنْ أَكُونَ قَدْ شَقَقْتُ عَلَى أُمَّتِي. رَوَاهُ أبو داود والترمذى وصححه[٣].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەلای من بوو کە دەرچوو کەیفی هەبوو، بەڵام کەهاتەوە بۆلام پەست بوو، جا فەرمووی: رۆیشتمە ناو ماڵی کابەوە، لە دەستم چوو نەدەبوو بچوومایەتە ناوی دەترسم ئۆمەتم تووشی ئەرك و مەینەت کردبێ لەبەر ئەوەی وابزانن کە چوونە ناوی فەرزە (د/ت:ص).

١٧٢٠- وَعَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أُحِبُّ أَنْ أَدْخُلَ الْبَيْتَ فَأُصَلِّيَ فِيهِ فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِي فَأَدْخَلَنِي فِي الْحِجْرِ فَقَالَ: صَلِّي فِي الْحِجْرِ إِنْ أَرَدْتِ دُخُولَ الْبَيْتِ فَإِنَّمَا هُوَ قِطْعَةٌ مِنَ الْبَيْتِ وَلَكِنَّ قَوْمَكِ اسْتَقْصَرُوا حِينَ بَنَوُا الْكَعْبَةَ فَأَخْرَجُوهُ مِنَ الْبَيْتِ. رَوَاهُ أصحاب السنن وصححه الترمذي[٤].

دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزم لێ بوو کە بچمە ناو بەیتەوەو نوێژی تیا بکەم، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی گرتم و بردمیە ناو حیجرەوەو فەرمووی: لە حیجرا نوێژ بکە ئەگەر حەزدەکەی بچیتە ناو بەیتەوە. چونکە حیجریش پارچەیەکە لە بەیت، بەڵام لەکاتی خۆیا کە هۆزی تۆ ویستیان کەعبە دروست بکەنەوە کورتیان کردەوەو حیجریان نەخستەوە سەری لەبەر دەست کورتی (د/ن/ت:ص).

---

[٣] صحيح عند الترمذي.

[٤] صحيح عند الترمذي.

١٧٢١- وَعَنْهَا قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْجَدْرِ أَمِنَ الْبَيْتِ هُوَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: فَلِمَ لَمْ يُدْخِلُوهُ فِي الْبَيْتِ؟ قَالَ: إِنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بِهِمُ النَّفَقَةُ. قُلْتُ فَمَا شَأْنُ بَابِهِ مُرْتَفِعًا؟ قَالَ: فَعَلَ ذَلِكِ قَوْمُكِ لِيُدْخِلُوا مَنْ شَاءُوا وَيَمْنَعُوا مَنْ شَاءُوا وَلَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِالْجَاهِلِيَّةِ فَأَخَافُ أَنْ تُنْكِرَ قُلُوبُهُمْ لَنَظَرْتُ أَنْ أُدْخِلَ الْجَدْرَ فِي الْبَيْتِ وَأَنْ أُلْزِقَ بَابَهُ بِالأَرْضِ. وَفِي رِوَايَةٍ: لَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُو عَهْدٍ بِشِرْكٍ لَهَدَمْتُ الْكَعْبَةَ فَأَلْزَقْتُهَا بِالأَرْضِ وَجَعَلْتُ لَهَا بَابَيْنِ بَابًا شَرْقِيًّا وَبَابًا غَرْبِيًّا بَابٌ يَدْخُلُونَ مِنْهُ وَبَابٌ يَخْرُجُونَ مِنْهُ وَزِدْتُ فِيهَا سِتَّةَ أَذْرُعٍ مِنَ الْحِجْرِ فَإِنَّ قُرَيْشًا اقْتَصَرَتْهَا حَيْثُ بَنَتِ الْكَعْبَةَ. رَوَاهُ الشيخان الترمذي[5].

دیسان گوتی: پرسیارم کرد لە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ): ئایا حیجری ئیسماعیل لە بەیتە یانا؟ فەرمووی: ئا، عەرزیم کرد: ئەی بۆ نەیانخستۆتە سەربەیت؟ فەرمووی: چونکی گەلی تۆ کاتێ کە کابەیان دروست کردەوە دەستیان کورت بوو گوتم: ئەی بۆچی دەرگای بەیت بەرزە؟ فەرمووی: گەلەکەت بۆیە وا لە بەرزی دەرگاکەیان دورست کردووە تا بە ئارەزووی خۆیان کێیان ویست کە بچێتە ناوی رێگەی بدەن و کێیان نەویست نەیەڵن بچێتە ناوی، گەلی تۆ هێشتا نۆ موسوڵمانن و دەترسم لە دڵەوە پێیان ناخۆش بێ ئەگینا حیجرم دەخستەوە سەربەیت و دەرگاکەیشم لە سەرزەوییەکە دادەنا.

لە گێرانەوەیەکا: هۆزی تۆ نۆ موسوڵمانن لەبەر ئەوە دەترسم کە لە دڵەوە پێیان ناخۆش بێ ئەگینا کەعبەم دەرووخان و لە ئاستی زەوی مزگەوتەکە تەختی بنەکەیم دادەنا و دەرگەکەیشم لەسەر تەختی زەوییەکە دادەنا، وە دوو دەرگایشم بۆ دروست دەکرد: دەرگایێ لە خۆر هەڵاتەوەو دەرگایێ لە خۆر نشینەوە، تا لە دەرگایەکیانەوە خەڵك بچنە ژوورەوەو لەو دەرگاکەی تریانەوە بڕۆنە دەرەوە، وە شەش باڵیشم لە حیجری ئیسماعیل

---

[5] بخاري. حج: ١٥٨٤. مسلم. حج: ٣٢٣٦، ٣٢٢٧ — ٣٢٣٥.

دەخستە سەر، چونکە قورەیش کە کابەیان دروست کردەوە (لەبەر دەست کورتی) کورتیان کردەوەو لەسەر بناغەکانی ئیبراهیم دروستیان نەکردەوە (ش/ت – شەیخان و تیرمیذی، خودایان لێ رازی بێ).

## ١٣٦) گەنج (کەنز)ەکەی کەعبە: (كنز الكعبة)

١٧٢٢– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: لَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُو عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ – أَوْ قَالَ: بِكُفْرٍ – لأَنْفَقْتُ كَنْزَ الْكَعْبَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَجَعَلْتُ بَابَهَا بِالأَرْضِ وَلأَدْخَلْتُ فِيهَا مِنَ الْحِجْرِ. رَوَاهُ مسلم[1].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ژنەوتم لە حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: لەبەر ئەوە نەبێ کە گەلی تۆ نوێ موسوڵمانن یا فەرمووی: تازە موسوڵمان بوون و هێشتا کەم و زۆر بیرو باوەڕی سەردەمی نەزانی کاریان لێ دەکاو لەبەر ئەوە لەوانەیە لە دڵەوە پێیان ناخۆش بێ ئەگینا گەنجەکەی ناو کابەم دەردەهێناو لە ڕێگەی خودادا خەرجم دەکرد، وە دەرگاکەیشم دادەگرت و دەم گەیاندە سەر تەختی زەوی، وە هەندێکیشم لە حیجری ئیسماعیل (دروودی خودای لەسەربێ) دەخستە سەری! (م. خودای لێ رازی بێ).

١٧٢٣– وَقَالَ: شَقِيقٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) كُنْتُ مَعَ شَيْبَةَ ابْنَ عُثْمَانَ فَقَالَ: قَعَدَ عُمَرُ فِي مَقْعَدِكَ الَّذِى أَنْتَ فِيهِ فَقَالَ: لاَ أَخْرُجُ حَتَّى أَقْسِمَ مَالَ الْكَعْبَةِ. قَالَ: قُلْتُ مَا أَنْتَ بِفَاعِلٍ. قَالَ: بَلَى لأَفْعَلَنَّ. قَالَ: قُلْتُ مَا أَنْتَ بِفَاعِلٍ. قَالَ: لِمَ؟ قُلْتُ: لأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ رَأَى مَكَانَهُ وَأَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) وَهُمَا أَحْوَجُ مِنْكَ إِلَى الْمَالِ فَلَمْ يُخْرِجَاهُ. فَقَامَ فَخَرَجَ. رَوَاهُ أبو داود والبخارى ولفظه: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ لاَ أَدَعَ فِيهَا صَفْرَاءَ وَلاَ بَيْضَاءَ إِلاَّ قَسَمْتُهُ. قُلْتُ إِنَّ صَاحِبَيْكَ لَمْ يَفْعَلاَ. قَالَ: هُمَا الْمَرْآنِ أَقْتَدِى بِهِمَا[2].

---

[1] مسلم. حج: ٣٢٣٠. بخاری حج: ١٥٨٣.

[2] بخاري. حج: ١٥٩٤، ٧٢٧٥.

شەقیق (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ لەلای شەیبەی کوڕی عوسمان (خودای لێ ڕازی بێ) دانیشتبووم لەسەر کورسییەك لەناو کابەدا گوتی: لەم شوێنەی تۆدا عومەر دانیشتبوو گوتی: ناڕۆمە دەرەوە هەتا ئەم ماڵەی وا لەناو کابەدا دابەشی نەکەم گوتم: نایکەی، گوتی: با دەیکەم گوتم: نایکەی، گوتی: بۆ؟ گوتم: چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) و ئەبو بەکریش وەکێ تۆ بەم ماڵ و سامانەیان دەزانی و لە تۆیش پتر هەوەجییان پێی هەبوو لەگەڵ ئەوەیشا دەستیان لێ نەدا، جا عومەر هەڵسا ڕۆیشت (د/ب — خودایان لێ ڕازی بێ).
گفتەی (ب): عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: نیازم وایە هەرچی زێڕو زیوێ لە کابەدایە هەمووی دابەش بکەم، منیش گوتم: پێغەمبەرو ئەبو بەکری هاوڕێیانی تۆ ئەمەیان نەکردووە، گوتی ئەو دوانە کەڵەپیاو بوون، منیش چاو لەوان دەکەم و ڕەوشتی بەرزی ئەو دوو مەردە دەکەم بەسەر مەشق!

## ١٣٧) لەشکرێ شاڵاو دێنن بۆ سەرکەعبە، وە لەڕێ ڕۆدەچن بەناخی زەویدا: يخسف بمن يغزو الكعبة

١٧٢٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَغْزُو جَيْشٌ الْكَعْبَةَ، فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ، وَفِيهِمْ أَسْوَاقُهُمْ وَمَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ؟ قَالَ: يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ، ثُمَّ يُبْعَثُونَ عَلَى نِيَّاتِهِمْ. رَوَاهُ الخمسة[1].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەشکرێ دێن بدەن بەسەر کابەدا، جا کە دەگەنە بەیدا کە ناوی شوێنێکی تایبەتییە لە ناوەندی مەککەو مەدینەدا لەوێ هەموویان ڕۆ دەچن بە ناخی

---

[1] بخاري. بيوع: ٢١١٨. مسلم. فتن: ٧١٦٩ — ٧١٧٣. أبو داود. مهدى: ٤٢٨٩. نسائى. مناسك: ٢٨٧٩ (رياض/١-ز:١ ژ:٢/٢).

زەویدا منیش گوتم: ئەی رەوانەکراوی خودا! چۆن و بۆ هەموویان چونیەك رۆ دەچن، خۆ هەیانە بۆ شەڕ نەهاتووەو تەنیا بازاڕیان بۆ ساز دەکا، وە هەشیانە لەوان نیەو بەزۆر هێناویانە؟

فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): هەموویان وەك یەك رۆ دەچن بەناخی زەویدا بەڵام لە پاشا هەر کەسەیان لەسەر نیازی خۆی زیندوو دەکرێتەوە چاکیان بە چاك پاداشی دەدرێتەوەو خراپیان بە خراپ (ش/د/ت/ن).

١٧٢٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُخَرِّبُ الْكَعْبَةَ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الْحَبَشَةِ. وَفِي رِوَايَةٍ: كَأَنِّي بِهِ أَسْوَدَ أَفْحَجَ، يَقْلَعُهَا حَجَرًا حَجَرًا. رَوَاهُ الشيخان[٢].

ئەبو هورەیره (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پیاوێکی دوو لاق بارێکی حەبەشەیی کەعبە دەرووخێنێ!

لە گێڕانەوەیەکا: دەڵێی ئێستا وا لەبەر چاوم ئەو قولە رەشە پەیزەنە گەلاوگەڵەی کە کابە بەرد بە بەرد هەڵدەتەکێنێ! (ش = بوخاری و موسلیم - خودایان لێ رازی بێ).

## ١٣٨) بەشی سێیەم: باسی گەورەیی مەدینە سڵاوو درودی خودا لەسەر ئەو پێغەمبەرو موسوڵمانانە بێ کە ئارامگایان لەو خاکە پاك و پیرۆزەیە:

## الفصل الثالث: في فضل المدينة. على سكانها أفضل الصلاة والسلام

١٧٢٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى سَمَّى الْمَدِينَةَ طَابَةَ[١].

---

[٢] بخاري. حج: ١٥٩١، ١٥٩٦، ١٥٩٥. مسلم. فتن: ٧٢٣٤ — ٧٢٣٦. نسائى. مناسك: ٢٩٠٤.

[١] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٧٢. مسلم. حج: ٣٣٤٤.

جابیری کوڕی سەموورە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورە خۆی مەدینەی ناوناوە طابە واتە: شارێکی خۆش‌و باش‌و سازگارو خاوەنی دانیشتوانی باش‌و خاس (ش — خودای لێ ڕازی بێ).

١٧٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: أُمِـرْتُ بِقَرْيَةٍ تَأْكُلُ الْقُرَى يَقُولُونَ: يَثْرِبُ. وَهْيَ الْمَدِينَةُ، تَنْفِي النَّـاسَ كَمَـا يَنْفِـي الْكِـيرُ خَبَـثَ الْحَدِيدِ. رواهما الشيخان[٢].

لـە ئـەبو هـورەیرەوە (خودای لێ ڕازی بێ) لـە پێغەمبـەرەوە دەفـەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): فـەرمانم پـێ کـراوە کـە کـۆچ بکـەم بـۆ گونـدێ، کـە گونـدان دەبەزێنێ، نا پاکان پێی دەڵێن: یەثـریب واتـە: لۆمـەو سەرزەنشت بەڵام هـەر خۆی سەر گوڵی شارانەو نـاوی مەدینەیە، گەندەکانی مـەردوم ڕەهەنە دەکا وەك چۆن مووشەدەمەو کوورە چڵك‌و ژەنگی ئاسن لا دەبەن! (ش).

١٧٢٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَبَايَعَـهُ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَجَاءَ مِنَ الْغَدِ مَحْمُومًا، فَقَالَ: أَقِلْنِي، فَأَبَى ثَلاَثَ مِرَارٍ، فَخَرَجَ الأَعْرَابِيُّ. فَقَالَ: رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ، تَنْفِي خَبَثَهَا، وَيَنْصَعُ طَيِّبُهَا[٣].

جـابیر (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: عـەرەبێکی دەشـتەکی هاتـە خزمـەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بەیعەت‌و پەیمانی دایە لەسەر ئیسلامەتی، وە بۆ سبەینێ هاتـەوە تـاداربوو، گـوتی: پەیمانەکـەم هەڵوەشێنەرەوەو ڕێگـەم بـدە بگەڕێمـەوە بـۆ وڵاتـی خـۆم ئـاوو هـەوای ئێرەم پـێ ناکـەوێ، وەسـێ جار ئـەم داوایـەی لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) داواکـرد، وە هەرسـێ جارەکـە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) داواکەی قەبووڵ نەکرد، لەگەڵ ئەوەیشا کابرای دەشتەکی شاری بەجێ هێشت‌و پەیمانەکەی شکاند.

---

[٢] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٧١. مسلم. حج: ٣٣٤٠.

[٣] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٨٣، ٧٢٠٩، ٧٢١١، ٧٢١٦، ٧٣٢٢. مسلم. حج: ٣٣٤٢. ترمذی. مناقب: ٣٩٢٠.

جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەدینە وەك مووشەدەمە وایە چڵك و ژەنگەکەی لادەبا و جەوهەرەکەی دەردەخاو شەوقی پێ هەڵدێنێ (ش/ت).

١٧٢٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الإِيمَانَ لَيَأْرِزُ إِلَى الْمَدِينَةِ كَمَا تَأْرِزُ الْحَيَّةُ إِلَى جُحْرِهَا. رواهما الشيخان والترمذي[٤].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: وەکی چۆن مار کە زۆری بۆ هات دەخزێتەوە ناوکونی خۆی و پەپکەی تیا دەخوات، ئیسلامەتیش ئاوەها دەکشێتەوە بۆ ناو مەدینەو گرمۆڵەی تیا دەکا! (ش/ت).

١٧٣٠- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: آخِرُ قَرْيَةٍ مِنْ قُرَى الإِسْلاَمِ خَرَابًا الْمَدِينَةُ. رَوَاهُ الترمذي وحسنه وتقدم في باب المساجد فضل المساجد الثلاثة[٥].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دواترین وڵاتی ئیسلام کە وێران دەبێ شاری مەدینەیە (ت:ح).

١٧٣١- قال المؤلف (رحمه الله تعالى) وتقدم في باب المساجد فضل المساجد الثلاثة[٦].

تەماشای ئەم باسە بکە: (ب-١ ز-١١٥ = بەرگی یەکەم زنجیرە سەدو پازدە).

## ١٣٩) بەشی چوارەم: باسی بەست (حەرەم)ی مەدینە:

## الفصل الرابع: في حرمها

١٧٣٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ (رَضِي اللهُ عَنهُمْ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ وَدَعَا لأَهْلِهَا وَإِنِّي حَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ كَمَا حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ

---

[٤] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٧٦. مسلم. إيمان: ٣٧٢.

[٥] حسن عند الترمذي.

[٦] راجع المجلد الأول، تسلسل/ ١١٥ وتسلسل/١٦.

وَإِنِّي دَعَوْتُ فِي صَاعِهَا وَمُدِّهَا بِمِثْلَيْ مَا دَعَا بِهِ إِبْرَاهِيمُ لأَهْلِ مَكَّةَ. رَوَاهُ مسلم والترمذي[1].

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیم (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئیبراهم بە فەرمانی خودا مەککەی کردووە بە حەرەم و بەستێکی ئەمین و هێمن و مەنعی کاری نا موناسبی لێ کردووە، وە دوعاو نزای کردووە بۆ دانیشتوانی، وە منیش دیسان بە فەرمانی خودا مەدینەم حەرام کردووە و کردوومە بە بەست و حەرەم، هەر وەك چۆن ئیبراهیم مەککەی حەرام کردووەو کردوویەتی بە بەست و حەرەم، وە من دۆعای پیت و بەرەکەتم کردووە بۆ مەن و مشتی مەدینە دوو قاتی ئەو دوعاو نزایەی کە ئیبراهیم کردوویەتی بۆ خەڵکی مەککە (م/ت).

١٧٣٣- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: مَنْ زَعَمَ أَنَّ عِنْدَنَا شَيْئًا نَقْرَأُهُ إِلاَّ كِتَابَ اللَّهِ وَهَذِهِ الصَّحِيفَةَ فَقَدْ كَذَبَ فِيهَا أَسْنَانُ الإِبِلِ وَأَشْيَاءُ مِنَ الْجِرَاحَاتِ وَفِيهَا قَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ فَمَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا أَوْ آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً وَذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ. زَادَ فِي رِوَايَةٍ: فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِمًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ، وَمَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَو انْتَمىَ إِلَى مَوَالِيهِ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ اللهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلاً رواه الثلاثة[2].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: هەر کەسێ گومان بکا کە ئێمە کە کەس و کاری پێغەمبەرین نامەیەکی تایبەتیمان لەلا هەیە، کە هەر بۆ ئێمەیەو بۆ خۆمان دەیخوێنین، زیاد لە قورئان هەر کەسێ گومانی وابێ، درۆ دەکا، بەس

---

[1] بخاری. بیوع: ٢١٢٩. تجرید: ٩٦٥. مسلم. حج: ٣٣٠٠.

[2] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٧٠، ٣١٧٢، ٣١٧٩، ٦٧٥٥، ٧٣٠٠. مسلم. حج: ٣٣١٤، ٣٧٣٧. أبو داود. مناسك: ٢٠٣٤. ترمذی ولاء وهبة: ٢١٢٧.

ئەمـەی لێ دەرچـێ کـە لـەم تۆمارەدایـە کـە لوولـدراوەو وا لـەناو کێلانـی ئـەم شمشێرەما.

لەم تۆمارەدا باسی تەمەنی ئەو وشترانەی تیادایە کە دەدرێن بە تۆڵـەی خوێنـدا. وە هـەوەها باسـی چـەند بابـەتێکی زامو زامکـاریی (جیراحـات)ی تیایە، وە ئەمەشی تیایە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفـەرموێ: مەدینـە بەستو حەرەمە، لە نێوانی کێوی عەیرەوە هەتا کێوی ثـەور، جـا هـەر کەسـێ کارێکی نارەوای تیا بکـا، یـا پیـاو خراپێکـی تیـا پـەنا بدا لەعنەتو نەفرینی خوداو فریشتەکانو ئەو خەڵکەی هەموو لەسەربێ لـە ڕۆژی قیامەتیشا خـودا نەفەرزو نەسوننەتی لێ قەبووڵ ناکا.

موسوڵمانان بۆ پەیمانی ئامـان دان بـە کـافران، هـەموویان چـون یـەکنو هەرە خوارینەکەیان مافی ئامان دانی هەیە بەهەرکافرێ دەیەوێ.

لە گێڕانەوەیەکا: ئەمەیشی پتر کردووە: جا هەر کەس پـەیمانی ئامـانی موسوڵمانێ تێك بدا، لەعنەتو نەفرینی خوداو فریشتەو ئەو خەڵکەی هـەموو لەسـەربێ، لـە ڕۆژی قیامـەتا خـودا نەسـوننەتو نەفـەرزیلێ گـیرا ناکـا، وە نەفرینو لەعنەتی خوداو فریشتەو ئادەمیزاد هـەموو لەسـەر ئـەو کەسـەبێ کە حاشـا لـە بـاوکی خـۆی دەکـاو خـۆی دەکـا بـە نەتـەوەی پیـاوێکی تـر، وە یـا بەندەو کەنیزبێو ئاغای ئازادی کردبێو کەچی حاشا لـە ئاغـای خـۆی بکـاو یـەکێکی تـر بکـا بـە ئاغـای خـۆی، ئـەم جـۆرە کەسـە لـە ڕۆژی قیامـەتا خـودا نەفەرزو نەسوننەتیان لێ گیرا ناکا (ش/د).

١٧٣٤- وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) حَرَّمَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَـا بَـيْنَ لاَبَتَي الْمَدِينَةِ. فَلَوْ وَجَدْتُ الظِّبَاءَ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا مَا ذَعَرْتُهَا. وَجَعَلَ اثْنَيْ عَشَرَ مِيلاً حَوْلَ الْمَدِينَةِ حِمًى. رَوَاهُ الشيخان والترمذى وَفِي رِوَايَةٍ: لمسلم: اللّٰهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّـةَ فَجَعَلَهَا حَرَمًا وَإِنِّي حَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ حَرَامًا مَا بَيْنَ مَأْزِمَيْهَا أَنْ لاَ يُهَرَاقَ فِيهَا دَمٌ وَلاَ يُحْمَلَ فِيهَا سِلاَحٌ لِقِتَالٍ وَلاَ تَخْبَطُ فِيهَا شَجَرَةٌ إِلاَّ لِعَلَفٍ[٣].

---

[٣] بخاري. حج: ١٨٧٣. مسلم. حج: ٣٣١٩، ٣٣٢٣. ترمذى. مناقب: ٣٩٢١.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەم پەڕ مەدینەوەتا ئەو پەڕی مەدینەی حەرام کردووەو لە خڕەبەرداوییەکەی ئەم پەڕی تا خڕەبەرداوییەکەی ئەو پەڕی کردووە بە بەست و حەرەم، جا من بەش بە حاڵی خۆم ئەگەر لە ناوەندی ئەم دوو شوێنەدا ئاسك ببینم نایڕەوێنمەوەو داینا چەڵەکێنم، وە کورت و پوخت حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دوانزە میلی بەدەوری شاری مەدینەدا داناوە بە قەدەغەو بەست و حەرەم، حاڵی وەکی حاڵی حەرەمی مەککە وایە (ش/ت).

لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا: ئەی خودایە! ئیبراهیم لەسەر ئەمرو فەرمانی تۆ کە لە رۆژی دروستکردنی ئاسمان و زەمیندا بڕیارت داوە مەککەی حەرام کردووەو کردوویەتی بە قەدەغەو بەست و حەرەم، وە منیش دیسان بە فەرمانی تۆ مەدینەم حەرام کردووەو ئەو ماوەیەی کە دەکەوێتە نێوانی کێوی عەیرو کێوی ثەورەوە کردوومە بە بەست و قەدەغە: کە نەخۆوێنی تیا بڕێژرێ وە نەچەکی تیا هەڵبگیرێ بۆ شەڕو شۆڕ، وە نەدارو درەخت و رووەکی تیا داپاچرێ مەگەر بۆ ئاڵف و ئالیك!

١٧٣٤- وَلأبي داود: لاَ يُخْتَلَى خَلاَهَا، وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهَا، وَلاَ تُلْتَقَطُ لُقَطَتُهَا إِلاَّ لِمَنْ أَنْشَدَهَا[٤].

ئەبو داوود (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە بە سەنەدێکی صەحیح دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: گیای مەدینە درەوناکرێ و نەچێری داناچەڵەکێنرێ و راوناکرێ و شتی داکەوتووی هەڵناگیرێ، مەگەر بۆ کەسێ کە ناونیشانی هەڵبدا تا خاوەنەکەی پەیدا دەبێ.

---

[٤] راجع رقم واحد من تسلسل/ ١٨٥من هذا المجلد (مترجم).

## ١٤٠) کەسێ دەس درێژی لە دارو درەخت‌و نەچیری حەرەم بکا رووت دەکرێتەوەو جلەکانی لێ دەسێنرێ:

## من تعرض لشجر الحرم أو صيده تسلب ملابسه

١٧٣٥- رَكِبَ سَعْدِ بْنُ أَبِي وَقَاصٍ (رَضِي اللَّهُ عَنـهُ) إِلَى قَصْرِهِ بِالْعَقِيقِ فَوَجَدَ عَبْـدًا يَقْطَعُ شَجَرًا أَوْ يَخْبِطُهُ فَسَلَبَهُ فَلَمَّا رَجَعَ سَعْدٌ جَاءَهُ أَهْـلُ الْعَبْـدِ فَكَلَّمُـوهُ أَنْ يَـرُدَّ عَلَـى غُلاَمِهِمْ أَوْ عَلَيْهِمْ مَا أَخَذَ مِنْ غُلاَمِهِمْ فَقَالَ: مَعَاذَ اللَّهِ أَنْ أَرُدَّ شَيْئًا نَفَّلَنِيـهِ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبَى أَنْ يَرُدَّ عَلَيْهِمْ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود ولفظه: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَنْ يُقْطَعَ مِنْ شَجَرِ الْمَدِينَةِ شَيْئًا فَلِمَنْ أَخَذَهُ سَلَبُهُ[1].

سـەعدی کـوڕی ئـەبووە ققـاص (خـودای لێ رازی بـێ) سـوار بـوو، چـوو بـۆ کۆشـکەکەی لـە عـەقیق، تەماشـای کـرد کـەوا خولامـێ داردەبـڕێ، جـا سـەعد رووتـی دەکاتـەوە، لەپاشـا خـاوەنی خولامەکـە هاتـە لای سـەعدو داوای لێکـرد کە جلك‌و بەرگی خولامەکە بداتەوە پێی، ئەو جلك‌و بەرگەی کە بردبووی بـۆ خۆی، سەعدیش گـوتی: پەنا دەگرم بە خـودا لـەوە کە هەڵـەی وا بکـەم: ئەو تالانییەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رەوای دیـوە بـۆ مـن، مـن نەمـەوێ‌و بچم بیدەمەوە! وە هیچی پێ نەدانـەوە (م/د) گفتـەی ئـەبو داود)ئاوایـە: سـەعد گوتی: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): هەر کەسـێ شـتێ لە دارو درەختی مەدینە ببڕی کەسێ گرتی رووتی بکاتەوە بۆ خۆی!

١٧٣٧- وَعَنْهُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَرَّمَ هَذَا الْحَرَمَ وَقَالَ: مَنْ وَجَدَ أَحَدًا يَصِيدُ فِيهِ فَلْيَسْلُبْهُ ثِيَابَهُ. رَوَاهُ أبو داود والله أعلم[2].

دیسان سەعد (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئـەم حەرەمی مەدینەیەی قەدەغە کردووەو فەرموویـەتی: هـەر کەسـێ یـەکێکی دی راوی تیا دەکرد با رووتی بکاتەوەو جلەکانی بە تالانی ببا بۆ خۆی (د).

---

[1] مسلم. حج: ٣٣٠٧.

[2] سكت عنه الشارح.

## ١٤١) لە سایەی خودای گەورەوە مەدینە شارێکی پارێزراوەو پاسەوانو ئێشکچی بە دیارەوەیە: (المدينة محروسة بعناية الله تعالى)

١٧٣٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِينَةِ مَلاَئِكَةٌ، لاَ يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلاَ الدَّجَّالُ. وَفِي رِوَايَةٍ: لاَ يَدْخُلُ الْمَدِينَةَ رُعْبُ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، لَهَا يَوْمَئِذٍ سَبْعَةُ أَبْوَابٍ، عَلَى كُلِّ بَابٍ مَلَكَانِ[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەسەر هەموو کوچەو شەقامێکی مەدینە فریشتە راوەستاون ئێشکی دەگرن ئیتر نە تاعوونو نە جەجاڵ ناچنە ناوی لە گێڕانەوەیەکا: ئەو سامو ترسو تۆقینە کە جەجاڵی جادووگەر بەرپای دەکا نایەتە ناو مەدینەوە، لەو رۆژگارەدا مەدینە حەوت دەرگای هەیە، هەر دەرگایەکی دوو فریشتەی بە دیارەوەیە (ش — خودایان لێ رازی بێ).

١٧٣٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلاَّ سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ، إِلاَّ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ، لَيْسَ لَهُ مِنْ نِقَابِهَا نَقْبٌ إِلاَّ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ صَافِّينَ، يَحْرُسُونَهَا، ثُمَّ تَرْجُفُ الْمَدِينَةُ بِأَهْلِهَا ثَلاَثَ رَجَفَاتٍ، فَيُخْرِجُ اللّٰهُ كُلَّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ. رواهما الشيخان[2].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جەجاڵ دەچێتە ناو هەموو ولاتی، مەککەو مەدینەی لێ دەرچێ، هەموو رێو بانەکانی مەدینە فریشتە لەسەریان ریزبوون ئێشکیان دەگرن، لەپاشا شاری مەدینە سێ جار دەهەژێو دانیشتووەکانی رادەوەشێنێ و سێ لەرزە دەکا، جا لەسەری لەرزەی سێهەما ئیتر هەرچی کافرو مونافیقە لە مەدینە دەردەچنو دەچن بۆ لای جەجاڵ (ش).

---

[1] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٨٠، ٥٧٣١، ٧١٣٣ مسلم. حج: ٣٣٣٧.

[2] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٨١، ٧١٢٤، ١١٣٤، ٧٤٧٣. مسلم. فتن: ٧٣١٦.

١٧٤٠- ولمسلم: يَأْتِي الْمَسِيحُ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِق هِمَّتُهُ الْمَدِينَةُ حَتَّى يَنْزِلَ دُبُرَ أُحُدٍ ثُمَّ تَصْرِفُ الْمَلاَئِكَةُ وَجْهَهُ قِبَلَ الشَّامِ وَهُنَالِكَ يَهْلِكُ[٣].

ئیمامی موسلیم (خودای لێ ڕازی بێ) ڕیوایەت دەکا دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: جەجاڵە کوێرە مووشەی (سەگی پێ سووتاو[١]) لەلای خۆرهەڵاتەوە پەیدا دەبێ و دێ، نیازی مەدینەی دەبێ، دێ هەتا دەگاتە پشتی کێوی ئوحود، لەوێ دادەبەزێ، بەڵام فریشتەکان بەرەو وڵاتی شام پێچێ پێ دەکەنەوە، وە لەوێ لەسەر دەستی حەزرەتی عیسادا (دروودی خودای لەسەربێ) لەناو دەچێ (م — خودای لێ ڕازی بێ).

١٧٤١- عَنْ سَعْدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَكِيدُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَحَدٌ إِلاَّ انْمَاعَ كَمَا يَنْمَاعُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ. رَوَاهُ البخاري ومسلم. ولفظه: مَنْ أَرَادَ أَهْلَ الْمَدِينَةِ بِسُوءٍ أَذَابَهُ اللَّهُ كَمَا يَذُوبُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ. والله أعلم[٤].

سەعد (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ ئەوەی فروفێڵ لە خەڵکی مەدینە بکا وەك خوێی ناو ئاو دەتوێتەوە (ب/م) گفتەی (لفظ)ی (م): ئەوەی بیەوێ بۆ دانیشتووانی مەدینە خراپ بێ، خودا (وەك خوێی ناو ئاو) دەیتوێنێتەوە خودا بۆ خۆی باشی دەزانێ.

## ١٤٢) بەشی پێنجەم: دووعاو نزای پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر بۆ مەدینەو بۆ دانیشتوانی: (الفصل الخامس: في دعاء النبي ﷺ للمدينة وأهلها)

١٧٤٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، وَفِي مُدِّنَا، وَصَحِّحْهَا لَنَا

---

[٣] مسلم. حج: ٣٣٣٨.

[١] مەسیح کە بۆ جەجاڵ بەکار بهێنرێ یا بە مەعنا مەمسووحە واتە: چاوێکی کوێرەو سافو لووسە لەگەڵ ڕوومەتیا، واتە: کوێرەمووشە یا بەمەعنا گەڕۆك و شارانگەڕە وەك سەگی پێ سووتاو، کە بۆ ئەم مەعنای دووەمەیشی لەناو کەوانەکەدا ئیشارەمان کردووە. - وەرگێڕ -

[٤] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٧٧. مسلم. حج: ٣٣٤٥ — ٣٣٤٨.

وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ. قَالَتْ وَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، وَهِيَ أَوْبَأُ أَرْضِ اللَّهِ. قَالَتْ فَكَانَ بُطْحَانُ يَجْرِي نَجْلاً قَالَتْ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ وُعِكَ أَبُو بَكْرٍ وَبِلاَلٌ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ إِذَا أَخَذَتْهُ الْحُمَّى يَقُولُ:

كُلُّ امْرِئٍ مُصَبَّحٌ فِي أَهْلِهِ ... وَالْمَوْتُ أَدْنَى مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ

وَكَانَ بِلاَلٌ إِذَا أُقْلِعَ عَنْهُ ... الْحُمَّى يَرْفَعُ عَقِيرَتَهُ يَقُولُ:

أَلاَ لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ ... لَيْلَةً بِوَادٍ وَحَوْلِي إِذْخِرٌ وَجَلِيلُ

وَهَلْ أَرِدَنْ يَوْمًا مِيَاهَ مَجَنَّةٍ ... وَهَلْ يَبْدُوَنْ لِي شَامَةٌ وَطَفِيلُ

رَوَاهُ الشيخان ولفظ مسلم قَالَتْ: قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، وَهِيَ وَبِيئَةٌ فَاشْتَكَى أَبُو بَكْرٍ وَاشْتَكَى بِلاَلٌ فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَكْوَى أَصْحَابِهِ قَالَ: اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَمَا حَبَّبْتَ مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ وَصَحِّحْهَا وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِهَا وَمُدِّهَا وَحَوِّلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ. وَفِي رِوَايَةٍ: اللَّهُمَّ اجْعَلْ بِالْمَدِينَةِ ضِعْفَيْ مَا جَعَلْتَ بِمَكَّةَ مِنَ الْبَرَكَةِ[1].

**عائیشه** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی:**

**اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، وَفِي مُدِّنَا، وَصَحِّحْهَا لَنَا وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ:**

**ئەی خودایە! مەدینەیشمان لەلا خۆشەویست کە وەك مەککە، یاخود خۆشەویستتریش، ئەی خودایە! پیت و فەڕو بەرەکەت بڕێژە بەسەر مەن و مشت و مێوەو دانەوێڵەماندا، وە تەندروستی و لەشی ساغ بدە بە دانیشتوانی وبیکە بە شارێکی ساخلەم سازگر بۆمان، وە ناسازیی و ناساغییەکەشی بگوێزەرەوە بۆ جوحفە.**

**عائیشە دەڵێ: کە کۆچمان کرد بۆ مەدینە، ئەوساکە ناسازترین وڵاتی خودا ئەوێ بوو، شیوی بوطحان جمەی دەهات، لە سییاناو وچڵکاو!**

---

[1] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٨٩، ٣٩٢٦، ٥٦٥٤، ٥٦٧٧، ٦٣٧٢. مسلم. حج: ٣٣٢٩.

گوتیشی: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەبو بەکرو بیلال نەخۆش کەوتن و تووشی پەتا بوون و ئاوو هەوای ئەوێیان پێ نەکەوت جا ئەبو بەکر کە لەرزووتاکە دەیگرت دەیگوت:

كُـلُّ امْـرِئٍ مُـصَبَّحٌ فِـي أَهْلِـهِ وَالْمَـوْتُ أَدْنَـى مِـنْ شِـرَاكِ نَعْلِـهِ

گەر تۆ لەناو کەس و کاری گەر لەلادێ، گەر لەشاری

کە مردن هات نییەچاری سەرچاوانە دیاری باری!

گوتی: بیلالیش کە تاکە بەری دەدا دەستی دەکرد بە لۆرەلۆرو سۆز کردن و دەیگوت:

أَلاَ لَيْـتَ شِـعْرِي هَـلْ أَبِيـتَنَّ لَيْلَـةً بِـوَادٍ وَحَـوْلِي إِذْخِـرٌ وَجَلِيـلُ
وَهَـلْ أَرِدَنْ يَوْمًـا مِيَـاهَ مَجَنَّـةٍ وَهَـلْ يَبْـدُوَنْ لِـي شَـامَةٌ وَطَفِيـلُ

ئای نەمردایە شەوێ لە شەوان

شەوارەم دەگرت لە گردی سەیوان

مەست دەبووم لە بۆی گوڵی نەرخەوان

لەمن دەردەکەوت چیای بەرانان![1] (ش)

---

[1] هەر چەند نامەوێ پەراوێزەکان زۆربێ، بەڵام گەلێ جار چار نیە، شیعرەکەی ئیمامی ئەبو بەکر (خودای لێ رازی بێ) واتە: هەموو کەسێ کە لە ناوکەس و کاری خۆیا بێ سەر لەبەیانی بەیانی باش و رۆش باشی لێ دەکرێ، وەك ئاگای لە مردن نەبێ، بەڵام چونکە مەرگ کاتی بۆنیە، لەوانەیە مردن لەپەنا گوێی دابێ، شیعرەکانی ئیمامی بیلالیش (خودای لێ رازی بێ) واتای وایە:
خۆزگەم شەوێ لە شەوان لە یەکێ لە شیوەکانی دەورو بەری مەککەدا، وەك جاری جاران شەوم دەکردەوە، وە بۆن و بەرامەی گیای (اذخر) و (جەلیل)ی شێوەکانی مەککە دەهات بەسەرما، وە دەبێ جارێکی تر رێم بکەوێتەوە سەر سەرچاوەی مەجیننە، وە یا چاوم بکەوێتەوە بە شاخی شامەو بەچیای گوفەیل. جا هەرچەندە هۆنراوەکان بە مەعنا تەرجەمەکراون (نەوەك پیت بە

پیت) بەڵام ڕۆح و ئەصڵەکە لە یەکەوە گەڵێ نزیکن. منیش چاوم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)و یارانی (خودایان لێ ڕازی بێ) کردووە، وە لەهۆی خۆشەویستیی نیشتمان و بیرکردنی زێدەوە گوتوومەو هەمیشە دەڵێم:

ئای ئەمردمایە شەوێ لە شەوان
شەوارەم دەگرت لە گردی سەیوان
مەست دەبووم لەبۆی گوڵی ئەرخەوان
لەمن دەر دەکەوت چیای بەرانان!
تۆ دیدەی منی ئەی زێدی نازدار!
ئەگەر بەخۆم بێ ناتدەم بە هەزار
وڵاتی تری پڕ خێرو خۆشی
چونکە یەکەم پێک ئەشقی تۆم نۆشی
ئەی سلێمانی! ئەی قۆپی قەراخ!
پڕ لەداری چڕ، لە باخ و بوڵاخ!
کزەم لێ وەدی بۆ شنەی شەماڵ
بدا بە گوێما ئاوازەی شمشاڵ!
لە بناری گوێژە لە کلکەی سەیوان
نامێتەی بۆنی گوڵی ئەرخەوان
چریکەی مەلی مەستی سەرچڵان
یەکتر بانگ دەکەن بۆ کۆڕی خۆیان
دەڵێی دەروێشن یادی شێخ دەکەن
بە زمانی حاڵ سۆزی خۆ دەکەن
قیبلەم! لەپاش نوێژ دۆعات بۆ دەکەم
یادی مزگەوت و شوێنانت دەکەم
چاو لە بینایی چاوی خۆم دەکەم
حەزرەتی ئەحمەد بەسەر مەشق دەکەم
درووودو سەلام بۆ گیانی باڵای
ئەتۆش دەخەمە پەنای خاکو پای!

**گفتەی (م) ئاوایە: عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: کە کۆچمان کرد بۆ مەدینە شارێکی پەتاوی و ناساز بوو، لەبەر ئەوە ئەبو بەکرو بیلال نەخۆش کەوتن، پێغەمبەریش** (درودی خودای لەسەربێ) **کە چاوی کەوت بە حاڵ و سکاڵای هاوڕێیانی فەرمووی:**

---

ئەی خۆشەویستمان ئەحمەدی کاکی!
تۆ بۆ شارەکەم بەستێکی چاکی
سڵاو لە خوێت و دڵسۆزانی لات
بێمە نۆشتان بێ دیداری وڵات
کاکا! هێمەتێ. کاتی هیمەتە
کاتی تەنگانەو رۆژی سەخڵەتە
بۆ ئەمڕۆ ئەبێ هیممەت بۆ کەیە
هەموو بەتەماس هیممەتی تەیە
دەستی تەضەروع بەرزکە بۆ ئاسمان
دەستی شەفاعەت بەرزکە بۆ ئاسمان
میهری دەنوێنێ خودای میهرەبان
رەحمەت دەنوێنێ خودای میهرەبان
تا وڵات پڕ بێ لە خۆشی و لە خێر
دەستی ماندوو بێ لەسەر سکی تێر!
مزگەوتەکانمان وەک جاران
پڕ لە نوێژ کەری کوردی موسوڵمان
مەلا بە کوردی حەدیس بخوێنی
حەدیس وەک گەوهەر ورشە بنوێنێ
هەم خودا رازی هەم بەندە رازی
چەقڵ بە چاوی قازی بەرازی
مەڵێن: مەکوردێن. بێ کەس و نازین
کەسمان خودایە مەبەو دەنازین

وەرگێڕ- نوری فارس -

اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَمَا حَبَّبْتَ مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ وَصَحِّحْهَا وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِهَا وَمُدِّهَا وَحَوِّلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ:

له گێڕانەوەیەكی تری موسلیمدا:

اللَّهُمَّ اجْعَلْ بِالْمَدِينَةِ ضِعْفَيْ مَا جَعَلْتَ بِمَكَّةَ مِنَ الْبَرَكَةِ:

خودایە! دوو قاتی مەككە پیت و فەڕو بەرەكەت بڕێژە بەسەر مەدینەدا.

١٧٤٣- ولمسلم: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مُدِّنَا، اللَّهُمَّ اجْعَلْ مَعَ الْبَرَكَةِ بَرَكَتَيْنِ[٢]:

ئیمامی موسلیم (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ:

اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مُدِّنَا، اللَّهُمَّ اجْعَلْ مَعَ الْبَرَكَةِ بَرَكَتَيْنِ:

خوایە! پیت و فەڕو خێرو خۆشیمان بۆ بخەرە شارەكەمانەوەو بیكە بە شارێكی موبارەك و پیرۆز! خودایە! پیت و بەرەكەت بخەرە مەن و مستمانەوەو رزق و رۆژیمان پیرۆزو بەرەكەتدار كە، وە جار لەگەڵ جارا زیاتر بەرەكەتی تێخە.

١٧٤٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ، فَنَظَرَ إِلَى جُدُرَاتِ الْمَدِينَةِ أَوْضَعَ رَاحِلَتَهُ، وَإِنْ كَانَ عَلَى دَابَّةٍ، حَرَّكَهَا مِنْ حُبِّهَا. رَوَاهُ البخارى[٣].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كە لەسەرفەر دەهاتەوە كە چاوی دەكەوت بە مەدینە لە خۆشەویستی مەدینە وشترەكەی خێرا لێ دەخوڕی، ئەگەر بە سواریی ولاخی تریش بوایە

---

[٢] مسلم: حج: ٣٣٢٤.

[٣] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٨٦.

ولاخەکـەی تیـژ لێ دەخـوڕی، ئەوەنـدەی مەدینـە خـۆش دەویـست (ب = بوخاری. خودای لێ رازی بێ).

١٧٤٥- وَعَنْهُ قَالَ: نَظَرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى أُحُدٍ فَقَالَ: إِنَّ أُحُدًا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ. رَوَاهُ الشيخان والله أعلم[٤].

دیسان گوتی: (خودای لێ رازی بێ): پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سەرنجی کێوی ئوحودی دا کە شاخێکە لە سەرووی شاری مەدینەوە، (صەلاتو سەلامو درودی خودای گەورە لەسەر ئەو پێغەمبەرە نازدارە بێ). کە ئارامگای پیرۆزی لەوێیە جا فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ئەم کێوی ئوحودە ئێمەی خۆش دەوێو ئێمەیش ئەومان خۆش دەوێ (ش = شەیخان کە مەبست بوخاریو موسلیمە. خودایان لێ رازی بێ) وە خودا بۆ خۆی باشی دەزانێ.

## ١٤٣) پاشەکی: واتە: پایانێ، باسی هاندانو شێتگیرکردنی موسوڵمانان لەسەر دانیشتنو نیشتەجێ بوون لە شاری مەدینەدا (درودی خودا لەسەر ئەو پێغەمبەرە نازدارە بێ، کە نیشتەجێی ئەوێیە):

## خاتمة: في الترغيب في سكنى المدينة على صاحبها أفضل (الصلاة والسلام)

١٧٤٦- عَنْ سُفْيَانَ بْنِ أَبِي زُهَيْرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تُفْتَحُ الْيَمَنُ فَيَأْتِي قَوْمٌ يُبِسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، وَتُفْتَحُ الشَّأْمُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يُبِسُّونَ فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، وَتُفْتَحُ الْعِرَاقُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يُبِسُّونَ فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ. وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[١].

سوفیانی کوڕی ئەبو زوهەیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: یەمەن فەتح دەکرێو دەبێ بە وڵاتی ئیسلام جا گەلێ کەس بە

---

[٤] بخاري. مغازي: ٤٠٨٣. مسلم. حج: ٣٣٥٩.

[١] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٧٥. مسلم. حج: ٣٣٥٢، ٣٣٥١.

کورجی دینەوە بۆ مەدینەو کەس و کاری خۆیان و ئەوانەی کە بەگوێیان بکەن هەڵیان دەگرن دەیانبەن بۆ یەمەن لەبەر زۆری رزق و رۆژی و ژیواری خۆشی ئەوێ، بەڵام ئەگەر بزانن مەدینەیان گەلێ باشترە، وەشامیش فەتح دەکرێ و ئەویش هەروەها، وە عێراقیش فەتح دەکرێ و ئەویش هەروەها (ش/ن).

١٧٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَتْرُكُونَ الْمَدِينَةَ عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ، لاَ يَغْشَاهَا إِلاَّ الْعَوَافِ (يُرِيدُ عَوَافِيَ السِّبَاعِ وَالطَّيْرِ) وَآخِرُ مَنْ يُحْشَرُ رَاعِيَانِ مِنْ مُزَيْنَةَ، يُرِيدَانِ الْمَدِينَةَ يَنْعِقَانِ بِغَنَمِهِمَا، فَيَجِدَانِهَا وَحْشًا، حَتَّى إِذَا بَلَغَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ خَرَّا عَلَى وُجُوهِهِمَا. رَوَاهُ الشيخان[٢].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: مەدینە لەوپەڕی خۆشی و باشیدا دەبێ، کە دانیشتوەکانی بە جێی دەهێڵن، واچۆڵ دەبێ کەس سەری پیاناکا، مەگەر مەل و مۆرو جانەوەری مووشەکەر کە بۆ مڵومووش و مووشەکردن دەچن بۆ هەوارەکۆن و شوێنی چۆڵ بوو! وە دواترین کەسیش کە لە وڵات دەردەکرێن و دەبرێن دوو شوانی موزەینەیی دەبن، دەیانەوێ کە بچن بۆ مەدینە، دەنگ لە رانەکەیان دەکەن و پیرکە دەکەن بە ناویا جا کە دەچن تەماشا دەکەن مەدینە چۆڵ و هۆڵ و سامناک و چۆلەکە بکوژی تیانییە جا لە مەدینە دەر دەچن و دەڕۆن دەگەنە ثەنییەتولویداع لەوێ بەسەر دەما دەکەون و خڕپ دەمرن! (ش).

١٧٥٠- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَدْعُو الرَّجُلُ ابْنَ عَمِّهِ وَقَرِيبَهُ هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يَخْرُجُ مِنْهُمْ أَحَدٌ رَغْبَةً عَنْهَا إِلاَّ أَخْلَفَ اللَّهُ فِيهَا خَيْرًا مِنْهُ أَلاَ إِنَّ الْمَدِينَةَ كَالْكِيرِ تُخْرِجُ الْخَبِيثَ. لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَنْفِيَ الْمَدِينَةُ شِرَارَهَا كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ. رَوَاهُ مسلم[٣].

---

[٢] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٧٤. مسلم. حج: ٣٣٥٤.

[٣] مسلم. حج: ٣٣٣٩.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەردوم دەکەونە چەرخێکەوە، پیاو دەبێ کە ئامۆزاو خزمی خۆی گاز دەکاو پێی دەڵێ: وەرە بابڕۆین بۆ فیسارە ولآت لەوێ هەرزانییە! بەڵام ئەگەر بزانن مەدینە لە هەموو شوێنێکی تر باشترە بۆیان چونکە حەرەمی حەزرەتەو جێگەی خورۆشانی رەحمەتی خودایە، کەسێ هۆشی تەواو بێ چۆن هاوسایی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەگۆڕێتەوە بە پڕوپیتی دنیا؟ بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، ئەوەی ئارەزووی لە دانیشتنی مەدینە نەمێنێ و لەبەر ئەوە لێی دەرچێ و بڕوا بۆ شوێنێکی تر، خودای گەورە بەیەکێکی وا کەلەو گەلێ باشتر بێ شوێنەکەی لە مەدینەدا پڕ دەکاتەوە!

بزانن! مەدینە وەك کوورە وایە، ئەوەی پاك و ساخ نەبێ لەگەڵ دەر ناچێ و توورِ دەدرێ!

قیامەتیش هەڵناسێ هەتا مەدینە بەدکاروپیاو خراپەکانی ناوی دەرنەپەڕێنێ و رەهەنەیان نەکا، وەك چۆن مووشەدەمە چڵك و ژەنگی ئاسن لادەبات (م- خودای لێ رازی بێ).

١٧٥١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ مَوْلاَةً لَهُ أَتَتْهُ فَقَالَتِ: اشْتَدَّ عَلَيَّ الزَّمَانُ وَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَخْرُجَ إِلَى الْعِرَاقِ. قَالَ: فَهَلاَّ إِلَى الشَّأْمِ أَرْضِ الْمَنْشَرِ اصْبِرِى لَكَاعِ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَنْ صَبَرَ عَلَى شِدَّتِهَا وَلأْوَائِهَا كُنْتُ لَهُ شَهِيدًا أَوْ شَفِيعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ الترمذي ومسلم. وَفِي رِوَايَةٍ: لاَ يَصْبِرُ عَلَى لأْوَاءِ الْمَدِينَةِ وَشِدَّتِهَا أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي إِلاَّ كُنْتُ لَهُ شَهِيدًا أَوْ شَفِيعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ[٤].

کارەکەرێکی ئازادکراوی ئیبنو عومەر (خودای لێ رازی بێ) هات بۆلای و پێی گوت: رۆژگاری ناهەموار تەنگی پێ هەڵچنیوم و زۆری بۆ هێناوم و دەستم

---

[٤] مسلم. حج: ٣٣٣٢.

کورتە، دەمەوێ بڕۆم بۆ عێراق. ئەویش گوتی: ئەی بۆچی ناچی بۆ شام کە خاکی مەحشەرەو دەشتی کۆ بوونەوەیە. ئەی گێلە! ئارام بگرەو مەدینە بەجێ مەهێڵە چونکە من لە پێغەمبەرم (دروودی خودای لەسەربێ) بیستووە دەیفەرموو: هەر کەسێ خۆی رابگرێ، لەبەر زەبرو زەحمەتی مەدینەدا، لە رۆژی قیامەتدا خۆم دەبم بە شایەت بۆی یا فەرمووی: دەبم بە تکاکار بۆی (ت/م) لە گێڕانەوەیەکا: هەر کەسێ (لە ئۆمەتم) خۆی رابگرێ لەبەر زەبرو سەختی مەدینەدا، لە رۆژی قیامەتا خۆم دەبم بە تکاکاری.

١٧٤٩- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنِ اسْتَطَاعَ أَنْ يَمُوتَ بِالْمَدِينَةِ فَلْيَمُتْ بِهَا فَإِنِّي أَشْفَعُ لِمَنْ يَمُوتُ بِهَا[٥].

دیسان لە ئیبنو عومەرەوە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ بۆی دەلوێ لە مەدینە بمرێ، با لەوێ بمرێ، چونکە ئەوەی لەوێ بمرێ من تکای بۆ دەکەم (ش- س/ح).

١٧٥٠- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ هَؤُلَاءِ الثَّلَاثَةِ نَزَلْتَ فَهِيَ دَارُ هِجْرَتِكَ الْمَدِينَةَ أَوِ الْبَحْرَيْنِ أَوْ قِنَّسْرِينَ. روهما الترمذي[٦].

جەریری کوڕی عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا سرووشی بۆ ناردووم کە لەهەر کامێ لەم سێ شوێنە، دادەنیشێت، ئەوە خانەی کۆچتەو هەواری نوێی ئیسلامەو دەبێ بە یەکەم پایەتەختی دەوڵەتی ئیسلام: واتە: لە مەدینەو بەحرین و قیننەسرین! (ت- سند غریب).

١٧٥١- وَقَالَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) اللَّهُمَّ ارْزُقْنِي شَهَادَةً فِي سَبِيلِكَ، وَاجْعَلْ مَوْتِي فِي بَلَدِ رَسُولِكَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ البخاری والله أعلم[٧].

---

[٥] رَوَاهُ الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٦] رَوَاهُ الترمذي بسند غريب (شرحه).

عومەریش (خودای لێ رازی بێ) دەیگوت: ئەی خودایە! شەهیدبوونێ کە لە پێناوی تۆدا بێ بیکە بەبەش‌و بارەم، وە لە شارەکەی پێغەمبەرکەشتا مردنم بکە بە نەصیب! (ب).

## ١٤٤) سەردان لە گۆڕی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر : (زيارة قبر النبي ﷺ)

١٧٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلاَّ رَدَّ اللّٰهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ. رَوَاهُ أبو داود والبيهقي[١].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ سەلامم لێبکا خودا گیانم دەکاتەوە بەبەردا، تا سەلامەکەی دەسەندمەوە (د- سند صالح - بەیهەقی).

١٧٥٦- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُورًا وَلاَ تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيدًا وَصَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُ كُنْتُمْ. ر أبو داود والضياء[٢].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان‌و ئەندازەیێ لە عیبادەت‌و پەرستشتان دانێن بۆ ماڵەوە وە گۆڕی منیش مەکەن بە دیوەخانی رۆژی جەژن، وە لەهەر کوێ بوون صەلاواتم لەسەر بدەن، چونکە صەلاواتەکەتان پێم دەگاتەوە (د-سند حسن - الضیاء).

١٧٥٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ زَارَ قَبْرِي وَجَبَتْ لَهُ شَفَاعَتِي[٣].

---

[٧] بخاری. فضائل المدینة: ١٨٩٠.

[١] رَوَاهُ أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٢] رَوَاهُ أبو داود حسن (شرحه).

[٣] سکت عنه الشارح.

**ئیبنــو عومــەر** (خــودای لێ رازی بــێ) **گــوتی: پێغەمبــەر** (دروودی خــودای لەســەربێ) **دەفــەرموێ: کەســێ دێنیــی گۆڕەکــەم بکــا، دەبــێ منــیش لــە رۆژی قیامــەتا شەفاعەتی بۆ بکەم! (قاضی عەیاض – لە شیفادا – ریوایەتی کردووە).**

**١٧٥٥– عَنْ أَنَسٍ** (رَضِي اللهُ عَنهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) **مِنْ زَارَنِي فِي الْمَدِينَةِ مُحْتَسِباً كَانَ فِي جِوَارِي وَكُنْتُ لَهُ شَفِيعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ. وَفِي رِوَايَةٍ: مَنْ زَارَنِي بَعْدَ مَوْتِي فَكَأَنَّمَا زَارَنِي فِي حَيَاتِي. روى هذه الثلاثة القاضي عياض في الشفاء** (رَضِي اللهُ عَنهُ)[٤].

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گـوتی: حـەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفـەرموێ: هەر کەسێ (لەبەر رەزای خودا) بێ بۆ دێنیی من لە مەدینە ئەوە لـە بەهەشتا لـە پـەنای منـدا دەبـێ، وە لـە رۆژی قیامەتیـشدا دەبم بـە تکاکار بۆی! یـاخوا! نۆشی گیانی بێ هاوسایەتیی پێغەمبەرو تکـای پێغەمبـەر، خـودا بـە فـەضلی خۆی هەم دێنیی گۆڕی حەزرەت و هەم پەناو تکای ئەومان بە نەصیب بکا، لە گێڕانەوەیەکدا: هـەر کەسـێ (لـە پـاش مـردنم) بـێ بـۆ دێنـیم وەکـوو لـە حـاڵی ژیانمـا هاتبـێ بـۆ سـەردانم وەهایـە! (قـازی عـەیاز** (خودای لێ رازی بێ) **لـە کتێبـی شیفادا ریوایەتی کردووە).**

**قال المؤلف** (رَضِي اللهُ عَنهُ) **أسال الله ان يشفي صدورنا وقلوبنا بالايمان والعلم، وأن يملآهما باليقين والحلم آمين، آمين، آمين، والحمد لله رب العالمين اتممت بتوفيق الله قسم العبادات في ٢٩ شهر ذي الحجة سنة ١٣٤٣ هجري.**

**عدد الأحاديث من أول الكتاب الى هنا ١٧٣٥ خمسة وثلاثون وسبعمائه والف. انتهى قسم العبادات ويليه قسم المعاملات. واوله كتاب البيوع والزروع ان شاء الله:**

**مامۆسـتای بـەڕێزو مـەزن دانـەری ئـەم نامـە پیرۆزەیـە لێرەدا دەفـەرموێ** (خودای لێ رازی بێ):–

---

[٤] سكت عنه الشارح.

لە خودای گەورە داوا دەکەم کە سینەمان سافکاودڵمان بە نووری عیلم‌و ئیمان ڕۆشن بکاتەوە، وە دڵ‌و دەروونمان پڕ کا لە باوەڕی ساخ‌و لە حەوسەڵەو هێمنی. ئامین خودایە.. وە هەمیشەو هەمووکاتێ سوپاسی جوان‌و ستایشی ڕاست‌و دروست هەر بۆ خودایە کە خوداو پەروەردگاری هەر دوو جیهانە.

لە سایەی خوداوە بەشی عیباداتم تەواو کرد لە ٢٩ی مانگی قوربانی ساڵی ١٣٤٣ی کۆچیدا.

وە ژمارەی فەرموودەکان لە سەرەتای کتێبەکەوە هەتا ئێرە (١٧٣٥) هەزارو حەوت سەدو سیی‌و پێنج فەرموودەن.

تا ئێرە بەشی عیبادات تەواو، لە لێرە بەدواوە بەشی سەوداو مامەڵەو موعامەلات دەست پێ دەکا، سەرەتاکەی بە نامەی کڕین‌و فرۆشتن‌و کشتوکاڵ دەست پێ دەکا، خودا حەزکا.

# نامەی کڕین‌و فرۆشتن‌و کشتوکاڵ‌و وەقف

**ئەم نامەیە دوازدە باس‌و پاشەکییەکە (کۆتایی: پاشکۆ)**

## کتاب البیع والزروع والوقف

### ١٤٥) باسی یەکەم: باسی گەڕان بە دوای کاسپی حەڵاڵدا

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا}.

خـودای گـەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا دەفـەرموێ: واتـە: خـودا کـڕین‌و فرۆشتنی ڕەوادیوە، بەڵام مامەڵەی سوودی ڕەوا نەدیوە.

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ}.

خـودای گـەورە دەفـەرموێ: جـا کاتـێ نوێـژی هـەینی تـەواو بـوو، ئـیتر بڵاوەی لێ بکەن بە زەویداو ڕوو بکەنە کاسبی‌و داوای ڕۆژی لە کەرەمی خودا بکەن‌و ناوی خودا ببەن‌و یادی خودا بەزۆری بکەن، بە هیوای ئەوە کە لە هەردوو جیهاندا ڕزگارو سەرفرازبن.

١٧٥٦- عَنْ النُّعْمَانُ بْنَ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ كَالرَّاعِي حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ. أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى أَلاَ وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَحَارِمُهُ أَلاَ وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلُحَتْ صَلُحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ رَوَاهُ الخمسة[1].

نوعمـانی کـوڕی بەشـیر (خودای لێ ڕازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: شـتی حـەڵاڵ دیـارو ئاشـکرایە، هـەروەها شـتی حـەرامیش

[1] بخاری. إیمان: ٥٢، ٢٠٥١. مسلم. مساقاة: ٤٠٧٠. أبو داود. بیوع: ٣٣٢٩، ٣٣٣٠. ترمذی. بیوع: ١٢٠٥. نسائی. بیوع: ٤٤٦٥، ٥٧٢٦ (ریاض/٢/ز:٦٨ ژ: ٥٨٨/١).

دیارو ئاشکرایە، بەڵام لەم بەینەدا هەندێ شت هەن دوو بەینین‌و لەهەر دوو لا دەچن، لەبەر ئەوە گەلێ کەس حوکمەکەیان نازانن، بەڵام زانایانی ئایین لەپاش پەیجۆری‌و لێ کۆڵینەوە یەکی باش حوکمەکەیان دەدۆزنەوەو بڕیار دەدەن کە حەڵاڵن یا حەرامن، جا ئەوەی کە خۆی بپارێزێ لە شتی شوبهەدارو گومان لێکراو، ئەوە ئایین‌و ناموسی خۆی لەنەنگ‌و لکە دەپارێزێ.

بەڵام ئەوەی کە توخنی شتی شوبهەدارو گومان لێکراو دەکەوێ (خوا ناخوا) تووشی دەبێ بە تووشی شتی حەرامیشەوە، وەك چۆن شوان ئەگەر ران لە دەورو بەری پاکژو پاوەند بلەوەڕێنێ بەرە بەرە رانەکە لە پاوەندەکەیش دەلەوەڕێ.

باش ئاگاداربن! کە هەموو پادشایێ بەست‌و پاوەندێکی تایبەتی خۆی هەیە، بزانن کە بەست‌و پاوەندی خودایش ئەو شتانەیە کە حەرامی کردوون!

باش ئاگاداربن! کە گوڵمەیەك گۆشت هەیە لەناو جەستەدا ئەگەر ئەو گوڵمە گۆشتە سازو باش بوو ئەوا جەستەیش هەموو سازو باش دەبێ، بەڵام ئەگەر ئەو گوڵمەیە خراپ بوو ئەوا جەستەیش هەموو خراپ دەبێ، بزانن کە ئەو گوڵمەیە برێتییە لە دڵ، دڵی پاك‌و لەشی چاك، دڵی پیس‌و لەشی ناپاك (ش/د/ت/ن = بوخاری، موسلیم، ئەبو داوو، تیرمیذی، نەسائی – رەزای خودایان لێبێ).

١٧٦٠– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لاَ يُبَالِي الْمَرْءُ بِمَا أَخَذَ الْمَالَ، أَمِنْ حَلاَلٍ أَمْ مِنْ حَرَامٍ. رَوَاهُ البخاری والنسائی[٢].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: مەردوم دەکەونە چەرخێکەوە پیاو دەربەستی ئەوە نایەت کە ئەو ماڵەی پەیدای دەکا حەڵاڵە یا حەرامە (ب/ن).

---

[٢] بخاري. بيوع: ٢٠٥٩، ٢٠٨٣.

١٧٦١- (ب-٢/ز - ٢٠ / ف - ٣)[٣].

١٧٦٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ مَا بَعَثَ اللَّهُ نَبِيًّا إِلاَّ رَعَى الْغَنَمَ. فَقَالَ: أَصْحَابُهُ: وَأَنْتَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ كُنْتُ أَرْعَاهَا عَلَى قَرَارِيطَ لأَهْلِ مَكَّةَ[٤].

**دیسان لەوەوە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا هەر پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردبێ شوانی ڕانی کردووە. یارانیشی عەرزیان کرد: تۆیش؟؟ فەرمووی: بەڵێ منیش شوانیم کردووە: منیش بە چەند قڕانێ گەلەم دەلەوەڕان بۆ خەڵکی مەککە! (ب).**

١٧٦٠- عَنِ الْمِقْدَامِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ دَاوُدَ (عَلَيْهِ السَّلاَمُ) كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ. وَفِي رِوَايَةٍ: كَانَ لا يَأْكُلُ إِلاَّ مَنْ عَمَلِ يَدِهِ[٥].

**میقدام (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هیچ نانێ وەك ئەوە باش نیە کە مرۆڤ لەبەری ڕەنجەشانی خۆی بخوات، داوود کە پێغەمبەری خودابوو، (دروودی خودای لەسەربێ) هەر لە بەری ڕەنجەشانی خۆیی دەخوارد لە گێڕانەوەیەکا: هەر لە دەستکەوتی ڕەنجی شانی خۆی دەخوارد (ب).**

١٧٦١- لَمَّا اسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَقَدْ عَلِمَ قَوْمِي أَنَّ حِرْفَتِي لَمْ تَكُنْ تَعْجِزُ عَنْ مَئُونَةِ أَهْلِي، وَشُغِلْتُ بِأَمْرِ الْمُسْلِمِينَ، فَسَيَأْكُلُ آلُ أَبِي بَكْرٍ مِنْ هَذَا الْمَالِ أَحْتَرِفُ لِلْمُسْلِمِينَ فِيهِ. روى البخاری هذه الثلاثة[٦].

---

[٣] سبق فی تسلسل/ ٢٠ من هذا المجلد رقم/ ٣ منه.

[٤] بخاري. إجارة: ٢٢٦٢ (رياض/ ٢ز:٥٩ ذ: ٥٤٣/٥).

[٥] بخاري. بيوع: ٢٠٧٢، ٢٠٧٣.

[٦] بخاري. بيوع: ٢٠٧٠ (رياض/ز٥٩ ژ: ٥٤٣/٥).

کاتێ کە ئەبو بەکر کرا بە جێنشین، گوتی: خزمان خۆتان باش دەزانن کە پێشەکەی خۆم ناتەواویی نەبوو بۆ بژێویی و بە خێوکردنی کەس و کارم، بەڵام ئێستا کە لەبەر جێبەجێکردنی کاروباری موسوڵمانان دەستم ناپەرژێ کە وەك جاران کاسپی بکەم ئەوا ناچارم کە دەبێ کەسوزکارەکەم لە ماڵی خەزێنەی موسوڵمانان بخۆن و دەشێ مەسرەف و خەرجی خۆم و خێزانم لەسەر (بەیتولمال): گەنجینەی موسوڵمانان بێ وە لە هەمان کاتدا من ئەم ماڵە بە پێی توانا بەرهەم دەهێنم بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان (ب).

١٧٦٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَلَدُ الرَّجُلِ مِنْ كَسْبِهِ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِهِ فَكُلُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ إِذَا احْتَجْتُمْ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٧].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: منداڵی پیاو بەشێکە لە کاسپی ئەو، لە کاسپییە پاکەکەیشی، جا کەوابوو لەکاتی پێویستدا لە ماڵیان بخۆن (د/ت/ن- س/ح).

١٧٦٣- وَجَاءَ رَجُلٌ يَأْتِي النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ لِي مَالاً وَوَلَدًا وَإِنَّ وَالِدِي يَجْتَاحُ مَالِي. فَقَالَ: أَنْتَ وَمَالُكَ لِوَالِدِكَ. رَوَاهُ أبو داود وابن ماجه[٨].

پیاوێ هاتە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من بەشی خۆم ماڵ و منداڵم هەیە، وە باوکیشم پێویستی بە ماڵەکەم دەبێ، فەرمووی: خۆشت و ماڵەکەشت ماڵی باوکتن! (د-س/ح- ئیبنو ماجە).

١٧٦٧- عَنْ صَخْرٍ الْغَامِدِيِّ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللّٰهُمَّ بَارِكْ لأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا. قَالَ: وَكَانَ إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً أَوْ جَيْشًا بَعَثَهُمْ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ.

---

[٧] بسند حسن (شرحه).

[٨] رَوَاهُ أبو داود بسند حسن (شرحه).

وَكَانَ صَخْرٌ رَجُلاً تَاجِرًا وَكَانَ إِذَا بْعَثُ تِجَارَةَ بَعَثَ أَوَّلِ النَّهَارِ فَأَثْرَى وَكَثُرَ مَالُهُ. رَوَاهُ ترمذي وحسنه والله أعلم[٩].

**صەخری غامیدی** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: ئەی خودایە! کارو فرمانی سەر لەبەیانیانی ئۆمەتم پیرۆزو فەڕدارکە! گوتی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **دەستووری وابوو کە دەستەیێ، یا لەشکرێکی دەنارد بەلایەکا، سەر لەبەیانی ەیناردن.**

**صەخر خۆشی پیاوێکی بازرگان بوو، ئەویش دەستووری وابوو کە ماڵی بازرگانیی دەنارد بۆ شوێنێ، سەرلەبەیانی دەینارد، ئیتر زۆر دەوڵەمەند بوو بوو، وە سامانێکی زۆری ڕژابوو بەسەردا (ت–ح = تیرمیذی بە سەندێکی جوان گێڕاویەتەوە).**

## ١٤٦) دەستکەوتی کەڵەشاخگر هەرچەند حەڵاڵە بەڵام ناپەسەندو مەکروهە:

## كسب الحجام مكروه

١٧٦٥– عَنِ مُحَيِّصَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي إِجَارَةِ الْحَجَّامِ فَنَهَاهُ عَنْهَا فَلَمْ يَزَلْ يَسْأَلُهُ وَيَسْتَأْذِنُهُ حَتَّى أَمَرَهُ أَنِ اعْلِفْهُ نَاضِحَكَ وَرَقِيقَكَ. رَوَاهُ أبو داود والترمذى وصححه[١].

**موحەیصە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: بۆ خواردنی کرێی کەڵەشاخ گرتن لە حەزرەتم پرسی** (درودی خودای لەسەربێ) **ڕێگەی نەدام، بەڵام هەروازم لێ نەهێناو هەر لێم دەپرسی، تا فەرمووی: بیدە بە ئالیك‌و بیدە بە وڵاخەکەت، یاخود دەرخواردی خوڵام‌و بەندەکانتی بدەو خۆت لێی مەخۆ (د/ت:ص).**

١٧٦٦– وَقَالَ أَنَسٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) حَجَمَ أَبُو طَيْبَةَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَمَرَ لَهُ بِصَاعٍ مِنْ تَمْرٍ، وَأَمَرَ أَهْلَهُ أَنْ يُخَفِّفُوا مِنْ خَرَاجِهِ. رَوَاهُ الأربعة[٢].

---

[٩] حسن عند الترمذى.

[١] صحيح عند الترمذى .

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: ئەبو طەیبە کەڵەشاخی گرت لە حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **جا حەزرەت لەباتی ئەوە مەنێ خورمای پێ دا، وە فەرمانیشی کرد بە ئاغاکانی کە لەسەرانەکەی کەم بکەنەوە (ش/د/ت).**

١٧٧٠- وَقَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) احْتَجَمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَعْطَى الَّذِي حَجَمَهُ، وَلَوْ كَانَ حَرَامًا لَمْ يُعْطِهِ. رَوَاهُ الثلاثة[٣].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **کەڵەشاخی لە خۆی گرت، وە بەخششی دا بەو پیاوە کە کەڵەشاخەکەی لێ گرت، دیارە ئەگەر مزی کەڵەشاخگر حەرام بوایە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **نەیدەدایێ (ش/د = شەیخان و ئەبو داوود. خودایان لێ رازی بێ).**

## ١٤٧) باسی دووەم: باسی سەر راستی و مامەڵە خۆشی

## الباب الثاني: في الصدق والسماحة

١٧٧١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَجُلاً ذَكَرَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي الْبُيُوعِ، فَقَالَ: إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ لاَ خِلاَبَةَ. رَوَاهُ الثلاثة والنسائى. وزاد مسلم: فَكَانَ إِذَا بَايَعَ يَقُولُ: لاَ خِيَابَةَ[١].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پیاوێ عەرزی پێغەمبەری کرد، کە لە سەوداو مامەڵەدا دەخەڵەتێ. فەرمووی** (درودی خودای لەسەربێ)**: کە سەودای شتێ دەکەی بڵێ: بەبێ فرو فێڵ و قۆڵ برین. (ش/د — خودایان لێ رازی بێ) موسلیم** (خودای لێ رازی بێ) **ئەمەیشی لێ پتر کردووە: جا کابراکە کەشتێکی سەودا دەکرد**

---

[٢] بخاري. بيوع: ٢١٠٢، ٢٢١٠، ٢٢٧٧، ٢٢٨٠، ٢٢٨١، ٥٦٩١. مسلم. مساقاة: ٤٠١٤. ترمذي. بيوع: ١٢٧٨.

[٣] بخاري. بيوع: ٢١٠٣، مسلم. مساقاة: ٤٠١٧.

[١] بخاري. بيوع: ٢١١٧، ٢٤٠٧، ٢٤١٤، ٦٩٦٤. مسلم. بيوع: ٣٨٣٨. ترمذي. بيوع: ١٢٤٦. أبو داود. بيوع: ٣٤٥٩. نسائي. بيوع: ٤٤٦٩ (رياض/ ٤ ز: ٢٧٦ ز: ٤/ ١٥٨٢).

دەیگوت: بەبێ فڕو فێڵ و قۆڵ بڕین! چونکە پس بوو، زمانی دەگرت لە قسەکردنا، پیتێکی دەکرد بە پیتێکی تر.

١٧٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْحَلِفُ مُنَفِّقَةٌ لِلسِّلْعَةِ مُمْحِقَةٌ لِلْبَرَكَةِ. رَوَاهُ الثلاثة[٢].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: سوێندی درۆ برەو بە فرۆشتنی کاڵا دەدا، بەڵام پیت و بەرەکەتی دەبا (ش/د - خودایان لێ رازی بێ).

١٧٧٣- ولمسلم: إِيَّاكُمْ وَكَثْرَةَ الْحَلِفِ فِي الْبَيْعِ فَإِنَّهُ يُنَفِّقُ ثُمَّ يَمْحَقُ[٣].

موسلیم (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە سەوداو مامەڵەدا دووربن لە سوێندخواردنی زۆر، چونکە لە پێشا برەو بە کاڵا دەدا، بەڵام لە پاشدا پیت و بەرەکەتی دەبا.

١٧٧٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً أَقَامَ سِلْعَةً، وَهُوَ فِي السُّوقِ، فَحَلَفَ بِاللَّهِ لَقَدْ أَعْطَى بِهَا مَا لَمْ يُعْطَ، لِيُوقِعَ فِيهَا رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَنَزَلَتْ (إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً) الآية. رَوَاهُ البخاري[٤].

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ، لە بازاڕ، کاڵایەکی دانابوو، سوێندی دەخواردو دەیگوت: بە خودا خۆم زیاترم پێ داوە لەم نرخەی کە تۆ دەمدەیتێ، هەتا بیکا بە کوڵکی پیاوێکی موسوڵمانەوە. جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

---

[٢] بخاري. بیوع: ٢٠٨٧. مسلم. مساقاة: ٤١٠١. أبو داود بیوع: ٣٣٣٥. نسائی. بیوع: ٤٤٧٣.

[٣] مسلم. مساقاة: ٤١٠٢.

[٤] بخاري. بیوع: ٢٠٨٨، ٢٦٧٥، ٤٥٥١.

{إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُوْلَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ وَلاَ يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ} (٣/٧٧).

واتە: ئەو كەسانە كە پەیمانی خوداو سوێندی خۆیان بە بەهایەكی كەم دەگۆڕنەوە ئەوانە هیچ بەش و بارەیان نیە لە رۆژی قیامەتا، وە خودا بە میهرەبانی قسەیان لەگەڵ ناكا، وە لە رۆژی قیامەتا بە چاوی مەرحەمەت تەماشایان ناكا، وە پاكیان ناكاتەوە لە تۆڵەی تاوانەكانیان و هیچ تاریفێكیان ناكا، وە سزایەكی زۆر سەخت و بەسوێشیان بۆ هەیە لە پاشە رۆژدا (ب – خودای لێ رازی بێ).

١٧٧٥- وَمَرَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِرَجُلٍ يَبِيعُ طَعَامًا فَسَأَلَهُ كَيْفَ تَبِيعُ فَأَخْبَرَهُ فَأُوحِيَ إِلَيْهِ أَنْ أَدْخِلْ يَدَكَ فِيهِ فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهِ فَإِذَا هُوَ مَبْلُولٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْسَ مِنَّا مَنْ غَشَّ. رَوَاهُ أبو داود ومسلم والترمذي ولفظهما: فَقَالَ: مَا هَذَا يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ؟ قَالَ: أَصَابَتْهُ السَّمَاءُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ أَفَلاَ جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ كَىْ يَرَاهُ النَّاسُ مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّى[٥].

جارێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) چوو بۆ لای پیاوێ خۆراكی دەفرۆشت، پرسیاری لێ كرد چۆنی دەفرۆشی، پیاوەكەیش گوتی: ئاواو ئاوا.

جا خودا نیگای نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ): كە دەستی پیاكە، جا كە دەستی پیاكرد خۆراكەكە لە ناوەوە تەڕبوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ ساختەو گزیمان لێ بكا لە ئێمە نیە (د/م/ت) گفتەی (م/ت) ئاوایە: فەرمووی: ئەی خاوەن خۆراك! ئەم تەڕییە چیە؟ گوتی: ئەوە بارانی لێ داوە، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئەی نەدەبوو بیخەیتە سەرەوە تا خەڵك بیبینن؟ ئینجا فەرمووی: كەسێ گزی و ساختەیی بكا لە من نیە.

---

[٥] مسلم. إيمان: ٢٨٠. ترمذى. بيوع: ١٣١٥ (رياض/ ٤ ز: ٢٧٦ ژ: ١٥٧٩/١).

١٧٧٦- عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نُسَمَّى السَّمَاسِرَةَ فَمَرَّ بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَمَّانَا بِاسْمٍ هُوَ أَحْسَنُ مِنْهُ فَقَالَ يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ إِنَّ الْبَيْعَ يَحْضُرُهُ اللَّغْوُ وَالْحَلِفُ فَشُوبُوهُ بِالصَّدَقَةِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٦].

قەیسی کوڕی ئەبو غەرزە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بە سەرینی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە ئێمەیان دەگوت: دەڵاڵ، تا جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هات بۆ لامان‌و ناوێکی جوانتری لێ ناین‌و فەرمووی: ئەی دەستەی بازرگان! سەوداو مامەڵە مشتومڕو بگرەو بەردەی لەسەر دەکرێ‌و سوێندی تیا دەخورێ، جا کەوابوو ئامێتەی خێرو صەدەقەی بکەن (د/ت/ن-س/ص).

١٧٧٧- عَنْ رِفَاعَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ خَرَجَ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْمُصَلَّى فَرَأَى النَّاسَ يَتَبَايَعُونَ فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ فَرَفَعُوا أَعْنَاقَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ إِلَيْهِ إِجَابَةً لَهُ فَقَالَ: إِنَّ التُّجَّارَ يُبْعَثُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فُجَّارًا إِلاَّ مَنِ اتَّقَى اللَّهَ وَبَرَّ وَصَدَقَ. وَفِي رِوَايَةٍ: التَّاجِرُ الصَّدُوقُ الأَمِينُ مَعَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ. رواهما الترمذي[٧].

ریفاعە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) چووم بۆ نوێژگاکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) تەماشای کرد خەڵکەکە خەریکی سەودا کردنن، فەرمووی: ئەی دەستەی بازرگانان! خەڵکەکەیش سەریان بەرز کردەوەو ڕوویان کردە حەزرەت‌و گوێیان ڕاگرت، جا فەرمووی: لە ڕۆژی ڕەستاخێز (قیامەت)دا، بازرگانەکان کە زیندوو دەکرێنەوە هەموویان بەدکارو ناهەموارن، مەگەر ئەوانەیان نەبێ کە لە خودا دەترسن‌و چاکە دەکەن‌و ڕاست‌و سەر ڕاستن!

---

[٦] بسند صحيح (شرحه).

[٧] بسند صحيح (شرحه).

**لـە گێڕانەوەیـەکا: بازرگـانی راسـتاڵی راسـتگوی دەسـتپاك لـە رۆژی قیامەتا هاونشینی پێغەمبەران و پیاوچاکان و شەهیدانە (ت).**

**١٧٧٨- عَنْ جَابِرٍ** (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: رَحِمَ اللَّهُ رَجُلاً سَمْحًا إِذَا بَاعَ، وَإِذَا اشْتَرَى، وَإِذَا اقْتَضَى. رَوَاهُ البخاری والترمذی**[٨].

**جـابیر** (خودای لێ رازی بێ) **گـوتی: پێغەمبـەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فـەرمووی: رەحمـەتی خـودا لـەو کەسـەیەبێ کـە لەسـەوداو کـڕین و فرۆشـتن و داواکردنـی هەقی خۆیدا مامەڵە خۆش و نەرمونیانە (ب/ت).**

**١٧٧٩- عَنْ حُذَيْفَةَ** (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: تَلَقَّتِ الْمَلاَئِكَةُ رُوحَ رَجُلٍ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ؟ فَقَالُوا: أَعَمِلْتَ مِنَ الْخَيْرِ شَيْئًا؟ قَالَ: لاَ. قَالُوا: تَذَكَّرْ قَالَ: كُنْتُ أُدَايِنُ النَّاسَ فَآمُرُ فِتْيَانِي أَنْ يُنْظِرُوا المعْسِرَ وَيَتَجَاوَزُوا عَنِ الْمُوسِرِ قَـالَ اللهُ تَعَـالَى تَجَوَّزُوا عَنْهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: إِلاَّ أَنِّي كُنْتُ رَجُلاً ذَا مَالٍ فَكُنْتُ أُدَايِنُ النَّـاسَ فَكُنْـتُ أَقْبَـلُ الْمَيْـسُورَ وَأَتَجَـاوَزُ عَـنِ الْمَعْـسُورِ. فَقَـالَ اللهِ: تَجَـاوَزُوا عَـنْ عَبْـدِي. رَوَاهُ الـشيخان والترمذی**[٩].

**حوذەیفە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتـی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: فریشتە گیانی پیاوێکیان وەرگرت، کە لە نەتەوەکانی پێش ئێوە بوو وەپێیان گوت: ئایا هیچ چاکەیەکت کردووە؟ گوتی: نەء. گوتیان: بیربکەرەوە. گوتی: ئـا، قـەرزم دەدا بـە خـەڵك، دەسـتوورم وابـوو بـە پیاوەکـانم دەگـوت: مۆڵـەتی قـەرزاری نـەدارا بـدەن و لەگـەڵ قـەرزاری دەوڵەمەندیـشا چاوپۆشـی بکـەن و مامەڵەتان خۆش بێ.**

**خـودای گـەورەیش فـەرمووی (بـە فریـشتەکانی خـۆی): ئێـوەیش چاوپۆشی لەو بکەن.**

---

[٨] بخاري. بیوع: ٢٠٧٦. (ریاض/ ٣ ز: ٢٤٠ ژ: ١٣٦٨/٢).

[٩] بخاري. بیوع: ٢٠٧٧، ٢٣٩١، ٣٤٥١. مسلم. مساقاة: ٣٩٦٩.

لە گێڕانەوەیەکا: بەڵام پیاوێکی دەوڵەمەند بووم، قەرزم دەدا بە مەردوم، جا ئەوەی هەیبوو قەرزەکەی سەری دەدامەوە ئەوەیشی نەیبوو چاو پۆشیم لێ دەکرد جا خودایش فەرمووی: ئێوەیش چاوپۆشی لەم بەندەیەی من بکەن! (ش/ت).

١٧٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا أَوْ وَضَعَ لَهُ أَظَلَّهُ اللّٰهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَحْتَ ظِلِّ عَرْشِهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ. رَوَاهُ الترمذي وصححه[١٠].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ مۆڵەتی قەرزارێکی نەدارا بدا (یاشتێ لە قەرزەکەی دابشکێنێ بۆی) ئەوە ئەو کەسە لە رۆژی قیامەتا خودا دایدەنێ لە ژێر سایەی تەخت و بارەگای خۆیدا، ئەو رۆژە رۆژێکی وایە کە جگە لە سێبەری عەرشی خودا هیچ سێبەرێکی تر نیە! (ت:ص).

١٧٨١- وَعَنْهُ عَنْ كَانَ لِرَجُلٍ عَلَى رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَقٌ فَأَغْلَظَ لَهُ، فَهَمَّ بِهِ أَصْحَابُهُ، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): دَعُوهُ، فَإِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالاً. وَاشْتَرُوا لَهُ سِنّاً، فَأَعْطُوهُ إِيَّاهُ. فَقَالُوا: لاَ نَجِدُ إِلاَّ أَفْضَلَ مِنْ سِنِّهِ. قَالَ: اشْتَرُوهُ فَأَعْطُوهُ إِيَّاهُ، فَإِنَّ خَيْرَكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً. رَوَاهُ الخمسة[١١].

دیسان گوتی: کابرایێ، ئاژەڵێکی لەسەر پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەربێ) کە داوای کردەوە قسەی رەق بوو لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ). جا هاوڕێیان قرمیان لێ خۆش کرد کە پەلاماری بدەن و تەمێی بکەن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: وازی لێ بێنن، چونکە خاوەن ماف قسەی رەوایە و هەقی قسەی هەیە، ئاژەڵێکی هاوتەمەنی ئاژەڵەکەی خۆیی بۆ بکڕن و بیدەنێ.

---

[١٠] صحيح عند الترمذي.

[١١] بخاري. وكالة: ٢٣٠٥، ٢٣٩٠، ٢٣٩٢، ٢٣٩٣، ٢٤٠١، ٢٦٠٦، ٢٦٠٩. مسلم. مساقاة: ٤٠٨٦. ترمذي. بيوع: ١٣١٦، ١٣١٧، نسائي. بيوع: ٤٦٣٢، ٤٧٠٧. (رياض/ ٣ز: ٢٤٠ ز: ١٣٦٧/١).

گوتیان: ئاژەڵی وانیە، مەگەر لە هینەکەی خۆی باشتری بۆ پەیدا بکەین؟ فەرمووی: دەبیکڕن و بیدەنێ، چونکە لە پیاوباشانی ئێوە ئەو کەسانەتانن کە قەرز زۆر بە جوانی دەدەنەوە (ش/د/ت:ن. خەدایان لێ ڕازی بێ).

١٧٨٢- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَقَالَ مُسْلِمًا أَقَالَهُ اللَّهُ عَثْرَتَهُ. رَوَاهُ أبو داود وابن ماجه[١٢].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ چاوپۆشی لە هەڵەی موسوڵمانێ بکاو هەڵەکەی بۆ ڕاست بکاتەوە وەك ئەوە یەکێ لەسەودایەکا خەڵەتابێ، یا پەشیمان بێ و بیەوێ سوداکە هەڵوەشێنێتەوە بەرابەرەکەیشی ڕازی بێ و سەوداکە تێك بدەنەوە، هەر کەسێ ئاوابکا خودایش چاوپۆشی لەو دەکاو باری لاری بۆ ڕاست دەکاتەوە! (د- سند صالح - ئیبنو ماجە).

## ١٤٨) باسی سێیەم: باسی مەرجەکانی فرۆشراو

## الباب الثالث: في شروط المبيع

١٧٨٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: عَامَ الْفَتْحِ، وَهُوَ بِمَكَّةَ إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالأَصْنَامِ. فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهَا يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ، وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ، وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ. فَقَالَ: لاَ، هُوَ حَرَامٌ. ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْدَ ذَلِكَ: قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ، إِنَّ اللَّهَ لَمَّا حَرَّمَ عَلَيْهِمْ شُحُومَهَا جَمَلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ. رَوَاهُ الخمسة. وَفِي رِوَايَةٍ: نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَمَهْرِ الْبَغِيِّ وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ[١].

---

[١٢] رَوَاهُ أبو داود بسند صالح (شرحه).

[١] بخاري. بيوع: ٢٢٣٦، ٢٢٣٧، ٤٦٣٣، ٤٢٩٦. مسلم. مساقاة: ٤٠٢٤، ٣٩٨٥، أبو داود بيوع: ٣٤٨٦، ٣٤٨٧. ترمذي. بيوع: ١٢٩٧. نسائي. فرع وعتيرة: ٤٢٦٧، ٤٦٨٣.

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ساڵی گرتنی مەککە، لەو حەلەدا کە هێشتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە مەککە بوو لە خۆیم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): خوداو پێغەمبەری خودا کڕین‌و فرۆشتنی مەی‌و ئارەق‌و مردارەوەبووو بەرازو بتیان حەرام کردووە جا گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! پێمان بفەرموو ئەی ئایا ئەوە چۆنە کە خەڵك بەزو پیوی مردارەوە بوو کەشتی‌و کەوڵی پێ چەوردەکەن یا چرای پێ دەگرێنن؟ فەرمووی: نابێ، ئەوەیش هەر حەرامە لە هەمان کاتدا فەرموویشی: خودا بچێ بەگژی جوولەکەکاندا کاتێ خودای گەورەو سەروەر بەزو پیوی مردارەوە بووی لێ حەرام کردن، دەچوون بوختیان دەکردو دەیان پالاوت‌و بەرۆنی دەیان فرۆشت‌و ئەو جا پارەکەیان دەخوارد (ش/د/ت/ن – خودایان لێ رازی بێ).

لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی کردووە لە بەهای سەگ‌و لە کرێی ژنی سەڵیتە (قەحبە)و لەمز (مژدانە: سەر قەڵەمانە: کرێ)ی گوڵەنانی (کاهین).

١٧٨١– وَعَنْهُ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَالسِّنَّوْرِ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاری[٢].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهیی کردووە لە بەهای سەگ‌و پشیلە (م/د/ت/ن).

١٧٨٢– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْخَمْرِ عَشَرَةً عَاصِرَهَا وَمُعْتَصِرَهَا وَشَارِبَهَا وَحَامِلَهَا وَالْمَحْمُولَةَ إِلَيْهِ وَسَاقِيَهَا وَبَائِعَهَا وَآكِلَ ثَمَنِهَا وَالْمُشْتَرِيَ لَهَا وَالْمُشْتَرَاةَ لَهُ. رَوَاهُ الترمذی وأبو داود[٣].

---

[٢] مسلم. مساقاة: ٣٩٩١.

[٣] رَوَاهُ الترمذی بسند غریب ولکن مؤید بالصحاح (شرحه).

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە بارەی ئارەقەوە نەفرینی لەم دە كەسەیە كردووە: لەو كەسە دەیگوشێ‌و، لەو كەسە بۆیدەگوشرێ‌و، لەو كەسە دەیخواتەوە، لەو كەسە هەڵی دەگرێ‌و، لەو كەسە بۆی دەبەن‌و، لەو كەسە دەیگێڕێ‌و پێشكەشی دەكاو، لەو كەسە دەیفرۆشێ‌و، لەو كەسە پارەكەی دەخواو، لەو كەسە دەیكڕێ‌و، لەو كەسە دەیكڕن بۆی! (ت– سند غريب – خودایان لێ رازی بێ).

١٧٨٣– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ. رَوَاهُ الخمسة وزاد مسلم والترمذى: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) وَأَحْسِبُ كُلَّ شَيْءٍ مِثْلَ الْطَّعَامِ[٤].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر كەس خۆراكێكی لەیەكێ كڕی، تا بە تەواوی وەری نەگرێ" نەیفرۆشێتەوە بە یەكێكی تر (ش/د/ت/ن) موسلیم‌و تیرمیذی – رەزای خودایان لێبێ) ئەمەشیان لێ پتر كردووە: ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) دەیگوت: وا دەزانم هەموو شتێ لەم بارەیەوە وەك خۆراك وایە.

١٧٨٧– وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْوَزْنُ وَزْنُ أَهْلِ مَكَّةَ وَالْمِكْيَالُ مِكْيَالُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ. رَوَاهُ أبو داود والنسائى وابن حبان[٥].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بۆ كێشان كێش‌و سەنگی خەڵكی مەككە پەسەندەو بۆ پێوان عەیارەی خەڵكی مەدینە (د/ن/ماجە/ئیبنو حەببان – س/ص).

١٧٨٨– عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كِيلُوا طَعَامَكُمْ يُبَارَكْ لَكُمْ فِيهِ. رَوَاهُ البخارى[٦].

---

[٤] بخاري. بيوع: ٢١٣٢، ٢١٣٥. مسلم. بيوع: ٣٨١٥ – ٣٨١٩. أبو داود. بيوع: ٣٤٩٧. ترمذى. بيوع: ٤٦١٢.

[٥] بسند صحيح (شرحه).

میقدامی کوڕی مەعدیکەیبە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خۆراکتان بپێون پیت و فەڕی تێ دەکەوێ بۆتان (ب).

١٧٨٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّهُ قَالَ: لأَصْحَابِ الْمِكْيَالِ وَالْمِيزَانِ: إِنَّكُمْ قَدْ وُلِّيتُمْ أَمْرَيْنِ هَلَكَتْ فِيهِمَا الأُمَمُ السَّالِفَةُ قَبْلَكُمْ. رَوَاهُ الترمذي وصححه[٧].

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە تەرازوو بە دەستان و بە عەریارە پێوانی فەرموو: ئێوە دوو شتتان پێ سپێرراوە لە پێش ئێوەدا نەتەوەکانی پێش ئێوە بەهۆی ئەو دوو شتەوە سەریان تیا چووە جا کە وابوو ئاگاتان لە خۆتان بێ و تەرازوو بازی مەکەن و لە کڕین و فرۆشتندا گزی و فزی مەکەن (ت:ص).

١٧٩٠- وَقَالَ سُوَيْدُ بْنُ قَيْسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ): جَلَبْتُ أَنَا وَمَخْرَمَةُ الْعَبْدِيُّ بَزًّا مِنْ هَجَرَ فَأَتَيْنَا بِهِ مَكَّةَ فَجَاءَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمْشِي فَسَاوَمَنَا بِسَرَاوِيلَ فَبِعْنَاهُ وَثَمَّ رَجُلٌ يَزِنُ بِالأَجْرِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زِنْ وَأَرْجِحْ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٨].

سووەیدی کوڕی قەیس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: من و مەخرەفەی عەبدی لە هەجەرەوە کووتاڵمان هێنابوو، بردمان بۆ مەککە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە پێ هات بۆ لامان، سەودای دەرپێیێکی لێ کردین، پێمان فرۆشت، پیاوێ لەوێ بوو بەهاکەی دەکێشا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: بیکێشەو سلاوی بدەرەوە (د/ت/ن-س/ص).

---

(٦) بخاري. بيوع: ٢١٢٨.

(٧) صحيح عند الترمذي.

(٨) بسند صحيح (شرحه).

١٧٩١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلما[٩].

**ئیبنو عومەر** (خوایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **نەهیی کردووە لە کرێی پەڕینی نێر لە مێ (ب/د/ت/ن).**

١٧٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعِ الْحَصَاةِ وَعَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[١٠].

**ئەبو هورەیرە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **نەهی کردووە لە فرۆشتنی بەردەهاوێژ (بیع الحصاه) و لە فرۆشتنی شتی نەزانراو و دەس نەداو، وەك مەل بەحەواوە، یا ماسی لە ئاوا، یا شتی بزربوو (م/د/ت/ن — خودایان لێ ڕازی بێ).**

١٧٩٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَالَ اللَّهُ ثَلاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى مِنْهُ، وَلَمْ يُعْطِهِ أَجْرَهُ. رَوَاهُ البخاري[١١].

**دیسان گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: خودای گەورەو مەزن دەفەرموێ: ئەم سێ کەسەیە لە ڕۆژی قیامەتا خۆم داواچیم لەسەریان:**

**یەکەم: ئەو کەسەی کە بەهۆی ناوی منەوە پەیمان دەدا بە کەسێك و بەوە هێمنی دەکاتەوە، یا تەماداری دەکا کەچی لە پاشا دەسخەڕۆی دەکاو پەیمانەکەی ناباتە سەرو ناپاك دەردەچێ.**

**دووەم: پیاوێ ئادەمیزادێکی ئازاد بفرۆشێ و بەهاکەی بخوا.**

---

[٩] بخاري. إجارة: ٢٢٨٤.

[١٠] مسلم. بيوع: ٣٧٨٧. أبو داود. بيوع: ٣٣٧٦. ترمذی. بیوع: ١٢٣٠. نسائی. بیوع: ٤٥٣٠.

[١١] بخاري. بيوع: ٢٢٢٧، ٢٢٧٠ (رياض/ ٤ ز: ٢٧٧ ز: ٤/ ١٥٨٧).

**سێیەم: پیاوێ کرێکارێ بەکرێ بگرێ و کاری خۆیی پێ تەواو بکاو کەچی کرێکەیی نەداتێ (ب).**

**١٧٩١- وَقَالَ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) اشْتَرَيْتُ يَوْمَ خَيْبَرَ قِلاَدَةً بِاثْنَيْ عَشَرَ دِينَارًا فِيهَا ذَهَبٌ وَخَرَزٌ فَفَصَّلْتُهَا فَوَجَدْتُ فِيهَا أَكْثَرَ مِنِ اثْنَيْ عَشَرَ دِينَارًا فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: لاَ تُبَاعُ حَتَّى تُفَصَّلَ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخارى[١٢].**

**فوضالەی کوڕی عوبەید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژی رووداوی خەیبەر گەردانەیەکم کڕی، بە دوانزە لیرە، هەندێکی زێڕو هەندێکی مووروووبوو، بەڵام کە لە یەکم جیاکردنەوە تەماشام کرد زیاتر لە دوانزە هەر لیرەی تیابوو!جا کە ئەمەم عەرزی حەزرەت کرد فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): تا جیا نەکرێتەوە نافرۆشرێ (م/د/ت/ن - خودایان لێ رازی بێ).**

## ١٤٩) باسی نووسینی مەرجەکان و سەرپشکی و پەشیمان بوونەوە لە فرۆشتن: (كتابة الشروط والخيار في البيع)

**١٧٩٥- عَنْ عَبْدُ الْمَجِيدِ بْنُ وَهْبٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: قَالَ لِي الْعَدَّاءُ بْنُ خَالِدِ (رَضِي اللّهُ عَنهُ): أَلاَ أُقْرِئُكَ كِتَابًا كَتَبَهُ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْتُ: بَلَى. فَأَخْرَجَ لِي كِتَابًا هَذَا مَا اشْتَرَى الْعَدَّاءُ بْنُ خَالِدِ بْنِ هَوْدَةَ مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اشْتَرَى مِنْهُ عَبْدًا أَوْ أَمَةً لاَ دَاءَ وَلاَ غَائِلَةَ وَلاَ خِبْثَةَ بَيْعَ الْمُسْلِمِ الْمُسْلِمَ. رَوَاهُ الترمذى والبخارى. واد: الْغَائِلَةُ الزِّنَا وَالسَّرِقَةُ وَالإِبَاقُ[١].**

**عەبدولمەجیدی کوڕی وەهب (خوای لێ رازی بێ) گوتی: عەددائی کوڕی خالید (خوای لێ رازی بێ) پێی گوتم: دەی با ئەو نامەیەت بۆ بخوێنمەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆی نووسیبووم! گوتم: ئادەی فەرموو، جا**

---

**[١٢] مسلم. مساقاة: ٤٠٥١. أبو داود. بيوع: ٣٣٥١، ٣٣٥٢، ٣٣٥٣. نسائى. بيوع: ٤٥٨٧، ٤٥٨٨.**

**[١] بخاري. بيوع: تعليق ذكره البخارى فى الباب المرقم: ١٩ من كتاب البيوع. قبل رقم: ٢٠٧٩ فتح البارى (مترجم).**

ئـەویش ئـەم نامەیـەی بـۆ دەرهێنـام: عـەددای كـوڕی خالیـدی كـوڕی هـووزە ئەمـەی كڕیـوە لـە موحەممـەد كە پێغەمبـەری خوایە: بەندەیـەكی لێ كڕیـوە یـا كەنیزەكێكی لێ كڕیـوە كـە بـێ دەردەو بـێ فێڵ‌و تەڵەكەیـەو بـێ گـەڕەو گـەڕی كەسی تری بەسەرەوە نیە، وەك چۆن باوە كە موسوڵمانێ شتێ دەفرۆشێ بە موسوڵمانێ بەبێ فڕوفێڵ پێـی دەفرۆشـێ ئـاوا (ت/ب) بوخـاری (خوای لێ رازی بێ) ئەمەیشی لێ پتر كردووە: مەبەست: لە فێڵ‌و تەڵەكە حیزی‌و دزی‌و هەڵهاتنە.

١٧٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولُ اللّٰـهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَـالَ: الْمُسْلِمُونَ عَلَى شُرُوطِهِمْ. ر أبو داود والترمذی والحاکم [٢].

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرموێ: موسوڵمانان لەسەر مەرجی خۆیانن‌و هـەر مەرجێكی رەوا دابنێن دەبێ جێ بەجێی بكەن (د/ت/حاكم-س/ص).

١٧٩٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ حِينَمَا طَلَبَتْ مِنْهَا الْمُسَاعَدَةَ عَلَى مَا كَاتَبَهَا عَلَيْهِ أَهْلُهَا فَامْتَنَعُوا إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الْوَلاَءُ لَهُمْ فَسَمِعَ بِذَلِكَ النَّبِـيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: اشْتَرِيهَا وَاشْتَرِطِي لَهُمُ الْوَلاَءَ فَإِنَّ الْـوَلاَءَ لِمَـنْ أَعْتَـقَ. فَفَعَلَـتْ عَائِسَةُ وَقَامَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي النَّاسِ فَحَمِدَ اللّٰهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ فَمَا بَالُ رِجَالٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللّٰهِ مَا كَانَ مِـنْ شَـرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ فَهُوَ بَاطِلٌ وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْطٍ قَضَاءُ اللّٰهِ أَحَقُّ وَشَرْطُ اللّٰهِ أَوْثَقُ وَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ [٣].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بەریرە لەگەڵ خاوەنەكانیا رێكەوتبوو كە لەسـەر بـڕێ پـارەی دیـاریكراو ئـازادی بكـەن كـە لـە شـەریعەتا بـەم جـۆرە مامەڵەیە دەگـوترێ موكاتەبـە جاهـات بـۆلام بـۆ بـاربوویی. منیش ویستم كە

---

[٢] بسند صحيح (شرحه).

[٣] بخـارى. مكاتـب: ٢٥٦٠، ٢١٥٦، ٢٥٦٢، ٢١٦٩، ٢٧٥٧، ٦٧٥٢، ٦٧٥٧، ٦٧٥٩، ٢٥٦١، ٢٥٦٣، ٢٥٦٤، ٢٥٦٥. مـسلم. عتـق: ٣٧٦٠، ٣٧٥٨. نسائى. طبرانى: ٣٤٤٨.

بەریرە بکڕم، بەڵام خاوەنەکانی رازی نەبوون، مەگەر بەمەرجی ئەوە کە هەقداری (وەلاء)ەکەی بۆ خۆیان بمێنێتەوە.

جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەمەی زانی فەرمووی: تۆ بیکڕەو مەرجی ئەوەیان لەگەڵ بکە کە هەقدارییەکەی بۆ ئەوان بێ ئەو مەرجە سوودی نیە بۆ ئەوان چونکە ئەو کەسە دەبێ بە هەقداری بەندەی ئازادکراو کە ئازادی دەکا.

جا منیش وامکردو پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) هەستایەوە دوانێکی دا بۆ جەماوەرو سوپاس و ستایشێکی جوانی خودای کردو فەرمووی: لەپاش سوپاس و ستایشی خودا، ئەوە هەندێ کەس لەسەر چ بیرو باوەڕێ هەندێ شت دەگرن بە مەرج، کە مەرجی وا لە شەریعەتی خودادا نیەو نابێ! هەر مەرجێ کە لە شەریعەتی خودادا نەبێ ئەوە پووچ و بەتاڵ و بۆشە، ئەگەرچی سەد مەرجیش بێ، فرمان و حوکمی خودا راستترەو مەرجی خودا مەحکەمترو لەبارترە" ئەو کەسەیش دەبێ بە هەقداری بەندەی ئازادکراو کە ئازادی دەکا (ش/د/ت/ن — خودایان لێ رازی بێ).

١٧٩٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ بَاعَ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعِيرًا وَاشْتَرَطَ ظَهْرَهُ إِلَى أَهْلِهِ. رواهما الخمسة[٤].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: لەسەفەرێکا وشترێکم فرۆشت بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەو مەرجە لەو سەفەرەدا هەتا ماڵەوە خۆم سواری ببم (ش/د/ت/ن — خودایان لێ رازی بێ).

١٧٩٦- عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا، وَإِنْ كَتَمَا وَكَذَبَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا[٥].

---

[٤] بخاری. شروط: ٢٧١٨. مسلم. مساقاة: ٤٠٧٧. نسائی. بیوع: ٤٦٥٣.

حـەکیمی کـوڕی حیـزام (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەربێ) فەرمووی: کڕیارو فرۆشیار هەردوو لایان خۆیان سەرپشکن و دەتـوانن پەشیمان ببنـەوە هـەتا لـە یـەکتری جیا دەبنـەوە، جا ئەگـەر لەگـەڵ یەکتریـدا ڕاست و دروست بن و شت لە یەکتری نەشارنەوەو نەنگی شاراوەی سەوداکە حەشار نەدەن ئەوە ئەو سەودایەیان پیت و فەڕی تێ دەکەوێ بۆیان!

بەڵام ئەگەر لەگەڵ یەك ناراست بن و شت لـە یـەکتری حەشاربدەن، ئـەوا پیتی سەوداکەیان دەچێ بەحەوادا (ش/د/ت/ن —خودایان لێ رازی بێ).

١٧٩٧– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كُلُّ بَيِّعَيْنِ لاَ بَيْعَ بَيْنَهُمَا حَتَّى يَتَفَرَّقَا، إِلاَّ بَيْعَ الْخِيَارِ. رواهما الخمسة[٦].

ئیبنـو عومـەر (خودایان لێ خۆش نوود بێ) دەڵـێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: گشت فرۆشیارو کڕیارێ‌سەوداکەیان دانامـەزرێ هـەتا لـە یـەکتری جیادەبنەوە، ئەو سەودایە نەبێ کە مافی پەشیمانبوونەوەو سەرپشکیان بە مـەرج گرتبـێ ئـەوە تامـاوەی نـاوبراو مـافی پەشـیمان بونـەوەیان بـۆ هەیـە (ش/د/ت/ن = ئیمـامی بوخـاری و ئیمـامی موسـلیم و ئیمـامی ئـەبو داوودو ئیمامی تیرمیذی و ئیمامی نەسائی، (خودای گەورە لێیان رازی بێ) لەبەر خاتری ئەوان لە ئێمەیش خۆش بێ. ئامین).

١٧٩٨– وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا تَبَايَعَ الرَّجُلاَنِ فَكُـلُّ وَاحِـدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ، مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، وَكَانَا جَمِيعًا، أَوْ يُخَيِّرُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ فَتَبَايَعَـا عَلَـى ذَلِـكَ، فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ، رَوَاهُ الثلاثة[٧].

---

[٥] بخاری بیوع: ٢١١١. مسلم. بیوع: ٣٨٣١. أبو داود. بیوع: ٣٤٥٤. نسائی. بیوع: ٤٤٧٧.

[٦] بخاری. بیوع: ٢١١١. مسلم. بیوع: ٣٨٣١.

[٧] بخاری. بیوع: ٢١١٢. مسلم. بیوع: ٣٨٣٤. نسائی. بیوع: ٤٤٨٣، ٤٤٨٤.

دیسان دەڵێ: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ پیاوێ شتێکی بە پیاوێکی تر فرۆشت، ئەوە هەردوولایان سەرپشکن و هەقی پەشیمانبوونەوەیان هەیە هەتا بەیەکەوەبن تا ئەو دەمەی کە لە یەکتری جوێ دەبنەوە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان ئەوەی تریانی کرد بەسەرپشك کە مافی پەشیمان بوونەوەی هەبێ هەتا سێ رۆژ یا کەمتر، ئەوە ئەو مافەی بۆ هەیە، یا کردی بەسەر پشك کە سەوداکە هەڵبگرێ و قوبووڵی بکا وە لەسەر ئەوە رێ کەوتن ئەوە سەوداکە دادەمەزرێ و فرۆشتنەکە سەر دەگرێ (ش/د).

١٨٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَفْتَرِقَنَّ اثْنَانِ إِلاَّ عَنْ تَرَاضٍ. رَوَاهُ أبو داود والترمذى[٨].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەردوو لایان واتە: کڕیارو فرۆشیار لە یەکتری جیانەبنەوە هەتا لە یەکتری رازی نەبن! (د-سند صالح-ت).

## ١٥٠) بەسەردا دانەوەی ماڵی عەیبدار: (الرد بالعيب)

١٨٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مِنَ اشْتَرَى شَاةً مُصَرَّاةً فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْلُبَهَا إِنْ شَاءَ أَمْسَكَهَا وَإِنْ شَاءَ رَدَّهَا وَصَاعًا مِنْ تَمْرٍ لاَ سَمْرَاءَ. رَوَاهُ الأربعة[١].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: حەزرەت (صەلات و سەلام و درودی خودای گەورەی لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر کەسێ مەڕێکی کڕی بۆ فێڵ چەند رۆژێ نە دۆشرابوو، تا کڕیار پێی بخەڵەتێ و وابزانێ کە بەشیرە ئەوە لەپاش دۆشینی کڕیار خۆی سەرپشکە لە یەکێ لەم دووە: ئەگەر حەزکا مەڕەکە هەڵدەگرێ و،

---

[٨] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[١] بخاری. بیوع: ٢١٤٨. مسلم. بیوع: ٣٨٠٩ — ٣٨١٢. نسائی. بیوع: ٤٥٠١.

ئەگەر حەزكا دەیداتەوە بە سەرخاوەنەكەیدا، بەڵام دەبێ مەنێ خورما (نەك گەنم) بدا لە جیاتیی شیرەكەی (ش/د/ت).

١٨٠٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا) عَنْ النَّبِيُّ قَالَ: الْخَرَاجُ بِالضَّمَانِ[٢].

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دەست كەوتی فرۆشراو بۆ كڕیارە لەو ماوەیەدا كە لەلایەتی لەپێش پەشیمان بوونەوەدا لە جیاتی دەستەبەریی چونكە كڕیار لەو ماوەیەدا زامن‌و دەستەبەرە (د/ت/ن-سر/ح).

١٨٠٢- عَنْ عَبْدُ اللّٰهِ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إذَا اخْتَلَفَ الْبَيِّعَانِ وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا بَيِّنَةٌ فَهُوَ مَا يَقُولُ رَبُّ السِّلْعَةِ أَوْ يَتَتَارَكَانِ أيْ يَتَفَاسَخَانِ الْعَقْدَ. رواهما أصحاب السنن- والله أعلى وأعلم[٣].

عەبدوڵڵا (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر كڕیارو فرۆشیار قسەیان یەك نەبوو، وە كەسیشیان بەڵگەیان نەبوو، ئەوە یا قسەی فرۆشیار دەخوا، یا هەردوولا واز لەو سەودایە دێنن! واتە: سەوداكە هەڵدەوەشێننەوە (د/ت/ن-سند صالح).

## ١٥١) نرخ دانان‌و شت شاردنەوە بۆ كاتی گرانی دروست نین
## لا یجوز التسعیر ولا الاحتكار:

١٨٠٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّاسُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ غَلاَ السِّعْرُ فَسَعِّرْ لَنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إنَّ اللّٰهَ هُوَ الْمُسَعِّرُ الْقَابِضُ الْبَاسِطُ الرَّازِقُ وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ أَلْقَى اللّٰهَ وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْكُمْ يُطَالِبُنِي بِمَظْلَمَةٍ فِي دَمٍ وَلاَ مَالٍ. رَوَاهُ أصحاب السنن[١].

---

[٢] بسند حسن (شرحه).

[٣] بسند صالح (شرحه).

[١] بسند صحيح (شرحه).

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: مەردوم گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! نرخی شت تەواو گران بووە، نرخی شت دانێ بۆمان، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا هەر خۆی نرخدانەوەو نرخی شت دەبڕێ وە هەر خۆی ڕۆژیدەرەو ڕزق و ڕۆژی دەدا، وە هەر خۆی ڕزق و ڕۆژی و هەموو شتێ دەگرێتەوە، یا گوشادو زۆری دەکا، وە من ئومێد دەکەم کە هەتا دەچمەوە دیوانی خودا کەس لە ئێوە داواچی نەبێ لەسەرم، کە داوای هەقی خۆیم لێ بکا، ئیتر ئەو هەقە چ خوێن بێ، چ ماڵ! (د/ت/ن–س/ص).

١٨٠٧– عَنْ مَعْمَرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنِ احْتَكَرَ فَهُوَ خَاطِئٌ . فَقِيلَ لِسَعِيدٍ: فَإِنَّكَ تَحْتَكِرُ قَالَ سَعِيدٌ إِنَّ مَعْمَرًا الَّذِى كَانَ يُحَدِّثُ هَذَا الْحَدِيثَ كَانَ يَحْتَكِرُ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذى والله أعلى وأعلم[٢].

مەعمەر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ شت بکڕێ و هەڵی بگرێ بۆ کاتی گرانی تا بەکران بیفرۆشێتەوە ئەو کەسە تاوانبارە، جا بەسەعیدی کوڕی موسەییەبیان گوت: خۆ تۆ خۆشت ئەمە دەکەیت ئەی ئەمە چەنی بەچەن! گوتی: مەعمەر خۆشی کە ڕاوی ئەم حەدیثەیە ئەویش ئەمەی دەکرد! (م/د/ت – خودایان لێ ڕازی بێ).

## ١٥٢) باسی چوارەم: باسی ئەو سەودایانە کە ناپەسەندو ناشایستەن

## الباب الرابع: في البيوع المنهي عنها

١٨٠٨– عَنْ بْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ، وَكَانَ بَيْعًا يَتَبَايَعُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ، كَانَ الرَّجُلُ يَبْتَاعُ الْجَزُورَ إِلَى أَنْ تُنْتَجَ النَّاقَةُ، ثُمَّ تُنْتَجُ الَّتِي فِي بَطْنِهَا. رَوَاهُ الخمسة[١].

---

[٢] مسلم. مساقاة: ٤٠٨٩. أبو داود. بيوع: ٣٤٤٧. ترمذى. بيوع: ١٢٦٧.

[١] بخارى. مناقب الأنصار: ٣٧٤٣. مسلم. بيوع: ٣٧٨٩. أبو داود. بيوع: ٣٣٨١. نسائى. بيوع: ٤٦٣٨.

ئیبنو عومەر (خوایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نەهی کردووە لەو فرۆشتنەی کە ببەسترێ بە زایینی بەچکەی ناوسکی وشتری ئاوسەوە! ئەم جۆرە فرۆشتنەیش (لەسەردەمی نەزانیدا) خەڵك دەیانکرد، لەسەر ئەم شێوەیە: پیاوێ وشترێکی دەکڕی، بە بەهایەکی دیاری کراوی نەدراوی دواخراو، بە وادەی ئەوەندە کە ئەو وشترە بزێ و سکەکەشی بزێتەوە، ئەوسا بەهاکەی بدا! (ش/د/ت/ن).

١٨٠٦– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعَتَيْنِ، نَهَى عَنِ الْمُلاَمَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ فِي الْبَيْعِ، وَالْمُلاَمَسَةُ لَمْسُ الرَّجُلِ ثَوْبَ الآخَرِ بِيَدِهِ بِاللَّيْلِ أَوْ بِالنَّهَارِ، وَلاَ يُقَلِّبُهُ إِلاَّ بِذَلِكَ، وَالْمُنَابَذَةُ أَنْ يَنْبِذَ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ بِثَوْبِهِ، وَيَنْبِذَ الآخَرُ إِلَيْهِ ثَوْبَهُ، وَيَكُونَ ذَلِكَ بَيْعَهُمَا، عَنْ غَيْرِ نَظَرٍ وَلاَ تَرَاضٍ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذى ولفظ أبى داود: وَالْمُنَابَذَةُ أَنْ يَقُولَ إِذَا نَبَذْتُ إِلَيْكَ هَذَا الثَّوْبَ فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ وَالْمُلاَمَسَةُ أَنْ يَمَسَّهُ بِيَدِهِ وَلاَ يَنْشُرُهُ وَلاَ يُقَلِّبُهُ فَإِذَا مَسَّهُ وَجَبَ الْبَيْعُ[٢].

ئەبو سەعید (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نەهی لێ کردین لەم دوو جۆرە فرۆشتنە: لە فرۆشتن بە دەست لێ دان (مولامەسە). وە لە فرۆشتن بە هەڵدان بۆ یەکتری، فرۆشتن بەدەست لێدان ئاوایە: فرۆشیار بەکڕیار دەڵێ: هەرکاتێ دەستت دا لەم جلە ئەوە بەیعی هاتبێ و ئیتر ئەوە لەباتی تەماشاکردنی و ئەم دیوەو ئەو دیو کردنی! وە ئەم دەست لێ دانەیش خوا بەشەوی تاریك بێ، خوا بەرۆژی ڕووناك بێ.

فرۆشتن بەهەڵدان بۆ یەکتریش ئاوایە: ئەم جلەکەی خۆی هەڵبدا بۆ ئەوو ئەویش جلەکەی خۆی هەڵبدا بۆ ئەم، وە ئەمە لە جیاتی گوتە (صیغە)ی فرۆشتن، ئیتر بەبێ سەرنجدان و دڵگرتن (ش/د/ن) گفتەی (د) ئاوایە: فرۆشتن بەهەڵدان بۆ یەکتری ئاوایە: وەك ئەوە پێی بڵێ: کە ئەم جلەیەم بۆ فڕەدایت ئەوە فرۆشتنەکەی دادەمەزرێ و بەیعی هاتووە: فرۆشتن

---

[٢] بخاری. صوم: ١٩٩٣. مسلم. بیوع: ٣٧٨٤.

بە دەست كوتانیش ئەوەتانێ كە بەدەست دەستێ لێبدا بەبێ ئەوەی كە ئەم دیوو دیوی بكا، یا سەرنجی بدا، واتە: هەر كاتێ دەستی بەری كەوت ئیتر بەیعی هاتبێ!

١٨١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ بَاعَ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ فَلَهُ أَوْكَسُهُمَا أَوِ الرِّبَا. رَوَاهُ أبو داود والترمذی وصححه[٣].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: كەسێ دوو فرۆشتن لەیەك فرۆشتندا ئەنجام بدا وەك ئەوە بڵێ: من ئەم خانووەت پێ دەفرۆشم بە ئەوەندە بەو مەرجە تۆیش ئەسپەكەی خۆتم پێ بفرۆشی بە ئەوەندە ئەو كەسەی ئەمە بكا یا ەبێ سەوداكەر كەمترەكەیان هەڵبگرێ، یاخۆ تووشی سوود خواردن دەبێ (د/ت:ص).

١٨١١- ولأصحاب السنن: لاَ يَحِلُّ سَلَفٌ وَبَيْعٌ وَلاَ شَرْطَانِ فِي بَيْعٍ وَلاَ رِبْحُ مَا لَمْ يَضْمَنْ وَلاَ بَيْعُ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ[٤].

ئەبو داوودو تیرمیذی‌و نەسائی (خودایان لێ رازی بێ) گێڕاویانەتەوە بەرشتەیەكی ساغ: بە سەنەدێكی صەحیح: بەڕشتەیەكی راست كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دروست نیە قەرزو فرۆشتن ببەسترێن بە یەكەوە وەك ئەوە شتێ (دە) دینار بێنێ، خاوەنەكەی بەكڕیار بڵێ: ئەمەت پێ دەفرۆشم بە (نۆ) دینار بەمەرجێ پەنجا دینارم بە قەرز بدەیتێ، چونكە ئەمە بەر ئەو فەرموودەیە دەكەوێ كە دەفەرموێ: هەر قەرزێ سوودێ راكێشێ دەبێ بەسوود هەروەك دروست نیە كە لە یەك فرۆشتندا دوو مەرج دابنرێ وەك ئەوە فرۆشیار بە كڕیار بڵێ: ئەم جلەت پێ دەفرۆشم بەم دوو مەرجە:

یەكەم: خۆم بۆت دە درووم.

---

[٣] صحيح عند الترمذی.

[٤] بسند صحيح.

**دووەم: خۆم گازری دەکەم بۆت! هەروەها قازانجی فرۆشراوێ کە هێشتا دەستەبەر نەکرابێ وەك شتێ بکڕیٚ و پێش ئەوەی وەری بگرێ بیفرۆشێتەوە بە قازانج بە کەسێکی تر هەروەها دروست نیە فرۆشتنی شتێ کە هی تۆ نەبێ.**

١٨١٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَلَقَّوُا الرُّكْبَانَ وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَلاَ تَنَاجَشُوا وَلاَ يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ. رَوَاهُ الخمسة وَفِي رِوَايَةٍ: فَإِنْ تَلَقَّاهُ إِنْسَانٌ فَابْتَاعَهُ فَصَاحِبُ السِّلْعَةِ فِيهَا بِالْخِيَارِ إِذَا وَرَدَ السُّوقَ[٥].

**ئیبنو عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: مەچن بە پیری کاروانییەوە تا پێش ئەوەی کە بگەنە بازاڕ کاڵاکەیان بە هەرزان لێ بکڕن و خۆتان بەگران بیفرۆشنەوە وە (شاری)یش شت بۆ لادێیی نەفرۆشێ و نەبێ بە دەلاڵی (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: جا ئەگەر کەسێ چوو بەپیر کەسێکەوەو شتێکی لێ کڕی ئەوە خاوەن کاڵاکە خۆی لەو سەودایەدا سەرپشکە کاتێ چووە بازاڕ بۆی هەیە پەشیمان ببێتەوە.**

١٨١٣- ولمسلم والترمذى: لاَ يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ دَعُوا النَّاسَ يَرْزُقِ اللَّهُ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ[٦].

**موسلیم و تیرمیذی (خوایان لێ ڕازی بێ) ریوایەت دەکەن: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: شاریی شت بۆ لادێی نەفرۆشێ و نەبێ بە دەلاڵی واز لەو خەڵکە بێنن، سا بەشکوو خودا بیانکا بەهۆی ڕۆژیی ناردن بۆ یەکتری!**

١٨١٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَبِعِ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ وَلاَ يَخْطُبْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ إِلاَّ أَنْ يَأْذَنَ لَهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: لاَ يَسُمُ المسلم عَلَى سَوْمِ أَخِيهِ[٧].

---

[٥] بخاری. بیوع: ٢١٥٨، ٢١٦٣، ٢٢٧٤. مسلم. بیوع: ٣٧٩٨، ٣٨٠٢. ٣٨٠٤. نسائی. بیوع: ٤٥١٣، ٤٥١٠.

[٦] مسلم. بیوع: ٣٧٠٥. أبو داود. بیوع: ٣٤٤٢.

ئیبنو عومەر (خوایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: سەودا لەسەر سەودای برای ئاییینی خۆتان مەکەن، هەروەها خوازبێنیش لەسەر خوازبێنیی برای ئاییینی خۆتان مەکەن، مەگەر بە مەرجێ ئەو برایەتان ڕێگەتان بدا. لە گێڕانەوەیەکا: ناشێ موسوڵمان سەودا بەسەر سەودای برای ئاییینیی خۆیدا بکا (ش/د/ت/ن).

١٨١٥- وَعَنْهُ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ النَّجْشِ[٨].

دیسان دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جڵەو گیریی کردووە لە کۆستە کۆستەو زەمی درۆ بۆ تەفرەدانی کڕیار (ش/د/ت/ن).

١٨١٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعِ الثَّمَرَةِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا، وَعَنِ النَّخْلِ حَتَّى يَزْهُوَ. قِيلَ: وَمَا يَزْهُو؟ قَالَ: يَحْمَارُّ أَوْ يَصْفَارُّ[٩].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی کردووە لە فرۆشتنی بەری درەخت و شینایی تا پێ دەگاو بەکەڵکی خواردن دێ وە نەهی کردووە لە فرۆشتنی خورمایش تا ماتە دەدا گوترا: ماتە دەدا یانی چی؟ گوتی: یانی سوور ببێ، یا زەرد هەڵگەڕێ واتە: نیشانەی گەیینی دەرکەوتبێ (ش/د/ت/ن = بوخاری و موسلیم و ئەبو داوودو تیرمیذی و نەسائی. خودای گەورە لێیان ڕازی بێ).

١٨١٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ حَتَّى يَزْهُوَ وَعَنِ السُّنْبُلِ حَتَّى يَبْيَضَّ وَيَأْمَنَ الْعَاهَةَ نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ. وَفِي رِوَايَةٍ: نَهَى عَنْ بَيْعِ الْعِنَبِ حَتَّى يَسْوَدَّ وَعَنْ بَيْعِ الْحَبِّ حَتَّى يَشْتَدَّ. روى هذه الأربعة الخمسة[١٠].

---

[٧] بخاری. بیوع: ٢١٤٠، ٢١٤٨، ٢١٥٠، ٢١٥١، ٢١٦٠، ٢١٦٢، ٢٧٢٣، ٢٧٢٧، ٥١٤٤، ٥١٥٢، ٦٦٠١. مسلم. نكاح: ٣٤٤١، ٣٧٩١، ٣٧٩٢.

[٨] بخاری. بیوع: ٢١٤٢، ٦٦٦٣. مسلم. بیوع: ٣٧٩٧. نسائی. بیوع: ٤٥١٧ (ریاض/ ٤ ز- ٢٧٦ ژ — ٢/١٥٨٠).

[٩] بخاری. بیوع: ٢١٩٦، ٢١٩٨. مسلم. مساقاة: ٣٩٩٥. نسائی. بیوع: ٤٥٣٩.

[١٠] مسلم. بیوع: ٢٨٤٢. أبو داود. بیوع: ٣٣٦٨. ترمذی. بیوع: ١٢٢٧. نسائی. بیوع: ٤٥٦٥

**ئیبنو عومەر** (خوایان لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **نەهی کردووە لە فرۆشتنی خورما بە دارەوە، بەر لەوە کە زەرد یا سوور ببێ، وە لە فرۆشتنی دانەوێڵە لەناو گوڵەکەیدا بەر لەوە کە سپی هەڵگەڕێ و لە دەردو بەڵای ئاسمانی رزگاری ببێ، نەهی کردووە لەم جۆرە سەودایە چ بۆ فرۆشیار چ بۆ کڕیار لە گێڕانەوەیەکدا: نەهی کردووە لە فرۆشتنی ترێ تا رەش دەبێ، وە لە فرۆشتنی دانەوێڵە بە سەوزی تا دەنکەکەی تەواو رەق دەبێ (ش/د/ت/ن — خودایان لێ رازی بێ).**

**١٨١٩– عَنْ جَابِرٍ** (رَضِي اللهُ عَنهُ) **قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ وَالْمُعَاوَمَةِ وَالْمُخَابَرَةِ وَعَنِ الثُّنْيَا وَرَخَّصَ فِي الْعَرَايَا. وَفَسَّرَ بَعْضُ الرُّوَاةِ الْمُحَاقَلَةَ بِأَنَّهَا بَيْعُ الزَّرْعِ بِالْحِنْطَةِ كَيْلاً، وَالْمُزَابَنَةِ بِأَنَّهَا بَيْعُ الرُّطَبِ وَالْعِنَبِ بِالتَّمْرِ وَالزَّبِيبِ كَيْلاً، وَالْمُعَاوَمَةِ بِأَنَّهَا بَيْعُ الشَّجَرِ سِنِينَ، وَالْمُخَابَرَةَ بِأَنَّهَا دَفْعُ الأَرْضِ إِلَى شَخْصٍ لِيَعمَلَ وَيَزْرَعَهَا مَنْ عِنْدِهِ بِبَعْضِ مَا يَخْرُجُ مِنهَا. رَوَاهُ الأربعة[١١].**

**جابیر** (خوای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **نەهی کردووە لە موحاقەلەو موزابەنەو موعاوەمەو موخابەرەو لە ئیستیثنا، وە ڕێگەی عەرایای داوە. هەندێ لەو ڕاوییانە کە ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە راڤەی ئەم وشانە بەم شێوەیە دەکەن، دەڵێن: موحاقەلە با بەکوردی ناوی بنێین: قەرسیلکاریی برێتییە لە فرۆشتنی قەرسیل و شینایی نەدووراوە بەگەنم یا بە دانەوێڵەی تر بە پێوانەیەکی دیاریکراو، وەك ئەمە فرۆشیار بڵێ: ئەم پەڵە قەرسیلەت پێ دەفرۆشم بە سێ تەغار گەنمی سوور جا ئەگەر زیاتری تیابوو زیادەکە بۆ خۆم، ئەگەر کەمی تیابوو کەمەکەیت بۆ تەواو دەکەم!**

---

[١١] بخاری. بیوع: ٢٢٠٧، ٢١٨٦، ٢١٨٧، مسلم. بیوع: ٣٨٨٦، ٣٨٨٨ — ٣٨٩٠. نسائی. إیمان: ٣٨٨٨.

وە دەڵێن: موزابەنە یا بە کوردی ناوی بنێین: بەرسیلەکایی برێتییە لە فرۆشتنی روتاب و ترێ بەسەر دارەوە بە خورماو مێووژ بە پێوانەیەکی دیاریکراو.

وە دەڵێن: موعاوەمە یا لە کوردی خۆماندا زاراوی ساڵکاری بۆ داتاشین برێتییە لە فرۆشتنی درەخت بەوادەی چەن ساڵێ کە وادەکە تەواو بوو دەرەختەکە بیێتەوە بەهی خاوەنە پێشووەکەی.

وە دەڵێن: موخابەرە مڵکانەکاریی = موزارەعە برێتییە لەوە کە یەکێ پارچەیێ زەوی بدا بە کەسێ کە خۆشی بکاو، دایچێنێ بە مڵکانە بە نیوەکاریی، یا بە کەمتر یا بەزیاتر، وە ئیستیثنا (چەرتکردن)یش برێتییە لەوە کە شتێ بفرۆشرێ و بەشێکی نەزانراوی لێ جیابکرێتەوە، وەك ئەوە بڵێ: ئەوا ئەم کۆمەڵە گەنمەم پێ فرۆشتیت هەندێکی نەبێ (ش/د/ت).

١٨٢٠- وَسُئِلَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ شْتِرَاءِ التَّمْرِ بِالرُّطَبِ فَقَالَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَيَنْقُصُ الرُّطَبُ إِذَا يَبِسَ؟ قَالُوا: نَعَمْ. فَنَهَى عَنْ ذَلِكَ. رَوَاهُ اصحاب السنن[١٢].

پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە بارەی کڕینی خورما بە روتاب فەرمووی: ئایا رووتاب کە وشك بوو کەم دەکا یانا؟ گوتیان: ئا کەم دەکا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی لێکرد (د/ت/ن-س/ص).

١٨٢١- عَنْ سَمُرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ بِالْحَيَوَانِ نَسِيئَةً. وَفِي رِوَايَةٍ: الْحَيَوَانُ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ لاَ يَصْلُحُ نَسِيئًا وَلاَ بَأْسَ بِهِ يَدًا بِيَدٍ. رَوَاهُ اصحاب السنن[١٣].

سەموورە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درووی خودای لەسەربێ) نەهی کردووە لە فرۆشتنی زیندەماڵ بە زیندەماڵ، ئەگەر دەست بە دەست نەبێ لە گێڕانەوەیەکا: گیانلەبەر یەك بە دوو دروست نیە ئەگەر دوا بخرێ، بەڵام

---

[١٢] بسند صحيح (شرحه).

[١٣] بسند صحيح (شرحه).

ئەگـەر دەسـت بـە دەسـت بـێ قـەیناکا. (د/ت/ن = ئـەبو داوودو تیرمیـذیو نەسائی. خودایان لێ رازی بێ).

١٨٢٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ عَبْدٌ فَبَايَعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْهِجْرَةِ وَلَمْ يَشْعُرْ أَنَّهُ عَبْدٌ فَجَاءَ سَيِّدُهُ يَطْلُبُهُ فَقَالَ لَـهُ النَّبِـيُّ (صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) بِعْنِيـهِ. فَاشْتَرَاهُ بِعَبْدَيْنِ أَسْوَدَيْنِ ثُمَّ لَمْ يُبَايِعْ أَحَدًا بَعْدُ حَتَّى يَسْأَلَهُ أَعَبْدٌ هُوَ[١٤].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بەندەیێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پەیمانی دایێ لەسەر کۆچکردن، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) نـەیزانی کـە ئـەوە کۆیلەیـە لەپاشـا خاوەنەکـەی هـات داوای کـردەوە، پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێم بیفرۆشە.

جا لـە خاوەنەکـەی کـڕی بـە دوو کۆیلـەی رەش. ئیتر لـەوە پـاش پـەیمانی نەدەدا بەکەس هەتا لێی دەپرسی: خۆتۆ بەندە نیت؟ (م/د/ت/ن –خودایان لێ رازی بێ).

١٨٢٣- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنِ ابْتَـاعَ نَخْلاً بَعْدَ أَنْ تُؤَبَّرَ فَثَمَرَتُهَا لِلَّذِي بَاعَهَا إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ وَمَـنِ ابْتَـاعَ عَبْـدًا فَمَالُـهُ لِلَّذِي بَاعَهُ إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ. رَوَاهُ الخمسة[١٥].

ئیبنـو عومـەر (خوایـان لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) فـەرمووی: کەسـێ دار خورمـای متووربـەگراوی کـڕی ئـەو بـەرە موتوربەکراوەشی بۆ فرۆشیارەکەیە، مەگەر کڕیار مـەرجی ئـەوەی کردبێ کە بۆ خۆی بێ، وە کەسێ بەنـدەیێ بکڕێ، مـاڵی بەندەکە بۆ فرۆشیارە، مەگـەر کڕیار مەرجی کردبێ کە بۆ خۆی بێ! (ش/د/ت/ن – خودایان لێ رازی بێ).

١٨٢٤- وَقَالَ عَلِيٌّ (رَضِي اللّهُ عَنهُ): سَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ عَضُوضٌ يَعَضُّ الْمُوسِرُ عَلَى مَا فِي يَدَيْهِ وَلَمْ يُؤْمَرْ بِذَلِكَ قَـالَ اللّـهُ تَعَـالَى (وَلاَ تَنْسَـوُا الْفَـضْلَ بَيْـنَكُمْ) وَيُبَـايِعُ الْمُضْطَرُّونَ وَقَدْ نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعِ الْمُضْطَرِّ. رَوَاهُ أبو داود[١٦].

---

(١٤) مسلم. مساقاة: ٤٠٨٩. ترمذی. بیوع: ١٢٣٩، ١٥٩٦. أبو داود. بیوع: ٣٣٥٨. نسائی. بیعة: ٤١٩٥، ٤٦٣٥.

(١٥) بخاری. بیوع: ٢٣٧٩. مسلم. بیوع: ٣٨٨٢. ترمذی بیوع: ١٢٤٤. أبو داود. بیوع: ٣٤٣٣، ٤٦٥٠.

عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: مەردوم دەكەونە چەرخێكی رژدو چرووك‌و دەست قووچاوی واوە، تەواو رژدو چرووك دەبن‌و پیسكەو پارە پەرست دەردەچن، وە كەسیش پێی نەگوتوون كە وابن، ئەوەتانێ بە پێچەوانەوە خودای گەورە دەفەرموێ:

{وَلاَ تَنسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ /٢٣٧}.

واتە: هەرگیز پیاوەتی‌و بەخشش لەناو خۆتانا فەرامۆش مەكەن.

جا لەو زەمانەیەدا شت لە پیاوی ناچاری داماو دەكڕن بە هەرزانتر لە نرخی خۆی وەلحاڵ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نەهی كردووە لە كڕینی شت لەو كەسانەی كە لەبەر ناچاری‌و لێقەوماویی ماڵی خۆیان تاڵان فرۆش دەكەن![(١)] (د-سند ضعيف).

١٨٢٥- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الْوَالِدَةِ وَوَلَدِهَا فَرَّقَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَحِبَّتِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[(١٧)].

ئەبو ئەیوب (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر كەسێ لە دنیادا دایك‌و بەچكە لەیەكتر دابڕێ‌و لەیەك دوور بخاتەوە، خوداش لە رۆژی قیامەتا ئەو دوور دەخاتەوە لە دۆست‌و خۆشەویستانی خۆی! (ت-س/ح).

---

(١٦) بسند ضعيف ولكن للترهيب (شرحه).

(١)

به چاوی خۆم دیم نەك بەقسەی خەڵك
مەڕێكیان دەدا بە بارێ بەلەك
تابارە بۆریش تاڵانی نەیبات
كردی بە پەردووی دارە رای دەستەك

(١٧) بسند حسن (شرحه).

١٨٢٦- وَقَالَ عَلِيّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) وَهَبَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غُلاَمَيْنِ أَخَوَيْنِ فَبِعْتُ أَحَدَهُمَا فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا عَلِيُّ مَا فَعَلَ غُلاَمُكَ. فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ: رُدَّهُ رُدَّهُ[١٨].

عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دوو بەندەی بە خەڵات پێدام، هەردووکیان برابوون، منیش یەکێکیانم فرۆشت، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێم: ئەی عەلی! خوڵامەکەی ترت چی لێ هات؟ منیش عەرزیم کرد: فرۆشتم. فەرمووی: سەوداکە هەڵوەشێنەرەوە سەوداکە هەڵوەشێنەرەوە (ت-س/ح).

١٨٢٩- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَبِيعُوا الْمُغَنِّيَاتِ وَلاَ تَشْتَروهُنَّ وَلاَ تُعِلّمُوهُنَّ وَلاَ خَيرَ، تِجَارَةٌ فِيهِنَّ وَأَكْلُ أَثْمَانِهِنَّ حَرَامٌ فِي مِثْلِهِ نَزَلَتْ (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِى لَهْوَ الْحَدِيثِ) الآية. روى الثلاثة الترمذى[١٩].

ئەبو ئومامە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نەکەنیزەکی گۆرانی بێژ بفرۆشن و نەبیانکڕن و نەفێری خوێندەوارییان بکەن و نە بازرگانییان پێوە بکەن، وە بەهاشیان حەرامە، لە شانی ئەم جۆرە شتەدا ئەم ئایەتە دابەزیوە:

(وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِى لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ).

هەندێ کەس قسەی پڕو پووچ و بەتاڵ دەکڕن و دەیخوێندنەوە بەسەر خەڵکدا بۆ ئەوە لە ڕێگەی ڕاست دووریان بخەنەوەو ئایەتەکانی خوداو ڕێگەی ڕاستی دین بکەن بە گاڵتەجاڕی، بەبێ ئەوەی کە بزانن مامەڵەی وا

---

[١٨] بسند حسن (شرحه).

[١٩] بسند ضعيف (شرحه).

پیاوی زاناو دانا نایکا، جا ئەم جۆرە کەسانە لە پاشەرۆژدا سزایەکی ریسواکەریان بۆ هەیە (ت- سند ضعیف).

١٨٣٠- عَنْ عُمَرُ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللّهِ، فَرَأَيْتُهُ يُبَاعُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: لاَ تَشْتَرِهِ، وَلاَ تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ. رَوَاهُ الشيخان[٢٠].

عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەسپێکم بەخێر دا بەپیاوێ لە غەزادا سواری دەبوو رۆژێ دیم دەیفرۆشت، ویستم لێی بکڕمەوە لە پێغەمبەرم پرسی فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): مەیکڕەرەوەو شتت کە بەخشی چاوت لە دووی نەبێ! (ش = بوخاری‌و موسلیم).

١٨٣١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ وَتَرَكْتُمُ الْجِهَادَ سَلَّطَ اللّهُ عَلَيْكُمْ ذُلاًّ لاَ يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ. رَوَاهُ أبو داود وسكت عنه والله أعلم[٢١].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکاتێ شتتان کڕی بە قەرزو دەست بەجێ فرۆشتتانەوە بە فرۆشیارەکە بە نەختی بەڵام بەهەرزانتر، وە کەوتنە شوێن کلکی گاو گۆتاڵ‌و دەستتان دایە کشتوکاڵ‌و ماڵداریی‌و وازتان هێنا لە غەزاکردن‌و خەباتگێڕان واتە: هەر کاتێ دەستتان کرد بە فرۆفێڵ‌و تەڵەکەبازی‌و لە پێناوی کۆکردنەوەی ریتەو پیتەو پڕوپاتاڵی جیهاندا لە شەقامەرێی شەریعەت لاتان داو پەلاماری حیلە شەرعی کۆلکە مەلایانتان داو وازتان لە کۆشش‌و تێکۆشان بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام هێنا، هەر کاتێ ئەمە حاڵتان بوو،

---

[٢٠] بخاری. زكاة: ١٤٩٠، ٢٦٢٣، ٢٦٣٦، ٢٩٧٠، ٣٠٠٣. مسلم. هبة: ٤١٣٩ — ٤١٤٥.

[٢١] سكت عنه أبو داود. ولكن قال المؤلف شرحه على التاج الجامع للأصول: (لكنه ضعيف لوجود إسحاق الخراسانى وعطاء الخراسانى فى سنده (شرحه).

ئەوکاتــە خــودا دووچــاری کەساســی و ژێردەســتەییتان دەکــا، جــا هــەتا نەگەڕێنەوە بۆ باوەشی ئیسلام خودا ئەو بەرگی کەساسی و ژێر دەستەییە کە وەك کاڵا بە بەرتان بڕاوە لە بەرتانی داناکەنێ! (ئەبو داوود (خودای لێ ڕازی بێ) ئەم حەدیثەی ریوایەت کردووە، وە لە بارەی سەنەدەکەیەوە بێ دەنگ بووە).

١٨٣٢- وللترمذی: (كَمَا هُوَ مذكو فى الشرح) إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ أَوْ يَبْتَاعُ فِي الْمَسْجِدِ فَقُولُوا: لاَ أَرْبَحَ اللَّهُ تِجَارَتَكَ فَظَاهِرَه: أَنَّ الْبَيْعِ وَالشِّرَاءِ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامَ وَباطل وعليه بعضهم لأن المسجد بنى للعبادةِ فَقَطْ- شرحه[٢٢].

لــە شــەرحەکەدا دەڵێ: تیرمیــذی ریوایــەت دەکــا حــەزرەت (درووودی خودای لەسەربێ) دەفــەرموێ: ئەگــەر دیتــان کەســێ لــەناو مزگــەوتا شــتی دەفرۆشــت یــا شتی دەکڕی پێی بڵێن: خــودا ســەوداکەت مایە پوچکابۆت. شــاریح کــە هــەر مامۆستای دانەر خۆیــەتی لــە شــەرحەکەدا دەڵــێ: وا دەردەکــەوێ بەپێی ئەمــە کە کڕین و فرۆشتن لەناو مزگەوتدا حەرام و پووچ بێ چونکە مزگەوت تەنیا بۆ خودا پەرستی دروست کراوە و بەس.

## ١٥٣) باسی بەیعولعەرایا (فرۆشتنی دارە دۆخە) و باسی شت هەڕاجکردن (مەزات): (بيع العرايا والمزايدة)

١٨٣٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَطِيبَ، وَلاَ يُبَاعُ شَيْءٌ مِنْهُ إِلاَّ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ إِلاَّ الْعَرَايَا. رَوَاهُ البخاری وأبو داود[١].

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) نــەهی کــردووە لە فرۆشتنی بەری دارو درەخت تا خۆش نەبێ و بە کەڵکی خواردن نــەیێ، وە

---

[٢٢] سکت عنه.

[١] بخاری. بیوع: ٢١٨٩. مسلم. بیوع: ٣٨٤٩.

**هیچی لێ نافرۆشرێ مەگەر بەپارە، جگە لە عەرایا بەڵام عەرایا (واتە: دارە دۆخە) دروستە بەرەکەی بفرۆشرێ بە خورما، عەرایا ئەوەیە کە دەوڵەمەندێ دارێ، دوان دەدا بە هەژارێ، تا بەرەکەی بخواو لە پاشا دارەکە هی خۆیەتی، جا لەپاشا بۆ بارسووکی بەرەکەی لێ دەکڕێتەوە بە خورما ئەگەر هەردوو لا هەوەسیان هەبوو (ب/د).**

**١٨٣٤– عَنْ سَهْلُ بْنُ أَبِى حَثْمَةَ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ وَقَالَ ذَلِكَ الرِّبَا تِلْكَ الْمُزَابَنَةُ. إِلاَّ أَنَّهُ رَخَّصَ فِى بَيْعِ الْعَرِيَّةِ النَّخْلَةِ وَالنَّخْلَتَيْنِ يَأْخُذُهَا أَهْلُ الْبَيْتِ بِخَرْصِهَا تَمْرًا يَأْكُلُونَهَا رُطَبًا**[٢].

**سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **نەهی کردووە لە فرۆشتنی بەر بە دار خورماوە بە خورمای وشك، وە فەرمووی: ئەوە سوودە، وە بەم جۆرە سەودایە دەگوترێ موزابەنە، بەڵام حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **رێگەی بەیعولعەرایای داوە، کە برێتییە لە یەك دوو دارخورما دەوڵەمەندێ دەیدا بە ماڵێکی هەژار بەرەکەی بخۆن، لە پاشا بۆ بارسووکیی هەر دوولا، خاوەنەکەی دەیخەملێنێ بە خورماو لێی دەکڕێتەوەو بەقەد خەمڵەکە خورمای دەداتێ جا خۆی بە رووتابی دەیخوا (ش/د/ت/ن** — خودایان لێ رازی بێ**).**

**١٨٣٥– عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **أَنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **رَخَّصَ فِى بَيْعِ الْعَرَايَا فِى خَمْسَةِ أَوْسُقٍ أَوْ دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ. رواهما الخمسة**[٣].

---

[٢] بخاری. بیوع: ٢١٩١، ٢٣٨٤. مسلم. بیوع: ٣٨٦٤. أبو داود. بیوع: ٣٣٦٣. ترمذی. بیوع: ١٣٠٣. نسائی. بیوع: ٤٥٥٦، ٤٥٥٧، ٤٥٥٨.

[٣] بخاری. بیوع: ٢١٩٠، ٢٣٨٢. مسلم. بیوع: ٣٨٦٩. أبو داود. بیوع: ٣٣٦٤. ترمذی. بیوع: ١٣٠١. نسائی. بیوع: ٤٥٥٥.

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی فرۆشتنی دارە بەدۆخە (عەرییە)ی داوە، بە مەرجێ لە پێنج ویسق تێ نەپەڕێ (ش/د/ت/ن).

١٨٣٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَاعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِلْسًا وَقَدَحًا قَالَ: مَنْ يَشْتَرِى هَذَا الْحِلْسَ وَالْقَدَحَ؟ فَقَالَ رَجُلٌ: أَخَذْتُهُمَا بِدِرْهَمٍ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ يَزِيدُ؟ فَأَضعْطَاهُ رَجُلٌ دِرْهَمِيْنِ فَبَاعَهُماَ مِنْهُ. رَوَاهُ الترمذى وحسنه والله أعلى وأعلم[٤].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) ژێر کۆپانێک و جامێکی هەراج کردو فەرمووی: کێ ئەم ژێر کۆپان و جامەیە دەکڕێ؟ پیاوێ گوتی: من دەمەوێن بە درەمێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کێ زیاتر دەدا جا پیاوێکی تر دوو درەمی دایە، پێغەمبەریش بەوی فرۆشتن (ت:ح).

## ١٥٤) باسی پێنجەم: باسی سوود (ریبا)و باسی پارەگۆڕینەوە

## الباب الخامس: في الربا والصرف

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَمْحَقُ اللّهُ الْرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ}.

خودا سود بێ پیت و بەرەکەت دەکاو ماڵی سوود لە خوداوە خێرناداتەوە، بەڵام ماڵێ کە خێرو خێراتی لێ بکرێ و زەکاتی لێ بدرێ خودای گەورە زۆری دەکاو نەشو نمای پێ دەکا، وەشتێکی دیارو ئاشکرایە کە خودا خۆشی نایێ لەوانەی کە بێ باوەڕو تاوانبارن و لەسەر کوفرو تاوانی خۆیان بەردەوام دەبن و تەوبەی لێ ناکەن.

---

[٤] حسن عند الترمذى.

١٨٣٧- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَثَمَنِ الدَّمِ، وَنَهَى عَنِ ثَمَنِ الْوَاشِمَةِ وَالْمَوْشُومَةِ، وَآكِلِ الرِّبَا، وَمُوكِلِهِ، وَلَعَنَ الْمُصَوِّرَ. رَوَاهُ البخاري[1].

ئەبو جوحەیفە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی نەداوە بەهای سەگ و بەهای خوێن و کرێی خاڵکوت وەربگیرێ، وە ڕێگەی نەداوە ژن خاڵ بکوتێ بۆ خۆی، هەروەها ڕێگەی سوود خۆرو سووددەری نەداوە، وە نەفرین و لەعنەتیشی کردووە لە وێنەگر (ب = بوخاری - خوای گەورەی لێ ڕازی بێ).

١٨٣٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) لَعَنَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) آكِلَ الرِّبَا وَمُوكِلَهُ وَكَاتِبَهُ وَشَاهِدَيْهِ وَقَالَ هُمْ سَوَاءٌ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذي[2].

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەفرینی کردووە لەمانە: لە سوود خۆرو لە سوود وەرگرو لەو کەسە دەینووسێ و لەو کەسەش دەبێ بە شایەتی، وە فەرمووی: ئەمانە هەموویان لە تاوانباریدا چون یەکن (م/د/ت).

١٨٤٠- عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: اِلْتَمَسْتُ صَرْفًا بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَدَعَانِي طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ فَتَرَاوَضْنَا، حَتَّى اصْطَرَفَ مِنِّي، فَأَخَذَ الذَّهَبَ يُقَلِّبُهَا فِي يَدِهِ، ثُمَّ قَالَ: حَتَّى يَأْتِيَ خَازِنِي مِنَ الْغَابَةِ، وَعُمَرُ يَسْمَعُ ذَلِكَ، فَقَالَ وَاللَّهِ لاَ تُفَارِقُهُ حَتَّى تَأْخُذَ مِنْهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ. رَوَاهُ الخمسة[3].

---

[1] بخاری. بیوع: ٢٢٣٨.

[2] مسلم. مساقاة: ٤٠٦٩. (ریاض/ ٤ز: ٢٨٧ ژ: /١٦١٥).

[3] بخاری. بیوع: ٢١٣٤، ٢١٧٠، ٢١٧٤. مسلم. مساقاة: ٤٠٣٥. أبو داود. بیوع: ٣٣٤٨. ترمذی. بیوع: ١٢٤٣. نسائی. بیوع: ٤٥٧٢.

مالیکی کوڕی ئەوس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ویسم سەد دیناری زێڕ بگۆڕمەوە بە درەمێ زیو، طەلحەی کوڕی عەبدوڵلا بانگی کردم و سەودامان بڕییەوەو ڕێککەوتین لەسەر گۆڕینەوە، جا طەلحە زێڕەکەی لە من وەرگرت و لە دەستیائەم دیوو ئەو دیوی پێ دەکرد، ئینجا گوتی: باکلیلدارەکەم لە جەنگەڵەکە بێتەوە زیوەکەت دەداتێ، عومەریش گوێی لێبوو، گوتی: بەخودا لێی جیا نابێتەوە تا زیوەکەی لێ وەرنەگریت. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: زێڕ بە زێڕ دەست بە دەست نەبێ سوودە، گەنم بە گەنم دەست بە دەست نەبێ سوودە، جۆ بە جۆ دەست بە دەست نەبێ سوودە، خورما بە خورما دەست بە دەست نەبێ سوودە. (ش/د/ت/ن).

١٨٤١- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الذَّهَبِ بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ بِالْفِضَّةِ وَالْبُرِّ بِالْبُرِّ وَالشَّعِيرِ بِالشَّعِيرِ وَالتَّمْرِ بِالتَّمْرِ وَالْمِلْحِ بِالْمِلْحِ مِثْلاً بِمِثْلٍ سَوَاءً بِسَوَاءٍ يَدًا بِيَدٍ فَإِذَا اخْتَلَفَتْ هَذِهِ الأَصْنَافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ. وَزَادَ فِي رِوَايَةٍ: فَمَنْ زَادَ أَوِ اسْتَزَادَ فَقَدْ أَرْبَى الآخِذُ وَالْمُعْطِي فِيهِ سَوَاءٌ. رَوَاهُ الخمسة. ولفظ أبى داود: الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ تِبْرُهَا وَعَيْنُهَا وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ تِبْرُهَا وَعَيْنُهَا[٤].

عوبادەی کوڕی صامیت (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: زێڕ بە زێڕو زیو بە زیوو گەنم بە گەنم و جۆ بە جۆو خورما بە خورما و خوێ بە خوێ دەبێ دەق بە دەق یەك بن و دەست بە دەست بن، ئەگینا ئەگەر وانەبوو وەك کەم بە زۆر یا حازر بە نا حازر ئەوە دەبێ بە سوود، بەڵام ئەگەر هەردوو شتەکە لە چەشنی یەك نەبوون وەك گەنم بە جۆ، یا زێڕ بە زیو چۆن ئارەزوو دەکەن ئاوا بیفرۆشن، بە مەرجێ دەست بە دەست بێ، لە گێڕانەوەیەکا ئەمەی پتر کردووە: ئیتر ئەوەی زیاتر بدا یا زیاتر وەرگرێ ئەوە سوود خۆرە، وە لە تاواندا سوود خۆرو سووددەر چون یەکن

---

[٤] مسلم. مساقاة: ٤٠٣٧. أبو داود. بيوع: ٣٣٤٩. ترمذى. بيوع: ١٢٤٠.

(ش/د/ت/ن) گفتەی (د) ئاوایە: زێڕ بە زێڕ، چ زێڕی خاو بێ چ سکە لێ دراو، وە زیو بە زیو چ زیوی خاو بێ چ سکە لێ دراو.

١٨٤٢- عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعِ الصُّبْرَةِ مِنَ التَّمْرِ لاَ يُعْلَمُ مَكِيلَتُهَا بِالْكَيْلِ الْمُسَمَّى مِنَ التَّمْرِ. رَوَاهُ مسلم والنسائى[٥].

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جڵەوگیری (نەهی)ی کردووە لە فرۆشتنی کۆمەڵێ خورما لە گوترە بە ئەندازەیێ خورمای تر کە پێوانەی زانراوی بێ وەك ئەوە گەلێ کەس دەڵێن: ئەم کۆمەڵە گەنمە کە هێشتا نە پێوراوە لەسەر من بە بە بیست ربە (م/ن).

١٨٤٣- عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ الْبَرَاءَ الصَّرْفِ فَقَالَ: سَلْ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ فَهُوَ أَعْلَمُ. فَسَأَلْتُ زَيْدًا فَقَالَ: سَلِ الْبَرَاءَ فَإِنَّهُ أَعْلَمُ ثُمَّ قَالاَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعِ الْوَرِقِ بِالذَّهَبِ دَيْنًا. رَوَاهُ مسلم والبخارى. ولفظه: إِنْ كَانَ يَدًا بِيَدٍ فَلاَ بَأْسَ، وَإِنْ كَانَ نَسِيئَةً فَلاَ[٦].

ئەبو مینهال (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە بارەی پارەگۆڕینەوە بە پارەی تر لە بەرائم پرسی، گوتی: لە زەیدی کوڕی ئەرقەم بپرسە ئەو باشتری لێ دەزانێ، کە لە زەیدم پرسی ئەویش گوتی: لە بەراء بپرسە، ئەو باشی لێ دەزانێ، لە پاشا هەردووکیان گوتیان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی کردووە لە فرۆشتنی زیو بە زێڕ بە قەرز (م/ب) گفتەی (ب): ئەگەر دەست بە دەست بێ قەیناکا، بەڵام ئەگەر دەست بە دەست نەبوو نابێ.

١٨٤٤- وَقَالَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) كُنْتُ أَبِيعُ الإِبِلَ بِالْبَقِيعِ فَأَبِيعُ بِالدَّنَانِيرِ فَأَخُذُ مَكَانَهَا الْوَرَقَ وَأَبِيعُ بِالْوَرَقِ فَأَخُذُ مَكَانَهَا الدَّنَانِيرَ فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوَجَدْتُهُ خَارِجاً مِنْ بَيْتِ حَفْصَةَ فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ بِالْقِيمَةِ. رَوَاهُ

---

[٥] مسلم. بيوع: ٣٨٢٩. نسائى. بيوع: ٤٥٦١.

[٦] بخارى بيوع: ٢٠٦١، ٢٠٦٠، ٢١٨٠، ٢٤٩٧، ٢١٣٩، ٢١٨١، ٢٤٩٨، ٢٩٤٠. مسلم. مساقاة: ٤٠٤٧. نسائى. بيوع: ٤٥٨٩، ٤٥٩٠، ٤٥٩١.

أصحاب السنن ولفظ أبی داود: لاَ بَأْسَ أَنْ تَأْخُذَهَا بِسَعْرِ يَوْمِهَا مَا لَمْ تَفْتَرِقَا وَبَيْنَكُمَا شَيْءٌ. والله أعلم[٧].

**ئیبنو عومەر** (خوایان لێ رازی بێ) **گوتی: جاران لە بەقیع وشترم دەفرۆشت رێ دەکەوت دەمفرۆشت بە دیناری زێڕ بەڵام درەمی زێوم لە جیاتیی وەردەگرت، وە رێ دەکەوت بە پێچەوانەوە، جا چووم بۆ لای پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **روانیم لەماڵی حەفصەوە هاتە دەرێ جا کە ئەمەم لێ پرسی، فەرمووی: ئەمە قەیناکا بەڵام هەرشتە بە نرخی خۆی (د/ت/ن - حدیث ضعیف) گفتەی (د) ئاوایە: قەیناکا ئەگەر بەنرخی رۆژ وەری بگرێ، بەو مەرجەی کە لە پێش ئەوەدا کە لەیەك جیا دەبنەوە هیچیان لە نێواندا نەمێنێ.**

### ١٥٥) فرۆشتن بە قەرز دروستە: (يجوز البيع إلى أجل)

١٨٤٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اشْتَرَى طَعَامًا مِنْ يَهُودِيٍّ إِلَى أَجَلٍ، وَرَهَنَهُ دِرْعًا مِنْ حَدِيدٍ. رَوَاهُ الشيخان والنسائی[١].

**لە عائیشەوە** (خوای لێ رازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **هەندێ جۆی بە قەرز لە پیاوێکی جوولەکە کڕی بۆ ماوەیەکی ناوبراو، وە زریەیەکی ئاسنینی بە بارمتە لەلا دانا تا پارەکە دەدات! (ش/ن).**

١٨٤٦- وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَوْبَانِ قِطْرِيَّانِ غَلِيظَانِ فَكَانَ إِذَا بَعَدَ فَعَرِقَ ثَقُلاَ عَلَيْهِ فَقَدِمَ بَزٌّ مِنَ الشَّامِ لِفُلاَنٍ الْيَهُودِيِّ. فَقُلْتُ: لَوْ بَعَثْتَ إِلَيْهِ فَاشْتَرَيْتَ مِنْهُ ثَوْبَيْنِ إِلَى الْمَيْسَرَةِ. فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَقَالَ: قَدْ عَلِمْتُ مَا تُرِيدُ إِنَّمَا

---

[٧] حديث ضعيف (شرحه).

[١] بخاری. بيوع: ٢٠٦٨، ٢٠٩٩٠٠، ٢٢٥١، ٢٢٥٢، ٢٣٨٦، ٢٥٠٩، ٢٥١٣، ٢٩١٦، ٤٤٦٧. مسلم. مساقاة: ٤٠٩٠، ٤٠٩١. نسائی. بيوع: ٤٦٢٣، ٤٦٦٤.

تُرِيدُ أَنْ تَذْهَبَ بِمَالِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَذَبَ قَدْ عَلِمَ أَنِّي مِنْ أَتْقَاهُمْ لِلَّهِ وَأَدَّاهُمْ لِلأَمَانَةِ. رَوَاهُ النسائى والترمذى وصححه[٢].

دیسان عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دوو بەرگی شاڵی ئەستوری هەبوون، کە دەچوون بە لایەکا، کە ئارەقی دەکرد قورس دەبوون لە بەریدا.

تا ڕۆژێ لە شامەوە فیسارە جوو کووتاڵی هێنا، منیش عەرزیم کرد، بۆ نانێریت بۆ لایدەستێ جلی بە قەرز لێ بکڕیت، تا کاتی دەست ڕۆیین!

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) ناردی بۆ لای، کەچی جووە گوتبووی: دەزانم چیت دەوێ: دەتەوێ ماڵەکەم ببەیت و نەیدەیتەوە.

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: درۆ دەکا، باش باش دەزانێ کە من لە هەموو کەس باشتر لە خودا دەترسم و لە هەموو کەسیش باشتر سپاردە (ئەمانەت) دەدەمەوە (د/ت: ص= نەسائی و تیرمیذی ریوایەتیان کردووە وە تیرمیذی بە صەحیحی داناوە).

**١٥٦) باسی شەشەم: باسی سەلەم: (الباب السادس: في السلم)**

١٨٤٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِي الثِّمَارِ السَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ فَقَالَ: مَنْ أَسْلَفَ فِي تَمْرٍ. وَفِي رِوَايَةٍ: فِي شَيْءٍ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مُلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ. رَوَاهُ الخمسة[١].

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە خەڵك بە سەربەری دارو درەخت و شینایی سەلەمیان دەکرد بۆ ماوەی یەك دوو ساڵ.

---

[٢] صحيح عند الترمذى.

[١] بخارى. ملم: ٢٢٣٩، ٢٢٤٠، ٢٢٤١، ٢٢٥٣، ٢٢٤٠. مسلم. مساقاة: ٤٠٩٥ — ٤٠٩٧. أبو داود. بيوع: ٣٤٦٣. ترمذى. بيوع: ١٣١١. نسائى. بيوع: ٤٦٣٠.

جا فەرمووی: هەر کەسێ سەلەم بەسەر خورما دەکا لە گێڕانەوەیەکا: هەر کەسێ سەلەم بەسەر شتێ دەکا با ئەندازەی شتە سەلەم بەسەر کراوەکە دیاریبێ یا کێشانەی بزانرێ، هەروەها بۆ ماوەی چەندیشە ناوبرێ (ش/د/ت/ن – خودایان لێ رازی بێ).

١٨٤٨- قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي الْمُجَالِدِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) بَعَثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ شَدَّادٍ وَ أَبُو بُرْدَةَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) فَقَالاَ: سَلْهُ هَلْ كَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي عَهْدِهِ يُسْلِفُونَ فِي الْحِنْطَةِ؟ قَالَ: عَبْدُ اللَّهِ كُنَّا نُسْلِفُ نَبِيطَ أَهْلِ الشَّأْمِ فِي الْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالزَّيْتِ، فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ. قُلْتُ إِلَى مَنْ كَانَ أَصْلُهُ عِنْدَهُ؟ قَالَ: مَا كُنَّا نَسْأَلُهُمْ عَنْ ذَلِكَ، ثُمَّ بَعَثَانِي إِلَى ابْنِ أَبْزَى فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: نَعَمْ وَمَا كُنَّا نَسْأَلُهُمْ أَلَهُمْ حَرْثٌ أَمْ لاَ. رَوَاهُ البخاری وأبو داود والنسائی[٢].

موحەممەدی کوڕی ئەبو موجالید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: عەبدوڵڵای کوڕی شەدداد و ئەبو بوردە ناردمیان بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا، گوتیان لێی بپرسە ئایا جاران یارانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر خۆی و رەزای خودا لە یارانی) بەسەرینی حەزرەت خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) سەلەمیان بەسەر گەنم دا دەدا یا نا؟ گوتی: بەڵێ جاران پارەمان بە سەلەم دەدا بە جووتیارەکانی شام بە سەرگەنم و جۆ و رۆن و زەیتوون، بە پێوانەیەکی دیاری تا ماوەیەکی دیاری.

گوتم: باشە پارەکەتان دەدا بەو کەسانە کە بنک و بنەتۆوی ئەوشتانەیان هەبوو؟ گوتی: پرسیاری ئەوەمان لێ نەدەکردن.

لە پاشا ناردمیشیان بۆ لای ئیبنو ئەبزا لەویشم پرسی ئەویش گوتی: ئا سەلەممان دادەدا وە نەشمان دەپرسی لێیان: ئایا کشتوکاڵتان هەیە یا نا؟ (ب/د/ن).

---

[٢] بخاری. سلم: ٢٢٤٢، ٢٢٤٤، ٢٢٥٥، ٢٢٤٣، ٢٢٤٥، ٢٢٥٤.

١٨٤٩- ولأبي داود وابن ماجه: مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَلاَ يَصْرِفْهُ إِلَى غَيْرِهِ. والله أعلم[٣].

ئەبو داوودو ئیبنو ماجە (خوای لێ رازی بێ) ریوایەت دەکەن: حەزرەت (درووودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: هەر کەسێ سەلەمی دادا بەسەر شتێ نەیدا بە کەسێکی تر تا خۆی وەری نەگرێ.

## ١٥٧) باسی بارمتە (رەهن): (الرهن)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِن كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُواْ كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ}.

{صَدَقَ اللهُ العَظِيمُ}

ئەگەر لەکاتی مامەڵەکردنتاندا (لەسەر قیمەتێ کە حازر نەبوو) لە سەفەردا بوون، میرزاتان دەست نەکەوت، ئەوە بەرژەوەندی ئێوە گرەوێ وە بارمتەیەکە وەری بگرن‌و لە دەستتانا بمێنێتەوە هەتا هەقەکەتان دەدەنێ.

١٨٥٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: تُوُفِّيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَدِرْعُهُ مَرْهُونَةٌ بِعِشْرِينَ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ أَخَذَهُ لأَهْلِهِ. رَوَاهُ الترمذي وصححه[١].

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) کاتێ وەفاتی کرد زرێیەکی هەبوو، داینابوو لە بارمتەدا، لە جیاتی بیست مەن خۆراك کە وەری گرتبوو بۆ بژێوی خێزانەکەی (ت:ص).

١٨٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الظَّهْرُ يُرْكَبُ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا وَلَبَنُ الدَّرِّ يُشْرَبُ إِذَا كَانَ مَرْهُوناً وَعَلَى الَّذِي يَرْكَبُ وَيَحْلِبُ النَّفَقَةُ. رَوَاهُ الترمذي والبخاري وأبو داود[٢].

---

[٣] سكت عنه الشارح

[١] صحيح عند الترمذي: (رياض/ ٢ز: ٥٦ ژ: ٥٠٤/١٤).

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربێ) فەرمووی: وڵاخێ سواری (ئەگەر لە بامتەدا دانرابێ) دروستە سواری ببێ، وە ئاژەڵی شیرداریش (ئەگەر لە بارمتەدا دانرابی) دروستە بارمتە وەرگر شیرەکەی بخواتەوە، وە مەسرەفیش لەسەر ئەو کەسەیە کە سوار دەبێ یا شیرەکە دەخواتەوە! (ت/ب/د- خودایان لێ ڕازی بێ).

## ١٥٨) بەش هەڵگرتنەوە (شوفعە): (الشفعة)

**١٨٥٢**- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَضَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ مَالٍ لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ فَلاَ شُفْعَةَ. رَوَاهُ الخمسة ولفظ مسلم: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ شِرْكَةٍ لَمْ تُقْسَمْ رَبْعَةٍ أَوْ حَائِطٍ. لاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَبِيعَ حَتَّى يُؤْذِنَ شَرِيكَهُ فَإِنْ شَاءَ أَخَذَ وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ فَإِذَا بَاعَ وَلَمْ يُؤْذِنْهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ[1].

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) شوفعة (بەشی هاوبەش و هاوسا هەڵگرتنەوە)ی داناوە، لە هەموو شتێکا کە هاوبەشی بێ و هێشتا دابەش نەکرابێ، بەڵام ئەگەر شتەکە جیاکرایەوەو سنوور دانراو توخوب نیشانە کراو ڕێگەوبان دیاری کرا ئیترهەقی شوفعەی بەسەرەوە نامێنێ (ش/د/ت/ن) گفتەی (م): پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) شوفعەی داناوە لە هەموو شتێکی هاوبەشی بەش نەکراودا، چ خانوو بێ، چ باخ، دروست نیە هاوبەش بیفرۆشێ تا هاوبەشەکەی ئاگادار نەکاتەوە، جا هاوبەشەکەی بە ئارەزووی خۆیەتی حەزکا بەشەکەی ئەویش هەڵدەگرێتەوە حەزیش کا نایەوێ، بەڵام ئەگەر بەبێ ئاگاداریی ئەو فرۆشتی ئەوە بۆ ئەو لە پێشترە!

---

[2] بخاری. رهن: ٢٥١١، ٢٥١٢.

[1] بخاری. شفعة: ٢٢٥٧. مسلم. شفعة: ٤١٠٤. أبو داود. بیوع: ٣٥١٣. نسائی. بیوع: ٤٦٦٠.

١٨٥٣- عَنْ أَبِي رَافِعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: الْجَارُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلما. ولفظ النسائي: جَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرْضِي لَيْسَ لأَحَدٍ فِيهَا شَرِكَةٌ وَلاَ قِسْمَةٌ إِلاَّ الْجُوَارَ. فَقَالَ: الْجَارُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ[٢].

**ئەبو رافیع** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو** (دروودی خودای لەسەربێ): **دراوسێ شایانترەو لە پێشترە بە لاتەنیشتی خۆی! (ب/د/ت/ن) گفتەی (ن): پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! زەوییەکم هەیە نە هاوبەشی کەسی پێوەیە نە بەشی کەسی تێدایە، جگە لە دراوسێتی، مافی کەسی تری پێوە نیە، فەرمووی: دراوسێ لە پێشترە بۆ لاتەنیشتی خۆی تا کەسێکی تر!**

١٨٥٤- عَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: جَارُ الدَّارِ أَحَقُّ بِدَارِ الْجَارِ أَوِ الأَرْضِ[٣].

**سەموورە** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: دراوسێی خانوو بە خانووی دراوسێ لە بەرترە، وە هەروەها هاوسای زەویش لەبەرترە بە زەوی هاوسا (د/ت/ن-ح/ص).**

١٨٥٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْجَارُ أَحَقُّ بِشُفْعَةِ جَارِهِ يُنْتَظَرُ بِهَا وَإِنْ كَانَ غَائِبًا إِذَا كَانَ طَرِيقُهُمَا وَاحِدًا. رواهما أصحاب السنن[٤].

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: دراوسێ لە پێشترە بە هەڵگرتنەوەی زەوی دراوسێ، بە مەرجێ ڕێگەی هەردوولا یەك بێ، ئەگەر دراوسێ حازریش نەبێ دەبێ چاوەنواڕیی بکرێ تا حازر دەبێ (د/ت/ن-ح/ح).**

---

[١] بخاری. شفعة: ٢٢٥٨، ٦٩٧٧، ٦٩٧٨، ٦٩٨٠، ٦٩٨١.

[٢] بسند صحيح (شرحه).

[٤] بسند حسن (شرحه).

١٨٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَمْنَعُ جَارٌ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَهُ فِي جِدَارِهِ. ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: مَا لِي أَرَاكُمْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ وَاللّٰهِ لأَرْمِيَنَّ بِهَا بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ. رَوَاهُ الثلاثة والله تعالى أعلى وأعلم[٥].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ڕێگەی دراوسێ بدەن کە سەری دەستەك و گوێسەوانە لەسەر دیوارتان دابنێن لە پاشا ئەبو هورەیرە گوتی: ئەوە بۆچی دەتانبینم لووتەلان لەم فەرمایشتە! دەسا بە یەزدانی پاك خۆشیتان بێ و ترشیتان بێ، من ئەرکی سەرشانی خۆم بەجێ دەێنم و ئەم فەرمایشتت و ڕاسپێرییانە وەك گوڵمێخ دەیکوتم بە ناوشانتانا (ش/د).

## ١٥٩) باسی حەوتەم: باسی بەکرێدان: (الباب السابع: في الإجارة)

{قَالَ:اللّٰهُ تَعَالَى – يَحْكِي قَوْلَ شُعَيْبٍ لِمُوسى عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ:- إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللّٰهُ مِنَ الصَّالِحِينَ}.

خودای گەورە گوفتوگۆکەی نێوانی پێغەمبەر شوعەیب و پێغەمبەر مووسا (دروودی خوا لەسەر پێغەمبەری خۆمان و ئەوانیش بێ) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: شوعەیب پێغەمبەر فەرمووی بە مووسا: ئەی مووسا! دەمەوێ یەکێ لەم دوو کچەی خۆمت لێ مارە بکەم، بە مەرجێ ئەوە هەشت ساڵ کارم بۆ بکەیت و ئەرکی ئاژەڵ و ماڵەکەم بەڕێوە بەری، ئەگەر هەشتەکەیشت کرد بە دە، ئەوە پیاوەتی خۆتەو کارێکی مرۆڤانەیە دەیکەی لەگەڵماو من زۆرت لێ ناکەم و نامەوێ زەحمەتت بدەم بە تەواوکردنی دە ساڵ و خودا حەزکا دەمبینی کە یەکی لە پیاوچاکان دەبم لەگەڵتا.

---

[٥] بخاری. مظالم: ٢٤٦٣، ٥٦٢٧، ٥٦٢٨. مسلم. مساقاة: ٤١٠٦ — ٤١٠٧. أبو داود. أقضية: ٣٦٣٤. ترمذی. أحكام: ١٣٥٣.

**١٨٥٧- عَنْ أَبِي مُوسَى** (رَضِي اللهُ عَنهُ) **عَنْ النَّبِيِّ** (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) **قَالَ: الْخَازِنُ الأَمِينُ الَّذِي يُؤَدِّي مَا أُمِرَ بِهِ طَيِّبَةً نَفْسُهُ أَحَدُ الْمُتَصَدِّقَيْنِ**[1].

**ئەبو مووسا** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: کلیل بە دەستی دەستپاك کاتێ بە فەرمانی خاوەن ماڵ ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ دێنێ، کە بە دڵێکی پاك‌و روویەکی خۆشەوە شتێ دەدا بە کەسێ، ئەوە ئەویش بەقەد ماڵەکە خێری دەگاو ئەویش خێرکەرێکە وەك خاوەن ماڵ (ب).**

**١٨٥٨- عَنِ عَائِشَةَ** (رَضِي اللهُ عَنهَا) **قَالَتْ: اسْتَأْجَرَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) **وَأَبُو بَكْرٍ رَجُلاً مِنْ بَنِي الدِّيلِ، هَادِيًا خِرِّيتًا وَهْوَ عَلَى دِينِ كُفَّارِ قُرَيْشٍ، فَدَفَعَا إِلَيْهِ رَاحِلَتَيْهِمَا، وَوَاعَدَاهُ غَارَ ثَوْرٍ بَعْدَ ثَلاَثِ لَيَالٍ فَأَتَاهُمَا بِرَاحِلَتَيْهِمَا صُبْحَ ثَلاَثٍ فَأَخَذَ بِهِمْ طَرِيقَ السَّاحِلِ. رواهما البخاری**[2].

**عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **و ئەبو بەکر کە کۆچیان کرد بۆ مەدینە پیاوێکی بەنی دیلی رێ زانی شارەزای رێگەوبانیان لە کافرەکانی قورەیش بەکرێ گرت، کە رێگەکەیان نیشان بدا، وە هەردوو وشترەکانی خۆیان دایەو بەڵێنیان دایە کە لە پاش سێ شەو لە ئەشکەوتی ثەور یەك بگرن.**

**جا پیاوەکە لە شەوی سێهەما لەکاتی بەیانیدا وشترەکانی بۆ بردن‌و لە رێگەی پێ دەشتەوە بردنی بۆ مەدینە (ب).**

**١٨٥٩- (ب ٢ – ز ١٤٦ – ف ٣)**[3]:

**١٨٦٠- (ب ٢ – ز ١٤٥ – ف ٤)**[4]:

---

[1] بخاری. زکاة: ١٤٣٨، ١٤٢٥، ٢٢٦٠، ٢٣١٩. مسلم. زکاة: ٢٣٦٠. أبو داود. زکاة: ١٦٨٤. نسائی. زکاة: ٢٥٥٩.

[2] بخاری. إجارة: ٢٢٦٣، ٣٨٩٥، ٣٩٠٥، ٢١٣٨، ٢٢٦٣، ٢٢٦٤، ٢٢٩٧، ٤٠٩٣، ٥٨٠٧، ٦٠٧٩.

[3] تقدم برقم: ١٧٦٧.

١٨٦١- (ب - ز ٢٣ - ف ٤ - ل ٤٦)[٥]:

## ١٦٠) وەرگرتنی کرێ لەسەر خوێندن‌و فێرکردنی قورئانی پیرۆز، وە لەسەر دەلالی: (الإجرة على القرآن والسمرة)

١٨٦٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحَقَّ مَا أَخَـذْتُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا كِتَابُ اللَّهِ. رَوَاهُ الخَمسة[١].

ئیبنو عـەبباس (خودایـان لێ ڕازی بـێ) دەڵـێ: حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: ڕەوا تـرین شـت کـە کرێـی لەسـەر وەربگـرن قورئـانی پـیرۆزە کـە نامەی خودای گەورەیە (ش/د/ت/ن).

١٨٦٢- وَلَمْ يَرَ ابْنُ سِـيرِينَ وَعَطَـاءٌ وَإِبْـرَاهِيمُ وَالْحَـسَنُ (رَضِـي اللّـهُ عَنـهُ) بِـأَجْرِ السِّمْسَارِ بَأْسًا[٢].

ئیبنو سیرین‌و عەطاو ئیبراهیم‌و حەسەن (خودایان لێ ڕازی بێ). دەڵـێن: کرێـی دەلاڵ واتە: دەلالانە قەیدی نیە (ب - خودای لێ ڕازی بێ).

١٨٦٤- وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) لاَ بَأْسَ أَنْ يَقُولَ: بِعْ هَذَا الثَّوْبَ فَمَـا زَادَ عَلَى كَذَا وَكَذَا فَهُوَ لَكَ[٣].

ئیبنو عەبباسیش (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: قەیناکا ئەگەر بڵێ: ئەم جلە یا ئـەم شـتە بفرۆشـە بـە ئەوەنـدە، ئەگـەر زیـاتری کـرد زیادەکـەی بـۆ خـۆت (ب- خودای لێ ڕازی بێ).

---

[٤] تقدم برقم: ١٧٦٠.

[٥] تقدم برقم: ١٢٦٨/٤. مجلد/٢.

[١] بخاری. إجارة: تعليق قبل رقم: ٢٢٧٦ راجع مسلم. سلام. رقم: ٥٦٩٧.

[٢] بخاری. إجارة: تعليق قبل رقم: ٢٢٧٤.

[٣] بخاری. إجارة: تعليق قبل رقم: ٢٢٧٤.

١٨٦٥- وَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ (رَضِي اللّٰهُ عَنـهُ): إِذَا قَالَ بِعْهُ بِكَذَا فَمَا كَانَ مِنْ رِبْحٍ فَهُوَ لَكَ، أَوْ بَيْنِي وَبَيْنَكَ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ. رَوَى هَذِهِ الثلاثة البخارى. والله أعلم[٤].

ئیبنو سیرینیش (خوداى لێ رازى بێ) دەڵێ: قەیدی نیە ئەگەر بڵێ: بیفرۆشە بە ئەوەندە، ئیتر چی قازانجە بۆ خۆت، یاناو کۆییمان بێ (بوخاری - خوداى لێ رازى بێ).

## ١٦١) هاوبەشی‌و سەرکاریی (وەکالەت): (الشركة والوكالة)

١٨٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَالَ اللهُ تَعَالَى: أَنَا ثَالِثُ الشَّرِيكَيْنِ مَا لَمْ يَخُنْ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ فَإِذَا خَانَهُ خَرَجْتُ مِنْ بَيْنِهِمَا. رَوَاهُ أبو داود بسند صحيح[١].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ خۆش نوودبێ) دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودای گەورە دەفەرموێ: هەموو دوو هاوبەشێ من کەسی سێهەمیانم واتە: لە پشتیانم، بەو مەرجە کە گزی‌و دەستپیسی لە یەکتری نەکەن، بەڵام هەرکاتێ گزییان لە یەك کردو لەگەڵ یەکا ناپاك بوون ئیتر من لە بەینیان دەردەچم‌و شەیتان دەبێ بە هاوبەشیان (د-س/ص).

١٨٦٧- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَعْطَى رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيْبَرَ الْيَهُودَ أَنْ يَعْمَلُوهَا وَيَزْرَعُوهَا، وَلَهُمْ شَطْرُ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا. رَوَاهُ الأربعة[٢].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە خەیبەری گرت دایەوە بە جوولەکەکان کە ئیشی تیا بکەن‌و دایچێنن بە نیوەیی (ش/د/ت).

---

[٤] بخارى. إجارة: تعليق قبل رقم: ٢٢٧٤.

[١] بسند صحيح.

[٢] بخارى. حرث ومزارعة: ٢٢٢٩، ٢٣٣١. مسلم. مساقاة: ٣٩٤٠، ٣٩٣٩. أبو داود. بيوع: ٣٤٠٨ ترمذى. أحكام: ١٣٨٣.

١٨٦٨- وَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): اشْتَرَكْتُ أَنَا وَعَمَّارٌ وَسَعْدٌ فِيمَا نُصِيبُ يَوْمَ بَدْرٍ قَالَ: فَجَاءَ سَعْدٌ بِأَسِيرَيْنِ وَلَمْ أَجِئْ أَنَا وَعَمَّارٌ بِشَيْءٍ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[٣].

ئیبنو مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: من و عەممارو سەعد بووین بە هاوبەش و قەولمانکرد هەرچیمان دەست کەوت لە ڕۆژی غەزای بەدردا بۆ هەموومان بێ.

ئەوە بوو سەعد دوو دیلی گرت و هێنانی، بەڵام من و عەممار هیچمان دەست نەکەوت ئیتر ئەو دوو دیلەمان بەشکرد بۆ هەرسێکمان (د-سند منقطع-ن).

١٨٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: وَكَّلَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِحِفْظِ زَكَاةِ رَمَضَانَ[٤].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کردمی بە سەرکاری سەرفترەی ڕەمەزان کە ئاگاداری بکەم (ب).

١٨٧٠- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَعْمَلَ رَجُلاً عَلَى خَيْبَرَ، فَجَاءَهُمْ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ فَقَالَ: أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا؟ فَقَالَ: إِنَّا لَنَأْخُذُ الصَّاعَ مِنْ هَذَا بِالصَّاعَيْنِ، وَالصَّاعَيْنِ بِالثَّلاثَةِ. فَقَالَ: لاَ تَفْعَلْ، بِعِ الْجَمْعَ بِالدَّرَاهِمِ، ثُمَّ ابْتَعْ بِالدَّرَاهِمِ جَنِيبًا[٥].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێکی کرد بە سەرکاری سەر خەیبەر، کە هاتەوە خورمایەکی نایابی بۆ هێنان، پێغەمبەر (دروودی خودای

---

[٣] رَوَاهُ أبو داود بسند منقطع (شرحه).

[٤] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠١٠، ٥٠٤١، ٢٣١١، ٣٢٧٥.

[٥] بخاری. وكالة: ٢٣٠٢، ٢٣٠٣.

لەسەربێ) فەرمووی: ئایا خورمای خەیبەر هەمووی ئاوایە؟ پیاوەکە گوتی: نەء، بەڵام مەنێ لەمە لەباتی دوو مەن وەردگرین و دوو مەن لە باتی سێ مەن!

فەرمووی: وامەکە، خورما ئایەخەکەی بفرۆشە بە پارەو لە پاشا بەو پارەیە چەندی کرد خورمای نایاب بکڕە (ب).

١٨٧١- (ب ٢ - ز ١١٠ - ف - ١) = ژ: ١٧٦٠٠/١[٦].

١٨٧٢- وَقَالَ جَابِر (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَرَدْتُ الْخُرُوجَ إِلَى خَيْبَرَ فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ وَقُلْتُ لَهُ إِنِّي أَرَدْتُ الْخُرُوجَ إِلَى خَيْبَرَ. فَقَالَ: إِذَا أَتَيْتَ وَكِيلِي فَخُذْ مِنْهُ خَمْسَةَ عَشَرَ وَسْقًا فَإِنِ ابْتَغَى مِنْكَ آيَةً فَضَعْ يَدَكَ عَلَى تَرْقُوَتِهِ. رَوَاهُ أبو داود والدارقطني[٧].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ویستم بچم بۆ خەیبەر، چووم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سلاوم لێ کردو عەرزیم کرد: نیازم هەیە بچم بۆ خەیبەر، فەرمووی: کە چوویتە لای سەرکارەکەم پازدە وەسقی لێ وەربگرە، ئەگەر داوای نیشانەی لێ کردیت دەستت دانێ لەسەر ددانەی سینەی (د- س/ح- دارە قوطنی).

١٨٧٣- عَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيِّ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأعْطَاهُ دِينَارًا يَشْتَرِي بِهِ أُضْحِيَةً أَوْ شَاةً فَاشْتَرَى شَاتَيْنِ فَبَاعَ إِحْدَاهُمَا بِدِينَارٍ فَأَتَاهُ بِشَاةٍ وَدِينَارٍ فَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ فِي بَيْعِهِ فَكَانَ لَوِ اشْتَرَى تُرَابًا لَرَبِحَ فِيهِ. رَوَاهُ أبو داود والترمذي والبخاري في بَدْءِ الْخَلْقِ واللهُ تَعَالَى أعلى وأعلم.

عوروەی باریقی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دینارێکی دامێ کە قوربانییەکی ( یا مەڕێکی) پێ بکڕم بۆی، منیش بەو دینارە دوو مەڕم کڕی، یەکێکیانم فرۆشتەوە بە دینارەکەو دینارێک و

---

[٦] تقدم برقم: ١٦٠٧/١.

[٧] رَوَاهُ أبو داود بسند حسن (شرحه).

مەڕێکشم بۆی بردەوە، ئەویش نزای بۆ کردم کە خودای گەورە پیت‌و فەڕ بخاتە مامەڵەو سەودامەوە، ئیتر لەوە دوا ئەگەر خۆڵی ئاساییم بکڕیبایە قازانجم دەکرد (د/ت/ب– ڕەزای خودایان لێبێ).

## ١٦٢) ڕێکەوتن (سوڵح – صلح): (الصلح)

قَالَ اللهُ تَعالى: {وَالصُّلْحُ خَيْرٌ}.

**خوادی گەورە دەفەرموێ: سوڵح‌و ڕێکەوتن زۆر باشە!**

١٨٧٤– عَنْ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيُّ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَالَ: الصُّلْحُ جَائِزٌ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ إِلاَّ صُلْحًا حَرَّمَ حَلاَلاً أَوْ أَحَلَّ حَرَامًا وَالْمُسْلِمُونَ عَلَى شُرُوطِهِمْ إِلاَّ شَرْطًا حَرَّمَ حَلاَلاً أَوْ أَحَلَّ حَرَامًا. رَوَاهُ الترمذى وأبو داود والبخارى[1].

**عەمری کوڕی عەوفی موزەنی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەناو موسوڵمانانا ڕێك كەوتن دروستەو ڕەوایە جگە لەو ڕێککەوتنەی کە ڕەوا بکا بە ناڕەوا یا ناڕەوا بکا بە ڕەوا، وە موسوڵمانان لەسەر مەرجی خۆیانن، مەگەر مەرجێ کە حەڵاڵ حەرام بکا، یا حەرام حەڵاڵ بکا (ت/د/ب).**

١٨٧٥– عَنْ كَعْبِ بْنَ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي الْمَسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُـوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ فَنَادَى يَا كَعْبُ. قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: ضَعْ مِنْ دَيْنِكَ هَذَا. وَأَوْمَأَ إِلى الشَّطْرِ قَالَ لَقَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: قُمْ فَاقْضِهِ. رَوَاهُ الثلاثة والنسائى[2].

---

[1] بخاری. صالح: ٢٦٩٠.

[2] بخاری. صلاة: ٤٥٧، ٤٧١، ٢٤١٨، ٢٤٢٤، ٢٧٠٦، ٢٧١٠. مسلم. مساقاة: ٣٩٦١. أبو داود. أقضية: ٣٥٩٥. نشائی. قضاة: ٥٤٢٣، ٥٤٢٩. (ریاض/ ز-٣١ ژ-٣/٢٥٠).

کەعبی کوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: قەرزێکم لەسەر ئیبنو ئەبی حەدەد بوو، لە مزگەوت داوام لێ کردەوەو بوو بە قڕەقڕمان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ماڵەوە بوو، گوێی لە دەنگمان بوو هات بۆ لامان، جا پەردەی دەرگای هۆدەکەی خۆی کە لەسەر مزگەوت بوو کلا کردوو بانگی کرد: ئەی کەعب! گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئەوەندە لە قەرزەکەت دابشکێنە وە ئیشارەتی بۆ نیوەی قەرزەکە کرد کە دایشکێنم، منیش گوتم: ئەوا کردم ئەی پێغەمبەری خودا! جا فەرمووی: دەتۆش هەڵسە نیوەکەی تری بدەروە (ش/د/ن- خودایان لێ ڕازی بێ).

## ١٦٣) باسی هەشتەم: باسی خواستەمەنی (عاریە) ماڵخواز دەستەبەرە تادەیباتەوە: (الباب الثامن: في العارية وضمانها)

١٨٧٦- عَنْ أَنَسَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ فَزَعٌ بِالْمَدِينَةِ فَاسْتَعَارَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَسًا مِنْ أَبِي طَلْحَةَ يُقَالُ لَهُ الْمَنْدُوبُ فَرَكِبَهُ فَلَمَّا رَجَعَ قَالَ: مَا رَأَيْنَا مِنْ شَيْءٍ وَإِنْ وَجَدْنَاهُ لَبَحْرًا[1].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ مەدینە شەڵەژاو خەڵکەکە تۆقین، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) ئەسپێکی خواست لە ئەبو طەلحە ناوی مەندووب بوو کەمێ تەمبەڵ و گرانەڕۆ بوو جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) سواری بوو، وە چوو بە سۆراخی ئەو دەنگوباسەیەوە کە گوایە دوشمن شاڵاوی هێناوە بۆ سەر شاری مەدینە کاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گەڕایەوە فەرمووی: هیچمان نەدی، ئەم ئەسپەیش زۆر زۆر خێرابوو! (ئیمامی بوخاری – خودای لێ ڕازی بێ).

١٨٧٧- قَالَ أَيْمَنَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) وَعَلَيْهَا دِرْعُ قِطْرٍ ثَمَنُ خَمْسَةِ دَرَاهِمَ، فَقَالَتِ انْظُرْ إِلَى جَارِيَتِي، فَإِنَّهَا تُزْهَى أَنْ تَلْبَسَهُ فِي الْبَيْتِ، وَقَدْ

---

[1] بخاری. عمری: ٢٦٢٧، ٢٨٢٠، ٢٨٥٧، ٢٨٦٢، ٢٨٦٦، ٢٨٦٧، ٢٩٠٨، ٢٩٦٨، ٢٩٦٩، ٣٠٤٠، ٦٠٣٣، ٦٢١٢.

كَانَ لِي مِنْهُنَّ دِرْعٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَا كَانَتِ امْرَأَةٌ تُقَيَّنُ بِالْمَدِينَةِ إِلاَّ أَرْسَلَتْ إِلَيَّ تَسْتَعِيرُهُ. رواهما البخاری فی العمری[٢].

**ئەیمەن (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: چووم بۆ دیدەنی عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) کراسێکی شاڵی زبری ئەستووری لەبەردا بوو، کە لە یەمەن بەو جۆرە شاڵە دەڵێن: قیطر، کراسەکە بایی پێنج درەم دەبوو، عائیشە گوتی: سەیرکە! کەنیزەکەکەم لەماڵەوەیش بێزی نایەو دەعیەی نایەنێ کە ئەمە لەبەربکا، لە سەردەمی پێغەمبەریشدا (دروودی خودای لەسەربێ) کراسێکم لەمانە هەبوو، هەر ئافرەتێ لە مەدینەدا کە دەچوو بە بووکیو خۆی دەڕازاندەوە بۆ زاوا دەینارد بۆ لامو ئەو کراسەی لێ دەخواستم، کەچی ئێستا دەعیە وازل بووە کارەکەریش بێزی نایێ لەبەری بکا (ب).**

١٨٧٨- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ وَلاَ تُنْفِقُ الْمَرْأَةُ شَيْئًا مِنْ بَيْتِهَا إِلاَّ بِإِذْنِ زَوْجِهَا. فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ الطَّعَامَ؟ قَالَ: ذَالِكَ أَفْضَلُ أَمْوَالِنَا. ثُمَّ قَالَ: الْعَارِيَةُ مُؤَدَّاةٌ وَالْمِنْحَةُ مَرْدُودَةٌ وَالدَّيْنُ مَقْضِيٌّ وَالزَّعِيمُ غَارِمٌ. رَوَاهُ أبو داود والترمذی وصححه[٣].

**ئەبو ئومامە (خوای لێ خۆش نوودبێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو خاوەن مافێ خودا مافی خۆیی داوەتێ وە گشت خاوەن پشکێ خودای گەورە پشکی خۆیی بۆ داناوە لە کەلەپووری مردووەکەی ئیتر لەبەر ئەوە راسپێریو وەسییەت دروست نیە بۆ میراتبەر، وە دروستیش نیە کە ئافرەت هیچ شتێ لەماڵی مێرد ببەخشێ مەگەر بە فەرمانی خۆی، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! نابێ خواردەمەنیش ببەخشێ؟ فەرمووی: بۆ ئێوە**

---

[٢] بخاری عمری: ٢٦٢٨.

[٣] صحيح عند الترمذی.

خواردەمەنی بەچی دەزانن خواردەمەنی باشترینی ماڵی ئێمەیە کەواتە ئەویش بەبێ ڕەزا لێبوونی مێرد ژن نابێ لە خۆیەوە بی بەخشێ.

لە پاشدا فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): شتی خوازراو دەدرێتەوە بە خاوەنی، وە شتی دۆخە دەبرێتەوە بۆ خاوەنی، وە قەرزیش دەبێ ببژێردرێتەوە، وە دەستەبەر (زامن)یش بژاردنی لەسەرە هەر کاتێ قەرزارەکە خۆی نەیبوو دەبێ کەفیلەکەی شتەکە ببژێرێ (د/ت:ص).

١٨٧٩- عَنْ سَمُرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَلَى الْيَدِ مَا أَخَذَتْ حَتَّى تُؤَدِّىَ. ثُمَّ إِنَّ الْحَسَنَ نَسِيَ فَقَالَ هُوَ أَمِينُكَ لاَ ضَمَانَ عَلَيْهِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٤].

سەموورە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەست دەناسێ و کەسێ شتێکی وەرگرت ئەو شتەیە لە ئەستۆیەتی هەتا دەیداتەوە بە خاوەنەکەی.

کەچی لە دواییدا حەسەن کە ڕاوی ئەم فەرموودەیە بوو لە سەموورەوە ئەمەی لەبیر نەمابو، بۆیە دەیگوت: ئەو کەسەی کە تۆ شتی خۆتی دەدەیتێ، چ بەکرێ، چ بە خواستن، چ بەشتێکی تر ئەوە ئەو کەسە ئەمینداری تۆیە، دەستەبەر نیەو دەستەبەریی لەسەر نیە (د/ت/ن-س/ح = ئەبو داوودو تیرمیذی و نەسائی بەرشتەیەکی جوان، واتە بە سەنەدێکی حەسەن، ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە).

١٨٨٠- عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنْ أَبِيهِ قَالَ قَالَ لِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَتَتْكَ رُسُلِي فَأَعْطِهِمْ ثَلاَثِينَ دِرْعًا وَثَلاَثِينَ بَعِيرًا. فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَعَارِيَةً مَضْمُونَةً أَوْ عَارِيَةً مُؤَدَّاةً؟ قَالَ: بَلْ مُؤَدَّاةٌ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[٥].

---

[٤] بسند حسن (شرحه).

[٥] رَوَاهُ أبو داود بسند صالح (شرحه).

**صەفوانی کوڕی یەعلا (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: باوکم گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێم: نوێنەری خۆم دەنێرم بۆ لات، کە هاتن سیی زریەو سیی وشتریان بدەرێ.**

**منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئەمە تەنیا خواستەمەنییەو ئەگەر ماو نەفەوتا لەپاش جێبەجێ کردنی کاری خۆت پێی پێم دەیدەیتەوە، یاخود هەر چەند خواستەمەنییە بەڵام ئەگەر لەلای تۆ فەوتا بۆم دەبژێریتەوە؟**

**فەرمووی: ئەمە خواستەمەنییە ئەگەر ما دەیدەمەوە پێت خۆ ئەگەر فەوتایش ئەوا هیچ! (د-سند صالح-ن).**

**١٨٨١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ فَأَرْسَلَتْ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ مَعَ خَادِمِهَا بِقَصْعَةٍ فِيهَا طَعَامٌ قَالَ فَضَرَبَتْ بِيَدِهَا فَكَسَرَتِ الْقَصْعَةَ فَضَمَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِحْدَى الْكِسْرَتَيْنِ إِلَى الأُخْرَى فَجَعَلَ يَجْمَعُ فِيهَا الطَّعَامَ وَيَقُولُ: غَارَتْ أُمُّكُمْ كُلُوا فَأَكَلُوا حَتَّى جَاءَتْ قَصْعَتُهَا قَالَ: كُلُوا وَحَبَسَ الرَّسُولَ وَالْقَصْعَةَ الْمَكْسُورَةَ حَتَّى فَرَغُوا فَدَفَعَ الْقَصْعَةَ الصَّحِيحَةَ إِلَى الرَّسُولِ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلما ولفظه لأبى داود والله أعلى وأعلم[٦].**

**ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ماڵی ژنێ لە ژنەکانی بوو، ژنێکی تری بەکارەکەرێکی خۆیا لە گەنێ خواردەمەنی بۆ نارد، ژنەکەی تەنگەگرتی و دەستی کێشا بە لەگەنەکەداو شکاندی.**

**جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەردوو لەتی لە گەنەکەی نووساندنەوە بەیەکەوە خواردەمەنییەکەی تێ کردەوەو فەرمووی: دایکتان تەنگە دەیگرێ و دڵی پڕبووە، ئێوە بخۆن.**

---

[٦] **بخاری. مظالم: ٢٤٨١، ٥٢٢٥.**

ئـەوانیش خواردیـان. جـا کـە لەگـەنی ژنەکـەی تریـشی هـات دیـسان فـەرمووی: بخـۆن. رابـەرو لەگەنـە شکاوەکەیـشی گـل دایـەوە تـا لێ بوونـەوە ئەوسا لەگەنـە سـاغەکەی دا بـە کارەکەرەکـەو لەگەنـە شـکاوەکەی گـل دایـەوە (د/ب/ت/ن).

## ١٦٤) باسی نۆهەم: باسی قەرزکردن

## الباب التاسع: في الاستقراض والاستدانة

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللَّهُ فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا}.

خودای گەورە دەفـەرموێ: ئـەی کەسانێ کە باوەڕتـان هەیـە بـە ئـاییـنی ئیسلام! هـەرکاتێ شتتان دا بـە قـەرز بـە یـەکرتی هـەتا وادەیـەکی دیـاریکراو، ئەو قـەرزە بنووسـن، وە با نووسـەرێ لـە نێـوانی ئێوەدا ئـەو مامەڵـە بنووسێ لەسـەر شـێوەیەکی راسـت و دروسـت، نابـێ ئـەو نووسـەرە لـە نووسـینی ئـەو قەرزەدا لە رێگەی راست لابدا، دەشێ وەك خودا فەرموویەتی و فێری کـردووە ئاوا بینووسێ، وە با ئـەو کەسـە قسە دابنـێ بۆ نووسـەرەکە کـە هەقەکـەی لـە سـەرە، وە با لـەو خودایـە بترسـێ کـە پـەروەردگاری ئـەوە، وە لـەو هەقـە وا بـە سەریەوە هیچ کەم نەکا.

١٨٨٢- عَنْ أَبِي رَافِعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَسْلَفَ مِنْ رَجُلٍ بَكْرًا فَقَدِمَتْ عَلَيْهِ إِبِلٌ مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ فَأَمَرَنِي أَنْ يَقْضِيَ الرَّجُلَ بَكْرَهُ فَقُلْتُ: لَمْ أَجِدْ فِيهَا إِلاَّ خِيَارًا رَبَاعِيًا. فَقَالَ: أَعْطِهِ إِيَّاهُ إِنَّ خِيَارَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً. رَوَاهُ الخمسة[1].

---

[1] تقدم برقم: ١١/١٧٤٥.

ئەبو رافیع (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نۆبەنە وشترێکی قەرز کرد لە پیاوێ، جا کە وشتری زەکاتی بۆ هات فەرمووی بەمن کە نۆبەنە وشترەکەی پیاوەکە بدەمەوە" منیش عەرزیم کرد: وشتری نۆبەنیان تیا نیە، مەگەر وشترێکی سەرەی چاکی بدەینێ، فەرمووی: بیدە پێی، لە راستیدا مرۆڤی باش قەرزی خەڵك بە جوانی دەبژێرێتەوە (ش/د/ت/ن- خودایان لێ رازی بێ).

١٨٨٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: اسْتَقْرَضَ مِنِّي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرْبَعِينَ أَلْفًا فَجَاءَهُ مَالٌ فَدَفَعَهُ إِلَيَّ وَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ الْحَمْدُ وَالأَدَاءُ. رَوَاهُ النسائي[٢].

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو رەبیعە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چل هەزار درەمی لێ قەرز کردم لە پاشا کەماڵی بۆ هات قەرزەکەی دایەوە پێم و فەرمووی: خودا ماڵ و مناڵت لێ پیرۆزکاو پیت و بەرەکەت بڕژێنێ بەسەریاندا، پاداشی قەرزیش برێتییە لە دانەوەی قەرزەکە بەسەر راستی و سوپاسکردنی خاوەنەکەی و بەس (ن).

١٨٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ أَدَاءَهَا أَدَّى اللَّهُ عَنْهُ، وَمَنْ أَخَذَ يُرِيدُ إِتْلافَهَا أَتْلَفَهُ اللَّهُ. رَوَاهُ البخاري[٣].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ ماڵی کەسێ وەربگرێ و لە دڵەوە نیازی دانەوەی هەبێ ئەوە خودا بۆی هەڵدەسووڕێنێ و دەیداتەوە، بەڵام ئەوەی کە دەیەوێ بیبا بۆ ئەوەی لرفی لێ بدا ئەوە خودا خۆی لەناو دەبات (بوخاری، خودای لێ رازی بێ).

---

[٢] سکت عنه الشارح.

[٣] بخاری. استقراض: ٢٣٨٧.

١٨٨٥- عَنْ الْمُغِيرَةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ حَـرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الأُمَّهَاتِ، وَوَأْدَ الْبَنَاتِ، وَمَنَعَ وَهَـاتِ، وَكَـرِهَ لَكُـمْ قِيـلَ وَقَـالَ، وَكَثْـرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ. رَوَاهُ الشيخان[٤].

موغیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفـەرموێ: خودا حەرامی کردووە لە سەرتان: دڵ ڕەنجاندنی باوکان و دایکان، وە زینـدە بەچاڵکردنی کچان، وە نەدانی مافی سـەرتان، وە زەوتکردنـی هـەقی خـەڵکان، وە حەزیش ناکا لـەم ڕەفتارانـە بۆتـان: لـە وتـی و وتـی و لـە پرسـیاری زۆرو لـە سواڵکردنی زۆر، وە لە زایەکردنی ماڵ بە خۆڕاییی (ش).

١٨٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ. رَوَاهُ الخمسة[٥].

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبــەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرموێ: قەرز کوێری پیاوی دەوڵەمەند گەلێ ستەمە(ش/د/ت/ن).

١٨٨٩- وللبخاري وأحمد والنسائي: لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ[٦].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: سەرچەوتی دارا هـەم ئـابرووی دەبـاو هـەم سـزادانی حـەلاڵ دەکـا (بوخـاری و ئەحمـەدو نەسـائی ڕیوایـەتیان کردووە. خودایان لێ ڕازی بێ).

١٨٩٠- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَعْظَـمَ الذُّنُوبِ عِنْدَ اللَّهِ أَنْ يَلْقَاهُ بِهَا عَبْدٌ - بَعْدَ الْكَبَائِرِ الَّتِي نَهَى اللَّهُ عَنْهَا - أَنْ يَمُوتَ رَجُلٌ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ لاَ يَدَعُ لَهُ قَضَاءً. رَوَاهُ أبو داود[٧].

---

[٤] بخاری. زکاة: ١٤٧٧. مسلم. اقضية: ٤٤٥٦ — ٤٤٦١.

[٥] بخاری. حوالة: ٢٢٨٧، ٢٢٨٨، ٢٤٠٠. مسلم. مـساقات: ٣٩٧٨. أبـو داود. بيـوع: ٣٣٤٥. نـسائی. بيـوع: ٤٧٠٥. (رياض/ ٤/ز/ ٢٨٤ ژ: ١/١٦١١).

[٦] تعليق ذكره البخاری قبل رقم: ٢٤٠١ فی المساقاة (مترجم).

[٧] بسند صالح (شرحه).

ئـەبو مووسـا (خـوای لێ ڕازی بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرموێ: لە پاش گوناهە هەرە گەورەکان کە خودا نەهی لێ کردوون زلترین گوناهێ کە بەندە پێیەوە بچێتە دیوانی خودا گوناهی ئەو پیاوەیە کە کاتێ دەمرێ بە قەرزاری دەمرێ، وە ئەوەندەش ماڵ لە پاش خۆی بەجێ نەیەڵێ کە بەشی بژاردنەوەی قەرزەکەی سەری بکا! (د-سند صالح).

١٨٩١- وللنسائي: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ رَجُلاً قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ أُحْيِيَ ثُمَّ قُتِلَ ثُمَّ أُحْيِيَ ثُمَّ قُتِلَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ مَا دَخَلَ الْجَنَّةَ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ دَيْنُهُ[٨].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەو کەسە کە گیانی منی بە دەسە ئەگەر پیاوێ لە ڕێگەی خودادا بکوژرێ و لە پاشا زندوو بکرێتەوە، دیسان بکوژرێتەوەو دیسانەوە زیندوو بکرێتەوەو هەمدیس بکوژرێتەوە، ئەگەر پیاوێ لەم ڕەنگەو لەم حاڵە قەرزێکی لەسەربێ ناچێتە بەهەشت، تا قەرزەکەی بۆ نەدرێتەوە! (ن).

١٨٩٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يُصَلِّي عَلَى رَجُلٍ مَاتَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ فَأُتِيَ بِمَيِّتٍ فَقَالَ: أَعَلَيْهِ دَيْنٌ؟ قَالُوا: نَعَمْ دِينَارَان. قَالَ: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ. فَقَالَ أَبُو قَتَادَةَ الأَنْصَارِيُّ هُمَا عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ فَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ. رَوَاهُ الخمسة[٩].

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران کە پیاوێ دەمرد ئەگەر قەرزی لەسەر بوایە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەر نەدەکرد، تا جارێ مردوویەکیان بۆ هێنا، فەرمووی: ئایا قەرزی لەسەرە یانا؟ گوتیان: ئا دوو لیرەی لەسەرە. فەرمووی: دە خۆتان نوێژ لەسەر مردووەکەتان بکەن! ئەبو

---

[٨] سکت عنه الشارح.

[٩] بخاری. استقراض: ٢٣٩٩، ٢٢٩٨، ٤٧٨١، ٥٣٧١، ٦٧٣١، ٦٧٣١، ٦٧٤٥، ٦٧٦٣. مسلم. فرائض: ٤١٣٣.

**قەتادە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەو دوو لیرە قەرزە لە سەرمن، من دەیاندەمەوە ئەی پێغەمبەری خودا!.**

**ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نوێژی لەسەر کرد، بەڵام لەوەودوا کە خودا دەرووی دارایی لە حەزرەت کردەوە فەرمووی: من دڵسۆزترم بۆ هەموو موسوڵمانێ لە هەموو کەسێ هەتا لە خۆشی، جا ئەگەر موسوڵمانێ مردو قەرزی لەسەر بوو ئەوە قەرزەکەی لەسەر من، من قەرزەکەی بۆ دەدەمەوە، بەڵام ئەگەر ماڵی لەپاش بەجێما ئەوە بۆ میراتبەرەکانیەتی (ش/د/ت/ن).**

**١٨٩٣- وَعَنْهُ قَالَ: قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ شَهِيدًا، وَعَلَيْهِ دَيْنٌ فَاشْتَدَّ الْغُرَمَاءُ فِي حُقُوقِهِمْ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكَلَّمْتُهُ فَسَأَلَهُمْ أَنْ يَقْبَلُوا تَمْرَ حَائِطِي وَيُحَلِّلُوا أَبِي فَأَبَوْا، فَقَالَ: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَنَغْدُو عَلَيْكَ فَغَدَا عَلَيْنَا حِينَ أَصْبَحَ، فَطَافَ فِي النَّخْلِ، وَدَعَا فِي ثَمَرِهَا بِالْبَرَكَةِ، فَجَدَدْتُهَا فَقَضَيْتُهُمْ، وَبَقِيَ لَنَا مِنْ تَمْرِهَا. رَوَاهُ البخاری وأبو داود[١٠].**

**دیسان ئەو گوتی: لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا باوکم شەهید کرا، وە هەندێ قەرزی لەسەر بوو، جا خاوەن قەرزەکان تەنگیان پێ هەڵچنیم بۆ قەرزەکانیان، منیش چووم بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەمەم عەرزیکرد، ئەویش داوای لێکردن: کە خورما باخەکەم هەڵبگرن و ئەگەر شتێکیان ما لەسەر باوکم بە پیاوەتی گەردنی ئازاد بکەن، بەڵام بەوە قاییل نەبوون.**

**جا فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): سبەینێ سەرلەبەیانی دێین بۆ لات جا ڕۆژی دوایی سەر لە بەیانی هات بۆ لامان و خولێکی خوراد بەناو دارخورماکاناو لە خودا پاڕایەوە کە پیت و بەرەکەت بخاتە خورماکەیەوە.**

**جاکە خورماکەم ڕنی، قەرزەکانی ئەوانم هەموو بە تەواوی دایەوە، وە لە سایەی خوداوەو بە بەرەکەتی دووعاکەی حەزرەت زیادەیشمان بۆ مایەوە (ب/د).**

---

[١٠] **بخاری. استقراض: ٢٣٩٥.**

## ١٦٥) کەسێ ماڵی خۆی بەسەر بگرێتەوە لەلای کەسێ کە نابووت کەوتبێ ئەوە هی خۆیەتی: (من أدرك ماله عند مفلس فهو أحق به)

١٨٩٤– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَدْرَكَ مَالَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَ رَجُلٍ أَوْ إِنْسَانٍ قَدْ أَفْلَسَ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ. رَوَاهُ الخمسة وَفِي رِوَايَةٍ لأبي داود: فَإِنْ كَانَ قَضَاهُ مِنْ ثَمَنِهَا شَيْئًا فَمَا بَقِيَ فَهُوَ أُسْوَةُ الْغُرَمَاءِ وَأَيُّمَا امْرِئٍ هَلَكَ وَعِنْدَهُ مَتَاعُ امْرِئٍ بِعَيْنِهِ اقْتَضَى مِنْهُ شَيْئًا أَوْ لَمْ يَقْتَضِ فَهُوَ أُسْوَةُ الْغُرَمَاءِ[1].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ دەق ماڵی خۆیی بەسەرگرتەوە لەلای پیاوێکی لات کەوتوو، ئەوە هی خۆیەتی و بەو ڕەواترە هەتا بە کەسێکی تر (ش/د/ت/ن. خودایان لێ ڕازی بێ). لە گێڕانەوەیەکی ئەبو داووددا (خوای لێ ڕازی بێ) بە سەنەدێکی مورسەل: بەڵام ئەگەر کابرای نابووت شتێکی لە بەهای ئەو ماڵە دابوو پێی ئەوە لەم حاڵەتەدا ماڵەکە ناوکۆیی خاوەن قەرزەکانەو خاوەنی پێشووی ماڵەکەیش حاڵی حاڵی ئەوانە وە ئەگەر کەسێ مرد، وە پیاوێ دەق ماڵی خۆیی لەلای بەسەر گرتەوە، ئەوە ناوکۆیی خاوەن قەرزەکانە، خوا کابرای مردوو شتێکی لە بەهاکەی دابێ پێی یانا.

١٨٩٥– عَنْ سَمُرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ وَجَدَ عَيْنَ مَالِهِ عِنْدَ رَجُلٍ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ وَيَتَّبِعُ الْبَيِّعُ مَنْ بَاعَهُ أَيْ يَرْجِعُ الْمُشْتَرِي عَلَى الْبَائِعِ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[2].

سەموورە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ دەق ماڵی خۆی لەلای کابرایێ بەسەر گرتەوە خوا ئەو کابرایە دزیبوی، یا زەوتی کردبوو، یا کڕیبووی و لات کەوتبوو ئەوە ئەو ماڵە هی

---

[1] بخاری. استقراض: ٢٤٠٢. مسلم. مساقاة: ٣٩٦٣. أبو داود. بيوع: ٣٥١٩، ٣٥٢٠، ٣٥٢١، ٣٥٢٢. ترمذی بيوع: ١٢٦٢. نسائی. بيوع: ٤٦٩٠، ٤٦٩١.

[2] رَوَاهُ أبو داود بسند صالح (شرحه).

خۆیەتیو بەخۆی ڕەواترە لە هەموو کەس، وە کڕیاریش دەچێتەوە سەر ئەو کەسە کە ئەوماڵەی بە ساختە پێ فرۆشتووە، پارەی خۆی لەو دەسێنێتەوە (د-سند صالح-ن).

١٨٩٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ مِناً غُلاَمًا لَـهُ عَـنْ دُبُـرٍ، فَقَـالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي. فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بِكَذَا وَكَـذَا، فَدَفَعَـهُ إِلَيْهِ. رَوَاهُ الخمسة والله أعلى وأعلم[٣].

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ لە خۆمان خوڵامێکی هەبوو" ئازادی کرد، بە مەرجی ئەوە کە لەپاش مردنی خۆی ئازاد ببێ لە پاشا پیاوەکە داما بـۆ مـاڵ پێغەمبـەریش (درووودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: کـێ ئـەم خوڵامـەم لێ دەکڕێ؟ جا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵلا لێی کڕیو بەهاکەی وەرگرتو دای بە خاوەنەکەی (ش/د/ت/ن، خودایان لێ ڕازی بێ).

### ١٦٦) بەرەو ڕوو کردنەوە (حەواڵە)و دەستەبەر (کەفیل): (الحوالة والكفيل)

١٨٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ. رَوَاهُ الخمسة[١].

لـە ئـەبو هـورەیرەوە (خوای لێ ڕازی بێ) لـە پێغەمبـەرەوە (درووودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: قەرز کوێریی پیاوی دەوڵەمەند گەلێ ستەمە! ئەگەر کەسێکشتان لە لایەنی قەرزارەکەی خۆیەوە بەرەو ڕووی پیاوێکی دەوڵەمەند کرایەوە، کە ئەو دەوڵەمەندە لە باتی ئەو قەرزەکەی پێ بداتەوە، ئەوە با بچێ قەرزەکەی لەو دەوڵەمەندە وەربگرێتەوە (ش/د/ت/ن).

١٨٩٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَزِمَ رَجُلٌ غَرِيمًا لَهُ بِعَشْرَةِ دَنَانِيرَ فَقَالَ وَاللَّهِ لاَ أُفَارِقُكَ حَتَّى تَقْضِيَنِي أَوْ تَأْتِيَنِي بِحَمِيلٍ قَالَ: فَتَحَمَّلَ بِهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فَأَتَاهُ بِقَدْرِ مَا وَعَدَهُ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ أَيْنَ أَصَـبْتَ هَـذَا الـذَّهَبَ؟

---

[٣] بخاري. كفارات الأيمان: ٦٧١٦. مسلم. أيمان: ٤٣١٤ — ٤٣١٧. ترمذي. بيوع: ١٢١٩.

[١] تقدم تخريجه في رقم: ١٨٤٦/٥ في تسلسل: ١٦٤ من المجلد الثاني (مترجم).

قَالَ: مِنْ مَعْدِنٍ. قَالَ: لاَ حَاجَةَ لَنَا فِيهَا لَيْسَ فِيهَا خَيْرٌ فَقَضَاهَا عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ أبو داود وابن ماجه[٢].

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) دەڵێ: پیاوێ لەسەر (دە) دیناری قەرز یەخەی قەرزارێکی خۆی گرتبوو، دەیگوت: بە خودا لە کوڵکت نابمەوە، تا قەرزەکەمم نەدەیتەوە، یا دەستەبەر (کەفیل)ێکم نەدەیتێ. گوتی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بوو بە دەستەبەری.

گوتی: جا لە وادەی خۆیا کابرا قەرزەکەی هێنا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم زێڕەت لە کوێ دەست کەوتووە؟ گوتی: لەکان، فەرمووی: کارمان پێی نیەو خێری پێوە نیە وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی قەرزەکەی بژاردەوە لە جیاتی ئەو (د/ئیبنو ماجە-سند صالح).

١٨٩٩- (ب - ٢ - ز ١٦٣ - ف ٣). = رقم: ١٨٧١/٣(٣).

١٩٠٠- (ب ٢ - ز ١٦٣ - ف ٤). رقم: ١٨٣٩/٤(٤).

## ١٦٧) باسی دەهەم: باسی زەوی‌و دارناشتن‌و شت چاندن

## الباب العاشر: في الأرض والغرس والزرع

١٩٠١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَعْمَرَ أَرْضًا لَيْسَتْ لأَحَدٍ فَهْوَ أَحَقُّ، قَالَ: عُرْوَةُ قَضَى بِهِ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فِي خِلاَفَتِهِ. رَوَاهُ البخارى وابو داود والترمذى. وَفِي رِوَايَةٍ: مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيْتَةً فَهِيَ لَهُ وَلَيْسَ لِعِرْقٍ ظَالِمٍ حَقٌّ[١].

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] تقدم برقم: ١٨٧١/٣ تسلسل/ ١٦٣.

[٤] تقدم برقم: ١٨٣٩/٤ تسلسل/ ١٦٣.

[١] بخارى. إحياء الموات: ٢٣٣٥.

**عائیشه** (خوای لێ ڕازی بێ) **له پێغەمبەرەوە دەفەرموێ** (درودی خودای لەسەربێ): **کەسێ زەوییەك ئاوەدان بکاتەوە، که هی کەسێکی تر نەبێ، ئەوە دەبێ بەهی خۆی.**

**عوروە** (خوای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: عومەر** (خوای لێ ڕازی بێ) **لەکاتی جێنشینیی خۆیدا بەپێی ئەم فەرموودەیە حوکمی دەکرد (ب/د/ت) لە گێڕانەوەیەکدا: کەسێ زەوییەکی بێ خاوەن ئاوەدان بکاتەوە ئەوە ئەبێ بەهی خۆی، وە گەری زۆرداریش لەو زەوییەدا هیچی لێ سەوز نابێ.**

**١٩٠٢- عَنْ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ** (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لاَ حِمَى إِلاَّ لِلّٰهِ وَلِرَسُولِهِ وَحَمَى النَّبِيُّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **النَّقِيعَ، وَأَنَّ عُمَرَ حَمَى السَّرَفَ وَالرَّبَذَةَ. رَوَاهُ البخاری وأبو داود[٢].**

**صەعبی کوڕی جەثثامە** (خوای لێ ڕازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: پاکژو پاوەند بەس بۆ خوداو بۆ پێغەمبەری خودا هەیە. گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **نەقیعی کردبوو بە پاکژ، وە عومەریش سەرەف و رەبەزەی کردبوو بە پاوەند (ب/د).**

**١٩٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) **قَالَ: قَضَى النَّبِيُّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **إِذَا تَشَاجَرُوا فِي الطَّرِيقِ بِسَبْعَةِ أَذْرُعٍ. رَوَاهُ الشيخان والترمذی. ولفظه: إِذَا تَشَاجَرْتُمْ فِي الطَّرِيقِ فَاجْعَلُوهُ سَبْعَةَ أَذْرُعٍ[٣].**

**ئەبو هورەیرە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **حەوت گەزی بڕیارداوە بۆ (پانی ڕێگەی گشتی، ئەگەر لەسەری بوو بە هەرایان وە زەوییەکە ئەوەی لەوە زیاتر بوو بە سەرهاوبەشانا دابەش دەکرێ، وە ئەمە بۆ**

---

[٢] بخاری. مساقاة: ٢٣٧٠، ٢٠١١٣.

[٣] مسلم. مساقاة: ٤١١٥.

ڕێگەی تازە وایە ئەگینا ڕێگەی کۆن لێ نادرێ، وە ئەمە لە کۆنا وابوو ئەگینا بۆ ئێستا بەپێی قسەی پسپۆڕان ئەندازەی ڕێگە بڕیار دەدرێ (ش/ت) گفتەی (ت): ئەگەر لەسەر ئەندازەی ڕێگەبوو بە دەمەقرەتان ئەوا حەوت گەز دابنێن بۆ ڕێگە.

١٩٠٤– عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا، أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا، فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ أَوْ إِنْسَانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ، إِلاَّ كَانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ. ر الشيخان والترمذي[٤].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): هەر موسوڵمانێ نەمامێ بنێژێ، یا شتێ بچێنێ، وە باڵندەیێ، کەسێ گیانداری لێی بخوات ئەوە دەبێ بەخێرو بەخشش بۆی (ش/ت).

١٩٠٥– عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا إِلاَّ كَانَ مَا أُكِلَ مِنْهُ لَهُ صَدَقَةٌ وَمَا سُرِقَ مِنْهُ لَهُ صَدَقَةٌ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ مِنْهُ فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ وَمَا أَكَلَتِ الطَّيْرُ فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ وَلاَ يَرْزَؤُهُ أَحَدٌ إِلاَّ كَانَ لَهُ صَدَقَةٌ. وَفِي رِوَايَةٍ: لاَ يَغْرِسُ الْمُسْلِمُ غَرْسًا فَيَأْكُلَ مِنْهُ إِنْسَانٌ وَلاَ دَابَّةٌ وَلاَ طَيْرٌ إِلاَّ كَانَ لَهُ صَدَقَةً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ مسلم. والله أعلى وأعلم[٥].

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ شتێ بڕوێنێ، یا نەمامێ بنێژێ، ئەوەی لێی بخوا، ئەوەی لێی بدزێ، ئەوەی دڕندەو دەعبا بیخوا، ئەوەی مەلو مۆر بیخوا، ئەوەی سوودی لێ ببینێ، ئیتر هەر سوودێك بێ، ئەمانە" هەموویان بۆی دەبن بە خێرو خێرات.

---

[٤] بخاری. حرث ومزارعة: ٢٣٢٠، ٦٠١٢. مسلم. مساقاة: ٣٩٥١، ٣٩٥٠. ترمذی. أحکام: ١٣٨٢.

[٥] مسلم. مساقاة: ٣٩٤٥ — ٣٩٥١ (ریاض/ ز-١٣ ژ- ١٣٥/١٩ = بخاری: ٢٣٢٠ مسلم: ١٥٥٢، ١٥٥٣).

**لە گێڕانەوەیەکدا: هەر موسوڵمانێ نەمامێ بنێژێ، کەسێ، گیانەوەرێ، مەل و مۆرێ لێی بخوا ئەوە هەمووی دەبێ بە خێرو بەخشش بۆی هەتا ڕۆژی قیامەت! (م).**

## ١٦٨) بەکرێدانی زەوی و زار بە مڵکانە، ئیتر بە نیوەیی بێ یا کەمتر یا بەزیاتر: (الزراعة ببعض ما يخرج منها)

**١٩٠٦- عَنْ رَافِعٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا أَكْثَرَ أَهْلِ الْمَدِينَةِ حَقْلاً، وَكَانَ أَحَدُنَا يُكْرِي أَرْضَهُ، فَيَقُولُ هَذِهِ الْقِطْعَةُ لِي وَهَذِهِ لَكَ، فَرُبَّمَا أَخْرَجَتْ ذِهِ وَلَمْ تُخْرِجْ ذِهِ، فَنَهَاهُمُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[1].**

**رافیع (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: جاران ئێمە لە مەدینە لە هەموو کەسێ، زەوی و زارمان زۆرتر بوو، جا وا دەبوو کە یەکێکمان زەوی خۆی دەدا بەکرێ بەوەرزێرەکەی دەگوت: ئەم پارچەیەی بۆمن و ئەو پارچەیەی بۆ تۆ. جا زۆر جاری وا ڕێ دەکەوت پاچەیەکیان باشی دەهێنا بەڵام پارچەکەی تر باشی نەدەهێنا جا لەکاتی خەرمان هەڵگرتن و کۆ کردنەوەی بەروبوومدا دەبوو بە ناکۆکییان، جا لە بەرئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی لێکردن هەتا ناخۆشی بەرپا نەبێ (ش/د/ن).**

**١٩٠٧- عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ يَقُولُ مَا كُنَّا نَرَى بِالْمُزَارَعَةِ بَأْسًا حَتَّى سَمِعْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ يَقُولُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْهَا. فَذَكَرْتُهُ لِطَاوُسٍ فَقَالَ قَالَ لِي أَعْلَمُهُمْ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَنْهَ عَنْهَا وَلَكِنْ قَالَ لأَنْ يَمْنَحَ أَحَدُكُمْ أَرْضَهُ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا خَرَاجًا مَعْلُومًا. رَوَاهُ الخمسة[2].**

---

[1] بخاری. حرث ومزارعة: ٢٣٣٢، ٢٣٤٧، ٢٢٨٥، ٢٣٤٣، ٢٣٤٤. مسلم. بیوع: ٣٩٢١. أبو داود. بیوع: ٣٣٩٤. نسائی. أیمان ونذور: ٣٩٢٠، ٣٩٢١ — ٣٩٢٤.

[2] بخاری. حرث ومزارعة: ٢٣٣٠، ٢٣٤٢، ٢٦٣٤. مسلم. بیوع: ٣٩٣٤ — ٣٩٣٦. أبو داود. بیوع: ٣٣٨٩ ترمذی. أحكام: ١٣٨٥. نسائی. أیمان ونذور: ٣٨٨٢.

**عـەمری کـوڕی دینـار** (خوای لێ ڕازی بێ) **گـوتی: لـە ئیبنـو عومـەرم بیـست دەیگوت: لە پێشا زەوی‌و زارمان بە مڵکانە دەدا بەکرێ وە ئەمەمان بە خراپ دا نەدەنا، کەچی لە ڕافیعی کوڕی خەدیجم ژنەوت دەیگوت: پێغەمبـەر** (درودی خودای لەسەربێ) **جلـوگیریی لێ کـردووە، منـیش ئەمـەم باسـکرد بـۆ طـاووس کـە خۆشی زەوی دەدا بە مڵکانە، گوتم: خۆزیا وازت لەمـە دەهێنـا چونکە ئەوانـە بـە قـسەی خۆیـان دەڵـێن: پێغەمبـەر** (درودی خودای لەسەربێ) **نـەهی لـە شـتی وا کـردووە، طـاووس گـوتی: زاناتریـان کـە ئیبنـو عەبباسـە قسەی بـۆ کـردووم گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **یاسـاخی نـەکردووە، بـەڵام فەرموویـەتی: ئەگەر زەوی‌و زارتان بە پیاوەتی بدەن بە یەکێ بۆ خۆی دایچێنێ لەوە باشترە کە بە مڵکانە بیدەنێ (ش/د/ت/ن).**

**١٩٠٨- وَقَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ** (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) **يَغْفِرُ اللَّهُ لِرَافِعِ بْـنِ خَـدِيجٍ أَنَـا وَاللَّـهِ أَعْلَمُ بِالْحَدِيثِ مِنْهُ إِنَّمَا جَاءَ لِلنَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **رَجُلاَن مِنَ الأَنْصَارِ قَدِ اقْتَتَلاَ فَقَالَ: إِنْ كَانَ هَذَا شَأْنَكُمْ فَلاَ تُكْرُوا الْمَزَارِعَ فَسَمِعَ رَافِعٌ قَوْلَهُ فَلاَ تُكْرُوا الْمَزَارِعَ. رَوَاهُ أبـو داود والنسائى[٣].**

**زەیـدی کـوڕی ثابیـت** (خوای لێ ڕازی بێ) **دەیـگوت: خـودا لـە ڕافیعـی کـوڕی خـەدیج خـۆش بـێ، بـە خـودا بـۆ ئـەو قـسەیە مـن لـەو باشـتری لێ دەزانم، مەسـەلەکە خـۆی ئـاوابوو: دوو پیـاو لـە یـاردەدەران (ئەنـصار) هـاتن بـۆ لای حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **لەسـەر مەسـەلەیەکی وا لێیـان بـوو بـوو بـە شـەڕ. پێغەمبەریش** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: کە ئێـوە حاڵتـان وایـە زەوی‌و زار مەدەن بە کرێ.**

**جا ڕافیع** (خوای لێ ڕازی بێ) **تەنیا گوێی لەم وشـەیەی پێغەمبـەر** (درودی خودای لەسەربێ) **بـووە کـە فـەرمووی: زەوی‌و زار مـەدەن بـەکرێ وە ئاگـای لـە بـنج‌و بنەوانی ڕووداوەکە نیە (د/ن).**

---

[٣] جميع ما فى المجتبى للنسائى صحيح على ما فى مقدمة شرح التاج (مترجم).

**١٩٠٩- عَنْ ابْنَ عُمَرَ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) **كَانَ يُكْرِى مَزَارِعَهُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **وَأَبِى بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ وَصَدْرًا مِنْ إِمَارَةِ مُعَاوِيَةَ. فَلَمَّا سَمِعَ حَدِيثَ رَفِعٍ تَرَكَ ذِلكَ خَشْيَةَ أَنْ يَكُونَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَدْ أَحَدَثَ فِيهاَ شَيْئاً. رَوَاهُ الشيخان[٤].**

**جاران ئیبنو عومەر** (خوایان لێ ڕازی بێ) **لە سەردەمی پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **و ئەبو بەکرو عومەرو عوسماندا** (خوایان لێ ڕازی بێ) **هەتا سەرەتای فەرمانڕەوایی موعاوییەیش لەم ماوەیەدا زەوی و زاری خۆی دەدا بەکرێ.**

**بەڵام کە فەرموودەکەی ڕافیعی ژنەوت ئیتر وازی لێ هێنا، لە ترسی ئەوەی نەبادا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **شتێکی نوێی لەم بارەیەوە فەرمووبێ و ئەو ئاگای لێ نەبێ، جا بەپێی دەستووری: تا بێ تەشقەڵە هەبێ بەلای تەشقەڵەدارا مەچۆ، وازی لەم ئیشە هێنا! (ش).**

**١٩١٠- وَقَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **لَمْ يُحَرِّمِ الْمُزَارَعَةَ وَلَكِنْ أَمَرَ أَنْ يَرْفُقَ بَعْضُهُمْ بِبَعْضٍ. بِقَوْلِهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): **مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا أَوْ لِيَمْنَحْهَا أَخَاهُ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُمْسِكْ أَرْضَهُ. رَوَاهُ الخمسة[٥].**

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ خۆش نوود بێ) **دەڵێ، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **مڵکانەی حەرام نەکردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لەناو خۆیانابەزەوییان بە خۆیانا بێتەوەو دەستی یەکتری بگرن پێی فەرموون: هەر کەسێ زەوی هەیە با یا خۆی دایبچێنێ یا بە پیاوەتی بیدا بە برایەکی ئایینی خۆی، خۆ ئەگەر هیچ کامێ لەم دوە ناکا با زەوییەکەی بخەوێنێ (ش/د/ت/ن، خودایان لێ ڕازی بێ).**

**١٩١١- وَقَالَ أَبُو جَعْفَرٍ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **مَا بِالْمَدِينَةِ أَهْلُ بَيْتِ هِجْرَةٍ إِلاَّ يَزْرَعُونَ عَلَى الثُّلُثِ وَالرُّبْعِ. وَزَارَعَ عَلِيٌّ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **وَسَعْدُ بْنُ مَالِكٍ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ**

---

[٤] بخاری. إجارة: ٢٢٨٥، ٢٣٢٨، ٢٣٢٩، ٢٣٣١، ٢٣٣٨، ٢٤٩٩، ٢٧٢٠، ٣١٥٢، ٤٢٤٨. مسلم. بیوع: ٣٩١٥ – ١٩٢٠. أبو داود. بیوع: ٣٣٩٤. نسائی. إیمان ونذور: ٣٩٢٠، ٣٩٢١، ٣٩٢٢، ٣٩٢٣، ٣٩٢٤.

[٥] بخاری. حرث: ٢٣٤٠، ٢٦٣٢، ٢٣٤١.

وَعُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ وَالْقَاسِمُ وَعُرْوَةُ وَآلُ أَبِي بَكْرٍ وَآلُ عُمَرَ وَآلُ عَلِيّ وَابْـنُ سِيرِينَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمْ). رَوَاهُ البخارى والله أعلى وأعلم[٦].

**ئەبو جەعفەر** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: خێزانی کۆچەری نەبووە لە مەدینەدا کە بەمڵکانەی سێ یەك و چوار یەك زەوی دانەچێنێ، ئەم زاتانە هەموویان بە مڵکانە زەوییان دادەچێنا: عەلی** (خوای لێ ڕازی بێ) **سەعدی کوڕی مالیك، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، قاسم، عوروە، خانەوادەی ئەبو بەکر، خانەوادەی عومەر، خانەوادەی عەلی، ئیبنو سیرین — خودای گەورە لێیان ڕازی بێ — (ب).**

### ١٦٩) بەکرێدانی زەوی بە پارەو شتی تر: (كراء تالارض بالنقد وغيره)

١٩١٢- عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ قَيْسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: سَأَلْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ عَنْ كِرَاءِ الأَرْضِ فَقَالَ: نَهَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْهُ فَقُلْتُ: بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ فَقَالَ: أَمَّا بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ فَلاَ بَأْسَ بِهِ. رَوَاهُ الخمسة إلا الترمذى[١].

**حەنظەلەی کوڕی قەیس** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: لە ڕافیعی کوڕی خەدیجم پرسی لە بابەت دانی زەوییەوە بە مڵکانە، گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **نەهی لێ کردووە. گوتم ئەی ئەگەر بە زێڕو زیوبیدات بەکرێ چۆنە؟ گوتی: بەزێڕو زیوو بە پارەیەکی دیاری کراو بیدات بەکرێ قەیدی نیە (ش/د/ت).**

---

[٦] جملة من التعاليق والآثار ذكرها البخارى فى الباب/ ٨ من كتاب الحرث والمزارعة، قبل رقم: ٢٣٢٨ مباشرة (مترجم).

[١] بخارى. بيوع: ٢٣٤٦، ٢٣٤٧، ٢٣٢٧. مسلم. بيوع: ٣٩٢٨. أبو داود. بيوع: ٣٣٩٢، ٣٣٩٣، نسائى. أيمان ونذور: ٣٩٠٨ — ٣٩١١.

١٩١٣- وَقَالَ سَعْدٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) كُنَّا نُكْرِى الأَرْضَ بِمَا عَلَى السَّوَاقِي مِنَ الزَّرْعِ فَاخْتَلَفُوا فَنَهَانَا رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ذَلِكَ وَأَمَرَنَا أَنْ نُكْرِيَهَا بِذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ[٢].

سەعد (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە پێشدا زەویمان دەدا بەكرێ، لەسەر ئەم شێوەیە: ئەوەی كە لە سەرماكاوو قەدو تیرو جۆگەلەكان دەڕوێ بۆ ئێمە بێ‌و ئەوی تریشی بۆ وەرزێر بێ. جا گەلێ جار دەبوو بە ناكۆكیمان، لەبەر ئەم حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی لێ كردین لەوە، وە فەرمانی پێ كردین كە بەزێڕو زیو بیدەین بەكرێ (د-سند صالح-ن).

١٩١٤- عَنْ رَافِعٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّمَا يَزْرَعُ ثَلاثَةٌ رَجُلٌ لَهُ أَرْضٌ فَهُوَ يَزْرَعُهَا وَرَجُلٌ مُنِحَ أَرْضًا فَهُوَ يَزْرَعُهَا وَرَجُلٌ اسْتَكْرَى أَرْضًا بِذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ. رواهما أبو داود والنسائي والله أعلى وأعلم[٣].

ڕافیع (خوای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): تەنیا ئەم سێ كەسە كشتوكاڵ دەكەن: كەسێ خۆی زەوی هەبێ‌و بۆ خۆی دایچێنێ، كەسێ یەكێكی تر پارچەیێ زەوی بە پیاوەتی بداتێ‌و بۆ خۆی دایچێنێ، كەسێكیش زەوی بەزێڕو زیوو بە پاە بەكرێ بگرێ‌و بۆ خۆی دایچێنێ (د-سند صالح-ن) خودای گەورە بۆ خۆی باشی دەزانێ.

## ١٧٠) باخەوانی (موساقات)و خەرسكردن: (المساقاة والخرص)

١٩١٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: عَامَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ أَوْ زَرْعٍ. فَكَانَ يُعْطِي أَزْوَاجَهُ كَلَّ سَنَةٍ مِائَةَ وَسْقٍ ثَمَانِينَ وَسْقًا مِنْ تَمْرٍ وَعِشْرِينَ وَسْقًا مِنْ شَعِيرٍ فَلَمَّا وَلِيَ عُمَرُو قَسَمَ خَيْبَرَ خَيَّرَ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (صَلَّى

---

[٢] رَوَاهُ أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٣] رَوَاهُ ابو داود بسند صالح (شرحه).

اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ الأَرْضِ وَالْمَاءَ وَبَيْنَ الأَوْسَاقِ كُلَّ عَامٍ فَمِنْهُنَّ مَنِ اخْتَارَ الأَرْضَ وَالْمَاءَ وَمِنْهُنَّ مَنِ اخْتَارَ الأَوْسَاقَ كُلَّ عَامٍ فَكَانَتْ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ مِمَّنِ اخْتَارَتَا الأَرْضَ وَالْمَاءَ. رَوَاهُ الأربعة[1].

**ئیبنو عومەر (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە خەیبەری گرت: دایەوە بە خەڵکی خەیبەر، کە بە نیوەیی بەرهەمی بێنن، چ بەرو بووم چ شینایی بە نیوەیی، جا هەموو ساڵێ لە دەرامەتی خەیبەر سەد وەسقی دەدا بەهاو سەرەکانی، هەشتای خورماو بیستی جۆ.**

**جا کاتێ عومەر بوو بە سەرداری خەیبەری دابەشکرد، هاوسەرەکانی پێغەمبەری کرد بە سەرپشك: کە یا زەوی و ئاو هەڵبگرن، یا لەسەر ساڵانەی خۆیان بن و ساڵ بە ساڵ چەند تەغاریان بۆ دانراوە وەری بگرن. ئیتر ئەوە بوو هەندێکیان زەوی و ئاویان هەڵگرت و هێندێکیان ساڵانەیان هەڵبژارد، عائیشەو حەفصە لەو هاوسەرانە بوون کە زەوی و ئاویان هەڵگرتبوو (ش/د/ت).**

١٩١٦- وَقَالَتِ الأَنْصَارُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اقْسِمْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ إِخْوَانِنَا النَّخِيلَ. قَالَ: لاَ. فَقَالُوا تَكْفُونَا الْمَئُونَةَ وَنُشْرِكْكُمْ فِي الثَّمَرَةِ. قَالُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا. رَوَاهُ البخاری[2].

**یاریدەدەران (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتیان بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ): قوربان! باخە خورماکانی ئێمە دابەش بکە لە نێوانی ئێمەو برا کۆچەرەکانمانا، فەرمووی: نایکەم، بەکۆچەرەکانیان گووت: دە ئێوە لەجیاتی ئێمە بەخێوی کەن و بەروبوومەکەی بۆ هەردوولامان، گوتیان: زۆر بەجێیە بۆ ئەمەیان بەگوێتان دەکەین! (ب).**

---

[1] بخاری. حرث: ٢٣٢٩. مسلم. مساقاة: ٣٩٣٩. أبو داود. بیوع: ٣٤٠٨. ترمذی.أحکام: ١٣٨٣.

[2] بخاری. مزراعه: ٢٣٢٥، ٢٧١٩، ٣٧٨٢.

١٩١٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ خَيْبَرَ فَأَقَرَّهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَمَا كَانُوا وَجَعَلَهَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ فَبَعَثَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ رَوَاحَةَ فَخَرَصَهَا عَلَيْهِمْ. وَفِي رِوَايَةٍ: خَرَصَهَا ابْنُ رَوَاحَةَ أَرْبَعِينَ أَلْفَ وَسْقٍ خَيَّرَهُمْ ابْنُ رَوَاحَةَ أَخَذُوا الثَّمَرَ وَعَلَيْهِمْ عِشْرُونَ فَأَلْفَ وَسْقٍ. رَوَاهُ أبو داود والله أعلى وأعلم[٣].

**جابیر** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: کە خودا وڵاتی خەیبەری خەڵات کرد بە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **هەر کەسەی دانایەوە لە سەرماڵ و مەزرای خۆی، بە مەرجی ئەوە کە دەرامەتەکەی نیوەی بۆ ئەوو ئەو نیوەکەی تری بۆ ئەوانبێ، لە دواییشا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی نارد، خەمڵیکرد لە سەریان لە گێڕانەوەیەکا: عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە قرساندی بە چل هەزار وەسق، وە خۆشیانی کرد بەسەر پشك، ئەوانیش بەوە ڕازی بوون و دەرامەتەکەیان بۆ خۆیان کۆ کردەوەو بیست هەزار وەسقیان لێ دا بە حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **(د- خوای لێ ڕازی بێ).**

## ١٧١) سەگ بۆ پاس و ڕەشە وڵاخ بۆ زەوی کێڵان:

## الكلب للحراسة والبقر للحرث

١٩١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا لَيْسَ بِكَلْبِ صَيْدٍ وَلاَ مَاشِيَةٍ وَلاَ أَرْضٍ فَإِنَّهُ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِهِ قِيرَاطَانِ كُلَّ يَوْمٍ. رواه مسلم والبخاري ولفظه: مَنْ أَمْسَكَ كَلْبًا فَإِنَّهُ يَنْقُصُ مِنْ عَمَلِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ إِلاَّ كَلْبَ غَنِمٍ أَوْ حَرْثٍ أَوْصَيْدٍ[١].

---

[٢] سكت عنه الشارح.

[١] بخاری. ذبائح: ٥٤٨٢، ٥٤٨٠، ٥٤٨١. مسلم. مساقاة: ٣٩٩٩-٤٠١٣ (ریاض/ ٤ز: ٣٠٦ ذ- ١٦٨٨/١ وفی روايةِ: ١٦٨٩/٢).

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ ڕازی بـێ) لـە حەزرەتـەوە دەفـەرموێ (دروودی خـودای لەسەربێ): کەسێ سەگێ ڕابگرێ، کە سەگی ڕاوو پاسی ئاژاڵ و پاسی زەوی و زارو مەزرا نەبێ، هەموو ڕۆژێ دوو پارچە لە پاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە (م/ب) گفتەی (ب): هەر کەسێ سەگێ ڕابگرێ کە سەگی پاسی ڕان و کێڵگەو ڕاو نەبێ، هەموو ڕۆژێ پارچەیێ لە پاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە.

١٩١٩- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ رَاكِبٌ عَلَى بَقَرَةٍ الْتَفَتَتْ إِلَيْهِ. فَقَالَتْ لَمْ أُخْلَقْ لِهَذَا، خُلِقْتُ لِلْحِرَاثَةِ، قَالَ آمَنْتُ بِهِ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَأَخَذَ الذِّئْبُ شَاةً فَتَبِعَهَا الرَّاعِي، فَقَالَ الذِّئْبُ مَنْ لَهَا يَوْمَ السَّبُعِ، يَوْمَ لاَ رَاعِيَ لَهَا غَيْرِي. قَالَ آمَنْتُ بِهِ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ. قَالَ: أَبُو سَلَمَةَ: وَمَا هُمَا يَوْمَئِذٍ فِي الْقَوْمِ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي والله أعلى وأعلم[٢].

دیسان ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ سواری ڕەشە وڵاخێ بوو بوو لە گێڕانەوەیەکا: کابرایێ ڕەشە وڵاخەکێکی بارکردبوو لێی دەخوڕی لەو کاتەدا ڕەشە وڵاخەکە ئاوڕی لێ دایەوەو گوتی: من بۆئەمە دروست نەکراوم، من بۆ جووتکردن دروست کراوم، جا خەڵکەکە لەمە سەرسام بوون و هانایان بردە بەریادو ذیکری خوداو گوتیان: سوبحانەڵلا، نامەخوا لە کاری خوا، ڕەشە وڵاخ قسە دەکا! جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر هەندێ کەس سەرسام دەبن لە قسەکردنی ئاژەڵی بێ زمان، بەڵام من و ئەبو بەکرو عومەر باوەڕ دەکەین بەوە سەرسام مەبن لەمە، بۆ خوا چی تێ دەچێ، ئەو کەسەی ئادەمیزادی هێناوەتە قسە دەتوانێ کە ئاژەڵیش بهێنێتە قسە، فەرمووی جارێ گورگیش مەڕێ دەفڕێنێ لە بەرشوانێ، شوانەکە شوێنی دەکەوێ و دەنیشێتە سەری تا لێی دسێنێتەوە جا گورگەکە پێی دەڵێ: ئەی ئەو ڕۆژە

---

[٢] بخاری. مزارعة: ٢٣٢٤.

**کە ڕۆژ ڕۆژی دڕندەیەو جگە لەمن شوانی تری نیە کێ قوتاری دەکا لە چنگم! مەردومەکە گوتیانەوە: سوبحانەڵلا، حەزرەت فەرموویەوە: من و ئەبو بەکرو عومەر باوەڕ بەمە دەکەین. ئەبو سەلەمە کە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە لە ئەبو هورەیرەوە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ئەو کاتەی کە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **ئەم شایەتییە دەدا بۆ ئەبو بەکرو عومەر، خۆیان لەوێ حازر نابن وەلێ پشتە سوور دەبێ لە ئیمان و باوەڕی پتەویان، بۆیە لە نادیار شایەتییان بۆ دەدا (ش/ت) خودای گەورە هەر بۆ خۆی زۆر باشی لێ دەزانێ**[1].

---

[1] لێرانەدا شتێ هەیە دەمەوێ بیڵێم کە لە مێژەوە بیری لێ دەکەمەوەو دەمەوێ بیدرکێنم، ئەویش ئەمەیە:

یەکەم: ئەو زیادانەی کە شەتڵ کراون لەناو دەقی فەرموودە پیرۆزەکاندا وە بە دوو کەوانە شووراکراون، لەناو دەقی ئەصڵە عەرەبییەکەدا جاروبار لەناو تەرجەمە کوردییەکەیشدا، ئەوانە هەموویان یا لە شەرحەکەی تاجول ئوصول خۆی یا لەسەر چاوەیەکی باوەڕ پێکراو وەرگیراون.

مەگەر چۆنەها خۆم لە خۆمەوە راڤەی شتێکم کردبێ بەپێی بیرو رای خۆم، ئەویش بەپێی توانا هەوڵم داوە کە لەچار چێوەی تێکۆشانێکی موسوڵمانانەی دوور لە هەوارو هەوەسەوە دەرنەچێ، وە لە سایەی خوداوە ئەم رێبازەم لەسەرانسەری تەرجەمەکەدا رەچاو کردووە، وەلێ کەم تا بێژێ وا دەبێ کە لە تەرجەمەکەدا کەوانە هەڵدەگرم، وە عیبارەتی کوردییەکە بە شێوەیەکی وا کە پوختەی دەقە عەرەبییەکە بگەیەنێ بە کوردییەکی پەتی رێك و پێك دادەڕێژم، وە بەمە خۆم دوور دەخەمەوە لە وەرگێڕانی پیت بە پیت، کە گەلێ جار دەبێ بەهۆی رەونەق بردنی گوفتوگۆو ئاخاوتن، وە سەرەنجام سەر دەکێشێ بۆ پێچەوانەی مەبەست.

ئەمەیش بۆیە وا دەڵێم تا مرۆی موسوڵمان ئاگای لە بەرو دوای خۆی بێ و سەرو بەری کارو باری خۆی باش بزانێ؛ نە خوازەڵا لە شتێکا کە پەیوەندی بە بیرو باوەڕی ئایینییەوە هەبێ.

بە تایبەتی لە وێنەی ئەم کتێبە پیرۆزەدا، کە دادەنرێ بە سەرچاوەیەکی رۆشنی هەرە باڵای ئایینی پیرۆزی ئیسلام!

ئابینی زانایەکی پایەبەرزی وەك مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارەیی (خودای مەزن دەست بە عەمری بگرێ و تیشکی خامەکەی هەمیشە وەك ئێستای هەتا بەخێرو خۆشی و بەرووسووری

دەچێتەوە دیوانی خودا لە ورشەدان و پرتەودابێ) نابینی ئەم دەلیای زانست و تەقوایە چۆن لە تەفسیری نامی زێڕینا دەفەرموێ لە بەرگی شەشەمدا لە لاپەڕە (٤٦٨)دا:

**بە (تاج الاصول) یا (فتح الباری). مەرهەم نەهێنێ بۆ زامی کاری**

یا لەهەمان شوێندا دەفەرموێ:

**تاج نەڵێ وایە عەقیدەی جەمهوور! نیتر مەپرسە لە بیری مهجور**

ئەمە لە لایێ، لە لایەکی تریشەوە گەلێ جار لەبەر کورتبری ئەو حەدیثانەی کە مامۆستای مەزنم دانەری ئەم نامە پیرۆزەیە (پڕ گۆڕە پیرۆزەکەی لە نوورو رەحمەتی خودای مەزن بێ)، لەچەن شوێنێ، هەمان ریوایەت، بە بەچەن ریوایەتێ، بۆ چەن بۆنەیێ، دووبارەی کردبێتەوە، من ئەو حەدیثەیە لە یەك لا دەنووسم، وە لە جێگەکانی تر هێما بۆ ئەوێ دەکەم.

جا لەم کۆششەدا ئەگەر سەرکەوتن و خودا رێگەی دروستی کرد بە نصیبمان ئەوە لە سایەی خودای گەورەوەیەو ئازایەتی منی تیا نیە، وە خوا حەزکا لەگەڵ خوێنەری بەرێزا بە پاداشی باشی خۆمان دەگەین.

خۆ ئەگەر هەڵەیەکیشم هەبێ، ئەوە جگە لە یەزدانی پاك کێ بێ هەڵەنەکا، وە لە خودا داوا دەکەین کە لە هەڵەو تاوانمان خۆش بێ و نەنگ و عەیبمان بپۆشێ و، بە کردەوەی خراپی خۆمانمان لەگەڵ نەکاو بە کەرەم و بەخششی خۆی رەفتارمان لەگەڵ بکا.

زمانی حاڵ و زمانی سەرمان دەڵێ و دەڵێتەوە: پەروەردگارا! ئامان!من کردم تۆ نەیکەی، رووی نووری بە ساجی رەش نەکەی، شەرمەزاری دیوانی خۆتم نەکەی، سەر شۆڕو چاوخواری لای دۆست و دوشمنم نەکەی! شەیتانمان پێ خۆش نەکەی، روو زەردی هەر دوو جیهانمان نەکەی: من و هەموو موسوڵمانێ کە بەهەرشێوەیێ سوودێ لەم نامە پیرۆزەیە وەردەگرێ لە ژێر ئاڵای پێغەمبەردا حەشرمان بکەی.

پەروەردارا! لە خۆت دەپرسم ئایا بوێرم وەك گەورەمان مەولەوی بەهەشتی فەرموویەتی لە باسی بەروالایی لێشاوی رەحمەتی تۆدا منیش بڵێم:

**خەلیل! ئامانەن کێ عادەت کەر دەن! توێشە وەدەرگای کەریمان بەردەن!**

یاخۆ لەبەر خراپی خۆم وەك خوا لێ خۆش بوو مەحوی دەفەرموێ بڵێم:

**لە روو سووری عیبادەت لام و روزەردو خەجاڵەت مام**

**بەناوی سێوی ناوم باغەبان و من بەهێ دەگرم!**

## ١٧٢) ئافاتی شینایی دەبێ بەهۆی بەتاڵ بوونەوەی مڵکانەو کرێ و بەها: وضع الحوائج

١٩٢٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا فَكَثُرَ دَيْنُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ. فَتَصَدَّقَ النَّاسُ عَلَيْهِ فَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِغُرَمَائِهِ خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ وَلَيْسَ لَكُمْ إِلاَّ ذَلِكَ[1].

ئەبو سەعید (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێ بەری باخێکی کڕی، لە پاشا بەرەکە فەوتاو پیاوەکە تێ شکاو، بوو بە ژێر قەرزو قۆڵەوە.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خێری پێ بکەن و زەکاتی بدەنێ جا خەڵکیش خێرو زەکاتیان دایێ، بەڵام بەشی بژاردنی قەرزەکەی نەکرد بە تەواوی.

جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە خاوەن قەرزەکانی فەرموو: چیتان دەست کەوتووە بیبەن، ئیتر هەر ئەوەتان دەکەوێ و بەس. (م/د- موسلیم و ئەبو داوود، خوایان لێ ڕازی بێ).

---

پەروەردگارا! کورد وتەنی ڕادەم نیە کە تۆ بە شایەت بگرم بەڵام تۆ بۆ خۆت دەزانی کە کەنیزی تۆ دایکی صەلاحەددین، زەکییەی کچی مەلا کەریم عەلی کە هاوسەری منە، دڵ و دەروون و چاوی بەنوورو تیشکی ئەم کتێبە پیرۆزە ڕۆشن بۆتەوەو مێشك و هەستی لە بۆن و بەرامەی خۆش و خەستی مەست بووە، وە گەلێ یارمەتی داوم لەم ڕووەوە، سا تۆش بە کەرەم و گەورەیی خۆت (وەك خۆی بە تەمایە وئومێدی گەورەی بەلوتفی تۆیە) لە دووعای خێری چاکان ناهۆمێدی نەکەی و ڕەحمێ بە حاڵی هەر دووجیهانی بکەی.

ئامین. یا رب العالمین وصلى الله تعالى على سیدنا محمد واله وصحبه أجمعین وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمین. وەرگێڕی ئەم نامە پیرۆزەیە بۆ سەر زمانی شیرنی کوردی (نوری فارس حمه خان).

[1] مسلم. مساقاة: ٣٩٥٨. أبو داود. بیوع: ٣٤٦٩. ترمذی. زكاة: ٦٥٥. نسائی. بیوع: ٤٥٤٣، ٤٦٩٢.

١٩٢١- عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ بِعْتَ مِنْ أَخِيكَ ثَمَرًا فَأَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ فَلاَ يَحِلُّ لَكَ أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُ شَيْئًا بِمَ تَأْخُذُ مَالَ أَخِيكَ بِغَيْرِ حَقّ. رواهما مسلم وأبو داود والله أعلى وأعلم[٢].

**جابیر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: ئەگەر بەری باخێ بفرۆشی بە برایەکی موسوڵمانت و لەپاشا ئافات لێی داو فەوتاندی، دروست نیە بۆت کە هیچی لێ وەربگری، ئاخر لە باتی جێ ماڵی برای خۆت بەنارەوا دەخوێت!** (م/د).

## ١٧٣) باسی شینایی و ئاودان و بیر: (في الزرع والسقي والبئر)

١٩٢٢- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ زَرَعَ فِي أَرْضِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ فَلَيْسَ لَهُ مِنَ الزَّرْعِ شَيْءٌ وَلَهُ نَفَقَتُهُ. رَوَاهُ أبو داود والترمذي وحسنه[١].

**رافیعی کوڕی خەدیج** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: کەسێ لە زەوی کەسێکی تردا شینایی یەك بکا بەبێ رێگە پێدانی خاوەنەکەی ئەوە هیچی لەو شینایییە ناکەوێ، بەڵام مەسرەفەکەی دەکەوێتەوە** (د/ت:ح).

١٩٢٣- وَكَانَ لِلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) نَاقَةٌ ضَارِيَةٌ فَدَخَلَتْ حَائِطًا فَأَفْسَدَتْ فِيهِ فَكُلِّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيهَا فَقَضَى أَنَّ حِفْظَ الْحَوَائِطِ بِالنَّهَارِ عَلَى أَهْلِهَا وَأَنَّ حِفْظَ الْمَاشِيَةِ بِاللَّيْلِ عَلَى أَهْلِهَا وَأَنَّ عَلَى أَهْلِ الْمَاشِيَةِ مَا أَصَابَتْ مَاشِيَتُهُمْ بِاللَّيْلِ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[٢].

---

[٢] مسلم. مساقاة: ٣٩٥٢، أبو داود\. بيوع: ٣٤٧٠. نسائی. بیوع: ٤٥٤٠، ٤٥٤١.

[١] حسن عند الترمذي.

[٢] رَوَاهُ أبو داود بسند صالح (شرحه).

بەرائی کوڕی عازیب (خوای لێ ڕازی بێ) وشترێکی چنۆکی دەبێ، جارێ دەچێتە ناو باخێکەوەو زیانی لێ دەدا، جا ئەوەیان عەرزی حەزرەت کرد، حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەربێ) بڕیاریدا: کە ئاگاداری باخ بە ڕۆژ لەسەر خاوەنیەتی، وە ئاگاداریی ماڵاتیش بەشەو لەسەر خاوەنیەتی! وە هەر زیانێ کە لە شەودا ئاژەڵ بیدات لەسەر خاوەنیەتی (د–سند صالح–ن).

١٩٢٤– عَنْ عُرْوَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: خَاصَمَ الزُّبَيْرُ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا زُبَيْرُ اسْقِ ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: إِنَّهُ ابْنَ عَمَّتِكَ فَقَالَ: (عَلَيْهِ السَّلاَمُ): اسْقِ يَا زُبَيْرُ حَتَّى يَبْلُغَ الْمَاءَ الْجَدْرَ، ثُمَّ أَمْسِكْ. فَقَالَ: الزُّبَيْرُ فَأَحْسِبُ هَذِهِ الآيَاتِ إِلاَّ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ). رَوَاهُ البخاري والترمذي[٣].

عوروە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: زوبەیرو پیاوێکی ئەنصاری بوو بە هەرایان لەسەر سەرەی ئاو،جا کە بۆ ناوبژیی و دادپرسی چوونە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی زوبەیر! مەزراکەت ئاو بدەو لە پاشا ئاوەکە بەرەڵا بکە بۆ ئەو، ئەنصارییەکە گوتی: ئەوە پوورزای خۆتە بۆیە بەلای ئەوا دەیبەی! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی زوبەیر! دارە خورماکان ئاوبدە تا دێراوەکانیان تەواو پڕ دەبێ و ئاوەکە دەدا لە قەدیان ئینجا ئاوەکەش بگرەوە! زوبەیر (خوای لێ ڕازی بێ) دەیگوت: وا دەزانم کە ئەم ئایەتە لەم بارەیەوە هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ:

{فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ}.

واتە: ڕوداو وانیە کە وەك ئەوان گومان دەبەن، بەو کەسەی کەوا پەروەردگاری تۆیە، ئەو ناپاکانە باوەڕ ناهێنن هەتا بە ئارەزووی دڵ، تۆ دەکەن بە حەکەم و بەفەرمانداری فرمانڕەواڵەو کێشەو بەرانەدا کە ڕوودەن لە

[٣] بخاري. مساقاة: ٢٣٥٩، ٢٣٦٠، ٢٣٦١، ٢٣٦٢، ٢٧٠٨، ٤٥٨٥.

ناویانا وە لەگەڵ ئەوەیشا بەوبڕیارو حوکمە کە تۆ بیدەیت بەبێ چەن‌و چوون‌و پێ ناخۆشبوون رازی بین (ب/ت).

١٩٢٥- (ب ٢ – ز ٩ – ف ٥) [٤].

١٩٢٦– عَنْ الأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) فِي أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةَ ( إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ) كَانَتْ لِي بِئْرٌ فِي أَرْضِ ابْنِ عَمّ لِي، قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيِّنَتُكَ أَوْ يَمِينُهُ فَقُلْتُ إِذًا يَحْلِفَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. وَفِي رِوَايَةٍ[٥]:

١٩٢٧– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ وَهْوَ فِيهَا فَاجِرٌ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللَّهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ. رواهما الشيخان والترمذى والله أعلى وأعلم[٦].

ئەشعەثی کوڕی قەیس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەم ئایەتە لە شانی مندا هاتە خوارەوە! {إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ} بیرێکم هەبوو لەناو زەوی ئەمۆزایەکی خۆمابوو ئامۆزاکەم بیرەکەی لێ زەوت کردم، جا بۆ دادخوایی چووینە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی بەمن: یا بەڵگەی تۆ، یا سوێندی ئەو! گوتم: من بەڵگەو شایەتم نیە، حەزرەت فەرمووی: دە سوێندی بدە گوتم: هەواڵی سوێند نازانێ‌و دەربەستی سوێند نایێ سوێند دەخوا، ئەی پێغەمبەری خودا! لە گێڕانەوەی ئێرەدا: عەبدوڵڵا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ بە درۆ سوێندی ناهەق بخوا لە گێڕانەوەیەکا: سوێندی مەحکەمە بخوا بۆ ئەوە کە ماڵی پیاوێکی موسوڵمانی پێ ببچڕێ‌و بە ناهەق بیکا بە ماڵی خۆی ئەو کەسە کە دەچێتەوە بەر دیوانی خودا خودا رقی لێ دەگرێ‌و زۆری لێ ناڕازییە (ش/ت).

---

[٤] تقدم برقم: ٥/تسلسل/ ٩ من المجلد الثانى.

[٥] بخارى. تفسير: ٤٥٥٠. مسلم. إيمان: ٣٥٣.

[٦] بخارى. مساقاة: ٢٣٥٦، ٢٤١٦، ٢٥١٥، ٢٦٦٦، ٢٦٦٩، ٢٦٧٣، ٢٦٧٦، ٤٥٤٩، ٦٦٥٩، ٦٦٧٦، ٧١٨٣، ٧٤٤٥، ٢٣٥٧، ٢٤١٧، ٢٥١٦، ٢٦٦٧، ٢٦٧٠، ٢٦٧٧، ٧١٨٤. مسلم. إيمان ٣٥٣ — ٣٥٥.

## ١٧٤) ئاوو لەوەڕ قەدەغەیان دروست نیە: (منع الماء والكلأ حرام)

**١٩٢٨– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لاَ تَمْنَعُوا فَضْلَ الْمَاءِ لِتَمْنَعُوا بِهِ فَضْلَ الْكَلإِ**[1].

**ئەبو هورەیرە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئاوی زیادە قەدەغە مەکەن هەتا زیادە لەوەڕی پێ قەدەغە بکەن**[1] **(ش/د/ت/ن–** خودایان لێ رازی بێ**)**.

**١٩٢٩– وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ رَجُلٌ مَنَعَ ابْنَ السَّبِيلِ فَضْلَ مَاءٍ عِنْدَهُ وَرَجُلٌ حَلَفَ عَلَى سِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ – يَعْنِي كَاذِبًا – وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا فَإِنْ أَعْطَاهُ وَفَى لَهُ وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ لَمْ يَفِ لَهُ. رواهما الخمسة**[2].

**دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ:** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە رۆژی قیامەتا ئەم سێ کەسە خودا قسەیان لەگەڵ ناکا: پیاوێ کە زیادە ئاوی هەبێ و لە رێبواری قەدەغە بکا، پیاوێکیش کە لەپاش عەصر کە کاتی بەرزەوەبوونی فریشتەکانە لەگەڵ کردەوەی رۆژی یەندەدا، ئەو لەسەر مامەڵەو سەودا سوێندی درۆ بخوا، پیاوێکیش پەیمان بدا بە پێشەواو سەیری بەرژەوەندی خۆی بکا جا ئەگەر پێشەوا بەشی دا ئەویش بە گوێی دەکا، بەڵام ئەگەر ئەو بەشی نەدا ئەویش بە گوێی ناکا (ش/د/ت/ن.** رەزای خوایان لێبێ**)**.

---

[1] بخاری. مساقاة: ٢٥٥٣، ٢٤٥٤، ٦٩٦٣. مسلم. مساقاة: ٣٩٨٢ – ٣٩٨٣. ترمذی. بیوع: ١٢٧٢.

[1] ئیمامی نەوەوی (پڕ گۆڕەکەی لە نوور بێ) دەفەرموێ: وەك ئەوە کەسێ بیرێکی هەبێ، وە ئاوی بیرەکە لە خۆی زیاد بێ وە لە نزیکی ئەو بیرە لەوەڕ هەبێ، جا ئەگەر خاوەن بیرەکە بیرەکەی قەدەغە بکا لە ماڵاتو ئاژەڵ، لەبەر بێ ئاوی کەس ئاژەڵ ناڵەوەڕێنێ لەو لەوەڕگایە!

١٩٨٣/٨/٢٤ کاتی نوسینەوەی پێشوو (م.د.ع) ١٩٨٧/١١/٣٠ کاتی نووسینەوەی ئێستا (م.ك.ع).

کاتی پاکنووس و هەڵبژێری ئەم چاپی چوارەمە. ٢٠٠٧/٣/٣١. - وەرگێر -

[2] بخاری. مساقاة: ٢٣٦٩، ٧٠٠٨. مسلم. إيمان: ٢٩٥، ٢٩١، ٢٩٢، ٢٩٣. (ریاض/ ٤ ز: ٣٧٠ ژ: ٢٨/ ١٨٣٥).

١٩٣٠- وَلأبي داود: الْمُسْلِمُونَ شُرَكَاءُ فِي ثَلاَثٍ فِي الْكَلإِ وَالْمَاءِ وَالنَّارِ[٣].

ئەبو داوود (خوای گەورەی لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە بە سەنەدێكی صالح: بەڕشتەیەكی گونجاو دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: موسوڵمانان لەم سێ شتەدا هاوبەشن: لە ئاوو لەوەڕو ئاگردا.

## ١٧٥) زەوتكردن نارەوایە: (الغصب حرام)

١٩٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَنْتَهِبُ نُهْبَةً يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهْوَ مُؤْمِنٌ. رَوَاهُ الشيخان[١].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): داوێن پیس لەو كاتەدا كە داوێن پیسیەكە دەكا كموسوڵمان نیە، وە ئارەقخۆر لەو كاتەدا كە ئارەقەكە دەخواتەوە موسوڵمان نیە وە دز لەو كاتەدا كە دزییەكە دەكا موسوڵمان نیە، وە تالانكەر لەو كاتەدا كە لەبەرچاوی خەڵك تالانییەكی گرنگ دەبا موسوڵمان نیە (ش) لە گێڕانەویەكی ئەم فەرموودەیەدا لە ئیبنو عەبباسەوە: وە بەندە لەو كاتەدا كە بەناهەق كەسێ دەكوژێ موسوڵمان نیە لە گێڕانەویەكی تری ئەم فەرموودەیەدا لە ئەبو هورەیرەوە ئەمەی پترە: بەڵام لەوە بەدوا تا كاتی گیانەلاَ تەوبەی پێ نیشان دەدرێ و تەوبەی گیرایە (ش/د/ت/ن).

١٩٣٢- وَقَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ. رَوَاهُ الترمذى والشيخان ولله أعلى وأعلم[٢].

---

[٣] بسند صالح (شرحه).

[١] بخارى. الأشربة: ٥٥٧٨، ٢٤٧٥، ٦٧٧٢، ٦٨١٠. مسلم. إيمان: ٢٠٠ — ٢٠٤.

[٢] بخارى مظالم: ٢٤٨٠. مسلم. إيمان: ٣٥٨. (رياض/ ٣ — ١٣٥٦/٤ = أبو داود: ٤٧٧٢، ترمذى: ١٤٢١).

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ لە سەرماڵی خۆی بکوژرێ شەهیدە، وە کەسێ لەسەر خوێنی خۆی بکوژرێ شەهیدە،وە کەسێ لەسەر ئایینی خۆی بکوژرێ شەهیدە، وە کەسێ لەسەر نامووس و کەسوکاری خۆی بکوژرێ شەهیدە (ت/ش).

## ١٧٦) باسی یازدەهەم: باسی شت بەخشین، دیاریی سوننەتە:

## الباب الحادي عشر: في الهبات الهدية

١٩٣٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا. رَوَاهُ البخاري وأبو داود والترمذي[1].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دیاریی وەردەگرت و پاداشیشی لەسەر دەدایەوە! (ب/د/ت).

١٩٣٤- وَعَنْهَا قَلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِنَّ لِي جَارَيْنِ، فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي؟ قَالَ: إِلَى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ بَابًا. رَوَاهُ البخاري[2].

دیسان ئەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من دوو دراوسێم هەیە لە پێشا دیاری بە کامیان بدەم؟ فەرمووی: بەوەیان کە دەرگاکەی لێتەوە نزیکترە (ب).

١٩٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ دُعِيتُ إِلَى ذِرَاعٍ أَوْ كُرَاعٍ لأَجَبْتُ، وَلَوْ أُهْدِيَ إِلَيَّ ذِرَاعٌ أَوْ كُرَاعٌ لَقَبِلْتُ[3].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر خوڵکم بکەن بۆ سەر پاچەش دچم، یاخود سەروپێشم بە دیاری بۆ بێنن وەری دەگرم! (ب/ت).

---

[1] بخاری. هبة: ٢٥٨٥.

[2] بخاری هبة: ٢٥٩٥.

[3] (ریاض/٢ ز: ٧١ ژ: ٦١٠/٩ = بخاری: ٢٥٦٨).

١٩٣٦- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَهَادَوْا فَإِنَّ الْهَدِيَّةَ تُذْهِبُ وَحَرَ الصَّدْرِ وَلاَ تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا وَلَوْ شِقٌّ فِرْسِنِ شَاةٍ. رواهما البخارى والترمذى[٤].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دیاریی پێشکەشی یەکتریی بکەن، چونکە دیاری دڵ ساف دەکاو دەغەزی سینگ دەکێشێ، ئافرەت بۆ ئافەرتی دراوسێی خۆی هیچ دیاری‌و دەسەنەو کاسە ئاوسێیەك بەکەم نەزانێ، با لاسمی مەڕێکیش بێ! (ب/ت).

## ١٧٧) دۆخە (مەنیحە): (المنیحة)

١٩٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَلاَ رَجُلٌ يَمْنَحُ أَهْلَ بَيْتٍ نَاقَةً تَغْدُو بِعُسٍّ وَتَرُوحُ بِعُسٍّ إِنَّ أَجْرَهَا لَعَظِيمٌ. رَوَاهُ مسلم فى الزكاة[١].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئای بۆ پیاوێ وشترە مێنگەیێ بە دۆخە بدا بە خێزانێ، کە تاقی بەیانی جامێ شیرو تاقی ئێوەرێ جامێ شیریان بداتێ، بە راستی ئەوە خێرێکی گەلێ گەورەیە (م- خودای گەورەی لێ رازی بێ).

١٩٣٨- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: نِعْمَ الْمَنِيحَةُ اللِّقْحَةُ الصَّفِيُّ مِنْحَةً، وَالشَّاةُ الصَّفِيُّ تَغْدُو بِإِنَاءٍ وَتَرُوحُ بِإِنَاءٍ. رَوَاهُ البخارى[٢].

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: وشتری شیرداری بەشیرو مەڕو بزنی شیرداری بەشیر خێرێکی گەلێ چاکن، بۆ کەسێ کە بەدۆخەبیاندا بە خێزانێ، بەیانی قاپێ شیرو ئێوارە قاپێ شیر دەسەنەیەکی گەلێ چاکە (ب).

---

[٤] بخاری. هبة: ٢٥٦٦، ٦٠١٧.

[١] مسلم. زکاة: ٢٣٥٤.

[٢] بخاری. هبة: ٢٦٢٩، ٥٦٠٨.

١٩٣٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَيْنَا رَجُلٌ بِطَرِيقٍ، اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ فَوَجَدَ بِئْرًا فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ، ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَ مِنِّي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ، فَمَلأَ خُفَّهُ مَاءً، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللّٰهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ . قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ لأَجْرًا؟ فَقَالَ: فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ لە چۆڵێ بەرێگەیەکا دەڕۆیی، توونێتی زۆری بۆ هێنا، تا بیرێکی دۆزییەوەو چووە ناوی و ئاوی خواردەوە، کە هاتە دەرەوە (روانی وا سەگێ لە تووینیانا زمانی دەرکێشاوەو هاسکە هاسکێتی و لە تاوا تەڕایی دەوری بیرەکە دەلێسێتەوە، جا پیاوەکە لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەم سەگەیش لە تووینیانا وەك منی بەسەر هاتووە! جا دیسانەوە رۆیشتە خوارەوە بۆ ناوبیرەکەو کاڵە (خوففە)کەی خۆی پڕکرد لە ئاوو گرتی بە دەمیەوەو سەرکەوتەوە سەرێ و سەگەکەی ئاودا، جا خودا لەسەر ئەوە سوپاسی کردو تۆڵەی بۆ کۆدەوەو لێی خۆش بوو.

یارانیش گوتیان: ئەی رەوانەکراوی خودا! دیارە هەر چاکەیێ لەگەڵ گیانلەبەری بێ زمانا بکەین خێرو پاداشی هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ هەر چاکەیێ لەگەڵ شتێ بکرێ، کە تەڕایی ژیانی تیابێ خێرێکی گەورەیە (ش).

## ١٧٨) پاشگەزبوونەوە لە دەسنەو بەخشش دروست نیە:

## يحرم الرجوع في العطية

١٩٤٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ. رَوَاهُ الخمسة وَفِي رِوَايَةٍ: لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ، الَّذِي يَعُودُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَرْجِعُ فِي قَيْئِهِ[١].

---

[٣] بخاری. مساقاة: ٢٣٦٣. مسلم. سلام: ٥٨٢٠ (ریاض / ١ ز: ١٣ ژ-١٠/ ١٢٦).

[١] بخاری. هبة: ٢٥٨٩، ٢٦٢١، ٢٦٢٢، ٦٩٧٥. مسلم. هبات: ٤١٤٦ — ٤١٥٢. أبو داود. بیوع: ٣٥٣٨. نسائی. هبة: ٣٦٩٥، ٣٦٩٦، ٣٦٩٧، ٣٦٩٨، ٣٦٩٩ (ریاض/ ٤ ز: ٢٨٥ ژ: ١٦١٢/١).

ئیبنــو عــەبباس (خوایــان لیٚ ڕازی بــێ) گــوتی: حــەزرەت (دروودی خــودای لەســەربێ) دەفـەرموێ: کەسـێ دەسـەنەی خـۆی دووبـارە هەڵبگرێتـەوە یـا بـی سـەنێتەوە لـەو کەسە کە پێی بەخشیوە وەك ئەوە وایە کە سـەر لـەنوێ ڕشانەوەی خـۆی دووبـارە بخواتەوە! (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: ڕەفتاری ناشیرین لـە ئێمـەوە دوورە، وەك ڕەفتـاری ئـەو کەسـەی کـە لـە دەسـەنەو بەخششی خـۆی پاشـگەز دەبێتـەوە، ئـەوە وەکی سەگ وایە، کە دەرشێتەوە، کە دووبارە ڕشانەوەکەی خۆی دەخواتەوە!

١٩٤١- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يُعْطِيَ عَطِيَّةً أَوْ يَهَبَ هِبَةً فَيَرْجِعَ فِيهَا إِلاَّ الْوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ وَمَثَلُ الَّذِي يُعْطِي الْعَطِيَّةَ ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَا كَمَثَلِ الْكَلْبِ يَأْكُلُ فَإِذَا شَبِعَ قَاءَ ثُمَّ عَادَ فِي قَيْئِهِ. رَوَاهُ اصحاب السنن[٢].

دیـسان گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: پیـاو کـە شـتێکی بەخـشی، یابەخشیشێکی دا بـە کەسـێ، ئیتر دروسـت نیـە کـە لێـی پەشیمان ببێتەوە، مەگەر باوك و دایك و باپیرەو نەنك، دوورو نزیکیان بەڵام بۆ ئەمانە (ئەگەر شتێ ببەخشن بە منالّی خۆیان) دروستە لێی پەشیمان ببنـەوە چونکە منالّ خۆی و مالّی هی بابیەتی! ئەو کەسەیش کە شتێ دەبەخشێ و لە پاشا لێـی پەشیمان دەبێتـەوە وەك سـەگ وایـە، کـە هـەر دەخـوات، کـە تـەواو تێربوو دەڕشێتەوە، لـە پاشا کاتـێ ویستی ڕشانەوەکەی خـۆی دەخواتـەوە! (د/ت/ن–س/ص. خوایان لیٚ ڕازی بێ).

## ١٧٩) عومراو روقبا: (العمری والرقبی[١])

[٢] بسند صحيح ٠شرحه).

[١] عمرا لە عومر وەرگیراوە، کە بـەمانا مـان و تەمـەن و ژیانـە، وەك ئـەوە پێـی بلّـێ: ئـەم شـتە بـۆ تـۆ تاماویت، یا بلّێ: ئەمەم بەخشی بەتۆ تا خۆت ماویت بۆ خۆت، لەپاش خۆت بۆ وەچەو نەتەوەت.

روقباش لە ماددەی موراقەبە وەرگیراوە، کە بەمانا (چاوەنوارییە. وەك ئەوە پێی بلّـێ: ئەمـەم دا بەتۆ، وە هەردووکمان چاوەڕوانی مردنـی یـەکتری دەکـەین: ئەگـەر مـن لـە پێـشا مـردم ئـەوا بـە یەکجاری ببێ بەهی خۆت، وە ئەگەر تۆیش لەپێش مندا مردی ئەوا ببێتەوە بەهی خۆم.

١٩٤٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَضَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْعُمْرَى أَنَّهَا لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ. رَوَاهُ الخمسة[1].

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بڕیاری داوە ئەگەر کەسێ شتێ ببەخشێ بەکەسێ، کە تاماوەیێ بۆ خۆی بێ، ئەوە دەبێ بەهی ئەو کەسە کە پێی بەخشراوە (ش/د/ت/ن).

١٩٤٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْمَرَ رَجُلاً عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ فَقَالَ: قَدْ أَعْطَيْتُكَهَا وَعَقِبَكَ مَا بَقِيَ مِنْكُمْ أَحَدٌ. فَإِنَّهَا لِمَنْ أُعْطِيَهَا. وَإِنَّهَا لاَ تَرْجِعُ إِلَى صَاحِبِهَا مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ أَعْطَى عَطَاءً وَقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر پیاوێ شتێکی دا بە پیاوێ، کە بۆ خۆی بێ، یا بۆ وەچەی بێ لە پاش خۆی، وە گوتی: ئەمەم دا بەتۆو بەوەچەی تۆ تا یەکێکتان بمێنێ، ئەوە دەبێ بەهی ئەو کەسەی کە دراوە پێی، وە جارێکی تر نابێتەوە بەهی خاوەنە پێشووەکەی، چونکە ئەم جۆرە دەسەنەو بەخشینە بەشی کەلەپوور وەرگر (میراتبەر)ی تێ دەکەوێ! (م/د/ت/ن).

١٩٤٤- وَعَنْهُ قَالَ: إِنَّمَا الْعُمْرَى الَّتِي أَجَازَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يَقُولَ هِيَ لَكَ وَلِعَقِبِكَ. فَأَمَّا إِذَا قَالَ هِيَ لَكَ مَا عِشْتَ. فَإِنَّهَا تَرْجِعُ إِلَى صَاحِبِهَا. قَالَ مَعْمَرٌ وَكَانَ الزُّهْرِيُّ يُفْتِي بِهِ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود[3].

---

من پێشنیار دەکەم کە زینەبەخش بکرێ بە زاراو بۆ عومرا یا ژینە بەخش، وە هەروا تەمابەخش بکرێ بە زاراو بۆ روقبا نەمە لە مەرجێکا کە ئەم دووشتە لە کوردیدا زاراویان نەبێ، زمانی کوردی زۆر دەوڵەمەندە بەڵام بێ کەسو بێ خزمەتە. - وەرگێڕ -

[1] مسلم. هبات: ٤١٦٤، ٤١٦٥، ٤١٦٦. بخاري. هبة: ٢٦٢٥. أبو داود. بيوع: ٣٥٥٠، ٣٥٥٤. ترمذي. أحكام. ٣١٤٨. نسائي. عمرى: ٣٧٤٤، ٣٧٤٥، ٣٧٤٧ — ٣٧٥٢.

[2] مسلم. هبات: ٤١٦٧ تقدم تخريجه بمثل الحديث الذي قبله (الحديث ٢/١٩٠٠).

دیسان گوتی: ئەو عومرایەی کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی داوە ئەوەتا کە بڵێ: ئەمە بۆ خۆت‌و بۆ وەچەت، بەڵام ئەگەر بڵێ: ئەمە بۆ خۆت تاماویت، ئەوە دەبێتەوە بەهی خاوەنەکەی. جاران زوهری بەم چەشنە ڕەوا (فەتوا)ی دەدا (م/د).

١٩٤٥- وَعَنْهُ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي امْرَأَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ أَعْطَاهَا ابْنُهَا حَدِيقَةً مِنْ نَخْلٍ فَمَاتَتْ فَقَالَ ابْنُهَا إِنَّمَا أَعْطَيْتُهَا حَيَاتَهَا. وَلَهُ إِخْوَةٌ قَالُوا: نَحْنُ فِيهِ سَوَاءٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هِيَ لَهَا حَيَاتَهَا وَمَوْتَهَا. قَالَ: كُنْتُ تَصَدَّقْتُ بِهَا عَلَيْهَا. قَالَ: ذَلِكَ أَبْعَدُ لَكَ. رَوَاهُ أبو داود وأحمد والله تعالى أعلى وأعلم[٤].

دیسان گوتی: ئافرەتێکی ئەنصاری، کوڕێکی باخێ خورمای دابووپێی، کە دایکەکەی مرد کوڕەکە گوتی: من تەنیا بۆ ئەوەندە داومەتێ کە تا خۆی ماوە، چەن برایەکی تری هەبوون گوتیان: ئەم باخە بۆ هەموومانە وەك یەك چونکە کەلەپوورەوە لە دایکمانەوە بۆمان بەجێماوە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی ڕاستە ئەمە لە ژیان‌و مردندا هی خۆیەتی.

کوڕەکە گوتی: خۆ من بە خێردابووم پێی، فەرمووی: دەسا ئەمە باشتر قسەت دەبڕێ! (د-س/ص-ئەحمەد).

## ١٨٠) خەڵاتی (قەطائیع): (القطائع)

١٩٤٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: دَعَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الأَنْصَارَ لِيُقْطِعَ لَهُمْ بِالْبَحْرَيْنِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ فَعَلْتَ فَاكْتُبْ لإِخْوَانِنَا مِنْ قُرَيْشٍ بِمِثْلِهَا، فَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي. رَوَاهُ البخاري[١].

---

[٤] رواه أبو داود بسند صحيح (شرحه).

[١] بخاری جزیة: ٣١٦٣.

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یاریدەدەرانی بانگکرد کە لە بەحرەین بەشە زەوییان بۆ جیا بکاتەوەو بە بەخشیش بەرە جوتیان بداتێ.

ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر زەوی دەدەی بە ئێمە دەبێ بەقەد ئێمە بەشی برا کۆچەرەکانیشمان بدەیت.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوەندە زەوی نەبوو کە بەشی هەر دوولایان بکا لەبەر ئەوە فەرمووی: لەپاش خۆم خۆ خۆیی لە ناوتان روو دەداو بە چاوی خۆتان دەیدینن جا ددان بە خۆتانا بگرن و سەبر بکەن و بەکەمترین مەهانە ئاژاوە بەرپا مەکەن هەتا لە قیامەتا دەگەنەوە بە خۆم، جا ئەو کاتە پاداشی خۆتان بە زیادەوە وەردەگرن (ب).

١٩٤٧- عَنْ وَائِلٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَقْطَعَهُ أَرْضًا بِحَضْرَمَوْتَ وَبَعَثَ مَعَهُ مُعَاوِيَةَ لِيُقْطِعَهَا إِيَّاهُ. رَوَاهُ أبو داود والترمذى وصححه[٢].

وائیل (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە حەضرەمەوت پارچەیێ زەوی پێ بەخشیم، وە موعاوییەی لەگەڵدا ناردم تا بۆم جیا بکاتەوە (د/ت:ص).

١٩٤٨- وَقَالَ عَمْرُو بْنِ حُرَيْثٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) خَطَّ لِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَارًا بِالْمَدِينَةِ بِقَوْسٍ وَقَالَ: أَزِيدُكَ أَزِيدُكَ[٣].

عەمری کوڕی حورەیث (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە مەدینە بە کەوانێ جێگە خانوویەکی بۆ دیاری کردم و فەرمووی: پتری بکەم بۆت یا بەستە؟ (د-سند صالح).

---

[٢] صحيح عند الترمذى.

[٣] بسند صالح (شرحه).

١٩٥٠- وَأَقْطَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِلاَلَ بْنَ الْحَارِثِ الْمُزَنِيَّ مَعَادِنَ الْقَبَلِيَّةِ وَهِيَ مِنْ نَاحِيَةِ الْفُرْعِ فَتِلْكَ الْمَعَادِنُ لاَ يُؤْخَذُ مِنْهَا إِلاَّ الزَّكَاةُ إِلَى الْيَوْمِ. وَكَتَبَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذَا مَا أَعْطَى مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِلاَلَ بْنَ الْحَارِثِ الْمُزَنِيَّ أَعْطَاهُ مَعَادِنَ الْقَبَلِيَّةِ جَلْسِيَّهَا وَغَوْرَهَا وَحَيْثُ يَصْلُحُ الزَّرْعُ مِنْ قُدْسٍ وَلَمْ يُعْطِهِ حَقَّ مُسْلِمٍ. رواهما أبو داود والله أعلى وأعلم[٤].

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کانەکانی قەبەلییەی بە خەڵات بەخشی بە بیلالی کوڕی حاریثی موزەنی، وە ئەوکانانە هەتا ئەمڕۆ (جگە لە زەکات) بەشی کەسی تریان پێوە نیە.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەم قەواڵەیەی بۆ نووسی: بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان، موحەممەد کە پێغەمبەری خودایە ئەم شوێنانەی بە خەڵاتی داوە بە بیلالی کوڕی حاریثی موزەنی، کە بریتین لە کانەکانی قەبەلییە، چ هەورازیان چ نەوییان، لەگەڵ ئەوەی بە کەڵکی کشتووکاڵ بێ لە چیای قودس کە لە نەجدە، وە هەرچی لەم شوێنانە مافی موسوڵمانێکی تری پێوە بێ ئەوەی نەداوەتێ (د-سند صالح).

## ١٨١) باسی دوانزەهەم: باسی وەقف
## الباب الثاني عشر: في الوقف

١٩٥١- (ب ١ - ز ١٩ - ف ٢)[١].

## ١٨٢) باسی زەوی وەقف: (وقف الأرض)

١٩٥٢- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَرَ أَنْصَارِيٍّ بِالْمَدِينَةِ مَالاً وَكَانَ أَحَبَّ أَمْوَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرَحَى وَكَانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ الْمَسْجِدِ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْخُلُهَا وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ. قَالَ أَنَسٌ فَلَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ

---

[٤] بسند صالح (شرحه).

[١] تقدم برقم: ٢/ من تسلسل/ ١٩ من المجلد الأول. (مترجم).

حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ) قَامَ أَبُو طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ (لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ) وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بَيْرَحَى وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ لِلَّهِ أَرْجُو بِرَّهَا وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللَّهِ فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ حَيْثُ شِئْتَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَخْ ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ قَدْ سَمِعْتُ مَا قُلْتَ فِيهَا وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ. فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ وَبَنِي عَمِّهِ. رَوَاهُ الشيخان والترمذی(١).

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە مەدینە ئەبو طەلحە لەناو یاریدەدەرانا لە هەموویان دەوڵەمەندتر بوو، باخێ خورمای هەبوو ناوی بەیرەحا بوو، بەرابەر قیبلەی مزگەوتەكەی پێغەمبەر بوو، ئەم باخە خۆشەویسترین ماڵی بوو" كانیاوێكی سازگاری تیابوو، گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەشریفی دەچوو لە ئاوەكەی دەخواردەوە.

جا كاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ} (٩٢/٣).

واتە: ناگەن بە پاداشی چاك و خێری تەواو هەتا سەرف دەكەن لە ڕێگەی خودادا لە ماڵە نایاب و خۆشەویستەكانتان و لەو نازو نیعمەت و پایەو بەهرە باشانەی كە خودا پێی داون ئەبو طەلحە هەڵسا چوو بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: قوربان! خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا كە نامەی خۆیەتی دەفەرموێ: {لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ} وە منیش باشترین ماڵم بەلامەوە باخی بەیرەحایە، جا ئەوا كردم بەخێر، ساخ لەبەر ڕەزای خودا، ئومێد دەكەم كە خودا بە چاكە بینوسێ بۆم و پاشاكەوتی بكا بۆم بۆ ڕۆژی دواییم جا تۆیش ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت سەرپشك بە چۆنی بەباش دەزانی ئاوای لێ بكە.

---

(١) بخاری. زكاة: ١٤٦١، ٢٣١٨، ٢٧٥٢، ٢٧٥٨، ٢٧٦٩، ٤٥٥٤، ٤٥٥٥، ٥٦١١. مسلم. زكاة: ٢٣١٢. أبو داود. زكاة: ١٦٨٩. نسائی. إحباس: ٣٦٠٤. (ریاض/ ١ ز – ٣٧ ژ: ٢٩٧/١).

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەه، بەه لەم خێرە جوانە بەراستی ماڵی بەسوودو خێردار ئاوا دەبێ! تێ گەیشتم دەڵێی چی، من وا بە باشی دەزانم کە بیدەی بە خزم و خوێشانی خۆت.

جا ئەبو طەلحە دابەشی کرد بەسەر خزم و ئامۆزاکانی خۆی دا (ش/ت، خودای گەورە لێیان رازی بێ).

١٩٥٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) قَالَ أَصَابَ عُمَرَ أَرْضًا بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَأْمِرُهُ فِيهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ، لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ هُوَ أَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُنِي بِهِ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا. فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ أَنَّهُ لاَ يُبَاعُ أَصْلُهَا وَلاَ يُبْتَاعُ وَلاَ يُورَثُ، وَلاَ يُوهَبُ. قَالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ فِي الْفُقَرَاءِ وَفِي الْقُرْبَى، وَفِي الرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لاَ جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، أَوْيُطْعِمَ صَدِيقاً غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: عومەر زەوییەکی دەست کەوت لە خەیبەر، چوو بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە راوێژی پێ بکا، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پارچەیێ زەویم چنگ کەوتووە لە خەیبەر، ئەوەتی هەم ماڵی وا نایابم نەبووە، دەمەوێ بیکەم بەخێر، تۆ دەفەرمووی بیکەم بەچی؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەگەر حەزدەکەی خۆی بکە بەوەقف و دەرامەتەکەی بکە بە خێر! جا عومەریش (خوای لێ رازی بێ) لەسەر ئەم شێوەیە کردی بەخێر: جێ زەوییەکە خۆی نەدەفرۆشرێ، نە دەکڕرێ، نە بەکەلەپوور دەبرێ، نە دەبەخشرێ. گوتی: عومەر دەرامەتەکەی وەقف کرد لەسەر ئەم کەسانە: لەسەر هەژاران و خزم و خۆێشان و لەرێی ئازادکردنی بەندەداو لە رێگەی خوداداو لەسەر رێبوارو میوان، وە ئەو کەسەیشی کە سەرپەرشتی

---

[٢] بخاری. شروط: ٢٧٣٧. مسلم. وصیة: ٤٢٠٠. أبو داود وصایا: ٢٨٧٨. ترمذی. أحکام: ١٣٧٥. نسائی. إحباس: ٣٦٠١ — ٣٦٠٣.

ئەو وەقفە دەکا گوناهی لەسەر نیە ئەگەر بەشێوەیەکی پەسەند خۆی لێی بخوا، یا دەرخواردی دۆست و برادەری بدا، بە مەرجێ لێی نەیکا بە ماڵ و بیکا بەهی خۆی (ش/د/ت/ن، رەزای خودای گەورەیان لێبێ).

١٩٥٤- وَعَنْهُ قَالَ: كَتَبَ مُعَيْقِيبٌ وَشَهِدَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ الأَرْقَمِ بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذَا مَا أَوْصَى بِهِ عَبْدُ اللّٰهِ عُمَرُ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ إِنْ حَدَثَ بِهِ حَدَثٌ أَنَّ ثَمْغًا وَصِرْمَةَ ابْنَ الأَكْوَعِ وَالْعَبْدَ الَّذِي فِيهِ وَالْمِائَةَ سَهْمٍ الَّتِي بِخَيْبَرَ وَرَقِيقَهُ الَّذِي فِيهِ وَالْمِائَةَ الَّتِي أَطْعَمَهُ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْوَادِي تَلِيهِ حَفْصَةُ مَا عَاشَتْ ثُمَّ يَلِيهِ ذُو الرَّأْيِ مِنْ أَهْلِهَا أَنْ لاَ يُبَاعَ وَلاَ يُشْتَرَى يُنْفِقُهُ حَيْثُ رَأَى مِنَ السَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ وَذِي الْقُرْبَى وَلاَ حَرَجَ عَلَى مَنْ وَلِيَهُ إِنْ أَكَلَ أَوْ آكَلَ أَوِ اشْتَرَى رَقِيقًا مِنْهُ. رَوَاهُ أبو داود[٣].

دیسان گوتی: ئەمە راسپێری (وەصییەت)ەکەی عومەر بوو، کە موعەیقیب نووسی و عەبدوڵلای کوڕی ئەرقەم بوو بە شایەت: بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان، ئەمە راسپێریی عومەرە، کە بەندەی خودایەو ئێستا فەرمانڕەوای موسوڵمانانە، ئەگەر خۆی شتێکی لێهات ئەوا زەوی ثەمغ و ئەوبەندەیەی ئیشی تیا دەکاو باخی صیرمەی کوڕی ئەکوەع و ئەو سەد پشکەی کە لە خەیبەرەوە ئەو کۆیلەیەی کاری تیا دەکاو ئەو سەد وەسقە ساڵانەیش کە موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) لە ئەلوادی داویەتی پێی بۆ نانی ساڵی، ئەمانە هەموویان وەقف بن و حەفصەی کچم تا ماوە سەرپەرشتییان دەکا، لەپاش خۆشی هۆشیارانی کەسوکاری ئەو سەرەو کارییان دەکەن، بەو مەرجە کە نەهیچی لێ دەفرۆشرێ و نە هیچی لێ دەکڕرێ، چۆن خۆی بە باشی دەزانێ ئاوا بۆگەداو هەژارو بێ نەواو خزم و خوێش سەرفی بکا، وە ئەو کەسەشی کە سەرەوکاری دەکا قەیدی نیە ئەگەر خۆی لێی بخوا، یا دەرخواردی یەکێکی تری بدا، یاخودبەندەو ئامێرو شتی وای لێ بگرێ بۆ بەرهەمهێنانی (د-سند صالح).

---

[٣] بسند صالح (شرحه).

## ١٨٣) وەقفکردنی مزگەوت و بیر: (وقف المسجد والبئر)

١٩٥٥- (ب - ز ٢٢٣ - ف ٢) = ژمارە: ٢/١١٥٠(١).

١٩٥٦- عَنْ عُثْمَانَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ حَفَرَ بِئْرَ رُومَةَ فَلَهُ الْجَنَّةُ فَحَفَرْتُهَا. رَوَاهُ البخارى والترمذى والنسائى[2].

عوسمان (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ بیری ڕۆمە هەڵکەنێ بەهەشتییە منیش لەسەر مەسرەفی خۆم هەڵم کەند (ب/ت/ن).

١٩٥٧- ولفظ الترمذى والنسائى: قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ وَلَيْسَ بِهَا مَاءٌ عَذَبَ إِلاَّ بِئْرِ رُومَةَ فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ يَشْتَرِى بِئْرَ رُومَةَ فَيَجْعَلُ دَلْوَهُ فِيهَا مَعَ دِلاَءِ الْمُسْلِمِينَ بِخَيْرٍ لَهُ مِنْهَا فِي الْجَنَّةِ فَاشْتَرَيْتُهَا مِنْ صُلْبِ مَالِى فَجَعَلْتُ دَلْوِى فِيهَا مَعَ دِلاَءِ الْمُسْلِمِينَ وَأَنْتُمُ الْيَوْمَ تَمْنَعُونِى أَنْ أَشْرَبَ مِنْهَا حَتَّى أَشْرَبَ مِنْ مَاءِ الْبَحْرِ. قَالُوا اللَّهُمَّ نَعَمْ.

گفتەی تیرمیذی و نەسائی (خودایان لێ ڕازی بێ) بەپێی شەرحی غایەتولمەئموول ئاوایە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە تەشریف هێنا بۆ مەدینە، جگە لە بیری (ڕومە) ئاوی شیرینی تری لێ نەبوو، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ بیرێ بکڕێ و بیکا بە وەقف بۆ موسوڵمانان و خۆشی وەك یەکێ لەوان سوودی لێ وەربگرێ، ئەو کەسە خودای گەورە لە بەهەشتا لەو بیرە گەلێ باشتر تۆڵەی بۆ دەکاتەوە.

عوسمان گوتی: جا منیش بە پارەی ساغی خۆم بیری ڕوومەم کڕی بە بیست و پێنج (یا گوتی: بە سی و پێنج) هەزار درەم. ئەم بیرە لە پێشا کارێز بوو، هی کابرایەکی بەنی غیفاری بوو، جا عوسمان کردی بە بیرو سەری

---

[1] تقدم برقم ٢/١١٥٠ فى تسلسل/ ٢٢٣ من المجلد الأول (مترجم).

[2] بخارى. وقف: ٢٧٧٨.

گـرت و کـردی بـە وەقفـی موسـوڵمانان و خۆشـی وەك یـەکێ لـە موسـوڵمانان سوودی لێ وەردەگرت و بەس. (ڕەزای خودای گەورەی لێبێ).

١٩٥٨- عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمَّ سَعْدٍ مَاتَتْ فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: الْمَاءُ. قَالَ: فَحَفَرَ بِئْرًا وَقَالَ هَذِهِ لأُمِّ سَعْدٍ. رَوَاهُ ابو داود والنسائي. وزاد: فَتِلْكَ سِقَايَةُ سَعْدٍ بِالْمَدِينَةِ. ولله تعالى أعلى وأعلم[٣].

سەعدی کوڕی عوبادە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی ڕەهبەری خودا! دایکم مردووە دەمەوێ خێری بۆ بکەم کام خێرە زۆر گەورەیە تا بۆی بکەم؟ فەرمووی: ئاو. ئەویش بیرێکی لێ داو گوتی: ئەمە وەقف بێ و خێرەکەی بۆ دایکم بێ. (د/ن)" نەسائی ئەمەشی زیاتر کردووە: خێراوەکەی سەعد لە مەدینە هی ئەمەیە کە ئێستاش ماوە، هەر وەك وەقفی صەحابەکانی تریش ماوە.

## ١٨٤) پاشەکی: باسی دۆزراوە: (خاتمة في اللقطة)

١٩٥٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ آوَى ضَالَّةً فَهُوَ ضَالٌّ مَا لَمْ يُعَرِّفْهَا. رَوَاهُ مسلم وأحمد[١].

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ گومبوویێ بدۆزرێتەوە حەشاری بداو ناونیشانی وەك ئشەریعەت دەفەرموێ: هەڵنەدا ئەوە خۆشی لێ گومبوو گومڕایە (م/ئەحمەد).

١٩٦٠- وَعَنْهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَأَلَهُ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ: اعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا وَإِلاَّ فَشَأْنَكَ

---

[٣] بخاری. وصایا: ٢٧٥٦، ٢٧٦٢، ٢٧٧٠ (ریاض/ ٣ ز: ١٦٢ ژ: ٩٤٨/١ = متفق علیه: بخاری: ١٣٨٨. مسلم: ١٠٠٤).

[١] مسلم. لقطه: ٤٤٨٥.

بِهَا. قَالَ: فَضَالَّةُ الْغَنَمِ؟ قَالَ: هِيَ لَكَ أَوْ لأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ. قَالَ: فَضَالَّةُ الإِبِلِ؟ قَالَ: مَالَكَ وَلَهَا! مَعَهَا سِقَاؤُهَا وَحِذَاؤُهَا، تَرِدُ الْمَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ، حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا. رَوَاهُ الشيخان والترمذى[٢].

**دیسان ئەو گوتی: پیاوێ هاتە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزی کرد: حوکمی ماڵی دۆزراوە چییە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): پڕیاسکەو بوخچەو دەمبێنەکەی نیشانە بکە، وە هەتا ساڵێ ناونیشانی هەڵبدە، جا ئەگەر لەو ماوەیەدا خاوەنەکەی پەیدابوو ئەوە بیدەرەوە پێی، ئەگینا چی لێ دەکەی بیکە.**

**گوتی: ئەی حوکمی بزن و مەڕی ونبوو چییە؟ فەرمووی: ئەگەر تۆ نەیبەیت و خاوەنەکەی نەیدۆزێتەوە دیارە کە گورگ دەیخوا! گوتی: ئەی حوکمی وشتری بزر چییە؟ فەرمووی: دەخڵت نەبێ بەسەریەوەو دەغڵی مەکە، ئەو کوندەو پێڵاوی خۆی پێیە، بۆ خۆی ئاو دەخواتەوەو دەلەوەڕێ هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە (ش/ت).**

١٩٦١- وَسُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ اللُّقَطَةِ الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ فَقَالَ: اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً فَإِنْ لَمْ تَعْرِفْ فَاسْتَنْفِقْهَا وَلْتَكُنْ وَدِيعَةً عِنْدَكَ فَإِنْ جَاءَ طَالِبُهَا يَوْمًا مِنَ الدَّهْرِ فَأَدِّهَا إِلَيْهِ. رَوَاهُ مسلم[٣].

**پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حوکمی زێڕو زیوی دۆزراوە چییە؟ فەرمووی: پڕیاسکەو دەمبێنەکەی نیشانە بکە، وەتا ساڵێ جاڕی بۆ بدە، جا ئەگەر لەوماوەدا خاوەنەکەی پەیدابوو ئەوا بیدەرەوە پێی، بەڵام ئەگەر خاوەنەکەی پەیدا نەبوو ئەوسا خەرجی بکە وە لە هەمان کاتدا**

---

[٢] بخاری. علم: ٩١، ٢٣٧٢، ٢٤٢٧، ٢٤٢٨، ٢٤٣٦، ٢٤٣٨، ٥٢٩٢، ٦١١٢. مسلم. لقطە: ٤٤٧٣ — ٤٤٨٣. أبو داود. لقطة: ١٧٠٤. ترمذی. أحكام: ١٣٧٢.

[٣] مسلم. لقطة: ٤٤٧٤.

دایبنێ كە سپاردە (وەدیعە)یە لەلات هەركاتێ خاوەنەكەی داوای كردەوە دەبێ بیدەیتەوە پێی! (موسلیم. خودای لێ ڕازی بێ).

١٩٦٢- وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنِ الْتَقَطَ لُقَطَةً يَسِيرَةً دِرْهَماً أَوْ حَبْلاً أَوْ شِبْهَ ذَلِكَ فَلْيُعَرِّفْهُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فَإِنْ كَانَ فَوْقَ ذَلِكَ فَلْيُعَرِّفْهُ سِتَّةَ أَيَّامٍ. فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا وَإِلاَّ فَلْيَتَصَدَّقْ بِهاَ. رَوَاهُ أحمد والطبراني والبيهقي[٤].

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر یەكێ شتێكی سووكەڵەی كەم نرخی دۆزییەوە (وەك گوریسێ یا درەمێ یا شتێكی وا) با تا سێ ڕۆژ جاری بۆ هەڵدا، بەڵام ئەگەر ئاوا شتێ لەوە زیاتر بوو، با تاشەش ڕۆژ جاڕی بۆ هەڵدا، جا ئەگەر خاوەنەكەی پەیدابوو ئەوا باشە، ئەگینا با بیكا بەخێر! (ئەحمەد/ طەبەرانی/ بەیهەقی-س/ح).

١٩٦٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِهِ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تُؤْتَى مَشْرُبَتُهُ فَتُكْسَرَ خِزَانَتُهُ فَيُنْتَقَلَ طَعَامُهُ إِنَّمَا تَخْزُنُ لَهُمْ ضُرُوعُ مَوَاشِيهِمْ أَطْعِمَتَهُمْ فَلاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِهِ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي. ولفظه: إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ عَلَى مَاشِيَةٍ فَإِنْ كَانَ فِيهَا صَاحِبُهَا فَلْيَسْتَأْذِنْهُ فَإِنْ أَذِنَ لَهُ فَلْيَحْلِبْ وَلْيَشْرَبْ وَلاَ يَحْمِلْ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهَا أَحَدٌ فَلْيُصَوِّتْ ثَلاَثًا فَإِنْ أَجَابَهُ فَلْيَسْتَأْذِنْهُ وَإِلاَّ فَلْيَحْتَلِبْ وَلْيَشْرَبْ وَلاَ يَحْمِلْ[٥].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ خۆش نوود بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: كەس ئاژەڵی كەس نەدۆشێ، مەگەر بە ڕەزای خۆی، كامتان پێتان خۆشە كە ڕەفەكەتان بشكێنن‌و خواردنەكەتان ببەن دیارە كەس ئەمەی پێ خۆش نیە دە ئەو خەڵكەیش گوانی ئاژەڵەكانیان دۆڵابێ خۆراكەكەیانە! كەواتە كەس ئاژەڵی كەس نەدۆشێ مەگەر بە خواستی خۆی (ش/ت) گفتەی (ت): ئەگەر كەسێ چوو بۆ ناو ئاژەڵ ئەگەر خاوەنەكەی لەوێ بوو باداوای

---

[٤] بسند حسن (شرحه).

[٥] بخاری. لقطة: ٢٤٣٥. مسلم. لقطة: ٤٤٨٦. أبو داود. جهاد: ٢٦٢٣.

شیری لێ بکا، جا ئەگەر ڕێگەی دا با ئەوەندە شیر بدۆشێ کە خۆی بۆی بخورێتەوە، وە نابێ لێی ببا، بەڵام ئەگەر کەس لەوێ نەبوو باسێ جار بانگەواز بکا، جا ئەگەر کەسێ وەڵامی دایەوە، با ڕوخصەتی لێ بخوازێ، ئەگینا با ئەوەندە شیر بدۆشێ کە خۆی بیخواتەوە، وە نابێ لێی ببا.

## ١٨٥) داکەوتەی مەککەو حاجی: (لقطة مكة والحاج)

**١٩٦٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) **عَنْ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **إِنَّهُ فِي خُطْبَتِهِ فِي فَتْحِ مَكَةَ: وَلاَ تَحِلُّ لُقَطَتُهَا إِلاَّ لِمُنْشِدٍ. رواه الشيخان**[1].

**ئیبنو عەبباس** (خوایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **(لە وتارەکەی ڕۆژی گرتنی شاری مەککەدا) فەرمووی: هەڵگرتنی شتی داکەوتووی ناو مککە دروست نیە، مەگەر بۆ کەسێ کە ناونیشانی هەڵبدا وەك ئەوە لە دەرگای مزگەوت و لەناو بازاڕداو لە جێگەی کۆبوونەوەی مەردم بانگەواز هەڵدا: کێ شتی بزبووە بابێت بۆ لای من، ناونیشانی هەڵبدا.**

**١٩٦٥- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ** (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **نَهَى عَنْ لُقَطَةِ الْحَاجِّ. رَوَاهُ مسلم والله أعلى وأعلم**[2].

**عەبدولڕەحمانی کوڕی عوسمانی تەیمی** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **نەهی کردووە لە هەڵگرتنی شتی داکەوتووی حاجی (م).**

---

[1] تقدم برقم: ١٧٠١ فی تسلسل/ ١٣٩ من هذا المجلد (مترجم).

[2] مسلم. لقطة: ٤٤٨٤. أبو داود. لقطة: ١٧١٩.

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی فەرائیزو راسپێری (وەصییەت)و بەندە ئازادکردن

(هەشت بەش‌و دوا وتارێکە)

**١) بەشی یەکەم: هاندان لەسەر فێربوونی فەرائیزو دادپەروەری لە پشك داناندا:**

**كتاب الفرائض والوصايا والعتق.وفيه ثمانية فصول وخاتمة.**

**الفصل الأول: في الحث على تعليمه والعدل في القسمة**

١٩٥٦- ➡ (ب-١ / ز-١٤/ ف-٥)(١).

٢٩٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنـهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّم) قَـالَ: تَعَلَّمُـوا الْقُرْآنَ وَالْفَرَائِضَ وَعَلِّمُوا النَّاسَ فَإِنِّي مَقْبُوضٌ. رواه الترمذي والحاكم[٢].

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **لە حەزرەتەوە دەفەرموێ:** (دروودی خودای لەسەر بێ): **هەم خۆتـان فێـری قورئـان‌و زانستی فـەرائیز بـبن، وەهـەم خـەڵکی تـریش فێربکەن، چونکە من لەسەر مردن‌و کۆچ کردنم!** (ت- سند ضعيف- حاكم).

١٩٥٨- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضيَ اللهُ عَنهمـا) قَالَ: انْطَلَقَ بِي أَبِـي يَحْمِلُنِـي إِلَـى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اشْهَدْ أَنِّي قَدْ نَحَلْتُ النُّعْمَانَ كَذَا وَكَذَا مِنْ مَالِي. فَقَالَ: أَكُلَّ بَنِيكَ قَدْ نَحَلْتَ مِثْلَ هَذَا؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَأَشْهِدْ عَلَى هَذَا غَيْـرِي - ثُمَّ قَالَ - أَيَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا إِلَيْكَ فِي الْبِرِّ سَوَاءً؟. قَالَ: بَلَى. قَالَ: فَـلاَ إِذاً. بخـاري: وَفِي رِوَايَةٍ: أتَّقوا الله واعدِلُوا في أولادِكم. رَوَاهُ الخمسة[٣].

**نوعمانی کوڕی بەشیر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: باوکم هەڵی گرتم‌و بردمی بۆلای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **گوتی ئەی پێغەمبەری خودا تۆ بەشایەت بە کە ئەوا ئەوەو ئەوەم لە ماڵەکەم بەخشی بە نوعمانی کوڕم. فەرمووی: ئایا**

---

(١) تقدم برقم : ١٠٣ مجلد / ١ تسلسل/١٤.

(٢) رَواهُ الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

(٣) بخاري: (٢٥٨٧، ٢٥٨٦. ترمذي. أحكام: ١٣٦٧، مسلم. هبات: ٤١٥٣ نسأل. نحل: ٣٦٧٤، ٣٦٧٥، ٣٦٧٦، ٣٦٧٧.

هەموو کوڕەکانی تریشت بە قەد ئەمت پێ بەخشیون؟ گوتی نەو، فەرمووی: دە کەسێکی تر بکە بە شایەتی ئەمە، من شایەتی وا نادەم. لە پاشا فەرموی: ئەی حەزیش دەکەی کە هەموویان وەك یەك بۆت باش بن؟ گوتی: بەڵێ. فەرمووی: کەواتە نابێ.

لە گێڕانەوەیەکا: لە خودا بترسن و بەیەك چاو تەماشای هەموو مناڵەکانتان بکەن (ش/د/ت/ن– خودایان لێ رازی بێ).

١٩٥٩– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: اقْسِمُوا الْمَالَ بَيْنَ أَهْلِ الْفَرَائِضِ عَلَى كِتَابِ اللّٰهِ تعالى. رَوَاهُ مسلم وأبو داود. والله أعلى وأعلم[٤].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرمووێ: بە پێی نامەی خودای گەورە ماڵێ کە لە مردوو بەجێ دەمێنێ دابەشی بکەن بەسەر خاوەن بەشەکاندا (م/د).

## ٢) هۆی بێبەشبوون لە کەلەپوور: (موانع الإرث)

١٩٦٠– عَنْ أُسامة بن يَزيد (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يَرِثُ الْمُسلِمُ الكافِرَ وَلاَ يَرِثُ الكافِرُ الْمُسلِمَ[١].

ئوسامەی کوڕی زەید (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نە موسوڵمان کەلەپوور لە ناموسوڵمان وەردەگرێ وە نە ناموسوڵمان کەلەپوور لە موسوڵمان وەردەگرێ، هیچیان کەلەپوور لە هیچ کامیان ناگرن (ش/د/ت)

---

[٤] بخاري. فرائض. ٦٧٣٢، ٦٧٣٥، ٦٧٣٧، ٦٧٤٦. مسلم. فرائض: ٤١١٩. أبو داوُد. فرائض: ٢٨٩٨. ترمذي. فرائض: ٢٠٩٨.

[١] بخاري. فرائض: ٦٧٦٤. مسلم. ٤١١٦. أبو داوُد. فرائض: ٢٩٠٩. ترمذي. فرائض: ٢١٠٧.

١٩٦١– ولأصحاب السُنن: (لاَيَتَوارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ شَتَّى)[٢].

ئـەبو داوودو تیرمـزی‌و نەسـائی کـە لـەم کتێبـەدا ناسـراون بـە اصـحاب الـــسنن (خودایــان لــێ رازی بــێ) ریوایــەت دەکــەن: حــەزرەت (دروودی خــودای لەســەربێ) دەفەرموێ: پەیڕەوانی دوو ئایینی جیاجیا لە یەکتری کەلەپوور ناگرن!

١٩٦٢– وَلأبي دَاوُدَ: اخْتَصَمَ أَخَوانِ إِلَى يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ يَهُـودِيٌّ وَمُـسْلِمٌ في ميراث أبيهما فَوَرَّثَ الْمُسْلِمَ فَقَط وَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الأَسْوَدِ عَنْ رَجُلٍ عَنْ مُعَاذٍ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قالَ: الإِسْلاَمُ يَزِيدُ وَلاَ يَنْقُصُ[٣].

ئـەبو داوود دەگێڕێتـەوە: کـە دوو بـرا (کـە یـەکێکیان جوولەکـە بـوو وە ئـەویتریان موسـوڵمان بـوو) لەسـەر کەلـەپووری باوکیـان سـکاڵایان بـردە لای یەحیای کوڕی یەعمەر، یەحیا کەلەپووری تەنیا بۆ موسوڵمانەکەیان دانا، وە گـوتی: ئەبولئەسـوەد بـۆی گێڕامـەوە لـە پیـاوێکی تـرەوە لـە موعـازەوە لـە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئیسلام زۆر دەکاو کەم ناکا (د).

١٩٦٣– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْقَاتِلُ لاَ يَرِثُ. رَوَاهُ أصحاب السنن والدار قطني. والله أعلى وأعلم[٤].

ئــەبو هــورەیرە (خــودای لێ رازی بــێ) دەڵــێ: حــەزرەت (دروودی خــودای لەســەربێ) دەفـەرموێ: بکـوژ (پیـاو کـوژ= قاتـل) لـە کـوژراوی دەسـتی خـۆی کەلـەپوور نـاگرێ (د/ت/ن–سـند ضـعیف– دارە قـوطنی). وە خـودای گـەورە بۆخـۆی هەموو شتێ زۆر باش دەزانێ.

---

[٢] ما في المجتبى للنسائى صحيح عنده (المقدمة).

[٣] يحيى بن يعمر كان ثقةً (شرحه).

[٤] رَوَاهُ أصحاب السنن بسند ضعيف (شرحه).

## ٣) بەشی دووهەم: باسی بەشە کەلەپووری مناڵ

## الفصل الثاني: في ميراث الأولا

١٩٦٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: عَادَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَأَبُو بَكْرٍ فِي بَنِي سَلِمَةَ يَمْشِيَانِ فَوَجَدَانِي لاَ أَعْقِلُ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ رَشَّ عَلَيَّ مِنْهُ، فَأَفَقْتُ فَقُلْتُ: كَيْفَ أَصْنَعُ فِي مَالِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَنَزَلَتْ {يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ}. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[1].

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: نەخۆش بووم پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) و ئەبو بەکر (خودای لێ ڕازی بێ) بەپێ هاتن بۆ سەردانم، بۆ بەنی سەلەمە، کە دەگەنە جێ دەڕوانن وا من بێ هۆشم، جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) داوای ئاو دەکاو دەستنوێژ دەگرێ و لە ئاوی دەستنوێژەکەی دەپرژێنێ لێم، ئەوسا هۆشم دێتەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چی لەماڵەکەم بکەم؟ جا ئەم ئایەتە دابەزی:

{يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ} (٤/١١).

واتە: خودای مەزن ئامۆژگاریتان دەکاو ڕاتان دەسپێرێ و فەرمانتان پێ دەکا کە بەپێی ئەم یاسا ڕەسایە کەلەپوور بەش بکەن بۆ منداڵ و وەچەو نەتەوەی خۆتان: لە بۆ کوڕێ دوو ئەوەندەی بەشی کچێ هەیە، وە ئەگەر وەچەکان هەر کچی ڕووت بوون و زیاتربوون لە دوو کەس ئەوە دوو سێیەك دەبەن، وە ئەگەر نەتەوەی مردووەکە یەك کچ بوو ئەوە نیوەی کەلەپوورەکە دەبا (ش/ت) : (ب-١/ ز-٢١/ ف-١٣) = (بەرگی -١ / زنجیرە - ٢١ / ژمارە - ١٣ / ١٥٩).

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٥٧٧. مسلم. فرائض: ٤١٢٢.

١٩٦٥- وعَنْهُ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةُ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ بِابْنَتَيْهَا مِنْ سَعْدٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَاتَانِ ابْنَتَا سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ قُتِلَ أَبُوهُمَا مَعَكَ يَوْمَ أُحُدٍ شَهِيدًا وَإِنَّ عَمَّهُمَا أَخَذَ مَالَهُمَا فَلَمْ يَدَعْ لَهُمَا مَالاً وَلاَ تُنْكَحَانِ إِلاَّ وَلَهُمَا مَالٌ. قَالَ يَقْضِي اللَّهُ فِي ذَلِكَ. فَنَزَلَتْ آيَةُ الْمَوَارِيث {يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ} فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَى عَمِّهِمَا فَقَالَ: أَعْطِ ابْنَتَيْ سَعْدٍ الثُّلُثَيْنِ وَأَعْطِ أُمَّهُمَا الثُّمُنَ وَمَا بَقِيَ فَهُوَ لَكَ. رواه أبو داود والترمذي وصححه[٢].

دیسان جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ژنەکەی سەعدی کوڕی ڕەبیع ئەو دوو کچەی کە لە سەعد بوون هێنانی بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم دوو کچە کچی سەعدی کوڕی ڕەبیعن باوکیان لە غەزای ئوحوددا لەگەڵ تۆدا بوو کە شەهیدکرا، ئێستاش مامەکەیان هەرچی ماڵیان هەیە بردوویەتی بۆ خۆی، وە هیچی بۆ ئەمان نەهێشتۆتەوە، بەبێ ماڵ‌و داراییش کەس نایان خوازێ، فەرمووی: خودا خۆی بۆ ئەم بابەتە بڕیار دەدا، ئینجا ئایەتی دابەشکردنی کەلەپوور هاتە خوارێ کە دەفەرمووێ: {يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ}، ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ناردی بەشوێن مامەکەیانا‌و فەرمووی: دوو سێیەکی ماڵەکە بدە بە هەردوو کچەکەی سەعد، وە هەشتیەکی بدە بە دایکیان، وەچی مایەوە لەوان بۆ تۆیە (د/ت-ص).

١٩٦٦- عَنْ هُزَيْلَ بْنَ شُرَحْبِيلَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سُئِلَ أَبُو مُوسَى عَنِ ابْنَةٍ وَابْنَةِ ابْنٍ وَأُخْتٍ فَقَالَ: لِلاِبْنَةِ النِّصْفُ وَلِلأُخْتِ النِّصْفُ، وَأْتِ ابْنَ مَسْعُودٍ فَسَيُتَابِعُنِي. فَسُئِلَ ابْنُ مَسْعُودٍ وَأُخْبِرَ بِقَوْلِ أَبِي مُوسَى فَقَالَ لَقَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ، وَلَكِنِّي أَقْضِي فِيهَا بِمَا قَضَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لِلاِبْنَةِ النِّصْفُ، وَلاِبْنَةِ ابْنِ السُّدُسُ تَكْمِلَةَ الثُّلُثَيْنِ، وَمَا بَقِيَ فَلِلأُخْتِ. فَأَتَيْنَا أَبَا مُوسَى فَأَخْبَرْنَاهُ بِقَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ، فَقَالَ لاَ تَسْأَلُونِي مَا دَامَ هَذَا الْحَبْرُ فِيكُمْ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلما[٣].

---

[٢] صححه الترمذي.

[٣] بخاري. فرائض: ٦٧٣٦، ٦٧٤٢.

**هوذەیلی کوڕی شەرەحبیل** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ، پرسیار کرا لە ئەبوو مووسا: مردوویەك هەیە، کچێك‌و کچی کوڕێك‌و خوشکێکی هەیە میراتەکەیان چۆن لێ بەش دەکرێ؟**

**گوتی: نیوەی لە بۆ کچەکەیەو نیوەی لە بۆ خوشکەکەیە وە کچی کوڕەکە هیچی ناکەوێ، وە بشچۆ بۆ لای ئیبنو مەسعوود لەویش بپرسە، دەبینی ئەویش هەر وەك من دەڵێ، جا پرسیار کرا لە ئیبنو مەسعوود، وە قسەکەی ئەبو موساشیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش گوتی: ئەگەر وابێ دەبێ من ڕێگەم هەڵەکردبێ‌و سەرم لێ شێوابێ، بەڵام من لەم مەسەلەدا وەك پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **بڕیار دەدەم‌و حوکم دەکەم: بۆ کچەکە نیوە هەیە، بۆ کچی کوڕەکەش شەش یەك هەیە، کەبە هەردوو لا دەکەنە دوو سێیەکی تەواو کە بەشە پشکی دوو کچ‌و پترە، وە هەرچیش لەوان مایەوە بۆ خوشکەکەیە، جا چووینەوە بۆ لای ئەبو مووسا‌و قسەکەی ئیبنو مەسعوودمان بۆیگێڕایەوە، گوتی: ئێوە کە ئەم زانا گەورەیەتان لەناودایە لەمن مەپرسن (ب/د/ت/ن)**

**١٩٦٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ** (رَضِيَ اللهُ عَنهما) **أَنَّ رَجُلاً لاَعَنَ امْرَأَتَهُ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **وَانْتَفَى مِنْ وَلَدِهَا فَفَرَّقَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **بَيْنَهُمَا، وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالْمَرْأَةِ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود: ولفظه: جَعَلَ رَسُولُ اللهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **مِيرَاثَ ابْنِ الْمُلاَعِنَةِ لأُمِّهِ وَلِوَرَثَتِهَا مِنْ بَعْدِهَا**[٤]**.**

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: لەسەر دەمی پێغەمبەردا** (دروودی خودای لەسەربێ) **پیاوێ لیعانی لەگەڵ ژنەکەیدا کردبوو، وە حاشای کردبوو لە منالی ژنەکەی‌و گوتی: ئەم منالە لەمن نیە. جا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **ژن‌و پیاوەکەی لەیەك جیاکردەوەو تەلاقی خست‌و منالەکەی بەست بە ژنەکەوە (ب/د) گفتەکەی (د): پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کەلەپووری منالی لیعانی دا بە دایکەکەی وە لەپاش مردنی دایکی کەلەپوورەکەی دەدرێ بە میراتبەرانی دایکی، هەروەك خۆشی کەلەپوور لە دایکی دەگرێ‌و لە باوکی ناگرێ.**

---

[٤] بخاري. طلاق. ٥٣١٥.

١٩٦٨- وَلِلترمذي: أَيُّمَا رَجُلٍ عَاهَرَ بِحُرَّةٍ أَوْ أَمَةٍ فَالْوَلَدُ وَلَدُ زِنَا لاَ يَـرِثُ وَلاَ يُورَثُ[٥].

تیرمیذی ریوایەت دەکا: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: هەر پیاوێ شەڕواڵ پیسی بکا لەگەڵ هەر ئافرەتێکا، چ ئافرەتی ئازاد بێ، چ ئافرەتی کۆیلە، واتە: کەنیزەك بێ، ئەوە ئەو منداڵە زۆڵە، نە ئەو منداڵە کەلەپوور لەو پیاوە دەگرێ وە نە ئەو پیاوە کەلەپوور لەو منداڵە دەگرێ.

١٩٦٩- قَالَ أَبُو الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَانَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ بِـالْيَمَنِ مُعَلِّمًا وَأَمِيرًا، فَسَأَلْنَاهُ عَنْ رَجُلٍ تُوُفِّيَ وَتَرَكَ ابْنَتَهُ وَأُخْتَهُ، فَأَعْطَى الإِبْنَةَ النِّصْفَ وَالأُخْتَ النِّصْفَ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود. وزاد: (ونبي الله يومئذٍ حي)[٦].

ئەبولئەسوەدی کوڕی یەزید (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە یەمەن موعازی کوڕی جەبەل هات، وە بوو بە مامۆستاو بە فەرماندارمان، جا پرسیارمان لێکرد: پیاوێ مردووە کچێك و خوشکێکی لە پاش بەجێماوە چۆنماڵەکەیان لێ دابەش دەکەی؟ ئەویش ئاوا دابەشیکرد: نیوەی کەلەپوورەکەی دا بە کچەکەی و نیوەشی دا بە خوشکەکەی (ب/د) ئەبو داوود ئەمەی پتر کردووە: ئەوکاتە هێشتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی زیندوو بوو.

١٩٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا اسْتَهَلَّ الْمَوْلُودُ وُرِّثَ. رَوَاهُ أصحاب السنن وإبن حبان وصححه. والله تعالى أعلى وأعلم[٧].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر منداڵ لەکاتی لەدایکبووندا دەنگی لێوە هات یا هەر نیشانەیەکی تری ژیانی پێوەبوو، وەك هەناسەو پژمەو شتی وا ئەوە کەلەپوور دەگرێ! (د/ت/ن ئیبنو حەببان:ص).

---

[٥] الحديث ضعيف ولكن عليه كافة العلماء (شرحه).

[٦] بخاري. فرائض: ٦٧٤١، ٦٧٣٤.

[٧] صححه ابن حبان.

**٤) بەشە پشکی باوك‌و دایك‌و باوان (عەصەبە): (میراث الأبوين والعصبة)**

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ} (٤/١١).

خودای گەورەو باڵا دەست دەفەموێ: بۆ هەر یەکێ لە باوك‌و دایکی مردووەکە شەش یەك هەیە، لە کەلەپووری مردووەکە، ئەگەر نەتەوەی کەلەپوورگری هەبێ، بەڵام ئەگەر مردووەکە نەتەوەی نەبوو، وە بەس باوك‌و دایکی هەبوو وە هاوسەریشی نەبوو ئەوە دایکەکە سێیەکی دەبا وە پاشماوەی ماڵەکە بۆ باوکەکەیە، وەلێ ئەگەر مردووەکە چەن براو خوشکێکی هەبوو، ئەوە دایکەکە شەش یەك دەبا.

١٩٧١- قَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما): كَانَ الْمَالُ لِلْوَلَدِ، وَكَانَتِ الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ، فَنَسَخَ اللَّهُ مِنْ ذَلِكَ مَا أَحَبَّ، فَجَعَلَ لِلذَّكَرِ مِثْلَ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، وَجَعَلَ لِلأَبَوَيْنِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسَ، وَجَعَلَ لِلْمَرْأَةِ الثُّمُنَ وَالرُّبْعَ، وَلِلزَّوْجِ الشَّطْرَ وَالرُّبْعَ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود[1].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: لە پێشدا لە سەرەتای ئیسلامەوە ماڵ بۆ منداڵی مردوو بوو، ئەوەندە هەبوو مردووەکە راسپێری دەکرد بۆ باوك‌و دایکی، جا خودا ئەوەی پێی خۆش بوو هەڵی وەشاندەوە لەم یاسایە، وە بڕیاریدا: بۆ نێرینە دوو ئەوەندەی بەشی مێیینە هەیە وە بۆ هەر یەکێ لە باوك‌و دایك شەش یەك هەیە وە هەشت یەك‌و چوار یەکی دانا بۆ ژن، وە نیوە‌و چوار یەکی دانا بۆ مێرد (ب/د).

١٩٧٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ فَهْوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ. رَوَاهُ الأربعة (رَضِيَ اللهُ تعالى عَنهُم) والله أعلى وأعلم.

---

[1] بخاري. فرائض: ٦٧٣٩.

دیسان ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەموو خاوەن بەشێ بەشی دیاری کراوی خۆی بدەنێ بە پێی دەقی قورئانەکە، ئینجا هەرچی مایەوە لەوان ئەوە بۆ خزمترین کەسە بە مەرجێ کە نێرینە بێ! (ش/د/ت).

## ٥) بەشی سێهەم: کەلەپووری براو خوشك‌و باسی کەلالە، واتە مردوویێ کە نە وەچەی مابێ وە نەبنەچەی مابێ

## الفصل الثالث: في ميراث الأخوات (والأخوة) والكلالة

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْـرَأَةٌ وَلَـهُ أَخٌ أَوْ أُخْـتٌ فَلِكُـلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوَاْ أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاء فِي الثُّلُثِ} (٤/١٢)[٢].

واتە: خودای گەورەو باڵا دەست دەفەرموێ: ئەگەر کەسێ مرد، پیاو بێ یا ژن، وە وەچەو بنەچەی نەبوو، وە میراتبەرەکەی تەنیا برایەکی دایکی یا خوشکێکی دایکی بوو ئەوە بۆ هەریەکێ لەو براو خوشکە شەش یەك هەیە. وە ئەگەر ئەو براو خوشکە دایکییانە زیاتر بوون لە یەکێ ئەوە هەموویان هاوبەشن لە سێیەکی کەلەپوورەکەداو جیاوازی نیە لە نێوانی مێیینەو نێرینەیاندا لە بەشدا.

١٩٧٣- ← (رقم: ١٥٩ / جلد ١ / تسلسل ٢١)[١].

١٩٧٤- قَالَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) مَا رَاجَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي شَيْءٍ مِثْلَ الْكَلاَلَةِ وَمَا أَغْلَظَ لِي فِي شَيْءٍ مَا أَغْلَظَ لِي فِيهِ حَتَّى طَعَنَ بِإِصْبَعِهِ فِي صَدْرِي وَقَالَ: يَا عُمَرُ أَلاَ تَكْفِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ الَّتِي فِي سُورَةِ النِّسَاءِ. رَوَاهُ مسلم[٢].

---

[٢] بخاري. فرائض: ٦٧٣٧.

[١] تقدم برقم: ١٥٩. مجلد/١ تسلسل/٢١.

[٢] بخاري. طهارة: ١٩٤، ٤٥٧٧، ٥٦٥١، ٥٦٥١، ٥٦٥٤، ٥٦٥٧، ٦٧٢٣، ٦٧٤٣، ٧٣٠٩. مسلم. فرائض: ٤١٢٦.

**عومەر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: بۆ هیچ شتێ وەك کەلالە چەندبار پرسیارم لـە پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **نـەکردووە، وە پێغەمبـەریش** (دروودی خـودای لەسەربێ) **لەسـەر هیچ شتێ وەك کەلالـە لـێم تـون نـەبووە، تەنانـەت لـە دواجـارا پەنجـەی ژەنـد بـە سینەماو فـەرمووی: ئـەی عومـەر! ئـەی فـارووق! تـۆ زانـاو دانـای، ئەوەنـدە لەشـت مەپرسـەو ئەوەنـدە شـت ورد مەکـەرەوە، ئوصـوڵی مەسـائیل‌و روئوسـول ئـەقلام لـە قورئـانی پـیرۆزو سـوننەتی منـدا هەیـە، جـا کەواتـە ئەوەنـدە ئیعتمـاد لەسـەر نەصـصی صـەریح لـە هـەموو مەسـەلەیەکا مەکەن، چونکە مەسئەلەکان زۆرو نوصوص کەم، کەواتە تێکۆشن‌و ئیجتیهـاد بکەن‌و لە ئوصول‌و نوصوصـەکان ئیستنباطی ئـەحکامی تـر بکـەن، وە بـزانن کە عیلمی ئیستینباط ئـەرکی سـەرەکی سـەر شـانی زاناکانـە جـا ئـەی عومـەر! کە ئەمەت انی ئیتر[1] ئایەتەکەی کە لە هاویندا هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ:**

**{يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ} (١٧٦/٤)**

**ئایا ئەم ئایەتەت بەس نیە کە لە سوورەتی (النساء)دایە (م).**

**١٩٧٥- وَجَاءَ رَجُـلٌ إِلَـى النَّبِـيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **فَقَـالَ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ يَسْتَفْتُونَكَ فِي الْكَلاَلَةِ فَمَا الْكَلاَلَةُ؟ قَالَ: تُجْزِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ. قُلْتُ لأَبِي إِسْـحَاقَ: هُـوَ مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَدَعْ وَلَدًا وَلاَ وَالِدًا قَالَ: كَذَلِكَ ظَنُّوا. رَوَاهُ أبو داود[٣].**

**پیـاوێ هاتـە لای پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خودا! لەم ئایەتەدا کە خودا دەفەرموێ: {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ} کەلالە چیە؟ فەرمووی: ئایەتەکەی هاوینت بەسە، قسەبەر (راوی) دەڵـێ: گـوتم بـە ئـەبو ئیسحاق (کەلالـە) ئـەو کەسـەیە کـە مـرد نـە وەچـەو نـە بنەچەی لەپاش بەجێ نەمێنێ؟؟ گوتی: وا دەڵێن! (د).**

---

[1] ئەمە لەنەوەوی (خودای لـێ رازی بێ) وەرگیراوە. -وەرگێڕ-

[٢] سکت عنه.

١٩٧٦- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الآيَةَ: {مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ} وَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَضَى بِالدَّيْنِ قَبْلَ الْوَصِيَّةِ وَإِنَّ أَعْيَانَ بَنِي الأُمِّ يَتَوَارَثُونَ دُونَ بَنِي الْعَلاَّتِ الرَّجُلُ يَرِثُ أَخَاهُ لأَبِيهِ وَأُمِّهِ دُونَ أَخِيهِ لأَبِيهِ. رَوَاهُ الترمذي وأحمد والحاكم. والله تعالى أعلى وأعلم[٤].

**عەلی (ڕەزای خودای گەورەی لێبێ) گوتی: ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە کە دەفەرموێ:**

{مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ} (٤/١٢).

**واتە: ئەو بەش‌و پشکەی بۆتان دیاری کراوە، کاتێ وەری دەگرن لە پاش جێبەجێ کردن (ئیجرا)ی ڕاسپێری مردووەکە، وە لە پاش دانەوەی ئەو قەرزەی کە لە سەریەتی، وەلحاڵ پێغەمبەر خۆی (درودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەو باڵا دەستی لەسەربێ) بڕیاری داوە کە لەپێش جێبەجێکردنی ڕاسپێری مردوودا قەرزی سەری دەدرێتەوە، وە برای باوك‌و دایکیش کەلەپور لەیەکتری دەگرن واتە ئەگەر برای باوکییان لەگەڵ بێت ئەو کەلەپوور ناگرێ (ت- سند ضعيف- ئەحمەد/حاکم. خودای گەورە لێیان خۆش بێ).**

## ٦) بەشی چوارەم: کەلەپووری ژن‌و مێرد

## الفصل الرابع: في ميراث الزوجين

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ} (٤/١٢).

---

[٤] رَوَاهُ الترمذي بسند ضغيف ولكن عليه أهل العلم (شرحه).

واتـە: خـودای گـەورە دەفـەرموێ: وە بۆ ئێـوە هەیـە نیـوەی ئـەوەی کـە هاوجووتەکانتان (واتە: ژنەکانتان) لـەپاش مـردن بـەجێیان هێشتووە، ئەگـەر نەتـەوەیان نـەبێ، بـەڵام ئەگـەر نەتـەوەی میراتگریـان هـەبێ، ئـەوە بـۆ ئێـوەی مێـردان هەیـە چـوار یـەکی ئـەوەی ئـەوان بـەجێیان هێشتووە، ئـەم بەشـەیش وەردەگـرن لـەپاش بـەجێهێنانی وەصـییەتی شـەرعییان، ئەگـەر وەصـییەتیان کردبوو، وە هەروەها لەپاش دانەوەی قەرزی سـەریان ئەگـەر قـەرزار بـوون، وە بۆ ژنەکانیشتان (یـەك بن یـان زیـاتر) لـە هەریـەکێ لـەم دوو حاڵەتـەدا نیـوەی بەشی ئێوەیان هەیە، کە دەکاتە چاریەك لە حاڵـەتی یەکەمـدا، وە هەشـت یـەك لە حاڵەتی دووەمـدا، دیـسان ئـەویش لـەپاش ڕابواردنی ڕاسـپێری و دانـەوەی قەرزی سەرتان.

١٩٧٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي جَنِينِ امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي لَحْيَانَ سَقَطَ مَيِّتًا بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ. ثُمَّ إِنَّ الْمَرْأَةَ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا بِالْغُرَّةِ تُوُفِّيَتْ، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِأَنَّ مِيرَاثَهَا لِبَنِيهَا وَزَوْجِهَا، وَأَنَّ الْعَقْلَ عَلَى عَصَبَتِهَا. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ژنێکی بەنی لەحیانی منداڵێکی بە مردوویی لە بارچوو بە بەردە دەستی ژنێکی تر. پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) داینا کە خوێنی ئەو سکە لەبارچووە دەکاتە سەرێ، ئیتر ئەو سەرە بەندە بێ یا کەنیزەك بێ قەیناکا، لە پاشا ژنە سك لەبارچووەکەیش مرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بڕیاریدا: کە کەلەپوورەکەی بۆ منداڵەکانی و بۆ مێردەکەیەتی، وە هەروەها داینا کە دەبێ باوانی ژنە بکوژەکە خوێنباییەکە بدەن (ش/ت.خوایان لێ خۆش نوودبێ).

١٩٧٨- عَنْ سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: الدِّيَةُ لِلْعَاقِلَةِ وَلاَ تَرِثُ الْمَرْأَةُ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا شَيْئًا، حَتَّى قَالَ لَهُ الضَّحَّاكُ بْنُ سُفْيَانَ كَتَبَ إِلَيَّ رَسُولُ

[1] بخاري. فرائض: ٦٧٤٠.

اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنْ وَرِّثْ امْرَأَةَ أَشْيَمَ الضِّبَابِيِّ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا. فَرَجَعَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ). رَوَاهُ أصحاب السنن بسندٍ صحيحٍ[٢].

سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) دەیگوت: خوێنبایی هی خزمی باوکییە (العاقلە)، وە ژن کەلەپوور ناگرێ لە خوێنبایی مێردی، هەتا ضەحاکی کوڕی سوفیان پێی گوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نامەی بۆ نووسیم: بەشە کەلەپوور دابنێ بۆ ژنەکەی ئەشەیمی ضەبابی لە خوێنبایی مێردەکەی ئیتر عومەریش لە قسەی خۆی پەشیمان بۆوە! (د/ت/ن-س/ص).

## ٧) بەشی پێنجەم: کەلەپووری باپیرەو نەنك

## الفصل الخامس: في ميراث الجد والجدة

١٩٧٩- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِنَّ ابْنَ ابْنِي مَاتَ فَمَا لِي مِنْ مِيرَاثِهِ؟ قَالَ: لَكَ السُّدُسُ. فَلَمَّا أَدْبَرَ دَعَاهُ فَقَالَ: لَكَ سُدُسٌ آخَرُ. فَلَمَّا أَدْبَرَ دَعَاهُ فَقَالَ: إِنَّ السُّدُسَ الآخَرَ طُعْمَةٌ. رَوَاهُ أصحاب السنن[١].

عیمرانی کوڕی حوصەین (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزی کرد: کوڕی کوڕم مردووە، من چیم دەکەوێ لە کەلەپوورەکەی؟ فەرمووی: بۆ تۆ شەش یەك هەیە جا کە پیاوەکە هەڵسا بڕوا بانگی کردەوەو فەرمووی: بۆ تۆ شەش یەکێکی تریش هەیە جا کە پیاوەکە ویستی بڕوا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووی: شەش یەکەکەی تر بەش نیە، بەڵام بەرماوەیە چونکە خاوەن بەشەکان کەمن و ئەم شەش یەکەیش بە تەعصیب- واتە: بە باوەنێتی- بۆ تۆ ماوەتەوە (د/ت/ن-س/ص).

---

[٢] رَوَاهُ أصحاب السنن بسزند صحيح.

[١] بسند صحيح.

١٩٨٠- عَنِ الْحَسَنِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ عُمَرَ قَالَ: أَيُّكُمْ يَعْلَمُ مَا وَرَّثَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْجَدَّ، فَقَالَ: مَعْقِلُ بْنُ يَسَارٍ: أَنَا، وَرَّثَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) السُّدُسَ. قَالَ: مَعَ مَنْ؟ قَالَ لاَ أَدْرِي. قَالَ: لاَ دَرَيْتَ فَمَا تُغْنِي إِذًا. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[٢].

حەسەن (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: کامتان دەزانن کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چەندەی کەلەپوور داوە بە باپیرە؟ مەعقیلی کوڕی یەساریش دەڵێ: من دەزانم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) شەشیەکی دەدا بە باپیرە. عومەریش دەڵێ: کێی تری لەگەڵ دابوو کە حەزرەت شەش یەکی پێی دا؟ مەعقیل دەڵێ: نازانم، عومەریش (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: کەواتە هەر نەتزانی و بەدەردی ئێمەت نەخوارد. (د-سند صالح- ن. خودایان لێ ڕازی بێ).

١٩٨١- وَقَالَ سُلَيْمَانُ بْنِ يَسَارٍ فَرَضَ عُمَرُ وَعُثْمَانُ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمْ) لِلْجَدِّ مَعَ الإِخْوَةِ الثُّلُثَ. رَوَاهُ مالك[٣].

سولەیمانی کوڕی یەسار دەڵێ: عومەرو عوسمانو زەیدی کوڕی ثابیت (خودایان لێ ڕازی بێ) سێیەکیان دانا بۆ باپیرە، لە حاڵێکا کە چەند برایەکی مردووەکەی لەگەڵ دابێ (مالیك).

١٩٨٢- عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَتِ الْجَدَّةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا فَقَالَ: مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللّٰهِ تَعَالَى شَيْءٌ وَمَا عَلِمْتُ لَكِ فِي سُنَّةِ نَبِيِّ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شَيْئًا فَارْجِعِي حَتَّى أَسْأَلَ النَّاسَ. فَسَأَلَ النَّاسَ فَقَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَعْطَاهَا السُّدُسَ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَلْ مَعَكَ غَيْرُكَ فَقَامَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ فَقَالَ: مِثْلَ مَا قَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ فَأَنْفَذَهُ لَهَا أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) ثُمَّ جَاءَتِ الْجَدَّةُ الأُخْرَى إِلَى عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا فَقَالَ: مَا

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] سكت عنه الشارح.

لَكِ فِي كِتَابِ اللّٰهِ تَعَالَى شَيْءٌ وَمَا كَانَ الْقَضَاءُ الَّذِي قُضِيَ بِهِ إلاَّ لِغَيْرِكِ وَمَا أَنَا بِزَائِدٍ فِي الْفَرَائِضِ وَلَكِنْ هُوَ ذَلِكَ السُّدُسُ فَإِنِ اجْتَمَعْتُمَا فِيهِ فَهُوَ بَيْنَكُمَا وَأَيَّتُكُمَا خَلَتْ بِهِ فَهُوَ لَهَا. رَوَاهُ أصحاب السنن[٤].

قەبیصەی کوڕی ذوئەیب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: نەنکێك کە دایکی باوکی مردووەکە بوو، هاتە لای ئەبو بەکرو داوای بەشە کەلەپووری خۆیی لێ کرد، ئەویش گوتی: لە قورئانی نامەی خوادا هیچت بۆ نیەو بە دەقی ئایەت (بە نەصصی ئایەت) بەشت بۆ دیاری نەکراوە، وە لە سوننەتی پێغەمبەریشدا (دروودی خودای لەسەربێ) ئەگەر بەشت بۆ دانرابێ ئەوە من ئاگام لێی نیە، کەواتە بچۆرەوە با لە یاران بپرسم تا بزانم پشکی تۆ چییە.

جا کە پرسیاری کرد موغەیرەی کوڕی شوعبە گوتی: لە خزمەتی حەزرەتدا بووم شەشیەکی دا بەنەنك، ئەبو بەکریش گوتی: بۆ ئەم شایەتییە کەسی ترت لەگەڵ دایە؟

جا موحەممەدی کوڕی مەسلەمە هەڵسا هەمان شایەتی دا ئینجا ئەبو بەکر شەش یەکی پێدا، لەپاشا نەنکەکەی تریش (کە دایکی دایکی مردووەکەیە) هات بۆ لای عومەر، داوای بەشە کەلەپووری لێ کرد، عومەریش (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەنامەی خوادا هیچت بۆ نیە، وە ئەو حوکمەیش کە کراوە لە سەردەمی ئەبو بەکردا بۆ نەنکێکی تربوو، وە منیش لە خۆمەوە بەبێ بەڵگەیەکی ڕۆشن پشکەکان پتر ناکەم. بەڵام خۆی یەك شەش یەکە، ئەگەر هەردووکتان لەسەری حازربن ئەوا نیوەییتانە، وە هەرکامێکتان لە پێشەوە بۆ خۆی بردی ئەوە تێدەپەڕێ‌و دەبێ بە هی خۆی (د/ت/ن-س/ص).

١٩٨٣- عَنِ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) جَعَلَ لِلْجَدَّةِ السُّدُسَ إِذَا لَمْ تَكُنْ دُونَهَا أُمٌّ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي. والله أعلى وأعلم[٥].

---

[٤] بسند صحيح (شرحه).

بوریده (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) شەش یەکی دانا بۆ نەنك لە حاڵێکا کە دایکی مردووەکە نەما بێ! (د–سند صالح–ن).

## ٨) بەشی شەشەم: کەلەپوورگرتن بەهۆی ئازادکردنی کەسێکەوە واتە: بەهۆی وەلائەوە : (الفصل السادس: في الأرث بالولاء)

١٩٨٤– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) عَنْ النَبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) قَالَ: الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْطَى الْوَرِقَ، وَوَلِيَ النِّعْمَةَ. رَوَاهُ الخمسة[1].

لە گێڕانەوەی ئێرەدا بەم شێوەیە:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: هەقداری –یا سەرداری: وەلاء: ئەو هەقەی کە بەهۆی ئازادکردنی بەندەوە پەیدا دەبێ بۆ خاوەنە ئازادکەرەکەی – بۆ ئەو کەسەیە کە پارەی ڕەقی لەسەر دەژمێرێ‌و خەڵاتی ئازادی دەبەخشێ پێی! (ش/د/ت/ن–خودایان لێ ڕازی بێ).

١٩٨٥– وللبخاري: مَوْلَى الْقَوْمِ مِنْ أَنْفُسِهِمْ. أَو كَمَا قَالَ[2].

بوخاری (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئازادکراوی هەر هۆزێ بە یەکێك لە خۆیان حلێب دەکرێ یا وەك ئەوەی کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خۆی فەرمووی: واتە: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) یا ئاوای فەرموو، یا شتێکی ئاوای فەرموو.

١٩٨٦– عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) قالَ: الْمَرْأَةُ تَحُوزُ ثَلاَثَةَ مَوَارِيثَ عَتِيقَهَا وَلَقِيطَهَا وَوَلَدَهَا الَّذِى لاَعَنَتْ عَنْهُ[3].

---

(٥) بسند صالح.

(١) تقدم برقم: ١٧٦١/٣ مجلد/٢ تسلسل/١٤٩.

(٢) بخاري. فرائض. ٦٧٦١، تعليق ذكره البخاري قبل الرقم: ٣٥٢٨ مباشرة.

وائیلەی کوڕی ئەسقەع (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەلەپووری ئەم سێ کەسە بۆ ژنە:

یەکەم: ئازاد کراوی خۆی.

دووەم: منالّی دۆزراوەی خۆی کە لە لاکۆلّان دەیدۆزێتەوەو بەخێوی دەکا.

سێیەم: ئەو منداڵەی کە بەهۆی شەڕە نەفرینەوە (مولاعەنە: لیعان)ەوە بووە بە منداڵی خۆی (د/ت/ن-س/ص).

١٩٨٧- وَقَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُمَا): مَاتَ رَجُلٌ وَلَمْ يَتْرُكْ وَارِثًا إلاَّ غُلاَمًا كَانَ أَعْتَقَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): هَلْ لَهُ أَحَدٌ؟ قَالُوا: لاَ إلاَّ غُلاَمًا لَهُ كَانَ أَعْتَقَهُ. فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِيرَاثَهُ لَهُ. رَوَاهُمَا أصحاب السنن[٤].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ مرد، کەلەپوور گری نەبوو جگە لە خولامێ کە لەوەو پێش ئازادی کردبوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئایا کەسی هەیە؟ گوتیان: خەیر کەسی نیە تەنیا خولامێکی هەیە ئەویش لەپێش مردنیدا ئازادی کردبوو جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کەلەپوورەکەی دا بە خولامەکەی. (د/ت/ن-س/ح= ئەبو داوود، تیرمذی، نەسائی، بە سەنەدێکی حەسەن ریوایەتیان کردووە، خوایان لێ ڕازی بێ)

١٩٨٨- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: يَرِثُ الْوَلاَءَ مَنْ يَرِثُ الْمَالَ. رَوَاهُ الترمذي بسند ضعيف. والله أعلى وأعلم[٥].

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکییەوە، لە باپیریەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کێ ماڵی مردوو بە

---

[٣] رَوَاهُ أصحاب السنن بسند حسن (شرحه).

[٤] رَوَاهُ أصحاب السنن بسند حسن (شرحه).

[٥] بسند ضعيف كما هو مذكور أعلاه في ذيل الحديث.

**کەلەپوور دەگرێ هەر ئەویش هەقداری (واتە: وەلائی) بەندەی ئازاد کراوی خۆی بە کەلەپوور دەگرێ! (ت- سند ضعيف).**

## ٩) دانی کەلەپوور بە خاڵوان (زەویلئەرحام): (توريث ذوی الأرحام)

**١٩٨٩- قَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما): وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ كَانَ الرَّجُلُ يُحَالِفُ الرَّجُلَ لَيْسَ بَيْنَهُمَا نَسَبٌ فَيَرِثُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ فَنُسِخَ ذَلِكَ بقوله: وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللّهِ. فَتوارثُوا بالنسب. رَوَاهُ أبو داود والدّار قطني[1].**

**لە تەفسیرو ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا:**

**{ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ } (٤/٣٣)[1].**

**ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: لەپێشدا دوو پیاو دەبوون بە سوێنخۆری یەکتری، بەبێ ئەوە کە خزمی یەکتری بن، ئیتر بەهۆی بەستنی ئەو پەیمانەوە کەلەپووریان لەیەکتری دەگرت، تا لەپاش دا ئەم دەستوورە بەم ئایەتە هەڵوەشایەوە: کە دەفەرموێ:**

**{ وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللّهِ}[2].**

---

[1] سكت عنه الشارح.

[1] واتەی تەواوی ئایەتەکە ئاوایە: بۆ هەموو کەسێ بڕیاری چەن میراتبەرێکمان داوە، ئەو ماڵو مافانە بە میرات دەگرن کە لە بابو داکو خزمو خوێشی زۆر نێزیك بەجێ دەمێنێ، جا کەواتە هەر کەسێ لەمانە بەشی خۆیان لەمیرات پێ بدەن. -وەرگێڕ-

[2] ئەنفال/ ٧٥ واتە: ئەوانەی کە خزمو خوێشی یەکترین ورشتەی خوێشایەتی هەیە لە نێوانیانا ئەوانە لە پێشترن بۆ یەکتری، بەپێی یاساو دەستوری قورئان، هەتا کەسێکی بێگانە.

-وەرگێڕ-

ئیتر لەوەو دوا بەهۆی ڕشتەی خزمایەتییەوە کەلەپووریان لە یەکتری دەگرت و کەلەپوورگرتن بەهۆی سوێند خۆرییەوە پووچ بۆوە. (د/داره قوطني).

١٩٩٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: ابْنُ أُخْتِ الْقَوْمِ مِنْهُمْ أَوْ مِنْ أَنْفُسِهِمْ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خوشکەزای پیاو یەکێکە لە کەسوکارەکەی، یا فەرمووی: یەکێکە لە خۆیان (ش/د/ت/ن- خودایان لێ ڕازی بێ).

١٩٩١- عَنِ الْمِقْدَامِ الْكِنْدِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ فَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيْعَةً فَإِلَيَّ (أي فعليَّ سداد دَينه ومؤنة عياله) وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ وَأَنَا مَوْلَى مَنْ لاَ مَوْلَى لَهُ أَرِثُ مَالَهُ وَأَفُكُّ عَانَهُ (أي أسيره) وَالْخَالُ مَوْلَى مَنْ لاَ مَوْلَى لَهُ يَرِثُ مَالَهُ وَيَفُكُّ عَانَهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والشيخان والترمذي. ولفظه: الله ورسولَهُ مولى مَنْ لاَ مَوْلَى له والخالُ وارثُ من لا وارثَ له[٣].

میقدامی کەندی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: من لە بەرترم بە هەموو موسوڵمانێ، لە هەموو کەسێکی تر، تەنانەت لە بەرترم بە خۆشی لە خودی خۆشی! جا لەبەر ئەوە ئەگەر موسوڵمانێ مردو قەرزی لە سەربوو ئەوە قەرزەکەی لەسەر خۆمەو من بۆیدەبژێرمەوە، وە ئەگەر خێزانی بێ دالدەی لە پاش بەجێ ما ئەوە گوزەرانیان لەسەر منە، بەڵام ئەگەر ماڵی لەپاش بەجێ ما ئەوە بۆ میراتبەراکانیەتی، وە من خاوەنی ئەو کەسەم کە کەسوکاری نیە، ماڵی بە کەلەپوور دەگرم چونکە ماڵی من هەمووی هی بەیتولماله وە دیلی بەر ئەدەم، لالەیش خاوەنی ئەو کەسەیە کە خاوەنی تری لە باوانی نیە، هەم ماڵی بە

---

[٢] بخاري. فرائض: ٦٧٦٢، ٣٥٢٨.

[٣] بخاري. فرائض: ٦٧٣١. مسلم. فرائض: ٤١٣٣، ترمذي. جنائز: ١٠٧٠.

کەلەپوور دەبا، هەم دیلی لە دیلی رزگار دەکا (د/ش/ت). گفتەی (ت): خوداو پێغەمبەری خودا خاوەنی ئەو کەسەن کە خاوەنی تری نیە لە خزم‌و کەسوکار لالەیش میراتبەری ئەو کەسەیە کە میراتبەری تری نیە.

١٩٩٢– عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا السُّنَّةُ فِي الرَّجُلِ يُسْلِمُ عَلَى يَدَيِ الرَّجُلِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ؟ قَالَ: هُوَ أَوْلَى النَّاسِ بِمَحْيَاهُ وَمَمَاتِهِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٤].

تەمیمی داری (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر پیاوێ لەسەر دەستی موسوڵمانێکی تردا موسوڵمان بوو چی هەقێکی لەسەری هەیە؟ فەرمووی: لە ژیان‌و لە مردنیا لە پێشترین کەسە پێی!(د/ت/ن).

١٩٩٣– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ مَوْلًى لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَاتَ وَتَرَكَ شَيْئًا وَلَمْ يَدَعْ وَلَدًا وَلاَ حَمِيمًا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هَا هُنَا أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ أَرْضِهِ؟. قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: فَأَعْطُوهُ مِيرَاثَهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي وحسنَّه[٥].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: نۆکەرێکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) مرد، هەندێ ماڵی هەبوو، بەڵام نە منداڵ‌و نە خزمی نەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەس هەیە لێرە کە خەڵکی وڵاتی ئەو بێ؟ گوتیان: بەڵێ هەیە: فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ): دەکەلەپوورەکەی بدەن بەو (د/ت:ح).

١٩٩٤– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: كُلُّ قَسْمٍ قُسِمَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَهُوَ عَلَى مَا قُسِمَ لَهُ وَكُلُّ قَسْمٍ أَدْرَكَهُ الإِسْلاَمُ فَهُوَ عَلَى قَسْمِ الإِسْلاَمِ رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن ماجه[٦].

---

[٤] سكت عنه الشارح.

[٥] حسنعند الترمذي.

[٦] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: هەر ماڵێ کە لە سەردەمی نەزانیدا بەشکرابێ وەك خۆی دەمێنێتەوەو ئەحکامی سەردەمی نەزانی لەگەڵ شتا دیانی پیا دەنرێ، وەك ماڵو ڕشتەی کەسایەتی و ژنو ژنخوازی و ئەمانە وەك خۆیان دەمێننەوە. بەڵام هەر ماڵێ کەوتبێتە سەردەمی ئیسلامەوە ئەوە بەپێی حوکمی ئیسلام دابەش دەکرێ (د-سند صالح-ئیبنو ماجە).**

## ١٠) ماڵی پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر بۆ نەتەوەکەیەتی: (مال النبي ﷺ لأمته)

**١٩٩٥- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ** (رَضيَ اللهُ عنهما) **قَالَ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **عِنْدَ مَوْتِهِ دِرْهَمًا وَلاَ دِينَارًا وَلاَ عَبْدًا وَلاَ أَمَةً وَلاَ شَاةً، إِلاَّ بَغْلَتَهُ الْبَيْضَاءَ وَسِلاَحَهُ وَأَرْضًا جَعَلَهَا صَدَقَةً. رَوَاهُ الثلاثة والنسائي.**

**عەمری کوڕی حاریث** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **مرد نە پوولو پارەو نەزیوو زێڕو نە بەندەو کە نیزەكو نە ڕانەمەڕی لەپاش بەجێ نەما، تەنیا هێسترێکی سپی هەبوو، لەگەڵ چەکەکەی، پارچەیێ زەویشی هەبوو کردبووی بەوەقف (ش/د/ن- خودایان لێ ڕازی بێ).**

**١٩٩٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ فَاطِمَةَ وَالْعَبَّاسَ (عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ) أَتَيَا أَبَا بَكْرٍ يَلْتَمِسَانِ مِيرَاثَهُمَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **يَطْلُبَانِ أَرْضَيْهِمَا مِنْ فَدَكَ، وَسَهْمَهُمَا مِنْ خَيْبَرَ. فَقَالَ لَهُمَا أَبُو بَكْرٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **يَقُولُ: لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ، إِنَّمَا يَأْكُلُ آلُ مُحَمَّدٍ مِنْ هَذَا الْمَالِ. وَاللهِ لاَ أَدَعُ أَمْراً رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **يَصْنَعُهُ فِيهِ إِلاَّ صَنَعْتُهُ. قَالَ: فَهَجَرَتْهُ فَاطِمَةُ، فَلَمْ تُكَلِّمْهُ حَتَّى مَاتَتْ. وَفِي رِوَايَةٍ: لاَ يَقْتَسِمْ وَرَثَتِي دِينَارًا، مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي وَمَئُونَةِ عَامِلِي فَهُوَ صَدَقَةٌ. رَوَاهُ الخمسة والله أعلى وأعلم[٢].**

---

[٢] بخاري. فرائض: ٦٧٣٠، ٦٧٢٩، ٦٧٢٨، ٦٧٢٧، ٣٠٩٤، ٦٧٢٩. مسلم. جهاد: ٤٥٥٢، ٤٥٥٥، ٤٥٥٦، ٤٥٥٨، أبو داود. خراج: ٢٩٧٤، ٢٩٦٣، ٢٩٦٤. ترمذي. السّير: ١٦١٠. نسائي. قسم الفيئ: ٤١٥٩.

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: فاطیمەو عەبباس (دروودیان لێبێ) چوون بۆ لای ئەبو بەکر، داوای بەشە کەلەپووری خۆیانیان لێکرد، لە کەلەپووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ): داوای پشکی خۆیانیان لێکرد لە دوو پارچە زەوییەکەی فەدەك و لە زەویەکەی خەیبەر. ئەبو بەکریش پێی گوتن: بۆ خۆم لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): میرات و کەلەپووری لە ئێمە ناگیرێ، کە دەستەی پێغەمبەرانین، هەرچیمان لەپاش بەجێ ما خێرو خێراتە، بەڵام گوزەرانی کەسوکاری موحەممەد لەسەر بەیتولمالە.

ئینجا ئەبو بەکر گوتی: بەخودا خۆم چیم دیوە لە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) کە کردوویەتی لەم ماڵە منیش هەروای لێ دەکەم.

گوتی: ئیتر فاطیمة هامووشۆی ئەبو بکری نەکردەوە، وە هەتا مردیش قسەی لەگەڵدا نەکرد (ش/د/ت/ن).

لەگێڕانەوەیەکا: کەسوکاری من (لەپاش مردنی من) پارەو پول دابەش ناکەن، هەرچیم لەپاش بەجێ ما خێرو خێراتە تەنیا ژێواری ژنەکانم و ئازوخەی سەرکارەکەمی لێ دەرچێ! (ش/د/ت/ن).

## ١١) بەشی حەوتەم: باسی راسپێری (وەصییەت):

## الفصل السابع: في الوصية:

١٩٩٧- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنْ النَبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ، يُرِيْدُ أَن يُوصِي فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ، إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر موسوڵمانێ شتێکی هەبێ کە بیەوێ راسپێریی (وەصییەتی)

---

[1] بخاري. وصايا: ٢٧٣٨. مسلم. وصية: ٤١٨٠. أبُو دَاوُدَ. وصايا: ٢٨٦٢، ترمذي. جنائز: ٩٧٤، ٢١١٨. نسائي. وصايا: ٣٦٢١.

بۆ بکا هەق وایە دوو شەوی بەسەردا تێ نەپەڕێ هەتا وەصییەتنامەکەی بە نووسراوەیی لەلای خۆی دادەنێ (ش/د/ت/ن– خودایان لێ رازی بێ).

١٩٩٨– وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها): مَا تَرَكَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دِينَـارًا وَلاَ دِرْهَمًـا وَلاَ شَـاةً وَلاَ بَعِـيرًا وَلاَ أَوْصَـى بِـشَيْءٍ. رَوَاهُ مـسلم و أَبُـو دَاوُدَ والنسائي[٢].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە گیانی پاکی سپارد هیچی لەپاش خۆی بەجێ نەهێشت، نە دینار، نە درەم، نەمەڕ نە وشتر، تەنانەت هیچ راسپێرییەکیشی نەکرد (م/د/ن).

١٩٩٩– عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنْ النَبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ أَو الْمَرْأَةَ بِطَاعَةِ اللّٰهِ تعالى سِتِّينَ سَنَةً ثُمَّ يَحْضُرُهُمَا الْمَوْتُ فَيُضَارَّان فِـى الْوَصِـيَّةِ فَتَجِبُ لَهُمَا النَّارُ. وَقَرَأَ أَبُو هُرَيْرَةَ ( مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ). رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي بسند صحيح. والله أعلم[٣].

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ رازی بـێ) دەڵـێ: حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرموێ: رێ دەکەوێ، پیـاوێ، یـا ژنـێ، شەسـت ساڵی رەبەق فەرمانبەری (طاعـەت)ی خـودای گـەورە دەکـا، کەچـی لـەکاتی سـەرەمەرگا لـە راسـپێریی (وەصییەت)دا ناهـەقی دەکـا، جا شایـستەی ئاگری دۆزەخ دەبێ ئینجا ئـەبو هورەیرە بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ} (١٢/٤).

واتـە: ئەم بەشە کە هەیە بۆیـان لـەپاش رابواردنی راسپێرییەکە کە کرابێ، یـا لـەپاش دانـەوەی قـەرزێ کـەوا بەسـەر مردووەکەوە، بە مـەرجێ کە ئەو وەصییەت‌و قـەرزە نـەکرابن بـە مەهانـەی زیـان گەیانـدن بـە میراتبـەرەکان. (د/ت–س/ص).

---

[٢] مسلم. وصية: ٤٢٠٥، أبُو داوُد. وصايا: ٢٨٦٣. نسائي. وصايا: ٣٦٢٣، ٣٦٢٤.

[٣] رَوَاهُ الترمذي بسند صحيح.

## ١٢) وەصییەتکردن بەسێیەکی ماڵ: (الوصية بالثلث)

٢٠٠٠- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرِضْتُ عَامَ الفَتْحِ مَرَضاً أَشْفَيْتُ مِنْهُ عَلَى المَوْتِ فَأَتَانِي رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَعُودُنِي فقُلتُ: يا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنَّ لِي مَالاً كَثِيراً لاَ يَرِثُنِي إِلاَّ ابْنَتِي أَفَأُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ:لاَ. قُلْتُ: فَثُلُثَيْ مَالي؟ قَالَ: لاَ، قُلْتُ: فَالشَّطْرُ؟ قَالَ: لاَ، قُلْتُ: فَالثُّلُثُ؟ قَالَ: الثُّلُثُ وَالثُّلْثُ كَثِيرٌ إِنَّكَ أَنْ تَدَعْ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَدَعَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً إِلاَّ أُجِرْتَ فِيهَا حَتَّى اللُّقْمَةَ تَرْفَعُهَا إِلَى فِي (فم) امْرَأَتِكَ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُخَلَّفُ عَنْ هِجْرَتِي؟ قَالَ: إِنَّكَ لَنْ تُخَلَّفَ بَعْدِي فَتَعْمَلَ عَمَلاً تُرِيدُ بِهِ وَجْهَ اللهِ إِلاَّ ازْدَدْتَ بِهِ رِفْعَةً وَدَرَجَةً، وَلَعَلَّكَ أَنْ تُخَلَّفَ حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أَقْوَامٌ وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ، اللَّهُمَّ أَمْضِ لأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ، وَلاَ تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ رَوَاهُ الخمسة[1].

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ساڵی فەتحی مەککە لە مەککە زۆر نەخۆش بووم، کەشەنگ بووم، خەریکبووم بمرم، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هات بۆ لام، بۆ سەر لێدانم، عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من ماڵێکی زۆرم هەیە، ئەوەیشی پێی بگوترێ میراتبەر تەنیا تاقە کچێکم هەیە، جا ئایا دروستە کە وەصییەت بکەم کە هەموو ماڵەکەم لەپاش خۆم بکەم بە خێرو خێرات؟ فەرمووی: (نەء) عەرزیم کرد: ئەی دووبەشی؟ فەرمووی: (نەء) عەرزیم کرد ئەی نیوەی؟ فەرمووی: (نەء) عەرزیم کرد: ئەی سێیەکی؟ فەرمووی: سێیەك دەبێ، وەلێ سێیەکیش هەر زۆرە لە سێیەکیش کەمتر بێ باشترە چونکە تۆ میراتبەرەکانت بە دەوڵەمەندیی بەجێ بهێڵیت گەلێ لەوە باشترە کە بە هەژاری بەجێیان بێڵی، کە لەپ لەمو لەو پان بکەنەوە، هەرچیش خەرج بکەی لەبەر ڕەزای خودای گەورە ئەوە پاداشتی گەورەی لەسەر وەردەگریت، تنانەت ئەو پاروە نانەیش کە دەیدەیت بەژنی خۆت ئەویش هەر خێرێکی گەورەیە.

---

[1] بخاري. إيمان: ٥٦، ١٢٩٥، ٣٩٣٦، ٤٤٠٩، ٥٦٦٨، ٦٣٧٣، ٦٧٣٣. مسلم. وصية: ٤١٨٥- ٤١٩٤. أبو داود. وصايا: ٢٨٦٤. ترمذي. وصايا: ٢١١٦. نسائي. وصايا: ٣٦٢٨.

عەرزیمکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! دەترسم لەگەڵ (لە کۆمەڵی یارانم) بەجێ بمێنم‌و زیانی هەبێ بۆ کۆچکردنم؟ فەرمووی: چەندە لەپاش من بمێنی‌و کردەوەی باش بکەی ساخ بۆ ڕەزای خودا بەوە پایەو پلەت پێی بەرز دەبێتەوە، ئومێدیش دەکەم کە تەمەنت درێژبێ‌و لەپاش ئێمە بمێنی‌و ببی بە مایەی خێرو خۆشی بۆ گەلی موسوڵمان، وە هەروەها ببی بە مایەی زەرەرو زیان بۆ هۆزی کافران! ئەی خودایە! کۆچی یارانم تاسەربێ‌و قەبووڵ‌و گیرابێ، وەپاشگەزیان نەکەیتەوە لێی (ش/د/ت/ن).

٢٠٠١- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ سِتَّةَ مَمْلُوكِينَ لَهُ عِنْدَ مَوْتِهِ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُمْ فَدَعَا بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَجَزَّأَهُمْ أَثْلاَثًا ثُمَّ أَقْرَعَ بَيْنَهُمْ فَأَعْتَقَ اثْنَيْنِ وَأَرَقَّ أَرْبَعَةً وَقَالَ لَهُ قَوْلاً شَدِيدًا. رَوَاهُ مُسْلِمٌ و أَبُو دَاوُدَ والنسائي. والله أعلى وأعلم[٢].

عیمرانی کوڕی حوصەین (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ هەموو ماڵەکەی تەنیا شەش بەندە بوو، لەسەرەمەرگا هەر شەشیانی ئازاد کرد، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) بانگی کردن‌و کردنی بە سێبەش‌و دەو (قورعە)ی لە نێوانا کردن‌و دوانیانی ئازاد کرد کە دەوەکەیان بۆ دەرچووبوو وەچواریشیانی بە بەندیی هێڵایەوە، وەحەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) قسەی ناخۆشیشی بە پیاوەکە گوت لەسەر ئەو کارە ناشیرینە (م/د/ن).

## ١٣) ڕاسپێری بۆ میراتبەر دروست نیە: (لا وصية لوارث)

٢٠٠٢- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ فِي خُطْبَتِهِ عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعْطَى لِكُلِّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ وَمَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوِ انْتَمَى إِلَى غَيْرِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ التَّابِعَةُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لاَ تُنْفِقُ امْرَأَةٌ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا

---

[٢] مسلم. كتاب الأيمان: ٤٣١١ – ٤٣١٣. أبو داود. عتق: ٣٩٦١، ٣٩٥٨، ٣٩٥٩، ٣٩٦٠. ترمذى. أحكام: ١٣٦٤.

إِلاَّ بِإِذْنِ زَوْجِهَا. قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ الطَّعَامَ؟ قَالَ: ذَلِكَ أَفْضَلُ أَمْوَالِنَا. رَوَاهُ الترمذي وصاحباه[1].

ئەبو ئومامە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بە گوێی خۆم گوێم لێبوو، لە وتارەکەی ساڵی حەجی ماڵ ئاواییدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەموو خاوەن مافێ خودا مافی خۆی داوەتی، کەوابوو ئیتر وەصییەتو ڕاسپێری دروست نیە بۆ میراتبەر، منداڵیش هی مێردە، شەڕواڵپیسیش ئەگەر داوای منداڵی ژنێ بکا کە مێردی هەبێو بڵێ منداڵەکە لەوەو لە مێردەکەی نیە شەڕواڵپیسیش لەم حاڵەتەدا بەردەبارانی بۆ دەمێنێتەوەو لەسەر پێ لێنانی خۆی ڕەجم دەکرێ، لەو دنیایش حسابو لێ پرسینەوەیان لەسەر خودایە، هەر کەسێکیش حاشا لە باوکی خۆی بکاو یەکێکی تر بکا بە بابی خۆی، یا حاشا لە خاوەن (مەولا)ی خۆی بکاو کەسێکی تر بکا بە سەرداری خۆی، ئەوە نەفرینو لەعنەتی خودای لێبێ، پەیتا پەیتا هەتا ڕۆژی قیامەت. نابێ ژن- لە ماڵی مێردی- هیچ ببەخشێ مەگەر بە ڕەزای مێرد خۆی، بێژرا (گوترا): ئەی پێغەمبەری خودا! هەتا خواردەمەنیش نابێ ببەخشێ؟ فەرمووی: بۆ ئێوە خواردەمەنی بە چی دەزانن خواردەمەنی باشترین ماڵی ئێمەیە (ت/د/(ن-س/ص).

## ١٤) سەرپەرشت (وەصی)ی هەتیو بە شێوەیەکی پەسەند دروستە لە ماڵی هەتیوەکە بخوات: (يأكل الوصى من مال اليتيم بالمعروف)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا} (٤/١٠).

---

[1] بسند صحيح (شرحه).

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەو کەسانە کە ماڵی هەتیوان بە ناهەق دەخۆن ئەوە بە ڕاستی پڕ بەسکی خۆیان ئاگری دۆزەخ دەخۆن، وە بە زوویی دەچنە ناو ئاگری بڵێسەداری دۆزەخەوە!

٢٠٠٣- قَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): {وَمَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ}. أُنْزِلَتْ فِي وَالِي الْيَتِيمِ أَنْ يُصِيبَ مِنْ مَالِهِ إِذَا كَانَ مُحْتَاجًا بِقَدْرِ مَالِهِ بِالْمَعْرُوفِ. رَوَاهُ البخاري[1].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەم ئایەتە:

{وَمَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ} (٦/٤).

واتە: هەر کەسێ لە ئێوە دەوڵەمەندبێ، با خۆی دوور بگرێ لە ماڵی ئەو هەتیوانە وە هەر کەسێکیش کە ئاتاج‌و گەدایە با لەو ماڵە بخوا بە شێوەیەکی پەسەند، گوتی: ئەم ئایەتە: لە شانی کاربەدەستی هەتیودا هاتە خوارەوە: ئەگەر ئاتاج‌و نیازمەندبوو ئەوە دروستە کە بەقەی خزمەتی ماڵەکە بەپێی شەرع لێی بخوا (بوخاری- خودای لێ ڕازی بێ).

٢٠٠٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم) أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِنِّي فَقِيرٌ لَيْسَ لِي شَيْءٌ وَلِي يَتِيمٌ. قَالَ فَقَالَ كُلْ مِنْ مَالِ يَتِيمِكَ غَيْرَ مُسْرِفٍ وَلاَ مُبَادِرٍ وَلاَ مُتَأَثِّلٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[2].

عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە، لە باپیریەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: من هەژارم هیچم نیە، کاربەدەستی هەتیویشم؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): بەم سێ مەرجە لەماڵی هەتیوەکەی لات بخۆ:

یەکەم: بەبێ ئیسراف‌و دەستبڵاوی.

---

[1] بخاری. وصایا: ٢٧٦٥.

[2] رَوَاهُ أبو داود. بسند صالح (شرحه).

**دووەم: بە پەلە ماڵەکەی تەواو مەکە.**

**سێیەم: ماڵی لێ پێکەوەمەنێ بۆ خۆت! (د- سند صالح-ن).**

٢٠٠٥- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ لِي رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَا أَبَا ذَرٍّ إِنِّي أَرَاكَ ضَعِيفًا وَإِنِّي أُحِبُّ لَكَ مَا أُحِبُّ لِنَفْسِي فَلاَ تَأَمَّرَنَّ عَلَى اثْنَيْنِ وَلاَ تَوَلَّيَنَّ مَالَ يَتِيمٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ ومسلم[٣].

**ئەبو ذەڕ (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: ئەی ئەبو ذەڕ!! دەتبینم زەبوون و بێ هێزیت، لەبەرئەوەی کە چیم بۆ خۆم پێ خۆش بێ بۆ تۆیش پێم خۆشە لەبەرئەوە ئامۆژگاریت دەکەم کە نەبیتە فەرماندار، با لەسەر تاقە دوو کەسیش بێ، وە نەیشبی بە سەرەوکاری ماڵی هەتیو (د/م).**

## ١٥) لەپاش رەسیدە بوون هەتیویی نامێنێ: (لا يتم بعد بلوغ)

٢٠٠٦- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: حَفِظْتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لاَ يُتْمَ بَعْدَ احْتِلاَمٍ وَلاَ صُمَاتَ يَوْمٍ إِلَى اللَّيْلِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[١].

**عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە دەمی خۆی ئەم فەرموودەیەم لەبەر کردووە: لەپاش شەیتانی بوون هەتیویی نامێنێ، قسەنەکردن و دەمگرتنیش لە قسە بەیانی هەتا ئێوارێ بەهیچ دانانرێ (د-سند صالح).**

٢٠٠٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: عُرِضْتُ عَلَى النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي الجَيْشِ وَأَنَا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يَقْبَلْنِي فَعُرِضْتُ عَلَيْهِ مِنْ قَابِلٍ فِي جَيْشٍ وَأَنَا ابْنُ

---

[٣] مسلم. إمارة: ٤٦٩٦. أبو داود. وصايا: ٢٨٦٨. نسائی. وصايا: ٣٦٦٩.

[١] بسند صحيح (شرحه).

خَمْسَ عَشْرَةَ فَقَبِلَنِي. قَالَ نَافِعٌ: وَحَدَّثْتُ بِهَذَا الْحَدِيثِ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ فَقَالَ: هَـذَا حَدُّ مَا بَيْنَ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ. وفي رواية: هذا حَدُّ مَا بَينَ الذُّرِّيَّةِ والمُقاتِلَةِ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

لە گێڕانەوەیەکی ئێرەدا ئاوایە: ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: ڕۆژی غەزای ئوحود چواردە ساڵ بووم، لەناو سوپادا ڕانوێنرام بەسەر حەزرەتدا (درودی خودای لەسەربێ) هەتا بزانێ کە بەجەنگاوەر دەگیرێم یانا جا پەسەندی نەکردم‌و ڕێگەی شەڕکردنی نەدام، بەڵام لەساڵی ئایندەدا کە پانزە ساڵ بووم لەناو سوپایەکا ڕانوێنرام بەسەریا پەسەندی کردم‌و قەبووڵی کردم بە شەڕکەر. نافیع دەڵێ: کە ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەکاتی فەرمانڕەوایی خۆیدا گوتی: ئەم سەرگوزشتەیە ڕادەی جیاکردنەوەی بچووك‌و گەورەیە لە یەکتری. لە گێڕانەوەیەکا: ئەمە ڕادەی جیایی (حەددی فاصیلی) نێوانی منداڵانە لە جەنگاوەران (ش/د/ت/ن).

٢٠٠٨- عَنْ عَطِيَّةَ الْقُرَظِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: عُرِضْنَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَوْمَ قُرَيْظَةَ فَكَانَ مَنْ أَنْبَتَ قُتِلَ وَمَنْ لَمْ يُنْبِتْ خُلِّيَ سَبِيلُهُ فَكُنْتُ مِمَّنْ لَـمْ يُنْبِـتْ فَخُلِّـيَ سَبِيلِي. رَوَاهُ الترمذي في السّير والنسائي في طلاق الصَّبِيّ بلفظ: فَمَنْ كَـانَ مُحْتَلِمًـا أَوْ نَبَتَتْ عَانَتُهُ قُتِلَ وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مُحْتَلِمًا أَوْ لَمْ تَنْبُتْ عَانَتُهُ تُرِكَ. والله أعلى وأعلم[٣].

عطییەی قورطی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ڕۆژی غەزای بەنی قورەیظە، ئێمە کە ئەوسا جوولەکە بووین یەکە یەکە نیشانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەدراین هەتا منداڵ لە پیاو جیابکرێتەوە جا ئەو کەسەی کە بەری مووی لێ هاتبوو دەکوژرا، ئەوەشی کە بەری مووی لێ نەهاتبوو بەرەڵڵا دەکرا، من خۆم یەکێك بووم لەوانە کە هێشتا موویان لێ نەهاتبوو، بۆیە بەرەڵڵا کرام (ت-س/ص-ن) گفتەی (ن): ئیتر، ئەوەی کە شەیتانی بوو بوو، یا بەری مووی لێ هاتبوو دەکوژرا وە ئەوەیشی کە وەهانەبوو وازی لێ دەهێنرا.

---

[٢] تقدم برقم: ٣٨٨ فى المجلد الأول. تسلسل:٥١.

[٣] رواه الترمذى بسند صحيح (شرحه).

## ١٦) بەشی هەشتەم: باسی بەندە (واتە: کۆیلە) ئازادکردن:

## الفصل الثامن: العتق

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ، فَكُّ رَقَبَةٍ، أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ، يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ، أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ} (٩٠/١١-١٦).

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: هێشتا ئادەمیزاد بە تەواوی پەلاماری پلەی سەختی نەداوەو هەورازە سەختەکەی نەبڕیوە، تۆ چووزانیت ئەو پلە سەختە کامەیە کە خودا پێی خۆشە ئادەمیزاد پەلاماری بداو تەختی بکا؟ ئەو هەورازو پلەیە گەلێ پاپیلکەی هەیە: یەکێ لەوانە کۆیلەیی و بەندەییە، تەخت دەکرێ بە ئازادکردنی بەندەکان و بە هەڵکردنی ئاڵای ئازادی بۆ هەموو کەسێ و بۆ هەموو گەلێ، کە ئەمەیش بەڕاستی کۆسپێکی گەلێ گەورەیەو بەهەموو کەسێ ناکرێ، یەکێکی تر لەوانە دەسگیرۆیی مەردومە، بە تایبەتی لە ڕۆژی برسێتی و گرانیدا نان و ئاو بدا بەهەژاران و بە ئاتاجان و بە هەتیوان و بە خزم و خوێشان و بە هەژاری کەفتەکاری.

٢٠٠٩- عن سَعِيدٌ ابْنُ مَرْجَانَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْتَقَ امْرَأً مُسْلِمًا اسْتَنْقَذَ اللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنْهُ مِنَ النَّارِ. قَالَ سَعِيدٌ: فَانْطَلَقْتُ إِلَى عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ تعالى عَنْهُمَا) فَأَخْبَرْتُهُ فَعَمَدَ إِلَى عَبْدٍ لَهُ قَدْ أَعْطَاهُ بِهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ عَشَرَةَ آلَافِ دِرْهَمٍ أَوْ أَلْفَ دِينَارٍ فَأَعْتَقَهُ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[1].

سەعیدی کوڕی مەرجانە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) پێی گوتم: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر پیاوێ پیاوێکی بەندەی موسوڵمان ئازاد بکا، خودا لەجیاتی هەر ئەندامێکی ئەو بەندەیە، ئەندامێکی ئەو ئازادکەرە لە ئاگری دۆزەخ ئازاد دەکا. سەعید گوتی: چووم بۆ لای عەلی کوڕی حوسەین (خودای لێ ڕازی بێ) کە ئەم باسەم بۆ باسکرد پەلاماریدا، بەندەیەکی هەبوو ئازادیکرد، عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر

---

[1] بخاری: عتق: ٢٥١٧، ٦٧١٥. مسلم. عتق: ٣٧٧٥. ترمذی. نذورو أیمان: ١٥٤١.

بەو بەندەیە دەهەزار درەم، یا هەزار دینـاری دابوو پێـی نەیدابوو پێـی، بـەڵام بە ئومێدی شادبوون بەم بەهرەیە کە ئەم فەرموودەیە مژدەی پێ داوە ئـازادی کرد (ش/ت).

٢٠١٠- و لمسلم والترمذي: مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً أَعْتَقَ اللّٰـهُ بِكُـلِّ عُـضْوٍ مِنْـهُ عُضْوًا مِنَ النَّارِ حَتَّى يُعْتِقَ فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ[٢].

موسلیمو تیرمیذی غەریقی بەحری ڕەحمەتی خودای گەورە بنو نەیەنە دەرەوە لێـی، دەگێڕنـەوە لـە حەزرەتـەوە (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: هەرکەسێ بەندەیـەکی خـاوەن بـاوەڕو خـاوەن ئیمـان ئـازاد بکـا، خـودای گەورەیش لـە جیاتی هـەر ئەنـدامێکی ئـەو بەندەیە ئەندامێکی ئـەو کەسە لـە ئـاگری دۆزەخ ئـازاد دەکـا، تەنانـەت دامـەنو شـەرمگای لـەجیاتی دامـەنو شەرمگای ئازاد دەکا! (م/ت).

٢٠١١- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَيُّ الْعَمَـلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: إِيْمَانٌ بِاللّٰهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ. قُلْتُ: فَأَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: أَغْلاَهَا ثَمَنًا، وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا. قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قَالَ: تُعِينُ صَانِعًا أَوْ تَصْنَعُ لأَخْرَقَ. قُلْتُ: فَـإِنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قَالَ: تَدَعُ النَّاسَ مِنَ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

ئەبو ذەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پرسیم لە حـەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ): کام کارە زۆر پەسەندو گەورەیە؟ فەرمووی: ئیمانو باوەڕ بە خوداو خـەباتو تێکۆشـان لەڕێگـەی ئـەودا، گـوتم: ئـەی کـام بەندەیـە ئـازاد بکـرێ پاداشـی گەورەترە؟ فەرمووی: ئەوەی کە بە بەها گرانەو لەلای خاوەنەکەی گەلێ چاكو نایابە عـەرزیم کـرد: ئەگـەر ئـەوەم بـۆ نـەکرا؟ فـەرمووی: یاریـدەی پیشەسازی بدە، یا دەستی ناشیو کۆڵییەك بگرەو فێری کارێ، پیشەیەکی بکە، عـەرزیم کـرد: ئەگـەر ئەوەیـشم بـۆ نـەکرا؟ فـەرمووی: شـەڕی خـۆت لـە مـەردووم لادە، ئەوەیش هەر خێرە (ش).

---

[٢] مسلم. عتق: ٣٧٧٤ — ٣٧٧٧. ترمی. نذور: ١٥٤١.

[٣] بخاری. عتق: ٢٥١٨. نسائی. جهاد: ٣١٢٩. مسلم. إیمان: ٢٤٦، ٢٤٧.

٢٠١٢- و لأبي داوود والترمذي: أَيُّمَا رَجُلٍ مُسْلِمٍ أَعْتَقَ رَجُلاً مُسْلِمًا فَإِنَّ اللّٰهَ عَزَّ وَجَلَّ جَاعِلٌ وِقَاءَ كُلِّ عَظْمٍ مِنْ عِظَامِهِ عَظْمًا مِنْ عِظَامِ مُحَرَّرِهِ مِنَ النَّارِ وَأَيُّمَا امْـرَأَةٍ أَعْتَقَتِ امْرَأَةً مُسْلِمَةً فَإِنَّ اللّٰهَ جَاعِلٌ وِقَاءَ كُلِّ عَظْمٍ مِنْ عِظَامِهَا عَظْمًا مِنْ عِظَامِ مُحَرَّرِهَا مِنَ النَّارِ[٤].

لەسەر ریوایەتی ئەبو داوودو تیرمیذی (خودایان لێ رازی بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر پیاوێکی موسوڵمان پیاوێکی موسوڵمان ئازاد بکا خودا یەك بەیەك ئێسکی ئازادکراوەکە دەکا بەهۆی سوپەرێ لە ئاگری دۆزەخ، بۆ یەك بەیەکی ئێسکی ئازادکەرەکە، هەر ئافرەتێکیش ئافرەتێکی موسوڵمان ئازاد بکا هەروەها (د/ت-س/ص).

٢٠١٣- و لأصحاب السُّنن: مَثَلُ الَّذِي يُعْتِقُ عِنْدَ الْمَوْتِ كَمَثَلِ الَّـذِي يُهْـدِي إِذَا شَبِعَ[٥].

حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەربێ)- لەسـەر گێڕانـەوەی پێـشەوایان: ئـەبو داوودو تیرمیـذی نەسائی بـە سـەنەدێکی صـەحیح- دەفـەرموێ: ئـەوەی کـە لەسەرەمەرگا بەندە ئازاد دەکا مانەندی کەسێکە کە تا خۆی تێر نەخواو لـە لـووتی نەیەتـەوە دیـاری‌و دەسـەنە بەکـەس نـادا وە هـەتا خـۆی لەبـەری نەمێنێتەوە بەشی کەس نادا.

٢٠١٤- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَـالَ: مَـنْ أَعْتَـقَ عَبْدًا وَلَهُ مَالٌ فَمَالُ الْعَبْدِ لَهُ إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَهُ السَّيِّدُ[٦].

ئیبنـو عومـەر (خودایـان لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ بەندەیێ ئازاد بکا، ئەگەر بەندەکە ماڵی هەبێ ئەوە ماڵەکە بۆ خۆیەتی‌و مافی ئاغاکەیی پێوە نیە مەگەر لە حاڵەتێکا کە ئاغاکەی

---

[٤] بسند صحيح (شرحه).

[٥] بسند صحيح (شرحه).

[٦] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ بيسند صالح (شرحه).

مەرجی کردبێ کە ماڵەکە بۆ خۆی بێ، ئەوە دەبێ بەهی خۆی (د-سند صالح-ن).

٢٠١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلَدُ الزِّنَا شَرُّ الثَّلاثَةِ. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: لأَنْ أُمَتِّعَ بِسَوْطٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَعْتِقَ وَلَدَ زِنْيَةٍ. رَوَاهُما أَبُو دَاوُدَ والنسائي. والله أعلى وأعلم[٧].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: مناڵی زۆڵ خراپترینی سێ کەسەکەیە کە خۆی‌و باوکی‌و دایکین، هەرچەند بیژووەکە بەشدارنییە لە تاوانەکەی باوک‌و دایکیا، وەلێ بەزۆری واڕێدەکەوێ کە مرۆیەکی زۆر خراپی لێ پەیدا دەبێ، چونکە لە توخمێکی پیسە ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) دەیگوت: من بەش بە حاڵی خۆم ئەوەم گەلێ پێ باشترە کە قەمچییەك بکەم بەخێر لە ڕێگەی خودادا تا ئەوەی کە بەندەیەکی زۆڵ ئازاد بکەم (د-سند صالح-ن).

## ١٧) بەندەی خزم کەبوو بە ماڵی خزم ئیتر ئازاد دەبێ، ئەگەر کەسێکی دارا هەندێکی لە بەندەیێ ئازادکرد، دەبێ باقی مەندەکەشی ئازاد بکا:

## القريب يعتق بالملكية كما يعتق الباقي على الميسور

٢٠١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لاَ يَجْزِي وَلَدٌ وَالِدًا إِلاَّ أَنْ يَجِدَهُ مَمْلُوكًا فَيَشْتَرِيَهُ فَيُعْتِقَهُ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ البخاري[١].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەس لەچاکەی باوك‌و دایك‌و باپیرەو نەنکی خۆی دەرناچێ، مەگەر ئەمانە بەندەبن‌و ئەو بیانکڕێ‌و ئازادیان بکا (م/د/ت/(ن- خودایان لێ رازی بێ).

٢٠١٧- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: مَنْ مَلَكَ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ فَهُوَ حُرٌّ. رَوَاهُ أصحاب السنن والحاكم وصححه[٢].

---

[٧] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ بيسند صالح (شرحه).

[١] مسلم. عتق: ٣٧٧٨. ترمذى. بروصلة: ١٩٠٦. أبُو دَاوُدَ. أدب: ٥١٣٧.

سەموورەی کوڕی جوندوب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: هەرکەسـێ ببـێ بـەخاوەنی بەندەیـەکی خزمـی خـۆیی (مەحرەم) ئیتر یەکسەر ئەو بەندەیە ئازاد دەبێ چونکە کەسایەتی و ئاغایی و نۆکەرییان نەگوتووەو ئەم دوو وشە لەیەکەوە دوورن. (د/ت/ن/حاکم-حاکم بە صەحیحی داناوە).

٢٠١٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي مَمْلُوكٍ فَعَلَيْهِ عِتْقُهُ كُلِّهِ، إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَهُ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ عَتَقَ عَلَيهِ مَا عَتَقَ. رَوَاهُ الخمسة والله أعلى وأعلم[٣].

ئیبنـو عومـەر (خودایـان لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربێ) فەرمووی: ئەوەی بەشی خۆی لە بەندەیەك ئازاد بکا، لەسەریەتی کەهەمووی ئازاد بکـا، ئەگـەر ئەوەنـدەی مـاڵ هـەبوو کـە بەشـی ئـەوە بکـا، بـەڵام ئەگـەر ئەوەنـدەی مـاڵ نـەبوو ئـەوە هـەر ئـەو بەشـەی ئـازاد دەبـێ کـە ئـازاد کـراوە. (ش/د/ت/ن).

## ١٨) بەندەی کاغەز پێدراو (موکاتەب): (المكاتبة: (نامە نووسی))

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا} (٢٤/٣٣).

یەزدانی پاك خودای گـەورەو مـەزن لـە قورئـانی پیرۆزدا دەفـەرموێ: وە ئەو، بەندانەتان کە دەیانەوێ موکاتەبەیان لەگەڵدا بکرێ موکاتەبەیان لەگەڵدا بکەن، بە مەرجێ کە بزانن خێریان لێ دەوەشێتەوە.

٢٠١٩- ➡ (ب - ٢ - ز - ١٤٩ - ف - ٣): وَفِـي هَـذِهِ الرِوَايَـة: عَـنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: دَخَلَتْ عَلَيَّ بَرِيرَةُ فَقَالَتْ: إِنَّ أَهْلِي كَاتَبُونِي عَلَـى تِـسْعِ

---

[٢] صحيح عند الصالح.

[٣] بخارى. عتق: ٢٥٢٢، ٢٤٩٢، ٢٥٢١، ٢٥٢٣، ٢٥٢٤، ٢٥٢٥. مسلم. عتق: ٣٧٤٩، ٤٣٠١. أبو داوُد. عتق: ٣٩٤٠.

أَوَاقٍ فِي تِسْعِ سِنِينَ فِي كُلِّ سَنَةٍ أُوقِيَّةٌ. فَأَعِينِينِي. فَقُلْتُ لَهَا: إِنْ شَاءَ أَهْلُكِ أَنْ أَعُدَّهَا لَهُمْ عَدَّةً وَاحِدَةً وَأُعْتِقَكِ وَيَكُونَ الْوَلاَءُ لِي فَعَلْتُ. فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لأَهْلِهَا فَأَبَوْا إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الْوَلاَءُ لَهُمْ فَأَتَتْنِي فَذَكَرَتْ ذَلِكَ فَانْتَهَرْتُهَا (أي أنكرت عليها ما ذكرته) فَقَالَتْ: لاَهَا اللَّهِ إِذًا (أي لا والله هذا ما أقسم به) قَالَتْ: فَسَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَسَأَلَنِي فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ: اشْتَرِيهَا وَأَعْتِقِيهَا وَاشْتَرِطِي لَهُمُ الْوَلاَءَ فَإِنَّ الْوَلاَءَ لِمَنْ أَعْتَقَ. فَفَعَلْتُ. قَالَتْ: ثُمَّ خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَشِيَّةً فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ. ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ فَمَا بَالُ أَقْوَامٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ! مَا كَانَ مِنْ شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَهُوَ بَاطِلٌ وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْطٍ كِتَابُ اللَّهِ أَحَقُّ وَشَرْطُ اللَّهِ أَوْثَقُ. وَفِي رِوايةٍ: فَعُتِقَتْ وَكَانَ زَوْجُهَا عَبْداً فخيَّرَها رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا وَلَوْ كَانَ حُرًّا لَمْ يُخَيِّرْهَا. رَوَاهُ الخمسة[1].

**عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بەریرە هات بۆلام گوتی: خاوەنەکانم نامە نووسی (موکاتەبە)یان لەگەڵدا کردووم لەسەر نۆ ئۆقیە، بۆ ماوەی نۆ ساڵ، کە هەر ساڵەی ئۆقیەیە بدەم جا هاتووم کە تۆیش یاریدەیەکم بدەی. منیش پێم گوت: ئەگەر ئاغاکانت ئارەزوویان هەیە ئەوا من ئەو پارەیەیان بە نەختی بۆ دەژمێرم و یەکسەر ئازادیشت دەکەم. بەڵام بەمەرجێ کە سەرداریی (وەلاء)یەکەت بۆ من بێ و من ببم بە هەقدارت جا ئەویش ئەم باسە دەگێڕێتەوە بۆ ئاغاکانی بەڵام ئاغاکانی ڕازی نابن و دەڵێن: سەرداری و هەقداری هی خۆمانەو نایدەین بەکەس. جا دیسانەوە هاتەوە بۆ لام و ئەم کەین و بەینەی بۆ گێڕامەوە، منیش پیاهەڵشاخام، ئەویش گوتی: سا بەخودا هەر ئەوەیە.**

**عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم باسە دەبیسێت وە لە منی پرسی، بۆیم گێڕایەوە. فەرمووی: تۆ بیکڕەو ئازادی بکەو مەرجیش دابنێ کە سەرداریی بۆ ئەوان بێ ئەو مەرجە بایەخی نیە بەڵام لە ڕاستیدا سەرداریی بۆ ئەو کەسەیە کە بەندەکە ئازاد دەکا منیش وامکرد.**

---

[1] تقدم تخرجه برقم: ١٧٩٤/٣ في مجلد/ ٢ تسلسل: ١٤٩.

جا سەر لە ئێوارەیێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وتارێکی داو سوپاس و ستایشی خودای کردو ئینجا فەرمووی: لەپاش ئەمە ئەوە گەلا کەس بۆچی هەندێ مەرجی وا بە مەرج دەگرن کە شتی وا لە نامەی خودادا نیە! هەر مەرجێ کە لە نامەو شەریعەتی خودادا نەبێ ئەوە پووچ و بەتاڵە، ئەگەر چی سەدمەرجیش بێ، فەرمان و بڕیاری خودا ڕاستترەو مەرجی خودا مەحکەمترو لەبارترە. لە گێڕانەوەیەکا: ئیتر کە من کڕیم و ئازادم کرد بەریرە ئازاد بوو، مێردەکەیشی بەندە بوو، ناوی موغیث بوو.

جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەریرە خۆیی کرد بە سەرپشك کە یا بمێنێتەوە لە ژێر ڕکێفی مێردەکەیدا یا شووەکەی هەڵبووەشێنێتەوە بەریرەیش خۆیی هەڵبژاردو دەستی لە مێردەکەی هەڵگرت، بەلام ئەگەر مێردەکەی ئازاد بوایەو بەندە نەبوایە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) بەریرەی نەدەکرد بە سەرپشك و خوا ناخوا بەژنی مێردەکەی دەمایەوە (ش/د/ت/ن).

٢٠٢٠- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَيُّمَا عَبْدٍ كَاتَبَ عَلَى مِائَةِ أُوقِيَّةٍ فَأَدَّاهَا إِلاَّ عَشْرَةَ أَوَاقٍ فَهُوَ عَبْدٌ وَأَيُّمَا عَبْدٍ كَاتَبَ عَلَى مِائَةِ دِينَارٍ فَأَدَّاهَا إِلاَّ عَشْرَةَ دَنَانِيرَ فَهُوَ عَبْدٌ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن والحاكم وصححَّه[٢].

عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر بەندەیێ لەسەر سەد ئۆقیە نامە نوسی (کیتابەت) بکا وە پارەکە گشتی بدا تەنیا ئۆقیەی نەبێ ئەوە هێشتا هەر بەندەیە هەتا هەر سەدەکە بەتەواوی دەدا، وە هەر بەندەیێ لەسەر سەد لیرە نامەنووسی بکا، وە گشتی بدا تەنیا دیناڕێ نەبێ ئەوە هێشتا هەر بەندەیە! (د/ت/ن/حاکم:ص).

---

[٢] صحيح عنه الحاكم.

٢٠٢١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللّٰـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا كَانَ لإِحْدَاكُنَّ مُكَاتَبٌ فَكَانَ عِنْدَهُ مَا يُؤَدِّي فَلْتَحْتَجِبْ مِنْهُ. رَوَاهُ أصحاب السنن (بسند صحيح). والله أعلى وأعلم[٢].

ئوم سەلەمە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی بە ئێمە: ئەگەر ئافرەتێ لە ئێوە بەندەیەکی نامەنووس (موکاتەب: کاغەز پێدراو)ی هەبوو، وە لە هەمان کاتدا بەندەکە ئەوەندەی ماڵ هەبوو کە بەشی خەرجەکەی بکاو بتوانێ قیستەکەی سەری پێبدا، ئیتر با ئەو ئافرەتە چارشێوو پەچە بگرێتەوە لەو بەندەیە (د/ت/(ن-س/ص).

**١٩) بەندەی مودبەر (پاشە مەرگە)فرۆشتنی دروستە: (یجوز بیع المدبر)**

٢٠٢٢- ⬅ (ب-٢- ز - ١٦٥ - ف - ٣). وَفِي رِوَايَةٍ: عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ أَعْتَقَ غُلاَمًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ، لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ فَبَلَغَ ذلِكَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي؟ فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللّٰهِ بِثَمانِمَائَةِ دِرْهَم فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ. رَوَاهُ الخمسة. وزاد أَبُو دَاوُدَ: إذا كَانَ أَحَدَكُمْ فَقِيراً فَلْيَبْدَأْ بِنَفْسِهِ فَإِنْ كَانَ فِيهَا فَضْلٌ فَعَلَى عِيَالِهِ فَإِنْ كَانَ فِيهَا فَضْلٌ فَعَلَى ذِي قَرَابَتِهِ. والله أعلى وأعلم[١].

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێ- لە یاریدە دەرانی حەزرەت- خولامێکی هەبوو، ئازادیکرد بە مەرجێ کە لەپاش مردنی خۆی ئازاد ببێ، پیاوەکە هیچ ماڵێکی تری وای نەبوو، جا کە ئەم باسە گەیشتەوە بە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کێ ئەم بەندەیەم لێ دەکڕێ؟ جا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵلا لێی کڕی بە هەشت سەد درەم‌و پارەکەی وەرگرت‌و دای بە خاوەنەکەی (ش/د/ت/ن) ئەبو داوود ئەمەی پتر کردووە: ئەگەر یەکێ لە ئێوە هەژار بوو با لە پێش پێشا خێرەکەی بۆ خۆی بێ، جا ئەگەر لەخۆی مایەوە ئەوە با بۆ خاووخێزانی بێ، ئەگەر لەوانیش مایەوەو لەوانیش زیادبوو ئەوسا بۆ خزم‌و خوێش. خودا هەر بۆ خۆی باش باشی لێ دەزانێ.

---

[٢] بسند صحيح.

[١] تقدم برقم/ ١٨٨٧ فى المجلد الثانى. تسلسل/ ١٦٥.

## ٢٠) نە سەرداریی بەندە دەفرۆشرێ و نە دایکی منداڵ (ام الولد):
## لا يجوز بيع الولاء ولا أم الولد

٢٠٢٣- عن ابْنَ عُمَرَ رضى الله عنهما قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنْ بَيْعِ الْوَلاَءِ، وَعَنْ هِبَتِهِ. رَوَاهُ الخمسة[1].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **نەهی کردووە لە فرۆشتنی سەرداریی و لە بەخشینی بە یەکێکی تر. (ش/د/ت/ن. خودایان لێ ڕازی بێ).**

٢٠٢٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بِعْنَا أُمَّهَاتِ الأَوْلاَدِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَأَبِى بَكْرٍ فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ نَهَانَا فَانْتَهَيْنَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي. (ولفظه: كُنا نَبيع سَرَارينا أُمَّهاتِ الأَوْلاَدِ والنبي (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حيٌّ مَا يَرَى بَأْساً)[2].

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: بەسەرینیی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **و ئەبو بەکریش کەنیزەکی دایکی منداڵی خۆمانمان دەفرۆشت، بەڵام کە عومەر بوو بە جێنشین نەهی لێکردین لەوە، ئیتر ئێمەیش فەرمانەکەیمان نەشکاندو وازمان لێ هێنا (د/(ن-س/ح) گفتەی (ن): لەپێشدا ئەو کەنیزەکانەمان کە دایکی منداڵمان بوون دەمان فرۆشتن، ئەوسا پێغەمبەر خۆی** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەژیان دابوو، وەئەوەی بەخراپ نەدەزانی.**

٢٠٢٥- وَقَالَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَيُّمَا امْرَأَةٍ وَلَدَتْ مِنْ سَيِّدِهَا فَهِيَ مُعْتَقَةٌ عَنْ دُبُرٍ مِنْهُ. رَوَاهُ أحمد وإبن ماجه. والله أعلى وأعلم[3].

---

[1] مسلم. عتق: ٣٧٦٧. ترمذى. ولاء: ٢١٢٦، ١٢٣٦. بخارى. فرائض: ٦٧٥٦. نسائى. بيوع: ٤٦٧١. أبُو داوُد. فرائض: ٢٩١٩.

[2] بسند حسن (شرحه).

[3] سكت عنه الشارح.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر ئافرەتێ لە ئاغاکەی منداڵی ببێ لەپاش مردنی ئاغاکەی دەس بەجێ ئازاد دەبێ! (ئەحمەد/ ئیبنو ماجە).

## ٢١) پاشەکی: باسی مافی ئاغاو نۆکەریی

٢٠٢٦– عَنْ جَرِيرِ بْنُ عَبْدِ اللهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: أَيُّمَا عَبْدٍ أَبَقَ مِنْ مَوَالِيهِ فَقَدْ كَفَرَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَيْهِمْ. وفي رواية: إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ. وفي أخرى: مَنْ تَوَلَّى قَوْمًا بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ والنَّاسِ أَجْمَعِينَ لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ عَدْلٌ وَلاَ صَرْفٌ. رَوَاهُ مسلم هذه الثلاثة[1].

جەریری کوڕی عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر بەندەیەك لەدەست خاوەنەکانی هەڵبێ ئەوە کفری نیعمەتی کردووە تا دەگەڕێتەوە ژێر ڕکێفیان!

لە گێڕانەوەیەکا: ئەگەر بەندە هەڵبێ‌و ڕابکا لە دەست ئاغاکانی نوێژی قەبووڵ نابێ! لە یەکێکی تردا: هەر بەندەیێ (بەبێ ڕێدانی ئاغاکانی)کەسێکی تر بکا بە ئاغای خۆی لەعنەت‌و نەفرینی خوداو فریشتەکان‌و ئەو خەڵکەی هەموو لەسەر بێ، لە ڕۆژی قیامەتا نەفەرزو نە سوونەتی پەسەند ناکرێ! (م).

٢٠٢٧– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْعَبْدُ إِذَا نَصَحَ سَيِّدَهُ وَأَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ كَانَ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ. رَوَاهُ الثلاثة[2].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو بەندەیەی دڵسۆزبێ بۆ ئاغاکەی‌و ساغبێ لەگەڵی‌و لە هەمان کاتدا بەجوانی پەروەردگاری خۆی بپەرستێ ئەو دوو چەندان پاداشتی گەورەی بۆ هەیە (ش/د– خودایان لێ ڕازی بێ).

---

[1] مسلم. إيمان: ٢٢٥، ٢٢٧، ٣٧٧٠.

[2] بخاري. عتق: ٢٥٤٦، ٢٥٥٠.

٢٠٢٨- عن أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَـنِ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّم) قَـالَ: لِلْعَبْـدِ الْمَمْلُوكِ الصَّالِحِ أَجْرَانِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْحَجُّ وَبِرُّ أُمِّي، لأَحْبَبْتُ أَنْ أَمُوتَ وَأَنَا مَمْلُوكٌ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) لـە حـەزرەتـەوە دەفـەرموێ (دروودی خـودای لەسەربێ): بەندەی زەڕخڕیدەی باش دوو پاداشتی بۆ هەیە ئەبو هورەیرە دەڵێ: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەستە لەبەر خاتری خەبات‌و تێکۆشان لە ڕێگەی خـواداو لەبـەر حـەجکردن‌و خزمـەتکردنی دایکـم نـەبێ حـەز دەکـەم کـە بـە بەندەیی بمرم (ش).

٢٠٢٩- عَنِ الْمَعْرُورِ بْنِ سُوَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَرْنَا بِأَبِي ذَرٍّ بِالرَّبَـذَةِ وَعَلَيْـهِ بُرْدٌ وَعَلَى غُلاَمِهِ مِثْلُهُ فَقُلْنَا يَا أَبَا ذَرٍّ لَوْ جَمَعْتَ بَيْنَهُمَا كَانَتْ حُلَّةً. فَقَالَ: إِنَّهُ كَانَ بَيْنِـي وَبَيْنَ رَجُلٍ مِنْ إِخْوَانِي كَلاَمٌ وَكَانَتْ أُمُّهُ أَعْجَمِيَّةً فَعَيَّرْتُهُ بِأُمِّهِ فَشَكَانِي إِلَى النَّبِيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَلَقِيتُهُ فَقَالَ: يَا أَبَا ذَرٍّ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّـهِ مَـنْ سَـبَّ الرِّجَالَ سَبُّوا أَبَاهُ وَأُمَّهُ. قَالَ: يَا أَبَا ذَرٍّ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ. هُمْ إِخْوَانُكُمْ جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ فَأَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ وَأَلْبِسُوهُمْ مِمَّا تَلْبَسُونَ وَلاَ تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ. رَوَاهُ الثلاثة. ولفظ أبي داود: إِنَّهُمْ إِخْوَانُكُمْ فَضَّلَكُمُ اللَّهُ عَلَـيْهِمْ فَمَنْ لَمْ يُلاَئِمْكُمْ فَبِيعُوهُ وَلاَ تُعَذِّبُوا خَلْقَ اللَّهِ تَعَالَى[٤].

مـەعرووری کـوڕی سـووەید (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: جـارێ لـە ڕەبـەزە چووین بۆلای ئەبو زەڕ، پارچەیێ شاڵی لەبەردابوو، خولامەکەشی لە هەمان شاڵ پارچەیەکی لەبەردا بوو، وەهی هیچیان قاتی تەواو نەبوو جا گوتمان: ئەی ئەبو زەڕ! ئەگەر ئەم دوو پارچە شاڵەت بۆ خۆت لەبەر بکردایە جلەکەت دەبوو بە قاتی تەواو. گوتی: جارێ پیاوێکی برادەرم هەبوو، دایکی بەرانی بوو واتە: دایکی عەرەب نەبوو لەسەر قسەیێ توانجم لە دایکیدا پێم گوت:

---

[٣] بخاری. عتق: ٢٥٤٨. مسلم. أیمان: ٤٢٩٦.

[٤] بخاری. إیمان: ٣٠، ٢٥٤٥، ٧٠٨٣. مسلم. أیمان: ٤٢٨٩ — ٤٢٩١. أبو داود. أدب: ٥١٥٧، ٥١٥٨. ترمذی. بروصلة: ١٩٤٦.

کوڕی ژنە قولەڕەشەکە! ئەویش چوو لە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) سکالای لە دەستمکرد، جا کە چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ! هێشتا وەکوونێ ڕەگی سەردەمی نەزانیت تیا ماوە گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! کەسێ جنێو بە خەڵك بدا خەڵکیش جنێو بە باوك‌و دایکی دەدەنەوە!

فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ! تۆ چۆن پیاوێکی؟ هێشتا ڕەگی سەردەمی نەزانیت تیا ماوە، ئەمانە براتانن خودا کردوونی بەژێر دەستەی ئێوە، کەواتە لە خواردن‌و جل‌و بەرگا لە خۆتانیان جیا مەکەنەوە، وە کارو فرمانی گرانی وایان مەدەن بەسەردا کە لە کێشیانا نەبێ، ئەگەر دنیابوو داوای کارو فرمانێکی ئاواشتان لێ کردن خۆشتان یارمەتییان بدەن (ش/د- خودایان لێ ڕازی بێ). گفتەی (د): ئەوانە براتانن، ئەوەندە هەیە کە خودا باوو فەزڵی ئێوەی داوە بەسەر ئەواندا، جا ئەوەی لەوان بەدەردتان ناخوا بیفرۆشن، وە ئازارو ئەشکەنجەی دروستکراوانی یەزدانی مەزن مەدەن[1].

٢٠٣٠- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ آخِرُ كَلَامِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الصَّلَاةَ الصَّلَاةَ اتَّقُوا اللَّهَ فِيمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي وأحمد[5].

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: دوا فەرمایشتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەرەمەرگا ئەمەبوو دەیفەرموو: ئاگاتان لە نوێژەکان بێ، ئاگاتان لە نوێژەکان بێ، هەمیشە لە خودا بترسن‌و ترسی خوداتان لەدڵدا بێ، کەواتە بۆ

---

[1] هەزار ڕەحمەت لە شێخ سەلام‌و خەیام بێ کە دەڵێن:

دڵ ئازار مەبە، کەس دڵ مەشکێنە
بە ئاگری ڕق، کەس مەسووتێنە
گەر ئاسوودەگی یەکجاریت دەوێ
خۆت برەنجێنەو خەڵک مەرەنجێنە (وەرگێڕ)

[5] سكت عنه الشارخح.

**بەندەو کەنیزەك‌و ژێردەستەی خۆتان باش بن‌و ناهەقییان لێ مەکەن تەنانەت ناهەقی لە ئاژەڵیش مەکەن! (د/ن/ئەحمەد).**

**٢٠٣١- عن أبي هُرَيْرَة (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ، فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ، فَلْيُنَاوِلْهُ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ أَوْ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ، فَإِنَّهُ وَلِيَ عِلاَجَهُ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٦].**

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر کەسێکتان نۆکەرەکەی نانی بۆ دانا- ئەگەر لەگەڵ خۆشی داینەنیشێنێ- با پاروویە دوو پاروو، یا تیکەیێ دوو تیکەی بداتێ، چونکە ئەو خۆی دروستی کردووەو ئەرکی پێوە کێشاوە، بێ ویژدانییە کە خۆی لێی نەخوا (ش/ت).**

**٢٠٣٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْتَنِبِ الْوَجْهَ. رَوَاهُ الثلاثة (وهم البخاري ومسلم وأبو داود) رضوان الله تَعَالَى عليهم أجمعين[٧].**

**دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر بوو بە شەڕتان لە دەم‌و چاوی یەکتری مەدەن! (ش/د- خودایان لێ ڕازی بێ).**

**٢٠٣٣- و لمسلم وأبي داود: مَنْ لَطَمَ مَمْلُوكَهُ أَوْ ضَرَبَهُ فَكَفَّارَتُهُ أَنْ يُعْتِقَهُ. والله أعلى وأعلم[٨].**

**حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ شەپازلە لە بەندەی خۆی بدا یا بە هەر شتێکی تر لێی بدا برێتی (کفارە)تەکەی ئەوەیە کە ئازادی بکا (م/د).**

---

[٦] بخاری. عتق: ٢٥٥٧، ٥٤٦٠.

[٧] بخاری. عتق: ٢٥٥٩.

[٨] مسلم. أيمان: ٤٢٧٤. أبو داود. أدب: ٥١٦٨.



# نامەی ژنهێنانو تەڵاقدانو عیددەی ژن

**(ئەم نامەیە دەباسو پاشەکییەکە (پاشەکی= پایان))**

## ٢٢) باسی یەکەم: هاندان لەسەر ژنهێنان

قَالَ اللهُ تَعَالَى: { فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً} (٤/٣).

**واتە: خودای مەزن دەفەرموێ: ژنی پاكو تەمیز بێنن كە بە دڵتان بن وە لەسەر شەریعەتی ئیسلام مارەیان ببڕن لە خۆتان، ئیتر ژمارەیان دوو بێ، یا سێ بێ، یا چوار بێ دەبێ، ئەگەر مەترسی ئەوەتان هەبوو كە لە بەینیانا ناهەقیو نارەوایی دەكەنو ناتوانن لەنگەری تەرازووی دادو عەدالەت لە نێوانیاندا رابگرن ئەوە تاقە یەك ژن بێنن.**

وَقَالَ تَعَالَى: {وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن يَكُونُوا فُقَرَاء يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ} (٢٤/٣٢).

**واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەو پیاوانەتان كە بێ ژنن ژنیان بۆ بێننو ئەو ژنانەتان كە بێ مێردن بیاندەن بە شوو، وە هەروەها بەندەی باشو كەنیزەكی باشیشتان، گریمان هەژاریش بن خودا دەوڵەمەندیان دەكا لە فەزڵو میهرەبانی خۆیەوە، وە خودا دارایيو گوشادەو زانایشە بە حاڵی ئێوە.**

وَقَالَ تَعَالَى: {وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً } (١٣/٣٨).

**لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: لە پێش تۆشەوە رەهبەرانو پێغەمبەرانی ترمان رەوانە كردووە وە ژنانو هاوسەرانو منداڵو نەوەو وەچەمان پێ داوون.**

٢٠٣٤- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: سمعتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُول: يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ. رَوَاهُ الخمسة[1].

عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە حەزرەت خۆیم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): ئەی دەستەی لاوان! ئەی گەلی جوانان! هەر کەسەتان تەوانایی سەرجێیی و ژنداریی هەیە با ژن بێنێ، چونکە ئەوە چاوی تێر دەکا و داوێنی لە تاوان دەپارێزێ.

ئەو کەسەیشی کەلە کێشیا نیە ژن بهێنێ با بەرۆژوو بێ، چونکە رۆژوو دەیخەسێنێ واتە: ئارەزووی کەم دەکاتەوە، تا خودا دەرووی لێ دەکاتەوە (ش/د/ت/ن).

٢٠٣٥- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: جَاءَ ثَلاثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا فَقَالُوا وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ. قَالَ أَحَدُهُمْ أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا. وَقَالَ آخَرُ أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلاَ أُفْطِرُ. وَقَالَ آخَرُ أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبَدًا. فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[2].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: سێ کەس چوون بۆ ماڵی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە بارەی پەرستیش و عیبادەتی حەزرەتەوە پرسیاریان هەبوو، کە پێیان گوترا عیبادەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چۆنە وەك بڵێی بەکەمی بزانن وابوو، جا گوتیان: ئێمە لە کوێ و پێغەمبەر

---

[1] بخاری. صوم: ١٩٠٥، ٥٠٦٥، ٥٠٦٦. مسلم. نكاح: ٣٣٨٤. ترمذی. نکاح: ١٠٨١. نسائی. صیام: ٢٢٣٩ — ٢٢٤١، ٣٢٠٧، ٣٢٠٨، ٣٢١١. أبو داوْد. نكاح: ٢٠٤٦.

[2] بخاری. نكاح: ٥٠٦٣. مسلم. نكاح: ٣٣٨٩.

(دروودی خودای لەسەربێ) لە کوێ، ئەو خودا بە صەریحی ئایەت لە گوناهی بەرو دوای خۆش بووە ئەوەتانێ یەزدانی گەورە مژدەی دەداتێو پێی دەفەرموێ:

{إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا، لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ-٤٨/١-٢}.

جا یەکێکیان گوتی: من بەشەو هەر شەو نوێژ دەکەم هەتا هەتایە، یەکێکی تریشیان گوتی: منیش ساڵ دوانزە مانگە هەر بەرۆژوو دەبمو یەك رۆژی لێ ناخۆم، ئەویتریشیان گوتی: منیش کلا دەبم لەژنو هەتا هەتایە ژن نایەنمو توخنی ژن ناکەوم. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆلایانو فەرمووی: ئەوە ئێوە وەها وەها دەڵێنو ئەم قسانە دەکەن! دەسا بەو خودایە من لەئێوە زیاتر لە خودا دەترسمو لە ئێوە زیاتر تەقوای دەکەم، بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا من بەش بە حاڵی خۆم رۆژووش دەگرمو رۆژووش ناگرمو شەو نوێژیش دەکەمو بەشی خۆیشم دەخەومو سەرەڕای ئەمانەیش ژنیش دەهێنم، جا ئەمە رێگەو رەوشتو رەفتاری منە ئەوەی لێی لا بدا ئەوە لە من نیە (ش/ن).

٢٠٣٦- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَرْبَعٌ مِنْ سُنَنِ الْمُرْسَلِينَ الْحَيَاءُ وَالتَّعَطُّرُ وَالسِّوَاكُ وَالنِّكَاحُ. رَوَاهُ احمد والترمذي بسند حسن[٣].

ئەبو ئەییوب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەم چوارە لە رەوشتو سوننەتی پێغەمبەرانو رەهبەرانن:

یەکەم: شەرمو شکۆ.

دووەم: خۆ بۆنخۆشکردن.

سێیەم: سیواك.

چوارەم: ژن هێنان. (ئەحمەد/ ت-س/ح).

---

[٣] حدیث حسن.

٢٠٣٧- وللترمذي والنسائي والحاكم: ثَلاَثَةٌ حَقٌّ عَلَى اللَّهِ عَوْنُهُمُ الْمُكَاتَبُ الَّذِي يُرِيدُ الأَدَاءَ وَالنَّاكِحُ الَّذِي يُرِيدُ الْعَفَافَ وَالْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ[٤].

حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەم سێ کەسە سایشتەی یاریدەو کۆمەکی خودای گەورەن: ئەو بەندە نامە نووس (موکاتەب)ەی کە دەیەوێ پارەی ئاغاکەی بداو خۆی ئازاد بکا، ئەو ژنخوازەیش کە لە ژنهێنانەکەی مەبەستی سەرەکی داوێنپاکی بێ، ئەو خەباتگێڕەیش کە لە ڕێگەی خودادا تێ دەکۆشێ (ت/ن/حاکم/داره قوطنی:ص).

٢٠٣٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: حُبِّبَ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا النِّسَاءُ وَالطِّيبُ وَجُعِلَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلاَةِ. رَوَاهُ النسائي وأحمد والحاكم[٥].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەم جیهانە ئەم دوو شتەم لە لا خۆشەویست کراون: ئافرەتو بۆنی خۆش، وەلە نوێژیشدا چاوو دڵم ڕۆشن دەبنەوە! (ن/ئەحمەد/حاکم).

٢٠٣٩- عن سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قال: أَرَادَ عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ أَنْ يَتَبَتَّلَ فَنَهَاهُ رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلَوْ أَجَازَ لَهُ ذَلِكَ لاَخْتَصَيْنَا. رَوَاهُ الخمسة وأبا داود[٦].

سەعدی کوڕی وەققاص (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: عوسمانی کوڕی مەظعوون ویستی لێ بڕێ بۆ خوداو واز لە جیهان بێنێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی نەدا، ئەگەر ڕێگەی ئەوی بدایە ئێمەیش خۆمان دەخەسان! (ش/ت/ن).

---

[٤] رَوَاهُ الدارقطني وصححه.

[٥] كل ما في النسائي صحيح عنده على ماجاء في مقدمة شرح التاج.

[٦] بخاری. نكاح: ٥٠٧٣، ٥٠٧٤. مسلم. نكاح: ٣٣٩٠. ترمذی. نكاح: ١٠٨٣. نسائی. نكاح: ٣٢١٢.

٢٠٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي رَجُلٌ شَابٌّ وَإِنِّي أَخَافُ عَلَى نَفْسِي الْعَنَتَ وَلاَ أَجِدُ مَا أَتَزَوَّجُ بِهِ النِّسَاءِ فَأْذَنْ لِي أَخْتَصِيَ قَالَ فَسَكَتَ عَنِّي ثُمَّ قُلْتُ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ فَسَكَتَ عَنِّي ثُمَّ قُلْتُ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ فَقَالَ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ قَدْ جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا أَنْتَ لاَقٍ فَاخْتَصِ عَلَى ذَلِكَ أَوْ دَعْ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[٧].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من پیاوێکی گەنج و جەهێڵم و نیمە ژن بێنم و لە خۆشم دەترسم کە تووشی نارەوایی و بێ شەرعی ببم کەوابوو ڕێگەم بدە با خۆم بخەسێنم! حەزرەتیش خامۆش بوو، وە هیچ دەنگی نەکرد لە گەڵم، تا سێ جار ئەمەم لێ دووبارە کردەوە هەر دەنگی نەکرد، تا لە جاری چوارەما فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە! ئەوەی دێتە ڕێت تازە تێپەڕی و ڕەت بوونەوەی بۆ نیەو کار لەکار ترازاوەو لە چارەت نووسراوەو کاغەزو قەڵەم پێچراونەتەوەو هەڵگیراون و هیچ لەگەڵ چارەنووس ناکرێ! لەگەڵ ئەمیشە کەیفی خۆتە حەز دەکەی خۆت بخەسێنەو حەز دەکەی واز بێنەو خۆت مەخەسێنە لە حاستی چارەنووسی لەوحولمەحفووظ هیچ سوودی نیە (ب/ن).

٢٠٤١- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ (عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ) لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ بِمِائَةِ امْرَأَةٍ، تَلِدُ كُلُّ امْرَأَةٍ غُلاَمًا، يُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلَكُ قُلْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ. فَلَمْ يَقُلْ وَنَسِيَ، فَطَافَ بِهِنَّ، وَلَمْ تَلِدْ مِنْهُنَّ إِلاَّ امْرَأَةٌ نِصْفَ إِنْسَانٍ. قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَوْ قَالَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَمْ يَحْنَثْ، وَكَانَ أَرْجَى لِحَاجَتِهِ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي (رضوان الله تَعَالَى عليهم) والله أعلى وأعلم[٨].

دیسان گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لێبێ) فەرمووی: سولەیمانی کوڕی داوود (دروودی خودایان لەسەربێ) فەرمووی: سوێندبێ ئەمشەو دەچمە لای سەد ژن لە ژنەکانم هەر ژنەی کوڕێکی دەبێ لە ڕێگەی خودادا خەبات دەگێڕێ و

---

[٧] بخاری. نکاح: ٥٠٧٦.

[٨] بخاری. نکاح: ٥٢٤٢، ٦٧٢٠. مسلم. إيمان ونذور: ٤٢٦٤، ٤٢٦٥، ٤٢٦٢. نسائی. أيمان ونذور: ٣٨٦٥.

جەنگ دەکا، جوبرائیلیش پێی فەرموو: بفەرموو: خودا بیکاو حەزی خودای لەسەربێ، ئەویش لەیادی چوو ئەوەی نەگوت! جا کاتێ رۆیشتە لای هەموویان کەسیان منداڵیان نەبوو تاقە ژنێکیان نەبێ، ئەویش نیوە منداڵێکی بوو!

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر بیگوتبا: خوا حەزکا (ان شاء الله) سوێندەکەی سەری دەگرت و ئاواتەکەی دەهاتە دی! (ش/ت).

٢٠٤٢- ولأحمد وإبن ماجه: (كما هو في الشرح): كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَأْمُرُ بِالْبَاءَةِ وَيَنْهَى عَنِ التَّبَتُّلِ نَهْياً شَدِيداً وَيَقُولُ تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ الأَنْبِيَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[٩].

وەك لە شەرحەکەدا دەڵێ: گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمانی دەکرد بە هاوسەریی و بە هیچ جۆرێ رێگەی رەبەنی و شوونەکردن و ژن نەهێنانی نەدەدا، وە دەیفەرموو (درودی خودای لەسەربێ): ژنی مێرد پەروەری بزۆکی سکوزاکەر بێنن، چونکە من لە رۆژی قیامەتدا لەناو پێغەمبەرەکاندا خۆم دەنوێنم پێتانەوە جا ئێوە هەتا زۆرترو لەناو خۆتانا رێك و پێکتر بن بۆ من زیاتر مایەی شانازییە (ئەحمەد/ ئیبنو ماجە- خودایان لێ رازی بێ).

٢٠٤٣- ولإبن ماجه (كما هو في الشرح أيضا): النِّكَاحُ مِنْ سُنَّتِي فَمَنْ لَمْ يَعْمَلْ بِسُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي وَتَزَوَّجُوا فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ وَمَنْ كَانَ ذَا طَوْلٍ فَلْيَنْكِحْ[١٠].

لە شەرحەکەدا دیسان دەڵێ: ئیبنو ماجە (خودای لێ رازی بێ) ریوایەت دەکا: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: هاوسەری و ژنهێنان رەوشتی منە، ئەوەیشی رەفتار بە رەوشت و سوننەتی من نەکا لەمن نیە، وە ژن بێنن چونکە من لەناو نەتەوەکانی تردا شانازیتان پێوە دەکەم ئێوە هەتا زۆرتر بن زیاتر خودا دەپەرستن و دەبن بە مایەی رووسووری و سەربەرزی بۆ من لەناو گەلە خودا ناسەکانی تردا! وە ئەوەی هەیەتی و خاوەن دارابیە با ژن بێنێ.

---

[٩] سكت عن درجته الشارح.

[١٠] سكت عنه الشارح.

٢٠٤٤- وللبيهقي (كما هو في الشرح أيضاً): تَزَوَّجُوا فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ وَلاَ تَكُونُوا كَرَهْبَانِيَّةِ النَّصَارَى[١١].

لە شەرحەکەدا دیسان دەڵێ: بەیهەقی (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: ژن بێنن، چونکە من لەناو گەلانا خۆمتان پێوە دەنوێنم، وە ئێوە ڕەفتارو ڕەوشتی من بکەن بە سەرمەشق بۆ خۆتانو چاو لە ڕەهبانییەتی نەصرانییان مەکەن کە بە خەیاڵی خاوی خۆیان بۆ زیادە بەندەیی کردن ڕەهبانییەتیان دامەزراندبوو، کە گوایە بریتییە لە گۆشەگیریی و ڕەبەنی و بێ ژنو ماڵی.

٢٠٤٥- وللديلمي (كما هو في الشرح أيضاً): حجُّوا تستغنوا وَسَافِرُوا تَصِحُّوا وتناكَحُوا تَكْثُرُوا فإني أباهي بكم الأممَ[١٢].

دیسان لە شەرحەکەدا دەڵێ: دەیلەمی (خودای لێ ڕازی بێ) ڕیوایەت دەکا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: حەج بکەن چونکە حەج ئەگەر ساخ بۆ ڕەزای خودا بێ پێی دەوڵەمەند دەبن، وە سەفەر بکەن سەفەرو گەشتو گەڕان دەبێ بەهۆی ساخیو تەندروستی، وە ژن بێنن زۆر دەبن، چونکە من لەناو گەلانا شانازیتان پێوە دەکەم.

٢٠٤٦- وللدار قطني (كما هو في الشرح أيضاً): امرأَةُ ولودٍ أَحَبُ إِلى الله مِنْ امرأةٍ حسناء لا تَلِدُ إني مكاثِرٌ بِكُمْ الأمم يومَ القيامَةِ[١٣].

دارە قوطنی (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: ژنی سکوزاکەر باشترە لەلای خودا لە شەرحەکەدا دیسان دەڵێ: ژنی نەزۆکی جوان، من لە ڕۆژی قیامەتدا لەناو نەتەوەکانا خۆمتان پێوە دەنوێنم.

---

[١١] سكت عنه الشارح.

[١٢] سكت عنه الشارح.

[١٣] سكت عنه الشارح.

## ٢٣) ئەوەی بۆ پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر رەوا بووە لەبابەت ژنهێنانەوە

## ما ابيح للنبى ﷺ من النساء

٢٠٤٧- (ب-١ - ز - ٣٢ - ف - ١٠)[1].

٢٠٤٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) وَعِنْدَهُ تِسْعُ نِسْوَةٍ[2].

ئیبنو عەبباس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ کۆچی دوایی کرد نۆ ژنی هەبوو (ن).

٢٠٤٩- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها): مَا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) حَتَّى أَحَلَّ اللّٰهُ لَهُ أَنْ يَتَزَوَّجَ مِنَ النِّسَاءِ مَا شَاءَ. رواهما النسائي. والله أعلى وأعلم[3].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەپێش مەرگیا خوا بۆی رەوا کردبوو کە چەن ژن ئارەزوو دەکا بیهێنێ (ن).

## ٢٤) باسی دووەم: ژنی پەسەند

## الباب الثانى: في الزوجة المحمودة

٢٠٥٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) قَالَ: تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: وا باوە لەناو خەڵکا کە ژن لەبەر ئەم چوار شتە مارە دەکرێ و دەخوازرێ: لەبەرئەوە کە ماڵی هەیە، یا لەبەرئەوە کە خانەدانە، یا لەبەرئەوە

---

[1] تقدم فى المجلد الأول برقم: ٢٨٧/١٠ تسلسل/٣٢.

[2] جميع ما فى النسائى صحيح عنده على ما فى المقدم.

[3] جميع ما فى النسائى صحيح عنده على ما فى المقدم.

[1] تقدم فى المجلد الأول برقم: ٢٨٧/١٠ تسلسل/ ٣٢.

کە جوانە، یا لەبەرئەوە کە بە ئایینەو خاوەن دینە، جا ئەی ژنخوازی هۆشمەند! تۆ ئافرەتی ئاییندار بە دین لە کیس خۆت مەدە، تا دەستە شکێن نەبیت! (ش/د/ت/ن-خودایان لێ رازی بێ).

٢٠٥١- وللنسائي ومسلم: إِنَّ الدُّنْيَا كُلَّهَا مَتَاعٌ وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ[٢].

نەسائی و موسلیم (خودایان لێ رازی بێ) ریوایەت دەکەن: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: ئەم جیهانە هەمووی هەر رابواردنەو خۆشییەکەی نیوەچڵەو پێنج و دوو رۆژێکە باشترین هۆی رابواردن و خۆشگوزەرانیش لەم جیهانەدا ئافرەتی باشە!.

٢٠٥٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: خَيْرُ نِسَاءٍ رَكِبْنَ الإِبِلَ صَالِحُو نِسَاءِ قُرَيْشٍ، أَحْنَاهُ عَلَى وَلَدٍ فِي صِغَرِهِ وَأَرْعَاهُ عَلَى زَوْجٍ فِي ذَاتِ يَدِهِ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئافرەتی باشی قورەیش باشترین ئافرەتی عەرەبن زۆر دڵسۆزن بۆ منداڵی ساوا، وە گەلێ دڵیان بە ماڵی مێرد دەسووتێ! (ش).

٢٠٥٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: تَزَوَّجْتُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَا تَزَوَّجْتَ؟ فَقُلْتُ ثَيِّبًا، فَقَالَ مَالَكَ وللعَذارى وَلعابِهَا قُلْتُ؟ يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ عَبْدَ اللّٰهِ مَاتَ وَتَرَكَ سَبْعَ بَنَاتٍ أَوْ تِسْعًا فَجِئْتُ بِمَنْ يَقُومُ عَلَيْهِنَّ. قَالَ: فَدَعَا لِي. رَوَاهُ الخمسة (رضوان الله تَعَالَى عليهم)[٤].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کە ژنم هێنا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێم: چیت هێناوە کچ یا بێوەژن؟ عەرزیم کرد: بێوەژن فەرمووی: ئەی لۆ کچێکت نەهێنا بۆ یاری و دەسبازی و لێومژین!

---

[٢] مسلم. رضاع: ٣٦٢٨. نسائی. نکاح: ٣٢٣٢.

[٣] بخاری. نکاح ٣٤٣٤، ٥٠٨٢، ٥٣٦٥. مسلم. فضائل: ٦٤٠٧، ٦٤٠٢ – ٦٤٠٨.

[٤] بخاری. استتقراض: ٢٣٨٥، ٢٧١٨، ٢٩٦٧. أبو داود. بیوع: ٣٥٠٥. ترمذی. بیوع: ١٢٥٣. نسائی. بیوع: ٤٦٥١.

عەرزمکرد! ئەی پێغەمبەری خودا! عەبدوڵڵای باوکم کە مرد حەوت کچ یا نۆ کچی بەسەردا بەجێ هێشتم لەبەرئەوە بێوەژنێکم هێنا کە کارامەبێ ماڵ و مێردی دیبێ و وەك خۆیان کوڵی و دەسەوسان نەبێ هەتا سەرپەرشتییان بکا. گوتی: جا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) دووعا و نزای باشی بۆمکرد و راکەی پەسەند کردم (ش/د/ت/ن).

٢٠٥٤- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنها): يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَرَأَيْتَ لَوْ نَزَلْتَ وَادِيًا وَفِيهِ شَجَرَةٌ قَدْ أُكِلَ مِنْهَا، وَ شَجَرَةٌ لَمْ يُؤْكَلْ مِنْهَا، فِي أَيِّهَا كُنْتَ تُرْتِعُ بَعِيرَكَ؟ قَالَ: فِي الَّتِي لَمْ يُرْتَعْ مِنْهَا. تَعْنِي أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَمْ يَتَزَوَّجْ بِكْرًا غَيْرَهَا. رَوَاهُ البخاري[٥].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر لە شوێنێ دابەزیت، لەوەڕی لێ بوو لێی خورابوو لەوەڕی تریشی لێ بوو لێی نەخورابوو، تۆ لە کامیانا وشترەکەت دەلەوەڕێنی؟ فەرمووی: لەو لەوەڕەدا کە دەمی بۆ نەبراوە و لێی نەخوراوە!

عائیشە مەبەستی ئەوەبوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بێجگە لەخۆی کچی تری نەهێنابوو جا لەبەرئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) زیاتر نازی دەگرت (ب).

٢٠٥٥- عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: يا رَسُولَ اللهِ إِنِّي أَصَبْتُ امْرَأَةً ذَاتَ حَسَبٍ وَجَمَالٍ وَإِنَّهَا لاَ تَلِدُ أَفَأَتزَوَّجُهَا؟ قَالَ: لاَ، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ فَنَهَاهُ ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ فَقَالَ: تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي والحاكم و صَحَّحَهُ[٦].

مەعقیلی کوڕی یەسار (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئافرەتێکی خانەدانی خانومانم دۆزیوەتەوە بەڵام سکوزا ناکا، ئایا بیخوازم؟ فەرمووی: نەء لەپاشا جارێکی تریش هاتەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەر رێگەی نەدا، جا لەسەری جاری سێیەمدا کە پیاوەکە هاتەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێی

---

[٥] بخاری. نکاح: ٥٠٧٧.

[٦] صحیح عنددد الحاکم.

فەرموو: ژنی مێرد پەروەری بزۆکی سکوزاکەر بێنن! چونکە من لەناو نەتەوەکاندا خۆمتان پێوە دەنوێنم! (د/ن/حاکم:ص).

٢٠٥٦- وَقِيلَ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَيُّ النِّسَاءِ خَيْرٌ؟ قَالَ: الَّتِي تَسُرُّهُ إِذَا نَظَرَ وَتُطِيعُهُ إِذَا أَمَرَ وَلاَ تُخَالِفُهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهَا بِمَا يَكْرَهُ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُم)[٧].

وترا: ئەی پێغەمبەری خودا! کام چەشنە ژنە باشەو کام ژن چاکە بۆ پیاو کە بیخوازێ؟ فەرمووی: ژنێ کە تەماشکردنی و دیمەنی مایەی چاوو دڵ ڕۆشنیی مێردەکەی بێ و فەرمانی نەشکێنێ و گوێڕایەڵی بێ، وە بە سەرو بەماڵ درێخی لێ نەکاو ئازاری دڵی نەدا! (د/ت/ن-س/ص).

٢٠٥٧- وللشيخين والترمذي: مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ[٨].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەپاش خۆمەوە هیچ ئاژاوەو فیتنەیەکم لەناو ئۆمەتما بەجێ نەهێشتووە کە وەك ئاژاوەو فیتنەی ژنان زیان بەخش بێ بۆ پیاوان (ش/ت).

٢٠٥٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي لاَ تَمْنَعُ يَدَ لاَمِسٍ. قَالَ: غَرِّبْهَا. قَالَ: أَخَافُ أَنْ تَتْبَعَهَا نَفْسِي. قَالَ: فَاسْتَمْتِعْ بِهَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٩].

ئیبنو عەبباس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ هات بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ژنەکەم دەست بەڕووی کەسەوە نانێ؟! فەرمووی: بەرەڵایکە: تەڵاقی بدە! گوتی: دەترسم دوایی دڵم بۆی لێبدا، فەرمووی: ڕابوێرە لەگەڵی تا دڵت لێی هەڵدەکەوێ (د/ن-س/ص).

---

[٧] بسند صحيح (شرحه).

[٨] بخاری نکاح: ٥٠٩٦. مسلم. ذکرو دعاء: ٦٨٨١، ٦٨٨٠.

[٩] بسند صحيح (شرحه).

## ٢٥) مێردی پەسەند: (الزوج المحمود)

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللّٰهِ أَتْقَاكُمْ} (٤٩/١٣).

**خودای گەورە دەفەرموێ: بەقەدرو بەرێزترینی ئێوە ئەو کەسەتانە کە زیاتر ترسی خودای لەدڵ دابێ و پتر شەرمو شکۆی لێبکا!**

٢٠٥٩- عَنْ سَهْلٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي هَذَا؟ قَالُوا: رجل من أشْرَاف الناس، هذا وَاللّٰهِ حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ يُنْكَحَ، وَإِنْ شَفَعَ أَنْ يُشَفَّعَ، وَإِنْ قَالَ أَنْ يُسْتَمَعَ. قَالَ ثُمَّ سَكَتَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَرَّ رَجُلٌ مِنَ فُقَرَاءِ الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي هَذَا؟ قَالُوا: يا رَسُولُ اللهِ هذا الرجل من فقراء المسلمين حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ لاَ يُنْكَحَ وَإِنْ شَفَعَ أَنْ لاَ يُشَفَّعَ، وَإِنْ قَالَ أَنْ لاَ يُسْتَمَعَ (لقوله) فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَذَا خَيْرٌ مِنْ مِلْءِ الأَرْضِ (من) مِثْلَ هَذَا. رَوَاهُ البخاري (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُ)[1].

**سەهل (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێکی دەوڵەمەند لەلای پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) رەت بوو: فەرمووی: ئەم پیاوە چۆنە بەلاتانەوە؟ گوتیان: ئەمە پیاوێکی خانەدانە بەخودا ئەمە شایستەی ئەوەیە ئەگەر داوای ژن بکا ژنی پێ بدرێ، ئەگەر تکایێ بکا تکای بگیرێ، ئەگەر قسەیێ بکا گوێ بۆ قسەکەی شل بکرێ.**

**پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) بێدەنگ بوو، تا پیاوێکی هەژار لە موسوڵمانان لەوێوە رەت بوو، جا فەرمووی: ئەدی ئەم پیاوە چۆنە بە لاتانەوە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە پیاوێکە لە هەژارانی موسوڵمانان ئەمە هەقی وایە ژنی پێ نەدرێ، تکای نەگیرێ، گوێ لە قسەی نەگیرێ! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەسا ئەمەیان باشترە لە پڕزەوی لەوێنەی ئەوپتریان قەدرو رێزو چاکی لەلای خودای گەورە بەدڵی پاکە بە ماڵی زۆر نییە بوخاری. (پڕ گۆڕە پیرۆزەکەی لە نووری خودای مەزن بێ).**

---

[1] بخاری. نکاح: ٥٠٩١، ٦٤٤٧.

٢٠٦٠- عَنْ أَبِي حَاتِمٍ الْمُزَنِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا جَائَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ إِلاَّ تَفْعَلُوه تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ قالوا: يا رَسُولُ اللهِ وَإِن كَانَ فِيْهِ؟ قَالَ: إِذَا جَائَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. رَوَاهُ الترمذي و حسنه. والله أعلى وأعلم[٢].

ئەبو حاتەمی موزەنی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر پیاوێکی وا کە هەم ئایینی و هەم رەفتاریتان بەدڵ بوو هاتە سەر بەرەتان بۆ خوازبێنی ئەوا ژنی پێ بدەن، ئەگینا ئاژاوەو ئاشووب لە زەویدا بەرپا دەبێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ئەگەر لە لایەکی ترەوە ناتەواویی هەبوو وەك ئەوە هەژاربوو یا خانەدان نەبوو ئەوە چۆن؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: ئەگەر پیاوێکی وا هاتە سەر بەرەتان بۆ خوازبێنی کە ئایین و رەوشتیتان بەدڵ بوو ژنی پێ بدەن (ت:ح).

## ٢٦) باش وایە کە مرۆڤ لە پێشدا تەماشای دەسگیرانی خۆی بکا
## ينبغي النظر إلى المخطوبة

٢٠٦١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أُرِيتُكِ فِي الْمَنَامِ مَرَّتَيْنِ، إِذَا رَجُلٌ يَحْمِلُكِ فِي سَرَقَةِ حَرِيرٍ فَيَقُولُ هَذِهِ امْرَأَتُكَ، فَأَكْشِفُهَا فَإِذَا هِيَ أَنْتِ، فَأَقُولُ إِنْ يَكُنْ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ. رَوَاهُ الشيخان[١].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە خەوما دوو جار تۆم نیشان درا، پیاوێ لەناو پارچەیێ هەوریشما تۆی هەڵگرتبوو دەیهێنایت بۆ لای من و دەیفەرموو: ئەمە ژنی تۆیە. کەسەریم هەڵدەدایەوە دەڕوانم وا وێنەی تۆیە! جا دەمگوت: ئەمە ئەگەر لەخوداوە بێ دەیهێنێتەدی. (ش= بوخاری و موسلیم، رەزای خودایان لێبێ).

---

[٢] حسن عند الترمذي.

[١] بخاري. نكاح: ٣٨٩٥، ٥٠٧٨، ٥١٢٥. مسلم. فضائل: ٦٢٣٣.

**٢٠٦٢– قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا؟. قَالَ: لاَ. قَالَ: فَاذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا فَإِنَّ فِي أَعْيُنِ الأَنْصَارِ شَيْئًا. رَوَاهُ مسلم والنسائي[٢].**

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێ هاتە خزمەتی گوتی: ژنێکی ئەنصاریم خواستووە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئایا تەماشایت کردووە؟ گوتی: نەو فەرمووی: دەبڕۆ تەماشای بکە، چونکە لەچاوی ئەنصار (یاریدەدەران)دا شتێ هەیە چاویان کەمێ پچووکە، یا تۆزێ شینە (م/ن).**

**٢٠٦٣– عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا خَطَبَ أَحَدُكُمُ الْمَرْأَةَ فَإِنِ اسْتَطَاعَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى مَا يَدْعُوهُ إِلَى نِكَاحِهَا فَلْيَفْعَلْ (فَخَطَبْتُ جَارِيَةً فَكُنْتُ أَتَخَبَّأُ لَهَا حَتَّى رَأَيْتُ مِنْهَا مَا دَعَانِي إِلَى نِكَاحِهَا وَتَزَوُّجِهَا فَتَزَوَّجْتُهَا). رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والشافعي والحاكم وصححه[٣].**

**جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان ویستی ژنێ داوابکا، ئەگەر دەتوانێو بۆی لووا با خۆی تەماشای ئەو شوێنانەی بکا کە دەبێ بەهۆی خواستنی ئەگەر خۆی بۆی نەکرا با ئافرەتێ بنێرێ لە باتی خۆی تەماشای بکا، وە ژنیش ئەم دوو مافەی بۆ هەیە. جابیر گوتی: جا خوازبێنی کچێکمکرد، لەپەناوە خۆم مەلاس دەدا، هەتا تەماشای ئەو شوێنانەیم کرد کە بوو بە هۆی خواستنی، وە لەدواییدا مارەمکرد (د/شافیعی/حاکم، حاکم بەصەحیحی داناوە).**

**٢٠٦٤– عَنِ الْمُغِيرَةِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ خَطَبَ امْرَأَةً فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) انْظُرْ إِلَيْهَا فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا. رَوَاهُ النسائي والترمذي وحسنه[٤].**

---

[٢] مسلم. نکاح: ٣٤٧٠. نسائی. نکاح: ٣٢٤٦.

[٣] صحيح عند الحاكم.

[٤] حسن عند الترمذی.

**موغیره** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: داخوازی ژنێکمکرد بۆ خۆم، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: تەماشای بکە تا ببێ بە هەوێنی ئەڤینیی لە نێوانی هەردوولاتاندا، وە ببێ بە مایەی پایە داریی خۆشەویستی تاسەر لە نێوانتاندا** (ن/ت:ح).

**٢٠٦٥- عن ابْنَ عُمَرَ** (رَضِيَ اللهُ عَنهما) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قال: لاَ يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، حَتَّى يَتْرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَهُ، أَوْ يَأْذَنَ لَهُ. رَوَاهُ الخمسة. والله أعلى وأعلم**[5].

ئیبنو عمەر (خودایان لیَ رازی بآ) طوتی: ثیَغەمبەر (دروودی خودای لەسەربآ) فەرمووی: نابآ ثیاو خوازبیَنی لەسەر خوازبیَنیی برای ئایینی خؤی بکا، مەطەر خوازبیَنی کەری ثیَشوو واز بیَنآ یا ئەو ریَطەی بدا (ش/د/ت/ن).

## ٢٧) هاوتایی (هاوکوفی= کەفائەت): (الكفاءة)

**قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلاَ تَنكِحُواْ الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ وَلاَ تُنكِحُواْ الْمُشِرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُواْ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ} (٢/٢٢١).**

**راتە: خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ژنی هاوبەشپەیداکەر بۆ خودا مارە مەکەن، هەتا باوەڕ دێننو موسوڵمان دەبن، بەڕاستی کەنیزەکێکی موسوڵمان بۆ ئێوە باشترە لە ژنێکی ئازادی هاوبەشپەیداکەر، با ئەوەندەیش جوان بێ کە دڵتان بیگرێ، یا ئەوەندە داراو ماڵدار بێ کە بەدڵتان بێ، وە ژن مارە مەبڕن لە پیاوی بێ باوەڕی هاوبەشپەیداکەر بۆ خودا هەتا باوەڕ دێننو موسوڵمان دەبن، بە راستی**

---

[5] بخاری. بیوع: ٢١٣٩، ٢١٤٠، ٢١٤٨، ٢١٥٠، ٢١٥١، ٢١٦٠، ٢١٦٢، ٢٧٢٣، ٢٧٢٧، ٥١٤٤، ٥١٥٢، ٦٦٠٦. مسلم. نكاح: ٣٤٤١، ٣٧٩١. أبو داود. نكاح: ٢٠٨٠. ترمذي. نكاح: ١١٣٤. نسائي. نكاح: ١٨٦٧.

بەندەیەکی موسوڵمان زۆر باشترە لە پیاوێکی ئازاد (حوڕ)ی هاوبەشپەیداکەر بۆ خودا، ئەگەرچی لە بەرماڵ، یا لەبەر جوانی، یا لەبەر هەرهۆیەکی تر بەدڵتان بێ.

٢٠٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ أَبَا هِنْدٍ حَجَمَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي الْيَافُوخِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَا بَنِي بَيَاضَةَ أَنْكِحُوا أَبَا هِنْدٍ وَانْكِحُوا لَهُ وَقَالَ: إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِمَّا تَدَاوَوْنَ بِهِ خَيْرٌ فَالْحِجَامَةُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والحاكم[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەبو هیند کە ناوی یەسار بوو، وە بەندەی ئازادکراوی خێڵی بەنی بەیاضەبوو" وە ئیشی کەڵەشاخگرتن بوو جارێ کەڵەشاخی لە فریشکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گرت، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەی بەنی بەیاضة! ژن بدەن بە ئەبو هیند ئەگەر داوای ژنی لێکردن وە ژنیشی لێ بخوازنو مەڵێن: ئێمە چۆن ببین بە هاوشانی بەندەیەکی کەڵەشاخگر!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووشی: ئەم شتانەی کە ئێوە تیمارو داوو دەرمانی نەخۆشیان پێ دەکەن ئەگەر باشیان تیابێ، یەکێکیان کەڵەشاخگرتنە! (د/حاکم/حافظ:ح).

٢٠٦٧- قَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تَزَوَّجَهَا وَهْيَ بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ، وَأُدْخِلَتْ عَلَيْهِ وَهْيَ بِنْتُ تِسْعٍ، وَمَكَثَتْ عِنْدَهُ تِسْعًا. رَوَاهُ الخمسة. وزاد مسلم: وَمَاتَ عَنْهَا وَهِيَ بِنْتُ ثَمَانَ عَشْرَةَ سنة. وفي رواية: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي شَوَّالٍ وَبَنَى بِي فِي شَوَّالٍ فَأَيُّ نِسَاءِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَانَ أَحْظَى عِنْدَهُ مِنِّي. قَالَ وَكَانَتْ عَائِشَةُ تَسْتَحِبُّ أَنْ تُدْخِلَ نِسَاءَهَا فِي شَوَّالٍ[2].

---

[1] حسنه الحافظ فى التلخيص (شرحه).

[2] بخارى. مناقب الأنصار: ٣٨٦٩. مسلم. نكاح: ٣٤٦٦. نسائى. نكاح: ٣٢٥٨. ترمذى. نكاح: ١٠٩٣. نسائى. نكاح: ٣٢٣٦.

**عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: کاتێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **منی مارەکرد شەش ساڵانەبووم، کاتێ گواستمیەوە نۆ ساڵ بووم حەزرەت ئەوکاتە تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵ بوو وە تەنیا نۆساڵیش لەلای مامەوە ئیتر حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **گیانی سپارد (ش/د/ت/ن) موسلیم** (خودای لێ رازی بێ) **ئەمەشی پتر کردووە: جا کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کۆچی دوایی کردوو منی بەجێ هێشت هەژدە ساڵ بووم لە گێڕانەوەیەکا: گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە مانگی شەشەڵاندا منی مارەکردو، وە هەر لە مانگی شەشەڵانیشدا گواستمیەوە، جا پێم بڵێن ئایا ژنەکانی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کامیان وەکوو من لەلای نازی هەبوو؟ جا لەبەرئەوە عائیشە پێی خۆش بوو کە ژنی کەسوکاری خۆی لە مانگی شەشەڵاندا بەبووکی ببرێن!**

**٢٠٦٨– عَنْ بُرَيْدَةَ** (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) **قال: خَطَبَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ (رضي الله عنهما) فَاطِمَةَ (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْها) فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)**: إِنَّهَا صَغِيرَةٌ. فَخَطَبَهَا عَلِيٌّ (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) فَزَوَّجَهَا مِنْهُ. رَوَاهُ النسائي. والله أعلى وأعلم**[٣].

**بورەیدە**(خودای لێ رازی بێ) **گوتی: ئەبو بەکرو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **خوازبێنی فاطیمەیان کرد بۆ خۆیان، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئاخر منالە. بەلام زۆری پێ نەچوو عەلی داخوازیی کرد بۆ خۆی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لێی مارەکرد چونکە هەردوولایان لە عەمرێکا بوون، عەلی شەش ساڵ لە فاتیمە گەورەتربوو (ن).**

## ٢٨) دروستە ژن پێشکەش بکرێ بە پیاوی باش
## يجوز العرض على أهل الفضل

**٢٠٦٩– عن ابْنَ عُمَرَ** (رَضيَ اللهُ عَنهما) **قال: تَأَيَّمَتْ حَفْصَةُ مِنْ خُنَيْسِ بْنِ حُذَافَةَ السَّهْمِيِّ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النبي** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **تُوُفِّيَ بِالْمَدِينَةِ فَقَالَ عُمَرُ: عَرَضْتُ**

---

[٣] سكت عنه الشارح. جميع ما في المجتنى للنسائي صحيح عنده (مقدمة)

حَفْصَةَ عَلَى عُثْمَانَ فَقَالَ سَأَنْظُرُ فِي أَمْرِي. فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ ثُمَّ لَقِيَنِي فَقَالَ: قَدْ بَدَا لِي أَنْ لاَ أَتَزَوَّجَ يَوْمِي هَذَا فَلَقِيتُ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ زَوَّجْتُكَ حَفْصَةَ. فَصَمَتَ أَبُو بَكْرٍ وَكُنْتُ أَوْجَدَ مِنِّي عَلَى عُثْمَانَ، فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ ثُمَّ خَطَبَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَنْكَحْتُهَا إِيَّاهُ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: لَعَلَّكَ وَجَدْتَ عَلَيَّ حِينَ عَرَضْتَ عَلَيَّ حَفْصَةَ فَلَمْ أَرْجِعْ إِلَيْكَ شَيْئًا؟ قَالَ عُمَرُ: قُلْتُ نَعَمْ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَإِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَرْجِعَ إِلَيْكَ فِيمَا عَرَضْتَ عَلَيَّ إِلاَّ أَنِّي قد عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَدْ ذَكَرَهَا، فَلَمْ أَكُنْ لأُفْشِيَ سِرَّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلَوْ تَرَكَهَا لَقَبِلْتُهَا. رَوَاهُ البخاري[1].

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: خونەیسی کوڕی خوذافەی ئەل-سەهەمی، کە یەکێك بوو لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە مەدینە مرد، وە حەفصەی ژنی کە کچی عومەر بوو بێوە ژن کەوت، عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) دەیگوت: حەفصەم پێشکەشی عوسمان کرد، عوسمان گوتی: با بیری لە کاری خۆم بکەمەوە ئەوسا وەڵامت دەدەمەوە، جا لەپاش چەند شەوێ عوسمان تووشم بوو گوتی: وا بەباش دەزانم کە ئێستا ژن نەهێنم. جا تووشی ئەبو بەکری صدیق بووم، گوتم: ئەگەر ئارەزوو دەکەی حەفصەت لێ مارە دەکەم. ئەبو بەکر بێدەنگ بوو قسەی نەکرد، جا منیش لەدڵی خۆمەوە لە ئەبو بەکر زیاتر دڵگیر بووم تا عوسمان، هەتا چەند ڕۆژێکی پێ چوو ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) داخوازی حەفصەی کرد بۆ خۆی وە منیش مارەم بڕی لێی، ئینجا ئەبو بەکرم تووش بوو گوتی: ڕەنگە دڵگیربووبیت لێم لەسەر ئەوە کە حەفصەت پێشکەش کرد پێم و من وەڵامم نەدایتەوە؟ منیش گوتم: بەڵێ وایە، گوتی: دەسا من لەبەرئەوە وەڵامم نەدایتەوە بۆ ئەوکارە چونکە دەمزانی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە تەمایەتی، خۆ نەیش دەبوو کە نهێنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاشکرا بکەم، ئەگینا من لە دڵی خۆمەوە بەتەما بووم ئەگەر ئەو نەیەوێ من بۆ خۆم بیخوازم (ب).**

---

[1] بخاری. نکاح: ٥١٢٢، ٤٠٠٥، ٥١٢٩، ٥١٤٥.

٢٠٧٠- عن سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قال: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) جُلُوسًا فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ تَعْرِضُ نَفْسَهَا عَلَيْهِ فَخَفَّضَ فِيهَا النَّظَرَ وَرَفَعَهُ. رَوَاهُ الخمسة وفي رواية: قَالَ أَنَس: أَنَّ امْرَأَةً عَرَضَتْ نَفْسَهَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَضَحِكَتِ ابْنَةُ أَنَسٍ فَقَالَتْ: مَا كَانَ أَقَلَّ حَيَاءَهَا. فَقَالَ أَنَسٌ هِيَ خَيْرٌ مِنْكِ عَرَضَتْ نَفْسَهَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)[٢].

سەهلی کوڕی سەعد (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە خزمەتی حەزرەتدا بووین (دروودی خودای لەسەربێ) ئافرەتێ هات بۆ خزمەتی خۆی پێشکەشی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)کرد کە شووی پێبکا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) سەرتاپا سەرنجیداو لێی ورد بۆوە (ب).

لە گێڕانەوەیەکا: ئەنەس گوتی: ژنێ خۆی پێشکەشی پێغەمبەر کرد کە شووی پێبکا، کچێکی ئەنەسیش پێکەنی و گوتی: چەندە بێ شەرم بووە! ئەنەسیش گوتی: ئەو لە تۆ باشتربوو، خۆی پێشکەشی پێغەمبەر کردووە لە تۆ وایە هاوسەرێتیی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هەر واشتێکی ئاسایی کەمە، ئەوە مایەی سەربەرزی دین و دنیایە، ئەوە بەهرەیەکی گەلێ گەورەیە، دەست هەموو ئافرەتێ ناکەوێ!

## ٢٩) باسی سێهەم: ژنی خۆیی (واتە: ژنی مەحرەم) کێیە

## الباب الثالث: في المحرمات

قال الله تعالى: {حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ

---

[٢] بخاری. نکاح: ٥١٢١، ٢٣١٠، ٥٠٢٩، ٥٠٨٧، ٥١٢٦، ٥١٣٢، ٥١٣٥، ٥١٤١، ٥١٤٩، ٥١٥٠، ٥٨٧١، ٧٤١٧. مسلم. نکاح: ٣٤٧٢، ٣٤٧٣.

الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا، وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ كِتَابَ اللّهِ عَلَيْكُمْ. ٤/٢٣-٢٤}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: لەلایەنی خوداوە حەرام کراوە لەسەر ئێوە مارەکردنی دایك‌و کچ‌و خوشك‌و میمك‌و پووری خۆتان، وە هەروەها مارەکردنی دایك‌و خوشکی شیریتان، وە مارەکردنی دایکی ژنەکانتان، وە مارەکردنی ئەو هەنەزاو کۆڵە بەستانە کە هان لە باوەشتاناو بەخێویان دەکەن، بەم مەرجە کە لەو ژنانەتان بن کە ئێوە چوونەتە لایان‌و بە دەستتان گرتوون، بەڵام ئەگەر هێشتا نەچووبوونە لایان بەس مارەتان بڕیبوون ئەوە دروستە خۆیان تەلاق بدەن‌و ئەوجا کچەکانیان مارە بکەن وە حەرامکراوە لە سەرتان مارەکردنی بووکی خۆتان، واتە: ژنی ئەو کوڕانەتان کە لە پشتی خۆتانن، وە حەرام کراوە لە سەرتان کە دوو خوشك یا زیاتر لە دوو خوشك پێکەوە مارەبکەن، بەڵام ئەوەی رابووردووە ئەوە قەیناکا چونکە ئەوە لە سەردەمی نەزانیدا بووە، ئێمە قسەمان لەسەر دەمی ئیسلامە، بەراستی یەزدانی پاك تاوانپۆش‌و میهرەبانە. وە هەروەها حەرام کراوە لێتان مارە کردنی ژنی مێردار، مەگەر ئەو ژنە مێردارانەی کە ئێوە دەبن بە خاوەنیان‌و دیلیان دەکەن‌و لە شەڕی کافرانا دەیان گرن، ئەمە حوکم‌و بڕیاری خودایە هەمووی نووسیوە لەسەرتان بە نووسین!

وَقالَ تَعالَى: {وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاء سَبِيلاً} (٤/٢٢)

واتە: مارە مەکەن ئەو ژنانەی کە باوکەکانتان مارەیان کردوون واتە: باوەژن لە جێی دایکە وە ئەگەر شتی وەها نا هەموارو بێ شەرعی بکەن شایستەی تۆڵەی سزای سەختی خودایی دەبن، چونکە بەراستی ئەوە ئیشێکی گەلێ ناشرین‌و شەرم ئاوەرەو خودا قەت شتی وای پێ خۆش نییەو زۆر رقی لێیەتی، وەلێ ئەو حاڵەتانەی کە لە کۆنیدا رووی داوەو

خاوەنەکانیان مردوون ئەوە هەر چەند خودای گەورە بەرەوای نەدیوە بەڵام بەنیکاح دادەنرێن.

٢٠٧١- عَنْ عَائِشَةُ (رَضيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: يُحْرُمُ مِنَّ الرَّضَاعَةَ مَا يَحْرُمُ مِنَ الْوِلاَدَةِ. رَوَاهُ الخمسة[1].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرچی بەهۆی خزمایەتی و زاوزێ حەرام ببێ بەهۆی مەمکخواردنیشەوە حەرام دەبێ (ش/د/ت/ن).

٢٠٧٢- ورغِّبَ النَّبِيَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي نَكاحِ بنتِ عَمِّهِ حَمْزَةَ فَقَالَ: إنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِي إنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ وَيَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الرَّحِمِ. رَوَاهُ الشيخان[2].

عەرزی پێغەمبەریان کرد (دروودی خودای لەسەربێ) کە کچەکەی حەمزەی مامەی مارە بکا بۆ خۆی، فەرمووی: پێم ناشێ، چونکە کچی برای شیریمە. وە هەرچی بەهۆی سکوزاو کەسایەتییەوە قەدەغە بێ بەهۆی شیرخواردنیشەوە قەدەغە دەبێ (ش).

٢٠٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلاَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا رَوَاهُ الخمسة[3].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ژن بەسەر پوورو میمکی خۆی مارە ناکری، وە هەروەها پوورو میمکیش بەسەر برازاو خوارزای خۆیان مارە ناکرێن (ش/د/ت/ن).

٢٠٧٤- عن أُمَّ حَبِيبَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ انْكِحْ أُخْتِي بِنْتَ أَبِي سُفْيَانَ فَقَالَ: أَوَتُحِبِّينَ ذَلِكَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، لَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ، وَأَحَبُّ مَنْ شَارَكَنِي

---

[1] بخاری. شهادات: ٢٦٤٦، ٣١٠٥، ٥٠٩٩. مسلم. رضاع: ٣٥٥٤، ٣٥٥٣. نسائی. نكاح: ٣٣١٣، ٣٣٠٢.

[2] بخاری. شهادات: ٢٦٤٥، ٥١٠٠. مسلم. رضاع: ٣٥٦٨. نسائی. نكاح: ٣٣٠٥، ٣٣٠٦.

[3] بخاری. رضاع: ٥١٠٨. مسلم. نكاح: ٣٤٢٢. نسائی. نكاح: ٣٢٨٨.

فِي خَيْرٍ أُخْتِي. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّ ذَلِكَ لاَ يَحِلُّ لِي. قُلْتُ: يا رَسُولُ اللهِ فواللهِ إنا لنتحدَّثُ أَنَّكَ تُرِيدُ أَنْ تَنْكِحَ دُرَّةَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ. قَالَ:بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: فَواللهِ لَوْ لَمْ تَكُنْ فِي حَجْرِي مَا حَلَّتْ لِي إِنَّهَا لاَبْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِي وَأَبَا سَلَمَةَ ثُوَيْبَةُ فَلاَ تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلاَ أَخَوَاتِكُنَّ. رَوَاهُ الخمسة والترمذي[٤].

ئوممو حەبیبە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! خوشکەکەم مارەبکە لە خۆت، ئەو خوشکەم کە کچی ئەبو سوفیانە فەرمووی: جا پێت خۆشە؟ گوتم: بەڵێ چونکە ئەوە نەبێ کەتۆ بەتەنیا هەر بۆ من بیت، خۆشەویستترین کەسیش کە هاوبەشم بێ لە بەهرەی هاوسەرێتی تۆدا ئەو خوشکەمە کە وابوو حەز دەکەم مارەی بکەی تا ئەو سەربەرزییە بەویش ببڕێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەسا ئەوە بۆ من دروست نیە! گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! سا ئێمە لەناو خۆمانا مقۆمقۆی ئەوەمانە کە تۆ دەتەوێ دوڕەی کچی ئەبو سەلەمە مارەبکەی، فەرمووی: هەنەزاکەی خۆم کە کچی ئوممو سەلەمەی ژنمە؟ گوتم: بەڵێ ئەو! فەرمووی: دەسا بەخودا ئەوە گریمان ئەگەر زڕ کچیشم نەبێ و لە باوەشی خۆشما بەخێوی نەکەم هەر پێم ناشێ، چونکە ئەو کچی برای شیریمە: لەکاتی خۆیدا ثوەیبە مەمکی داوە هەم بەمنو هەم بە ئەبو سەلەمەی باوکی جا نە کچی خۆتانو نە خوشکی خۆتانم بۆ هەڵ مەدەنو ئەوانەم پێشکەش مەکەن (ش/د/ت).

٢٠٧٥- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُم) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ نَكَحَ امْرَأَةً فَدَخَلَ بِهَا فَلاَ يَحِلُّ لَهُ نِكَاحُ ابْنَتِهَا فَإِنْ لَمْ يَكُنْ دَخَلَ بِهَا فَلْيَنْكِحِ ابْنَتَهَا (إن أراد ذلك، وذلك بعد الإفتراقِ من أمها بِمَوْتٍ او طلاقٍ). رَوَاهُ الترمذي[٥].

---

[٤] بخاری. رضاع: ٥١٠١، ٥١٠٦، ٥١٠٧، ٥١٢٣، ٥٣٧٢. مسلم. رضاع: ٢٥٧١. نسائی. نکاح: ٣٢٨٤، ٣٢٨٥، ٣٢٨٦.

[٥] بسند ضعيف (شرحه).

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە (خودایان لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر پیاوێ ژنێ مارە ببڕێ لەخۆی لەگەڵ چووە لای و بە دەستی گرت ئیتر دروست نیە بۆی کە کچی ئەو ژنە مارە بکا، بەڵام لەپێش ئەوەدا کە بڕواتە لای ئەگەر ژنەکە تەڵاق بدا دەتوانێ کچەکەی مارە بکا لە خۆی. بەڵام هەر پیاوێ ژنێ مارە بکا، وە چ بڕواتە لای و چ نەڕواتە لای ئیتر دایکی ئەو ژنە پێی ناشێ کە دەکاتە خەسووی خۆی (ش-س/ص).

## ٣٠) باسی مەمکخواردن و شیردان

٢٠٧٦- عَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عن النَبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تُحَرِّمُ الرَّضْعَةُ أَوِ الرَّضْعَتَانِ أَوِ الْمَصَّةُ أَوِ الْمَصَّتَانِ[1].

ئومو فەضل (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بە ژەمێ یا بە دوو ژەم شیر خواردن یا فەرمووی: بە مژێ یا بە دوو مژ مەمکخواردن ژن و پیاو لەیەك حەرام نابن (م/د/ت/ن. رەحمەتی خودای گەورەیان لێبێ).

٢٠٧٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرْآنِ عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ. ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ فَتُوُفِّيَ رَسُولُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَهُنَّ فِيمَا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ. رواهما الخمسة إلا البخاري[2].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێشدا ئەمە ئایەتی قورئان بوو: (عشر رضعات معلومات يحرمن) دەژەم مەمکخواردنی دیاری کراو ژن و پیاو لەیەك حەرام دەکەن لە پاش ئەم دەیە هەڵوەشایەوە و بوو بە: (خمس رضعات

---

[1] مسلم. رضاع: ٣٥٧٥ — ٣٥٨٠. أبو داود. نكاح: ٢٠٦٣. ترمذي. رضاع: ١١٥٠. نسائي. نكاح: ٣٣١٠.

[2] مسلم. رضاع: ٣٥٨٢ — ٣٥٨٤. أبو داود. نكاح: ٢٠٦٢. ترمذي. رضاع: ١١٥٠م. نسائي. نكاح: ٣٣٠٧.

معلومات يحرمن): پێنج ژەم شیر خواردنی دیاریکراو ژنو پیاو لەیەك حەرام دەکەن. لە دواییدا ئەمەیش لە تیلاوەتا نەسخ بۆوە، تەنانەت کە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) وەفاتی کرد هێشتا هەندێ کەس بەم نەسخ بوونەوەیان نەزانیبوو، وەلەبەرئەوە تاماوەیەکیش ئەمەیان بە قورئان دەزانیو لەکاتی دەوری قورئاناندەوریان دەکردەوە (م/د/ت/ن).

٢٠٧٨- وعَنْها قالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) وَعِنْدِي رَجُلٌ قَاعِدٌ فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِ وَرَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّهُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ. قَالَتْ: فَقَالَ: انْظُرْنَ إِخْوَتَكُنَّ مِنَ الرَّضَاعَةِ فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنَ الْمَجَاعَةِ. رَوَاهُ الثلاثة[٣].

دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پیاوێ لەلام دانیشتبوو حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەوکاتەدا هات بۆ لام، کە ئەمەی دی لە بەری گران بوو، تەماشای دەمووچاویم کرد تووڕە بوو، جا عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە برای شیریمە بێگانە نییە پێت ناخۆش نەبێ. فەرمووی: باش سەرنج بدەن لە براو خوشکی شیریتان، چونکە مەمکخواردن کاتێ حەلە کە لەکاتی ساواییدا بێو لەبەر برسێتی بێ (ش/د- خودایان لێ رازی بێ).

٢٠٧٩- وَقَالَ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ (رَضِيَ الله عَنْهُ): تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، فَجَاءَتْنَا امْرَأَةٌ سَوْدَاءُ فَقَالَتْ أَرْضَعْتُكُمَا. فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) فَأَخبَرتَهُ وقُلْتُ: إِنَّ المَرأَةَ كَاذِبَةٌ فَأَعْرَضَ، فَأَتَيْتُهُ مِنْ قِبَلِ وَجْهِهِ، قُلْتُ إِنَّهَا كَاذِبَةٌ. قَالَ: كَيْفَ بِهَا وَقَدْ زَعَمَتْ أَنَّهَا قَدْ أَرْضَعَتْكُمَا؟، دَعْهَا عَنْكَ رَوَاهُ البخاري والترمذي[٤].

عوقبەی کوڕی حاریث (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ژنێکم مارەکرد، ئافرەتێکی رەشمان لێ پەیدا بوو دەیگووت: مەمکم داوە بە هەردووکتان

---

[٣] بخاری. شهادات: ٢٦٤٧، ٥١٠٢. أبو داوُد. نكاح: ٢٠٥٨. نسائی. نكاح: ٣٣١٢.

[٤] بخاری. علم: ٨٨، ٢٠٥٢، ٢٦٤٠، ٢٦٥٩، ٢٦٦٠، ٥١٠٤.

منیش چووم بۆ لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) و ئەمەم عەرزی کردو گوتم: ئەم ژنە درۆدەکا، کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رووی کرد بەولاوە، منیش لەولاوە چوومەوە بەردەمی و عەرزیم کردەوە: ئەم ژنە درۆدەکا. جا فەرمووی: چی لێ دەکەی ئەو بە قسەی خۆی دەڵێ گوایە مەمکی داوە بەهەر دووکتان واز لەو ئیشە بێنە (ب/ت).

٢٠٨٠- وَسُئِلَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنْ امرأتين فِي عِصْمَةِ رَجُلٍ أَرْضَعَتْ إِحْدَاهُمَا جَارِيَةً وَالأُخْرَى غُلاَمًا أَتَحِلُّ الجَارِيَةَ لِلْغُلاَمِ؟ فَقَالَ: لاَ إِنَّ اللِّقَاحَ وَاحِدٌ. رَوَاهُ الترمذي. والله أعلى وأعلم[٥].

پرسیار کرا لە ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ): دوو هەوێ کە ژنی یەك پیاو بن، ئەگەر یەکێکیان مەمك بدا بە کچێك و ئەوی تریان مەمك بدا بە کوڕێك، ئایا ئەو کچە بەو کوڕە دەشێ یا نا؟ گوتی: نەء. چونکە هەردوو هەوێکان بە ئاوی یەك پیاو متووربەکراون (ن).

## ٣١) باسی چوارەم: پرسکردن بەژن و بنیات (روکن)ەکانی ژن مارە بڕین

## الباب الرابع: في الآستئذان وأركان النكاح

٢٠٨١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عن النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ وَلاَ تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ. قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ إِذْنُهَا قَالَ: أَنْ تَسْكُتَ. رَوَاهُ الخمسة. وفِي رِوايةٍ: الثَّيِّبُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا وَالبِكْرُ تُسْتَأْذَنُ وَإِذْنُهَا سُكُوتُهَا[١].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بێوەژن نادرێ بەشوو تا رای وەرنەگیرێ، کچیش نادرێ بەشوو تا

---

[٥] قال الترمذي: عليه احمد وإسحاق (شرحه).

[١] بخاري. نكاح: ٥١٣٦، ٦٩٦٨، ٦٩٧٠، ٥١٣٧، ٦٩٤٦، ٦٩٧١. مسلم. نكاح: ٣٤٥٨ — ٣٤٦٣. نسائي. نكاح: ٣٢٦٦، ٣٢٦٧، ترمذي. نكاح: ١١٠٧. أبو داوُد. نكاح: ٢٠٩٨، ٢٠٩٩.

پرسی پێ نەکرێ! گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! جا چۆن بزانین کە قاییلە یانا؟ فەرمووی: کە قسەی نەکرد مانای وایە کە رازییە! (ش/د/ت/ن- خودایان لێ رازی بێ). لە گێڕانەوەیەکدا: بێوەژن- بۆ مارەبڕینی خۆی- خۆی زیاتر مافی هەیە تا هەقدار (وەلی)یەکەی، کچیش پرسی پێ دەکرێ، جا ئەگەر قسەی نەکرد ئەوە مانای وایە کە رازییە.

٢٠٨٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: تُسْتَأْمَرُ الْيَتِيمَةُ فِي نَفْسِهَا فَإِنْ سَكَتَتْ فَهُوَ إِذْنُهَا وَإِنْ أَبَتْ فَلاَ جَوَازَ عَلَيْهَا. رَوَاهُ أصحاب السنن[٢].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: چەتیو- لە پێش مارەبڕینیا- پرسی پێ دەکرێ، جا ئەگەر قسەی نەکرد ئەوە رازییە، بەڵام ئەگەر رێگەی نەدا ئەوا بەزۆر مارە ناکرێ (د/ت/ن- خودایان لێ رازی بێ).

٢٠٨٣- عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِدَامٍ الأَنْصَارِيَّةِ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهْيَ ثَيِّبٌ، فَكَرِهَتْ ذَلِكَ فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَرَدَّ نِكَاحَهُ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود[٣].

خەنسای کچی خیدام (کە ئافرەتێکی ئەنصاری بوو) گوتی: بێوەژن بووم، باوکم دامی بەشوو، منیش پێم ناخۆش بوو، چووم بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) شووەکەی هەڵوەشاندەوە (ب/د).

٢٠٨٤- وَجاءَتْ جَارِيَةٌ بِكْرٌ إِلى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَذَكَرَتْ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ فَخَيَّرَهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد[٤].

کەنیشکێکی کچ هاتە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: قوربان! باوکم داومی بە مێرد، بەڵام من خۆم پێم ناخۆشەو ئەو شووەم بەدڵ

---

[٢] بسند حسن (شرحه).

[٣] بخاری. نکاح: ٥١٣٨، ٣١٣٩، ٦٩٤٥، ٦٩٦٩.

[٤] ورواه ابن ماجه وابن أبی شیبة بسند موثق (شرحه).

نیە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) کچەکە خۆی کرد بە سەرپشك ئەگەر حەزدەکا بە گوێی باوکی بکاو ئەگەر حەزیش ناکا شووەکەی هەڵوەشێنێتەوە (د/ئەحمەد- خودایان لێ رازی بێ).

٢٠٨٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ نَكَحَتْ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهَا فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ فَإِنْ دَخَلَ بِهَا فَالْمَهْرُ لَهَا بِمَا أَصَابَ مِنْهَا فَإِنْ تَشَاجَرُوا فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لاَ وَلِيَّ لَهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[٥].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر ژنێ بەبێ راسپێریی لەسەر بوونی هەقدارەکانی شوو بکا شووەکەی پووچ و بەتاڵە. حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) سێ جار لە سەریەك (بۆ تەئکید) فەرمووی: شووەکەی بەتاڵە، شووەکەی بەتاڵە، شووەکەی بەتاڵە! ئینجا فەرمووی: جا ئەگەر پیاوەکە بە دەستی بگرێ ئەوە مارەیی دەکەوێ لەباتی ئەوە کە بە دەستی گرتووە وە ژنەکەیش نابێ بەژنی.

هەقدارانی ژنیش ئەگەر لەناو خۆیاندا رێك نەدەکەوتن ئەوا فەرمانڕەوا (سوڵتان: گەورەی موسوڵمان) هەقداری ئەو کەسەیە کە هەقداری (بایەخداری) نیە (د/ت- خودایان لێ رازی بێ).

٢٠٨٦- وَعَنْهَا عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيّ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي (بسند حسنٍ) وأحمد والبيهقي، ولفظهُما: لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيّ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ. ومنه حديث الترمذي: الْبَغَايَا اللاَّتِي يُنْكِحْنَ أَنْفُسَهُنَّ بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ[٦].

دیسان دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەبێ هەقداری ژن، ژن مارەی نایێ (د/ت-س/ح-ئەحمەد/بەیهەقی) گفتەی ئەحمەدو بەیهەقی ئاوایە: بەبێ هەقداری ژن و دوو شایەتی راست و دروستی

---

[٥] بسند حسن (شرحه).

[٦] رَوَاهُ الترمذى بسند حسن (شرحه).

دادپەروەر ژن مارەی نایێ! وە هەر لەم بابەتەیە ئەو حەدیسەی کە تیرمیذی ریوایەتی کردووە، کە دەفەرموێ: سۆزانی (داوێنپیس) ئەو ژنانەن: کە بەبێ بەڵگەو شایەت خۆیان مارە دەبڕن لە کەسێ.

٢٠٨٧- عَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قال: أَيُّمَا امْرَأَةٍ زَوَّجَهَا وَلِيَّانِ فَهِيَ لِلأَوَّلِ مِنهُمَا وَأَيُّمَا رَجُلٍ بَاعَ بَيْعًا مِنْ رَجُلَيْنِ فَهُوَ لِلأَوَّلِ مِنهُمَا. رَوَاهُ أصحاب السنن[٧].

سەمووره (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەو ژنەی دوو هەقدار بیدەن بەشوو وەك خوشکێ دوو برا بیدەن بە دووکەس ئەوە مارەی دی لە مێردی یەکەم، ئەگەر پیاوێکیش چشتێ بفرۆشێ بە دوو کەس، ئەوە بۆ کەسی یەکەم بەیعی دێو دەبێ بەهی ئەو (د/ت/ن- خودایان لێ رازی بێ- سند حسن).

٢٠٨٨- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: إِنَّ أَحَقَّ الشَّرْطِ أَنْ يُوفَى بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ. رَوَاهُ الخمسة. والله أعلى وأعلم[٨].

عوقبەی کوڕی عامر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: باشترین مەرجێ کە ئێوەی موسوڵمان بیبەنە سەر: ئەو مەرجەیە کە ژنی پێ حەڵاڵ دەکەن لە خۆتان (ش/د/ت/ن).

## ٣٢) وتاری خوازبێنی: (خطبة النكاح)

٢٠٨٩- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قال: عَلَّمَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خُطْبَةَ الْحَاجَةِ فِي النِّكَاحِ وَغَيْرِهِ: الْحَمْدَ لِلّٰهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللّٰهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللّٰهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ

---

[٧] بسند حسن (شرحه).

[٨] بخاری. شروط: ٢٧٢١، ٥١٥١. مسلم. نكاح: ٣٤٥٧. أبو داوُد: نكاح: ٢١٣٩. ترمذی. نكاح: ١١٢٧. نسائی. نكاح: ٣٢٨١، ٣٢٨٢.

وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ. وَ اتَّقُوا اللهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ والإرْحَامَ إنَّ الله كانَ عَلَيكُمْ رَقيباً. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ). رَوَاهُ أصحاب السنن (بسند حَسن).

**عەبدوڵڵا** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **وتاری پێداویستی (خوطبەتولحاجە)ی فێر دەکردین، کە لە سەرەتای هەموو کارێکی گرنگەوە بیڵێین، وەکوو مەسەلەی ژنخواستن و شتی وا ئەمەیش ئەو وتارەیە:**

الْحَمْدُ لِلَّهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ} (٣/١٠٢). {وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا} (٤/١). {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا} (٣٣/٧١).

**سوپاس و ستایش بۆ خودا، داوای یارمەتی و کۆمەك لەو دەكەین، هەروەها داوای لێخۆشبوونی لێ دەكەین، پەنا دەگرین بە خودا كە پەنامان بدا لەوەی و وەزەن و بەدیی دەروونی خۆمان، كەسێ خودا ڕێنموونی بكا بە كەسی تر گومڕا ناكرێ، وە كەسێ خودا گمڕای بكا بە كەسی تر نایەتەوە سەر ڕێ، وە شایەتی دەدەم بە زمان و باوەڕ دەكەم بە دڵ كە هەر خودا خودایە و خودای تر نیە، وە شایەتی دەدەم كە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خودایە- ئەی كەسانێ كە باوەڕتان هێناوە بە خودا! تەقوای خودا بكەن و هەمیشە لە خودا بترسن و خۆتان بپارێزن لە قاری، ترس و پارێزو تەقوایێ كە شایستەی زاتی خودا بێ، وە هەمیشە تێكۆشن تا لەسەر ئیسلامەتی دەمرن (وە تەقوای خودا بكەن و لە خودا بترسن، لەو خودا نازدارە كە بە خاتری ئەو داوای شت لەیەكتری دەكەن، وە خۆتان بپارێزن لە بڕینی ڕشتەی خزمایەتی و میهرەبانی، بە ڕاستی خودا بە هەموو شتێ ئاگادارەو تەماشاكاری وتارو كردارو ڕەفتارتانە) ئەی كەسانێ كە خاوەن باوەڕن**

شـەرمو شـکۆ لـە خـودا بکـەنو لـە خـودا بترسـنو قسـەی هـەق بکـەن تـا خـودا کردەوە باشەکانتان پەسەندبکاو لە گوناهەکانتان خۆش ببێ، وە هـەر کەسـێ فەرمانی خوداو فەرمانی پێغەمبەری خودا بەجێ بێنێو لە قسەیان دەرنەچێ ئەوە بە راستی شاد دەبێ بە بەهرەی گەورەو دەگا بە ئاواتی خۆی (د/ت/ن-س/ح).

٢٠٩٠- عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ قَالَ: خَطَبْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أُمَامَةَ بِنْتَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَأَنْكَحَنِي مِنْ غَيْرِ أَنْ يَتَشَهَّدَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والبخاري في تأريخه[٢].

پیـاوێکی بـەنی سـولەیمی گـوتی: خـوازبێنی ئومامـەی کـچی عەبدولمـەططـەلیبم لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) کـرد، بـەبێ ئـەوەی کـە شـایەتمان بێنـێ لێـی مارەبڕیم {د/بخاریش (خودای لێ رازی بێ) لـە تەئریخەکەیدا ریوایەتی کردووە}.

٢٠٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: كُلُّ خُطْبَةٍ لَيْسَ فِيهَا تَشَهُّدٌ فَهِيَ كَالْيَدِ الْجَذْمَاءِ. رَوَاهُ الترمذي بسند صحيح[٣].

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ رازی بـێ) لـە پێغەمبـەرەوە (درووودی خـودای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: هـەردوانو وتـارێ کـە شـایەتمانو یـادی خـودای تیـا نـەبێ، وەك دەستی گول وایەو بێ پیتو بەرەکەتە (ت-س/ص).

## ٣٣) باسی مارەیی: (فصل في الصداق)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَّرِيئًا} (٤/٤).

واتـە: خـودای مـەزن دەفـەرموێ: پێویـستە ئێـوە مـارەیی بـدەن بـە ژنەکانتان چونکە بەشێکە خودا بۆی داناوە، وە ئەگەر ژنان بە خۆشی دڵو

---

[٢] رواه البخاری فی تأریخه وهو کتاب له غیر صحیح البخاری.

[٣] صحیح عنه الترمذی.

ئـارەزووی خۆیـان گـەردنیان ئـازادکردن لـە شـتێ لـەو مارەییـە ئـەوە وەکـوو حەڵواو گەزۆ بیخۆن!

٢٠٩٢- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهـا) كَـمْ كَـانَ صَدَاقُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)؟ قَالَتْ: كَانَ صَـدَاقُهُ لأَزْوَاجِـهِ ثِنْتَـيْ عَـشْرَةَ أُوقِيَّـةً وَنَشًّا. قَالَتْ؟ أَتَدْرِي مَا النَّشُّ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَتْ: نِصْفُ أُوقِيَّةٍ. فَتِلْكَ خَمْـسُمِائَةِ دِرْهَـمٍ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود والنسائي[1].

ئەبو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: لـە عائیشەم پرسـی (خودای لێ رازی بێ): مـارەیی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) چـەند بـوو؟ گـوتی: مـارەیی ژنـەکانی دوانـزە ئۆقیـەو نـیم بـوو، عائیـشە گـوتی: دەزانیـت نـیم چـەندە؟ گـوتم: نـەء، گـوتی: نیـو ئۆقیەیـە، کـە هـەمووی دەکاتـە پێـنج سـەد درەمـی زیـوینی ئـەو سەردەمە (م/د/ن).

٢٠٩٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَأَى عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَثَرَ صُفْرَةٍ فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالَ: يا رَسُولُ اللهِ إِنِّي تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ. قَالَ: فَبَارَكَ اللَّهُ لَكَ، أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ. رَوَاهُ الخمسة[2].

ئەنـەس (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) ئـەثـەری زەعفـەرانی بـە عەبـدورەحمانی کـوڕی عەوفـەوە دی فـەرمووی: ئـەم زەردییـە چییە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە ژنم هێناوە، مارەییەکەی ناوکـەیێ زێڕە کە دەکاتە پێنج درەمی زێڕ. فەرمووی: دەخودا پیرۆزی بکا لێت، ئەگەر مەڕێکت سەر بڕیوە نانی شایی دروستکە (ش/د/ت/ن).

٢٠٩٤- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ عُبَيْدِ اللَّهِ بْـنِ جَحْـشٍ فَمَاتَ بِأَرْضِ الْحَبَشَةِ فَزَوَّجَهَا النَّجَاشِيُّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّم) وَأَمْهَرَهَا عنه أَرْبَعَةَ آلاَفٍ

---

[1] مسلم. نكاح: ٣٤٧٤. أبو داود. نكاح: ٢١٠٥. نسائی. نكاح: ٣٣٤٧.

[2] بخاری. نكاح: ٥١٥٥، ٦٣٨٦. مسلم. نكاح: ٣٤٧٥. ترمذی. نكاح: ١٠٩٤. نسائی. نكاح: ٣٣٧٢.

دِرْهَمٍ وَبَعَثَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) مَعَ شُرَحْبِيلَ ابْنِ حَسَنَةَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي وأحمد[٣].

**ئوممو حەبیبە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: ژنی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش بووم، لە وڵاتی حەبەشە ئەمری خودای کرد، جا نەجاشی شای حەبەشە مارەی بڕیم لە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **وە خۆی چوار هەزار درەم مارەیی لە باتی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **داپێم، ئینجا لەگەڵ شورەحبیلی کوڕی حەسەنەدا ناردمی بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ). **(د/ن/ئەحمەد).**

٢٠٩٥- عَنْ أَبِي الْعَجْفَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَطَبَنَا عُمَرُ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ: أَلاَ لاَ تُغَالُوا بِصُدُقِ النِّسَاءِ فَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ مَكْرُمَةً فِي الدُّنْيَا أَوْ تَقْوَى عِنْدَ اللَّهِ لَكَانَ أَوْلاَكُمْ بِهَا رَسُولُ اللهِ (صلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) مَا أَصْدَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ وَلاَ أُصْدِقَتِ امْرَأَةٌ مِنْ بَنَاتِهِ أَكْثَرَ مِنْ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً. رَوَاهُ أصحاب السنن (بسندٍ صحيحٍ)[٤].

**ئەبولعەجفاء** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: عومەر وتارێکی بۆمان خوێندەوە گوتی: ئاگاداربن! پێ هەڵمەبڕن لە مارەیی، چونکە ئەوە ئەگەر هۆی سەربەرزیی جیهان بوایە، یا لەلای خودا بە تەقواو تاعەت حل بوایە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **خۆی لە هەمووتان زیاتر شایستەی ئەوە بوو کە وابکا، بەڵام پێغەمبەر خۆی** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە دوانزە ئۆقیە پتر مارەیی نەداوە بە هیچ کەسێ لە ژنەکانی، وە هەروەها کەسیش لە کچەکانی لەوە پتر مارەییان وەرنەگرتووە (د/ت/ن-س/ص= ئەبو داوود، تیرمیذی، نەسائی- سند صحیح).**

---

[٣] جميع ما في المجتبى للنسائي صحيح على ما جاء في مقدمة شرح التاج الجامع للأصول، المجلد الأول ص.

[٤] بسند صحيح.

٢٠٩٦- وَتَزَوَّجَتْ امْرَأَةٌ مِنْ بَنِي فَزَارَةَ عَلَى نَعْلَيْنِ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَرَضِيتِ مِنْ نَفْسِكِ وَمَالِكِ بِنَعْلَيْنِ، قَالَتْ: نَعَمْ. فَأَجَازَهُ. رَوَاهُ الترمذي وصححه[٥].

ئافرەتێکی بەنی فەرازەیی لە سەرجووتێ سۆڵ شووی کردبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە جیاتی خۆت‌و ماڵت بە جووتێ سۆڵ رازی بوویت؟ گوتی: بەڵێ. پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) مارە بڕینەکەی دامەزراند (ت:ص).

٢٠٩٧- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ لِرَجُلٍ: أَتَرْضَى أَنْ أُزَوِّجَكَ فُلاَنَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ. وَقَالَ لِلْمَرْأَةِ: أَتَرْضِينَ أَنْ أُزَوِّجَكِ فُلاَنًا؟ قَالَتْ: نَعَمْ. فَزَوَّجَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ فَدَخَلَ بِهَا الرَّجُلُ وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقًا وَلَمْ يُعْطِهَا شَيْئًا وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ الْحُدَيْبِيَةَ وَكَانَ مَنْ شَهِدَ الْحُدَيْبِيَةَ لَهُ سَهْمٌ بِخَيْبَرَ فَلَمَّا حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) زَوَّجَنِي فُلاَنَةَ وَلَمْ أَفْرِضْ لَهَا صَدَاقًا وَلَمْ أُعْطِهَا شَيْئًا وَإِنِّي أُشْهِدُكُمْ أَنِّي أَعْطَيْتُهَا مِنْ صَدَاقِهَا سَهْمِي بِخَيْبَرَ فَأَخَذَتْ سَهْمًا فَبَاعَتْهُ بِمِائَةِ أَلْفٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٦].

عوقبەی کوڕی عامیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە پیاوێکی فەرموو: قاییل دەبی فیسارە ژنت لێ مارە بکەم؟ گوتی: بەڵێ بە ژنەکەیشی فەرموو: قاییل دەبی لە فیسارە پیاوت مارە ببڕم؟ گوتی: بەڵێ، ئینجا هەر خۆی لە یەکی مارەکردن، پیاوەکە گواستیەوەو چووە لای‌و هیچ مارەیی بۆ دیاری نەکردو هیچی نەدایێ، ئەو پیاوە لەکاتی خۆیدا هاوبەشی کردبوو لە رووداوی حودەیبییەدا ئەوانەشی کە هاوبەشی رووداوی حودەیبییەیان کردبوو لە خەیبەردا پشکیان هەبوو، جا لەکاتی سەرە مەرگا گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە ئەم ژنەی لێ مارەکردم نەمارەییم بۆ

---

[٥] صحيح عنه الترمذی.

[٦] بسند صالح (شرحه).

دیاری کردووەو نە هیچم داوەتێ، جا ئێوە بە شایەت بن ئەوا ئەو پشکەم کەوا لە خەیبەر، لەباتی مارەیی دەیدەم بەم ژنەم، ژنەکەیش پشکەکەی وەرگرتو فرۆشتی بە سەد هەزار درەم (د-سند صالح).

٢٠٩٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) أَنَّ عَلِيًّا قَالَ: تَزَوَّجْتُ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَعْطِهَا شَيْئًا. قَالَ: مَا عِنْدِي مِنْ شَيْءٍ. قَالَ: فَأَيْنَ دِرْعُكَ الْحُطَمِيَّةُ؟ قَالَ: هِيَ عِنْدِي. قَالَ: فَأَعْطِهَا إِيَّاهُ. رَوَاهُ النسائي وأبو داود والحاكم وصححه. والله أعلى وأعلم[٧].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: کە عەلی فاطیمەی مارەکرد، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: شتێکی بدەرێ". عەلی گوتی: هیچم نییە! فەرمووی: ئەی کوا زریە حوطەمییەکەت؟ گوتی: لەلای خۆمە. فەرمووی: ئەوەی بدەرێ (ن/د/حاکم. حاکم بە صەحیحی داناوە).

## ٣٤) ئیشکردن لەباتی مارەیی دەبێ: (قد يكون الصداق عملا)

٢٠٩٩- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُ لأَهَبَ لَكَ نَفْسِي، فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَصَعَّدَ النَّظَرَ إِلَيْهَا وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَأَتِ الْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فِيهَا شَيْئًا جَلَسَتْ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: يا رسول الله إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا. فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ؟. قَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: اذْهَبْ إِلَى أَهْلِكَ فَانْظُرْ هَلْ تَجِدُ شَيْئًا.. فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا وَجَدْتُ شَيْئًا. قَالَ: انْظُرْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ. ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ، وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي فَلَهَا نِصْفُهُ. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): مَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ، وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ شَيْءٌ. فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى طَالَ مَجْلِسُهُ ثُمَّ قَامَ فَرَآهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مُوَلِّيًا فَأَمَرَ بِهِ فَدُعِيَ

---

[٧] صحيح عنه الحاكم.

فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟. قَالَ: مَعِي سُورَةَ كَذَا وَسُورَةَ كَذَا عَدَّدَهَا. قَالَ: أَتَقْرَؤُهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: اذْهَبْ فَقَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ. وَفِي رِوَايَةٍ: زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ. رَوَاهُ الخمسة[1].

سەهلی کوڕی سەعد (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هاتووم تا خۆم ببەخشم بەتۆ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) سەرتاپا تەماشای کردو ئینجا سەری دانەواندو هیچ قسەی نەکرد.

ژنەکەیش کە روانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هیچی نەگوت لە بارەیەوە دانیشت. جا پیاوێ (کە لە یارانی حەزرەت بوو) هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر خۆت ناتەوێ لە منی مارەبکە؟ فەرمووی: ئایا هیچت هەیە کەبیکەی بە مارەیی؟ گوتی: نە بەخوا ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دەبڕۆ بۆماڵەوە بۆلای کەسوکارت بزانە هیچت دەست دەکەوێ. پیاوەکە رۆشت و هاتەوە گوتی: بەخودا هیچم دەست نەکەوت ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: شتێك پەیدا بکە ئەگەر ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ. پیاوەکە دیسان رۆیشتەوەو هاتەوە گوتی: بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! ئەنگوستیلەی ئاسنیشم دەست نەکەوت، بەلام ئەم لۆجلکەم هەیە نیوەی بۆ من و نیوەی بۆ ئەو. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە بەو چی، جلکەت خۆی یەك پارچەیە ئەگەر لەبەر تۆدا بێ هیچی بەر ئەو ناکەوێ، ئەگەر لەبەر ئەودابێ هیچی بەر تۆ ناکەوێ.

جا پیاوەکە تاوێکی باش دانیشت، لە پاشا هەڵسا رۆیشت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چاوی لێ بوو، ناردی بە شوێنیا بانگی کردەوە، کە هات پێی فەرموو: چیت لە قورئان لەبەرە؟ گوتی: ئەو سوورەتەو ئەو سوورەتەم لەبەرە، وە سوورەتەکانی ژمارد، فەرمووی: ئایا هەموویان بە باشی دەخوێنی؟ گوتی: بەڵێ. فەرمووی: دەبڕۆ ئەوا لەسەر ئەو قورئانەی کە

---

[1] تقدم تخريجه فى الرقم: ٢٠٣٥ من هذا المجلد تسلسل/ ٢٨.

لەبەرتە ئەم ژنەم کرد بە هی تۆ. لە گێڕانەوەیەکا: ئەوا لەسەر ئەوە کەفێری ئەو قورئانەی بکەی کە خۆت ئێستا لەبەرتە ئەم ژنەم مارەکرد لەتۆ! (ش/د/ت/ن).

٢١٠٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَعْتَقَ صَفِيَّةَ، وَجَعَلَ عِتْقَهَا صَدَاقَهَا[٢].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) صەفییەی ئازاد کرد، وە ئازادکردنەکەی دانا بە مارەیی بۆیو مارەی کرد لەخۆی. (ش/د/ت/ن).

٢١٠١- عن أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: ثَلاثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ عَبْدٌ أَدَّى حَقَّ اللَّهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ فَذَلِكَ يُؤْتَى أَجْرَهُ مَرَّتَيْنِ وَرَجُلٌ كَانَتْ عِنْدَهُ جَارِيَةٌ وَضِيئَةٌ فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ أَدَبَهَا ثُمَّ أَعْتَقَهَا ثُمَّ تَزَوَّجَهَا يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ فَذَلِكَ يُؤْتَى أَجْرَهُ مَرَّتَيْنِ وَرَجُلٌ آمَنَ بِالْكِتَابِ الأَوَّلِ ثُمَّ جَاءَ الْكِتَابُ الآخَرُ فَآمَنَ بِهِ فَذَلِكَ يُؤْتَى أَجْرَهُ مَرَّتَيْنِ. رَوَاهُ الخمسة. والله أعلى وأعلم[٣].

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سێ کەس دوو پاداشتیان بۆ هەیە:

یەکەم: بەندەیێ کە مافی خوداو مافی خاوەنەکانی بەجێ بێنێ.

دووەم: پیاوێ کەنیزەکێکی جوانی هەبێو بە جوانی تەمێی بکاو فێری وێڵو رەوشتی بەرزی بکا، ئینجا ئازادی بکاو مارەی بکا بۆ خۆی، وە مەبەستی لەم کارەیش ساخ رەزامەندی خودا بێ.

---

[٢] بخاری. صلاة: ٣٧١، ٦١٠، ٦٤٧، ٢٢٢٨، ٢٢٣٥، ٢٨٨٩، ٢٩٤٣، ٢٩٤٥، ٢٩٩١، ٣٠٨٥، ٣٠٨٦، ٣٣٦٧، ٣٦٤٧، ٤٢١٣، ٥٠٨٥، ٥١٥٩، ٥١٦٩، ٥٣٨٧، ٥٤٢٥، ٥٥٢٨، ٥٩٦٨، ٦١٨٥، ٦٣٦٣، ٦٣٦٩، ٧٣٣٣. مسلم. نكاح: ٢٤٨٣. نسائی. نكاح: ٣٣٤٢. ابن ماجه: نكاح: ١٩٥٧.

[٣] بخاری. علم: ٩٧، ٢٥٤٤، ٢٥٤٧، ٢٥٥١، ٣٠١١، ٣٤٦٤، ٥٠٨٣. مسلم. ایمان: ٣٨٥. ترمذی. نكاح: ١١١٦. نسائی. نكاح: ٣٣٤٤.

**سێیەم**: پیاوێ کە لەسەر ئایینی جوولەکە یا گاور بێ و لە پاشا موسوڵمان ببێ! (ش/د/ت/ن).

## ٣٥) مارەیی بەیەکێ لەم دوو شتە: دەبێ بەماڵ، یا بە مردن، یا بە دەست گرتنو چوونەلا : (يجب الصداق بالوفاة أو بالدخول)

٢١٠٢- سُئِلَ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقًا وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا حَتَّى مَاتَ. فَقَالَ: مِثْلُ صَدَاقِ نِسَائِهَا لاَ وَكْسَ وَلاَ شَطَطَ وَلَهَا الْمِيرَاثُ وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ. فَقَامَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ الأَشْجَعِيُّ فَقَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ مِثْلَ الَّذِي قَضَيْتَ. فَفَرِحَ بِهَا ابْنُ مَسْعُودٍ. رَوَاهُ أصحاب السنن[1].

پرسیار کرا لە ئیبنو مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) ئەگەر پیاوێ ژنێ مارە بکاو مارەیی بۆ دیاری نەکاو بە دەستیشی نەگرێ تا خۆی دەمرێ مارەیی ئەم ژنە چییەو چی نیە؟ گوتی: مانەندی مارەیی کەسوکاری خۆی مارەیی بۆ دادەنرێ وەك دایکی، یا خوشکی، یا پووری بەبێ کەمو زۆر، وە بەشە کەلەپووریش دەگرێ، وە عیددەی مردن (وەفات)یشی لەسەرە.

مەعقیلی کوڕی سینانی ئەشجەعیش هەڵسا گوتی: پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) لە شانی بەروەعەی کچی واشیقدا بڕیاریدا وەك ئەم بڕیارەی تۆ، ئیبنو مەسعوودیش ئەم قسەی گەلێ پێ خۆش بوو. (د/ت/ن-س/ص).

٢١٠٣- عَنْ بَصْرَةَ بنْ أَكثَم الأَنْصَارِ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّهُ قَالَ للنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً بِكْرًا فِي سِتْرِهَا فَدَخَلْتُ عَلَيْهَا فَإِذَا هِيَ حُبْلَى فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

---

[1] بسند صحيح (شرحه).

وَسَلَّم): لَهَا الصَّدَاقُ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا وَالْوَلَدُ عَبْدٌ لَكَ فَإِذَا وَلَدَتْ فَاجْلِدْهَا أو فَاجْلِدُوهَا أو فَحُدُّوهَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ. نسأل الله السّترَ التَّوفيقَ والله أعلى وأعلم[٢].

بەصرەی کوڕی ئەکثەمی ئەنصاری (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ): ژنێکی کچم هێناوە کەچی کە لەپەردەدا چوومەلای دەڕوانم سکی پڕە؟!

حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەباتی ئەوە کە بە حەلاڵی بە دەستت گرتووە مارەیی دەکەوێ، منداڵەکەی کە بوو منداڵەکە دەبێ بە بەندەی تۆ، هەرکاتێ کە منداڵەکەی بوو داری حەددی لێ دە، یا فەرمووی: داری حەددی لێ بدەن یا فەرمووی: حەددی لێ بدەن (د-سند صالح) لە خودا داوا دەکەین سرمان بپۆشیو راستمان بۆ بکا خودای گەورە هەر خۆی باشی لێ دەزانێ.

## ٣٦) جیازیی بووك: (الجهاز)

٢١٠٤- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَهَّزَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَاطِمَةَ فِي خَمِيلٍ وَقِرْبَةٍ وَوِسَادَةٍ حَشْوُهَا إِذْخِرٌ. رَوَاهُ النسائي. نسأل الله التوفيق. والله أعلى وأعلم[١].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جیازییەکەی فاتیمە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بۆی کردبوو، برێتی بوو لە پارچەیێ قەیفەو کوندەیەكو پشتییەك کە ناواخنەکەی پووشی ئیذخەر[١] بوو (ن-س/ص).

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[١] بسند صحيح (شرحه).

(١) مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە رەحمەتی خودا بێ) لە (اقتران النيرين)دا. ئیژخەری بەسوڕناتك تەرجەمە کردووە.

-وەرگێڕ-

## ٣٧) سوننەتە ژنهێنان بە ئاشكرا بێ، وە شایی بۆ بكرێ
## إعلان النكاح واللهوفية

٢١٠٥- عن الرُّبَيِّعُ بِنْتُ مُعَوِّذٍ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قالَتْ: جَاءَ النَّبِـيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَدَخَلَ حِينَ بُنِيَ عَلَيَّ، فَجَلَسَ عَلَى فِرَاشِي كَمَجْلِسِكَ هذا، فَجَعَلَتْ جُوَيْرِيَاتٌ لَنَا يَضْرِبْنَ بِالدُّفِّ وَيَنْدُبْنَ مَنْ قُتِلَ مِنْ آبَائِي يَوْمَ بَدْرٍ، إِذْ قَالَتْ إِحْدَاهُنَّ: وَفِينَا نَبِيٌّ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ. فَقَالَ: دَعِي هَذِهِ، وَقُولِي بِالَّذِي كُنْتِ تَقُولِينَ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود والترمذي[1].

روبەیعی كچی موعەوویذ (خودای لێ رازی بێ) گوتی: كە چووم بە بووكی، بەیانی شەوی بووكێنیم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ لام، وە لەم جێگەی تۆدا لەسەر نوێنەكەی من دانیشت، چەند كەنیزەكێكمان هەبوون، دەستیانكرد بە دەف لێدانو ئەوانەی لە باوانم لە رۆژی بەدردا كوژرابوون ئەوانەیان دەلاواندەوە، تا یەكێكیان گوتی: پێغەمبەرێكی وامان تیا هەڵكەوتووە دەزانێ كە سبەی چی دەقەومێ!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: وامەڵێ، لە پێشدا چیت دەوت لەو بابەتە بڵێ (ب/د/ت).

٢١٠٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) أَنَّهَا زَفَّتِ امْرَأَةً إِلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): يَا عَائِشَةُ مَا كَانَ مَعَكُمْ لَهْوٌ فَإِنَّ الأَنْصَارَ يُعْجِبُهُمُ اللَّهْوُ. رَوَاهُ البخاري وأحمد[2].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ژنێكم گواستەوە بۆ پیاوێكی ئەنصاری، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی عائیشە! ئایا هیچ بەزمو شادییەكتان نەگێڕا؟ چونكە یاریدەدەران (ئەنصار) حەزیان لەبەزمو شادیی هەیە (ب/ئەحمەد).

---

[1] بخاری. غزوة بدر: ٤٠٠١، ٥١٤٧.

[2] بخاری. نكاح: ٥١٦٢.

٢١٠٧- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ حَاطِبٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: فَصْلُ مَا بَيْنَ الْحَرَامِ وَالْحَلَالِ الدُّفُّ وَالصَّوْتُ. رَوَاهُ النسائي والترمذي وحسنَّه[٣].

**موحەممەدی کوڕی حاطیب** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: جیاوازی ژنهێنان کە ڕەواو حەڵاڵە لەگەڵ داوێن پیسیدا کە ناڕەواو حەرامە بەهۆی ئاشکرا کردنەوەیە، کە زۆرتر بەهۆی دەنگی دەف و گوتنی گۆرانییەوە دەبێ! (ن/ت:ح).**

٢١٠٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: أَعْلِنُوا هَذَا النِّكَاحَ وَاجْعَلُوهُ فِي الْمَسَاجِدِ وَاضْرِبُوا عَلَيْهِ بِالدُّفُوفِ. رَوَاهُ أحمد والترمذي وحسنَّه[٤].

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: کە ژن مارەدەبڕن ئاشکرای بکەن و لە مزگەوتا مارەی ببڕن و (تەپڵ و دەفی بۆ لێدەن). (ئەحمەد/ت:ح).**

٢١٠٩- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى قَرَظَةَ بْنِ كَعْبٍ وَأَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ فِي عُرْسٍ وَإِذَا جَوَارٍ يُغَنِّينَ فَقُلْتُ: أَنْتُمَا صَاحِبَا رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَمِنْ أَهْلِ بَدْرٍ يُفْعَلُ هَذَا عِنْدَكُمْ؟ فَقَالاَ: اجْلِسْ إِنْ شِئْتَ فَاسْمَعْ مَعَنَا وَإِنْ شِئْتَ فاذْهَبْ قَدْ رُخِّصَ لَنَا فِي اللَّهْوِ عِنْدَ الْعُرْسِ. رَوَاهُ النسائى والحاكم وصححه[٥].

**عامیری کوڕی سەعد** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: چووم بۆ لای قورەظەی کوڕی کەعب و ئەبو مەسعوودی ئەنصاری، کە چووم لە شایی بوون، کە تەماشامکرد وا چەن کەنیزەکێ گۆرانی دەڵێن! جا پێیانم گوت: ئێوە لەکن خۆتان هاوڕێی پێغەمبەر بوون و لە دەستەی غەزای بەدرن، کەچی ئەم بەزم و شادییە دەکرێ لە پاڵتانا و هیچ دەنگ ناکەن ئەمە چەنی بەچەنە؟! گوتیان: ئەگەر حەزدەکەی دانیشە لەگەڵمان و بۆ خۆت وەك ئێمە گوێ بگرە، ئەگەر**

---

[٣] حسن عند الترمذى.

[٤] حسن عند الترمذى.

[٥] صحيح عند الحاكم.

حەزیش ناکەی بڕۆ چونکە ئێمە لەکاتی شاییدا ڕێگەی بەزمگێڕانو خۆشی کردنمان دراوە (ن/حا:ص).

## ٣٨) نزاکردن بۆ بووکو زاوا: (الدعاء للعروسين)

٢١١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قال: كانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) إذَا رَفَّأَ الإِنْسَانَ إذَا تَزَوَّجَ قَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ وَبَارَكَ عَلَيْكَ وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ. رَوَاهُ أصحاب السنن[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە پیرۆزبایی دەکرد لەیەکێ کە ژن بێنێ، دەیفەرموو: بارك الله وبارك عليك وجمع بينكما في خير: خودا پیرۆزی کا لێتو پیرۆزی کا بۆتو لەسەر خێرو خۆشی یەکتان بخا (د/ت/ن-س/ص).

٢١١١- عَنِ الْحَسَنِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: تَزَوَّجَ عَقِيلُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ امْرَأَةً مِنْ بَنِي جُشَمٍ فَقِيلَ: لَهُ بِالرِّفَاءِ وَالْبَنِينِ. قَالَ: قُولُوا كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) بَارَكَ اللَّهُ فِيكُمْ وَبَارَكَ لَكُمْ. رَوَاهُ النسائي.

حەسەن (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: عەقیلی کوڕی ئەبو طالیب ژنی هێنا ژنەکەی بەنی جوشەمی بوو، پێیان گووت: بەدڵی خۆشو بە کوڕو کچ بێو هەتا سەربێو پێکتانەوە بێ. ئەویش گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەم بۆنەوە دەیفەرموو: بارك الله فيكم وبارك لكم: خودا پیرۆزی کا لێتانو پیرۆزی کا بۆتان. جا ئێوەیش هەروا بڵێن باشترە (ن- خودای لێ ڕازی بێ).

٢١١٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قالت: تَزَوَّجَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) فَأَتَتْنِي أُمِّي فَأَدْخَلَتْنِي الدَّارَ، فَإِذَا نِسْوَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فِي الْبَيْتِ فَقُلْنَ عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ، وَعَلَى خَيْرِ طَائِرٍ. رَوَاهُ البخاري هنا وأبو داود في الأدب[3].

---

[1] بسند صحيح (شرحه).

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) گوتی: که پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) مارەی کردم تەمەنم شەش ساڵ بوو، ئەوکاتە ماڵمان له مەککە بوو، له پاشا کۆچمان کردو چووین بۆ مەدینە، کە تەمەنم بوو بە نۆ ساڵ رۆژێ دایکم هات بۆلام لەوکاتەدا لە نەخۆشین هەڵسابوومەوە، قژەکەم رووتابووەوە، بەڵام بەشی پەلکێکی لێ پەیدا بوو بوو، که دایکم هات من لەگەڵ چەن دەستە خوشکێکما جۆلانێم دەکرد جا پەلی گرتمو بە بووکی بردمی بۆ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) کە چوومە ژوورەوە تەماشام کرد وا دەستەیێ ژن لە یاریدەدەران لەناو هۆدەکەدا بوون جا کاتێ چوومە ژوورەوە گوتیان: (علی الخیر والبرکة وعلی خیر طائر): لەسەر خێرو پیتو فەڕو بەرەکەت، وه لەسەر بەختی باش (ب/د).

٢١١٣- ولأبي داود والنسائي: إِذَا تَزَوَّجَ أَحَدُكُمُ امْرَأَةً أَوِ اشْتَرَى خَادِمًا فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَمِنْ شَرِّ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ وَإِذَا اشْتَرَى بَعِيرًا فَلْيَأْخُذْ بِذِرْوَةِ سَنَامِهِ وَلْيَقُلْ مِثْلَ ذَلِكَ. والله أعلى وأعلم[٤].

لەسەر گێڕانەوەی ئەبو داوودو نەسائی (خودایان لێ رازی بێ) حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ یەکێ لە ئێوە ژن دەهێنێ، یا نۆکەرێ یا کارەکەرێ دەکڕێ بابڵێ: اللهم انی اسالك خیرها وخیر ما جبلتها علیه واعوذ بك من شرها ما جبلتها علیه: خودایە! داوات لێ دەکەم لە خێری ئەمەو لە خێری خوو رەوشتی باشی، وه پەنات پێ دەگرم لە شەڕی ئەمە خۆیو لە شەڕی خوو رەوشتی بەدیی، وه فەرمووی: وه کاتێکیش کە وشترێ دەکڕێ با دەست بگرێ بە نووچکەی کۆ پارەکەیەوەو هەمان دووعا بکا (د/ن- خودایان لێ رازی بێ).

---

[٢] بخاری. نكاح: ٥١٥٦.

[٤] سكت عنه الشارح.

## ٣٩) باسی پێنجەم: باسی نانی شایی‌و شیرینی خواردنەوەو شتی لەم بابەتە: (الباب الخامس: في الوليمة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا} (٣٣/٥٣).

واتە: یەزدانی پاك دەفەرموێ: کاتێ بانگ دەکرێن بچنە ژوورەوە جا کە نانتان خواردو لە نانخواردن بوونەوە بڵاوەی لێ بکەن.

٢١١٤- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْوَلِيمَةِ فَلْيَأْتِهَا. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر خوڵککران بۆ سەرنانی شایی بچن بۆی (ش/د/ت/ن- خودایان لێ رازی بێ).

٢١١٥- وللبخاري: فُكُّوا الْعَانِيَ، وَأَجِيبُوا الدَّاعِيَ، وَعُودُوا الْمَرضَى[2].

بوخاری (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: دیل رزگار بکەن‌و کەسێ بانگێشتنی لێکردن بچن بۆ سەر بانگێشتنەکەی، وە سەر لە نەخۆش بدەن (ب).

٢١١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ يُمْنَعُهَا مَنْ يَأْتِيهَا وَيُدْعَى إِلَيْهَا مَنْ يَأْبَاهَا وَمَنْ لَمْ يُجِبِ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ[3].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەدترین نان نانی شایی‌و شیرینییە، ئەوەی کە خۆی دەیەوێ بچێ بۆی رێگەی نادەن، ئەوەی دەعیەی نایبا خوڵکی دەکەن بۆ سەری، ئەو کەسەشی خوڵك بکرێ‌و نەچێ ئەوە لە خوداو لە پێغەمبەری خودا یاخی دەبێ (ش/د).

---

[1] بخاری. نکاح: ٥١٧٣، ٥١٧٩. مسلم. نکاح: ٣٤٩٥. أبو داوُد. أطعمة: ٣٧٣٦.

[2] بخاری. نکاح: ٥١٧٣، ٥١٧٩.

[3] بخاری. نکاح: ٥١٧٦ (٥١٧٧) أبو داوُد. أطعمة: ٣٧٤٢.

٢١١٧- وَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ يُدْعَى لَهَا الأَغْنِيَاءُ، وَيُتْرَكُ الْفُقَرَاءُ، وَمَنْ تَرَكَ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رواهما الثلاثة[٤].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: خراپترین نان نانی شایی‌و شیرینی‌و شتی وایە، دەوڵەمەندان بانگ دەکرێن بۆی‌و هەژاران بانگ ناکرێن، ئەو کەسەشی خوڵك بکریێ‌و نەچێ ئەوە لە خوداو لە پێغەمبەری خودا یاخی دەبێ (ش/د).

٢١١٨- وَلأَبِي دَاوُدَ: مَنْ دُعِيَ فَلَمْ يُجِبْ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَنْ دَخَلَ عَلَى غَيْرِ دَعْوَةٍ دَخَلَ سَارِقًا وَخَرَجَ مُغِيرًا[٥].

ئەبو داوود دەگێڕێتەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر کەسێ بانگێشتنی لێ بکرێ‌و نەچێ ئەوە لە خوداو لە پێغەمبەری خودا یاخی دەبێ‌و لە فەرمانی ئەوان دەردەچێ وە ئەگەر کەسێ لە خۆیەوە، بەبێ بانگێشتن بچێ ئەوە وەك دز بە دزییەوە دەچێتە ژوورەوەو وەك تاڵانکەر بە ئاشکرا دەرواتە دەرەوە.

٢١١٩- وَجَاءَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ أَبُو شُعَيْبٍ إِلَى غُلاَمٍ لَهُ لَحَّامٍ (أي يبيع اللَّحْمَ) فَقَالَ: اصْنَعْ لِي طَعَامًا يَكْفِي خَمْسَةً فَإِنِّي رَأَيْتُ فِي وَجْهِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْجُوعَ. قَالَ فَصَنَعَ طَعَامًا ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَدَعَاهُ وَجُلَسَاءَهُ الَّذِينَ مَعَهُ فَلَمَّا قَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) اتَّبَعَهُمْ رَجُلٌ لَمْ يَكُنْ مَعَهُمْ حِينَ دُعُوا، فَلَمَّا انْتَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَى الْبَابِ قَالَ لِصَاحِبِ الْمَنْزِلِ: إِنَّهُ اتَّبَعَنَا رَجُلٌ لَمْ يَكُنْ مَعَنَا حِينَ دَعَوْتَنَا فَإِنْ أَذِنْتَ لَهُ دَخَلَ. قَالَ فَقَدْ أَذِنَّا لَهُ فَلْيَدْخُلْ. رَوَاهُ الترمذي والشيخان[٦].

---

[٤] تقدم تخريجه في: ٢٠٨١/٣.

[٥] سكت عنه الشارح.

[٦] بخاری. بیوع: ٢٠٨١، ٢٤٥٦، ٥٤٣٤، ٥٤٦٠. مسلم. أشربة: ٥٢٧٧. ترمذی. نكاح: ١٠٩٩.

پیاوێ ناوی ئەبو شوعەیب بوو، خولامێکی گۆشت فرۆشی هەبوو، چوو بۆلای پێی گوت: نانی پێنج کەسم بۆ دروست بکە، پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەربێ) ڕەنگی برسێتی لێ نیشتبوو. جا کە نۆکەرەکەی نانەکەی دوستکرد ناردی بەشوێن پێغەمبەرو ئەوانەی کە لە خزمەتیا دانیشتبوون، جا کە کەوتنەڕێ پیاوێ شوێنیان کەوت بانگ نەکرابوو، جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گەیشتە بەردەرگای ماڵەکە بە خاوەن ماڵەکەی فەرموو: پیاوێ شوێنمان کەوتووە کە تۆ خوڵکت کردین ئەومان لەگەڵ نەبوو، ئەگەر ڕێگەی دەدەیت ئەوا دێتە ژوورەوە. خانە خوێکەش گوتی: ڕێگەی دەدەم بابێتە ژوورەوە (ت/ش).

٢١٢٠- ولأصحاب السنن: طَعَامُ أَوَّلِ يَوْمٍ حَقٌّ وَطَعَامُ يَوْمِ الثَّانِى سُـنَّةٌ وَطَعَـامُ يَوْمِ الثَّالِثِ سُمْعَةٌ وَمَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللَّهُ بِهِ[٧].

ئیمامان ئەبو داوودو تیرمذیو نەسائی (ڕەزای خوایان لێبێ) دەگێڕنەوە لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نان دروستکردنی ڕۆژی یەکەم شتێکی پێویستە، نان دروستکردنی ڕۆژی دووەم سوننەتە، نان دروستکردنی ڕۆژی سێیەم بۆ ڕواڵەتبازیو ناوە، کەسێکیش شتێ بکا بۆ ڕواڵەتبازی خودا دەیکا بە پەند!

٢١٢١- ولأبي داودَ وأحمد (بسندٍ صالحٍ): إِذَا اجْتَمَعَ الدَّاعِيَانِ فَأَجِبْ أَقْرَبَهُمَا بَابًا فَإِنَّ أَقْرَبَهُمَا بَابًا أَقْرَبُهُمَا جِوَارًا وَإِنْ سَبَقَ أَحَدُهُمَا فَأَجِبِ الَّذِى سَبَقَ. والله أعلى وأعلم[٨].

ئەبو داوودو ئەحمەد (خودایان لێ ڕازی بێ) بە سەنەدێکی صالح دەگێڕنەوە: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر دووکەس بەیەکەوە بانگێشتنیان لێ کردیت بچۆ بۆ سەر خوڵکی ئەوەیان کە دەرگاکەی نزیکترە، چونکە کامەیان دەرگاکەی نزیکتربێ ئەوەیان دراوسێی نزیکە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان لەپێش ئەویتریانا خوڵکی کردیت ئەوە بچۆ بۆ سەر دەعوەتی ئەوەیان.

---

[٧] بسند صالح (شرحه).

[٨] بسند صالح (شرحه).

## ٤٠) باسی نانی شایی: (في وليمة العرس)

٢١٢٢- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا دَعَا أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُجِبْ عُرْسًا كَانَ أَوْ نَحْوَهُ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود[1].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر یەكێ لە ئێوە برادەرێكی خۆی خوڵك كرد بۆ شایی و شتی وا بابچێت (م/د).

٢١٢٣- عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ دَعَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي عُرْسِهِ، فَكَانَتِ امْرَأَتُهُ خَادِمَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَهْيَ الْعَرُوسُ، فَلَمَّا أَكَلَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سَقَتْهُ نَقِيعَ تَمْرٍ مِنَ اللَّيْلِ. رَوَاهُ الشيخان في الأشربة[2].

ئەبو ئوسەیدی ساعیدی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەرم بانگكرد بۆ سەرشایی یەكەم، ژنەكەم (كە بووك بوو) خۆی خزمەتی دەكردین، كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە نانخواردن بووەوە ژنەكەم خۆشاوی خورمای دەرخوارددا، كە لە شەوەوە خووساندبووی (ش).

٢١٢٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَيْنَ خَيْبَرَ وَالْمَدِينَةِ ثَلاَثًا يُبْنَى عَلَيْهِ بِصَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ فَدَعَوْتُ الْمُسْلِمِينَ إِلَى وَلِيمَتِهِ فَمَا كَانَ فِيهَا مِنْ خُبْزٍ وَلاَ لَحْمٍ، أُمِرَ بِالأَنْطَاعِ فَأَلْقَى فِيهَا مِنَ التَّمْرِ وَالأَقِطِ وَالسَّمْنِ فَكَانَتْ وَلِيمَتَهُ، فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ أَوْ مِمَّا مَلَكَتْ يَمِينُهُ؟ فَقَالُوا: إِنْ حَجَبَهَا فَهْيَ مِنْ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ وإِلاَّ فَمَا مَلَكَتْ يَمِينُهُ، فَلَمَّا ارْتَحَلَ وَطَّى لَهَا خَلْفَهُ وَمَدَّ الْحِجَابَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ النَّاسِ. رَوَاهُ الخمسة إلا أبا داود[3].

---

[1] بخاری. نكاح: ٥١٧٣، ٥١٧٩. مسلم. نكاح: ٣٤٩٥ – ٣٤٩٩. أبو داوُد. أطعمه: ٣٧٣٨.

[2] بخاری. أيمان ونذور: ٥١٧٦، ٦٦٨٥. مسلم. اشربة: ٢٥٠١.

[3] بخاری. صلاة: ٣٧١، ٦١٠، ٩٤٧، ٢٢٢٨، ٢٢٣٥، ٢٨٨٩، ٢٨٩٣، ٢٩٤٣، ٢٩٤٤، ٢٩٤٥، ٢٩٩٤، ٣٠٨٥، ٣٠٨٦، ٣٣٦٧، ٣٦٤٧، ٤٠٨٣، ٤٠٨٤، ٤١٩٧، ٤١٩٨، ٤١٩٩، ٤٢٠٠، ٤٢٠١، ٤٢١١، ٤٢١٣، ٥٠٨٥، ٥١٥٩، ٥١٦٩، ٥٣٨٧، ٥٤٢٥، ٥٥٢٨، ٥٩٦٨، ٦٣٦٣، ٦٣٦٩، ٧٣٣٣، ٦٤٨٥. مسلم. نكاح: ٣٤٨٢، ٤٦٤١. أبو داوُد. خراج: ٣٠٠٩. نسائي. نكاح: ٣٣٨٠.

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **سێ شەو مایەوە، لە نێوانی خەیبەرو مەدینەدا، صەفییەی کچی حویەییان بۆ گواستەوە، من خۆم خوڵکی موسوڵمانانم دەکرد بۆ سەر نانی شاییەکە نان و گۆشتی تیانەبوو، تەنیا بریتی بوو لەوە کە حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمانی کرد سفرەکانیان راخست و هەنێ خورما و کەشك و رۆنیان هەڵڕشتنە سەریان و دەستیانکرد بە خواردنی! ئیتر ئەوە نانی شاییەکەی بوو.**

**موسوڵمانانیش لە ناوخۆیانا کەوتنە مقۆمقۆ: ئایا صەفییە یەکێك دەبێ لە دایکانی موسوڵمانان یا کەنیزەکێ دەبێ لە کەنیزەکەکانی حەزرەت؟ ئینجا گوتیان: ئەگەر پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **پەردەی گرتەوە بۆی ئەوە ژنیەتی و دەبێ بە دایکی موسوڵمانان، ئەگینا ئەوە کەنیزەکییەتی و نابێ بە دایکی موسوڵمانان، جا کە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **کەوتە رێ لە پاشکۆی خۆیەوە جێگەی بۆ خۆش کردو خستیە پاشکۆی خۆی و چارشێوی بۆ گرتەوە تا خەڵك نەیبینن (ش/ت/ن).**

**٢١٢٥- وَعَنْهُ قَالَ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **أَوْلَمَ عَلَى أَحَدٍ مِنْ نِسَائِهِ مَا أَوْلَمَ عَلَى زَيْنَبَ، أَوْلَمَ بِشَاةٍ. رَوَاهُ الثلاثة[٤].**

**دیسان ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: نەمدیوە کە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **بۆ کەسی تر لە ژنەکانی نانی شایی دروست بکا وەك ئەونانەی کە بۆ شاییەکەی زەینەبی ژنی دروست کردبوو، مەڕێکی کوشتەوە و کردی بەنانی شایی بۆی (ش/د).**

**٢١٢٦- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **يَسْأَلُنِي عَنِ الْحِجَابِ وَكُنْتُ أَعْلَمَ النَّاسِ بِهِ أَصْبَحَ رَسُولُ اللهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **عَرُوسًا بِزَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ وَكَانَ تَزَوَّجَهَا بِالْمَدِينَةِ، فَدَعَا النَّاسَ لِلطَّعَامِ بَعْدَ ارْتِفَاعِ النَّهَارِ، فَجَلَسَ مَعَ رَسُولِ اللهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **رِجَالٌ بَعْدَ مَا قَامَ الْقَوْمُ، حَتَّى قَامَ رَسُولُ اللهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **فَمَشَى وَمَشَيْتُ مَعَهُ، حَتَّى بَلَغَ بَابَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، ثُمَّ ظَنَّ أَنَّهُمْ قَدْ خَرَجُوا فَرَجَعَ فَرَجَعْتُ مَعَهُ، فَإِذَا هُمْ**

---

[٤] بخاری. نكاح: ٥١٦٨، ٥١٧١. أبو داوُد. اطعمه: ٣٧٤٣. مسلم. نكاح: ٣٤٨٩.

جُلُوسٌ مَكَانَهُمْ، فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ الثَّانِيَةَ، حَتَّى بَلَغَ بَابَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ، فَإِذَا هُمْ قَامُوا، فَضَرَبَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ سِتْرًا، وَأَنْزَلَ اللهُ آيَةَ الْحِجَابِ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ}. رَوَاهُ الشيخان والترمذي.

دیسان گوتی: ئوبەیی کوڕی کەعب (خودای لێ ڕازی بێ) لە بارەی ئایەتی حیجابەوە لێی پرسیم، کە من لە هەموو کەس باشتری لێ دەزانم، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە مەدینە زەینەبەی هێنا، جا شەوی زاوایی بۆ بەیانی کە خۆر بەرزەوەبو بانگێشتنی لە خەڵککرد بۆ نان خواردن.

جا کاتێ خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد چەند پیاوێ لە خزمەتی پێغەمبەردا دانیشتن و نەڕۆشتن و هەر دەوریان چۆڵ نەکرد تا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەڵساو ڕۆیشت، منیش لە خزمەتیا ڕۆیشتم، هەتا گەیشتە بەردەرگای هۆدەکەی عائیشە، ئینجا لەوێوە گەڕایەوە، منیش لەگەڵیا گەڕامەوە، وە لە پێغەمبەر وابوو کە ئێستا پیاوەکان ڕۆیشتوون، کەچی تەماشامانکرد هێشتا هەر لەشوێنی خۆیان دانیشتوون.

دیسان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گەڕایەوەو ڕۆیشت تا گەیشتەوە بەردەرگای هۆدەکەی عائیشە، منیش دیسان لەگەڵیا چووم، کە گەڕایەوە منیش گەڕامەوە ئەمجارە کە تەماشامانکرد پیاوەکان هەڵسابوون ڕۆیشتبوون.

ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پەردەی لە نێوانی من و خۆیدا دادایەوە، وە خودای گەورە ئایەتی حیجابی نارده خوارەوە کە دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ}. (٣٣/٥٣).

واتە: ئەی پێغەمبەری خودا! کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە بە خوداو بە پێغەمبەری خودا، خودسەر خۆتان مەکەن بەناو ماڵەکانی پێغەمبەردا مەگەر کاتێ کە ڕێگەتان بدرێ بۆ نان خواردنو شتی وا، لەم حاڵەیشدا کاتێ بچن کە نانەکە پێ گەیشتبێ، نەوەك لەپێشا بچنو لەوێ چاوەنواڕ بکەن تا نان پێ دەگا، جا کە بانگێشتنتان لێ کرا بڕۆن، کاتێ نانتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن، وە لەوێ کۆڕی قسەی لێ دامەبەستنو زۆر مەمێننەوە، چونکە شتی وا ئازاری پێغەمبەر دەدا پێغەمبەر شەرمتان لێدەکا، بۆیە قسە ناکا، بەڵام خودا لەشتی هەق شەرم ناکا، وە هەرکاتێ داوای شتێ دەکەن لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر لە پشتی پەردەوە داوایان لێبکەن، چونکە بەم شێوەیە باشترە بۆ دڵپاکی ئێوەیش و ئەوانیش (ش/ت).

## ٤١) نان دروستکردن بە بۆنەی هاتنەوەوە لە ڕێبواری واتە: لە (سەفەر). ولیمة العودةِ من السفر

٢١٢٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْمَدِينَةَ نَحَرَ جَزُورًا أَوْ بَقَرَةً. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والبخاري في الجهاد. والله أعلى وأعلم[١].

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ هاتەوە بۆ مەدینە بەم بۆنەیەوە، وشترێکی کوشتەوە، یا گایەکی سەر بڕی (د/ب).

## ٤٢) ئەگەر لەو شوێنە بێشەرعی لێبوو چوون پێویست نییە لا إجابة إذا كان هناك منكر

٢١٢٨- كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) يَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نَهَى عَنْ طَعَامِ الْمُتَبَارِيَيْنِ أَنْ يُؤْكَلَ[١].

---

[١] بخاری. جهاد: ٣٠٨٩.

ئیبنـو عـەبباس (خودایـان لێ رازی بـێ) گـوتـی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەربێ) رێگـە نـادا کـە نـانی ئەو کەسانە بخورێ کە بۆ چاو لێکەری‌و شانازی نـان دروست دەکەن (د–سند صالح).

٢١٢٩– وَ أَضَافَ رَجُلٌ عَلِيّاً (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا فَقَالَتْ فَاطِمَـةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) لَوْ دَعَوْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَكَلَ مَعَنَا؟ فَدَعَوْهُ فَجَاءَ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى عِضَادَتَيِ الْبَابِ فَرَأَى الْقِرَامَ قَدْ ضُرِبَ بِهِ فِي نَاحِيَةِ الْبَيْتِ فَرَجَعَ فَقَالَتْ فَاطِمَةُ الْحَقْهُ فَانْظُرْ مَا أَرْجَعَهُ. فَتَبِعْتُهُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا رَدَّكَ؟ فَقَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ لِي أَوْ لِنَبِيٍّ أَنْ يَدْخُلَ بَيْتًا مُزَوَّقًا. رواهما أَبُو دَاوُدَ. والله أعلى وأعلم[٢].

پیـاوێ قـاوەڵتی بـۆ عـەلی دروسـت کـردو بـردی بـۆ ماڵـەوە بـۆی، فاطیمەیش (خودای لێ رازی بێ) گوتی: با پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) بـانگ بکەین لەگەڵمانا بخوا، جا بانگیانکرد، کاتێ تەشریفی هێنا کە گەیشتە بەرەوە دەستی گرت بەم بەرو بەو بەری دەرگاکەوەو هەردوو دەستی دانـا لەسـەر لاشـیپانی دەرگاکـە تەماشـای کـرد وا پەردەیـەکی نەخـشین لـە سووچێکی ماڵەکەوە دادراوەتـەوە، ئـیتر نەهاتـە ژوورەوەو گەڕایـەوە، جا فاطیمة بە عـەلی گـوتی: فریایکـەوە، بزانـە لەبەرچی گەڕایـەوە؟ عـەلی گـوتی: منـیش شـوێنی کـەوتم گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! بۆچـی گەڕایتـەوە؟ فەرمووی: (درودی خودای لەسەربێ) بۆ من نەهاتووە کە بڕۆمە ناومـاڵی رازاوەوە. یان فەرمووی: بۆ پێغەمبەران ناشێ کە بچنە نـاو خانـەی نەخشاوەوە. (د–سند صالح).

---

[١] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[٢] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

## ٤٣) باسی دەستووری سەرجێیی: (فَصْلٌ في آداب الوقاع)

٢١٣٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ قَالَ بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذَلِكَ، لَمْ يَضُرَّهُ الشَّيْطَانُ أَبَداً. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئیبنو عەبباس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ یەکێ لە ئێوە دەیەوێ بڕواتە لای خێزانی خۆی ئەگەر بڵێ: بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا: بەناوی خودا، ئەی خودا! شەیتانمان لەکۆڵ بکەرەوەو شەیتان دوور بخەرەوە لەم رۆژیی خۆتە کە داوتە بە ئێمە. هەر کەستان لەو کاتەدا ئاوا بڵێ، ئەگەر لەو جارەدا منداڵ لە چارەیان نووسرابێ هەرگیز شەیتان زیانی بۆی نابێ[1]! (ش/د/ت/ن).

٢١٣١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالتَّعَرِّي فَإِنَّ مَعَكُمْ مَنْ لاَ يُفَارِقُكُمْ إِلاَّ عِنْدَ الْغَائِطِ وَحِينَ يُفْضِي الرَّجُلُ إِلَى أَهْلِهِ فَاسْتَحْيُوهُمْ وَأَكْرِمُوهُمْ. رَوَاهُ الترمذي في الأدب[2].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای گەورەی لەسەربێ) دەفەرموێ: بەرووتی دامەنیشن، چونکە ئەو فریشتانەی کە لەگەڵتانان لێتان جیا نابنەوە، مەگەر لەکاتی پێشاوو لەکاتی دروستبوونی پیاو لەگەڵ خێزانیا، دەی ئێوەیش شەرمیان لێ بکەنو قەدریان بگرن! (ت-سند ضعيف).

---

[1] بخاری. وضوء: ١٤١، ٣٢٧١، ٣٢٨٣، ٦٣٨٨، ٥١٦٥، ٧٣٩٦. مسلم. نكاح: ٣٥١٩. أبو داود. نكاح: ٢١٦١. ترمذی. نكاح: ١٩١٩.

[1] بۆیە کە منداڵ چەمووشو هارو هاج بێ دەڵێن: ئەڵێی بەچکەی شەیتانە، بیسمیللای لێ نەکراوە. (وەرگێڕ)

[2] رَوَاهُ الترمذی بسند ضعيف (شرحه).

٢١٣٢- عَنِ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَتِ الْيَهُودُ تَقُولُ: إِذَا أَتَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ مِنْ دُبُرِهَا فِي قُبُلِهَا كَانَ الْوَلَدُ أَحْوَلَ فَنَزَلَتْ {نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ}. رَوَاهُ الأربعة[٣].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جوولەکەکان دەیانگووت: ئەگەر پیاو لەلای پشتەوە بچێتە لای ژنی خۆی بە پێشی، ئەوە منداڵەکەی خێل دەبێ. جا بۆ پووچ کردنەوەی ئەم بیروباوەڕە چەوتە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ}. (٢/٢٢٣).

واتە: ژنەکانتان کێڵگەن بۆ ئێوە، وەکوو زەویەکی لەبار بۆ تۆم تیا وەشاندن، دەی کێڵگەی خۆتان بکێڵن هەر چۆن دەتانەوێ.لە لاوە یا لە پێشەوە، یا لەلای پشتەوە، بەمەرجێ بەپێش بێ، نەوەك بە کۆم، دیارە مەبەستی بەیەك گەییشتنی ژن و مێردەو راستەوخۆ نەی گوتووە، بەو شێوە تەعبیری لێ داوەتەوە. (ش/د/ت).

٢١٣٣- ولأصحاب السُنن: مَلْعُونٌ مَنْ أَتَى حَائِضًا أَوِ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا[٤].

ئیمامان ئەبو داوودو تیرمیذی و نەسائی (خودایان لێ رازی بێ) دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نەفرین و لەعنەت لەو پیاوە بێ کە بە پاش (واتە: بە کۆم) دەڕواتە لای ژن! (د/ت/ن-سند صالح).

٢١٣٤- عَنْ عَلِيِّ بْنِ طَلْقٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَى أَعْرَابِيٌّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ الرَّجُلُ مِنَّا يَكُونُ فِي الْفَلاَةِ فَتَكُونُ مِنْهُ الرُّوَيْحَةُ وَيَكُونُ فِي الْمَاءِ قِلَّةٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِذَا فَسَا أَحَدُكُمْ فَلْيَتَوَضَّأْ وَلاَ تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَعْجَازِهِنَّ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ[٥].

---

[٣] مسلم. نكاح: ٣٥٢١. ترمذی. تفسير: ٢٩٧٨. بخاری. تفسير: ٤٥٢٧، ٤٥٢٨.

[٤] بسند صالح (شرحه).

[٥] رَوَاهُ الترمذی بسند حسن (شرحه).

عەلی کوڕی طەلق (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: عارەبێکی دەشتەکی هاتە لای حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕێ دەکەوێ، پیاو لەو چۆڵە بایەکی لێ دەبێتەوەو ئاویش کەمە؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ئەگەر کەسێکتان تسی کەند با دەسنوێژ بگرێتەوە، وە بە کۆمیش مەچنە لای ئافرەت، بە ڕاستی خودا شەرم لە شتی هەق و ڕەوا ناکا (ت-س/ح-ئەحمەد).

٢١٣٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَى رَجُلٍ أَتَى رَجُلاً أَوِ امْرَأَةً فِي الدُّبُرِ. رواهما الترمذي وأحمد[٦].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا بە چاوی ڕەحمەت تەماشای ئەو پیاوە ناکا کە بە کۆم سواری پیاوێ دەبێ، یا سواری ژنێ دەبێ (ت-س/ح-ئەحمەد).

٣١٣٦- وَقَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): كُلُّ مَا يَلْهُو بِهِ الرَّجُلُ الْمُسْلِمُ بَاطِلٌ إِلاَّ رَمْيَهُ بِقَوْسِهِ وَتَأْدِيبَهُ فَرَسَهُ وَمُلاَعَبَتَهُ أَهْلَهُ فَإِنَّهُنَّ مِنَ الْحَقِّ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[٧].

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: یاری و گەمەو گاڵتەی پیاوی موسوڵمان هەمووی هیچ و پووچە، مەگەر ئەوەی نەبێ کە تیرو ڕمبازیی بکاو مەشق بە ئەسپ بکا، یا یاری و دەسبازیی و گەمەو گاڵتە لەگەڵ خێزانی خۆیا بکا، ئەمانە هەر چەن یاری و گەمەن بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا هەموویان هەق و ڕەوان (ت:ص-د).

٢١٣٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) غَزْوَةَ بِالْمُصْطَلَقِ فَسَبَيْنَا كَرَائِمَ الْعَرَبِ فَطَالَتْ عَلَيْنَا الْعُزْبَةُ وَرَغِبْنَا فِي الْفِدَاءِ فَأَرَدْنَا أَنْ نَسْتَمْتِعَ وَنَعْزِلَ فَقُلْنَا نَفْعَلُ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَيْنَ أَظْهُرِنَا لاَ نَسْأَلُهُ. فَسَأَلْنَاه فَقَالَ: لاَ

---

(٦) رَواهُ الترمذى بسند حسن (شرحه).

(٧) رَواهُ الترمذى فى فضل الجهاد وصححه (شرحه).

عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَفْعَلُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ خَلْقَ نَسَمَةٍ هِيَ كَائِنَةٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ إِلاَّ سَتَكُونُ. رَوَاهُ الخمسة[٨].

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) غەزای بەنیلموصطەلیقمان کردو ژنانی نازدارانی عەرەبمان بەتاڵانی گرت، وە بێ ژنی زۆری بۆ هێنا بووین، وە حەزیشمان لە فرۆشتنی ئەو ژنە تاڵانییانە هەبوو، جا ویستمان بچینە لایان بەلام خۆمان بکێشینەوە تا ئاوەکە نەگاتە جێی خۆی و نەبێ بە منداڵ، ئەگینا ژنەکان دەبن بە دایکی منداڵمان و ئەوکاتە نافرۆشرێن جا گوتمان: ئێمە ئێستا لە خزمەتی پێغەمبەرداین چۆن دەبێ بەبێ پرسی ئەو (دروودی خودای لەسەربێ) شتی وابکەین، کە لێمان پرسی، فەرمووی: قەیناکەن ئەگەر وانەکەن! چونکە چارەنووسی خودایی رەتبوونەوەی نیە وە هەرکەسێ (هەتا رۆژی قیامەت) خودای گەورە لەچارەی نووسیبێ کە دەبێ دروست ببێ ئەوە دەبێ دروست ببێ (ش/د/ت/ن).

٢١٣٨- وَعَنْهُ أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي جَارِيَةً عَنْهَا وَأَنَا أَعْـزِلُ عَنْهَا وَأَنا أَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ وَأُرِيدُ مِنْهَا مَا يُرِيدُ الرِّجَالُ، وَإِنَّ الْيَهُودَ تُحَدِّثُ أَنَّ الْعَزْلَ مَوْءُودَةُ الصُّغْرَى. فَقَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَذَبَتْ يَهُودُ لَوْ أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَخْلُقَهُ مَا اسْتَطَعْتَ أَنْ تَصْرِفَهُ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[٩].

دیسان گوتی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کەنیزەکێکم هەیە، کە دەرۆمە لای خۆم دەکێشمەوە، چونکە حەزناکەم کە سکی پڕبکەم. جوولەکەکانیش دەڵێن: خۆکێشانەوە (واتە: عەزل) کچ زیندەبەچاڵکردنی بچووکەو برا کوشتنێکە؟ فەرمووی: جوولەکە درۆ دەکەن لەوەدا کە دەڵێن: خۆکێشانەوە بەری منداڵ دروست بوون دەگرێ، بۆیە بە زیندەبەچاڵکردنی بچووك دادەنرێ چونکە ئەگەر خودا بیەوێ منداڵێ دروست بکا تۆ ناتوانی قەدەغەی بکەی (د/ت/ن-س/ص).

---

[٨] بخاری. بیوع: ٢٢٢٩، ٢٥٤٢، ٤١٣٨، ٥٢١٠، ٦٦٠٣، ٧٤٠٩. مسلم. نكاح: ٣٥٢٩. أبو داوُد. نكاح: ٢١٧٢.

[٩] رَواهُ اصحاب السُّنن بسند صحيح (شرحه).

٢١٣٩- ولمسلم وأبي داود: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي جَارِيَةً لِي وَأَنَا أَعْزِلُ عَنْهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّ ذَلِكَ لَنْ يَمْنَعَ شَيْئًا أَرَادَهُ اللَّهُ. فَجَاءَ الرَّجُلُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْجَارِيَةَ قَدْ حَمَلَتْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ[١٠].

**گوتی: پیاوێ پرسیاریکرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ): کەنیزەکێکم هەیە کە دەڕۆمە لای خۆم دەکێشمەوە تا تۆماوەکە نەگاتە جێی خۆی‌و نەبێ بەمناڵ. فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەو شتەی خواستی خودای لەسەربێ بەشتی وا رەت نابێتەوە.**

**لەپاش ماوەیێ پیاوەکە هاتەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کەنیزەکەکە سکی پڕە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: من هەم پێغەمبەرم‌و هەم بەندەی خودام لەبەرئەوە قسەی من هەمیشە راست دەردەچێ (م/د).**

٢١٤٠- وَقَالَ جَابِراً (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَبَلَغَه ذَلِكَ فَلَمْ يَنْهَنَا. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[١١].

**جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بەسەرینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە دروست دەبووین لەگەڵ ژن، گەلێ جاران خۆمان دەکێشایەوەو ئاگربڕی ئەوەمان دەکرد کە نەبێ بەسك. جا کە ئەم باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهیی لێنەکردین‌و قەدەغەی نەکرد لێمان (ش/ت).**

٢١٤١- قَالَ فِي الشرح: لمسلم وأحمد: أَنَّ النبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سُئِلَ عَنِ الْعَزْلِ فَقَالَ: ذَلِكَ الْوَأْدُ الْخَفِيُّ[١٢].

---

[١٠] مسلم. نكاح: ٣٥٣٩ — ٣٥٤٢. أبو داود. نكاح: ٢١٧٣.

[١١] بخاری. نکاح: ٥٢٠٨. ترمذی. نکاح: ١١٣٧. مسلم. نکاح: ٣٥٤٣ — ٣٥٤٦.

[١٢] مسلم. نكاح: ٣٥٤٩، ٣٥٥٠. أبو داود. طب: ٣٨٨٢. ترمذی. طب: ٢٠٧٦. نسائی. نکاح: ٣٣٢٦.

لە شەرحەکەدا دانەر (پرگۆڕەکەی لە نووربێ) دەڵێ: موسلیمو ئەحمەد (خودایان لێ ڕازی بێ) ریوایەت دەکەن: پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەبارەی ئاگر بڕ (عزل): خۆکێشانەوە لەکاتی جووتبوون لەگەڵ هاوسەردا تا تۆماوەکە نەبێ بە منداڵ چۆنە؟ فەرمووی: ئەوە زیندەبەچاڵکردنی پەنامەکییە.

٢١٤٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: إِنَّ مِنْ أَشَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللَّهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الرَّجُلَ يُفْضِي إِلَى امْرَأَتِهِ وَتُفْضِي إِلَيْهِ ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا. رَوَاهُ مسلم وأحمد[١٣].

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ڕۆژی قیامەت لەلای خودا کەس وەك ئەو پیاوە جێگەی خراپ نیە کە لەگەل ژنەکەیدا سەردەکەن بەیەکداو لەسەر جێ باسی سەرجێییو شتی وا دەکەن کەچی دەچێ ئەو باسوخواسە بۆ خەڵکی تر دەگێڕێتەوەو ڕازو نهێنی ژنەکەی پەخشو بڵاو دەکاتەوە، (م/ئەحمەد- خودایان لێ ڕازی بێ).

٢١٤٣- أولأصحاب السُّنن: إِنَّمَا ذَلِكَ مَثَلُ شَيْطَانَةٍ لَقِيَتْ شَيْطَانًا فِي السِّكَّةِ فَقَضَى مِنْهَا حَاجَتَهُ وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ[١٤].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەمە وەك ئەوە وایە کە دەڵە دێوێ لەسەر چەقی ڕێگەوبان تووشی گۆڵە دێوێ ببێو بە بەرچاوی ئەو خەڵکەوە لێی هەڵبێ! (د/ت/ن-س/ص).

٢١٤٤- ننقل ههنا شرح المصنف على الحديث الحادي عشر وذلك لأهميته ولعموم البَلْوى بهذا الأمر في يومنا هذا، قال (رحمه الله تَعَالَى ونور ضريحه): ففي هذا جواز العزل مطلقا، وعليه بعض الصحب، والتابعين والشافعي... وقال بعض العلماء: إنه حرام مطلقا لتلك الأحاديث.. ولكن الذي يظهر وينبغي التعويل عليه الفرق بين

---

[١٣] مسلم. نكاح: ٣٥٢٧، ٣٥٢٨. أبو داوُد. أدب: ٤٨٧٠.

[١٤] لأصحاب السُّنن بسند صحيح (شرحه)

الجارية والحرة، فَالأُولى يجوز العزل عنها مطلقاً لأن تلك النصوص وردت فيها، وأما الحرة فلا يجوز العزل عنها إلا بإذنها، وعلى هذا جمهور السلف والخلف ومالك، وأبو حنيفة وأحمد (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُم).

(فائدة) حكم العزل هذا يجري على استعمال دواء لمنع الحمل مؤقتاً، ويجري على إسقاط النطفة قبل نفخ الروح فيها فإن الحكمة في الكل واحدة وهي منع الحمل. والله أعلم.

أقول أنا المترجم: وقال الإمام النووي (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) في شرحه على صحيح مسلم لدى شرحه للحديث الوارد في بيان كيفية خلق الجنين في بطن أمه، الذي تقدم في هذا الكتاب المبارك بالرقم: ٤١/٤ في المجلد الأول في مبحث الإيمان بالقدر: قوله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) في هذا الحديث (ثم يرسل الملك) ظاهره ان إرساله (لينفخ فيه الروح) يكون بعد مائة وعشرين يوماً. وقال (عليه الرضوان والرحمة) واتفق العلماء على ان نفخ الرُّوح لايكون إلا بعد أربعة أشهر. انتهى كلام النووي (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ).

وأقول: وبناء على ما تقدم ونظراً لأن بناء الدين على اليسر والرأفة بالإنسان، وأن القواعد الشرعية قد روعي فيها مصلحة البشر المَشْرُوعَةُ عامةً وفي المعاملات والأحوال الشخصية خاصة، مع الأخذ بنظر الإعتبار إحترام خالقية الخالق وإجلاله وإعظامه، أقول بناء على ما تقدم: لا بأس في ترجيح رأي العلماء الأجلاء الذين لا يرون بأساً بالعزل أو الذين يبيحون إستعمال وسائل منع الحمل وإسقاط النطفة قبل إكمالها أربعة أشهر لاسيما إذا أوصى بها الطبيب الحاذق المسلم الأمين لاعتبارات صحية كتهديد حياة الأم بالخطر، أو دينية كمنع الحيض والعادة الشهرية مؤقتاً لأداء صوم رمضان كاملا غير منقوص في شَهْرِهِ، أَوْ أَخْلاَقِيَّة كالستر على أهل الستر بالتخلص من الحمل بوسائل منعِهِ قبل تَكْوِينِهِ او بإجهاضه قبل إتمامه أربعة أشهر كما هو الحال في البغاء وفي المخلوقة من ماء الزنا، فَإِنَّ هذا أَسْتَرُ وَأَهْوَنُ شَرّاً، إِذْ عُرِفَ أَنَّ الشَّرَّ المَكْتُومَ يُقَلِّلُهُ السِّتْرُ، وَأَنَّ السِّرَّ الخفي يفحله النشر وقد ينكمش الفساد ويتقلص ضرره وهو في قيد الإسرار وطي الكتمان حتى إذا ذاع وشاع فتفاقم أمره واستفحل شرره، وليس في قولي هذا شئ من الدعاية للتغطية على الجريمَةِ، فإن ستر العيوب ورتق فتق المؤمنين

مأمور به شرعاً، وقال الله تَعَالَى في هذا الباب: {لاَّ يُحِبُّ اللّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوَءِ}. ومن الجهر بالسُّوءِ فتق رتق المسلمين.

أما تغطية الجريمة التي تُمِيِّعُ حقوق الناس وتضيعها فإنها من باب إخْفَاءِ الجريمة والإعانة عليها فَلا تجوز مطلقاً تحت أي ستار كان، قال تَعَالَى: {لاَّ يُحِبُّ اللّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوَءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلاَّ مَن ظُلِمَ} يعني إِنَّ الله تَعَالَى كما يكره فضح الناس والتعدي عليهم بالقول المشين كذلك يحب كشف الجريمة وقول الحقيقة وأداء الشهادة على وجهها ومقاومة الظلم الذي هو مرتع الجريمة بالقلم واليد واللسان والجنان، ومن لاحظ بإخلاص حال المسلمين في يومهم هذا واهتمامَهُمْ الزائد بهذا الأمر وبَلْبَلَتَهُمْ الروحية وذبذبتهم النفسية واسْتِفْتَائَهُمْ بحرارة في هذا الشأن صوب تَطَرُّقَنَا إِلَيه في هذه الأسطر المتقدِّمَةِ ولم ير في ذلك خروجاً من الموضوع. والله أعلى وأعلم[١٥]. (المترجم)

واتە: دانەر (پرگۆرەكەی لە نووربێ) لە شەرحەكەدا لەكاتی راڤەكردنی فەرموودەی یازدەهەمی ئەم باسەدا دەڵێ: لەم حەدیثەیەوە وا دەردەكەوێ كە ئاگر بڕ (عەزل) بەبێ بەندو مەرج دروستە، وە هەندێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) و هەندێ كەس لەچینی دوای یاران (تابیعین) و ئیمامی شافیعی (رەزای خودایان لەسەربێ) رایان لەسەر ئەم رایەیە.

وە هەندێ زانایانیش گوتوویانە: ئاگر بڕ (عەزل) بە هیچ جۆرێ رەوانییە، بەڵگەشیان ئەم فەرموودانەی ترە كە لەم باسەدا باسكراون.

وەڵێ ئەوەی كە روون و ئاشكرایە و بە كەڵكی ئەوە دێ كە پشتی پێ ببەسترێ ئەوەیە كە دەبێ لەم باسەدا كەنیزو ژنی ئازاد لەیەك جیابكرێنەوە لەسەر ئەم شێوەیە: كەنیز لە هەموو كاتێكدا دروستە ئاگربڕی لێ بكرێ بەڵام ژنی ئازاد دروست نیە ئاگربڕی لێ بكرێ مەگەر بە رەزای خۆی.

وە جەماوەری زانایانی پێشین و پاشین و ئیمامی مالیك و ئەبو حەنیفە و ئەحمەد (خودایان لێ رازی بێ) رایان لەسەر ئەم رایەیە.

---

[١٥] هذا ليس حديث لا حاجة إلى تخريجه.

(مەسەلەیەکی سوود بەخش) ئەم حوکمەی کە بۆ عەزل واتە: بۆ ئاگربڕ هەیە، بۆ بەکارهێنانی هەموو دەرمانو هۆیەك هەیە کە بۆماوەیەکی وەختی دەبێ بەهۆی ئاگربڕ (مەنع) لەسك پڕبوون وە هەروەها سك لەباربردنیش هەمان حوکمو بڕیاری هەیە، بە مەرجی ئەوە کە هێشتا رۆحی نەکرابێ بەبەرا چونکە مەبەست لەمانە هەموو ئەوەیە کە بەرگری لەسك پڕبوون بکرێ. وە خودای گەورە هەر بۆ خۆی زۆر باشتری لێ دەزانێ قسەی دانەر (خودای لێ رازی بێ) لێرەدا تەواو.

وە ئیمامی نەوەویش لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا، لە راڤەکردنی ئەو حەدیثەدا کە باسی چۆنێتی دروستبوونی ئادەمیزاد دەکا لە سکی دایکیا، ئەم حەدیثە لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا لە باسی باوەڕ بە قەزاو قەدەرو چارەنووسدا رۆیشت، دەڵێ: فەرموودەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کە دەفەرموێ: ثم يرسل الملك لينفخ فيه الروح: لەپاش ئەوە خودا فەرمان دەکا بە فریشتەکە کە گیانی بکا بە بەردا، وا دەردەکەوێ کە ئەمە لەپاش سەدو بیست رۆژ دەبێ.. وە قسەی زانایان لەوەدایە کە لەپاش چوار مانگ گیان دەکرێ بە بەرمناڵ لەسکی دایکیا. قسەی ئیمامی نەوەویش (خودای لێ رازی بێ) تەواو.

منیش (کە وەرگێڕم) دەڵێم: جا لەبەرئەوەی کە ئەم باسە ئەمڕۆ زۆر باوە، وە گەلێ گرنگە، وە بووە بە کێشەیەکی گشتی، وە موسوڵمانان بە ژنو پیاوەوە زۆر بە پەرۆشەوە لە چارەسەرێکی ئەم دیاردەیە دەپرسن، وە لەبەرئەوەی کە بناغەی دینو ئایین لەسەر ئاسانکاریو رەحمەتە، وە دەستوورو یاساکانی شەریعەت بەگشتی بەرژەوەندی ئادەمیزاد رەچاو دەکەن، بە تایبەتی لەباسی باری کەسایەتیو حاڵو بارودۆخە خۆییەکاندا، وە لەسەرو هەموو شتێکەوە رێزی دروستکاریی خودای دروستکەری کردگار رەچاو دەکەن، جا لەبەر ئەمانە هەموو، منی وەرگێڕیش دەڵێم:

قەیدی نیە ئەگەر رای ئەوزانا بەڕێزانە پەسەند بکرێ، کە دەفەرموون: عەزلو ئاگربڕ قەیدی نیە، وە هەروەها بەکارهێنانی هۆیەکانی بەرگرتنی مناڵبوون قەیدی نیە، وە سك لەباربردن بەر لە تەواوکردنی چوار مانگ قەیدی

نیـە، نـە خـوازەڵا ئەگـەر لەسـەر راویـژو ئامۆژگـاریی پزیـشکێکی موسـوڵمانی لێزانـی ئەمینـدار بـێ، ئـیتر لەبـەر هـۆی تەندروسـتی بـێ، وەك ئـەوەی کـە ئـەو سکە ببێ بە مایەی مەترسی بۆ دایکەکەی، یا لەبەر هۆیەکی ئایینی بـێ، وەك ئـەوەی بـە حـەپو دەرمـان بـەری بێنوێـژی بگیرێ بۆ ماوەیـەك، تـا ژنەکـە لـەو ماوەیەدا سی رۆژەی رەمەزان بەتـەواوی بـەرۆژوو بـێ، یـا تـەوافی مـاڵی خـودا بکا لەکاتی حەجدا، یا لەبەر هۆیـەکی رەوشـتی بـێ وەك سرپۆشـینی خێزانـی بەناموسو خاوەن سیترو پـەردە، وەك لـەباربردنی سـکی زۆڵو بـەکارهێنانی داودەرمـانی سـك نـەکردن لـەکاتی جووتبـوونی بـێ شـەرعیدا. چـونکە وەکـوو زانـراوە شـەڕو خراپـە هـەتا لـەژێر پـەردەوەبنو بەدزییـەوە بکـرێن باشـترە، چونکە کە ئاشکرابوون پەرەدەسێننو دەبن بە سەرمەشق بۆ خـەڵکی تـریش، سـەرەڕای ئـەوە گـەلێ خـەڵکی بـێ تـاوانی بـێ ئاگـا لـە کەسـوکاری هـەردوو لا تووشی شەرمەزاریو سەرشۆڕی دەبن بە بەلاش.

وە خـوداش خـۆی سرپۆشـەو سرپۆشـینی پـێ خۆشـە، وە ئـەوەتانێ دەفەرموێ: {لاَّ يُحِبُّ اللّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوَءِ}. واتە: خودا حەزی لەوە نیـە کـە شـتی خراپە ئاشکرا بکرێ. چ خراپەیەکیش لەوە خراپترە کە کەسێ پـەردەی خـودا لەسـەر بەنـدەی خـۆی هەڵبداتـەوەو ریـسواو تـرۆی بکـا تـەنیا لەبـەر ئـابڕوو شکاندنو بەس.

وەلێ دیارو ئاشکرایە کە مەبەست لە سرپۆشی ئەوە نیە کە تاوان بکرێ بەژێر لێوەو خەڵك پێ بخشێنن لـە تـاوانی تاوانبـارو چـاو بپۆشـن لـە ستەمی ستەمکار.

نەء ئەمە دروست نیەو ئەمـە ناڕەواییـەو هاریکارییـە لەگـەڵ تاوانکـاردا، خودا دەفەرموێ: لەم بارەیەوە: {لاَّ يُحِبُّ اللّهُ الْجَهْـرَ بِالـسُّوَءِ مِـنَ الْقَـوْلِ إِلاَّ مَـن ظُلِـمَ}. واتـە: خـودا حـەزی لـەوە نیـە کـە شـتی خراپـە ئاشـکرا بکـرێو بـەبێ هۆیەکی رەوا قسەی لێ بکرێ، مەگەر بۆ کەسێ کە پەردە لەسـەر زۆرو سـتەمو زوڵمی زۆردار لا بدات. لەمەیشەوە دەردەکەوێ کە خـودای گـەورە وەکـی پێـی ناخۆشە خەڵك بەناهەق ترۆو ریسوا بکرێن پێشی خۆشـە کـە پـەردە لـە رووی تـاوان لابـدرێو هەمیـشە قـسەی هـەقو رەوابکـرێو شـایەتی بەهـەق بـدرێو

زوڵم‌و زۆر (كە بۆگەی تاوانبارییە) ریشەكەن بكرێ‌و بەدەست‌و دەم‌و زبان‌و دڵ پاكۆبدرێ.

لەو باوەڕەدام كە ئەم لاباسە خۆكەڕ كردن نیە لە باسە سەرەكییەكە، چونكە بەراستی مەردومە موسوڵمانەكە ئەمڕۆ كە زۆرتینوی ئەم باسەن. وە خودای گەورەو مەزن هەر بۆ خۆی زۆر باشی لێ دەزانێ. (وەرگێڕ)

## ٤٤) چوونە لای ژنی سك پڕو ژنی مەمكدەری منداڵبەبەر دروستە
## يجوز وطء الحامل والمرضع

٢١٤٥- عَنْ جُدَامَةَ بِنْتِ وَهْبٍ الأَسَدِيَّةِ (رَضيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الْغِيلَةِ (وطء المرض خوفاً على الولد) حَتَّى ذَكَرْتُ أَنَّ الرُّومَ وَفَارِسَ يَصْنَعُونَ ذَلِكَ فَلاَ يَضُرُّ أَوْلاَدَهُمْ[١].

جودامەی كچی وەهبی- ئەسەدییە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نیازم وابوو رێگەی شفتە ژێ نەدەم واتە: رێگە نەدەم كە بچنە لای ژنی منداڵ بەبەر وەلێ كە تەماشا دەكەم رۆمەكان‌و فارسەكان شتی وەها دەكەن‌و لەگەڵ ئەوەیشا زیان بە زاڕۆڵەكانیان ناگا، لەبەرئەوە منیش ئەمەم قەدەغە نەكرد (م).

٢١٤٦- وَجَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: يا رَسُولُ اللهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنِّي أَعْزِلُ عَنِ امْرَأَتِي. فَقَالَ: لِمَ؟ قَالَ: أُشْفِقُ عَلَى وَلَدِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لَوْ كَانَ ذَلِكَ ضَارًّا ضَرَّ فَارِسَ وَالرُّومَ. رواهما مسلم[٢].

پیاوێ هات گوتی: ئەی نێردراوی خودا! من ئاگربڕ (عەزل) لە ژنەكەم دەكەم، فەرمووی: ئەوە ئەگەر زیانی ببوایە زیانی بۆ فارسەكان‌و بۆ رۆمەكانیش دەبوو (م).

---

[١] مسلم. نكاح: ٣٥٤٩. أبو داوُد. طب: ٣٨٨٢. ترمذی. طب: ٢٠٧٦، ٢٠٧٧. نسائی. نكاح: ٣٣٢٦.

[٢] مسلم. نكاح: ٣٥٥٢.

## ٤٥) دروست نیە کە خاوەنی تازەی کەنیزەك بچێتە لای تا دەردەکەوێ کە لە خاوەنی پێشووی سکی نیەو منداڵدانی پاکە

## لا توطا المملوكة حتى تستبرأ

٢١٤٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَعَثَ يَوْمَ حُنَيْنٍ بَعْثًا إِلَى أَوْطَاسٍ فَلَقُوا عَدُوَّهُمْ فَقَاتَلُوهُمْ فَظَهَرُوا عَلَيْهِمْ وَأَصَابُوا مِنهُمْ سَبَايَا فَتَحَرَّجَ بَعْضُ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِنْ غِشْيَانِهِنَّ مِنْ أَجْلِ أَزْوَاجِهِنَّ الْمُشْرِكِينَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ {وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ} أَيْ فَهُنَّ لَكُمْ حَلاَلٌ إِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهُنَّ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ ومسلم والترمذي[1].

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕۆژی غەزای حونەین، لەشکرێکی نارد بۆ سەر ئەوطاس جا لەشکرەکە سەرکەوتن بەسەر دوشمنداو هەندێ ژنیان بەدیل لێ دەگرن.

جا هەندێ لە هاوڕێکان زات ناکەن کە جووت بن لەگەڵ ئەو ژنە دیلانەدا، گوایە ژنی مێرد دارن و مێردی بتپەرستیان هەیە.

جا خودای گەورە لەم بارەیەوە ئەم ئایەتەی نارد: {وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ} واتە: حەرام کراوە لەسەرتان ژنانی مێرددار کە لە پەنای شووی رەوادا نامووسی خۆیان دەپارێزن تەنیا ئەو ژنە خاوەن مێردانەیان لێ دەرچێ کە لە جەنگا داگیریان دەکەن و لە کافرانیان دەستێنن واتە: ئەو ژنە دیلانە کە عیددەی شەرعییان تەواو بوو ئیتر دروستە بۆ خاوەنە موسوڵمانەکەی بڕواتە لای. (د/م/ت).

٢١٤٨- وَمَرَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَهُوَ فِي غَزْوَةٍ بِامْرَأَةٍ مُجِحٍّ عَلَى بَابِ فُسْطَاطٍ فَقَالَ: لَعَلَّ صَاحِبَهَا أَلَمَّ بِهَا، قَالُوا: نَعَمْ. فَقَالَ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَلْعَنَهُ لَعْنَةً يَدْخُلُ مَعَهُ فِي قَبْرِهِ كَيْفَ يُوَرِّثُهُ وَهُوَ لاَ يَحِلُّ لَهُ وَكَيْفَ يَسْتَخْدِمُهُ وَهُوَ لاَ يَحِلُّ لَهُ. رَوَاهُ مسلم وأَبُو دَاوُدَ[2].

---

[1] مسلم. نكاح: ٣٥٩٣ — ٣٥٩٧. أبو داود. نكاح: ٢١٥٥. ترمذی. نكاح: ١١٣٢م. نسائی. نكاح: ٣٣٣٣.

[2] مسلم. نكاح: ٣٥٤٧. أبو داود. نكاح: ٢١٥٦.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە غەزایەکا لەبەر دەرگای رەشماڵێکەوە رەت بوو، ژنێکی سك پڕی دی، کە پێ‌و مانگی خۆی بوو، فەرمووی: رەنگە خاوەنەکەی چووبێتە لای؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: خەریکبووم لەعنەت‌و نەفرینێکی وای لێ بکەم کە پێیەوە بلکێ‌و لەگەڵیا بچێتە ناو گۆڕەکەیەوە، ئەوە چۆن دەبێ، ئەگەر دەیکا بە منداڵی میراتبەری خۆی دروست نیە چونکە وا دیارە کە ئەم سکە لەو نیەو لە پیاوی پێشووە خۆ ئەگەر دەشیکا بە بەندەو نۆکەری خۆی دیسان هەر دروست نیە چونکە هەڵدەگرێ‌و رێی تێ دەچێ کە ئەم ژنە تا شەش مانگی تریش ئەم سکە دانەنێ، لەم حاڵەتەدا رێی تێ دەچێ کە لە خۆی بێ کەواتە دەبوو (بۆ ئەوەی کە تووشی یەکێ لەم دوو نارەواییە نەبێ) چاوەڕوانیی بکردایە تا کاتی پاکەوەبوونی منداڵدان (م/د).

٢١٤٩- وَعَنْهُ وَعَنْ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تُوطَأُ حَامِلٌ حَتَّى تَضَعَ وَلاَ غَيْرُ ذَاتِ حَمْلٍ حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً[٣].

دیسان دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ژنی سك پڕ تا منداڵەکەی دانەنێ نابێ خاوەنە تازەکەی بڕواتە لای، ئەو کەنیزەکەیشی کە سکی نیە هەتا نەکەوێتە بێنوێژی‌و پاك نەبێتەوە بۆ خاوەنە تازەکەی دروست نیە بڕواتە لای (د/ت-سند صالح).

٢١٥٠- عَنْ رُوَيْفِعِ بْنِ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يَحِلُّ لاِمْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَسْقِيَ مَاءَهُ زَرْعَ غَيْرِهِ. وَلاَ يَحِلُّ لاِمْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَقَعَ عَلَى امْرَأَةٍ مِنَ السَّبْيِ حَتَّى يَسْتَبْرِئَهَا، بحيضةٍ. رواهما أَبُو دَاوُدَ والترمذي. والله أعلى وأعلم[٤].

رووەیفیعی کوڕی ثابیتی ئەنصاری (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر پیاوێ بەراستی ئیمان‌و باوەڕی بە خوداو

---

[٣] بسند صالح (شرحه).

[٤] بسند حسن (شرحه).

بە ڕۆژی دوایی هەیە بۆی دروست نیە کە بە ئاوی خۆی نەمامی کەسێکی تر ئاو بدا، هەروەها ئەو پیاوەشی کە بە تەواوی ئیمان و باوەڕی بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە بۆی دروست نیە کە بڕواتە لای ژنی تالانی جەنگی کافران (سەبایا) هەتا ئەو ژنە منالدانی پاك دەبێتەوەو دەردەکەوێ کە منداڵی تیا نیە لەسەر ئەم شێوەیە: ئەگەر سکی هەبوو بە دانانی سکەکە، ئەگەر لەبەر پیریی یا گچکەیی نەدەکەوتە سەر بێنوێژیی تا مانگێ چاوەڕوان بکا هەتا ئەو ژنە دەکەوێتە سەر بێنوێژی و پاك دەبێتەوە (د/ت-س/ح).

## ٤٦) باسی شەشەم: باسی مافی ژن و مێردایەتی. مافی مێرد لەسەر ژن:

## الباب السادس: في الحقوق الزوجية. ما للزوج على إمراته

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ}. (٤/٣٤).

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: پیاوان (لە خوداییەوە) سەرگەورەی ژنانن و خودا کردوونی بە گەورەو چاودێری سەریان بەهۆی ئەوەوە کە بە فەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەی باش باش و لەشی تەواناو هۆشی بەهێزو دینی تەواوی داونەتێ، سەرەڕای ئەمەیش پیاوان مەسرەفی ماڵ دەکەن و ماڵ و دارایی خۆیان خەرج دەکەن و بەرپرسیارن لە ماڵ و میوان و لە ژێواری خێزان.

٢١٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، وَلاَ تَأْذَنَ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ. رَوَاهُ الأربعة[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دروست نیە کە ژن ڕۆژووی سوننەت بگرێ ئەگەر مێردەکەی

---

[1] بخاری. نكاح: ٥١٩٢، ٥١٩٥، ٢٠٦٦، ٥٣٦٠، ٥١٩٢. مسلم. نكاح: ٢٣٦٧. أبو داود. زكاة: ١٦٨٧.

لەگەڵیا بێ مەگەر بەرەزای مێردەکەی هەروەها نابێ کە ژن ڕێگەی کەس بدا کە هاموشۆی بکاو بچێ بۆ ماڵی مەگەر بەرەزای مێردەکەی (ش/د/ت).

٢١٥٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ أَنْ تَجِيءَ، لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ. رَوَاهُ الثلاثة[٢].

دیسان دەڵێ: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر پیاو داوای سەرجێیی لە ژنەکەی بکاو ژنەکەی ملی نەدایە، ئەوە ئەوشەوە تا بەیانی فریشتەکان لەعنەت و نەفرین لەو ژنە دەکەن! (ش/د).

٢١٥٣- عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ الْحِيرَةَ فَرَأَيْتُهُمْ يَسْجُدُونَ لِمَرْزُبَانٍ لَهُمْ فَقُلْتُ: رَسُولُ اللّٰهِ أَحَقُّ بِذلِكَ فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقُلْتُ لَهُ ذلِكَ، فَقَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ مَرَرْتَ بِقَبْرٍ أَكُنْتَ تَسْجُدُ لَهُ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: فَلاَ تَفْعَلُوا لَوْ كُنْتُ آمِرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لأَحَدٍ لأَمَرْتُ النِّسَاءَ أَنْ يَسْجُدْنَ لأَزْوَاجِهِنَّ لِمَا جَعَلَ اللّٰهُ لَهُمْ عَلَيْهِنَّ مِنَ الْحَقِّ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي. ولفظه: لَوْ كُنْتُ آمِرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لأَحَدٍ لأَمَرْتُ المرأَةَ أَنْ تسجُدَ لزوجها[٣].

قەیسی کوڕی سەعد (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ چووم بۆ حیرە، تەماشامکرد وا کوڕنووش دەبەن بۆ شاسوارەکەیان منیش گوتم: ئەمە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بکرێ گەلێ باشترە جا کە هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەم پێش نیارەم عەرزکرد، فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): پێم بڵێ: ئەگەر لەلای گۆڕێکەوە ڕەتبووی کوڕنووشی بۆ دەبەی؟ گوتم: نەخێر. فەرمووی: دەشتی وا مەکەن. من ئەگەر فەرمانم بکردایە بە کەسێ کە کوڕنووش ببا بۆ کەسێکی تر فەرمانم دەکرد بە ژنان کە کوڕنووش ببەن بۆ مێردەکانیان، چونکە خودا ئەوەندە هەق و ماف و قەدرو ڕێزی بۆ پیاوان داناوە لەسەر ژنان (د/حاکم/ت- س/ح) گفتەی (ت): ئەگەر من فەرمانم

---

[٢] بخاری. نكاح: ٣٢٣٧، ٥١٩٤. مسلم. نكاح: ٣٥٢٤. أبو داوْد. نكاح: ٢١٤١.

[٣] بسند حسن (شرحه).

بکردایە بە کەسێ کە کڕنووش ببا بۆ کەسێ ئەوا فەرمانم دەکرد بە ژن کە سوجدە ببا بۆ مێردەکەی.

٢١٥٤- عَنْ ابْنِ عَمْرِو بْنِ الأَحْوَصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: ألا إِنَّ لَكُمْ عَلى نِسَائِكُمْ حَقًّا وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا فَأَمَّا حَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ فَلاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ وَلاَ يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ أَلاَ وَحَقُّهُنَّ عَلَيْكُمْ أَنْ تُحْسِنُوا إِلَيْهِنَّ فِي كِسْوَتِهِنَّ وَطَعَامِهِنَّ. رَوَاهُ الترمذي وصححه[٤].

عەمری کوڕی ئەحوەص (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بزانن کە هەم ئێوە مافتان هەیە لەسەر ژنەکانتان، وە هەم ژنەکانتان مافیان هەیە لەسەر ئێوە! مافی ئێوەیە لەسەر ژنەکانتان کە نەهێڵن ئەو کەسانەی کە ئێوە حەزیان لێ ناکەن بێنە سەر بەڕەتان یا بێن بۆ ماڵتان.

بزانن کە مافی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە کە بە جوانی جل و بەرگیان بۆ بکەن و بە جوانی بە خێویان بکەن (تیرمیذی (خودای لێ رازی بێ) ریوایەتی کردووەو بە صەحیحی داناوە).

٢١٥٥- عَنْ طَلْقِ بْنِ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا الرَّجُلُ دَعَا زَوْجَتَهُ لِحَاجَتِهِ فَلْتَأْتِهِ وَإِنْ كَانَتْ عَلَى التَّنُّورِ. رَوَاهُ الترمذي (بسند حسن) والنسائي[٥].

طەلقی کوڕی عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر پیاوو کارێکی خۆی بە ژنەکەی هەبوو، وە بانگی کرد بۆ ئەوکارە بابچێ بۆ کنی ئەگەرچی لەسەر تەندووریش بێ (ت-س/ح-ن).

٢١٥٦- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: أَيُّمَا امْرَأَةٍ مَاتَتْ وَزَوْجُهَا عَنْهَا رَاضٍ دَخَلَتِ الْجَنَّةَ. رَوَاهُ الترمذي والحاكم[٦].

---

[٤] صحيح عند الترمذي.

[٥] بسند حسن.

ئومـو سـەلەمە (خـودای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) فەرمووی: هەر ئافرەتێ بمرێ و مێردەکەی لێی رازی بێ دەچێتە بەهەشت (ت-س/ح-حاکم).

٢١٥٧- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوْجَهَا فِي الدُّنْيَا إلاَّ قَالَتْ زَوْجَتُهُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ: لاَ تُؤْذِيهِ قَاتَلَكِ اللَّهُ فَإِنَّمَا هُوَ عِنْدَكِ دَخِيلٌ يُوشِكُ أَنْ يُفَارِقَكِ إِلَيْنَا. رَوَاهُ الترمذي وحسَّنه[7].

موعـازی کـوڕی جەبـەل (خـودای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر ژنێ لە جیهاندا کە ئازاری مێردەکەی دەدا، ژنەکەی تری- ئەوەی کە لە پەرییە نازدارەکانی بەهەشتە- لەوێوە دەڵێ: ئازاری مەدە، خوا بچێت بەگژتا، ئەوە لای تۆ رێبوارە، زۆری نەماوە کە تۆ بەجێ بێڵێ و بێ بۆ لای خۆمان! (ت:ح).

## ٤٧) مافی ژن لەسەر مێردی: (حقوق الزوجة على زوجها)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ}. (٢٢٨/٢).

واتە: یەزدانی مەزن دەفەرموێ: پیاوو ژن بەپێی شەریعەت هەق و مافیان چون یەك لەسەر یەکتری هەیە، تەنیا ئەوەندە هەیە کە پیاوان یەك پلەیان هەیە بەسەر ژنانەوە.

٢١٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِي جَارَهُ، وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا، فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاَهُ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ

---

[6] رواه الترمذی بسند حسن (شرحه).

[7] حسن عند الترمذی.

أَعْوَجَ فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا. رَوَاهُ الشيخان والترمذي وفي رواية: إِنَّ الْمَـرْأَةَ خُلِقَـتْ مِنْ ضِلَعٍ لَنْ تَسْتَقِيمَ لَكَ عَلَى طَرِيقَةٍ فَإِنِ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَبِهَا عِـوَجٌ وَإِنْ ذَهَبْـتَ تُقِيمُهَـا كَسَرْتَهَا وَكَسْرُهَا طَلاَقُهَا [١].

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ رازی بـێ) لـە حەزرەتـەوە دەفـەرموێ (دروودی خـودای لەسەربێ): هەر کەسێ بە راستی باوەڕی بە خوداو بە رۆژی دوایی هەیە نابێ ئازاری دراوسێی خۆی بدا ئامۆژگاری بێ لێتان زۆر باش بن بۆ ژنـان، چونکە ژنـان لـە پەراسووی ئادەم دروست کراونو لـە بنەڕەتـەوە چـەوتن وە لارتـرین شوێنی پەراسویش نووکەکەیەتی، جا ئەگەر بتەوێ راستی بکەیتـەوە راسـت نابێتەوە بەڵام دەشکێ، ئەگـەر دەستیشی لێ نـەدەی ئـەوا بـەلاری دەمێنێتـەوە هەچۆنێ بێ بوونی لە نەبوونی باشترە کەوابوو وەصییەت بێ لێتان زۆر باش بـن بـۆ ئافرەتـان (ش/ت) لـە گێڕانەوەیـەکا: ژن لـە پەراسـوو دروسـت کـراوەو چەوتییەکەی بەشێکە لە سروشتیو تێکلاوی خوێنو بیرو هۆشـی بـووە، جا لەبەرئـەوە تـا سـەر لەسـەر یـەك بـار نامێنـێو زوو زوو دەگـۆڕێ جـا ئەگـەر دەتـەوێ رابوێری لەگـەڵیا ئـەوا دەبـێ بـە لاریـیو خـواریی رابـوێری لەگـەڵیا، چـونکە ئەگـەر بتـەوێ راسـتی بکەیتـەوە بـەتۆ راسـت نابێتـەوە، بـەڵکوو لـە دەستتا دەشکێ" شکاندنەکەیشی برێتییە لە تەڵاقدانی!

٢١٥٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: لاَ يَفْرَكْ مُـؤْمِنٌ مُؤْمِنَـةً إِنْ كَـرِهَ مِنْهَا خُلُقًا رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ. رَوَاهُ مسلم[٢].

دیسان ئەو (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): پیـاوی موسـوڵمان نابـێ بێـزار ببـێ لـە ژنـی موسـوڵمان چـونکە ئەگـەر خوویەکیشی بەدڵی نەبێ خوویەکی تری بەدڵیەتی! (م).

---

[١] بخاری. أحادیث الأنبیـاء: ٣٣٣١، ٥١٨٤، ٥١٨٦ + ٥١٨٥، ٦٠١٨، ٦٣٣٦، ٦١٣٨، ٦٤٧٥. مـسلم. رضـاع: ٣٦٣. ترمذی. طلاق: ١١٨٨.

[٢] مسلم. رضاع: ٣٦٢٣.

٢١٦٠- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: لَوْلاَ بَنُو إِسْرَائِيلَ لَمْ يَخْبُثِ الطَّعَامُ وَلَمْ يَخْنَزِ اللَّحْمُ وَلَوْلاَ حَوَّاءُ لَمْ تَخُنْ أُنْثَى زَوْجَهَا الدَّهْرَ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

دیسان ئەو لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر لە بنەڕەتا بەهۆی جوولەکەکانەوە نەبوایە هەرگیز خواردەمەنی نە دەگەنیو گۆشت بۆگەن نەدەبوو چونکە لەکاتی خۆیا خودا گەزۆو گۆشتی شەلاقەی بۆ ناردنو فەرمووی: لەم گۆشتو گەزۆیە بخۆن بەڵام لێیان پاشەکەوت مەکەن، کەچی ئەوان فەرمانەکەی خودایان شکانو لێیان هەڵدەگرتن بۆ لەوەو پاش، ئیتر گۆشتو گەزۆکە گەنین، وە لەوەوە گەنینو ترشانی خۆراك داکەوت تا ئەمڕۆ وە ئەگەر بەهۆی حەوواشەوە نەبوایە هەتا هەتایە هیچ ژنێ گزیو ناپاکیی لە مێردی خۆی نەدەکرد چونکە حەواء لە بەهەشتا ئادەمی فریوداو لەبەری درەختە قەدەغەکەی دەرخوارد داو بوو بەهۆی ئەوە کە لە بەهەشت دەرکران (ش).

٢١٦١- عَنْ مُعَاوِيَةَ الْقُشَيْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا حَقُّ زَوْجَةِ أَحَدِنَا عَلَيْهِ؟ قَالَ: أَنْ تُطْعِمَهَا إِذَا طَعِمْتَ وَتَكْسُوَهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ وَلاَ تَضْرِبِ الْوَجْهَ وَلاَ تُقَبِّحْ وَلاَ تَهْجُرْ إِلاَّ فِي الْبَيْتِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٤].

موعاوییەی ئەل-قوشەیری (خودای لێ رازی بێ) گوتی: عەرزی پێغەمبەرم کرد (درودی خودای لەسەربێ) قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! مافی ژن لەسەر مێرد چییە؟ فەرمووی: وەك خۆت نانو بەرگی بۆ بکەو لێی مەدەو وەکوو ئاژەڵ دارکاریی مەکە، ئەگەر دنیابوو لێشت دا لە دەموچاوی مەدەو قسەی ناشیرینی پێ مەڵێ، ئەگەر جێگەیشت لێ جیاکردەوە لەبەر هۆیەکی رەوا ئەوا لە هۆدەیەکا بەتەنیا دایمەنێ (د-س/صالح-ن).

---

[٣] بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٣٩٩. مسلم. رضاع: ٣٦٣٦.

[٤] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

٢١٦٢- عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: إِذَا أَطَالَ أَحَدُكُمُ الْغَيْبَةَ فَلاَ يَطْرُقْ أَهْلَهُ لَيْلاً [٥].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر کەسێکتان ماوەیەکی زۆر دابڕان لە کەسوکارتان بەشەو لەناکاوا مەدەن بەسەریانا (ش/د/ت/ن).

٢١٦٣- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَكْرَهُ أَنْ يَأْتِيَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ طُرُوقًا[٦].

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) حەزی لەوە نەدەکرد کە پیاو لەناکاوا بەشەو هەڵکوتێتە سەر خێزانی خۆی (ش/د/ت/ن).

٢١٦٤- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: أَمْهِلُوا حَتَّى تَدْخُلُوا لَيْلاً لِكَيْ تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ وَتَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ. روى الأصول الخمسة هذه الثلاثة. والله أعلى وأعلم[٧].

دیسان جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ لەسەفەر دەگەڕێنەوە ئەگەر بەشەو دەگەیشتنە جێ وا بکەن کە لەپێشدا ئاگاداریان بکەنەوە، هەتا ژن سەری خۆی شانە بکاو دەرمانی حەمام بەکاربێنێ (ش/د/ت/ن).

٢١٦٥- قال في الشرح: ومنه حديث مسلم: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنْ يَطْرُقَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ لَيْلاً يَتَخَوَّنُهُمْ أَوْ يَلْتَمِسُ عَثَرَاتِهِمْ[٨].

---

[٥] بخاری. نکاح: ٥٢٤٤، ٥٢٤٦. مسلم. إیمارة: ٤٩٤٤. أبو داوُد. جهاد: ٢٧٧٧.

[٦] بخاری. عمرة: ١٨٠٠. مسلم. إیمارة: ٤٩٢٩. أبو داوُد. جهاد: ٢٧٧٦.

[٧] بخاری. نکاح: ٥٢٤٥، ٥٢٤٦، ٤٤٣، ١٨٠١، ٢٠٩٧، ٢٣٠٩، ٢٣٨٥، ٢٣٩٤، ٢٤٠٦، ٢٤٧٠، ٢٦٠٣، ٢٦٠٤، ٢٧١٨، ٢٨٦١، ٢٩٦٧، ٣٠٨٧، ٣٠٨٩، ٣٠٩٠، ٤٠٥٢، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٤، ٥٢٤٥، ٥٢٤٦، ٥٢٤٧، ٥٢٦٧، ٦٣٨. مسلم. رضاع: ٣٦٢٥. أبو داوُد. جهاد: ٢٧٧٨.

[٨] مسلم. إمارة: ٤٩٤٦، ٤٩٤٧.

لە شەرحەکەدا دەڵێ (خودای لێ رازی بێ): هەر لەم بابەتەیە ئەو حەدیثەی موسلیم (خودای لێ رازی بێ) کە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رێگەی ئەوەی نەداوە کە پیاو بەشەو لەناکاودا خۆی بکا بە مالاً، مەبەستی ئەوە بێ کە ژنەکەی تاقی بکاتەوە، ئایا ناپاکی لێ دەکا یا نا، یا لە هەڵەو سەرسمی ژنەکەی بگەڕێ.

## ٤٨) ژن خزمەتی ماڵی خۆی دەکاو بۆکاری خۆشی (بەقەدرو رێزەوە) دەڕواتە دەرەوە: (الزوجة تخدم بيتها وتخرج للحاجة مع الإحتشام)

٢١٦٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: خَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ لَيْلاً فَرَآهَا عُمَرُ فَعَرَفَهَا فَقَالَ: إِنَّكِ وَاللَّهِ يَا سَوْدَةُ مَا تَخْفَيْنَ عَلَيْنَا، فَرَجَعَتْ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَهْوَ فِي حُجْرَتِي يَتَعَشَّى، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، وَإِنَّ فِي يَدِهِ لَعَرْقًا، فَأُنْزِلَ عَلَيْهِ فَرُفِعَ عَنْهُ وَهُوَ يَقُولُ: قَدْ أُذِنَ لَكُنَّ أَنْ تَخْرُجْنَ لِحَوَائِجِكُنَّ. رَوَاهُ الشيخان[1].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: شەوێ سەودەی کچی زەمعە کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، بۆ کارێکی خۆی دەچێتە دەرەوە، عومەر دەیبینێ و دەیناسێ و دەڵێ: بەخودا ئەی سەودە! دەتناسمەوە! سەودەیش هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە لە هۆدەکەی من بوو، شێوی دەکرد، قسەکەی عومەری بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەوکاتەدا گرتکێکی بە دەستەوە بوو، گرتکەکەی دانەنا کە سرووشی بۆ هات، کە حاڵەتی سروش بۆ هاتن بەری دا فەرمووی: ریگەتان پێ دراوە ئەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر، وە هەروەها ئەی ژنانی موسوڵمانان! کە بۆ کارو فرمانی خۆتان لەماڵ دەرچن (ش).

---

[1] بخاري. وضوء: ١٤٦، ١٤٧، ٤٧٩٥، ٥٢٣٧، ٦٢٤٠. مسلم. سلام: ٥٦٣٣.

٢١٦٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ فَإِذَا خَرَجَتِ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ [٢].

عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ژن سەرتاپا شەرمگاو عەورەتە، کە لەماڵ دەردەچێ شەیتان چاوی تێ دەبڕێو تەکی دەکەوێ تا فرصەتی لێ بێنێو لە خشتەی بەرێ (ت-س/ص).

٢١٦٨- عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَثَلُ الرَّافِلَةِ فِي الزِّينَةِ فِي غَيْرِ أَهْلِهَا كَمَثَلِ ظُلْمَةِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لاَ نُورَ لَهَا. رواهما الترمذي[٣].

مەیموونەی کچی سەعد (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەو ژنەی کە خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ غەیری مێردەکەی وەك تاریکی رۆژی قیامەت وایە دەنك رووناکی تیا نیە! (ت-سند ضعيف).

٢١٦٩- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ فَاطِمَةَ (عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ) أَتَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تَشْكُو إِلَيْهِ مَا تَلْقَى فِي يَدِهَا مِنَ الرَّحَى، وَبَلَغَهَا أَنَّهُ جَاءَهُ رَقِيقٌ فَلَمْ تُصَادِفْهُ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ، فَلَمَّا جَاءَ أَخْبَرَتْهُ قَالَ: فَجَاءَنَا وَقَدْ أَخَذْنَا مَضَاجِعَنَا، فَذَهَبْنَا نَقُومُ فَقَالَ: عَلَى مَكَانِكُمَا فَقَعَدَ بَيْنِي وَبَيْنَهَا حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمَيْهِ عَلَى بَطْنِي فَقَالَ: أَلاَ أَدُلُّكُمَا عَلَى خَيْرٍ مِمَّا سَأَلْتُمَا، إِذَا أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا فَسَبِّحَا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَاحْمَدَا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ. رَوَاهُ الأربعة. نسأل الله التوفيق. والله أعلى وأعلم[٤].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: فاتیمە ئاشتی خودایان لەسەر بێ، بیستی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەندەی بۆ هاتووە، جا چوو بۆ لای تا سکاڵای خۆی لەلا بکا کە ناولەپی دەسکی دەستاڕ چۆن تلۆقی پی کردووە

[٢] رَوَاهُ الترمذی بسند حسن (شرحه).

[٣] رَوَاهُ الترمذی بسند صعيف (شرحه).

[٤] بخاری. فرض الخمس: ٣١١٣، ٣٧٠٥، ٥٣٦١، ٥٣٦٢، ٦٣١٨. مسلم. ذکرو دعاء: ٦٨٥٣. ابُو داوُد. أدب: ٥٠٦٢.

**ئەوەندەی باداوە، سا بەشكوو حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **بەندەیەكی بداتێ بۆ ئیشكردنی ناومالْ لەباتی ئەو، بەلاّم فاتیمە كە دەچێ حەزرەت لەمالْ نابێ فاتیمەیش باسەكە لە عائیشە دەگەیەنێ و دەگەڕێتەوە، جا كە پێغەمبەر دێتەوە عائیشە قسەی بۆ دەكا عەلی گوتی: جا حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **شەوێ هات بۆ لامان، كە تەشریفی هات ئێمە لەسەر نوێن پاڵكەوتبووین ویستمان لەبەری هەڵسین، فەرمووی: لە شوێنی خۆتان بن ئینجا لە ناوەندی هەردوكمانا دانیشت بەشێوەیێ كە ساردی قاچی دەیدا لە سكم، ئینجا فەرمووی: باشتێكتان فێربكەم كە لەوە باشتربێ كە ئێوە داوای دەكەن لەمن: كاتێ كە رادەكشێن لە سەرجێ سیی و سێ (سبحان الله) و سیی و سێ (الحمد لله) و سیی و چوار (الله اكبر) بكەن، ئەمە بۆ ئێوە گەلێ باشترە لە نۆكەر (ش/د/ت/ن).**

## ٤٩) داستانی ئوم زەرع: (حديث أم زرع)

**٢١٧٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: جَلَسَ إِحْدَى عَشْرَةَ امْرَأَةً، فَتَعَاهَدْنَ وَتَعَاقَدْنَ أَنْ لاَ يَكْتُمْنَ مِنْ أَخْبَارِ أَزْوَاجِهِنَّ شَيْئًا. قَالَتِ الأُولَى: زَوْجِي لَحْمُ جَمَلٍ، غَثٌّ عَلَى رَأْسِ جَبَلٍ، وَعْرٍ لاَ سَهْلٍ فَيُرْتَقَى، وَلاَ سَمِينٍ فَيُنْتَقَلُ. قَالَتِ الثَّانِيَةُ: زَوْجِي لاَ أَبُثُّ خَبَرَهُ، إِنِّي أَخَافُ أَنْ لاَ أَذَرَهُ، إِنْ أَذْكُرْهُ أَذْكُرْ عُجَرَهُ وَبُجَرَهُ. قَالَتِ الثَّالِثَةُ: زَوْجِي الْعَشَنَّقُ، إِنْ أَنْطِقْ أُطَلَّقْ وَإِنْ أَسْكُتْ أُعَلَّقْ. قَالَتِ الرَّابِعَةُ: زَوْجِي كَلَيْلِ تِهَامَةَ، لاَ حَرٌّ، وَلاَ قُرٌّ، وَلاَ مَخَافَةَ، وَلاَ سَآمَةَ. قَالَتِ الْخَامِسَةُ: زَوْجِي إِنْ دَخَلَ فَهِدَ، وَإِنْ خَرَجَ أَسِدَ، وَلاَ يَسْأَلُ عَمَّا عَهِدَ. قَالَتِ السَّادِسَةُ: زَوْجِي إِنْ أَكَلَ لَفَّ، وَإِنْ شَرِبَ اشْتَفَّ، وَإِنِ اضْطَجَعَ الْتَفَّ، وَلاَ يُولِجُ الْكَفَّ لِيَعْلَمَ الْبَثَّ، قَالَتِ السَّابِعَةُ: زَوْجِي غَيَايَاءُ أَوْ عَيَايَاءُ طَبَاقَاءُ، كُلُّ دَاءٍ لَهُ دَاءٌ، شَجَّكِ أَوْ فَلَّكِ أَوْ جَمَعَ كُلاًّ لَكِ. قَالَتِ الثَّامِنَةُ: زَوْجِي الْمَسُّ مَسُّ أَرْنَبٍ، وَالرِّيحُ رِيحُ زَرْنَبٍ. قَالَتِ التَّاسِعَةُ: زَوْجِي رَفِيعُ الْعِمَادِ، طَوِيلُ النِّجَادِ، عَظِيمُ الرَّمَادِ، قَرِيبُ الْبَيْتِ مِنَ النَّادِ. قَالَتِ الْعَاشِرَةُ: زَوْجِي مَالِكٌ وَمَا مَالِكٌ، مَالِكٌ خَيْرٌ مِنْ ذَلِكِ، لَهُ إِبِلٌ كَثِيرَاتُ الْمَبَارِكِ قَلِيلاَتُ الْمَسَارِحِ، وَإِذَا سَمِعْنَ صَوْتَ الْمِزْهَرِ أَيْقَنَّ أَنَّهُنَّ هَوَالِكُ. قَالَتِ الْحَادِيَةَ عَشْرَةَ: زَوْجِي أَبُو زَرْعٍ فَمَا أَبُو زَرْعٍ أَنَاسَ مِنْ**

حُلِيّ أُذُنَيَّ، وَمَلأَ مِنْ شَحْمٍ عَضُدَيَّ، وَبَجَّحَنِي فَبَجِحَتْ إِلَيَّ نَفْسِي، وَجَدَنِي فِي أَهْلِ غُنَيْمَةٍ بِشِقٍّ، فَجَعَلَنِي فِي أَهْلِ صَهِيلٍ وَأَطِيطٍ وَدَائِسٍ وَمُنَقٍّ، فَعِنْدَهُ أَقُولُ فَلاَ أُقَبَّحُ وَأَرْقُدُ فَأَتَصَبَّحُ، وَأَشْرَبُ فَأَتَقَنَّحُ، أُمُّ أَبِي زَرْعٍ فَمَا أُمُّ أَبِي زَرْعٍ عُكُومُهَا رَدَاحٌ، وَبَيْتُهَا فَسَاحٌ، ابْنُ أَبِي زَرْعٍ، فَمَا ابْنُ أَبِي زَرْعٍ مَضْجِعُهُ كَمَسَلِّ شَطْبَةٍ، وَيُشْبِعُهُ ذِرَاعُ الْجَفْرَةِ، بِنْتُ أَبِي زَرْعٍ فَمَا بِنْتُ أَبِي زَرْعٍ طَوْعُ أَبِيهَا، وَطَوْعُ أُمِّهَا، وَمِلْءُ كِسَائِهَا، وَغَيْظُ جَارَتِهَا، جَارِيَةُ أَبِي زَرْعٍ، فَمَا جَارِيَةُ أَبِي زَرْعٍ لاَ تَبُثُّ حَدِيثَنَا تَبْثِيثًا، وَلاَ تُنَقِّثُ مِيرَتَنَا تَنْقِيثًا، وَلاَ تَمْلأُ بَيْتَنَا تَعْشِيشًا، قَالَتْ خَرَجَ أَبُو زَرْعٍ وَالأَوْطَابُ تُمْخَضُ، فَلَقِيَ امْرَأَةً مَعَهَا وَلَدَان لَهَا كَالْفَهْدَيْنِ يَلْعَبَان مِنْ تَحْتِ خَصْرِهَا بِرُمَّانَتَيْنِ، فَطَلَّقَنِي وَنَكَحَهَا، فَنَكَحْتُ بَعْدَهُ رَجُلاً سَرِيًّا، رَكِبَ شَرِيًّا وَأَخَذَ خَطِّيًّا وَأَرَاحَ عَلَيَّ نَعَمًا ثَرِيًّا، وَأَعْطَانِي مِنْ كُلِّ رَائِحَةٍ زَوْجًا. قَالَ كُلِي أُمَّ زَرْعٍ، وَمِيرِي أَهْلَكِ فَلَوْ جَمَعْتُ كُلَّ شَيْءٍ أَعْطَانِي مَا بَلَغَ أَصْغَرَ آنِيَةِ أَبِي زَرْعٍ. قَالَتْ عَائِشَةُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): كُنْتُ لَكِ (في الألفة والوفاءِ لا في الفرقة والجفاءِ) كَأَبِي زَرْعٍ لأُمِّ زَرْعٍ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي. نسأل الله التوفيق. والله أعلى وأعلم[١].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: یازدە ژن کۆڕی قسەی لێ دەگرن، وە بەڵێن دەدەن بە یەكو پەیمان دەبەستن کە هیچ شتێ لە دەنگوباسی مێردەکانیان نەشارنەوە. ژنی یەکەمیان دەڵێ: مێردەکەی من گۆشتە لەڕکی وشترە، وابەسەر لووتکەی شاخێکەوە، نە شاخەکە سەرکەوتنی ئاسانەو نە گۆشتەکەش ئەوەندە قەڵەوە تا کەسێ بچێ بۆیو بیبات بۆ خۆی واتە: هەم ڕژدو چرووکەو هەم چەمووشو بەدخووە. ژنی دووەمیان دەڵێ: هەواڵی مێردەکەم بڵاو ناکەمەوە چونکە ناوێرم ناوی بەرم ئەگینا شەنو کەوی دەکەمو ناوی دەزڕێنم! واتە: نەنگ نییە تیا نەبێ. سێیەمیان دەڵێ: مێردەکەی من قوچێکی ناقۆڵای نەگریسە ئەگەر نق بکەم تەلاقم دەدا، ئەگەر نقەش نەکەم ئەوا وەك بێوەژن بەسراوەمەتەوە نە خۆی بە مێرد دەچێو نە بەرەڵاشم دەکا تا بۆ خۆم شوویەکی تر بکەم. چوارەمیان دەڵێ: مێردەکەی من وەك شەوی تیهامە فێنكو خۆشە، نە ساردەو نە گەرمە، بەبێ ترسو بەبێ

---

[١] بخاری. نكاح: ٥١٨٩. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٢٥٥.

بێـزاری دوو بــە دوو بــۆ خۆمــان رادەبــوێرین، ئینجــا پێنجــەمیان دەڵــێ: مێردەکەی من لەماڵەوە وێزە هەر دەکاو دەخەوێ و لە دەرەوە شێرەو ئازایەو چاوتێرەو لەشتی ناومال ناپرسێتەوە! شەشەمیان دەڵێ: مێردەکەی من بۆ خواردن لرفەی دێ و لە خواردنەوەدا بەشی کەس ناداو کە دەخەوێ خۆی گرمۆڵە دەداو دەس ناگێرێ تا لە پەژارەی دڵ تێ بگا واتە: زۆر خۆرو بەدفەڕو رژدو دژ کردنە! ژنی حەوتەم دەڵێ: مێردەکەی من دژێکی ئێسك قورسی دژپەڕینە، لاژگ و گەوج و گێلە، هەموو دەردێ بۆ ئەو دەردەو دەردەدارو دەغەزارەو دەرد نیە کە نیگرتبێ! لەگەڵ ئەمەیشدا هەروا بە ئاسانی لە دەستی رزگارت نابێ، یا سەرت دەشکێنێ، یا شوێنێکت دەقرنجێنێ، یا تووشی چورتمێکی گەورەترت دەکا!

ژنی هەشتەم دەڵێ: مێردەکەی من نەرم و نۆڵە وەك کەروێشك، بۆن خۆشە وەك زەعفەران. ژنی نۆهەم دەڵێ: مێردەکەی من خانەدان و نانبدەو جەوانمەردو بالا بەرزو شۆخ و شەنگەو ئالای بەخشندەیی لێ هەڵکردووەو خانەی نزیکی یانەیەو سەردارو ئازاو میوان پەروەرو هۆشمەندە!

ژنی دەهەم دەڵێ: مالیکی مێردی من چۆن مالیکێکە! گەلێ لەم پیاوانە باشترە، وشترو پەچە وشتری زۆرە بەلام پاوان و پاکژی کەمە چونکە بۆ سەربڕینی راگرتوون نەوەك بۆ بەخێوکردن کە وشترەکان دەنگی کەمانچە دەبیستن لێیان روون دەبێ کەوا سەریان دەبڕن بۆ میوانی تازە.

ژنی یازدەهەم دەڵێ: ئەبو زەرعی مێردی من چۆن ئەبو زەرعێکە! هەردوو گوێچکەی پڕکردووم لە گوارەو خشڵ، وە بازووی پڕکردووم لە گۆشت و بەز، ئەوەندە نازی گرتووم و ئەوەندە نازی کێشاوم تا نازدارو نازەنین بووم، لەناو خێزانێکی هەژاری مەڕداردا بووم لە پەنایەکا بووین، ئەو هێنامیە ناو خێزانێکی تێرو پڕی دەوڵەمەندی داراوە، کە بە چەندان رەوگ و رانە وشترو گاگەل و خەلەو خەرمانیان هەبوو.

کە قسەم دەکرد لەگەڵیا کەس نەیدەدایەوە بە دەمما، بەشەو کە دەخەوتم تا بەیانی لەخەو هەڵنەدەسام چونکە کارەکەرو نۆکەری زۆرم هەبوو

ئەوان ئیشی ناو ماڵیان دەکرد وە تا دەمتوانی لە جۆرەها شەرابی نایاب دەمخواردەوە.

دایکی ئەبو زەرع چۆن ژنێك بوو! چۆن خان و مانێ بوو! خورجەکانی هەمیشە پڕبوون وهەم قەبەو هەم کەشخە بوون و هەموو کاتێ پڕبوون لە گەوهەرو زێڕو زیوو جلی ئاڵاو واڵا وە ماڵەکەی پان و بۆڕ بوو وە بۆ هیچ شتێ دانەدەما.

کوڕەکەی ئەبو زەرع چۆن کوڕێك بوو! کەڵەگەت و قەدباریك، پاکخۆرو کەمخۆر، بەژن و باڵای ئەوەندە شووش و قەڵەمی ئەوەندە ڕێك بوو لە شوێن تڵیشی پەلکە خورمایەکا جێگەی دەبۆوە، لەبەر کەمخۆری لە دەستی کارژەڵەیێ لەبەری دەمایەوە!

کچەکەی ئەبو زەرع چۆن کچێك بوو! گوێڕایەڵ و فەرمان بەربوو، لە فەرمانی باوك و دایکی دەرنەدەچوو، بۆ جوانی وێنەی نەبوو، خرپنەو خەپەتۆڵ بوو، خڕو خەپان بوو، وە لەبەر شۆخ و شەنگی و ناسك و نازداری و داوێنپاکی هەوێکەی رقی لێ دەکێشا.

کەنیزەکەکەی ئەبو زەرع چۆن کەنیزەکێك بوو!! نە قسەمانی دەبردە دەرەوەو نە ئازووقەو دانەوێڵەی دەپژاندین و نە ناوماڵی پڕ دەکرد لە پووشکەو پەڵاش زمان پاك و دڵسۆزو پاك و تەمیزو ئیش جوان بوو، ئوممو زەرع گوتی: مەشکە دەژەندرا، ڕۆژێ ئەبو زەرع دەرچوو بۆ دەرەوە، تووشی ئافرەتێ دەبێ، دوو کوڕی خۆی بەبەرەوە دەبێ، وەك دوو بەچکە وێز مەمکەکانی دایکیان دەمژن، کە وەك دوو هەنار وا دەبن خڕو پڕ بەدەست دەبن ئیتر منی تەڵاقداو ئەوی مارەکرد بە هیوای ئەوەی منالی وەجاخزادەی لێی ببێ وەك ئەو دوو منالە ئینجا منیش – لە دوا ئەو – شووم کرد بە پیاوێکی خانەدانی دارا، سواری ئەسپێکی نایابی خۆشڕەو بوو، وەرمێکی چاکی هەڵگرت، وە سەر لەئێوارێ ئاژەڵێکی بێ شوماری هێنایەوە بۆم، وە لە هەموو چەشنێ سەرو جووتی دامێ، وە گوتی: ئەی ئوموو زەرع: لەهیچ دەست مەگرەوە نە لە خۆت و نە لە کەسوکارت.

ئوممـو زەرع گـوتی: بـەڵام ئـەم هـەموو نـازو نیعمەتـەی ئـەم نـادا لـە گۆێچکەیێ نانی ئەبو زەرع!! چ جای ئەو هەموو خێرو بێرەی کە هەی بوو.

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی پێـی: ئـەی عائیشه! ئـەبو زەرع چۆن بـووە بۆ ئوممـوو زەرع منـیش بـۆ تـۆ وام بەڵام لە نازگرتنو قەدر زانیندا نەوەك لە جیابوونەوەو تەڵاقداندا (ش/ن).

## ٥٠) باسی حەوتەم: باسی نۆرەکاریی (قەسم) لە نێوانی هاوسەراندا

## الباب السابع: في القسم بين الزوجات

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلَن تَسْتَطِيعُواْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ النِّسَاء وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلاَ تَمِيلُواْ كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ وَإِن تُصْلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا}

یەزدانی مەزن لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ئێوە هـەرگیز نـاتوانن کە یەکسانیو هاوکێشی بکـەن لـە هـەموو شـتێکا لەگـەڵ ژنـەکانتانا، هەرچـەن تەواو حەریصو سووریش بن لەسەر ئەم کارە، بەڵام بەپێی توانا لا مـەدەن لە ڕێڕەوی عـەدڵو دادگـەری لـە ناویانـا، بـە لادانێکـی تـەواوی وا کـە هەندێ لە ژنـەکانتان وەکـوو ژنـی بەسـتراوەیان لێ بـێ، بەناو مێردیـان هـەبێ، بـەڵام لـە ڕاستیدا وەك ژنی تەڵاق دراو وابن، جا ئەگەر هەڵەی خۆتـان ڕاسـت بکەنـەوەو خۆتان لە خراپە بپارێزن ئەوە خودا تاوان پۆشو میهرەبانە.

٢١٧١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ كَانَـتْ لَهُ إِمْرَأَتَانِ فَمَالَ إِلَى احداهُما جاء يومَ القيامة وشقّه مائِلٌ[1].

ئـەبو هـورەیره (خـودای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبــەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) فەرمووی: کەسێ دوو ژنی هەبێ بەڵام یەکێکیانی پتر بوێو لایەنی ئەو زیاتر بگـرێ ئـەوە لـە ڕۆژی قیامـەتا کـە دێـت لایـەکی لەنگـە (وەك پیـاوی ئیفلـیج) (د/ت/ن-سند صالح).

[1] بسند صالح ،شرحه).

٢١٧٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقْسِمُ بَيْنَ نسائهُ، فَيَعْدِلُ وَيَقُولُ اللَّهُمَّ هَذَا قَسْمِي فِيمَا أَمْلِكُ فَلاَ تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ وَلاَ أَمْلِكُ. رواهما أصحاب السُّنن[٢].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نۆرەکاری و لەنگەری دادگەریی رادەگرت لەناو ژنەکانیا و وەك یەك نازی دەگرتن و وەك یەك جل و بەرگی بۆ دەکردن و وەك یەك بەشەو لەلایان دەمایەوە، ئینجا دەیفەرموو: خودایا! ئەمە نۆرەکاری منەو من هەر ئەم دابەشکردنەم لە دەست دێ، ئیتر لەسەر ئەوەی کە بە دەستی تۆیەو دەستەلاتی منی تیانییە کە حەزو مەیلی دڵە سەرکۆنەو سەرزەنیشتم مەکە (د/ت/ن-سند صالح).

٢١٧٣- وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لاَ يُفَضِّلُ بَعْضَنَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْقَسْمِ مِنْ مُكْثِهِ عِنْدَنَا وَكَانَ قَلَّ يَوْمٌ إِلاَّ وَهُوَ يَطُوفُ عَلَيْنَا جَمِيعًا فَيَدْنُو مِنْ كُلِّ امْرَأَةٍ مِنْ غَيْرِ مَسِيسٍ حَتَّى يَبْلُغَ إِلَي الَّتِي هُوَ يَوْمُهَا فَيَبِيتُ عِنْدَهَا رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأَحْمَدُ والبخاري. (ولفظه: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا انْصَرَفَ مِنَ الْعَصْرِ دَخَلَ عَلَى نِسَائِهِ، فَيَدْنُو مِنْ إِحْدَاهُنَّ)[٣].

دیسان عائیشە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە نۆرەشەوداو لە بەشداندا جیاوازییی نەدەکرد لە ناومانا، وەك یەك دەمایەوە لەلای هەمووومان، مەگەر چۆنەهایش ئەگینا هەموو رۆژێ یەکە یەکە سەری لێمان دەداو بەسەری دەکردینەوەو دەهات بە لامانەوە، بەڵام بەبێ چوونەلاو جوتبوون، تا دەگەیشتە لای ئەو ژنەی کە ئەو رۆژە سەرەی خۆی بوو، ئیتر شەو لەلای ئەو دەمایەوە (د/ئەحمەد/بوخاری) گفتەی بوخاری - بەپێی شەرحەکە- ئاوایە: گەلێ جار حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ لە نوێژی عەصر دەبۆوە، دەچوو سەری لە ژنەکانی دەدا، وە لە یەکێکیان دەچووە پێشەوە.

---

[٢] صححه ابن حبان (شرحه).

[٣] بخاری. نکاح: ٥٢١٦، ٥٢٦٧، ٥٢٦٨.

٢١٧٤- وَعنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا أَرَادَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ، وَكَانَ يَقْسِمُ لِكُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا، غَيْرَ أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) وَهَبَتْ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا، لِعَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها). رَوَاهُ الثلاثة والنسائي[٤].

دیسان گوتی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وابوو کاتێ دەچوو بۆ سەفەرێ، دەو (قورعە)ی دەکرد لە نێوانی ژنەکانیا، جا ناوی هەرکامێکیان دەردەچوو لە دەوەکەدا ئەو ژنەیانی دەبرد لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەو سەفەرە.

وەکوو دیکەیش بۆ هەر ژنێ لە ژنەکانی شەوو رۆژێکی بۆ تەرخان کردبوو، بەسەرە لە لایان دەبوو، بەڵام سەودەی کچی زەمعە (خودای لێ رازی بێ) نۆرە رۆژەکەی خۆی بەخشیبوو بەمن (ش/د/ن).

٢١٧٥- وَعَنْهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ امْرَأَةً أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَكُونَ فِي مِسْلَاخِهَا مِنْ سَوْدَةَ لَمَّا كَبِرَتْ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَدْ جَعَلْتُ يَوْمِي مِنْكَ لِعَائِشَةَ. فَكَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقْسِمُ لِعَائِشَةَ يَوْمَيْنِ يَوْمَهَا وَيَوْمَ سَوْدَةَ. رَوَاهُ الشيخان.

دیسان گوتی: خۆزگەم بە هیچ ژنێ نەبردووە کە من لە جێی ئەوبم بە سەودە نەبێ چونکە بەراستی ئافرەتێکی رەوشت بەرزو مەردو خودا پەرست بوو سەودە (خودای لێ رازی بێ) کاتێ پیربوو عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! نۆرە رۆژی خۆم کە تۆ دەمێنیتەوە لەلام دەیدەم بە عائیشە چونکە من پیر بووم نەبادا دڵت گەرد بگرێ لەمن، ئاواتی گەورەی من دڵراگرتنی تۆیەو ئەوەیە کە لە دنیاو قیامەتا هاوسەری تۆبم!

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دوو رۆژی سەرە دادەنا بۆ عائیشە: رۆژەکەی عائیشە خۆی و رۆژەکەی سەودە (ش).

---

[٤] بخاری. هبة وقضاء: ٢٥٩٣، ٢٦٣٧، ٢٦٦١، ٢٦٨٨، ٢٨٧٩، ٤٠٢٥، ٤١٤١، ٤٦٩٠، ٤٧٤٩، ٤٧٥٠، ٤٧٥٧، ٥٢١٢، ٦٦٦٢، ٦٦٧٩، ٧٣٦٩، ٧٣٧٠، ٧٥٠٠، ٧٥٤٥. مسلم. رضاع: ٣٦١٤، ٣٦١٥، ٦٩٥١.

٢١٧٦- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي ضَرَّةً، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ إِنْ تَشَبَّعْتُ مِنْ زَوْجِي غَيْرَ الَّذِي يُعْطِينِي فَقَالَ: الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ. رَوَاهُ الأربعة[٦].

ئەسماء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ژنێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من هەوێبارم، ئەگەر بە رواڵەت خۆم وا نیشان بدەم کە مێردەکەم تێرو پڕم دەکاو ئەوەو ئەوەم لەگەڵ دەکاو لە راستیشدا وا نەبێ ئەمە چۆنە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەوەی گەزاف لێ بداو بەشتێکەوە بنازێ کە نەیبێ ئەوە وەك کەسێ وایە کە جلی خەڵك لەبەر بکاو بەدرۆ بڵێ هی خۆمە زوو یا درەنگ درۆکەی ئاشکرا دەبێو تەریق دەبێتەوە (ش/د/ت).

## ٥١) بۆ کچ حەوت شەوو بۆ بێوە ژن سێ شەو: (للبكر سبع وللثيب ثلاث)

٢١٧٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ إِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ الْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا وَقَسَمَ، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى الْبِكْرِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثًا ثُمَّ قَسَمَ. قَالَ أَبُو قِلَابَةَ: وَلَوْ شِئْتُ لَقُلْتُ رَفَعَهُ (أنس) إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). رَوَاهُ الأربعة[١].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: سوننەت وایە ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر بێوەژن حەوت شەو لەلای بێ ئینجا بەسەرە شەویان وەك یەك بۆ دابنێ، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچ سێ شەو لەلای بێ ئینجا بە نۆرە وەك یەك شەویان بۆ دابنێ. ئەبو قیلابە گوتی: ئەگەر بمەوێ لە باتی ئەوەی بڵێم ئەنەس گوتی: سوننەت وایە دەڵێم: ئەنەس گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر.. تاد (ش/د/ت).

٢١٧٨- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَمَّا تَزَوَّجَهَا أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَقَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ بِكِ عَلَى أَهْلِكِ هَوَانٌ وَإِنْ شِئْتِ سَبَّعْتُ لَكِ وَإِنْ سَبَّعْتُ لَكِ سَبَّعْتُ لِنِسَائِي. رَوَاهُ مسلم وأَبُو دَاوُدَ[٢].

---

[٦] بخاری. نكاح: ٥٢١٩. مسلم. ٥٥٤٨، ٥٥٥٠.

[١] بخاری. نكاح: ٥٢١٣، ٥٢١٤. مسلم. نكاح: ٣٦١١، ٣٦١٢. أبو داوُد. نكاح: ٢١٢٤. ترمذی. نكاح: ١١٣٩.

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) منی گواستەوە سێ شەو لەلام مایەوە، ئینجا فەرمووی: وامەزانە کەلەبەر ئەوە سێ شەو دەمێنمەوە لەلات چونکە بێ قەدری لەلام، نەء لەبەرئەوە نییە بەڵام ئەگەر حەزدەکەی بۆتی دەکەم بە حەوت شەو وەلێ ئەوەندە هەیە ئەگەر بۆتۆ بیکەم بە حەوت شەو دەبێ بۆژنەکانی تریشم بیکەم بە حەوت شەو (م/د).

٢١٧٩- وَلِمُسلمٍ: إنْ شِئْتِ زِدْتُكِ وَحَاسَبْتُكِ بِهِ لِلْبِكْرِ سَبْعٌ وَلِلثَّيِّبِ ثَلاَثٌ. وَفي رِواية: قَالَتْ: ثَلِّث وَدُرْ عَلَى نِسائكَ والله أعلى وأعلم[٣].

موسلیم (خودای لێ رازی بێ) ریوایەت دەکا: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بە ئوممو سەلەمە: ئەگەر حەزدەکەی بۆت زیاد دەکەم بەڵام لەسەرتی حل دەکەم خۆی دانراوە بۆ کچ کە بووك بێ حەوت شەو، وە بۆ بێوەژن کە دەچێ بە بووکی سێ شەو لە گێرانەوەیەکی شەرحەکەدا: ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) عەرزیکرد: سێ شەوو سێ رۆژ لەلای من بەو لەپاشا رێز بگرە لە ژنەکانی ترت.

## ٥٢) دروستە ژن دەست لە مافی خۆی هەڵبگرێ بۆ مێردەکەی
## للزوجة التنازل عَنْ حقها لزوجها

٢١٨٠- قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِن امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا (فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا)... قَالَتْ فِيهَا عَائِشَةَ: هِيَ الْمَرْأَةُ تَكُونُ عِنْدَ الرَّجُلِ، لاَ يَسْتَكْثِرُ مِنْهَا فَيُرِيدُ طَلاَقَهَا، وَيَتَزَوَّجُ غَيْرَهَا، فَتَقُولُ لَهُ: أَمْسِكْنِي وَلاَ تُطَلِّقْنِي، ثُمَّ تَزَوَّجْ غَيْرِي، فَأَنْتَ فِي حِلٍّ مِنَ النَّفَقَةِ عَلَيَّ وَالْقِسْمَةِ لِي، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى {فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَصَّالَحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ}. رَوَاهُ البخاري[١].

---

[٢] مسلم. نكاح: ٣٦١٦ – ٣٦١٠. أبو داوُد. نكاح: ٢١٢٢.

[٣] مسلم. نكاح: ٣٦٠٧.

[١] بخاري. تفسير: ٤٦٠١.

یەزدانی مەزن لە قورئانی پیرۆزدا، لە سوورەتی (نیساء)دا لە ئایەتی سەدو بیست و هەشتدا دەفەرموێ: ئەگەر ژنێ دەترسا لەوە کە مێردەکەی بێزار ببێ لێی و بەرە بەرە بە تەواوی دوور بکەوێتەوە لێی وەیاخود حەزی لەو نەماوەو حەزی لە ژنێکی تر کردووە وە یاخود لەبەر هۆیەکی تر دوور نیە کە مێردەکەی دەستی لە دەستی بێتەوە ئەوە گوناهیان ناگا ئەگەر لەناو خۆیانا بسازێن و رێبکەون و صوڵح بکەن، چونکە صوڵح و رێکەوتن هەمیشە هەر خێر بووەو هەر خێریش دەبێ.

جا عائیشە (خودای لێ رازی بێ) لە بارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێ: ئەم ئایەتە وەك ئەوە پیاوێ ژنێکی هەبێ، خۆی تێ نەگەیەنێ و بیەوێ تەڵاقی بداو ژنێکی تر بێنێ، ژنەکەیش پێی بڵێ: بمهێڵەو بەرەڵام مەکەو بۆ خۆت ژنێکی تر بێنەو بۆ ئازووقەو خەرجی و نۆرەکاریش گەردنت ئازاد بێ. مەبەست ئەمەیە کە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَصَّالَحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ}. (ب).

٢١٨١- وَكَانَتِ عِنْدَ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ بْنْتُ مُحَمَّدِ بْنِ مَسْلَمَةَ فَكَرِهَ مِنْهَا أَمْراً إِمَّا كِبَرًا وَإِمَّا غَيْرَ ذَلِكَ فَأَرَادَ طَلاَقَهَا فَقَالَتْ: لاَ تُطَلِّقْنِي وَأَمْسِكْنِي وَاقْسِمْ لِي مَا بَدَا لَكَ. فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِنِ امْرَأَةٌ...}الآية. رَوَاهُ الشافعي في المُسند[٢].

کچی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ژنی رافیعی کوڕی خەدیج بوو، جا لەبەر پیریی – یا لەبەر شتێکی تر- حەزی لێی نەمابوو، وە ویستی تەڵاقی بدا، ژنەکەی گوتی: تەڵاقم مەدەو بم هێڵەو خۆت سەرپشك بە چیم بۆ دادەنێی کەیفی خۆتە من پێی قاییلم. جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە تا کۆتایی: (وأن امرأةٌ- ١٢٨/٤) (شافیعی لە ئەلموسنەددا ئەم حەدیثەی ریوایەت کردووە).

---

[٢] سكت عنه الشارح.

## ٤٣) ژن (ئەگەر بەتەمێو ئامۆژگاریو جێ لێ جیاکردنەوە) عاری نەنا ئەوسا لێی دەدرێ: (تضرب الزوجة بعد الوعظ والهجر)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا} (٤/٣٤).

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەو ژنانەی کە لە فەرمانتان دەردەچن لە پێشا ئامۆژگارییان بکەن هەتا بێنەوە ژێر فەرمانتان، جا ئەگەر باش نەبوون جێگەیان لێ جیا بکەنەوەو لەگەڵیانا مەخەون، ئەگەر بەوەیش تەمێ گرنەبوون ئەوا لێیان بدەن بەڵام هەرکاتێ فەرمانی ئێوەیان بەجێ هێنا ئیتر زۆرو ستەمو ناهەقییان لێ مەکەن، بە راستی خودا پایەبەرزو بڵندەو لە هەموو کەسێ گەورەترەو دەتوانێ تۆڵەی هەموو زەبوونێ لە هەموو کەسێ بسەنێ.

٢١٨٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يَجْلِدُ أَحَدُكُمُ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ، ثُمَّ يُجَامِعُهَا آخِرِ الْيَوْمِ. رَوَاهُ البخاري والترمذي[1].

عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ژنەکانتان وەك بەندە دارکاری مەکەن دەگونجێ هەر لە کۆتایی ئەو رۆژەدا دروست بێن لەگەڵیان (ب/ت).

٢١٨٣- عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ يُسْأَلُ الرَّجُلُ فِيمَا ضَرَبَ امْرَأَتَهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[2].

عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پرسیار ناکرێ لە پیاو کە لەسەرچی لەژنی خۆی داوە! (د-سند صالح-ن).

٢١٨٤- عَنْ إِيَاسِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تَضْرِبُوا إِمَاءَ اللَّهِ. فَجَاءَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ: يا رَسُولُ اللهِ ذَئِرَ النِّسَاءُ عَلَى أَزْوَاجِهِنَّ.

---

[1] بخاری. نکاح: ٥٢٠٤.

[2] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

فَأَذِنَ فِي ضَرْبِهِنَّ فَأَطَافَ بِآلِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نِسَاءٌ كَثِيرٌ يَشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لَقَدْ طَافَ بِآلِ مُحَمَّدٍ سَبْعُونَ امْرَأَةً كُلُّهُنَّ يَشْتَكِينَ أَزْوَاجَهُنَّ وَلاَتَجِدُونَ أُولَئِكَ خِيَارَكُمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي والحاكم وصححه. والله أعلى وأعلم[٣].

**ئیباسی کوڕی عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ژنان بەندەگانی خودان لێیان مەدەن. عومەریش (خودای لێ ڕازی بێ) هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ژنان زاتیان شکاوە لە مێردەکانیان جا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی دا بۆ لێدانیان ئیتر ژن گەلێکی زۆر هاتنە سەر ماڵی پێغەمبەر سکاڵایان دەکرد لە دەستی مێردەکانیان.**

**پێغەمبەریش (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: حەفتا ژن هاتوونەتە سەر ماڵی موحەممەد، هەموویان دادو بێدادیانە لە دەستی مێردەکانیان، ئەم جۆرە مێردانە کە ئازاری ژنی خۆیان دەدەن و لەسەر شتی هیچ و پووچ لە ژنی خۆیان دەدەن پیاوی باش نین! (د/ن/حاکم:ص).**

## ٥٤) دانانی ناو بژیکەر: (التحكيم)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا} (٤/٣٥).

**خودای گەورە دەفەرموێ: ئەگەر مەترسی ئەوەتان هەبوو کە ئاژاوەی ناوەندی ژن و پیاو درێژە دەکێشێ ئەوا ناوبژیکەرێ (یا فەرمانڕەوایێ) لە خزمی ژنەکە ڕەوانە بکەن، وە هەروەها فەرمانڕەوایێ لە خزمی پیاوەکە ڕەوانە بکەن و ئەو دوو حەکەمە بکەونە نێوانیان جا ئەگەر ئەو دوو ناوبژیکەرانە بیانەوێ میانەیان باش کەن ئەوە خودا ڕێکیان دەخا.**

---

[٣] صحيح عند الحاكم.

٢١٨٥- وَجَاءَ رَجُلٌ وَامْرَأَةٌ إِلَى عَلِيّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) وَمَعَ كُلٍّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ فَأَمَرَهُمْ عَلِيٌّ فَبَعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا ثم قَالَ لِلْحَكَمَيْنِ: تَدْرِيَانِ مَا عَلَيْكُمَا؟ إِنْ رَأَيْتُمَا أَنْ تَجْمَعَا فَافْعَلاَ وَإِنْ رَأَيْتُمَا التَّفرِيقَ فَافْعَلاَ. فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: رَضِيتُ بِكِتَابِ اللَّهِ بِمَا عَلَيَّ فِيهِ وَما لِي. وَقَالَ الرَّجُلُ: أَمَّا الْفُرْقَةُ فَلاَ. فَقَالَ عَلِيٌّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) كَذَبْتَ وَاللَّهِ حَتَّى تُقِرَّ بِمَا أَقَرَّتْ بِهِ. رَوَاهُ الإمام الشافعي. والله أعلى وأعلم[1].

پیاوێك و ژنێك هاتنە لای عەلی (خودای لێ رازی بێ) پیاوەکە کۆمەڵێکی لەگەڵدا بوو، ژنەکەیش کۆمەڵێکی لەگەڵدا بوو، جا عەلی فەرمانی پێکردن دوو فەرمانڕەوا (حەکەم)یان هەڵبژارد: یەکێ لە کەسوکاری پیاوەکەو یەکێ لە کەس و کاری ژنەکە. ئینجا بە فەرمانڕەواکانی گوت: دەزانن ئەرکی سەرشانی ئێوە چییە؟ ئەگەر بە باشتان زانی یەکیان بخەنەوە، ئەگینا لەیەکیان جیا بکەنەوە. ژنەکە گوتی: من هەرچی شەریعەتی خودا بۆم دانێ چ چاك چ خراپ، پێی قاییلم. بەڵام پیاوەکە گوتی: بە هەموو شتێ قاییلم جگە لە جیابوونەوە.

عەلیش (خودای لێ رازی بێ) گوتی: درۆ دەکەی، بە خودا، هەتا تۆیش وەك ئەو قاییل دەبی بە بڕیاری شەرع! {ئیمامی شافیعی(خودای لێ رازی بێ) ریوایەتی کردووە}.

## ٥٥) حوکمی نەنگی ژن و مێرد: (حكم العيب في أحد الزوجين)

٢١٨٦- عن كَعْبُ بْنُ زَيْدٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي غِفَارٍ فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهَا فَوَضَعَ ثَوْبَهُ وَقَعَدَ عَلَى الْفِرَاشِ أَبْصَرَ بِكَشْحِهَا بَيَاضاً (برصاً) فَانْحَازَ عَنِ الْفِرَاشِ ثُمَّ قَالَ: خُذِي عَلَيْكِ ثِيَابَكِ وَلَمْ يَأْخُذْ مِمَّا أَتَاهَا شَيْئاً. رَوَاهُ أَحْمَد والبيهقي والحاكم[1].

---

[1] سكت عنه الشرح.

[1] سكت عَن درجته الشارح.

کەعبی کوڕی زەید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەبەنی غیفار ژنێکی هێنا، کە چووە ناوپەردەوە بۆی و جلەکانی دانا و لەسەر نوێنەکە دانیشت، سەیری کرد قەبرغەی تووشی بەڵەکی بووە، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە نوێنەکە دەکشێتەوە و دەفەرموێ: جلەکانت بدەرەوە بە خۆتاو بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوانت، لەبەر ئەم عەیبە من تۆم ناوێ وە ئەو شتومەکەیشی دابووی پێی هیچی لێ نەسەندەوە. (ئەحمەد/بەیهەقی/حاکم).

٢١٨٧- عَنْ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَيُّمَا رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَبِهَا جُنُونٌ أَوْ جُذَامٌ أَوْ بَرَصٌ فَمَسَّهَا فَلَهَا صَدَاقُهَا كَامِلاً، وَذَلِكَ لِزَوْجِهَا غُرْمٌ عَلَى وَلِيِّهَا. رَوَاهُ مالك والشَّافِعِيُّ[٢].

عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: هەر پیاوێ ژنێ بێنێ، ژنەکە شێت بێ، یا گول بێ، یا بەڵەك بێ، ئەگەر بچێتە لای و بە دەستی بگرێ ئیتر ژنەکە مارەییی تەواوی دەکەوێ، بەڵام مێردەکە ئەوە بە هەقداری ژنەکە دەبژێرێ! (مالیك/شافیعی).

٢١٨٨- وَقَالَ مَالِكٌ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ): وَإِنَّمَا يَكُونُ ذَلِكَ إِذَا كَانَ وَلِيُّهَا الَّذِى أَنْكَحَهَا وَهُوَ أَبُوهَا أَوْ أَخُوهَا أَوْ مَنْ يُرَى أَنَّهُ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهَا فَأَمَّا إِذَا كَانَ الَّذِى أَنْكَحَهَا ابْنَ عَمٍّ أَوْ مَوْلًى أَوْ مِنَ الْعَشِيرَةِ مِمَّنْ يُرَى أَنَّهُ لاَ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهَا فَلَيْسَ عَلَيْهِ غُرْمٌ وَتَرُدُّ تِلْكَ الْمَرْأَةُ مَا أَخَذَتْهُ مِنْ صَدَاقِهَا وَيَتْرُكُ لَهَا قَدْرَ مَا تُسْتَحَلُّ بِهِ[٣].

مالیك بۆ ئەم مەسەلەیە دەڵێ: ئەمە کاتێ وایە کە ئەو هەقدارەی مارەی دەبڕێ باوکی بێ یا برای بێ یا کەسێکی وای بێ کە گومانی ئەوەی لێ بکرێ کە بەو نەخۆشییەی زانیبێ، بەڵام ئەگەر ئامۆزای مارەی بڕیبوو، یا خزمێکی دوور، وە گومانی ئەوەی لێ نەدەکرا کە بەو نەخۆشییەی زانیبێ ئەوە بژاردنی لەسەر نیە بەڵکوو ژنەکە چی مارەیی وەرگرتووە دەیداتەوە بە پیاوەکە، تەنیا بە ئەندازەی ئەوەندەی دەدرێتێ کە بە حەڵاڵی دەستی بۆ براوە.

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

[٣] مرفوع إلى مالك.

٢١٨٩- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَبِهِ جُنُونٌ أَوْ ضَرَرٌ فَإِنَّهَا تُخَيَّرُ فَإِنْ شَاءَتْ قَرَّتْ وَإِنْ شَاءَتْ فَارَقَتْ[٤].

سەعیدی کوڕی موسەییب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەگەر پیاوێکی شێت، یا نەخۆش ژنێ مارە بکا هەر کاتێ نەخۆشییەکەی ئاشکرابوو ئەوە ژنەکە خاتر خۆ دەگرێ ئەگەر ئارەزووی هەبوو بە پیاوەکە ڕازی دەبێ ئەگینا لێی جیا دەبێتەوە (مالیك- خودایان لێ ڕازی بێ).

٢١٩٠- وَعَنْهُ قَالَ: مَنْ تَزَوَّجَ امْرَأَةً فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَمَسَّهَا فَإِنَّهُ يُضْرَبُ لَهُ أَجَلٌ سَنَةً فَإِنْ مَسَّهَا وَإِلاَّ فُرِّقَ بَيْنَهُمَا. وَسُئِلَ ابْنُ شِهَابٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) مَتَى يُضْرَبُ الأَجَلُ فَقَالَ: بَلْ مِنْ يَوْمِ التَّرَافُعِ إِلَى السُّلْطَانِ. رواهما مالك. وَقَالَ: فَأَمَّا الَّذِي قَدْ مَسَّ امْرَأَتَهُ ثُمَّ اعْتَرَضَ عَنْهَا فَلاَ يُضْرَبُ لَهُ وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا. وسيأتي حكم فقد الزوج في باب الطَّلاق إن شاء الله تَعَالَى. والله أعلى وأعلم.

دیسان دەڵێ: ئەگەر کەسێ ژنێ بێنێ، وە نەتوانێ بە دەستی بگرێ ئەوە ماوەی ساڵێکی بۆ دادەنرێ، جا ئەگەر لەو ماوەیەدا ڕۆیشتە لای ئەوە باشە، ئەگینا لە یەك جیا دەکرێنەوە، پرسیار کرا لە ئیبنو شەهاب: لە کەیەوە ماوەی ساڵێکی بۆ دادەنرێ گوتی: لەو ڕۆژەوە کە سکاڵا دەکرێ لەلای کار بەدەست.

ئیمامی مالیك (خودای لێ ڕازی بێ) ئەم فەرمایشتەی گێڕاوەتەوە، وە دەڵێ: وەلێ ئەوەی ژنی خۆی بەدەست بگرێ، وە لەوە دوا لە پیاوەتی بکەوێ ئەوە ئەماوەی بۆ دیاری دەکرێ وە نەتەڵاقی دەخرێ. حوکمی دیار نەبوونی مێرد لە باسی تەڵاقدا خودا حەزکا لەمەولا دێ. وە خودای گەورەو مەزن هەر بۆ خۆی زۆر باشی لێ دەزانێ.

---

[٤] مرفوع إلى مالك.

## ٥٦) بە تەنیا کۆبوونەوە لەگەڵ ئافرەتی بێگانەدا دروست نیە، هەروەها تەماشاکردنیشی: (تحرم الخلوة بالأجنبية والنظر اليها)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ، وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ}. (٣١/٢٤).

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی خۆشەویست! لەسەر فەرمانی من بفەرموو بە موسوڵمانەکان، بە چاوی ناپاك تەماشای نامووسی خەڵك نەکەن‌و چاوی خۆیان بگرن لە تەماشاکردنی ژنی بیانی، بەپێی تەوانا، وە هەمیشە داوێن پاك بن‌و داوێنی خۆیان بپارێزن لە بێ شەرعی. ئەم یاساو دەستوورە هۆی پاك‌و تەمیزی‌و مایەی ئابڕو مەندییە بۆ ئێوە.

دیارە کە خودا ئاگادارە بە هەموو کارێ وە هیچی لێ ون نابێ. ئەی خۆشەویست! دیسان لەسەر فەرمانی من بفەرموو بە ژنە موسوڵمانەکان کە باوەڕو ئیمان چەسپاوە لەناو دڵیانا ئەوانیش بە چاوی ناپاك نەڕوانن بۆ پیاوی نامەحرەم‌و بەپێی تەوانا تەماشای ناڕەوا (نەظەری حەرام) نەکەن، وە هەمیشە مەردو سەر بەرزو داوێن پاك بن‌و گەردو تۆزی پیس لە دامەنتان نەنیشێ.

٢١٩١- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ. قَالَ: الْحَمْوُ الْمَوْتُ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[1].

عوقبەی کوڕی عامیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بە تەنیا مەچن بۆ لای ژنان! پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ئەگەر خزمی مێردەکەی بێ؟ فەرمووی: خزمی مێرد مردنە: ئەو لە هەمووی خراپتر، چونکە بەناوی خزمایەتییەوە دوور نیە کاری دوشمنێ بکا (ش/ت).

---

[1] بخاری. نکاح: ٥٢٣٢. مسلم. سلام: ٥٦٣٨.

٢١٩٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تَلِجُوا عَلَى الْمُغِيبَاتِ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنْ أَحَدِكُمْ مَجْرَى الدَّمِ. قُلْنَا: وَمِنْكَ. قَالَ: وَمِنِّي وَلَكِنَّ اللَّهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمُ [٢].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەچن بۆ لای ئەو ژنانەی کە مێردیان لەماڵ نیە، چونکە شەیتان لە لەشی ئادەمیزادا وەکوو خوێن هاتو چۆ دەکا.

گوتمان لە لەشی تۆیشدا ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: لە لەشی منیشدا، بەڵام من خودا زاڵی کردووم بە سەریداو لە دەستی رزگارم بوەو شەیتانەکەم موسوڵمان بووە (ت).

٢١٩٣- وَ قَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ كَانَ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ رواهما الترمذيُّ[٣].

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر پیاوو ژنێکی بێگانە دوو بە دوو پێکەوە بن، مسۆگەر کەسی سێهەمیان شەیتانە (ت).

٢١٩٤- ➡ (ب- ٢ز-)[٤].

٢١٩٥- ولمسلمٍ: أَلاَ لاَ يَبِيتَنَّ رَجُلٌ عِنْدَ امْرَأَةٍ ثَيِّبٍ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ نَاكِحًا أَوْ ذَا مَحْرَمٍ [٥].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئاگاداربن پیاو بەشەو لەلای ژن نەمێنێتەوە، مەگەر مێردی بێ یا خۆیی بێ (م).

---

[٢] مسلم. سلام: ٥٦٤١.

[٣] سكت عنه الشارح.

[٤] سكت عنه الشارح.

[٥] مسلم. سلام: ٥٦٣٧.

٢١٩٦- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دَخَلَ عَلَيْهَا وَفِي الْبَيْتِ مُخَنَّثٌ، فَقَالَ: أَي الْمُخَنَّثُ لأَخِي أُمِّ سَلَمَةَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ: إِنْ فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ الطَّائِفَ غَدًا أَدُلُّكَ عَلَى ابْنَةِ غَيْلاَنَ، فَإِنَّهَا تُقْبِلُ بِأَرْبَعٍ وَتُدْبِرُ بِثَمَانٍ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لاَ يَدْخُلَنَّ هذا عَلَيْكُنَّ. رَوَاهُ الشيخان[٦].

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەشریفی هێنا بۆلام، لەو کاتەدا پیاوێکی سەر ژنانی لەوێ بوو، جا پیاوەکە بە عەبدوڵڵای کوڕی ئومەییەی برامی گوت: ئەگەر سبەینێ بە پشتی خودا تائیفتان فەتح کرد، خۆم کچەکەی غەیلانت نیشان دەدەم، لە دەستی نەدەی نێچیرێکی قەڵەوە چۆن شۆخ و شەنگ و گەرم و نەرمێکە، لە پێشەوە چوار لۆیەو لە پاشەوە هەشت لۆ! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەیەڵن ئەمە هاموشۆتان بکا (ش) وزاد فی روایة (ذکرها المُصَنِفُ – عَلَيهِ الرحمة – فی الشرح): إن قعدت تثنت، وان تکلمت نغنت، وبین فخذیها کالاناء المکفوء، فلما سمع النبی ذلكَ قال: لا یدخلن هذا علیکم:

لە گێڕانەوەیەکی شەرحەکەدا ئەمەیشی پترە: گوتی: کە دادەنیشێ خڕو خەپانەو هەر لۆیە دەنیشێتە سەرلۆ، کە قسەدەکا دەڵێی شەکر دەشکێنێ، یا بولبولەو دەخوێنێ، بەینی هەردوو رانی وەك خەپلەی هەڵاتە وایە! جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوێی لەم قسانە بوو فەرمووی: مەیەڵن ئەمە بێ بۆ لاتان.

٢١٩٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تُبَاشِرِ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا، كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا رَوَاهُ الخمسة إلا مسلماً[٧].

عبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نابێ ژن سرنجی ژنێکی تربداو لەپاشا ورد ورد باسی لەشولاری ئەو ژنە بکا

---

[٦] تقدم تخریجه فی رقم: ١٤٩٣ تسلسل: ٧٩ فی مجلد/ ٢.

[٧] بخاری. نکاح: ٥٢٤٠، ٥٢٤١.

بۆ مێردەکەی خۆی بە شێوەیەکی وا وەك مێردەکەی بە چاوی خۆی تەماشای کردبێ وابێ (ب/ت/د/ن).

٢١٩٨- عَنْ جَرِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنْ نَظْرَةِ الْفَجْأَةِ فَقَالَ: اصْرِفْ بَصَرَكَ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري.

جەریر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیارم کرد لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ تەماشاکردنی کوتوپڕی، فەرمووی: چاوت وەرچەرخێنەو یەکسەر روو بکە بەو لاوە (م/د/ت/ن)[8].

٢١٩٩- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: يَا عَلِيُّ لاَ تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ فَإِنَّ لَكَ الأُولَى وَلَيْسَتْ لَكَ الآخِرَةُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[9].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێم: ئەی عەلی! تەماشا لەسەر تەماشا مەکە، چونکە یەکەم تەماشا هی خۆتە لەبەرئەوە لەناکاو بووە بەڵام دووهەم تەماشا هی تۆ نیە لەبەرئەوە حەرامەو گوناهە (د/ت).

٢٢٠٠- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَأَى امْرَأَةً فَأَتَى امْرَأَتَهُ زَيْنَبَ وَهْيَ تَمْعَسُ مَنِيئَةً لَهَا فَقَضَى حَاجَتَهُ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: إِنَّ الْمَرْأَةَ تُقْبِلُ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ وَتُدْبِرُ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ فَإِذَا أَبْصَرَ أَحَدُكُمُ امْرَأَةً فَلْيَأْتِ أَهْلَهُ فَإِنَّ ذَلِكَ يَرُدُّ مَا فِي نَفْسِهِ. وَفِي رِوَايَةٍ: إِذَا أَحَدُكُمْ أَعْجَبَتْهُ الْمَرْأَةُ فَوَقَعَتْ فِي قَلْبِهِ فَلْيَعْمِدْ إِلَى امْرَأَتِهِ فَلْيُوَاقِعْهَا فَإِنَّ ذَلِكَ يَرُدُّ مَا فِي نَفْسِهِ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[10].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ژنێکی دی ئارەزووی جووڵا جا رۆیشت بۆ لای زەینەبی هاوسەری، زێنەب لەوکاتەدا خەریکبوو پێستەی خاوی دادەتاشی و خۆشەی دەکرد، جا پێغەمبەر (دروودی

---

[8] مسلم. أداب: ٥٦٠٩. أبو داوُد. نكاح: ٢١٤٨. ترمذی. الأدب: ٢٧٧٦.

[9] سكت عنه الشارح.

[10] مسلم. نكاح: ٣٣٩٣. أبو داوُد. نكاح: ٢١٥١. ترمذی. رضاع: ١١٥٨.

خودای لەسەربێ) کە ئیشی شەرعی تەواوکرد هاتەوە بۆ ناو هاوڕێیانی، فەرمووی: ژن لە شێوەی شەیتانا دێ و لە شێوەی شەیتانا پشت هەڵدەکا و بە دەنگ و رەنگی ناسك و نازدارو جوانی پیاو لە خشتە دەبا جا ئەگەر یەکێکتان ژنێکی ئاوای دی و ئارەزووی جووڵا بابڕواتە لای ژنەکەی خۆی، چونکە ئەوە کوڵو کۆی دڵی دادەمرکێنێ لە گێڕانەوەیەکا: ئەگەر یەکێکتان ژنێکی پەسەند کردو دڵی تێی چوو بابڕواتە لای هاوجووتەکەی خۆی و دروست ببێ لە گەڵی، تا بەوە کوڵوکۆی دەروونی خۆی بمرێنێ (م/د/ت/ن).

٢٢٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَا، أَدْرَكَ ذَلِكَ لاَ مَحَالَةَ، فَزِنَا الْعَيْنِ النَّظَرُ، وَزِنَا اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ. وزاد في رواية: وَزِنَا الْيَدَيْنِ الْبَطْشُ وَزِنَا الرِّجْلَيْنِ الْمَشْيُ وَزِنَا الْفَمِ الْقُبَلُ، وَالنَّفْسُ تَمَنَّى ذَلِكَ وَتَشْتَهِي، وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ وَيُكَذِّبُهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والشيخان[11].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو ئادەمیزادێ خودا بەشی خۆی داوێن پیسی لە چارەی نووسیوە، خوا ناخوا دەشێ تووشی ئەوە ببێ، جا داوێنپیسیی چاو برێتییە لە روانین، وە داوێن پیسی زمان بریتییە لە قسەکردن. لە گێڕانەوەیەکا ئەمەی پترە: وە داوێن پیسیی دەست برێتییە لە دەست وەشاندن، وە داوێنپیسیی پێ برێتییە لە رۆیشتن بۆ ئیشی ناڕەوا وە داوێنپیسیی گوێ برێتییە لە گوێگرتن لە شتی نادروست وە داوێنپیسیی دەم برێتییە لە ماچ و موچ، وە دەرون و نەفسیش ئاواتی ئەوە دەخوازێ و ئارەزووی دەکا، جا ئینجا دامەن (فەرج= عەورەت= شەرمگا)یش ئەمە بەدی دەهێنێ یا رەفزی دەکا (د/ش).

---

(11) بخاری. استئذان: ٦٢٤٣، ٦٦١٢. مسلم. قدر: ٦٦٩٥. أبو داوُد. نكاح: ٢١٥٢.

## ٥٧) مەردایەتی‌و بەتەنگەوەبوونی نامووس شتێکی گەلێ پەسەندە
## الغيرة محمودة

٢٢٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَغَارُ وَالْمُؤْمِنُ يَغَارُ وَغَيْرَةُ اللَّهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ. رَوَاهُ الترمذي والبخاري[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا غیرەت دەیگرێ‌و موسوڵمانیش غیرەت دەیگرێ‌و بە تەنگی شەرەف‌و نامووسەوە دێ، خودا لەسەر ئەوەغیرەت دەیگرێ‌و هەڵدەداتێ کە موسوڵمان شتی ناڕەوا بکاو ئەوەی خودا حەرامی کردووە ئەو بیکا (ت/ب).

٢٢٠٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَا أَحَدٌ أَغْيَرَ مِنَ اللَّهِ أَنْ يَرَى عَبْدَهُ أَوْ أَمَتَهُ تَزْنِي يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ (من أحوال الآخرة وأهوالها) لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا. رَوَاهُ البخاري[2].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): کەس لە خودا بە غیرەتتر نیەو کەس وەك ئەو دەمار نایگرێ‌و لەسەر نامووس هەڵناداتێ، کە ببینێ وا بەندەیەك لە بەندەکانی، ژن بێ یا پیاو، زینا دەکاو خەریکی داوێن پیسییە. ئەی ئۆمەتی موحەممەد! ئەوەی من دەیزانم لە ئێش‌و ئازاری گۆڕو لە کێشەو بەرەو تەنگ‌و چەڵەمەی رۆژی دوایی ئەگەر ئێوە بیزانن کەم پێدەکەنین‌و زۆر دەگریان (ب).

٢٢٠٤- قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): لَوْ رَأَيْتُ رَجُلاً مَعَ امْرَأَتِي لَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ غَيْرَ مُصْفِحٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَتَعْجَبُونَ مِنْ غَيْرَةِ سَعْدٍ، لأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ وَاللَّهُ أَغْيَرُ مِنِّي. رَوَاهُ الشيخان وزاد مسلم: وَمِنْ أَجْلِ غَيْرَةِ اللَّهِ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ، وَلاَ شَخْصٌ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ: وَلاَ شَخْصٌ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْعُذْرُ مِنَ اللَّهِ،

---

[1] بخاری. نكاح: ٥٢٢٢، ٥٢٢٣م. مسلم. توبة: ٦٩٢٧. ترمذی. رضاع: ١١٦٨.

[2] بخاری. كسوف: ١٠٤٤، ١٠٤٦، ١٠٤٧، ١٠٥٠، ١٠٥٦، ١٠٥٨، ١٠٦٤، ١٠٦٥، ١٢١٢، ٣٢٠٣، ٤٦٢٤، ٥٢٢١، ٣١٦٦. مسلم. كسوف: (٩١٥).

مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ بَعَثَ الله مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ وَلاَ شَخصٌ أَحَبُّ إِلَيْهِ الْمِدْحَةُ مِنَ اللَّهِ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ وَعَدَ اللَّهُ الْجَنَّةَ. والله أعلى وأعلم[٣].

**سەعدی کوڕی عوبادە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ئەگەر پیاوێ ببینم لەگەڵ ژنەکەم دەیدەمە بەر شمشێر: دەیدەمە بەر دەمە تیژەکەی نەك لەسەر باری پانی!**

**پێغەمبەریش** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئایا ئێوە سەرتان سوڕ دەمێنێ لە غیرەتو لە نامووس پەروەری سەعد دەسا من لەویش زیاتر بەتەنگی نامووسەوە دێم وە خودایش لەمن پتر! (ش).**

**موسلیم** (خودای لێ ڕازی بێ) **ئەمەیشی لێ زیاد کردووە: هەر لەبەرئەوەیە کە خودا ئەوەی پێی بڵێن خراپە (خوا ئاشکرابێ خوا نهێنی) هەمووی قەدەغە کردووە، کەس وەك خودا غیرەتو دەمار نایگرێ، کەسیش وەك خودا عوزر خواهیی پێ خۆش نیە، هەر لەبەر ئەوەیشە کە خودا ئەم پێغەمبەرانەی ناردووە تا مژدەبدەن بە چاکانو هەڕەشە بکەن لە بەدکاران، وە کەسیش وەك خودا مەدحو پیا هەڵگوتنی پێ خۆش نیە، هەر لەبەر ئەوەیشە کە مژدەو مزگێنی بەهەشت دەدات.**

## ٥٨) باسی هەشتەم: باسی بازە ژنهێنانێکی ناڕەوا، وەکی ژنهێنانی سەردەمی نەزانی:

## الباب الثامن: في النكاح المنهي عنه، منه نكاح الجاهلية

٢٢٠٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: النِّكَاحَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ كَانَ عَلَى أَرْبَعَةِ أَنْحَاءٍ فَنِكَاحٌ مِنْهَا نِكَاحُ النَّاسِ الْيَوْمَ، يَخْطُبُ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ وَلِيَّتَهُ أَوِ ابْنَتَهُ، فَيُصْدِقُهَا ثُمَّ يَنْكِحُهَا، وَنِكَاحٌ آخَرُ كَانَ الرَّجُلُ يَقُولُ لِامْرَأَتِهِ إِذَا طَهُرَتْ مِنْ طَمْثِهَا أَرْسِلِي إِلَى فُلاَنٍ فَاسْتَبْضِعِي مِنْهُ. وَيَعْتَزِلُهَا زَوْجُهَا حَتَى يَتَبَيَّنَ حَمْلُهَا فَإِذَا تَبَيَّنَ أَصَابَهَا

---

[٣] بخاری. نکاح: ٥٢٢٠. مسلم. توبة: ٦٩٢٣ – ٦٩٣١.

زَوْجُهَا إِذَا أَحَبَّ، وَإِنَّمَا يَفْعَلُ ذَلِكَ رَغْبَةً فِي نَجَابَةِ الْوَلَدِ، وَيُسَمَّى هَذَا نِكَاحَ الاِسْتِبْضَاعِ، وَنِكَاحٌ آخَرُ يَجْتَمِعُ الرَّهْطُ مَا دُونَ الْعَشَرَةِ فَيَدْخُلُونَ عَلَى الْمَرْأَةِ كُلُّهُمْ يُصِيبُهَا. فَإِذَا حَمَلَتْ وَوَضَعَتْ، وَمَرَّ عَلَيْهَا لَيَالِيَ، أَرْسَلَتْ إِلَيْهِمْ فَلَمْ يَسْتَطِعْ رَجُلٌ مِنْهُمْ أَنْ يَمْتَنِعَ حَتَّى يَجْتَمِعُوا عِنْدَهَا تَقُولُ لَهُمْ قَدْ عَرَفْتُمْ مَاكَانَ مِنْ أَمْرِكُمْ، وَقَدْ وَلَدْتُ فَهُوَ ابْنُكَ يَا فُلاَنُ. تُسَمِّي مَنْ أَحَبَّتْ بِاسْمِهِ، فَيَلْحَقُ بِهِ وَلَدُهَا، لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَمْتَنِعَ بِهِ الرَّجُلُ. وَنِكَاحُ الرَّابِعِ يَجْتَمِعُ النَّاسُ الْكَثِيرُ فَيَدْخُلُونَ عَلَى الْمَرْأَةِ لاَ تَمْتَنِعُ مِمَّنْ جَاءَهَا وَهُنَّ الْبَغَايَا كُنَّ يَنْصِبْنَ عَلَى أَبْوَابِهِنَّ رَايَاتٍ تَكُونُ عَلَمًا فَمَنْ أَرَادَهُنَّ دَخَلَ عَلَيْهِنَّ، فَإِذَا حَمَلَتْ إِحْدَاهُنَّ وَوَضَعَتْ حَمْلَهَا جُمِعُوا لَهَا وَدَعَوْا لَهُمُ الْقَافَةَ ثُمَّ أَلْحَقُوا وَلَدَهَا بِالَّذِي يَرَوْنَ فَالْتَاطَ بِهِ، وَدُعِيَ ابْنَهُ لاَ يَمْتَنِعُ مِنْ ذَلِكَ، فَلَمَّا بُعِثَ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِالْحَقِّ هَدَمَ نِكَاحَ الْجَاهِلِيَّةِ كُلَّهُ، إِلاَّ نِكَاحَ النَّاسِ الْيَوْمَ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود[1].

**عائیشه** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: لە سەردەمی نەزانیدا واتە: لە زەمانی جاهلییەتا ژنهێنان بە یەکێ لەم چوار شێوەیە بوو:**

**یەکەم: لەسەر ئەم شێوەی ژنهێنانەی ئێستا باوە لەناو خەڵکا: پیاوێ دەچوو خوازبێنی لە پیاوێکی تر دەکرد، سا یا هی کچێکی یا هی هەقدارێکی تری، وە مارەیی دەدایە، وە وەك چۆن ئێستا باوە ئاوا بە رێكو پێکی مارەی دەبڕیو دەیگواستەوە.**

**دووەم: پێیان دەگووت ژنهێنانی لێ چاککردن! بەم رەنگە پیاوەکە بە ژنەکەی خۆی دەگوت (کە لە بێنوێژیی پاك دەبۆوە): بنێرە بۆ لای فیسارە پیاو کە بۆ پیاوەتیو خانەدانی بە ناوبانگ بوو بنێرە بۆ لای خۆتی لێ چاك کە! ئیتر مێردەکەی توخنی نەدەکەوت هەتا سکی پڕ دەبوو لەو پیاوەی تر، جا کاتێ کە سکەکەی دیاری دەدا ئەوسا ئەگەر خۆی مەیلی ببوایە دەچووەوە لای! وە پیاوەکە ئەمەی بۆ ئەوە دەکرد کە منداڵی خانەدانی ببێ.**

**ژنهێنانی سێیەم بەم شێوەیە بوو: دەستەیەك (لە دەکەس کەمتر) یەکیان دەگرتو هامووشۆی ژنێکیان دەکردو هەموویان لاقەیان دەکردو دەچوونەلای،**

---

[1] بخاری. نکاح: ٥١٢٧.

جا کە ژنەکە سکی دەکردوو سکەکەی دادەنا لەپاش چەند شەوێ دەینارد بە شوێنیانا، جا هەموویان لای ژنەکە یەکیان دەگرت پێی دەگوتن: خۆتان لە کارەکە دەزانن، ئەوەتانێ منالّم بووە، ئەی فیسار! ئەمە کوڕی تۆیە، ئیتر ژنەکە بە ئارەزووی خۆی ناوی پیاوێکیانی دەبرد، ئیتر منالّی ژنەکە دەبوو بەهی ئەو پیاوە، وە پیاوەکە نەیدەتوانی کە حاشای لێبکا.

**شێوەی چوارەم: بەم چەشنە بوو:** پیاوگەلێکی زۆر کۆ دەبوونەوەو دەچوونە لای ژنێ و یەکە یەکە لاقەیان دەکردو ئەو ژنەیش هەر پیاوێ رووی لێ بنایە دەستی نە دەنا بەروویەوەو جووت دەبوو لەگەڵی، وە بەم ژنانەیان دەگوت: سەڵیتەو سۆزانی، جا ئەم ژنانە بۆ نیشانە لەبەر دەرگایماڵەکانیانا ئاڵایان هەڵدەکرد!! ئیتر هەر کەسێ بیویستنایە دەرۆیشتە لایان وە شەوو رۆژ دەرگایان لەسەر پشت بوو وەك ئاو دەستی بێ دەرگا! جا هەرکاتێ یەکێ لەم ژنانە منالّێکی دەبوو، ئەو پیاوانەیان لەلای کۆ دەکردەوەو شێوەناس (قائیف)ەکانیان کۆ دەکردەوە بۆیان و ئەوانیش منداڵەکەیان بەهی کامیان بزانیبایە دەیان نووسان بەوەوەو ئیتر دەلکا پێیەوەو بە کوڕی ئەو ناو دەبرا، وە خۆشی حاشای لێ نەدەکرد جاکاتێ کە خودای گەورە موحەممەدی بەم ئایینە راست و دروستەوە رەوانەکرد، ئیتر هەرچی شێوەی ناڕەوای ژنهێنانی سەردەمی نەزانی بوو لای بردو رووخاندی، جگە لەم ژنهێنانەی کە ئێستا باوە لەناو خەڵکا (ب/د).

## ٥٩) وەکی ژن بە ژن ئەویش حەرامە: (ومنه نكاح الشغار)

٢٢٠٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ شِغَارَ فِي الإِسْلاَمِ. رَوَاهُ مسلم والترمذي[1].

---

[1] مسلم. نكاح: ٣٤٥٣.

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ژن بەژن و ئیسلامەتییان نەگوتووە! (م/ت).

٢٢٠٧- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نَهَى عَنِ الشِّغَارِ، وَالشِّغَارُ أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ الآخَرُ ابْنَتَهُ، لَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

دیسان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) جڵەو گیریی دەکرد لە ژن بەژن! ژن بەژنیش ئەوەتانێ کە دوو پیاو بەکچی خۆیان ژن بەژن بکەن بەبێ مارەیی (ش/د/ت/ن).

٢٢٠٨- وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): وَالشِّغَارُ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: زَوِّجْنِي ابْنَتَكَ وَأُزَوِّجُكَ ابْنَتِي أَوْ زَوِّجْنِي أُخْتَكَ وَأُزَوِّجُكَ أُخْتِي. رَوَاهُ مسلم والله أعلى وأعلم[٣].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: ژن بەژن ئەوەتانێ کە پیاوێ بە پیاوێ بڵێ: کچەکەتم لێ مارە بکە، منیش کچەکەی خۆمت لێ مارە دەکەم، یا بڵێ پێی: خوشکەکەتم لێ مارە بکە منیش خوشکەکەی خۆمت لێ مارە دەکەم، یا پێی بڵێ: هەقدارەکەی خۆتم لێ مارە بکە منیش هەقدارەکەی خۆمت لێ مارە دەکەم (م).

## ٦٠) سیغەکردن حەرامە: (ومنه نكاح المتعة)

٢٢٠٩- عَنْ جَابِرٍ وَسَلَمَةَ (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) قَالاَ: كُنَّا فِي جَيْشٍ فَأَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُمْ أَنْ تَسْتَمْتِعُوا فَاسْتَمْتِعُوارَوَاهُ الشيخان[١].

---

[٢] بخاری. حیل: ٦٩٦٠. مسلم. نكاح: ٣٤٥٤. نسائی. نكاح.

[٣] مسلم. نكاح: ٣٤٥٤.

**جابیرو سەلەمە** (خودای گەورەیان لێ خۆش نوود بێ) **گوتیان: لەناو سوپایەکا بووین، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **خۆی، لە ریوایەتی بوخاریدا فروستادەی پێغەمبەر هات بۆ ناومان فەرمووی: رێگەی ژن سیغەکردنتان دراوە ژن سیغە بکەن (ش).**

٢٢١٠- عن عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نَهَى عَنِ الْمُتْعَةِ وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ يَوْمَ خَيْبَرَ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

**عەلی** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە رۆژی غەزای خەیبەردا جڵەوگیریی لەم دوو شتەکرد: لە ژن سیغەکردن و لە خواردنی گۆشتی کەری ماڵی (ش/د/ت/ن).**

٢٢١١- وَقَالَ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَامَ أَوْطَاسٍ فِي الْمُتْعَةِ ثَلاثًا ثُمَّ نَهَى عَنْهَا. رَوَاهُ مسلم[٣].

**سەلەمە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: لە ساڵی غەزای ئەوطاسدا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **بۆ جاری سێیەم رێگەی ژن سیغەکردنی دایەوە، بەڵام لە پاشا بە ئێجگاریی یاساخی کردەوە (م).**

٢٢١٢- عَنْ سَبْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قائِماً بَيْنَ الرُّكْنِ والبَابِ وَهُوَ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ فِي الاسْتِمْتَاعِ مِنَ النِّسَاءِ وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ ذَلِكَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَيْءٌ فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهَا وَلاَ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا. رَوَاهُ مسلم وأبو داود والنسائي. والله أعلى وأعلم[٤].

---

[١] بخاری. نکاح: ٥١١٧، ٥١١٨. مسلم. نکاح: ٣٣٩٩.

[٢] بخاری. مغازی: ٤٢١٦، ٥١١٥، ٥٥٢٣، ٦٩٦١. مسلم. نکاح: ٣٤١٧ — ٣٤٢١، ٤٩٨١، ٤٩٨. ترمذی. نکاح: ١١٢١، ١٧٩٤. نسائی. نکاح: ٣٣٦٥، ٣٣٦٦، ٣٣٦٧، ٤٣٤٥، ٤٣٤٦.

[٣] مسلم. نکاح: ٣٤٠٤.

[٤] مسلم. نکاح: ٣٤٠٥ — ٣٤١٦. أبو داود. نکاح: ٢٠٧٢، ٢٠٧٣. نسائی. نکاح: ٣٣٦٨.

سـەبرە (خـودای لێ رازی بـێ) گـوتی: لـە بـەینی گۆشـەی حەجەرولئەسـوەدو دەرگای کابەدا، پێغەمبەرم دی لەوێ راوەستا بوو لەکاتی حـەجی ماڵئاواییدا دەیفـەرموو (درودی خـودای لەسـەربێ): خەڵکینـە! ئـەی موسـوڵمانینە! لەمـەوپێش ئەوەبوو خـۆم رێگـەم پـێ دابوون کـە ژن سـیغە بکـەن. واتـە: ژن بۆ ماوەیەکی دیاریکراو مارە بکەن بەڵام لەم دەمەوە هەتا رۆژی قیامەت خودا ئەوەی حەرام کرد، ئیتر لە ئێستاوە هەر کەسێ یەکێکی لەم ژنانە لەلا هەیە با بـەرەڵای بکـا، وە هەرچیشیان داونەتێ هیچیان لێ مەسەندنەوە (م/د/ن).

## ٦١) ژنهێنانو ژن بەشوودان لەکاتی دابەستنی ئیحرامی حەجو عەمرەدا دروست نیە، ژن هێنانی بەندەیش بەبێ رەزای خاوەنی هەروەها، مارە بە جاشیش هەروەها:

### ومنه نكاح المحرم والتحليل والعبد

٢٢١٣- ⬅ (ب- ز-٨٥ ل-ف-١)[1].

٢٢١٤- عَنْ عَبْدِ اللهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ. رَوَاهُ الترمذي وصاحباه (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُم)[2].

عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) لەعنـەتو نەفرینی کردووە لە جاش (موحەللیل)و لـەو پیاوەش کـە ژنـی خـۆی بـە مـارە بەجاش چاك دەکاتەوە (ت/د/ن:ص).

٢٢١٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: أَيُّمَا عَبْدٍ تَزَوَّجَ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَهُوَ عَاهِرٌ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَنِكَاحُهُ بَاطِلٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي بسند حسنٍ. والله أعلى وأعلم[3].

---

[1] تقدم تخريجه في رقم: ١٥٠٩/١ تسلسل/ ٨٥ ج/ ٢.

[2] بسند صحيح (شرحه).

[3] بسند حسن.

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: هەر بەنـدەیێ (بـەبێ ڕەزای خاوەنەکـەی) ژن بێنـێ ئـەوە شـەڕواڵ پیـسە لـە گێڕانەوەیەکا: ژنهێنانەکەی پووچو بەتاڵە (د/ت-س/ح).**

٢٢١٦- ولأبْنُ مَاجَه (كما في الشرح): أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِالتَّيْسِ الْمُسْتَعَارِ؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: هُوَ الْمُحَلِّلُ لَعَنَ اللَّهُ الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ[٤].

**حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی بە یاران** (خودایان لێ ڕازی بێ)**: ئـەدیی باپێتـان بڵـێم کـە تەگـەی خـوازراو کێیـە؟! گوتیـان: ئـادەی بفـەرموو ئـەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئەوە جاشە، لەعنەتو نەفرینی خودا لە جاشو لـەو پیـاوەش کـە تـەڵاقی ژنـی خـۆی بـە جـاش چاك دەکاتـەوە! (ئیبنو ماجـە/ بەپێی غایەتولمەئموول).**

## ٦٢) باسی نۆهەم: باسی تەڵاق: (الباب التاسع: في الطلاق)

٢٢١٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَبْغَضُ الْحَلاَلِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى الطَّلاَقُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والحاكم وصححّه[١].

**ئیبنـو عومـەر** (خودایـان لێ ڕازی بـێ) **گـوتی: پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **فەرمووی: دزێوترین حەڵاڵ لەلای خودای گەورەو سەروەر تەڵاقە.**

وَفِي رِوَايَةٍ ذكرها المؤلفُ في شرحه المرسوم بغايةِ المأمولِ: مَا أَحَلَّ اللَّهُ شَيْئًا أَبْغَضَ إِلَيْهِ مِنَ الطَّلاَقِ.

**لـە گێڕانەوەیـەکا (بـەپێی شـەرحەکە) حـەزرەت** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **دەفـەرموێ: هـیچ حـەڵاڵێك نیـە وەك تـەڵاق لەگـەڵ ئەوەیشا کـە خـودا حـەڵاڵی کردووە کەچی گەلێ ڕقی لێیەتی!**

---

[٤] سكت عنه الشارح.

[١] صحيح عند الحاكم.

٢٢١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ خَبَّبَ امْرَأَةً عَلَى زَوْجِهَا أَوْ عَبْدًا عَلَى سَيِّدِهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ (بسندٍ صحيح) والنسائي(٢).

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەو کەسەی کە ژنو پیاو یا باوكو منداڵ یا بەندەو ئاغا یا دوو خزم، یا دوو دۆست لەیەك بكاو لەیەكیان هەڵبگێڕێتەوە لە ئێمە نیە (د-سند صالح-ن).

٢٢١٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تَسْأَلُ الْمَرْأَةُ طَلاَقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَهَا وَلْتَنْكِحْ فَإِنَّ لَهَا مَا قُدِّرَ لَهَا. رَوَاهُ الأربعة(٣).

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دروست نیە بۆ ژن کە داوای تەڵاق دانی خوشكی ئایینی خۆی بكا، تا ئەو بە تەڵاقدان بداو خۆی بە شوێنەكەی شاد ببێ! چونكە ئەوەی کە لە چارەی نووسراوە هەر ئەوەی بۆ دەبێ كەواتە ئیتر بۆ ناهەقی لەو ژنە بەسەزمانەی تر دەكاو خانەو لانەی لێ تێك دەدا (ش/د/ت).

٢٢٢٠- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلاَقًا فِي غَيْرِ مَا بَأْسٍ فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن وحسَّنه الترمذي(٤).

ثەوبان (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر ژنێ (بەبێ بەهانەیەكی رەوا) داوای تەڵاق دان لە مێردەكەی بكا بۆنی بەهەشت ناكا (د/ت:ح-ن).

---

(٢) بسند صالح.

(٣) مسلم. نكاح: ٣٤٢٨.

(٤) حسن عند الترمذي.

٢٢٢١- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُم) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ طَلاَقَ إِلاَّ فِيمَا تَمْلِكُ وَلاَ عِتْقَ إِلاَّ فِيمَا تَمْلِكُ وَلاَ بَيْعَ إِلاَّ فِيمَا تَمْلِكُ وَلاَ وَفَاءَ نَذْرٍ إِلاَّ فِيمَا تَمْلِكُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي (بسندٍ حسن)[٥].

عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە (ڕەزای خودای گەورەیان لێبێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: تەلاق کاتێ دەکەوێ کە تۆ خاوەنی ئەو ژنە بی لەکاتی تەلاقدانەکەدا، وە بەندەیش کاتێ ئازاد دەبێ کە لەکاتی ئازادکردنەکەدا هی تۆ بێ، وە شت کاتێ فرۆشتن (بەیع)ی دێ کە لەکاتی فرۆشتنەکەدا هی تۆ بێ کە دەیفرۆشی، وە ئەوەیش کە ماڵی تۆ نەبێ نەذری دانامەزرێ (د/ت-س/ح).

٢٢٢٢- (ب- ١ز- ٤ل- ف - ١٠)[٦].

٢٢٢٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: ثَلاَثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: النِّكَاحُ وَالطَّلاَقُ وَالرَّجْعَةُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي والحاكم وصححَّه[٧].

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم سێ شتە چ بە گاڵتەوە بێ و چ بە ڕاستەوە بێ هەر بە ڕاست حلێن:

یەکەم: ژن مارە بڕین.

دووەم: ژن تەلاق دان.

سێیەم: ژن گێڕانەوە بۆ ژێر ژنێتی خۆی واتە: ڕیجعەتی ژنی تەڵاق دراو (د/ت/حاکم:ص).

---

[٥] بسند حسن.

[٦] تقدم تخريجه في رقم: ٣٢/١٠ تسلسل/ ٤ ج/١.

[٧] صحيح عند الحاكم.

٢٢٢٤- عَنْ عَلِيّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَلَيْهِ السَّلاَمُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلما[٨].

**عەلی** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەم سێ کەسە نووسین و گلەیی و تەکلیفیان لەسەر نیە: خەوتوو تا خەبەری دەبێتەوە، منداڵ تا رەسیدە دەبێ، شێت تا هۆشیار دەبێتەوە (ب-موقوفا-د/ت/ن).**

٢٢٢٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: كُلُّ طَلاَقٍ جَائِزٌ إِلاَّ طَلاَقَ الْمَعْتُوهِ الْمَغْلُوبِ عَلَى عَقْلِهِ. رَوَاهُ الترمذي والبخاري موقوفاً[٩].

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەموو تەڵاقێ دەکەوێ، تەڵاقی شێتێ نەبێ کە هۆشی نەبێ و سەرو بەری قسەو کاری خۆی نەزانێ (ت/ب-موقوفا).**

٢٢٢٦- عَنْ عَائِشَةُ (رَضيَ اللهُ عَنها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ طَلاَقَ وَلاَ عَتَاقَ فِي إِغْلاَقٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والحاكم وصححَّه[١٠].

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: نەژن تەلاق دان و نە بەندە ئازادکردن هیچیان بە زۆر نابێ یا هیچیان لەکاتی تووڕەبوونی لە رادەبەدەردا سەر ناگرن (د/حاکم:ص).**

## ٦٣) ژمارەی تەڵاق: (عدد الطلاق)

٢٢٢٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: كَانَ الرَّجُلَ إِذَا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِرَجْعَتِهَا وَإِنْ طَلَّقَهَا ثَلاَثًا فَنَسِخَ ذَلِكَ بِقَصولِهِ تَعَالَى: {الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ}. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[١].

---

[٨] تعليق ذكره البخارى فى كتاب النكاح باب/ ١١ قبل الرقم: ٥٢٦٩ مباشرة خمن جملة من التعاليق الأخرى.

[٩] تعليق ذكره البخارى عَن على فى الباب/ ١١ من كتاب الطلاق، قبل الرقم: ٥٢١٩ مباشرة.

[١٠] صحيح عند الحاكم.

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: جاران پیاو کە ژنی تەڵاق دەدا، هەر کاتێ بیویستایە دەیهێنایەوەو دەیکردەوە بە ژنی خۆی، باسی تەڵاقیشی بدایە، تا خودای گەورە بەم ئایەتە ئەمەی هەڵوەشاندەوە:**

**{الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ}. (٢/٢٢٩)**

**واتە: ژن تەڵاقدان دووجارە، ئیتر لەپاش ئەو دووجارە مێرد دەبێ یا بە جوانی ئەو ژنە رابگرێ، یا ئەگەر بۆ جاری سێیەم تەڵاقی دایەوە ئیتر فڕی بە سەریەوە نامێنێ و مافی ئەوەی نامێنێ کە لە ماوەی عیددەدا بیهێنێتەوە[١] (د/ت/ن-س/ص).**

---

[١] بسند صحيح (شرحه).

(١) مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە، خودای گەورە دەست بە عەمری بگرێ، لە تەفسیری نامی زێڕیندا، دەوری بیست و دوو پەڕەی لەسەر ئەم ئایەتە پیرۆزەیە نووسیوە، منیش لە ١٩٨٢/١/١٧دا کاتێ ئەم باسە دوورو درێژەی مامۆستام خوێندەوە ئەم پەراوێزەم لەسەر نووسی، ئێستا لێرەدا بەبێ دەستکاری روونووسی دەکەمەوە، وەڵێ خوا هەقە نووسینەکەی مامۆستا مەلایانەو زانایانەیە، وە ئەم پەراوێزە شڕەی منە بە تۆزی قولیا ناگا. ئەمەیش دەقی نووسینەکەی منە: بەندەیش دەڵێم: مەلایان خودا سەلامەتیانکا مەسەلەی تەلاقیان کردووە بە مەتەڵ و ریازیات و تەلەسم، بە هەموو کەس و بە هەموو مەلایەك حەل ناکرێ، مەگەر بە کەسێ مێزەرەکەی حەوت تۆپ جاو بێ!!

بەڵام بەخودا مەسەلەکە لە راستیدا گەلێ ئاسانترە لەم گێرەو کێشەیەی کە مەلایان دروستیان کردووە: ئەویش ئەمەیە: پیاو هەقی هەیە تا سێ جار ژنی خۆی تەڵاق بدا، بەرەڵای بکا. جا دیارە ئەم تەڵاقدان و بەرەڵاکردنە دەبێ لەسەر شێوەیەکی رێك و پێك بێ، کە زیانی زۆری نەبێ بۆ کۆمەڵ، ئەوەیش دیارە لە ئەستۆی زاناو قازی و دەوڵەتە. جا هەر کاتێ ئەم دەستەیە بۆ رەزای خوداو بەرژەوەندی ئیسلام تەنزیمی تەڵاق و ژن تەڵاقدانیان بە شێوەیەکی جوان کرد ئیتر پێویستە لەسەر رەشە خەڵکەکە مل کەچی ئەوە بن و لەم سەرگەردانییە خۆیان رزگارکەن.

**٢٢٢٨- عَنْ أَبِي الصَّهْبَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) أَنَّهُ قَالَ لابْنِ عَبَّاسٍ: أَتَعْلَمُ أَنَّمَا كَانَتِ الثَّلاَثُ تُجْعَلُ وَاحِدَةً عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَأَبِي بَكْرٍ وَثَلاَثًا مِنْ إِمَارَةِ عُمَرَ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نَعَمْ[٢].**

**ئەبولصەهباء (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: بە ئیبنو عەبباس (خودای لێ ڕازی بێ): ئایا دەزانیت کە لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (درودی خودای لەسەربێ)و هەروا**

---

**نێستاکەیش کە ئەم بەرگە ئامادە دەکەم بۆ چاپ کە ڕێکەوتی (١٩٨٨/٢/١)ە دەڵێم: ئەم قسەیە بۆ گەلێ بابەتی تریش دەست دەدا، وەك هەندێ بابەتی ژنو ژنخوازی، وەك هەندێ بابەتی سوود کە پێی دەڵێن عیقاری، وەك جلو بەرگی ئافرەتو دەوری ژن لە کۆمەڵگای ئیسلامدا، وەك مەسەلەی مەنعولحەملو تەشریحی لاشەی ئادەمیزادو سوود وەرگرتن لە هەندێ مادەی موخەددیر/ بۆ مەبەستی پزیشکی وەك گەلێ بابەتی تر. ئێستاکەیش کە (٢٠٠٧/٦/٢)ە، وە ئەم بەرگە ئامادە دەکەم بۆ چاپی دووەم، وە توحفەی ابن حەجەر، بەشی تەڵاقی بەدەرس دەڵێمەوە بە کۆمەڵی خوێندکاری خوێندنی باڵا، دەڵێم: بەخوا مەسەلەکە گەلێ لەمە ئاسانترە کە توحفەی ابن حەجەر دەیفەرموێ.**

**وەلێ ئەوەی کە گومانی تیا نیە موسوڵمانان بۆ کارو باری ئایینی خۆیان نابێ بە قسەی ئەمو ئەو لە فەرمایشتی مەلاکان دەربچن. چونکە ئیسلام ئەوەیە کە مەلاکان دەیڵێنو بەس، قسەی ئەفەندیو مەفەندی بۆ کاروباری دنیایی دەشێ نەك بۆ ڕافەی دین (ئەمە: ڕاسترین قسەیە لەم بارەیەوە/٢٠٠٧/٤/١٣).**

**برا ئەگەر دەتەوێ سەرفرازی لای خودابی لە قسەی مەلای داناو زانا دەرمەچۆ، بە قسەی بکە زەرەر ناکەی. ئەمە لەلایێ، وەلێ بۆئەوەی ئەبێ بەتێکەولێکە دەڵێم:**

**١- لەم قۆناغەدا باشترین سەرچاوەی ئایینی کتێبە کۆنەکانەو فەتوای مامۆستا ئایینییەکانە. (ئەمە حەقیقەتە قەت کۆن نابێ ٢٠٠٧/٤/١٣).**

**٢- مەبەست لەو تەنزیمو بەرنامە ڕێژییە خزمەتی شەریعەتی ئیسلامو میللەتی ئیسلام بێ، نەك بە زۆرەملێ بێو بۆ تەتویعی شەریعەتبێ بۆ موسایەرەی قانوونی وەزعی. ئەوە پێی دەڵێن تەحریفو تەبدیل، داخەکەم زوربەی ئەوەی پێی دەڵێن قانوونی دینی لەم ڕۆژەی ئێمەدا لەم بابەتەیە. -وەرگێڕ-**

[٢] مسلم. طلاق: ٣٦٥٩. أبو داود. طلاق: ٢٢٠٠. نسائی. طلاق: ٣٤٠٦.

لەسەردەمی جێنشینیی ئەبو بەکرداو هەتا سێ ساڵیش لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عومەردا، ئایا دەزانیت کە لەو ماوەیەدا سێ تەڵاقە تەنیا بەیەك تەڵاق دادەنرا؟ ئیبنو عەبباسیش (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بەڵێ دەزانم کە وابوو (م/د/ئەحمەد).

٢٢٢٩- وَقَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عنهما): كَانَ الطَّلاَقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولُ اللهِ (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم) وَأَبِي بَكْرٍ وَسَنَتَيْنِ مِنْ خِلاَفَةِ عُمَرَ طَلاَقُ الثَّلاَثُ وَاحِدَةً فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: إِنَّ النَّاسَ قَدِ اسْتَعْجَلُوا فِي أَمْرٍ قَدْ كَانَتْ لَهُمْ فِيهِ أَنَاةٌ فَلَوْ أَمْضَيْنَاهُ عَلَيهِمْ. فَأَمْضَاهُ عَلَيهِمْ. رواهما مسلم وأبو داود أَحْمَدُ[٣].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران بەسەرینیی پێغەمبەر خۆی‌و، لە سەردەمی جێنشینیی ئەبو بەکردا تەڵاقی سێ تەڵاقە یەك تەڵاق بوو، تا دوو ساڵیش لە سەردەمی جێنشینیی عومەر ڕۆیشت ئەم حاڵە هەر وا مابوو، لەپاشا عومەری کوڕی خەتتاب گوتی: ئەم خەڵکە لەپێشدا لەم کارەدا بە شێنەیی بوون‌و پشوو درێژ بوون، بەڵام ئێستا سەریان تێ کردووەو زۆر لێی بەپەلەن، کەوابوو با حوکم بکەین بە کەوتنی سێ تەڵاقە، جا لەپاش ڕاوێژکردن لەگەڵ یارانیا بۆ ئەم مەسەلەیە حوکمی کرد بە کەوتنی تەڵاقی سێ تەڵاقە (م/د/ئەحمەد).

٢٢٣٠- عَنْ رُكَانَةَ عَنْ بْنِ عَبْدِ يَزِيدَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنِّي طَلَّقْتُ امْرَأَتِي الْبَتَّةَ. فَقَالَ: مَا أَرَدْتَ بِهَا؟ قُلْتُ: وَاحِدَةً. قَالَ: وَاللّٰهِ. قُلْتُ: وَاللّٰهِ. قَالَ: فَهُوَ مَا أَرَدْتَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي والشافعي والحاكم وصححَّه[٤].

روکانەی کوڕی عەبدویەزید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ژنەکەمم بە ئێجگاری تەڵاق داوە. فەرمووی: مەبەستت لە ئێجگاری (ئەلبەتتەتە) چی

---

[٣] تقدم تخريجه بمثل الحديث الذى قبله (الحديث ٢/٢١٩٣).

[٤] صحيح عند الحام.

**بوو؟ گوتم: مەبەستم یەك تەڵاق بوو. فەرمووی: بڵێ بەخودا گوتم: بە خودا. فەرمووی: مەبەستت چی بوو بۆ هەر ئەوە حەڵە! (د/ت/شافیعی/حاکم:ص).**

**٢٢٣١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: طَلَاقُ الأَمَةِ تَطْلِيقَتَانِ وَعِدَّتُهَا حَيْضَتَانِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي. والله أعلى وأعلم[٥].**

**عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ژمارەی تەڵاقی کەنیزەك (واتە: ئەمەتە: کەنیز) دوو تەڵاقە وە عیددەیشی دوو بێنوێژییە (د/ت:س/ص).**

## ٦٤) تەڵاقی سوننی و ژن گێڕانەوە: (طلاق السنة والرجعة)

**قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ }. (٦٥/١).**

**واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بە موسوڵمانان بفەرموو هەر کاتێ ویستتان ژن تەڵاق بدەن با لە کاتێکدا تەڵاقیان بدەن کە ماوەی عیددەیە، کە کاتی پاکی ژنانە لە بێنوێژیی و، زەیستانی، وە ژمارەی رۆژی کاتی عیددەکەیان رابگرن، وە بەردەوام لە خودا بترسن.**

**٢٢٣٢- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَسَأَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ تَحِيضَ، ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ. رَوَاهُ الخمسة إلاَ الترمذي[١].**

---

[٥] بسند ضعيف (شرحه).

[١] بخاری. طلاق: ٥٢٥١، ٤٩٠٨، ٥٢٥٢، ٥٢٥٣، ٥٢٥٨، ٥٢٦٤، ٥٣٣٢، ٧١٦٠. مسلم. طلاق: ٣٦٣٧. أبو داود. طلاق: ٢١٧٩. نسائی. طلاق: ٣٣٩٠.

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: بە سەرینیی حەزرەت خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) ژنێکم بێنوێژبوو تەڵاقم دا، عومەر (خودای لێ رازی بێ) بۆ ئەمە لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەپرسێ، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: پێی بڵێ با ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر نیکاحی، ئینجا بیهێڵێتەوە لەلای خۆی تا لە بێنوێژیی پاك دەبێتەوەو جارێکی تر دەکەوێتەوە بێنوێژیو دیسان پاك دەبێتەوە ئیتر لەوە دوا ئەگەر ئارەزوو دەکا رای بگرێ لای خۆیو ژنی خۆیەتی ئەگەر ئارەزووش دەکا بەرلەوەی کە بچێتە لای تەڵاقی بدات، ئەمە ئەو عیددەیەیە کە خودا فەرمانی کردووە کە ژنی تیا تەڵاق بدرێ (ش/د/ن).

٢٢٣٣- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَتْ تَحْتِي امْرَأَةٌ أُحِبُّهَا وَكَانَ أَبِي يَكْرَهُهَا فَأَمَرَنِي أَبِي أَنْ أُطَلِّقَهَا فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَذَكَرْتُ لَهُ فَقَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ طَلِّقِ امْرَأَتَكَ. رَوَاهُ الترمذي وأَبُو دَاوُدَ[٢].

دیسان گوتی: ژنێکم هەبو خۆشم دەویست، بەلام باوکم حەزی لە چارەی نەبوو، جا پێی گوتم کە بەرەڵای بکەم، منیش چووم بۆ خزمەتی حەزرەتو حاڵەکەم عەرزکرد، فەرمووی: ئەی عەبدوڵلا! ژنەکەت تەڵاق بدە (ت/د-س/ص).

٢٢٣٤- عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) طَلَّقَ حَفْصَةَ ثُمَّ رَاجَعَهَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٣].

عومەر (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حەفصەی تەڵاقدا، لەپاشا گێڕایەوە بۆ ژێر رکێفی خۆی (د/ن).

٢٢٣٥- وَقَالَ مَحْمُودَ بْنَ لَبِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أُخْبِرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِرَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثَ تَطْلِيقَاتٍ جَمِيعًا فَقَامَ غَضْبَانَ ثُمَّ قَالَ: أَيُلْعَبُ بِكِتَابِ اللَّهِ وَأَنَا

---

[٢] بسند صحيح (شرحه).

[٣] سكت عنه الشارح.

بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟ حَتَّى قَامَ رَجُلٌ وَقَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ: أَلاَ أَقْتُلُهُ. رَوَاهُ النسائي بسندٍ جيّدٍ. والله أعلى وأعلم[٤].

مەحموودی کوڕی لەبید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: عەرزی حەزرەت کرا (دروودی خودای لەسەربێ): کە ئەو پیاوە ژنەکەی خۆی سێ بە سێ بەسەر یەکەوە تەڵاق داوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) بە تووڕەیی هەڵساو فەرمووی: ئەمە چۆن حاڵێکە من خۆم هێشتاکە ماوم و شەوو رۆژ لەناوتانام کەچی گاڵتە بە نامەی خودا دەکرێ و بەپێی ئایەتی (الطلاق مرتان) رەفتار ناکرێ جا دەبێ لەپاش من چی فەرتەنەیەك بەرپا بکرێ (ن-سند جید).

## ٦٥) ژنێ سێ بەسێ تەڵاق بدرێ هەتا مێردێکی تر نەکا حەڵاڵ نابێتەوە بۆ مێردەکەی: (لا تحل المطلقة ثلاثاً حتى تنكح زوجاً غيره)

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ} (٢/٢٣٠).

خودای گەورە دەفەرموێ: ئەگەر لەپاش ئەو دوو تەڵاقەی کە لە ئایەتی: (الطلاق مرتان)دا باسکرا مێردی ژنەکە جارێکی سێهەم ژنەکەی تەڵاقدا، خوا بە خۆڕایی بێ یا لە سەرماڵ بێ، ئەوە ئیتر ئەو ژنە حەڵاڵ نابێتەوە بۆ ئەو پیاوە هەتا شوودەکا بە مێردێکی تر.

٢٢٣٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) قَالَتْ: أَنَّ امْرَأَةَ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ رِفَاعَةَ طَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلاَقِي، وَإِنِّي نَكَحْتُ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ الْقُرَظِيَّ، وَإِنَّمَا مَعَهُ مِثْلُ الْهُدْبَةِ. قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّم): لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ، لاَ، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ. رَوَاهُ الخمسة[١].

---

[٤] رَوَاهُ النسائي بسند جيد (شرحه).

[١] بخاري. شهادات: ٢٦٣٩، ٥٢٦٠، ٥٢٦١، ٥٢٦١\٢، ٥٢٦٥، ٥٣١٧، ٥٧٩٢، ٥٨٢٥، ٦٠٨٤. مسلم. طلاق: ٣٥١٢. ترمذي. نكاح: ١١١٨.

**عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ژنەکەی ریفاعەی قورەظی هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ریفاعە بە ئێجگاری تەڵاقی دامو لەپاش ئەو شووم کردەوە بە ئەورەحمانی کوڕی زەبیری قورەظی بەڵام چووکی ئەو رەحمان وەك پەتك وایەو جیماعی پێ ناکرێ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: رەنگ بێ بتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ لای ریفاعەی مێردی پێشووت شتی وا نابێ تا تۆو ئەوڕەحمان خۆشی جووتبوون (جیماع) لە یەکتریی نەچێژن (ش/د/ت/ن).**

**٢٢٣٧- وَ جَاءَتْ الْغُمَيْصَاءَ أَوِ الرُّمَيْصَاءَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْها) إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تَشْتَكِي زَوْجَهَا أَنَّهُ لاَ يَصِلُ إِلَيْهَا فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ جَاءَ زَوْجُهَا فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ هِيَ كَاذِبَةٌ وَهُوَ يَصِلُ إِلَيْهَا (وَفِي رِوَايَةٍ: أَنَّهُ ينفضها نفض الأديم) وَلَكِنَّهَا تُرِيدُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَى زَوْجِهَا الأَوَّلِ. فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لَيْسَ ذَلِكَ لَكِ حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ. رَوَاهُ النسائي والله أعلى وأعلم. أعلى وأعلم[٢].**

**غومەیصاء یا رومەیصاء (خودای لێ رازی بێ) هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سکاڵای بوو لە دەستی مێردەکەی، کە ناتوانێ بڕواتە لای و جووت بێ لە گەڵیا گوایە ئەندامەکەی بچووکە ناگاتە جێگەی خۆی، یا شلەپەتەیە، جا ئەوەندەی نەخایاند کە مێردەکەی هات، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم ژنە درۆ دەکا، بەڵام ئەمە بیانووە دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ لای مێردە پێشووەکەی ئەگینا من وەك کەوڵ دەی هەژێنم حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەت بۆ نیە هەتا خۆشی و لەزەتی چوونەلای ئەم مێردەشت نەچێژی (ن).**

---

[٢] سكت عنه الشارح.

## ٦٦) سپاردنی کاروباری ژن بەخۆیو خۆخاترکردنی:
## تخيير الزوجة وتفويض أمرها لها

٢٢٣٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) قَالَتْ: خَيَّرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَاخْتَرْنَا اللَّهَ وَرَسُولَهُ، فَلَمْ يَعُدَّ ذَلِكَ عَلَيْنَا شَيْئًا. رَوَاهُ الخمسة (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنهُم)[1].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆمانی کرد بە سەرپشك کە یا بە ژنێتیی حەزرەت رازی بین یا لێی جیاببینەوە ئێمەیش کە هاوسەرانی پێغەمبەر بووین هەمووومان خوداو پێغەمبەری خودامان ویستو پێغەمبەرمان هەڵبژارد، وە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوەی حل نەکرد بە تەڵاق لە سەرمان (ش/د/ت/ن- رەزای خودایان لێبێ).

٢٢٣٩- وَ عَنْ عَائِشَةُ فِي قصَّةِ بَرِيرةَ (رَضيَ اللهُ تَعَالَى عَنهُمَا) قَالَتْ: وَكَانَ زَوْجُهَا عَبْدًا فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا وَلَوْ كَانَ (زوجُها) حُرًّا لَمْ يُخَيِّرْهَا. رَوَاهُ الخمسة ولفظ مسلمٍ في العتق: كَانَ فِي بَرِيرَةَ ثَلاَثُ قَضِيَّاتٍ أَرَادَ أَهْلُهَا أَنْ يَبِيعُوهَا وَيَشْتَرِطُوا فَقَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنَّ وَلاَءَ لِمَنْ أَعْتَقَ وَعُتِقَ فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا. قَالَتْ: وَكَانَ النَّاسُ يَتَصَدَّقُونَ عَلَيْهَا فَتُهْدِي (من تلك الهدايا بعد قبضها). فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ وَهُوَ لَكُمْ هَدِيَّةٌ فَكُلُوهُ[2].

لە داستانەکەی بەریرەدا (خودای لێ رازی بێ) عائیشە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: مێردەکەی بەریرە بەندەبوو، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەریرە خۆیی کرد بە سەرپشك: کە یا وەك جاران کە خۆشی کەنیز بوو هێشتا ئازاد نەکرابوو بەلای مێردەکەیەوە دانیشێت، یا هەر لە ئێستاوە دەستی لێ هەڵگرێت، دەنا ئەگەر مێردەکەی ئازادو سەربەست بووایە، پێغەمبەر (دروودی

---

[1] بخاری. ١٤٩٥، ٢٥٧٧، ٥٢٢٦، ٥٢٦٣. مسلم. طلاق: ٣٦٦٨. ترمذی. طلاق: ١١٧٩. نسائی. نكاح: ٣٢٠٣، ٣٤٤١، ٣٤٤٢، ٣٤٤٣.

[2] بخاری. مكاتب: ٢٥٦٣. مسلم. عتق: ٣٧٥٩ — ٣٧٦٦ أبو داوُد. طلاق: ٢٢٣٣. ترمذی. رضاع: ١١٥٤. نسائی. طلاق: ٣٤٥١.

خودای لەسەربێ) بەریرەی خاتر خۆ نەدەکرد (ش/د/ت/ن) گفتەی (م) لەباسی (عیتق)دا: لە داستانەکەی بەریرەدا سێ باسی تیابوو:

یەکەم: خاوەنەکانی ویستیان بیفرۆشن بەڵام بە مەرجێ کە هەقداریی یەکەی بۆ خۆیان بمێنێتەوە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەقداریی هی ئەو کەسەیە کە بەندەکە ئازاد دەکا.

دووەم: کە بەریرە ئازادبوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خۆیی کرد بە سەرپشك و ئەویش خۆیی هەڵبژارد و لە مێردەکەی جیا بۆوە.

سێیەم: گەلێ جار خەڵك خێریان بۆ دەهێنا، وە ئەویش لەپاش ئەوەی وەری دەگرت بە دیاریی دەیهێنا بۆ ئێمە، جا منیش ئەمەم عەرزی پێغەمبەر کرد، فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو خێرە، بەڵام لەوەوە بۆ ئێوە دەبێ بە دیاریی، کەواتە بیخۆن قەیناکا.

٢٢٤٠- وَعَنْهَا قَالَتْ: أَنَّ بَرِيرَةَ أُعْتِقَتْ وَهِيَ عِنْدَ مُغِيثٍ (عَبْدٍ لآلِ أَبِي أَحْمَدَ) فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَقَالَ لَهَا: إِنْ قَرِبَكِ فَلاَ خِيَارَ لَكِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأَحْمَدُ ولفظه: إِذَا أُعْتِقَتِ الأَمَةُ فَهِيَ بِالْخِيَارِ إِنْ شَاءَتْ فَارَقَتْهُ مَا لَمْ يَطَأْهَا[٣].

دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کاتێ بەریرە ئازاد کرا ژنی موغیث بوو، کە بەندەی خانەوادەی ئەبو ئەحمەد بوو، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەریرەی کرد بە سەرپشك وە پێی فەرموو: لەم ماوەیەدا ئەگەر مێردەکەت بێتەلات و جووت بێ لەگەڵتا ئیتر پەشیمانبوونەوەت بۆ نیە (د/ئەحمەد) گفتەی ئەحمەد ئاوایە: کاتێ کەنیزەك ئازادکرا خۆی سەرپشکە دەتوانێ بەرلەوەی کە مێردەکەی بچێتە لای لێی جیاببێتەوە و دەستی لە دەستی بێتەوە.

٢٢٤١- عَنْ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قُلْتُ لأَيُّوبَ: هَلْ عَلِمْتَ أَنَّ أَحَدًا قَالَ فِي أَمْرُكِ بِيَدِكِ أَنَّهَا ثَلاَثٌ إِلاَّ الْحَسَنَ؟ قَالَ: لاَ اللَّهُمَّ غَفْرًا إِلاَّ مَا حَدَّثَنِي قَتَادَةُ عَنْ كَثِيرٍ

---

[٣] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه). بخاری. طلاق: ٥٢٨٠، ٥٢٨١، ٥٢٨٢، ٥٢٨٣.

مَوْلَى ابْنِ سَمُرَةَ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: ثَلاَثٌ. رَوَاهُ الترمذي وصاحباه والله أعلى وأعلم(٤).

حەممادی کوڕی زەید گوتی: بە ئەییوبم گوت: ئایا گومان دەبەی کە کەسێ گوتبێتی (جگە لە حەسەن) کە گوتەی کارو باری خۆت بەدەستی خۆتبێ سێ تەڵاقەیە؟ گوتی: نەء، خودایە! لێم مەگرە، تەنیا ئەوە نەبێ کە قەتادە بۆی گێڕامەوە لە کەثیری ئازادکراوی بەنی سەموورەوە، لەئەبو سەلەمەوە، لەئەبو هورەیرەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوگوتەیە سێ تەڵاقەیە (ت/د/ن–سند ضعيف).

٢٢٤٢– قال المؤلف في شرحه المرسوم بغاية المأمول (شرح التَّاج الجامع للأصول): ولأبي دود والنسائي: عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَعْتِقَ مَمْلُوكَيْنِ لَهَا زَوْجَيْنِ، فَسَأَلَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِبْدَئِي بِالرَّجُلِ قَبْلَ الْمَرْأَةِ. قال: المؤلف شارحاً: وذلك لِأَنَّهُ أكمل ولعدم إعطائها الخيار في أمر النكاح فربَّما استنكرت البقاء تحت الرقيق(٥).

دانەر (پڕ گۆڕەکەی لە نووربێ) لەشەرحەکەدا کە ناوی غایەتولمەئموولی شەرحی تا جول ئوصووله دەڵێ: ئیمامی ئەبو داوودو ئیمامی نەسائی (خودا یان لێ ڕازی بێ) ڕیوا یەت دەکەن: کە عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) دەیەوێ ژن و مێردێ (کە هەردوکیان بەندەی زەڕخرِیدەی خۆی دەبن) ئازاد بکا، جا بۆ ئەمە لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەپرسێ، دە فەرموێ: لەپێشدا پیاوەکە ئازاد بکە ئینجا ژنەکە. دانەر لەشەرحی ئەوەدا دەڵێ: چونکە ئاوا تەواو ترە، وە لەم حالەدا ژنەکە ما فی ئەوەی نامێنێ کە نیکاحی خۆی هەڵوەشێنێتەوە، وەکی گەلێ جار وابووە ژن لەم کاتەدا ڕازی نابێتەوە بە ژنێتی مێردە بەندەکەی.

---

(٤) بسند ضعيف والصحيح وقفه على أبى هريرة (شرحه)

(٥) سكت عَن درجته الشارح.

## ٦٧) خولعکردنی ژن: (الخلع)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا} (٢٢٩) سورة البقرة

**خودای گەورە دەفەرموێ: جا ئەگەر ترسان کە هەردوو لا، سنووری خودا رانەگرن ئەوە گوناهیان ناگا ئەگەر ژنەکەی هەندێ ماڵ لە تۆڵەی بەرەڵڵاکردنی خۆیا بدا بە پیاوەکە، ئەمانە فەرمانی خودان لە سنوری ئەوانە دەرمەچن.**

٢٢٤٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ أَتَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ مَا أَعْتُبُ عَلَيْهِ فِي خُلُقٍ وَلاَ دِينٍ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُ الْكُفْرَ فِي الإِسْلاَمِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: اقْبَلِ الْحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً. رَوَاهُ البخاري والنسائي[1].

**ئیبنو عەببا س (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: ژنەکەی ثابیتی کوڕی قەیس هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! گلەییم لەڕەووشت و بەدینیی پابیت نیە، بەڵام دەترسم ئەگەر بەشێوەیەکی رەوا دەستم لەدەستی نەبێتەوە خۆم کافر بکەم، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو باخە کە لەباتی مارەیی داوێتی پێت دەیدەیتەوە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: بە ثابیت: باخەکەی لێ وەربگرەو تاقە یەك تەڵاقی بدە (ب/ن).**

٢٢٤٤- وعنه أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ اخْتَلَعَتْ مِنْهُ فَجَعَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عِدَّتَهَا حَيْضَةً. رَوَاهُ أصحاب السنن[2].

**دیسان گوتی: ژنەکەی پابیتی کوڕی قەیس خولعی کرد لەگەڵ مێردەکەی، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) یەك بێنوێژی بۆ دانا بۆ عیددە (د/ت/ن-س/ح).**

---

[1] بخاري. فلع: ٥٢٧٣، ٥٢٧٤، ٥٢٧٥، ٥٢٧٦، ٥٢٧٧.

[2] بسند حسن (شرحه).

**٢٢٤٥- اخْتَلَعَتْ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ (رَضِيَ اللهُ عَنها) عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَمَرَهَا أَو أُمِرَتْ أَنْ تَعْتَدَّ بِحَيْضَةٍ. رَوَاهُ الترمذي وصححه[٣].**

**بەسەرینیی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) روبەییعی کچی موعەوویـژ (خودای لێ رازی بێ) خۆی خولعکرد لەمێردەکەی، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێکرد (یا کەسێکی تر فەرمانی پێکرد) کەیەك بێنوێژی عیددە بگرێ (ت:ص)**

## ٦٨) حوکمی ئیلا (سوێنکاری) و ژن لە خۆ حەرامکردن:

## الأيلاء وتحريم الزوجة

**قَالَ اللهُ تَعَالَى: {لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللّـهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ، وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ } (٢/٢٢٦).**

**واتە: ئەوانەی کە سوێند دەخۆن کە لەگەڵ ژنەکانیان دروست نەبن هەقیان هەیە تا چوار مانگ چاوەڕوانی بکەن، جا ئەگەر پیاوە سوێند خۆرەکان گەڕانەوە بۆ سەر یا سا ی ژن و مێردی و لەو ماوەیەدا چوونە لایان ئەوە خودای گەورە لێخۆشبوو میهرە بانە، وە ئەگەر بڕیاری تەڵاقیاندا ئەوا خودا هەموو شتێ دەبیستێ و ئاگای لە خشەی مارو مێرووە.**

**٢٢٤٦- ← (ب-٢ز-٢٩ل-ف-٤) وفِي هَذِهِ الرواية: عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: آلَى رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِنْ نِسَائِهِ، وَكَانَتِ الفَكَّتْ رِجْلُهُ، فَأَقَامَ فِي مَشْرُبَةٍ تِسْعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، ثُمَّ نَزَلَ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللّـهِ آلَيْتَ شَهْرًا. فَقَالَ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وعِشْرُونَ. رَوَاهُ الخمسة إلا أبو داود[١].**

**لەم گێڕانەوەدا: لە ئەنەسەوە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: جا رێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سوێندی خوارد لە ژنەکانی کە یەك مانگ نەچێتە لایان، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) قاچی لە جێ چوو بوو، ئینجا دا بەزی. عەرزیان**

---

[٣] صحيح عند الترمذي.

[١] تقدم تخريجه بمثل الحديث (١٣٢٣/٤ تسلسل/ ٢٩ ج/٢). بخاري طلاق: ٥٢٨٩.

کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ تۆ سوێندت خوا ردبوو کەیەك مانگ نەچێت بۆ لایان؟ فەرمووی: ئەم مانگە بیستو نۆ شەو بوو خۆ مەرج نییە کە هەموو مانگێ سیی ڕۆژوی ڕەبەق بێ (ش/ت/ن).

٢٢٤٧– وَكَانَ ابْنَ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهما) يَقُولُ فِي الإِيلاَءِ الَّذِى سَمَّى اللَّهُ: لاَ يَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدَ الأَجَلِ إِلاَّ أَنْ يُمْسِكَ بِالْمَعْرُوفِ، أَوْ يَعْزِمَ بِالطَّلاَقِرَوَاهُ البخاري[٢].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) دە یگوت: سو ێنکاری واتە: سوێند خوا ردن لەسەر دروست نەبوون لەگەڵ ژندا کە خودا لە قورئاندا ناوی ناوە (ئیلاء)، لە پا ش ماوەی چوار مانگەکە کە خودا لەناو ئا یەتەکەدا دیاری کردووە، ئیتر مێردەکە دەبێ یەکێ لەم دوو بڕیارە هەڵبژێرێ یا بەبا شی بە پێی یاسای شەرع ژنەکە ڕابگرێ یا بڕیاری بەرەڵاکردنی بدا (ب).

٢٢٤٨– وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) آلَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِنْ نِسَائِهِ وَحَرَّمَ فَجَعَلَ الْحَرَامَ حَلاَلاً وَجَعَلَ فِي الْيَمِينِ كَفَّارَةً. رَوَاهُ الترمذي[٣].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) دەیگوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوێندی خوارد لە ژنەکانی کە دروست نەبێ لەگەڵیان، وە هەندێ شتی حەڵاڵیشی لە خۆی حەرام کرد، بەڵام لە پاشدا ئەو شتەی کە حەرامی کردبوو لە خۆی دیسان حەڵاڵی کردەوە بۆ خۆیو لەباتی سوێندەکەیشی برێتی (کە فا ڕەتی دا (ت).

٢٢٤٩– عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهما) قَالَ: إِذَا حَرَّمَ الرَّجُلُ عَلَيْهِ امْرَأَتَهُ فَهِىَ يَمِينٌ يُكَفِّرُهَا وَقَالَ: {لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ}. رَوَاهُ الشيخان والله أعلى وأعلم[٤].

---

[٢] بخاری. طلاق: ٥٢٩٠.

[٣] وقل في الفتح: رجاله موثقون (شۆحه). انظر فتح الباری للعسقلانی شرح صحیح البخاری رقم: ٥٢٩١ ص٤٢٧ مجلد/٩. (مترجم).

[٤] بخاری. تفسیر: ٤٩١١. مسلم. طلاق: ٣٦٦١.

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەگەر پیاوێ بە ژنەکەی خۆی گوت: تۆ لەمن حەرامیت، ئەوە دادەنرێ بە سوێند (نەك بەتەڵاق) کەواتە دەبێ برێتیی سوێند بدا جا بۆ پشتیوانی قسەکەی خۆی گوتیشی {لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ} (٢١/٣٣). واتە: پێغەمبەری خودا بکەن بەسەر مەشق و پێشەوای خۆتان و لە هەموو کا رو فرمانێکی جوانا چاوی لێ بکەن. (ش)

## ٦٩) شەرە نە فرین = لیعان: (اللعان)

٢٢٥٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِي شَأْنِهِ مَا ذَكَرَ فِي الْقُرْآنِ مِنْ أَمْرِ الْمُتَلاَعِنَيْنِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): قَدْ قَضَى اللَّهُ فِيكَ وَفِي امْرَأَتِكَ. قَالَ فَتَلاَعَنَا فِي الْمَسْجِدِ وَأَنَا شَاهِدٌ، فَلَمَّا فَرَغَا قَالَ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا. فَطَلَّقَهَا ثَلاَثًا قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حِينَ فَرَغَا مِنَ التَّلاَعُنِ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَتِ السُّنَّةُ بَعْدَهُمَا التفريقُ بَيْنَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ، وَكَانَتْ حَامِلاً، وَكَانَ ابْنُهَا يُدْعَى لأُمِّهِ، ثُمَّ جَرَتِ السُّنَّةُ فِي مِيرَاثِ أَنَّهُ وَيَرِثُهَا وَتَرِثُهُ مَا فَرَضَ اللَّهُ لَهَا. زاد فِي روايـة: فَقَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنْ جَاءَتْ بِهِ أَحْمَرَ قَصِيرًا كَأَنَّهُ وَحَرَةٌ، فَلاَ أُرَاهَا إِلاَّ قَدْ صَدَقَتْ وَكَذَبَ عَلَيْهَا، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَسْوَدَ أَعْيَنَ ذَا أَلْيَتَيْنِ، فَلاَ أُرَاهُ إِلاَّ قَدْ صَدَقَ عَلَيْهَا. فَجَاءَتْ بِهِ عَلَى الْمَكْرُوهِ بِهِ مِنْ ذَلِكَ. رَوَاهُ الأربعة. وَفِي رواية: قَالَ لَهُمَا: حِسَابُكُمَا عَلَى اللَّهِ أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ، لاَ سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا. قَالَ الرجلُ: مَالِي، قَالَ: لاَ مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا، فَهُوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا، فَذَاكَ أَبْعَدُ لَكَ[1].

---

[1] بخاری... طلاق: ٥٢٥٩، ٤٢٣، ٤٧٤٦، ٥٢٥٩، ٥٣٠٨، ٦٨٥٤ — ٧١٥٩ — ٧١٦٦ — ٧٣٠٤. مسلم. لعـتن: ٣٧٢٣. أبو داوُد. طلاق: ٢٢٤٥، ٢٢٤٧، ٢٢٤٨، ٢٢٤٩، ٢٢٥٠، ٢٢٥١، ٢٢٥٢. نسائی. طلاق: ٣٤٠٢.

سەهلی کوڕی سەعد (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێکی ئەنصاری هاتە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو، پیاوێ پیاوێکی بەسەر ژنەکەیەوە گرتووە ئایا بیکوژێ یا چی لێ بکا؟ جا خودا لە شانی ئەم پیاوەدا ئایەتی شەڕە نەفرینی لە نێوانی ژن‌و مێرددا نارده خوارەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا بۆ خۆی لە شانی تۆو ژنەکەتا بڕیاری داوە. سەهل گوتی: جا لە ناو مزگەوتا ژن و پیاوەکە شەڕە نەفرینیان کرد، من خۆم بەدیارەوە بووم، جا کە لەشەڕە، نەفرینەکە بوونەوە مێردەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر ڕایبگرمەوە لەلای خۆم دیارە کە بوختنا نیم پیا کردووە، ئیتر لە دوا شەڕە نەفرینەکە، بەر لەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی بڵێ‌و فەرمانی پێ بکا ئەو لە خۆیەوە ژنەکەی خۆی سێ بەسێ تەڵاقدا. ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئیتر لە دوا ئەو دووە جیابوونەوە بوو بەباو لە نێوانی ئەو ژن‌و مێردەدا کە شەڕە نەفرین دەکەن وەلەو کاتەدا ژنەکە دووگیان بوو، لە پاشا کوڕێکی بوو جا ئەو کوڕەیان بەناوی دایکیەوە بانگ دەکرد، ئینجا بۆ کەلە پوور (میرات) یش بوو بە یاساو باو ئەو دایك‌و منالە کەلە پووریان لە یەکتری بە پێی شەریعەت وەردەگرت لە گێڕانەوەیەکا ئەمەشی هەیە: جا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەگەر ئەم ژنە منالێکی سوورکەڵەی کورتە بالای هێنا (وەك وەحەرە)[1]. ئەوە وا دەزانم کە ژنەکە ڕاست دەکاو مێردەکەی شەڵتاخی بۆ دەکا، بەلام ئەگەر منالێکی ڕەشکەڵەی چاو ڕەشی چاو قەویلەی سمت پانی قول قەویلەی بوو ئەوە وا دەزانم کە مێردەکەی ڕاست دەکاو ژنەکە درۆ دەکا جا کاتێ کە منالەکەی بوو نیشانە خراپە کەیانی تیا بوو (ش/د/ت) لە گێڕانەوەیەکا: فەرمووی پێیان: حیسا بو پرسینەوەتان لەسەر خودایە، دیارە کە یەکێکتان درۆ دەکەن، ئیتر ئەم ژنە لە ژنی تۆ دەرچوو، وە ما فت نەما بەسەریەوەو فڕت پێیەوە نەماوە پیاوەکەیش گوتی: ئەدی ماڵەکەم! فەرمووی: ماڵت نیە لەسەری چونکە ئەگەر قسەکەت ڕاست بێ ئەوە ماڵەکەی دەکەوێ لەباتی ئەوە کە لەمەوپێش ژنت بووەو لە باخەڵت گرتووە، خۆ ئەگەر بوختیانیشت بۆ کردبێ ئەمەیانت خرا پتر!

٢٢٥١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهما) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: يا رَسُولُ اللهِ لَوْ أَنَّ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً فَتَكَلَّمَ جَلَدْتُمُوهُ أَوْ قَتَلَ قَتَلْتُمُوهُ وَإِنْ سَكَتَ سَكَتَ عَلَى غَيْظٍ فقال: اللَّهُمَّ افْتَحْ وَجَعَلَ يَدْعُو فَنَزَلَتْ آيَةُ اللِّعَانِ فَتَلاهُنَّ عَلَيْهِ وَوَعَظَهُ وَذَكَّرَهُ وَأَخْبَرَهُ أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ قَالَ: لاَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ مَا كَذَبْتُ عَلَيْهَا. ثُمَّ ثَنَّى بِالمَرْأَةِ وَوَعَظَهَا وَذَكَّرَهَا وَأَخْبَرَهَا أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ فَقَالَتْ: لاَ وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالحَقِّ إِنَّهُ لَكَاذِبٌ فَبَدَأَ بِالرَّجُلِ فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ وَالْخَامِسَةَ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ثُمَّ ثَنَّى بِالمَرْأَةِ فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ ثُمَّ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا. رَوَاهُ مسلم والترمذي. نسأل الله الستر والتوفيق. والله أعلى وأعلم[٢].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ لەیاریدەدەران هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! گریمان پیاوێ پیاوێ بگرێ بەسەر ژنی خۆیەوە حاڵ لەم سێ شتە بەدەر نیە: ئەگەر قسە دەکا ئێوە دا رکاریی دەکەن و جەڵدەی لێ دەدەن گوایە شەڵتاخی پیا کردووە ئەگەر دە یکوژێ ئێوەیش ئەو دەکوژنەوە، دەنگیش ناکات لە داخا شەق دەبا، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەی خودایە! چارەسەری ئەم مەسەلەیەمان بۆ بکە ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی کرد بە پاڕانەوە، جا ئایەتی شەڕە نەفرین (ئایەتی لیعان هاتە خوارەوەو پێغەمبەر ئایەتەکەی خوێندەوە بۆی و پەندو ئامۆژگاریی کردوبا سی ئەوەی بۆ کرد کە سزای جیهان لە چاو سزای قیامەتا سووکەو هیچە ژنەکەیش گوتی: بەو کەسە کە تۆی ڕاوەنە کردووە لەگەڵ ئەم ئا یینە ڕا ست و دروستەدا ئەم پیاوە درۆ دەکا.

ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پێشا لەسەر ئەم شێوەیە شایەتی بە پیاوەکەدا چوا ر جا ر گوتی:شا یەتی دەدەم بە خودا کەمن ڕاست

---

[٢] مسلم. لعان:٣٧٢٦. ترمذی. طلاق: ١٢٠٢، ٣١٧٨. نسائی. طلاق: ٣٤٧٣.

دەکەم، وە لەجاری پێنجەما گوتی: وە لەعنەتو نەفرینی خودام لێبێ ئەگەر درۆ بکەمو بوختیان بۆ ئەم ژنەی خۆم بکەم ئینجا لەپاش ئەو حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) شا یەتیی بە ژنەکەدا، ئەویش چوا ر جار شایەتی داو گوتی: شایەتی دەدەم بە خودا بێگومان ئەم مێردەی من درۆزنەو ئەمە شەڵتاخ بوو کردی بەمنا وە لە جاری پێنجەما گوتی: وەخەشمو رقو غەزەبی خودام لەسەر بێ ئەگەر ئەو ڕاست بکاو لەم شایەتییەداڕاستگۆ بێ.

لەپا شا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو ژنو پیاوەی لەیەك جیا کردەوە (م/ت) لە خودای مەزن داوا دەکەین کە سرمان بپۆشێو کارمان ڕا ست کا ئەو زاتە مەزنە بۆ هەموو شتێ خۆی لە هەموو کەسێ باشتری لێ دەزانێ.

### ٧٠) منالّ هی خاوەن نوێنە: (الولد للفراش)

**٢٢٥٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتِ: اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِى وَقَّاصٍ وَعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ (رَضيَ اللهُ تَعَالى عَنْهُما) فِي غُلاَمٍ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ هَذا ابْنُ أَخِي عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّهُ ابْنُهُ، وَانْظُرْ إِلَى شَبَهِهِ. وَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ زَمْعَةَ هَذَا أَخِي يَا رَسُولَ اللّٰهِ وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي مِنْ وَلِيدَتِهِ. فَنَظَرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَى شَبَهِهِ، فَرَأَى شَبَهًا بَيِّنًا بِعُتْبَةَ، فَقَالَ: هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ. رَوَاهُ الخمسة[1].**

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: سەعدی کوڕی ئەبو وەققا صو عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە (خودایان لێ ڕازی بێ) لەسەر خولامێ بوو بە هەرایان.

[1] بخاری. بیوع: ٢٢١٨، ٢٧٦٥، ٦٨١٧. مسلم. رضاع: ٣٥٩٨ – ٣٦٠١. نسائی. طلاق: ٣٤٨٤، ٣٤٨٣. ترمذی. رضاع:

سەعد گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە برازای منەو کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو وەققاصی برامەو کاتی خۆی منی راسپاردووە کە ئەمە کوڕی ئەوە، فەرموو تەماشای شێوەیشی بکە ئەوەتانێ ڕێك لە عوتبەی برام دەچێ و کوتومت لەو دەکا. عەبدوڵڵای کوڕی زەمعەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە برای منەو لەسەر نوێنی باوکم لەدایك بووەو لە کەنیزەکی خۆیەتی.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) کە سەرنجی شێوەی خولامەکەی دا روانی شێوەی تەواو لە عوتبە دەچێ، بەڵام فەرمووی: ئەی عەبد! ئەمە هی تۆیەو ئەم منالە شەرع دەیدا بە تۆ چونکە منالْ هی مێردە یا هی خاوەنی کە نیزەکە، کە خۆی چوو بێتە لای، هەناسە سا ردیش بۆ داوین پیس دەمێنێتەوە (ش/د/ت/ن).

٢٢٥٣- وَجَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فُلاَنًا ابْنِي عَاهَرْتُ بِأُمِّهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لاَ دِعْوَةَ فِي الإِسْلاَمِ ذَهَبَ أَمْرُ الْجَاهِلِيَّةِ الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والله أعلى وأعلم[٢].

کابرایەك هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فیسارەکەس کوڕی منە، لە سەردەمی نەزانیدا شەڕوالْ پیسیم لەگەڵ دایکی دەکرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): لە حوکمی ئیسلاما ئەم جۆرە داخوازییە نیە، وە دا ب و نەریتی سەردەمی نەزانی بەسەر چوو، لەم حاڵەدا منداڵ ئەگەر باوکی شەرعی نەبوو هی دا یکەو بەشی شەڕواڵپیسیش هەناسەی ساردە! (د).

### ٧١) خانە گومانی باش نیە: (ينبغي الإحتراس وتحسين الظن)

٢٢٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي فَزَارَةَ إِلَى رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاَمًا أَسْوَدَ. فَقَالَ: هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ. قَالَ: نَعَمْ.

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

قَالَ: مَا أَلْوَانُهَا. قَالَ: حُمْرٌ. قَالَ: هَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ؟. قَالَ: إِنَّ فِيهَا لَوُرْقًا. قَالَ: فَأَنَّى أَتَاهَا ذَلِكَ؟ قَالَ: عَسَى أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ. قَالَ: وَهَذَا عَسَى أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئەبو هورەیرە (خودا لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێکی بەنی فەزارەیی هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من خۆم سپیم کەچی ژنەکەم کوڕێکی رەشی بووە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): هیچ وشترت هەیە؟ گوتی: بەڵێ هەمە. فەرمووی: رەنگیان چۆنە؟ گوتی: سوورن. فەرمووی: وشتری تاڵەیان تیادا هەیە؟ گوتی: وشتری تاڵەی زۆریان تیادا هەیە، فەرمووی: ئەو وشترە تالأنەیان لە کوێوە تێ کەوتووە؟ گوتی: رەنگ بێ ڕەگێ لە ڕەگەزیان رەنگی وا بووبێ، ئەمانەی ئێستا چووبنەتەوە سەر ڕەنگی ئەو رەگەزە کۆنەی خۆیان! فەرمووی: دە کوڕەکەی تۆیش هەروەها (ش/د/ت/ن).

٢٢٥٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَدْخَلَتْ عَلَى قَوْمٍ مَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ فَلَيْسَتْ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ وَلَنْ يُدْخِلَهَا اللَّهُ جَنَّتَهُ وَأَيُّمَا رَجُلٍ جَحَدَ وَلَدَهُ وَهُوَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ احْتَجَبَ اللَّهُ تَعَالَى مِنْهُ وَفَضَحَهُ عَلَى رُءُوسِ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي والحاكم وصححه[2].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی حخودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر ئافرەتێ زۆڵێ بخاتەوەو بیکات بە منالی هۆزێکی تر ئەوە ئەو ژنە فڕی بە ئا یینی خوداوە نامێنێ وە خودا بە هەشتی لێ قەدەغە دەکا، هەر پیاوێکیش حا شا لە منالی خۆی بکا کەلەبەر چاوی بێ خودایش لە ڕۆژی قیامەتا حاشا لەو دەکاو لەبەر چاوی پێشینان و پا شینان دە یکا بە پەندو ریسوای دەکات! (د/ن/ حاکم:ص).

---

[1] بخاری. طلاق. لعان: ٥٣٠٥، ٦٨٤٧، ٧٣١٤.

[2] صحيح عند الحاكم.

### ٧٢) بەڕای شێوەناس (قائف) کار دەکرێ، ئەگینا بەدەو (قرعە) کار دەکرێ: يعمل برأي القائف وإلاَّ فالقرعة

٢٢٥٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ذَاتَ يَوْمٍ مَسْرُورًا تُبْرِقُ أَسَارِيرُ وَجْهِهِ فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ أَلَمْ تَرَىْ أَنَّ مُجَزِّزًا الْمُدْلِجِيَّ دَخَلَ عَلَيَّ فَرَأَى أُسَامَةَ وَزَيْداً وَعَلَيْهِمَا قَطِيفَةٌ وَقَدْ غَطَّيَا رُءُوسَهُمَا وَبَدَتْ أَقْدَامُهُمَا فَقَالَ هَذِهِ أَقْدَامٌ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ. رَوَاهُ الخمسة[1].

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ڕۆژێ** (دروودی خودای لەسەر بێ) **تەشریفی هات بۆ لام زۆر کەیفی خۆش بوو لە خۆشیانا نوور لە رووی دەباری، فەرمووی: ئەی عائیشە! دەزانیت کە موجەززیزی مودلەجی کە شێوە ناسێکی بە ناوبانگ بوو هات بۆ لام، لەو کاتەدا ئوسامەو زەیدی باوکی لە ژێر پارچەیەك قەدیفەدا بوون‌و سەری خۆیان داپۆشیبوو بەڵام قاچیان بەدەرەوە بوو موجەززیز لەسەر ئەم حاڵە کە چاوی پێیان کەوت گوتی: خاوەنی ئەم قاچانە باوك‌و کوڕن! (ش/د/ت/ن).**

٢٢٥٧- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: أُتِيَ عَلِيٌّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) بِثَلاَثَةٍ وَهُوَ بِالْيَمَنِ وَقَعُوا عَلَى امْرَأَةٍ فِي طُهْرٍ وَاحِدٍ فَسَأَلَ اثْنَيْنِ أَتُقِرَّان لِهَذَا بِالْوَلَدِ؟ قَالاَ: لاَ. حَتَّى سَأَلَهُمْ جَمِيعًا. فَأَقْرَعَ بَيْنَهُمْ فَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالَّذِي صَارَتْ عَلَيْهِ الْقُرْعَةُ وَجَعَلَ عَلَيْهِ ثُلُثَيِ الدِّيَةِ لِصَاحِبَيْهِ فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي. والله أعلى وأعلم[2].

**زەیدی کوڕی ئەرقەم** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: عەلی لە یەمەن بوو، سێ پیاویان هێنا بۆ لای، هەرسێکیان لە ماوەی یەك پاکی (توهر) دا چووبوونە لای ژنێ، جا عەلی دوو دوو لێی دەپرسین: ئایا پێلێ دەنێن کە مناڵەکە هی**

---

[1] بخاری. فرائض: ٦٧٧٠، ٣٧٣١، ٦٧٧١. أبو داوُد. طلاق: ٢٢٦٨. ترمذی. ولاء: ٢١٢٩. نسائی. طلاق: ٣٤٩٣. مسلم. رضاع: ٣٦٠٢ – ٣٦٠٤. أبو داوُد. طلاق: ٢٢٦٧.

[2] سكت عنه الشارح.

ئەوی ترتانە یانا؟ جا کە لە هەموویانی پرسیو هەموویان گوتیان: نەو، ئەوسا دەوی کرد لە ناویاناو منالەکەی لکان بەوەیانەوە کە دەوەکەی بەرکەوت، وە دوو سێیەکە خوێنی دانا لەسەری کە هەر سێ یەکێکی بدا بەهاوڕێیەکی جا کە ئەمەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا پێکەنی کاکیلەکانی دەرکەوتن (د/ن).

## ٧٣) باسی ظیهار: (الظهار)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ}. (٣/٥٨)

واتە: ئەوانەی کە ظیهار دەکەن لەگەڵ ژنەکانیانو پێیان دەڵێن: تۆ لەسەرمن وەکوو پشتی دایکم وای، یا وەکوو خوشکم وای، وەلەپاشا پەشیمان دەبنەوە لەو قسە ناشیرینو نا شایستەیەی کە گوتوویانە، ئەوە پێویستە لەسەر ئەو مێردەی کە ئەم قسەیە بڵێ بەژنی خۆی بەندەیەك ئازاد بکا لە پێش ئەوەدا کە ئەو پیاوو ژنە لەگەڵ یەك جووت بن، ئەم حوکمەو ئەم بڕیاری کە فارەتە پەندو ئامۆژگاری ئێوەی پێ دەکرێو خودا زۆر باش ئاگادارە بەوەی کە ئێوە دەیکەن.

٢٢٥٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: يَا رَسُولُ اللهِ إِنِّي قَدْ ظَاهَرْتُ مِنِ امْرَأَتِهِ فَوَقَعَ عَلَيْهَا قَبْلَ أَنْ أُكَفِّرَ فَقَالَ: وَمَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ يَرْحَمُكَ اللَّهُ؟ قَالَ: رَأَيْتُ خُلْخَالَهَا فِي ضَوْءِ الْقَمَرِ. فَقَالَ: لاَ تَقْرَبْهَا حَتَّى تَفْعَلَ مَا أَمَرَكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِهِ. رَوَاهُ الترمذي وصاحباه[1].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ظیهارم کرد لەگەڵ ژنەکەماو لە پێش ئەوەیشا کە کەفارەتی بدەم چوومەوە لایو جووت بووم

---

[1] بسند صحيح (شرحه).

لەگەڵیا. فەرمووی: بەر رەحمەتی خودا کەویت چی ئەمەی پی کردیت؟ گوتی: لەبەر تریفەی مانگە شەوەکە خڕخاڵەکەیم دی ئیتر ئارەزووم جووڵاو خۆم پێ زەوت نەکرا فەرمووی: ئیتر توخنی مەکەوەرەوە تا ئەو کە فارەتەی خوا داینراوە لەسەرت دەیدەیت (تیرمذی‌و ئەبو داوودو نەسائی (خودایان لێ رازی بێ) ئەم فەرموودەیەیان بە سەندێکی صەحیح گێڕاوەتەوە).

٢٢٥٩- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ امْرَأً أُصِيبُ مِنَ النِّسَاءِ مَا لاَ يُصِيبُ غَيْرِي فَلَمَّا دَخَلَ شَهْرُ رَمَضَانَ خِفْتُ أَنْ أُصِيبَ مِنَ امْرَأَتِي فَظَاهَرْتُ مِنْهَا حَتَّى يَنْسَلِخَ شَهْرُ رَمَضَانَ فَبَيْنَمَا هِيَ تَخْدُمُنِي ذَاتَ لَيْلَةٍ إِذْ تَكَشَّفَ لِي مِنْهَا شَيْءٌ فَنَزَوْتُ عَلَيْهَا فَلَمَّا أَصْبَحْتُ أَخْبَرْتُ قَوْمِي وَقُلْتُ امْشُوا مَعِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالُوا: لاَ وَاللَّهِ. فَانْطَلَقْتُ إِلَيهِ فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ: أَنْتَ بِذَاكَ يَا سَلَمَةُ (أي انت إرتكبت ذلك). قُلْتُ أَنَا بِذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَرَّتَيْنِ وَأَنَا صَابِرٌ لأَمْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَاحْكُمْ فِيَّ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ. قَالَ: حَرِّرْ رَقَبَةً، قُلْتُ: وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَمْلِكُ رَقَبَةً غَيْرَهَا وَضَرَبْتُ صَفْحَةَ رَقَبَتِي قَالَ: فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ. قُلْتُ: وَهَلْ أُصِبْتُ الَّذِى أُصِبْتُ إِلاَّ مِنَ الصِّيَامِ؟ قَالَ: فَأَطْعِمْ وَسْقًا مِنْ تَمْرٍ بَيْنَ سِتِّينَ مِسْكِينًا. قُلْتُ: وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَقَدْ بِتْنَا وَحْشَيْنِ مَا لَنَا طَعَامٌ قَالَ: فَانْطَلِقْ إِلَى صَاحِبِ صَدَقَةِ بَنِي زُرَيْقٍ فَلْيَدْفَعْهَا إِلَيْكَ فَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا وَسْقًا مِنْ تَمْرٍ وَكُلْ أَنْتَ وَعِيَالُكَ بَقِيَّتَهَا. فَرَجَعْتُ إِلَى قَوْمِي فَقُلْتُ: وَجَدْتُ عِنْدَكُمُ الضِّيقَ وَسُوءَ الرَّأْيِ وَوَجَدْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) السَّعَةَ وَحُسْنَ الرَّأْيِ وَقَدْ أَمَرَ لِي بِصَدَقَتِكُمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي. والله أعلى وأعلم[٢].

سەلەمەی کوڕی صەخر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ بووم زۆرم حەز لە ژن بوو، جا کە رەمەزان هات نەبادا لە رەمەزانا بچمە لای ژنەکەم هاتم ظیهارم لەگەڵ کرد هەتا رەمەزان دەڕوا، جا شەوێ ژنەکەم خەریك بوو خزمەتی دەکردم لەو کاتەدا لە پڕ چاوم بە شوێنێکی کەوت‌و ئیتر خۆم بۆ رانەگیراو هەڵپەڕیمە سەر کۆڵی‌و چوومە لای، جا بۆ سبەینێ قسەم بۆ خزمەکانم کردو گوتم: وەرن لەگەڵما دەچین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتیان: نە بە

---

[٢] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد والحاكم وصححه (شرحه).

خـودا نایـەین، جـا خـۆم چـووم بـۆ خزمـەتی‌و عـەرزیم کـرد، فـەرمووی: ئەمەیشتکرد ئەی سەلەمە! گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بەڵێ ئەمەیشمکرد، ئەمەیشمکرد، بەڵام ئەمەتام راوەستاوم لەبەر باری خودای گەورەو شکۆمەندا خودای گەورە فەرمانی بە چییە بەوە حوکمم بدە، من ملم کەچە بۆ ئەوە، فەرمووی: بەندەیێ ئازاد بکە منیش دەستم ماڵی بەلاملماو گوتم: بەو کەسە کە تۆی کردووە، بە پێغەمبەری راست‌و دروست جگە لە خۆم کە بەندەی خودام بەندەی تر گومان نابەم. فەرمووی: دە دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بە گوتم: ئاخر من بەهۆی ڕۆژووەوە تووشی ئەم کێشەو بەرەیە بووم! فەرمووی: دە شەست مەن خورما دەرخواردی شەست هەژا ر بدە گوتم: بەو کەسە تۆی کردووە بە پێغەمبەری راست و دروست خۆم‌و ژنەکەم بەبێ شێو سەرمان ناوەتەوە، وە ئەوەی پێی بگوترێ خۆراك نەمان بوو، فەرمووی: بڕۆ بۆ لای سەرکا ری زەکاتی بەنی زورەیق، زەکاتەکەی لێ وەربگرە، شەست مەن خورمای لێبدە بە شەست هەژارو باقی مەندەکەشی بۆ خۆت‌و خێزانت، بیخۆن بۆ خۆتان. جا منیش گەڕامەوە بۆ لای خزمانم پێم گوتن: ئێوە سەری دنیاتان لێ هێنامەوە یەك‌و راتان خراپ بوو، بەڵام پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دڵ فراوان‌و بە حەوسەلەیەو رای فرەخاسەوە فەرمووشی کە زەکاتەکەتان بۆ من بێ (د/ت/ئەحمەد/ حاکم:ص).

## ٧٤) ئەگەر پیاوێ موسوڵمان بوو، دوو خوشك ژنی بوون، یا لە چوار ژن پتری هەبوو: (إذا أسلم وتحته أختان أو أكثر من أربع)

٢٢٦٠- عَنِ فَيْرُوزَ الدَّيْلَمِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَسْلَمْتُ وَتَحْتِي أُخْتَانِ. فَقَالَ: اخْتَرْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود ولفظه: طَلِّقْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ[1].

---

[1] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

فەیرۆزی دەیلەمی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من موسڵمان بووم‌و دوو ژنم هەن، هەردوکیان خوشکن هەردوکیانیش لەگەڵما موسوڵمان بوون؟ فەرمووی: بەئارەزووی خۆت یەکێکیان هەڵبـژێرەو ئەوی تریان بەرەڵڵا بکە (ت- س/ح-د) گفتەی (د): خۆت سەرپشك بە یەکێکیان تەڵاق بدە.

٢٢٦١- عَنِ الْحَارِثِ بْنِ قَيْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَسْلَمْتُ وَعِنْدِي ثَمَانُ نِسْوَةٍ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: اخْتَرْ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا. رواه أَبُو دَاوُدَ[٢].

حاریثی کوڕی قەیس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: کاتێ کە ئیسلام بووم هەشت ژنم هەبوو، جا کە ئەمەم عەرزی پێغەمبەر کرد، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): بەئارەزووی خۆت چوا ریان لێ هەڵبـژێرەو ئەو چوا رەی تریشیان تەڵاق بدە (د – سند صالح).

٢٢٦٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) أَنَّ غَيْلَانَ بْنَ سَلَمَةَ الثَّقَفِيَّ أَسْلَمَ وَلَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَأَسْلَمْنَ مَعَهُ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنْ يَتَخَيَّرَ أَرْبَعًا مِنْهُنَّ. رَوَاهُ الترمذي وابن ماجه[٣].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: غەیلانی کو ڕی سەلەمەی ثەقەفی لەسەردەمی نەزانیدا دە ژنی هەبوو کە خۆی ئیسلام بوو ئەوانیش هەردەیان لە گەڵیا ئیسلام بوون، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کرد کە چوا ر ژنیان هەڵبژێرێ‌و ئەوانی تریان بەرەڵڵا بکا. (ت- س/ص – ئیبنو ماجە).

## ٧٥) ئیسلام بوونی یەکێ لە ژن و مێرد : (إسلام أحد الزوجين)

٢٢٦٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) أَنَّ رَجُلاً جَاءَ مُسْلِمًا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ثُمَّ جَاءَتِ امْرَأَتُهُ مُسْلِمَةً بَعْدَهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهَا قَدْ كَانَتْ أَسْلَمَتْ مَعِي. فَرَدَّهَا عَلَيْهِ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[١].

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] رَوَاهُ الترمذى بسند صحيح (شرحه).

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: بەسەرینیی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێ ئیسلام بوو هات بۆ خزمەتی، ئینجا ژنەکەیشی هات ئەویش موسوڵمان بوو بوو، پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەویش لەگەڵ خۆمدا ئیسلام بووە بیدەرەوە پێم، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دایەوە پێی (ت/د–س/ص).

٢٢٦٤– وَعَنْهُ قَالَ: أَسْلَمَتِ امْرَأَةٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَتَزَوَّجَتْ فَجَاءَ زَوْجُهَا الأَوَّلُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَسْلَمْتُ وَعَلِمَتْ بِإِسْلاَمِي فَانْتَزَعَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِنْ زَوْجِهَا الثَّانِي وَرَدَّهَا إِلَى زَوْجِهَا الأَوَّلِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن ماجه[٢].

دیسان گوتی: بەسەرینیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ژنێ ئیسلام بوو، وە شووی کرد بە کابرایێ، جا مێردە پێشووەکەی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! منیش ئیسلام بوو بووم وە ژنەکەیشم دەیزانی بە ئیسلام بوونم، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەکەی لە مێردی دووهەمی سەندەوەو دایەوە بە مێردی یەکەمی (د/ ئیبنو ماجە – سند صا لح).

٢٢٦٥– وَعَنْهُ قَالَ: رَدَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ابْنَتَهُ زَيْنَبَ عَلَى أَبِي الْعَاصِي بْنِ الرَّبِيعِ بَعْدَ سِتِّ سِنِينَ بِالنِّكَاحِ الأَوَّلِ وَلَمْ يُحْدِثْ نِكَاحًا. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[٣].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پاش شەش ساڵ زەینەبی کچی دایەوە بە مێردەکەی کە ئەبولعاصی کوڕی رەبیع بوو، هەر لەسەر مارە بڕینی یەکەم، وە سەرلەنوێ مارەی نەبڕیەوە لێی. (ت/د – سند صالح).

---

[١] بسند صحيحح (شرحه).

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] بسند صالح (شرحه).

٢٢٦٦- وَعَنْهُ قَالَ: إِذَا أَسْلَمَتِ النَّصْرَانِيَّةُ قَبْلَ زَوْجِهَا بِسَاعَةٍ حَرُمَتْ عَلَيْهِ. رَوَاهُ البخاري. والله أعلى وأعلم[٤].

دیسان گوتی: ئەگەر ژنێکی مەسیحی بەیەك کاژێر یابە زیاتر یابە کەمتر لە پێش مێردەکە یا ئیسلام ببێ لە مێردەکەی حەرام دەبێ (ب)

## ٧٦) باوكو دایکی منالێ هەر کامیان موسوڵمان بن منداڵ دەدرێ بەوەیان
## الولد یتبع المسلم من أبویه

٢٢٦٧- عَنْ رَافِعِ بْنِ سِنَانٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ أَسْلَمَ وَأَبَتِ امْرَأَتُهُ أَنْ تُسْلِمَ فَقَالَتْ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ابْنَتِي، وَقَالَ رَافِعٌ: ابْنَتِي، لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): اقْعُدْ نَاحِيَةً. وَقَالَ لَهَا: اقْعُدِي نَاحِيَةً. وَأَقْعَدَ الصَّبِيَّةَ بَيْنَهُمَا ثُمَّ قَالَ: ادْعُوَاهَا. فَمَالَتِ الصَّبِيَّةُ إِلَى أُمِّهَا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): اللَّهُمَّ اهْدِهَا. فَمَالَتِ الصَّبِيَّةُ إِلَى أَبِيهَا فَأَخَذَهَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي. والله أعلى وأعلم[١].

رافیعی کوڕی سنان (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کە ئیسلام بووم ژنەکەم قاییل نەبوو کەئیسلام ببێ، جا هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: کچەکەمم دەوێ، منیش عەرزیم کرد: کچ کچی منە، جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) بەمنی فەرموو: تۆ لەم لایەوە دانیشەوە بەویشی فەرموو: تۆیش لەم لایەوە دانیشە ئینجا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) کچۆڵەکەی لە نێوانمانا داناو فەرمووی: دەی هەردوکتان بانگی بکەن هەر کەسەتان بۆ لای خۆی جا کچۆڵەکە لار بۆوە بەلای دا یکیاو ویستی بچێ بۆ لای ئەو، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی خودایە! ڕێنموونی بکەو ڕێگەی ڕا ستی نیشان بدە جا کچەکە لایدایەوە بۆ لای منو هات بۆ لامو من بردم بۆ خۆم (د/ن).

---

[٤] رواه البحاری تعلیقا فی الباب/ ٢٠ مکن کتاب الطلاق، قبل الرقم: ٥٢٨٨ مباشرة (المترجم).

[١] سکت عنه الشارح.

## ٧٧) پەروەردەکردنی منداڵ و لەلەیی (حەضانەت): (الحضانة)

٢٢٦٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنِي هَذَا كَانَ بَطْنِي لَهُ وِعَاءً وَثَدْيِي لَهُ سِقَاءً وَحِجْرِي لَهُ حِوَاءً وَإِنَّ أَبَاهُ طَلَّقَنِي وَأَرَادَ أَنْ يَنْتَزِعَهُ مِنِّي فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَنْتِ أَحَقُّ بِهِ مَا لَمْ تَنْكِحِي. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والحاكم وصححه[1].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئافرەتێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم کوڕەمم بەچەرمی سك هەڵگرتووەو بە بەشیری مەمك گۆش کردووەو لەکۆشما پەروەردەم کردووە ئێستایش باوکی تەڵاقی دام و دەیەوێ بەزۆر لێمی بسێنێ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: تا شوو نەکەیتەوە تۆ لە پێشتری بەم کوڕە. (د/ئەحمەد/ حاکم:ص)

٢٢٦٩- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ إِلَى مَكَّةَ فَقَدِمَ بِابْنَةِ حَمْزَةَ فَقَالَ: جَعْفَرٌ أَنَا آخُذُهَا أَنَا أَحَقُّ بِهَا ابْنَةُ عَمِّي وَعِنْدِي خَالَتُهَا وَإِنَّمَا الْخَالَةُ أُمٌّ. فَقَالَ عَلِيٌّ: أَنَا أَحَقُّ بِهَا ابْنَةُ عَمِّي وَعِنْدِي ابْنَةُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَهِيَ أَحَقُّ بِهَا. فَقَالَ زَيْدٌ: أَنَا أَحَقُّ بِهَا أَنَا خَرَجْتُ إِلَيْهَا وَسَافَرْتُ وَقَدِمْتُ بِهَا. فَخَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَيهِم فَقَضى بِهَا لِجَعْفَرٍ وَقَالَ: تَكُونُ مَعَ خَالَتِهَا وَإِنَّمَا الْخَالَةُ أُمٌّ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والشيخان.

عەلی (خودای گەورەی لێ خۆش نووبێ) گوتی: زەیدی کوڕی حاریپە چوو بۆ مەککە، کە هاتەوە کچەکەی هەمزەی لەگەڵ خۆی هێنا. جەعفەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: من دەیگرمە لای خۆم بە من شایانترە، چونکە هەم کچی مامەمەو هەم پوورەکەی ژنمە، پووریش لە جێگەی دایکە، منیش گوتم: من لە پێشترم پێی چونکە هەم ئامۆزامەو هەم کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنمە، دیارە کە کچەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەبەر ترە پێی، زەیدیش گوتی: من شایانترم پێی من خۆم چووم بۆی و هێناومەو ئەرکی ڕێگەم پێیەوە کێشاوە، جا پێغەمبەر

[1] صحیح عند الحام.

(درودی خودای لەسەربێ) لەماڵەوە بوو هات بۆ لامان وە کچەکەی دا بە جەعفەر، فەرمووی: لەلای پووری دەبێ، چونکە پووریش هەر دایکە! (د/ش).

٢٢٧٠- عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَجَاءَتْ فَقَالَتْ: إِنَّ زَوْجِي يُرِيدُ أَنْ يَذْهَبَ بِابْنِي وَقَدْ نَفَعَنِي وَسَقَانِي مِنْ بِئْرِ أَبِي عِنَبَةَ. فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) اسْتَهِمَا عَلَيْهِ، فَقَالَ زَوْجُهَا: مَنْ يُخَاصِمُنِي فِي وَلَدِي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): هَذَا أَبُوكَ وَهَذِهِ أُمُّكَ فَخُذْ بِيَدِ أَيِّهِمَا شِئْتَ فَأَخَذَ بِيَدِ أُمِّهِ فَانْطَلَقَتْ بِهِ. رَوَاهُ أصحاب السنن. نسأل الله الستر والتوفيق. والله أعلى وأعلم[٣].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جا رێ لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم (درودی خودای لەسەربێ) ئافرەتێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! مێردەکەم دەیەوێ کوڕەکەم ببات کوڕەکەیشم بە کەڵکم دێو لەبیری ئەبو عینەبە ئاوی خواردنەوەم بۆ دێنێ، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەوی لێ بکەن لەبەینی هەردوکتانا مێردەکەشی گوتی: لەسەر کوڕی خۆم کێ دەتوانێ گەرم تێ ئاڵێنێ. پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمەیان باوکتەو ئەمەیان دایکتە بە ئارەزووی خۆت ئەی کوڕەکە! دەستی کامیان دەگریت بیگرە. ئەویش دەستی دایکی گرت، جا دا یکەکەی بردی (د/ت/ن-س/ص).

## ٧٨) حوکمی دیارنەبوونی مێرد (فقد الزوج): (حكم فقد الزوج)

٢٢٧١- أَنَّ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ فَقَدَتْ زَوْجَهَا فَلَمْ تَدْرِ أَيْنَ هُوَ فَإِنَّهَا تَنْتَظِرُ أَرْبَعَ سِنِينَ ثُمَّ تَعْتَدُّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ثُمَّ تَحِلُّ. رواه مَالِكٌ وَقَالَ: وَإِنْ تَزَوَّجَتْ بَعْدَ انْقِضَاءِ عِدَّتِهَا فَدَخَلَ بِهَا زَوْجُهَا أَوْ لَمْ يَدْخُلْ بِهَا فَلاَ سَبِيلَ لِزَوْجِهَا الأَوَّلِ إِلَيْهَا[١].

---

[٣] بسند صحيح (شرحه).

[١] سكت عن درجته الشارح.

عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: هەر ئا فرەتێ مێردەکەی دیار نەبێ و نەزانێ لە کوێیە ئەوە دەبێ چوار ساڵ چاوەڕوانیی پەیدا بوونی مێردەکەی بکا، ئینجا چوار مانگ و دەشەو عیددە دەگرێ، ئیتر دروستە شوو بکا. ئیمامی مالیك ئەم فەرمایشتەی گێڕاوەتەوە دەڵێ: ئەگەر ژنەکە لەپاش تەواو بوونی عیددەکەی شووی کرد ئیتر مێردی پێشووی فڕی بەسەریەوە نامێنێ، خوا مێردی دووەمی چوو بێتە لای یا نە چووبێتە لای.

٢٢٧٢- وَقَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) إِذَا فُقِدَ فِي الصَّفِّ عِنْدَ الْقِتَالِ تَرَبَّصُ امْرَأَتُهُ سَنَةً.

ئیبنو موسەییب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەگەر مێرد لە ریزی جەنگا بزر بوو ژنەکەی یەك ساڵ چاوەنواڕی دەکا و ئینجا عیددەی ژنی مێرد مردوو دەگرێ و لە پاشا بۆی هەیە کەشوو بکاتەوە (ب).

٢٢٧٣- وَقَالَ: الزُّهْرِيُّ فِي الأَسِيرِ يُعْلَمُ مَكَانُهُ لاَ تَتَزَوَّجُ امْرَأَتُهُ، وَلاَ يُقْسَمُ مَالُهُ فَإِذَا انْقَطَعَ خَبَرُهُ فَسُنَّتُهُ سُنَّةُ الْمَفْقُودِ. رواهما البخاري. والله أعلى وأعلم.

زوهری (خودای لێ رازی بێ) گوتی: دیل ئەگەر جێ و شوێنی دەزانرا ئەوا ژنەکەی شوو ناکاتەوە و ماڵیشی دابەش ناکرێ، بەڵام ئەگەر دەنگوباسی بڕاو بێ سەرو شوێن بوو ئەوە بەیاسای دیار نەبوو (ئەلمەفقود) رەفتاری لەگەڵ دەکرێ (ب).

## ٧٩) باسی دەهەم: باسی عیددە و تازیباریی

## الباب العاشر في العدة والاحداد

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ} (٢/٢٢٨).

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ژنانی تەڵاقدراو خۆیان رابگرن لە شوو کردنەوە تا ماوەی سێ بێنوێژیی، وە دروست نیە بۆیان کە ئەوەی خودا دروستی کردووە لە منداڵدانیانا لە خوێنی بێنوێژیی و لەسك بیشارنەوە،

ئەگەر بەڕاستی ئەو ژنانە بڕوایان هەیە بە خوداو بە لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی.

وَقَالَ جَلَّ شَأْنُهُ: {وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ} (٦٥/٤).

واته: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەو ژنانەتان کە بێ هیوا دەبن لەبەر پیری لە حەیزو بێنوێژی ئەگەر نازانن عیددەیان چەندێکە بزانن عیددەیان سێ مانگە، هەروەها ئەو ژنانەیش کەلەبەر منالی هێشتا حەیزیان پیا نەهاتووە، وە ئەو ژنانەیش کە سکیان هەیە ئەوە ماوەی عیددەکەیان تا دانانی سکەکەیانە.

وَقَالَ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا}. (٣٣/٤٩)

خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی کەسانێ کە خاوەن باوەڕو ئیمانن! کاتێ ژنانی موسوڵمانتان مارە کرد بۆ خۆتان، وە لەپێش ئەوەدا کە بچنە لایان تەڵاقتان دان، ئەوە هەقی عیددەتان بەسەریانەوە نیە تا حلێبی بکەن لەسەریان.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا} (٢/٢٣٤).

خودای مەزن دەفەرموێ: ئەو پیاوە – موسوڵمانانە کە دەمرنو ژنەکانیان لەپا ش خۆیان بەجێ دەهێڵن، دەبێ ئەو ژنانە تا ماوەی چوار مانگو دەشەو چاوەڕوانی بکەنو لەو ماوەیەدا شوو نەکەنەوە.

٢٢٧٤– قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) اِجْتَمَعَ أَبُو سَلَمَةَ وَابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُما) وَهُمَا يَذْكُرَانِ الْمَرْأَةَ تُنْفَسُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِلَيَالٍ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: عِدَّتُهَا آخِرُ الأَجَلَيْنِ. وَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): قَدْ حَلَّتْ بالوَضْعِ. فَجَعَلاَ يَتَنَازَعَانِ ذَلِكَ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَا مَعَ ابْنِ أَخِي فَبَعَثُوا رَكِيباً إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ يَسْأَلُهَا فَجَاءَ فَقَالَ: أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ قَالَتْ: نُفِسَتْ سُبَيْعَةَ الأَسْلَمِيَّةَ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِلَيَالٍ ذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ

(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَمَرَهَا أَنْ تَتَزَوَّجَ. رَوَاهُ الخمسة. ولفظ الترمذي: وَضَعَتْ سُبَيْعَةُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِثَلاثَةٍ وَعِشْرِينَ أَوْ خَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ يَوْمًا فَ تَشَوَّفَتْ لِلنِّكَاحِ فَأُنْكِرَ عَلَيْهَا ذَلِكَ فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِنْ تَفْعَلْ فَقَدْ حَلَّ أَجَلُهَا[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەبو سەلەمەو ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) لە کۆبوونەوەیەکا باسی ئەو ژنەیان دەکرد کەلەپاش مردنی مێردەکەی بەچەن شەوێ منداڵی ببێ. ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: عیددەی بە پێی دوا وادەیە (ئاخر الأجلین). ئەبو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بەدانانی سکەکەی عیددەی تەواو دەبێ و دروستە شوو بکاتەوە، جا لەسەر ئەمە لێیان بوو بە مشتومڕ، منیش گوتم: من لەگەڵ ئەبو سەلەمەی کاکم هاودەنگم، جا سوارێکیان نارد بۆ لای ئوممو سەلەمە کە لێی بپرسێ کە سوارەکە هاتەوە گوتی: ئوممو سەلەمە گوتی: سوبەیعەی ئەسلەمییە لەپاش مردنی مێردەکەی بە چەند شەوێ منداڵی بوو، وە ئەمەی باسکرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: دەتوانی شوو بکەیتەوە (ش/د/ت/ن) گفتەی (ت): سوبەیعە (خودای لێ رازی بێ) لەپاش مردنی مێردەکەی بە بیست و سێ ڕۆژ یا بەبیست و پێنج ڕۆژ منداڵی بوو، وە حەزی لە شوو بوو بەڵام خەڵك تانەیان لێ دەدا، کەچی کە ئەم باسە عەرزی حەزرەت کرا فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەگەر شوو بکاتەوە عیددەی تەواو بووەو حەیەی هەڵهاتووەو دروستە بۆی مێرد بکاتەوە.

٢٢٧٥- وَتَقَدَّم في الصّداق أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَضَى عَلَى امْرَأَة مَاتَ زَوْجُهَا قَبْلَ الدُّخُول بِهَا بِالعَدَّة، وَقَالَ: مَعْقِلُ الأَشْجَعِيُّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) هَكَذا قَضى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ➡ (ب-٢ ز-٢٠ ل-ف ١ = ج/١ تسلسل/٢٢٠ ص الحديث رقم واحد)[2].

---

[1] بخاري. مغازي: ٣٩٩١، ٥٣١٩. مسلم. طلاق: ٣٧٠٦. نسائي. طلاق: ٣٥١٨، ٣٥١٩، ٣٥٢٠.

[2] تقدم تخريجه فی رقم: ٢٠٦٧/١ تسلسل/ ٣٥ من هذا المجلد.

٢٢٧٦- وللترمذي وأبي داود: طَلاَقُ الأَمَةِ تَطْلِقَتَانِ وَعِدَّتُهَا حَيْضَتَانِ[٣].

تیرمذیو ئەبو داوود (ڕەزای خودای گەورەیان لێبێ) ڕیوایەت دەکەن: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دە فەرمویٚ: تەڵاقی کە نیزەك (ئەمەتە) دوو تەڵاقە نەك سێ، وەعیددەیشی دوو بێنوێژییە نەك سێ.

٢٢٧٧- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ نَافِعٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَخْبَرَتْنِي زَيْنَبَ ابْنَةِ أَبِي سَلَمَةَ بِهَذِهِ الأَحَادِيثِ الثَّلاَثَةِ قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حِينَ تُوُفِّيَ أَبُوهَا أَبُو سُفْيَانَ، فَدَعَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِطِيبٍ فِيهِ صُفْرَةٌ خَلُوقٌ أَوْ غَيْرُهُ فَدَهَنَتْ مِنْهُ جَارِيَةً، ثُمَّ مَسَّتْ بِعَارِضَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا. قَالَتْ زَيْنَبُ: ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ حِينَ تُوُفِّيَ أَخُوهَا، فَدَعَتْ بِطِيبٍ فَمَسَّتْ مِنْهُ ثُمَّ قَالَتْ: وَاللهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ: لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا. قَالَتْ زَيْنَبُ: وَسَمِعْتُ أُمِّي أُمَّ سَلَمَةَ تَقُولُ جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنَتِي تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا وَقَدِ اشْتَكَتْ عَيْنُهَا أَفَنَكْحُلُهَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لاَ. ثُمَّ قَالَ: إِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ وَقَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَرْمِي بِالْبَعَرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ؟. قَالَ حُمَيْدٌ: فَقُلْتُ لِزَيْنَبَ: وَمَا تَرْمِي بِالْبَعَرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ؟ فَقَالَتْ زَيْنَبُ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا دَخَلَتْ حِفْشًا، وَلَبِسَتْ شَرَّ ثِيَابِهَا، وَلَمْ تَمَسَّ طِيبًا وَلاَ شَيْئاً حَتَّى تَمُرَّ بِهَا سَنَةٌ، ثُمَّ تُؤْتَى بِدَابَّةٍ حِمَارٍ أَوْ شَاةٍ أَوْ طَائِرٍ فَتَفْتَضُّ بِهِ، فَقَلَّمَا تَفْتَضُّ بِشَيْءٍ إِلاَّ مَاتَ، ثُمَّ تَخْرُجُ فَتُعْطَى بَعَرَةً فَتَرْمِي بِهَا ثُمَّ تُرَاجِعُ بَعْدُ مَا شَاءَتْ مِنْ طِيبٍ أَوْ غَيْرِهِ. رَوَاهُ الخمسة (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنهُمْ)[٤].

---

[٣] بسند ضعيف (راجع رقم: ٥/٢١٩٦).

[٤] بخاری. جنائز: ١٢٨٠، ١٢٨١، ١٢٨٢، ٥٣٣٤، ٥٣٣٥، ٥٣٣٦، ٥٣٣٨، ٥٣٤٥، ٥٧٠٦. مسلم. طلاق: ٣٧٠٩، ٣٧١١ — ٣٧١٣.

حومەیدی کوڕی نافیع (خودای لێ رازی بێ) گوتی: زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) ئەم سێ فەرموودەیەی بۆ گێڕامەوە گوتی: کاتێ ئەبو سوفیان مرد کە باوکی ئوممو حەبیبە بوو،کە هاوسەری پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) چووم بۆ لای ئوممو حەبیبە (بەم بۆنەیەوە) روانیم ئوممو حەبیبە داوای بۆنێکی گێراوەی کرد، کەمێ زەعفەرانی تیا بوو، جا هەردوو دەستی کرد بە ناویاو ئینجا دەستەکانی هێنا بەسەری کە نیزەکەکەدا تا دەستی بۆنی کەمی پێوەبمێنێ ئینجا دەستی سووی بەهەردوو لاڕوومەتی خۆیاو بۆنی دا لە خۆی و تازێی شکاندو گوتی: بەو خودایەی کە هەر خۆی خودایە هیچ کارێکم بە بۆنی خۆش نیە، بەڵام لەبەر ئەوە بەکا ری دەهێنم چونکە لە پێغەمبەرم ژنەوت لەسەر دوانگە دەیفەرموو: ئەو ژنەی باوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە دروست نیە بۆی کەلەسێ ڕۆژ پتر ماتەم بگرێ بۆ مردوو مەگەر بۆ مێرد کە دە بێ چوار مانگ و دەشەو تازێباربێ.

زەینەب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: چووم بۆ لای زەینە بی کچی جەحشیش بە بۆنەی مردنی براکەیەوە، دیم کە ئەویش داوای گوڵاوی کردو دای لە خۆی و گوتی: بە خودا هیچ کارێکم بە بۆنی خۆش نیە، بەڵام لەبەر ئەوە بەکاری دەهێنم چونکە بۆ خۆم لە پێغەمبەرم بیست لەسەر مینبەر دەیفەرموو: (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو ژنەی کە ئیمان و باوەڕی بە خوداو بە حسیب و لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی هەیە دروست نیە بۆی کەلەسێ ڕۆژ زیاتر تازێ بگرێ بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد کە دەبێ بۆ ئەو چوار مانگ و دەشەو تازێبار بێ.

زەینەب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە ئوموو سەلەمەی دایکیشم بیست دەیگوت: ژنێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەم بەری خودا! کچەکەم مێردەکەی مردووەو چاویشی دێشێ ئایا چاوی بڕێژێ؟ فەرمووی: (نەء) ئینجا فەرمووی: خۆی تەنیا چوا ر مانگ و دەشەوە کەچی

ئێـوە هێـشتا پەلەپـەلی لێ دەکـەن و دەتانـەوێ لێـی بدزنـەوە بـەڵام جـاران لەسەردەمی نەزانیدا لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێ ئەوسا پشقلەکەتان فڕێ دەدا.

حومەید (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: بەزینەبم گوت: لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێ ئەوسا پشقلەکەتان فڕێ دەدا، واتـەی چی؟ گوتی: جا ران ژن کە مێردەکەی دەمرد دەچووە نـاو کوڵبەیەکـەوەو جلکێکـی زۆر خـرا پـی لەبـەر دەکـرد، وە بۆنی خۆش و گولاوو شتی وای لـە خـۆی نـەدەدا جا تـا سـاڵێ دە ڕۆیـی ئەمـە حا ڵی بوو، ئەوجا ولاخێکیان بۆ دەهێنـا، ئیتر ئـەو ولاخـە کـەر بوایە، یا مـەڕ بوایە یا مەل بوایە ئەو خۆی پێ پاك دەکردەوە، وەلێ بە دەگمـەن ڕێ دەکـەوت کە ئەو ژنە خۆی بەشتێ پاك بکاتەوەو ئەو شتە لەبەر ئـەو پیسی و پۆخڵییە نـەمرێ! ئینجـا ژنەکـە لـە کوڵبەکـەی دەهاتـە دەرەوەو پـشقلێکیان دەدایـە دەستی، ئەویش پشقلەکەی توورِ دەدا، ئیتر عیددەی تەواو دەبوو، وە تـازێی دەشکاندو ئەوسا ئەگەر ئارەزووی ببوایە وەك جا رانی بۆن و گولاوو شتـی و ای بەکار دەهێنایەوە. (ش/د/ت/ن- خودا یان لێ ڕازی بێ).

٢٢٧٨- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كُنَّا نُنْهَى أَنْ نُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، وَلاَ نَكْتَحِلَ وَلاَ نَتَطَيَّبَ وَلاَ نَلْبَسَ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلاَّ ثَوْبَ عَصْبٍ، وَقَدْ رُخِّصَ لَنَا عِنْدَ الطُّهْرِ إِذَا اغْتَسَلَتْ إِحْدَانَا مِنْ مَحِيضِهَا فِي نُبْذَةٍ مِنْ كُسْتِ أَظْفَارٍرَوَاهُ الخمسة إلا الترمذي[٥].

ئوممـو عـەطییـە (خودای لێ خۆش نوودبێ) گـوتی: نـەهی کـراوە لـە ئێمـە کـە دەستەی ژنانین کەلە سێ ڕۆژ پتر تازێ بگرین بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد، کە دەبـێ چـوار مـانگ و دەشـەو تـازێ بگـرین بـۆی، وە لـەو ماوەیـەدا نابـێ چـاو بڕێـژین، یـا خۆمـان بـۆن خـۆش بکـەین، یـا جل و بـەرگی ڕەنگین لەبـەر کـەین، مەگەر بەرگێ کەلە پێشا ڕەنـگ کرابێ و لـە پاشـا چنرابێ، کـاتێکیش کـە پـاك

---

[٥] بخاري. حيض: ٣١٤، ٣١٣، ٣١٥، ٣٧٥٧. مسلم. طلاق: ٣٧٢٠ - ٣٧٢٢. أبو داود. طلاق: ٢٣٠٢، ٢٣٠٣، نسائي. طلاق: ٣٥٣٦.

بووینەوە لە بێنوێژیی کە ویستمان خۆمان بشۆرین رێگەی ئەوەمان دراوە کە بەقەد پێویست عوودو گوڵاو نەختێ بۆ وانێك بەكار بێنین. (ش/د/ن — (خودایان لێ رازی بێ) شەیخانو ئەبو داوودو نەسائی (رەزای خودایان لێبێ)).

## ٨٠) دوا گوتار باسی نشیمەن (سوکنا = جێگەی دانیشتن)و ژێوار (نەفەقە)

## خاتمة في السكنى والنفقة

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ} (٦/٦٥).

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەو ژنە تەڵاقدراوانە تا لە عیددەدان دایان بنێن لەو شوێنانەدا کە خۆتانی تیا دادەنیشن بە پێی دارایی‌و تەواناتان، وە زیانیان پێ مەگەیەنن‌و لە جێگەی نابارا دایان مەنێن هەتا تەنگیان پێ هەڵچنن‌و لەبەر ناچاری دەربچن، وە ئەگەر سکدار بوون خەرجیان بکێشن‌و پێویستی ژێواریان بۆ جێبەجێ بکەن تا سکەکەیان دادەنێن.

٢٢٧٩- عَنْ الْفُرَيْعَةِ بِنْتَ مَالِكِ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عَنهما) أَنَّهَا جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تَسْأَلُهُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهَا فِي بَنِي خُدْرَةَ فَإِنَّ زَوْجَهَا خَرَجَ فِي طَلَبِ أَعْبُدٍ لَهُ أَبَقُوا حَتَّى إِذَا كَانُوا بِطَرَفِ الْقَدُومِ لَحِقَهُمْ فَقَتَلُوهُ فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنْ أَرْجِعَ إِلَى أَهْلِي فَإِنَّهُ لَمْ يَتْرُكْنِي فِي مَسْكَنٍ يَمْلِكُهُ وَلاَ نَفَقَةٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): نَعَمْ. فَخَرَجْتُ حَتَّى إِذَا كُنْتُ فِي الْحُجْرَةِ أَوْ فِي الْمَسْجِدِ دَعَانِي أَوْ أَمَرَ بِي فَدُعِيتُ لَهُ فَقَالَ: كَيْفَ قُلْتِ. فَرَدَدْتُ عَلَيْهِ الْقِصَّةَ الَّتِي ذَكَرْتُ مِنْ شَأْنِ زَوْجِي قَالَتْ فَقَالَ: امْكُثِي فِي بَيْتِكِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ. قَالَتْ: فَاعْتَدَدْتُ فِيهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا. فَأَخْبَرْتُ عُثْمَانُ بِهَذَا فَاتَّبَعَهُ وَقَضَى بِهِ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن (بسندٍ صحيح)[1].

فورەیعەی کچی مالیکی خودری (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ڕۆیشتم بۆ ماڵی باوانم لە بەنی خودرە چونکە مێردەکەم چەند بەندەیەکی هەبوو، هەڵهاتبوون، ئەویش ڕۆیشت بە دوایانا، تا دەورو بەری قەددوم پێیان دەگا، وەلەوێ بەندەکان گەلەکۆمەی لێ دەکەن‌و دەیکوژن جا لەبەر ئەوەی نەخانوویەکی بۆ بەجێ هێشتووم کە هی خۆی بێ تا ستاری تیا بکەم، وە نەژیوارو خەرجی، لەبەر ئەوە دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ماڵی باوانم.

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵێ باشە جا کەلە خزمەتی هەڵسام ڕۆیشتم تا گەیشتمە هۆدەکەی خۆی، یا گوتی: ڕۆیشتم تا گەیشتمە ناو مزگەوت دیسان بانگی کردمەوە، یا فەرمانی کرد دیسان بانگیان کردمەوە بۆی، جا کە چوومەوە خزمەتی فەرمووی: چۆنت گوت منیش سەر لەنوێ کارە ساتی مێردەکەم بۆ گێڕایەوە، جا فەرمووی: لە ماڵەکەتا بمێنەرەوەو ماڵی مێردەکەت بە جێ مەهێڵە هەتا عیددەت بەسەر دەچێ! ئیتر منیش لەوێ چوار مانگ‌و دە شەو عیددەم گرت، وە لە سەردەمی جێنیشینی عوسماندا ئەم داستانەم عەرزی عوسمان کرد عوسمانیش پەیڕەویی ئەم فەرموودەیەی دەکردو کردی بەسەر مەشق‌و حوکمی پێ دەکرد (د/ت/ن-ص).

٢٢٨٠- عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ أَبَا عَمْرِو بْنَ حَفْصٍ طَلَّقَهَا الْبَتَّةَ وَهُوَ غَائِبٌ فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا وَكِيلُهُ بِشَعِيرٍ فَسَخِطَتْهُ فَقَالَ وَاللَّهِ مَا لَكِ عَلَيْنَا مِنْ شَيْءٍ. فَجَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: لَيْسَ لَكِ عَلَيْهِ نَفَقَةٌ. فَأَمَرَهَا أَنْ تَعْتَدَّ فِي بَيْتِ أُمِّ شَرِيكٍ ثُمَّ قَالَ: تِلْكَ امْرَأَةٌ يَغْشَاهَا أَصْحَابِي اعْتَدِّي عِنْدَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ فَإِنَّهُ رَجُلٌ أَعْمَى تَضَعِينَ ثِيَابَكِ فَإِذَا حَلَلْتِ فَآذِنِينِي. قَالَتْ: فَلَمَّا حَلَلْتُ ذَكَرْتُ لَهُ أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ وَأَبَا جَهْمٍ خَطَبَانِي. فَقَالَ: أَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَلاَ يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ فَصُعْلُوكٌ لاَ مَالَ لَهُ انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ. فَكَرِهْتُهُ ثُمَّ قَالَ: انْكِحِي أُسَامَةَ. فَنَكَحْتُهُ فَجَعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا وَاغْتَبَطْتُ بِهِ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[٢].

---

[٢] مسلم. طلاق: ٣٦٨٨ – ٣٧٠٣. أبو داود. طلاق: ٢٢٩٠. نسائي. نكاح: ٣٢٢٢، ٣٥٥٤. ترمذي. طلاق: ١١٨٠م.

فاطیمەی کچی قەیس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەبو عەمری کوڕی حەفص سێ تەڵاقەی دام لەنادیارو خۆم لەوێ نەبووم، جا بە سەرکارەکەیا هەنێ جۆی بۆ ناردم، منیش پێی ڕازی نەبووم، ئەویش گوتی: بەخودا هیچی تۆ لەسەر ئێمە نیە، منیش چووم بۆ خزمەت حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) و ئەم باسەم بۆی باس کرد، فەرمووی: نەفەقەو ژێوارت ناکەوێتە سەری ئینجا فەرمانی پێدام کەلەماڵی ئوممو شەریکدا عیددە بگرم، بەڵام لەپاشا فەرمووی: ئوممو شەریك ئافرەتێکی گەلێ باش و لەخودا ترسە لەبەرئەوە یارانی من هامشۆی دەکەن جانەبادا هەم تۆو هەم ئەوان تووشی تەماشاکردنی ناڕەوا بێن بچۆ لای ئیبنو ئوممو مەکتووم عیددە بگرە، چونکە ئەو پیاوێکی کوێرە تۆ نابینێ و تۆش بەئاسانی دەتوانی سەیری ئەونەکەی وە کاتێ جلەکانیشت دادەنێیت کەس ناتبینێ، کاتێ عیددەیشت تەواو بوو ئاگادارم بکە فاطیمە گوتی: جا کە عیددەم تەواو بوو عەرزیم کرد: موعاوییەو ئەبو جەهم خوازبێنیم دەکەن تۆ فەرمانت چییە؟ فەرمووی: هەرچی ئەبو جەهمە کۆڵ بەکۆڵەو گەڕۆکە یا فەرمووی: لێدەرەو لەژن زۆر دەدا هەرچی موعاوییەیشە بۆرە پیاوەو بێ ماڵە، شووبکە بە ئوسامەی کوڕی زەید منیش حەزم لە ئوسامە نەبوو چونکە هەم ڕەش بوو هەم کۆنەنۆکەر بوو جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەوە: شوو بکە بە ئوسامە ئیتر لەسەر ڕاوێژو ئاماژەکەی ئەو شووم پێکرد، وە ئەوەتانێ خودا کردی بەمایەی خۆشی و سەربەرزیی و ژنان خۆزگەم پێدەبەن (م/د/ت/ن).

٢٢٨١- وعَنْهَا قَالَتْ: طَلَّقَنِي زَوْجِي ثَلاثًا فَلَمْ يَجْعَلْ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةً. رَوَاهُ مسلم وأبو داود[٣].

دیسان فاطیمە گوتی: مێردەکەم تەڵاقی دام، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهەقی نشیمەنی دامێ، وە نەخەرجی (نەفەقە)شی بۆ بڕیمەوە تا عیددەم بەسەر دەچێ (م).

---

[٣] مسلم. طلاق: ٣٦٨٩.

٢٢٨٢- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ فِي الْمَسْجِدِ الأَعْظَمِ وَمَعَنَا الشَّعْبِيُّ فَحَدَّثَ الشَّعْبِيُّ بِحَدِيثِ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَمْ يَجْعَلْ لَهَا سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةً ثُمَّ أَخَذَ الأَسْوَدُ كَفًّا مِنْ حَصًى فَحَصَبَهُ بِهِ. فَقَالَ: وَيْلَكَ تُحَدِّثُ بِمِثْلِ هَذَا؟! قَالَ عُمَرُ بنُ الخَطَّاب: لاَ نَتْرُكُ كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّنَا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لِقَوْلِ امْرَأَةٍ لاَ نَدْرِي لَعَلَّهَا حَفِظَتْ أَوْ نَسِيَتْ، لَهَا السُّكْنَى وَالنَّفَقَةُ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: {لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ}. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[٤].

ئەبو ئیسحاق (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەگەڵ ئەسوەدی کوڕی یەزیددا لە مزگەوتی گەورەی کووفە دانیشتبووین شەعبیشمان لەگەڵ بوو، شەعبی ئەو فەرموودەیەی گێڕایەوە کە فاطیمەی کچی قەیس دەڵێ: پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ) نە جێگەی دانیشتنی دامێ و نە ژێوار (نەفەقە) ی بۆ بڕیمەوە، ئەسوەدیش چنگێ چەوی هەڵگرت و چنگە چەوەکەی تێ گرت و گوتی: خانە خراپ! ئەمە چییە تۆ دەیگێڕیتەوە؟! ئەی ئەوە نەبوو کە ئەم قسەیەیان گێڕایەوە بۆ عومەری کوڕی خەططاب (خودای لێ رازی بێ) عومەر گوتی: ئێمە بە قسەی ژنێ واز نایەنین لە نامەی خوداو یاسای پێغەمبەری، کە نازانین ئەو ژنەیە شتەکەی بەباشی لەیاد ماوە، یا لەیادی نەماوە، ژنی تەڵاقدراو هەم مافی جێگەی دانیشتنی هەیەو هەم نەفەقەو ژێوارو خەرجیشی دەکەوێ، خودای گەورە لەم بابەتەوە دەفەرموێ:

{لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ} (٦٥/١).

واتە: ئەو ژنە تەڵاقدراوانە دەرمەکەن لە هۆدەو ماڵی شەرعی خۆیان تا عیددەکەیان تەواو دەبێ، وە نابێ خۆشیان لە هۆدەو ماڵی خۆیان دەرچن، مەگەر کارێکی ناباری ناشیرینیان لێ دەربکەوێ. (م/د/ت/ن).

---

[٤] مسلم. طلاق: ٣٦٩٦. ترمذی. نكاح: ١١٣٥. نسائی. طلاق: ٣٤١٨، ٣٥٥٣.

٢٢٨٣- وَقَالَ جَابِر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): طُلِّقَتْ خَالَتِي ثَلاَثًا فَخَرَجَتْ تَجُدُّ نَخْلاً لَهَا فَلَقِيَهَا رَجُلٌ فَنَهَاهَا فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ لَهَا: اخْرُجِي فَجُدِّي نَخْلَكِ لَعَلَّكِ أَنْ تَصَدَّقِي مِنْهُ أَوْ تَفْعَلِي خَيْرًا. رَوَاهُ أبو داود ومسلم والنسائي[٥].

جابیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پورێکم سێ تەڵاقە درا بوو، جارێ دەچێتە دەرەوە خورماکەی بڕنێ، پیاوێکی پێ دەگا نەهیی لێ دەکاو پێی دەڵێ: تۆ هێشتا عیددەت تەواو نەبووە چۆن لەماڵ دەردەچیت؟ پووریشم ئەمە عەرزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکا پێی دەفەرموێ: دەرچۆو بچۆ خورماکەت بڕنە، سا بەشکوو خێرێکی لێ بکەی، یا چاکەیێ بکەی خۆ تۆ بەندەیی نیت لەکونی ژوورەوە نەیەیتە دەرەوە (د/م/ن).

٢٢٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنْ النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ مَا تَرَكَ غِنًى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ. تَقُولُ الْمَرْأَةُ إِمَّا أَنْ تُطْعِمَنِي وَإِمَّا أَنْ تُطَلِّقَنِي. وَيَقُولُ الْعَبْدُ أَطْعِمْنِي وَاسْتَعْمِلْنِي. وَيَقُولُ الإِبْنُ أَطْعِمْنِي، إِلَى مَنْ تَدَعُنِي؟ فَقَالُوا يَا أَبَا هُرَيْرَةَ سَمِعْتَ هَذَا (كُلَّه) مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ هَذَا (الكلام الأخير وهو تقول المرأة إلى آخره مُدرجٌ في الحديث، وهو) مِنْ كِيسِ أَبِي هُرَيْرَةَ. رَوَاهُ البخاري وأحمد[٦].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گەورەترین خێر ئەو خێرەیە کەلەسەر تێری و دەوڵەمەندیی بێ، هەرچەندە راستە چەندەی لە دەستی پیاوی کەم دەست دێ ئەوە خێرێکی گەلێ مەزنە، بەڵام هەندێ هەژار دەچن لە دەمی ماڵ و منداڵی خۆیانی دەگرنەوەو دەیکەن بە قوڕگی ئەم و ئەودا دەستی خێرکەریش لە دەستی خێر وەرگر باشترە، وە لە خێزانی خۆشتەوە دەست پێ بکە بەشت بەخشین و ماڵ بەختکردن. ژن دەڵێ: یا نانم بدە یا تەلاقم بدە، بەندەیش دەڵێ: تێرنان و

---

[٥] مسلم. طلاق: ٣٧٠٥. أبو داوُد. طلاق: ٢٢٩٧. نسائی. طلاق: ٣٥٥٢.

[٦] بخاری. نفقات: ٥٣٥٥.

**ئاوم بکەو ئیشم پێ بکە، کوڕیش دەڵێ: ئەگەر خۆت بە خێوم ناکەی ئەی بە تەمای کێی کەبم سپێری پێی تا بەخێوم بکا؟! گوتیان: ئەی ئەبو هورەیرە! ئەم پەراوێزەی دواوە شت لە پێغەمبەر خۆی بیستووەو ئەمەی گوتت هەمووی فەرمایشتی ئەوە، یا لەوێوە کە گوتت ژن دەڵێ.. تاد. تێچەن و پەراوێزی خۆتە؟ گوتی: نەء، ئەمەم هەمووی لە حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **نەبیستووە ئەم پەراوێزەی تێچەنەو هی گیرفانی خۆمە! (ئیمامی بوخاری و ئیمامی ئەحمەد** (پڕ گۆڕی موبارەکیان لە نووری خودای گەورەبێ) **ئەم حەدیثەیان ریوایەت کردووە).**

٢٢٨٥- عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَانَ يَبِيعُ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ، وَيَحْبِسُ لأَهْلِهِ قُوتَ سَنَتِهِمْ. رَوَاهُ البخاري (رَضِيَ اللهُ تعالى عَنْهُ)[٧].

**عومەر** (خودای لێ خۆش نوودبێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کە بەری باخە خورماکانی بەنی نەضیری دەفرۆشت هەموو جارێ بەشی نانی ساڵی خێزانەکەیی لێ دادەنا (د- خودای لێ رازی بێ) واتە: ئیمامی بوخاری ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە،** (رەزای خودای لێبێ).

٢٢٨٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) أَنَّ هِنْدَ بِنْتِ عُتْبَةَ قَالَتْ: يا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، وَلَيْسَ يُعْطِينِي مَا يَكْفِينِي وَوَلَدِي، إِلاَّ مَا أَخَذْتُ مِنْهُ وَهُوَ لاَ يَعْلَمُ فَقَالَ: خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ. رَوَاهُ الشيخان (رَضِيَ اللهُ تعالى عَنْهُمَا) نسأل الله السر والتوفيق، والله أعلى وأعلم. تَمَّ الجزء الثاني. وعدَّة أحاديثه (١٣٨٠) ثمانون وثلاثمائة وألف – ويليه الجزء الثالث وأوَّله (كتاب الحدود والدّيات)[٨].

**عائیشە** (خودای گەورەی لێ رازی بێ) **گوتی: هیندی کچی عوتبە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو سوفیانی مێردم پیاوێکی رژدو گیرەو ئەوەندەم ناداتێ کە بەشی خۆم و منداڵەکانم بکا، مەگەر ئەو نەزانێ خۆم شتی تری ببەم**

---

[٧] بخاری. نفقات: ٥٣٥٧، ٣٠٩٤، ٢٩٠٤، ٤٠٣٣، ٤٨٨٥، ٥٣٥٧، ٥٣٥٨، ٦٧٢٨، ٧٣٠٥٢.

[٨] بخاری نفقات: ٥٣٦٤.

ئەوسا بەشمان بکا. فەرمووی: ئەوەندە ببە کە بەشی خۆت‌و منداڵەکانت بکا، بەشێوەیەکی پەسەند، بە پێی یاسای شەرع (ش = شەیخان، ڕەزای خودایان لێبێ) لە خودای گەورە داوا دەکەین کە سرمان بپۆشێ‌و کارمان ڕاست کا، خودای گەورەو پایەبڵند خۆی زاناترە بە هەموو شتێ.

دانەر (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نوورو ڕەحمەتی خودای گەورەو میهرەبان بێ) لە مێدا دەڵێ: جزمی دووهەم تەواو، ژمارەی فەرموودەکانی (١٣٨٠) هەزارو سێ سەدو هەشتا فەرموودەیە.

منی بەندە لەم میانەدا دەڵێم: لە کۆتایی ڕەشنووس (موسوەددە)ی ئەم بەرگەدا لە کاتی خۆیا ئەمەم نووسیوە بەبێ زیادو کەم: جزمی دووەم تەواو بوو لە کاژێر یانزەی ڕۆژی (١٩٧٥/٥/٤) لە هۆدەکەی خۆما لە نەخۆشخانەی سەربازی کەرکوك.

# فهرس المواضيع

